"من لە ژیانمدا، تەنیا ئەوەم کردووە، ئەو کارەی کە ئێوە زاتتان نەکردووە تا نیوەش بیبەن، تا سەر بردوومە."

دۆستویفسکی

پێرست

**بەشی یەکەم**



**بەشی دووەم**



**بەشی سێیەم**

**بەشی چوارەم**



# بەشی یەکەم

## فەسڵی یەکەم
## بنەماڵە

دنیا سارد بوو. بەفر پەنجەرەکانی گرتبوو. قەلەڕەش بە ئاسمانی دەشتە سپیەکەوە، لە حاڵی فڕیندا بوون. دەتگوت بەیداخی ڕەشی تازیە بارین و بەدەم باوە دەشەکێنەوە. ماری فەرمانی دا کە حەمام دابخەن و داوای لە مێردەکەی کرد کە بچێتە گەرماو و خۆی بشوات. مێردەکەی، بێئەوەی گومانی ئەوە بکات کە ڕەنگە ئەم حەمامە سەری بخوات، بە گوێی ژنەکەی کرد، چونکە هەم ژنەکەی خۆشدەویست و هەم هەستی دەکرد پێویستی بە گەرماوە. وەختێ لە کوختە دارینەکە، کە حەمامی تایبەتی پیاوەکان بوو، هاتە دەرێ، (یان تور). کە کرێگرتە و پیاوی ژنەکەی بوو، فیشەکێکی پێوەناو، بە سەختی برینداری کرد. یارۆی قوربانی، بە لارەلار و بەدەم ناڵەناڵێکی بەسوێوە بەرەو ماڵ بووەوە. بەڵام دەرگاکانی بینایەکە بە ئەمری ماری لە ژوورەوە کڵێلون درابوون. کاتێ کە زامداری بەلەنگاز بە مست لە دەرگاکەی دەدا، یارۆی بکوژ خۆی گەیاندێ و هەڵیکێشایە شمشێر و بە جەزرەبەیەک کوشتی.

کە جەنازەکەیان بۆ ماری هێنا، گوتی: "ئەولاتر چێت، بیبەن بۆ دۆزەخ."

جەنازەکەیان لەسەر دەستە بەرەیەک ڕاکشاند و چەرچەفێکی کۆنیان پێدا دا. چەند پەڵە خوێنێک لەبەر دەرگاکە ڕژابوو و کسۆک و بەرازان خەرێک بوون دەیانلستەوە.

زڕکوڕەکەی، کە ئەویش لەلایەن مارییەوە هەڕەشەی لێکرابوو، پەنای بردە بەر دراوسێیەکیان. ماری بێئەوەی خۆی شلوێ بکات، بۆ ئەوەی دەست بەسەر میراتی کوژراوەکەدا بگرێ. یەکسەر وەسێتنامەیەکی ساختەی هەڵبەست. بەڵام (کریستوف کارلوفیچ)ی زڕکوڕی (کە یارۆی کوژرا و هەڵی گرتبووەوە) خێرا سکاڵای لەسەر تۆمارکرد و، لێکۆڵینەوە و تاقیق دروستی سکاڵایەکەی سەلماند و، حوکمی ئیعدام بۆ ژنەی تاوانبار دەرکرا. بەڵام دەسەڵات جێبەجێکردی ئیعدامەکەی، دواخست.

لە ماوەی دادگایی و دادگایی کارییەکەدا، شوویەکی دیکەی کردەوە.

قارەمانی ئەم ڕووداوەی کە دەشیا، ببێ بە ڕووداوی سەرەکی یەکێک لە ڕۆمانەکانی دوستویفسکی، هەمان ئەو ڕیسکەیە کە (ماریا ستیبانوفنا دوستویفسکی)، نەنکی نووسەر، کردبووی. ئەم بویەرە لە ساڵی ١٦٠٦دا ڕووی دابوو، بەڵام نێوی دوستویفسکی یەک سەدە پێش ئەم ڕووداوە، لە ڕاپۆری واریقاتنامەکانی لیتوانی دا بۆ یەکەمجار هاتبوو.

لە بەرواری ١٥٠٦/١٠/٦دا، میری قەڵەمڕەوی پینسک، چەند گوندێکی بە دیاری پێشکەش بە دانیێل ئیڤانوفیچ ئیرتیچیفیچی نەجیبزادەی ڕووس کردبوو، کە یەکێک لەو گوندانە، ناوی (دۆستویڤو) بوو. ئیدی پاشینان و زوریەتەکانی ئیرتیچیفیچ، ناوی دۆستویفسکییان هەڵگرت و بوو بە شۆرەتیان. یەکێک لەو بنەماڵەیە کە نێوی (فیدور) دەبێت و زۆر لە میر (کوربسکی) ناودارەوە نزیک دەبێت و ژیان و سەربهووردی دەبێت بە بابەت و ناوەرۆکی شیعری ئاشقانەی گەلێک لە شاعیرانی ڕووسی ئەو ڕۆژگارە و لەو ڕێگایەوە ناوبانگ دەردەکات و نێوی دەکەوێتە سەر زاران، ئەم فیدۆرە هەمان ئەو کەسەیە کە بەر غەزەبی

تـزار ئیڤـانی ترسـناک دەکەوێـت و پەنـا دەبـاتە بەر لیتـوانی و لەوێنـدەرەوە کۆمەڵێـک نـامە ئاڕاسـتەی تـزار دەکـات کە لە بـاری هـونەریی و دەربڕینـی هەستی کینەکێشییەوە لە ئاسـتێکی زۆر بـاڵادا دەبـن. هەر لەو سـەروبەندەدا کەسێکی دیکەی ئەو بنەماڵەیە بە نێوی روفائیـل دۆستۆیفسـکی، بە تـۆمەتی قەڵبەزەنی و دزینی هەندێ پارەی دەوڵەتی تاوانبار دەکرێـت. هەنـدێکی دیـکە لە ئەندامانی ماڵباتی دوستویفسکی بوون بە قازی یان کەشیش یـان کـاپتنی کەشـتی. یەکێکـی دیکەیـان بە نیـوی ئاکینـدی دۆستویفسـکی کە نـاو و شـۆرەتی قەداسـەتی پەیـداکردبوو، لە پەرسـتگەی (لـور دی کییـف) نێـژراوە. یەکێکی دیکەیان بە ناوی ستیڤان دوستویفسکی لە ساڵی ١٦٢٤دا تـوانی لە زنـدانی تورکـان هەڵێـت و لە شـارن لفۆڤـدا و زنجیرێکـی زیـو بە ئیکـۆنەکەی مریەمی پـاکیزەوە هەڵبواسـێ. هەروەهـا لە سـاڵی ١٦٣٤دا یەکێکـی دیـکەی هەمان بنەماڵەی دوستویفسکی، بە نێـوی شاشـنی دوستویفسـکی دەگەڵ کوڕەکەیدا فەرماندەیەکی سوپاییان کوشـت. هەروەهـا فیلیـپ دوستویفسـکی لە ساڵی ١٦٤٩دا، هێرشێکی خوێناوی کردە سـەر زەوی و زاری دراوسـێکانی و موڵک و ماڵیانی تاڵانکرد.

جا ئەو زوڕپەتـانە کە تـێکەڵەیەکن لە دز، پیـاوکوژ، فەرمـانبەر، قـازی و دادوەر، ڕۆحانی، قەڵـبەزەن و زانـا و ئـاژاوەگێڕ، کە هەردوو لایەنـی خێـر و شـەڕ لە هەر نەوەیەکیانــدا یەک دەگــرنەوە و دووبــارە دەبــنەوە، لەوە دەچێــت وێنەیەکــی پێشـوەختەی، کاراکتەرانی بەرهەمەکانی دوستویفسکییان پێکهێنابێ.

لە ناوەڕاسـتی سـەدەی هەڤدەیەمـدا، لقێکـی ئەم ماڵبـات و بنەمـاڵەیە، لە ئۆکرانیـادا گیرسـانەوە و بە یەکجـارەکی لەوێنـدەر ئـاکنجی بـوون. ئەم لـقە مقاوەمەیەکی توندیان لە هەنبەر دەسەڵاتی کاتۆلیکی پۆڵۆنیادا کـرد و زۆربەی هەرە زۆری ئەندامان و نوێنەرانی ئەم لـقە پەیوەنـدیان بە ڕیزەکـانی ڕوحانیـانی ئەرتەدۆکسـەوە کـرد. ئیـدی چ ڕەبەن و چ قەشـەی گەورە بـووبن، ئـێمە هـیچ زانیـاریەکی ئەوتۆمـان دەربارەیـان نیـیە. ئەمـانە پـاش ئەوەی لەسـەر زەمـین و خاکی خۆ هەڵبڕابوون ئیدی چاویان لە خۆشـی ژیـان پۆشـی بـوو و خۆیـان بـۆ خزمەتـی ئـاین و ڕوحـانیەت تەرخـان کردبـوو و ئیـدی کەوتبـوونە تـاریکی فەرامۆشـییەوە و کـونجی قەناعەتیـان گرتبـوو. وەکـو دەڵـێن کەوتـنە پەراوێـزی مێژووەوە.

باوکی میخائیل ئاندروڤیچ دوستویفسکیش وەکو باو باپیرانی خۆی کەشـیش بـوو و بە خەیـاڵیش ئەوەی بە بیـردا نەدەهـات کە کـوڕەکەی جـگە لە بەهـرەی کەشیشـی هیچ بەهـرە و توانـا، یـان کەڵـکەڵە و خولیـایەکی دیـکەی هەبێـت. کـاتێ ئەم کـوڕە گەنـجە، کە لە تەمەنـی پـازدە سـاڵیدا بـوو، ڕایگەیانـد کە حەزدەکات بەشـی پزیشـکی بخوێنێ و خۆی بۆ خوێندنی ئەم زانسـتە تەرخـان بکـات، ئەمە هەرا و پەشـێویەکی گەورەی نـایەوە. دایکـی ژێراوژێـر پشـتیوانی لێـدەکرد و سـەرەنجام خـانەوادەکەی خـۆی بەجێهێشـت و چـوو لە مۆسـکۆ ئاکنجی بوو و گیرسایەوە.

کەسی لەم شارەدا نەدەناسی. پارەیەکی کەم و ئەزموونێکی کەمتر لە پارەکەشی پێبوو. بەڵام وێڕای ئەوەش بە کەماڵی جدیەت دەست بەکاربوو. لە قوتابخانەی "پزیشکی و نەشتەرگەری" قەبووڵ کرا. لەکاتی شەڕی ناپلیوندا (١٨١٢) زامدارانی تیمار دەکرد و سەرەنجام بە پلەی نەقیب (ماجۆر) خوێندنی تەواوکرد.
میخائیل، لە فەوجێکەوە بۆ فەوجێکی دی، لە ئۆردوگایەکەوە بۆ ئۆردوگایەکی دی، لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی دی ڕۆیی، تا لە ١٨٢١/٣/٢٤دا بە عینوانی دکتۆری چارەسەرکاری نەخۆشخانەی هەژاران دامەزرا. کاری پزیشکی، کە زۆر بە حەماسەوە دەستی دابویە و لە بنەماڵەکەی ئەواندا بێ پێشینە بوو و، ئێستا بە دڵ و گیان، وەکو وەزیفەیەکی کارگێڕی مومارەسەی دەکرد، دەسکەوتێکی ئەوتۆی بۆ ئەو نەبوو: میداڵێکی خاچی "سان - فلادیمیر"ی دەرەجە چوار، خاچێکی "سانت-ئان"ی دەرجە سێ و پاشان میداڵێکی دیکەی دەرەجە دووەم بوو، لەگەڵ ڕێزلێنانێکی چکۆلەدا کە لەلایەن بەرپرسێکەوە لێی نرابوو، دواتر وەکو پاداشتێک بۆ هەوڵ و کۆششەکانی پۆستی سادەی یاریدەدەری خەستەخانەکەی درایە. ئەمانە هەموو دەسکەوتەکانی ئەوبوو. ئیدی لەم ماوانەدا ماجۆر، ناوی خۆی لە تۆماری نەجیمزادانی بە میراتی شاری مۆسکۆدا تۆمار کردبوو.
میخائیل ئاندریوفیچ، لە ساڵی ١٨١٩دا، زەماوەندی لەگەڵ ماری فیدروفتانچاپیفدا کرد، ماری کیژی بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو، ئەمە جیازیەکی زۆری دەگەڵ خۆیدا هێنابوو، ڕاستگۆیانە مێردەکەی خۆشدەویست و بە ماڵداری و کابانی خۆی بە ئاسانی بەسەر هەموو کۆسپ و تەگەرەکاندا زاڵ بوو.
ژنێکی هەستیار و میرەبان و گوێڕایەڵ بوو. سیمای جوان بوو، جۆرە بێزارییەکی پێوە دیاربوو. نیگارکێشێک بە نێوی پوپوڤ، بە جل و بەرگ و ئارایشی باوی ساڵی ١٨٢٠وە وێنەیەکی کێشاوە، کە قژە ئاوریشمینەکەی دەوری دەموچاوی داوە و چاوە درشتەکانی خەواڵون و هیچ بزەیەک بەسەر لێوەکانیەوە نابینرێ. هەر هەمان نیگارکێش پورترێکی میخائیل دوستویفسکییشی کێشاوە: سیمایەکی زبری دێهاتیانەی هەیە، برۆکانی درێژ و هەڵگەڕاوە تا لاجانگەکانی هاتوون. دەمی زل، چەناگەی بەرز، ڕیشێکی قەڵەمکرا و تا نیوەی ڕوومەتەکانی هاتووە. یەخەی ڕەق و بەرز و سوورمەدۆزی یونیفورمە فەرمیەکەی تا هەردوو شەویلاگەی هاتووەو نیگای وەک نیگای چۆلەکەیەک جێگیر و نەگۆڕە.
سەرەتای دژوار و سەرکەوتنی کەمی ژیان، خووخدە و تەبیعەتی میخائیل دوستویفسکییان توند و زبر کردبوو. کابرایەک بوو بەرانبەر بە خۆی و بە خەڵکی سەختگیر و توند. بەڵام ئەم سەختگیری و زبریە هیچ گەورەیی و ویقارێکی بۆ ئەو تیا نەبوو. کەسێکی تورە و توندە تەبیعەت و بە گومان و بەدخوو، دوودڵ و وازوازی بوو. لە ماڵی خۆیدا ڕۆڵی حاکمێکی دکتاتۆری دەبینی. بەرنامەی بۆ وەخت و کاتی خۆی دانابوو. لە ماڵەوە، لە پەیوەندییە

خێزاندارییەکانیـدا، بە زەبـت و ڕەبـت بـوو. یـانی لە دوای خـوا، ئیـدی ئەو بـوو. ئیـدی ئەم پیـاوە بەدخـوایە، کەسـێکی یەجگـار هەسـتیار و نائاسـوودە بـوو. هەنـدێجار، خەم و پەژارەیەکـی ناگەهـانی و تونـد دایـدەگرت و هـیچ چـارێکی نەدەما، گرێـی دڵـی بەمجـۆرە بـۆ بـۆ ژنەکەی دەکـردەوە: "خەمێکـی کوشـندە دایگرتووم. نازانم ڕووبکەمە کوێ، پەنا بـۆ کـوێ بەرم. مەگەر هەر خـوابزانێ کە چ لە خەوا و چ لە بێداریدا چ بیر و خەیاڵاتێکم بە مێشکدا دێت!"

ژنەکەی کە مێردەکەی بەو خەم و پەژارە زۆرەوە دەبینی، زۆر دەترسا و خەمی دەخوارد. بەڵام مێردەکەی کە ژنەکەی دەبینی بەو رادەیە، راستگۆیانەو وەفادارانە بە خەمیەوەیە، زۆری لەزەت دەبینی.

ژنەکەی، لە ماوەی داپڕان و دوورییەکی کورتدا بۆی دەنووسێت: "کە تۆ بەو خەمینیە دێنمە بەرچاوی خۆم دڵم دەگوشرێت. تکات لێدەکەم ئەی فریشتەکەم، ئەی خودای من، ئاگات لە خۆت بێ. بەلای کەمەوە لەبەر خاتری من، لەبەر ڤیان و ئەشقی نێوانمان، ئاگاداری خۆت بە. ئەوە بزانە کە من لە دووری تۆ، هەمان پایە و ڕێزی خودات بۆ دادەنێم، من تۆم لە خۆم خۆشتر دەوێ، تۆ تەنیا دۆست و ئازیزی منیت".

بەمجۆرە ژنەی بەلەنگاز و داماو، هەوڵیدەدا. سووکە متمانە و باوەڕبەخۆ بوونێک بۆ ئەم ستەمکارە چکۆلە و خۆشەویستە بگێڕێتەوە. میخائیل، دڵی نەرم دەبوو، بەزەیی پێیدا دەهاتەوە و ملی بۆ دەدا. بەڵام هەر کە تەنگژە و قەیرانەکە دەڕەوییەوە دیسان بایدەداوە سەر باری دکتاتۆریەتەکەی خۆی و خەم دایدەگرتەوە و بەسەر خۆیدا کڕ دەکەوتەوە.

لە ڕاسـتیدا ئەم پیـاوە لە جەوهەر و کرۆکـدا، شـەڕەنگێز و بەدخـوا نەبـوو. ژنەکەی زۆر خۆشـدەویسـت، چـونکە ئەویـش ئەمـی تـا ڕادەی پەرسـتن خۆشـدەویسـت. لە منـداڵەکانی نەدەدا، سـزای بەدەنـی نەدەدان، هەرچەنـدە منداڵەکان لێدانیان پێ خۆشتر بوو لە هەڵچوون و تووڕەبـوونە بەترەفەکـانی. تـا ماری فیدوروفنای ژنـی لە ژیانـا بـوو، نەدەچـوو بەلای خـواردنەوەو مەینۆشـیدا. بەڵام پاشان کە خووی دایە مەینۆشـی و بادەگوسـاری و ئـالوودەبوون. بیـانووی ئەوەبوو کە دوای مەرگی ژنەکەی بەرگەی داخ و کەسەر و تەنیـایی نەدەگـرت. بەڵام سـەبارەت بە ڕەزیلـی و رژدیە بێـوێنەکەی کە بوویـوو بە داسـتانی سەرزاری ئاشنایانی، هەندێ لە بیوگرافیانووسەکانی هەوڵیانداوە هـۆی ئەمە بگێـڕنەوە بـۆ کەمـی دەرامەت و دەسـکەوتەکانی. بـۆ سـستی پێشـکەوتنی ژیـانی مـادی ئەو. مـوچەکەی بریتـی بـوو لە سـەد ڕۆبڵـی ئەسـکەناس (لەو ڕۆژگـارەدا یەک ڕۆبڵـی زیـو هاوتـای سـێ ڕۆبـڵ و نیـوی ئەسـکەناس بـوو.) کە بێگومـان مـووچەیەکی کەم بـوو. بەڵام جیـازی ژنەکەی، دەرامەتـی عیـادە تـایبەتیەکەی، ئەو کـۆمەکە ڕێکەوتەکیـانەی کە هەنـدێ لە خـزمە زۆر دەوڵەمەندەکانی وەکو (کومانین) دەیانـدایە، دەیکـردە کارێـک کە بە ئاسـانی و ڕەحەتی مانگەکە بەرێتە سەر. دەوڵەت خانووی بۆ دابین کردبوو، حەوت نـۆکەر و چـوار ئەسپیشـی لە لایەن نەخۆشـخانەکەوە بـۆ تەرخـان کرابـوو، بـۆیە بـێ ویژدانیە ئەگەر باسـی نەداری و هەژاری ئەو بکرێت.

لە ساڵی ١٨٣١دا، لە سەد و پەنجا کیلۆمەتری دەرێی مۆسکۆدا، لە قەڵەمڕەوی حکومەتی (تولا)دا موڵکێکی کڕی کە پانتاییەکەی پێنج سەد دۆنم بوو و دوو گوندی بە ناوی (داروڤوی) و (چرماچنی) تیابوو، کە سەد مسکێن تیایدا دەژیان و کاریان لەو موڵکەدا دەکرد.

وێڕای ئەوەش، ئەم موڵکدارە تازە پیاکەوتووە، وەختێ ژنەکەی بە منداڵەکانەوە دەچوو بۆ ناو موڵکەکە و لەوێندەر دەمایەوە، هەمیشە لەو نامانەدا کە بۆی دەنووسی، گلەیی و گازاندەی دەکرد: "هەموو شتەکانم پێ گەییون، تەنیا دوو بوتڵە شەڕابەکە نەبێ کە بە قسەی گریگۆری، شکاون. جا گیانەکەم من لە خۆم دەپرسم ئایا بوتڵەکان لەخۆوە شکاون، یان بەتاڵیان کردوون و پاشان شکاون". هەروەها دەنووسێت: "هەموو شتێک لە ماڵەکەدا ئارامە، هەرچەندە (ڤاسلیسا) چەند جارێک گومانی لا دروستکردووم، بەڵام من بەردەوام چاودێری دەکەم. گیانەکەم بۆم بنووسە و ئاگادارم بکەوە چەند شووشە لیکۆر (جۆرە شەرابێکە) لە گەنجینەکەدا ماوە."

لە نامەکانی دیکەیدا، تکا لە ژنەکەی دەکات کە ژمارەی قاپە زیوەکانی بداتێ، تەنانەت ژمارەی قاپە شکاوەکانیشی پێ بڵێت: "تۆ بۆت نووسیوم دەبێ شەش مراکی چێشتم لابێ و من تەنیا پێنج دانە دەبینم. هەروەها نووسیوتە یەک مراکی شکاو لە چەکمەجەی مێزەکەدایە، زۆری بۆ گەڕام، بەڵام نەم دۆزییەوە، تۆ بڵێی تۆ بە هەڵەدا نەچووبیت؟"

داوا لە ژنەکەی دەکات بە پەلە و بێ دواکەوتن ژمارەی تەواوەتی و دروستی شەپقە و کراسەکانی خۆیی بۆ بنێرێت. بەمجۆرە، لە نامەکانیاندا، ئەم وردە دواکاریە سادە و پوچانە، دەگەڵ ئەوپەڕی سۆز و خۆشەویستی ژن و مێردایەتیدا دووبارە دەبەنەوە و تێکەڵ بە یەکدی دەبن.

ماڵباتی دوستویفسکی، لە مۆسکۆ، لە خانوویەکی سەر بە خەستەخانەی ماری (یان خەستەخانەی هەژاران)دا دەژیان. بینای خەستەخانەکە، بە شێوەیەکی جوان، بە پایەی زەردی زێڕین ڕازابووەوە. چواردەوری بە موحەجەرە گیرابوو، لەسەر پایەی چوارگۆشەی بەینی موحەجەرەکاندا، پەیکەری شێر دروستکرابوو. بینایەکە دەیڕوانیە ڕوباری بوجیدومکا و شەقامی "ماڵێن خوا". لە ڕاستیدا کەنارەکانی بوجیدومکا، هەر هەمووی دامودەزگای خێرخوازی و پەروەردەیی بوو: هەتیوخانە، کەترەخانە، پەیمانگای ئەلکساندەر و سانت کاترین بۆ کچۆلانی نەجیبزادە، هەر هەمووی لەم شەقامەدا بوو. ئێرە بووبوو بە مەڵبەندی هەژاری، یەکپارچە حەقارەت و دزێویی و گەندەڵی بوو. گەڕەکێک بوو مەڵبەندی بەدبەختی و نەگبەتی.

ماڵەکەی، ماڵباتی دۆستۆیفسکی، بینایەکی یەک نهۆمی بوو کە بە ستایل و شێوازی نیمچە ئیمپراتۆری دروستکرابوو. باخێکی بچکۆلە بە چواردەوری ئەم خانووەوە بوو. ئەودیوی پەرژینی ئەم باخە بریتی بوو لە باخێکی گەورەی سەر بە خەستەخانەی ماری، بینای گەورەی خەستەخانەکە، دار و درەختی گەورە و چڕی زەیزەفۆن و کڵێسای تایبەتی خەستەخانەکە. دنیایەکی تایبەتی بوو بۆ

خـۆی، خەڵکـانی ئـاڵۆز و دامـاو و مـایەی بەزەیـی تیایـدا دەژیـان و هەڵـبەتە قەدەغە بوو منداڵان تێی بچن.
ماڵەکەی، ماڵباتی دوستویفسکی بریتی بوو لە دوو ژوور و هۆڵێک، ڕیزێک دۆڵاب، بەرهەیوانەکەیان لە هۆڵەکە جیا دەکردەوە. ئەم بەینە کرابوو بە ژووری منداڵەکان. ئەم ژوورە پەنجەرەی نەبوو، دیوارەکانی بە بۆیەیەکی کەوەیی بۆیە کرابوون. کەمێک لەولاترەوە، ژوورێکی گەورە هەبوو کە دیوارەکانی بە بۆیەیەکی زەردی وەکو ڕەنگی کەناری بۆیە کرابوون. هۆڵەکەش بە بۆیەیەکی شینی کاڵ بۆیە کرابوو. پاشان ژوورێکی دیکە خرابووە سەر ئەم خانووە کە ژووری دانیشتنی خێزانەکە بوو. هۆڵەکە، دوو مێزی یاری، مێزێکی نان خواردن و دەرزەنێک کورسی سەوزی چەرمی تیابوو. لە ژووری نووستندا، تەختە خەوی داک و باب، دەست شۆرێک و دوو سەندووقی گەورەی پڕ لە چەرچەف و لێفە و جل و بەرگی ژێرەوە بوو، سەبدووقەکان هێندە پڕبوون، کە بەزەحمەت و بە جیڕەجیڕ دادەخران.
میچی ژوورەکان بەرزبوو، مۆبێلەکان گەورەبوون، پشت و نشیمەنی کورسییەکان کە بە ڕیشاڵی ڕوەکان و موو ئاخنرا بوون، جێگای پشت و پاشـەڵی ئەو کەسانەیان پێوە دەردەکەوت کە لە سەریان دادەنیشتن.
کوڕی دووەمی ماجۆر، هەر هەموو تەمەنی منداڵیەتی خۆی لەم خانووەدا بردە سەر. ئەم کوڕەی کە ١٨٢١/١٠/٣٠دا لەدایک بوو و لە ١٨٢١/١١/٤دا لە کڵێسای (پتروس و پۆڵس)ی سەر بە خەستەخانەی هەژاران، غوسڵی تەعمید کرا و ناویان نا (فیدور) کە ناوی باوکی دایکی بوو.
ڕۆژانی منداڵی، بە هێمنی و ئارامی تێدەپەڕین. بەرنامەی ژیان سـەخت و بە زەبت و ڕەبـت بـوو. تەقـریبەن هـیچ جـۆرە شـادی و خۆشـییەک لەم ژینگەیەدا نەبـوو، ئەم حـاڵەتە مەنـدو نەگـۆڕو جێگیـرە، تەنـانەت مانـای زەمانیشـی لەم خانەوادەیەدا، کە خـۆی بە بەخـتەوەر دەزانـی، سـڕی بـووەوە. ئەنـدامانی ئەم خانەوادەیە، سـەعات شەشـی بەیانی لە خەو ڕادەبـوون. سـەعات هەشـت، باوکەکەیان لە ماڵ دەردەکەوت تا پیاسـەیەک بکـات و سـەرێکی ئەو بەشـانەی خەستەخانەکە بدات کە ئەو کاری تیـا دەکـرد. ئیـدی نـۆکەر و خزمەتگوزارەکـان دوای ڕۆیشـتنی ئەو دەرفەتیان دێنا و، ئەپارتمانەکەیان پـاک و خـاوێن دەکـردەوە و سۆپا ئاسنەکانیان پێدەکرد. سەعات نۆ دەگەڕایەوە، دوای کەمێک هەمـدیس لە مـاڵ وەدەردەکەوت تـا بەنـاو شـار بکەوێـت و سـەری نەخۆشـەکانی خـۆی بدات. نیوەڕۆ فراڤینیان دەخوارد. دکتۆر، دوای نیوەڕۆ دەچـووە هـۆڵەکە، نـزیکەی سەعات و نیوێک یان دوو سەعاتێک لەسەر کۆنە قەنەفەیەکـی چەرمینـدا پـاڵ دەکەوت، دەخەوت و ئیسـراحەتی دەکـرد. ڕۆژانـی هاوینـان دەبـوایە یەکێـک لە منــداڵەکان بە دیــار بــاوکییەوە بوەســتێت و بە چــڵە زەیزەفۆنێــک، مــێش لە سەروچاوی بابی پاسبکات. خۆ ئەگەر ئەم پاسەوانە داماوە، بە ئاسـتەم غافـڵ بوایە و مێشێک یان مەگەز و مێروویەک لەسەر کەپووی دکتـۆر بنیشـتایەتەوە و لە خەوی بکردایە، ئیدی دنیا ئاخر دەبوو و هاواری سەرزەنشت بەرز دەبـووەوە، بە جـۆرێ تـووڕە دەبـوو، کە هـیچ ئەنـدامێکی خـانەوادەکەی ئیشـتیای شـیو

خواردنی نەدەما. ئاندرێ دوستویفسکی پاشان لە یاداشتنامەکەی خۆیدا، لەمبارەیەوە دەڵێت: "واوەیلا بە حاڵی ئەو کەسەی کە هێشتابای مێشێک بەسەر چاوی ئەوەوە بنیشێتەوە." هەر هەموو ئەندامانی خێزانەکە، مدارای ئەم نیوەڕۆ خەوەی باوکیان دەکرد. هەموویان لە ژوورەکەی تەنیشت هۆڵەکە، لە دەوری مێزێکی خڕ کۆدەبوونەوە، بە ئەسپایی قسەیان دەکرد، جڵەوی پێکەنینی خۆیان دەگرت، بە کەمترین جوڵە و بڵمەبڵمی باوکیان بەدەم خەوەوە، لەرزیان لێدەهات.

دۆستۆیفسکی منداڵ، لەم ژینگە و نهێنگە سەیرەدا پەروەردە بوو، دایکی، ماری فیدورڤنا، حەزی دەکرد کە هەزاران یادگاری سەیر و سەمەرەی خانەوادەکەی خۆی بگێڕێتەوە. بابی ماری، کاتێ کە فەرەنسییەکان هاتبوونە مۆسکۆ، لە شار هەڵاتبوو، کە بە عەرەبانە لە ڕوبارێک پەڕی بووبووەوە، عەرەبانەکە لە ئاو نقوم بووبوو. بەهۆی ئەوەوە، ئەو سەفتە ئەسکەناسانەی کە لە بەینی کەلوپەلەکانی دیدا دابنابوون، بە جۆرێ پێکەوە چەسپی بوون، کە مەحاڵ بوو لێکدی جیابکرێنەوە. دەنگی ماری خۆش و چاوانی میهرەبان و مەند بوون. دەم و زاری خۆش و شیرین بوو. بۆیە ئەندامانی خێزانەکە ئەو کاتەیان خۆشبوو کە ماجۆر دەخەوت.

بەڵام منداڵەکان، حیکایەت و نەنزیلەکانی (دایە ئەلیونا فرولوڤنا)یان لە چیرۆک و حەکایەتەکانی دایکی خۆیان پێخۆشتر بوو. ئەلیونا لە ماڵەکەدا پێگەیەکی گرینگ و تایبەتی هەبوو. ئەمە ژنێکی قەڵەوی بە کەلەش بوو، وەکو ئەوەبوو بە پیوو بەزێکی خراپ ئاخنرابێ. ورگی بە گوتەی ئاندرێ دوستویفسکی دەهاتەوە سەر ئەژنۆکانی. ئەلیونا، جلی زۆر پاک و خاوێنی دەپۆشی، هەمیشە شەوکڵاوێکی تەنکی تولی سپی لەسەر دەکرد. نەوسنی وەکو خۆی نەبوو. وێڕای هەموو ئەمانە، ئەم دێوە، ئارام و ئاسوودە، بە سینگە خشکێ دەڕۆیی و دەبووە مایەی خۆشحاڵی و پێکەنینی دکتۆر.

دکتۆر لە نامەیەکیدا بۆ هاوسەرەکەی دەنووسێت: "تۆ بۆت نووسیوم کە ژنە چل و پێنج پوودیەکە (پوود: ١٦ کیلۆ)، لاواز بووە. زۆرت زەحمەت کێشاوە تا بۆ ناو عەرەبانەکە سەری بخەیت و دایبگریت. من قەناعەتم وایە کە هیچ نەگبەتیەک نییە کە فایدەیەکیشی نەبێت، وا تەسەور دەکەم بەلای کەمەوە کێشی، بیست پوودیک دابەزی بێت. هەڵبەتە ئەم کێش دابەزینە لە دوا ئەنجامدا بە قازانجی ئەسپەکان و عەرەبانەکەیە و ئەوان بەم بویەرە زۆر خۆشحاڵ دەبن"

ماجۆر (نەقیب) هەندێجار حەزی دەکرد بە خوڵق و خوو و مجێز و کەڵکەڵەکانی ئەم ژنە بەلەنگازە ڕابوێرێت و گاڵتەی پێبکات. ئەلیونا، بیروباوەڕ و ڕەفتارێن تایبەتی و سەیری هەبوو. بۆ نموونە باوەڕی وابوو کە خودای دادوان، داوا لە هەر مەسیحییەک دەکات کە لەنێوان دوو پاروو گۆشت یان ماسی یان سەوزەدا، پارووێەک نان بخوات؟ بە باوەڕی ئەو تەنیا خواردنی بێچوە قورینگی سوورەوەکراو بەبێ نان یان شتی دیکەوە، جایزە. "چکۆلەکەم، هەوەڵجار

پارووپەک نان بخە دەمتەوە و بیجوو و پاشان خواردنێکی دی بۆ دەمت ببە. ئەمە خواستی خوای دادوانە.:"
تاقە خاڵی لاوازیی ئەو ئەمە بوو کە پرنووتی بەکار دەبرد. کابرایەکی تووتن فرۆشی چەپەڵی شڕ و شەپرێوی پیسکە ناو بەناو بۆی دێنا. ماجۆر، دەیگوت ئەمە دەزگیرانی ئەلیونایە. ژنەی بەلەنگاز تووڕە دەبوو، بەرسقی دەدایەوە و دەیگوت: "تف، خوا ڕەحمت لێبکات. تەنیا خوای گەورە دەزگیرانی منە، نەک کابرایەکی تەماکۆ فرۆشی نەناس".
هەندێ شەو دەنگی سەیری وەکو لورەی گورگ لە ئەلیوناوە بەرز دەبووەوە. منداڵەکان، بە ترسەوە لە خەو رادەپەڕین. ماجۆر، لەسەر تەختە خەوەکە دەهاتە خوارێ و ژنەی تاینی ڕادەتەکان تا وەخۆ دەهاتەوە و خەبەری دەبووەوە. هەنگێ بە هەڕەشەوە پێی دەگوت: "وا پێت دەڵێم ئەگەر جارێکی دی بلورێنی، فەرمان دەدەم سێ لیتر خوێنت لێبگرن" ، لە ڕاستیا هەموو ڕۆژێک حەجامەتیان دەگرت، بەڵام بێفایدە بوو.
هەروەها دکتۆر ئامۆژگاری دەکرد، کە خواردن کەمبکاتەوە، بەڵام ئەو دەیگوت ئەگەر بە سکی خاڵی بخەوێت، ژنانی کێوەلی و جادووگەر دێنە خەوی و زۆر دەترسێت و ناڕەحەت دەبێت. ئیدی دکتۆر بێزار دەبوو و کوڵی دەدا و وازی لێدەهێنا. لەڕاستیا ئەلیونا تاقە کەس بوو لەو ماڵەدا کە دەیتوانی ڕوو بە ڕووی ئەم فەرمانڕەوا دکتاتۆرە ببێتەوە. زۆرجار منداڵەکانی لە پشم و غەزەبی ئەو پاراستبوو. ئەلیونا هاوولاتیەکی خەڵکی مۆسکۆ بوو ولەم ڕووەوە خۆی بەسەر هەموویاندا بادەدا و فەخرفرۆشی دەکرد. منداڵەکانی بە ڕاناوی تاک، واتە تۆ، گاز دەکرد. دکتۆری بە "بارین" بانگ نەدەکرد (بارین: بە زمانی ڕووسی یانی ئاغا) بەڵکو بە ناوی خۆیەوە، واتە میخائیل ئاندروفیچ-ەوە بانگی دەکرد و ناوی دەبرد. وەکو ئەوەی کارەکەی ماڵەکە نەبێت. بەهەرحاڵ کلیلی عەمار و دۆڵابی خۆراک و ژێرخانەکە بەو بوو و ئەمە خۆی لە خۆیدا ئیمتیازێکی گەورە بوو.
ئەندامانی خانەوادەی دوستویفسکی، سەعات چواری دوا نیوەڕۆ عەسرەچایان دەخواردەوە و شەویان لە دەوری مێزێکی خڕ کە بە دوو مۆمی لە پیو دروسکراو ڕوناکیان دەکردەوە، بەسەر دەبرد، شەمالکە مۆمیەکانیان بۆ بۆنە شاد و جەژنەکان هەڵدەگرت. شەونشینیانەدا باب و داکەکە و پاشان منداڵەکان، هەریەکەیان بە نۆرە مێژووی ڕووسیا، دانانی کارامزین، قەسیدە و شیعرەکانی درژاڤین و شیعرەکانی ژوکوڤسکییان بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە. هەندێجاریش ڕۆمانی "لیزای بێنەوا" یان شیعرەکانی پوشکینیان دەخوێندەوە، سەرگەڤاری خانەوادەکە، بۆ ئەو ڕۆژ و ڕۆژگارە و بەش بە حاڵی خۆی بە ڕۆشنبیرێکی تەواو عەیار دەژمێردرا و پیاو هەق بلێی دەیویست منداڵەکانی بە جۆرێ پەروەردە بکات کە ڕێز و حورمەتی ئەدەبیات و هونەر بگرن و بزانن.
هەموو شەوێک لەسەری ساعات نۆدا شیو دادەنرا. منداڵەکان هەرکە لە نانخواردن دەبوونەوە و هەڵدەستان دایک و باوکیان ماچ دەکرد و لە هەنبەر ئیکۆنەکاندا چوکیان دادەدا و نزا و نوێژی شەویان دەخوێند و پاشان

دەڕۆییشــتن بــۆ ژووره بــێ پەنــجەرەکەی خۆیــان کە کەلوپەلەکــانی نــاوی لە تاریکیەکەدا، شێوەو شــەکڵی ترســناکیان وەر دەگــرت.دەســکی موبێلەکــان، لە شێوەی داوێکی ترسناکدا، بەرەو منــداڵەکان دەکــرانەوە. پشــتی مۆبێلەکــان لە شێوەی گیانلەبەرێن زندوو و راستەقینەدا دەردەکەوتن، تەختەکانیان لێ دەبــوو بە تاپۆی جادوویی. "فیــدور" لە تــاریکی دەترســا و خــۆ میشــێلی برایشــی لەو ئازاتر نەبوو، بەڵام جووتە برا، چاویان دەپرییە ئەو شــوعلە چکۆلەیەی کە دەیــدا لە ئیکــۆنەکە و وەکــو پەپــولە بەســەریەوە بــاڵی لێــک دەدا و، زوو بەزوو خەویــان لێدەکەوت. کەیف و شــادی لە ماڵبــاتی دەسوتویفســکیدا یەجگــار کەم بــوو، لە ساڵێکدا دووجار دایەنێن منداڵەکان (ماری فیدوروفنای دایکیــان تەنیــا میشــێلی شــیردابوو)، لە گوندەکانەوە دەهاتن تا ســەری ئەو منــداڵە شــیرەخۆرانە بــدەن، کە کاتی خۆی شیریان دابوون. ئیدی ئەلیونا خەبەری بە خــانم دەدا کە (لوکریــا هاتووە) و لوکریا بە سەرپۆشێک و جووتێ پاتاوی کەتــانەوە خــۆی بە هــۆڵەکەدا دەکرد. هەر لە ئاستانەی دەرگاکەوە نیشانەی خــاچی دەکێشــا و بە ســەلاری و ســەنگینی ســڵاوی لە هەمــووان دەکــرد و ئەو کــولیچە دێهاتیــانەی کە لە بوخچەیەکی ڕەنگاورەنگییەوە پێچابوو، بەسەر منداڵەکاندا دابەش دەکرد.

بەڵام شــەوێ، بە ئەســپایی دەچــوو بــۆ ژووری منــداڵەکان کە بە تاســەوە چاوەڕوانیــان دەکــرد. لە لایــانەوە دادەنیشــت و لە تــاریکیە خەیــاڵئەنگێزەکەدا کە خــوا داینــابوو بــۆ گێڕانەوەی حیکــایەت و نەزیلەێــن ســەیر و غەریــب. ئیــدی بە دەنگی نزم حیکایەت و ســەربووری ئیڤــانی نــۆبەرەی تــزار یــان چیرۆکــی ڕدێــن شین، یان چۆلەکەی ئاگرین یان چیرۆکی (ئەلیوشــا پوپــوفیچی) بــۆ منــداڵەکان دەگێــرایەوە. ئەم ژنە بە زمــانی گونــدی کــۆن قســەی دەکــرد. بە کــاوەخۆ و بە ئــارامی قســەی دەکــرد. لە هەڕ وشــەیەکدا ســیلابی (ئــۆ)ی تیــابوایە، بە ئانقەست درێژی دەکردەوە و منداڵەکان، بە ئاو وتاو، بەدەم ترسێکی ئــاوێتە بە شـــــادییەوە، گوێیـــــان ڕادەدێـــــرا: "نەجیمـــــزادەی ڕووس لە دووریـــــانەکەدا دەســتگیرکرابوو..." دوای ئەوەی دەڕۆیــی و منــداڵەکان بەتەنیــا دەمــانەوە، لە بەینی خۆیاندا دەکەوتنە گەنگەشــە دەربــارەی بەهــرە و توانــای حیکــایەتەوانی دایەنەکانیــان و بەراوردکردنیــان: ئایــا دایەنەکەی ڤارنکــا، چیــرۆک و حیکــایەتی باشتر دەزانێ یان دایەنەکەی فیدور؟

دایک و باوکی فیدور بەدەگمەن لە ماڵەوە میوانیان ڕادەگرت. چونکە مــاجۆر بە تەبیعەت کەسێکی گۆشــەگیر و تەریــک بــوو، زۆر حەزی لە تێکەڵاوی خەڵکــی نەدەکرد و حەزی نەدەکرد شەوان درەنــگ بنوێــت، بەڵکــو بە پــێچەوانەوە حەزی دەکــرد زوو بــخەوێ. ئیــدی هەمــوو خــانەوادەکە بە چــاولێکەری ئەو، خوویــان بە گۆشەگیرییەوە گرتبوو. بەڵام سەبارەت بە شانۆ و شــانۆگەری؟ دوو ســێ جــار بە شێوەیەکی ئاوارتە و ڕیزپەڕ منداڵەکانیان بۆ شــانۆ بــرد. فیــدور، پــاش دیتنــی نمایشــی (جاکۆ) یان (مەیمــوونی بەرازیــل) چەنــدین هەفــتە هەوڵیــدا لاســایی ئەو ئەکتەرە بکاتەوە کە ڕۆڵی مەیموونی بینــی بــوو. دیتنــی شــانۆیی (دزان)ی شــیلەر، کە ماچــالوفی ئەکــتەر دەوری ســەرەکی تیــادا بینــی بــوو، خەوی لە فیدور حەرام کرد. ئەدی گەشــت و گەڕان؟ هەمــوو گەشــتەکان دەبــوایە دەگەڵ

بابی منداڵەکاندا بوایە، بۆیە سنووردار و تاقەتبەر بوو، ئیدی گەڕان و پیاسە وەکو جۆرە بێگارێک وابوو و دەبوایە ئەنجام بدرێت. لە ڕۆژانی هاویندا و، لە سەعاتێکی دیاریکراودا هەموو خێزانەکە دەچوون بۆ (چەمەنزاری مریەم) کە لە نزیکی خەستەخانەکەدا بوو. کاتێ کە بە بەردەم خەفەرەکەی پەیمانگەی ئەلکساندەردا ڕەت دەبوون، یەکێکیان پارچە دراوێکی چکۆلەی فڕێ دەدایە بەرپێی خەفەرەکە و، ئەویش بەپەلە دادەنەویەوە و بە دزییەوە هەڵیدەگرتەوە. بابیان بەدەم ڕێگاوە، قسەی زۆر بەسوودی بۆ منداڵەکانی دەربارەی بیرکاری و ئەندازە دەکرد... منداڵەکان بۆیان نەبوو بەسەر سەوزە گیاکەدا غاربدەن، چونکە منداڵی بە تەربێت و ئەدەب، بە گوتەی باوکیان، نابێ بە ڕاکردن خۆی سووک بکات. بۆیان نەبوو پەیوەندی دەگەڵ (منداڵانی نەناسراودا) بگرن. هەروەها هەندێ گەمە و یاری بێ زەرەر و زیانیشیان لێ قەدەغە بوو، وەکو سواری ئەسپ و تۆپێن و تەنس، کە بە باوەڕی بابیان، ئەمانە، یاری منداڵی بازاڕی و ڕەش و ڕووت بوون، نەک هی منداڵانی دکتۆر. ئەندامانی خێزانەکە یەک شەمووان و ڕۆژانی جەژن دەچوون بۆ کڵێسا بۆ نوێژ و نزا. ئیدی عادەت و ڕێ و ڕەسم وابوو کە لە شەوانی خۆشی و شادمانیدا یاری وەرەقیان دەکرد. منداڵە چکۆلەکان، بە بۆنەی یادی لەدایکبوونی باوکیانەوە، لەسەر کاغەزێکی لووسی جوان، بە زمانی فەرەنسی پیرۆزباییان لە بابیان دەکرد، کاغەزەکەیان بە قردێلەیەکی ئاوریشمی جوان دەبەست. پاشان چەند قەسیدەیەکی پوشکین و جوکوفسکییان کە ئەزبەریان کردبوو، یان شتێکی دیکەی سەیر کە بریتی بوو لە چەند کۆپلەیەکی داستانەوانی (هنریاد)یان، بەم بۆنەیەوە بۆ بابیان دەخوێندەوە. فیدور، کە بەتەواوەتی لە دنیای دەرەوە داپڕابوو، لەنێو جەرگەی ئەم خێڵە چکۆلە و داخراوەدا گەورە و پەروەردە دەبوو. لە دۆست و هاوڕێ، لە هەر ئەزموون و ئازادییەک بێبەش بوو. ئەم ژیانە، واتە بەسەربردنی دەورانی گەنجی لە ژینگەیەکی داخراوا، ئەم گەورەبوون و پەروەردە دەستکردە، بۆ هەتا هەتایە کاری کردە سەر ژیانی و لێی نەبووەوە. بۆیە یەکێک لە قارەمانی ڕۆمانێکی دەڵێت: "هیچ یەکێک لە ئێمە لەسەر ژیان ڕانەهاتووین." هەڵبەتە دەستویفسکی بە خۆیشی هەرگیز نەیتوانی لەگەڵ ژیاندا ڕابێت و خووی پێوەبگرێت. بەڵام ئەم قسەیە بەو مانایە نییە کە فیدور دوستویفسکی منداڵێکی خەمین و ئارام بوو. هەرچەندە تەبیعەتی خۆش و سادە بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زوو هەڵدەچوو، زۆر بە بیانوو و سەختگیر و دەسەڵاتخواز بوو. کە دەگەڵ دایک و باوکیدا وەرەقبازی دەکرد. هەرچەندە ماجور زۆر لێی تووڕە دەبوو، هەر هەوڵیدەدا گزی و فێڵ بکات. کە بە گالیسکە پیاسەیان دەکرد تووشی هەڵچوونێکی پڕ نیگەرانی دەبوو، بە بچووکترین گەشت و گەڕان دەهاتە جۆش و خرۆش و هەڵچوون. جارێک کە لە جومعە بازاڕێک دا ئەسپێک دەبینێ غاردەدا، ئەمیش دەستەسڕێک بە دەمیەوە دەگرێت و ئانیشکەکانی بە خۆوە دەچەسپێنێ و بە چاولێکەری ئەسپەکە، بە غار بە ناو باخەکە دەکەوێت و ئەوەندە غار دەدات تا لە ماندوویەتیدا لە پەلوپۆ دەکەوێت. ماری فیدوروفنا جارێک لە یەکێک لە نامەکانیا بۆ مێردەکەی

دەنووسـێت: "مـن سـەرم لە کـارە خراپەکـانی فیـدور سـوڕ نـامێنێ، چـونکە گیـانەکەم دەبـێ هەمیشـە لێـی بترسـین و چـاوەڕوانی ئەم جـۆرە کـارانەی لێبکەین." مـاجور، بە مەبەسـتی تەمێکـردن و ئامۆژگـاری کـوڕەکەی، قسـەی وایدەکرد کە بۆنی پێشبینیان لێدەهات، یەکێک لەو ئامۆژگاریانەی ئەمەیە: "ئـاخ فیـدیا، کـوڕەکەم ئاقـڵ بە، ئەم ڕەوش و ڕەفتـارەی تـۆ گرتـووتە بەر، ئەنجـام و ئـاقیبەتێکی باشـی نابێـت!... دەکـاتە کارێـک کە بە ناچـاری کاسـکێتی سـوور لەسـەر بنەیت!" هەڵبەتە فیودور ئان ئـاخری، وەختـێ لە تـاراوگە ئـازادبوو، ئەم کاسـکێتە سـوورەی، کە تـایبەت بـوو بە سـەربازانی سـادە و بـێ پـلە و پـایە، لەسـەر کرد.

بـــاخە بچکـــۆلەکەی ماڵبـــاتی دوستویڤســـکی مـــوحەجەرەیەکی لە دەورکێشـرابوو، کە لە باخە گەورەکەی خەسـتەخانەکەی جیـادەکردەوە. وێڕای هەڕەشـە و گوڕەشـەی دکتـۆر، فیـدور حەزی دەکـرد پەیوەنـدی دەگەڵ ئەو نەخۆشـانەدا بەرقەرار بکـات کە بە ڕۆبـی مەیـلەو زەرد و شـەوکڵاوی سـپییەوە بە نـاو بـاخەکەدا بە مەبەسـتی هەوا گـۆڕکێ، پیاسـەیان دەکـرد. بێـزی لەم خەڵکە ناشیرین و نەخـۆش و دەردەدارانە نەدەکـردەوە. بە پـێچەوانەوە بەزەیـی پێیاندا دەهـاتەوە، حەزی دەکـرد تێکەڵاویـان ببێـت. ئەم بـۆرژوا چکـۆلەیە، کە لە گۆشـەگیریدا دەژیا. حەزیدەکرد، هاوڕێیەتی و دۆسـتایەتی ئەو خەڵـکە بەلەنگـاز و کڵـــۆڵ و شـــەرمن و بێنەوایـــانە بکـــات. ئەم خەڵـــکەی، کە لەلایەن کـۆمەڵگەیەکەوە کە ئەو هیچـی دەربـارە نەدەزانـی، تڕۆکرابـوون، پشـت گـوێ خرابوون. ئەم قەرەبەختانە، ئەم تڵـپە فڕێـدراوانە، کە هەر یەکەیـان چیرۆکێکـی خەم ئەنگێزی هەبـوو، مـایەی بەزەیـی بـوون. جـا ئەم خەڵـکە وێڕای جیـاوازی تەمەن و پێگەی کۆمەڵایەتیان لە فیدور، بەلای فیدورەوە غەریب و نامۆ نەبـوون. کـاتێ مـاجۆر، فیـدوری بەدەم قسـەوە دەگەڵ یەکێـک لە نەخۆشـەکانی ئەم دەزگا خێرخوازییەوە غافڵگیر دەکرد، لێی توورە دەبوو و بە توندی سـەرزەنشـتی دەکرد. میشیل کە نۆبەرەی خێزانەکە، هەرچەندە زۆر خەیاڵاوی و خەیـاڵپەروەر دەهاتە بەرچاو، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی هێمن و گوێڕایەڵ بوو.

ئانـدرێ، کە بچـووکترین کـوڕی مـاڵەکە بـوو، بـابی زۆر لێـی ڕازی بـوو. بەڵام فیدور! وەکو دایـک و بـاوکی دەیـانگوت "ئاگرێـک بـوو لەو گـۆڕە". جـا دکتـۆر، بـۆ هێـورکردنەوە و دامرکانـدنەوەی هەڵچـوونی نەخۆشـانەی ئەم کـوڕە، بە دوور و درێژی باسـی ئەوەی بۆ دەکرد کە خانەوادەکەیـان چەنـد هەژار و چەنـد نەدارە. زۆر زەحـمەتە بتـوانن، کەمێـک پـارە پاشـەکەوت بـکەن و ژیـانێکی لە باریـان بـۆ دابـین بـکەن، بـۆیە دەبـێ بە گـوێرەی بەڕەی خۆیـان پـێ ڕاکێشـن و بەتەمـای شتی زۆر نەبن. دیارە ئەم تابلۆ و دیمەنە تاریـک و ڕەشـە سـەبارەت بە ئاینـدە. ترسـی دەخسـتە دڵـی منـداڵەکانەوەو دەی حەپەسـاندن. بێگومـان، ئەم جـۆرە ئامۆژگـاری و ڕێنـوێنیە تـاڵ و تاریکـانەی مـاجۆر بـوو کە ترسـی لە هەر جـۆرە کۆمەڵ و کۆمەڵگەیەک، گومان و ڕەشبینی بێ سنوور و دوودڵـی ئاشـکرای لە دڵ و دەروونی دوستویفسکی چەسپاند و تا کۆتـایی تەمەن لەگەڵیـا مـایەوە و پێوەی تلایەوە.

بابە ڕژد و پیسکەکەیان پێی دەگوتن: "چاو لە من بکەن." و غافڵ بوو لەوەی کە کوڕەکەی چەند لەوە دەترسێت کە بچێتەوە سەر ئەو! ئایا ئەو دەست بڵاویە زۆر و بێ سنوورەی دوستویفسکی پەرچەکردار نەبوو بەرانبەر بە چروکی و ڕژدییەکەی بابی. ئایا بەهۆی دڵڕەقی و زبری بابیەوە نەبوو، کە بەرانبەر بە هەر کەسێک زۆر دڵنەرم و بە سۆز و بەزەیی و لێبوردە بوو؟ دۆستویفسکی هەستی دەکرد کە هیچ خاڵێکی هاوبەشی لێکچوون لە نێوان خۆی و بابیدا نییە. ئەم باب و کوڕە نەک هەر لە ڕووی سۆز و سۆزدارییەوە خاڵی هاوبەشیان نەبوو، بەڵکو هەستی هەڤدژیی دەرهەق بە باوکی هەبوو: لێی دەترسا، هەندێجار ڕقی لێی دەبووەوە، بگرە هەندێجار هەستی بە جۆرە بێزاری و قێز و بێزێکی دەروونی و بەدەنی بەرانبەر بە بابی دەکرد. ئەوەتا لە ڕۆمانی برایانی کارامازوفدا (ئیڤان کارامازۆف) هاوار دەکات: "کێ لە ئێمە بە ئاواتی مەرگی بابیەوە نەبوو"؟ بەڵام هەندێجار هەستی ڕەحم و بەزەیی بەسەر کوڕەکەدا زاڵ دەبوو. پەشیمان دەبووەوە لەوەی کە بەم ڕادەیە لە بابیەوە، لەو کەسەوە کە هێنابویە دنیاوە، دوورە. لە نامەیەکیدا بۆ میشێلی برای دەڵێت: "چەند بەزەییم بە بابمدا دێتەوە، چەند تەبیعەت و ئەخلاقێکی سەیری هەیە!" بەڕاستی مەرگی دکتۆر جەزرەبەیەکی گەورەی لێدا، زۆری خەفەت خوارد. چونکە دڵنیابوو کە وەکو پێویست و بەڕاستی خۆشی نەویستووە.

## فەسڵی دووەم
## داروڤۆیی

لە ساڵی ١٨٣١دا موڵکی داروڤۆییان کڕی، کڕینی ئەم موڵکە جۆرە جم و جوڵێکی خستە ژیانی ئارام و مەندی خانەوادەی دوستویفسکییەوە. (ماری فیودورفنا) لەگەڵ هەوەڵین ڕۆژانی بەهاردا دەگەڵ منداڵەکاندا دەڕۆیی بۆ گوند، بەڵام ماجۆر، بەهۆی کار و دەوامەوە، ناچار لە شار دەمایەوە، تەنیا لە مانگی تەمووزدا، دەچووە سەردانی ماڵ و منداڵەکەی و سەردان و دیدارەکەشی هەرگیز لە چل و هەشت سەعات تێنەدەپەڕی: مۆڵەتەکەی هەر ئەوەندە بوو.
سەفەرەکە، کە دوو سێ ڕۆژی دەخایاند، بۆ منداڵەکان یەجگار خۆشبوو، هەمان کاریگەری ئەفسوونی هەبوو. ئەو جووتیارە کۆیلەیەی (سیرف: بەو دەستە وەرزێرە ڕووسانە دەگوترا کە بە زەویەکەوە، دەکڕدران و دەفرۆشران) کە نێوی (سیمون شیرۆکی) بوو، بەو ئەسپانەوە کە بۆ کێڵانی موڵکەکە بە کار دەبران، لە گوندەوە دەهات بە شوێنیاندا. عەرەبانە کۆنەکەیان لە جانتا و بوخچەو پریاسکان پڕدەکرد و (فیدیا) لە تەنیشت عەرەبانچیەکەوە، لەسەر کورسیەکە دادەنیشت، هەنگێ عەرەبانەکە، بە ئەسپایی و بە یورغە دەکەوتە ڕێ. لە شار دەردەچوون، دەکەوتنە سەر ڕێگەیەکی پڕ کەند و کۆسپ و کڵۆ کەستەکان و شەقار شەقار، کە بەناو مەزرایەکی شۆڤاندا بە

نزیکـی دار بەتـولایەکی، گەڵا زیـوینی وردا و، بەلای کەپـرو کـوختەیەک دا، کە سـەرەکەی بە هەژک و بـژاڵ و چـڵ و چێـوان گیرابـوو و، نەردەوانێکـی داری لە بەردەمـا بـوو، دەڕۆیشـتن. منـداڵێکی پـێ پەتـی بە تـوێی کراسـێک، دەسـتی بەرزکردبـووەوە و بە دەنگـی بەرز شـتێکی نـامەفهوومی دەگـوت، کە پێـدەچوو سـڵاو لە سەرنشـینانی عەرەبـانەکە بکـات. هەر هەمـوو ئەم دیمەنـانە بە کەناری جادەکەدا تێدەپەڕین و بۆنی خاک و خـۆڵ و پەیـن و زڕ و زبـڵ و پـارچە و پەڕۆ کۆن و ڕزیـو لە ڕاسـت و چەپـی جـادەکەوە، بە کەپووانـدا دەهـات. سـمی ئەسپەکان دەنگێکی سـەیریان لێـوە دەهـات، وەکـو دەنگـی چەقەنە بـوو کە بە زمان لێ بدرێ. چەرخی گالیسکەکە جیڕە جیڕیـان لێـوە دەهـات. زەنگوڵەکـان دەزرینگانەوە. فیدیا، لە سـیمون دەپاڕایەوە کە هەوسـاری ئەسـپەکانی بـداتە دەست. دەی ئاوا باشە؟

لەیەکەم قۆناغـدا، فیـدور، لەسـەر کورسـیەکە و لە شـوێنی عەرەبـانچیەکە هەڵدەسـتا، خـۆی هەڵـدەدایە خـوارەوە، چـاوی بە شـوێنەکەدا دەگێـڕا، پێڵاوەکـانی لەنێـو گیـایە شـێدارەکەدا تەڕدەبـوون، سـەرەنجام پـاش ئەوەی بە هەوای ئازاد مەست دەبوو، شـاد و بێ حەوسـەڵە، دەگەڕایەوە، سـەردەکەوتە سەر عەرەبانەکە، شریخەی لە قـامچیەکەی دەسـتی هەڵدەسـتان و دووبـارە بە خۆ و عەرەبانەکەوە دەکەوتنەوە ڕێ.

خانووەکەی (داروڤویی) یان بینایەکی پەرپووت بوو، بریتی بوو لە سێ هـۆدە، دیوارەکانی لەوحە دار بوو، کە قسڵیان تێ هەڵسووبوون. سـەریان بە هەژگ و بـژاڵ و چـڵ و چێـوان گرتبـوو، درەختـانی زەیزەفـۆنی زەلامـی سـەدە سـاڵە، سێبەریان لەم خانووە دەکرد. لەودیو ڕیـزە درەختەکـانی بەرانـبەر ئەم خـانووەوە کێڵگە وسەوزەزارێکی بچووک هەبـوو کە تـا قەراغ شـیوەکە دەهـات و لە دوای ئەوەوە جەنگەڵـی دار بەتـولان دەسـتی پێـدەکرد. کـاتێ خۆرئـاوا دەبـوو، ئەم جەنـگەڵ و بێشـەیە زۆر تاریـک و ترسـناک دەبـوو، دەیـانگوت پردەبێـت لە گیانلەبەرانی ترسناکی وەکو گورگ و مـار و ئەژدیهـا و، ئەمە هـۆش و خەیـاڵی منداڵەکانی دەهاڕوژاند و هەسـتی کونجکاویـانی دەجوڵانـد. بەتـایبەتی فیـدور کە منـداڵێکی ڕیسـکباز بـوو و حەزی دەکـرد بە دزیـیەوە خـۆی بەم جەنـگەڵەدا بکات. بۆیە ئەم جەنگەڵەیان ناونا: "بێشەی فیدیا."

ئەم مـوڵکە، بـاخێکی سەوزەواتیشـی تیـابوو. پاشـان دایـک و بـابی دۆستویفسکی ڕایان سپارد کە ئەستێڵێکیش لە نزیکی ماڵەکەیانەوە دروسـت بکەن. ئەوەبـوو میخائیـل ئانـدریڤیچ، یەک بەرمیـل ماسـی زنـدووی لە مۆسـکۆ نـارد تـا بیـانخەنە ئەسـتێڵەکەوە. دوای مـاوەیەک کەشیشـێک، کە کۆمەڵێـک قەشەی هەڵگری ئیکـۆنە و لافیـتەی پیـرۆزی دوای خـۆی خسـتبوو، هـات، بە دەوری ئەستێڵەکەدا سوڕایەوە و دوعای موبارەک بایی بە سەرا خوێند.

حاڵی حازر (واتە کاتی نووسینی دەقـی فەرەنسـی ئەم کتێـبە، ١٩٦٠) دار و درەختانی ئەو بێشەیە پرواوەتەوە و شوێنی ئەستێڵەکە کە وشـک کـراوەتەوە، کراوە بە کەلەرم. خانوویەکی تازە و پاک و خاوێن، بـێ هـیچ نـاوێکی تـایبەتی، لە جێگای خـانووەکەی بنەمـاڵەی دوسـتویڤسـکی دروسـتکراوە. بەڵام هەردوو

گوندی (داروڤویی) و (چیرماچنی) تا ئێستاش هەمان دیمەن و ڕواڵەتی کۆنی سەد ساڵەی خۆیان پاراستووە: هەندێ ئاوەدانی و کێڵگەی بچووک هەن، نزیکەی بیست کوختەیەک دەبن، کە سەرەکانیان بە هەژگ و بژاڵان گیراوە، باران دەیانشواتەوە و هەتاو وشکیان دەکاتەوە، کۆمەڵێک فەلاحی بێسەواد و تەمەڵ و بەدبەخت، بەڵام کارامە لە فەند و فێڵی ئەسپ دزی دا، لەو کوختانەدا دەژین، ژیانێکی سادە و سەرەتایی ئەوتۆ. لە تۆ وایە چەرخی ڕۆژگار بە سەدان ساڵ بۆ دواوە گەڕاوەتەوە.

ماری، هەموو وەرزی هاوینی لە (داروڤویی) بەسەردەبرد. لەم ماوەیەدا دەکەوتە پەلەوەرداری و سەوزە ڕواندن، چاندنی گەنم و جۆ و، پەتاتە و کەتان. ئەم ژنە ئازا و بە باشارە، بەوپەڕی دڵسۆزی و دڵپاکی بۆ مێردەکەی دەنووسی:

"مسکێنەکانمان، هەموویان باشن، ساغ و سەلامەتن. تەنیا چەند مسکێنێکی خانەوادەی فیدور نەبێت کە گەیینە حاڵی مردن. ئێستا شوکر باشترن. تەنیا سیانیان هێشتا دەتوانن کاری فەلاحەتی بکەن. حەیوانەکانیشمان لە خوا بەزیاد بێ باشن" لە نامەیەکی دیکەدا دەنووسێت: "خواوەند کوڕ و کچێکی مسکێنی پێ بەخشیوم. نیکیتا کوڕێکی بووە ناوی ناوە ئیگور و، فیدوت کچێکی بووە نێوی ناوە (لوکیریا). مالۆسەکە بە سکێ پێنج بێچووی بووە. مراویەکە بە ئارامی لەسەر هێلکەکانی کەوتووە، بەڵام قازەکان هیچیان پێ نییە."

لەو کاتانەدا کە دایکەکە بە کاروباری ماڵەوە سەرقاڵ دەبوو و بە وردی چاودێری سەلامەتی حەیوانەکان و مسکێن و فەلاحەکانی خۆی دەکرد، منداڵەکانی ماڵباتی دوستویفسکی بەوپەڕی تاسەمەندی و تامەزرۆییەوە، مومارەسەی ئەم ئازادیە تازەیەی خۆیان دەکرد و ئەوپەڕی لەزەتیان لێدەبینی و هەموو جۆرە یارییەکیان دەکرد، جا چ جۆرە یارییەک! لاسایی هۆڤیانیان دەکردەوە، کە ئەمەیان داهێنانی فیدیا بوو. منداڵەکان لەژێر دار زەیزەفۆنەکاندا، کوختەیەکیان دروستدەکرد، خۆیان ڕووت دەکردەوە، لەشی خۆیان بە جۆرەها ڕەنگ، دەڕەنگاند، بە چڵ و گەڵای درەختان و پەڕی قاز سەکڵاویان دروست دەکرد و لەسەریان دەنا. ئەوسا تیروکەوان بەدەست، هێرشیان بۆ بێشەی دار بەتولاکان دەبرد، کە کوڕان و کچانی گوندەکە، لەوێدا سەنگەریان گرتبوو. کوڕەکانیان بەدیل دەگرت و دەیان هێنان بۆ ناو کوختەکە و بەریان نەدەدان، تا غەرامەیەکی زۆریان لە هەنبەرا، وەرنەگرتبا. یارییەکەی دیکەیان کە ئەویشیان هەر لە داهێنانی فیدیا بوو، یاری ڕۆبنسون بوو. پاشان منداڵەکان هات بە سەریاندا کە لە ئەستێڵەکەدا مەلە بکەن. مسکێنەکان، ئەو جووتیارە کۆیلانەی لە مۆڵکەکەدا کاریان دەکرد، ئەم منداڵە شاریانەیان زۆر خۆشدەویست، بەتایبەتی فیدور کە ڕۆژ تا ئێوارێ بە کێڵگەکاندا دەسووڕایەوە و بە کونجکاوی دەیڕوانیە کاری جووتیارە ڕیشن و چڵکن و پڵکنەکان، دەیڕوانیە چاوانیان کە لە چاوی منداڵ دەچوون، سەیری دەستە قورس و پتەو و زبرەکانیانی دەکرد و لە پرسیاری دەگرتن. داوای لێدەکردن ڕێگەی بدەن ئەو

ئەسپانە پڕانێ کە لە خرماشە و هەوجاڕان بەسترابوون، یان داسەکانیان بەکاربێنێ. ڕۆژێک لە کاتی دروێنەدا، ژنە فەلاحێکی بینی، کە گۆزە ئاوەکەی قڵپەوە بوو و ئاوەکەی ڕژا و چونکە منداڵە ساواکەی تینوو بوو و ئەگەری ئەوە هەبوو گەرما بیبات، لە تاوا کەوتە گریە و زاری و گلەیی لە بەخت و ناوچەوانی ڕەشی خۆی. فیدور کە چاوی بەو ژنە کەوت، بەزەیی پێدا هاتەوە و نزیکەی دوو کیلومەتران بە پێیان ڕۆیی بۆ گوند تا ئاوی بۆ بێنێ.

ئەم جووتیارە سادە و ساکارانە. ئەو وەرزێرە ساویلکە و گەوجانە، وەکو نەخۆشەکانی، نەخۆشخانەی ماری، سەرنجی فیدوریان ڕادەکێشا. هەستی دەکرد زۆر لێیانەوە نزیکە، زۆر خاکیانە و خۆمانە بەرخورد و مامەڵەی دەگەڵدا دەکردن. بە شادییەکی زۆرەوە، میللەتی ڕووسی، کە خەڵکێکی سادە و ساویلکە و بە ژمارە زۆر بوون، کەشف دەکرد و دەیناسین و بە درێژایی ژیانی خۆشەویستی و مەیلی ئەم میللەتەی دانەنا. بەدرێژایی ژیانی خۆی، هەرکاتێک بیویستایە باوەڕی خۆی بە ئەرک و پەیامی پیرۆزی ڕووسیا لە جیهاندا، دەمەزەرد بکاتەوە، ڕووی دەکردەوە ناو ئەم خەڵکە ڕەش و ڕووتە نە بۆ ناو چینی ئەرستۆکراتی لووتبەرز و فڕناخ، یان فەرمانبەرانی هەڵگری میداڵ و نیشانان. ڕووی دەکردە ئەم خەڵکە ڕەش و ڕووتە، ئەم خەڵکە سەروسیما چڵکنە، ئەم خەڵکە ماندووە. کە لەژێر باری ژیاندا پشتیان چەمابوو، ڕووی دەکردە ئەم نیگایانەی کە جگە لە سۆز و میهر، هیچ شتێکی دیکەیان تیا بەدی نەدەکرا. تەنانەت ئەو کاتانەش کە لە تاراوگە و بێگارەزندان دەژیا و تەنیایی و نائومێدی بەرۆکی گرتبوو، یەکەمجار بە یادی ئەم خەڵکەوە، ورەی خۆی بەرز کردەوە لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەو مانگەم ، واتە مانگی ئابم بیر کەوتەوە کە لە گوند بووم. هەواکەی وشک و دنیا خۆش بوو، بەڵام تۆزێک سارد بوو، چونکە بایەکی بە قوەتی دەهات. هاوین ڕوو لە کۆتایی بوو، دەبوایە بەو زوانە بۆ شار، بۆ مۆسکۆ بگەڕێینەوە و دیسان هەموو زستانەکە بە بێزاری و بێتاقەتی بە خوێندنی زمانی فەرەنسییەوە بەرینە سەر. کە بیرم لەوە دەکردەوە دەبێ گوند و کێڵگەکە بەجێ بێڵم، دڵم دەگوشرا."

بەناو جەنگەڵەکە دەکەوت، بەڕاست و بە چەپدا، شولکی لە دار بندوقەکان دەکردەوە و دەیتاشین تا ڕاوە قورباقەی پێبکات. لێرەوارەکەی دەوروبەری کڕوکپ و بێدەنگ بوو. قومقومۆکی بۆر بەڵەک، بە بەر هەتاوەکەیا، تاویان دەدا و بە هەشتاو خۆیان بە بەینی بەردی سەر تولە ڕێگاکاندا دەکرد. خاڵخاڵۆکان، خۆیان بە گەڵای لقە نزمەکانی درەختەکانەوە هەڵدەواسی. هەوا بۆنی کارگ و تۆێکڵە دار و درەخت و گیای ڕزیوی لێدەهات. لەپڕ هاوارێکی ترسناک بەرزدەبێتەوە: "ئەهای گورگ!" منداڵەکان بەدەم هاوارەوە هەڵدێن، لە چوغووردی دارستانەکە تێدەپەڕن و دەگەنە ڕووتەنێک، کە جووتیارێک لەوێندەر خەریکی جووت کردنە. دۆستۆیڤسکی لەمبارەیەوە دەنووسیت: "ئەم فەلاحە "ماریی" مسکێنی خۆمان بوو. کابرایەکی پەنجا ساڵەی، تۆکمەی بە دار و بار بوو، باڵابەرزێکی ڕیشنی، ڕدێن سووربوو، کە تاک و تەرا داوی سپی کەوتبوونە ڕدێنی. هەرچەندە قەت قسەم لەگەڵدا نەکردبوو، بەڵام دەمناسی.

کە گـوێی لە هـاوارەکەم بـوو مـاینەکەی ڕاگـرت. هەر کە گەیـیمە ئاسـتی بە دەسـتێک دەستە دووی هەوجاڕەکەم گـرت و بە دەسـتەکەی دیـکەم، سـەری قـۆڵیم ڕاکێشـا. یەکسـەر هەسـتی بەوەکـرد کە زۆر ترسـاوم. بەدەم هـانکە هانکەوە، لێکدالێکدا دووبارەم دەکردەوە: "گورگ، گورگ"
"ماریی" سەری بەرزکردەوە و بەیێموبالاتی ڕوانیە دەوروبەر و دیاربوو باوەڕی بە قسەکەی من هات، گوتی:
- کوا گورگ، لە کوێیە؟
لەبن لێوانەوە گوتم:
- نازانم، گوێم لە یەکێک بوو، هاواری کرد: "گورگ"
جووتیارەکە بۆ ئەوەی من هێور بکاتەوە، بە دەنگێکی نەرم و نیان گوتی:
- نە بابە! گورگی چی، تۆ وات وێناکردووە. گورگ لێرە چی دەکات، چ کاری لێرەیە.
" لە کاتێک دا سەراپام لە ترسا دەلەرزی، زیاتر خۆم بە قۆڵی کراسەکەیەوە دەچەسپاند، پێموایە لەوکاتەدا ڕەنگم تەواو پەڕی بوو. ئەو سەری لەقاند و گوتی:
- ئاهـ! تۆ چەند دەترسیت، ئای ئای! تەواو گیانە، تەواو هیچ نییە. تەمەشای بکەن بزانن چەند ئازایە!
لەپڕ، دەستی هێنا و دەموچاوی نەوزاشت دام و گوتی.
- دەی تەواو گـوێی مەدەیە، مەسـیح ئاگـادارت بـێ، دەی نیشـانەی خـاچ بکێشە.
بەڵام مـن نیشـانەی خـاچم نەکێشـا. لێـوم نـابوونە سـەر یەک و لێکـدی نەدەبـوونەوە. ئەو هەسـتیکرد، قـامکە ئەسـتوورە نینـۆک ڕەشـەکەی، کە یەکپـارچە خـۆڵ و گـڵ بـوو، خسـتە سـەر لێـوە داخراوەکـانم. جـا ئێسـتا دوای بیست دانە ساڵ، مـن لە سـیبریادا لەناکـاوا، ئەو بەرخـوردەم، وەکـو خـۆی، بە هەمـوو وردەکـارییەکیەوە بیـر دەکەوێـتەوە. بـزە میهرەبـان و دایکـانەکەی ئەو جووتیـارە بێـنەوایە، کە سـیرف و مسـکێنی ئـێمە بـوو، لەبەرچـاوم بەرجەسـتە دەبێت. ئێستاش لەبیرمە چۆن سەری دەلەقاند و نیشانەی خـاچی دەکێشـا و دەیگـوت: "چەنـد ترسـاویت چکـۆلە گیـان!" بەتـایبەتی ئەو قـامکە پـیس و خۆڵاوییەی کە بە ترسێکی شەرمامێزەوە نابوویە سـەر دەمە چکـۆلەکەی مـن. لەپڕ لە تەختە خەوە شەق و شـڕەکەی خـۆم دوور دەکەومەوە، تەمەشـایەکی دەوروبەر دەکەم، هەسـت دەکەم دەتـوانم ئەم بەلەنگـاز و هەژارانە بە شـێوەیەکی دی بێـنمە بەرچـاوی خـۆم و ئەم حـاڵەت و بیرکـردنەوەیە، لەناکـاوا شادی و خۆشییەکی ئەوتـۆم پێدەبەخشـێت کە هەر جـۆرە ڕق و کیـنەیەک لە دڵمدا دەسڕێتەوە"
دۆستویفسکی، لە هەر ئەزموونێکی تازەدا، لە هەر قۆناغێکی تازەی گومانی مەزەبی و ئاینیدا، پەنای بۆ ئەم جووتیارە دەبرد و خۆزیای بە ژیانی سادە و نەگۆڕی ئەو، بە ورەی سادە و مەندی ئەو، دەخواست و تێر دەگریا. جووتیارەکە بە دەنگییەوە دەهات، دەیگوت: "وەرە، وەرە، گورگ نییە، خەمت

نەبێ نایەڵم گورگ بتخوات، نایەڵم بتکات بە تێشوو... دوعا دەکەم کە مەسیح بە هاناتەوە بێت."
"ماریی" جووتیارێکی خەڵکی گوندی "داروفویی" بوو. جووتیارێکی کۆیلە (موجیک) بوو، ئەسپناسێکی زۆر کارامە بوو، (ماریا فیدوروفنا) ڕێزی تایبەتی دەگرت و زۆری متمانە پێی هەبوو، تەنانەت چاوپۆشی لە جنێو و قسە ناشیرینەکانی دەکرد. دۆستۆیفسکی لە (داروڤویی)دا "سمیردیاشایا" دەناسێت، ئەو کیژەی کە لە ڕۆمانی برایانی کارامازوفدا کراوە بە کاراکتەر. ئەم کیژە لە گوندی (داروڤویی)دا ناوی ئاگافیا بوو، بە کچێکی شێتۆکە و گێلۆکە ناسرابوو،ساڵ دوازدەی مانگ بە تۆی کراسێک لە کوچە و کۆڵانەکاندا دەسوڕایەوە و شەوان لە گۆڕستاندا دەخەوت. باسی گوندی (چیرماچینی)ش لە هەمان ڕۆماندا کراوە. بەڵام (ئەلیونا فرولوڤنا) دۆستویفسکی لە ڕۆمانی ئەهریمەنانددا ناوی جاویدان کردووە. هەڵبەتە ئەم ئەلیونا بوێر و ئازایە، شایستەی ئەو پاداشتە بوو، ڕۆژێک لە مۆسکۆ، ئەو کاتە دوستویفسکی تەمەنی نۆ ساڵان دەبێت، لەپڕ دەرگای هۆڵەکە دەکرێتەوە. گریگۆری لە ئاستانەی دەرگاکەدا دەردەکەوێت، یەکسەر لە گوندەوە هاتبوو. دۆستویفسکی لەو بارەیەوە دەنووسێت: "ئێمە لەجیاتی پێشکارە پۆشتە و پەرداخە قەڵەوەکەی جاران کە جلی ستایلی ئەڵمانی لەبەردەکرد، پیاوێکمان بینی بە کراسێکی کۆن و جووتێ پێڵاوی کەتانەوە. باوکم بە ترسەوە هاواری لێکرد:
- ها، چی بووە؟
گریگۆری بە دەنگێکی گیراوەوە گوتی:
- موڵکەکە سووتا.
ئاگر بەربووبووە کوختە دارینەکان، حەیوانەکان و عەماری بەروبوومان و هەر هەمووی سووتابوو. تەنانەت (بابا ئەرخیب)ش سوتابوو و مردبوو. لە سەرەتاوە وامان وێناکرد کە هەموو شتێک سوتاوە و هیچ شتێکمان بۆ دەرنەچووە. هەموو خێزانەکە کەوتنە سەر چۆکان و کەوتنە نزا و دوعا. ماری فیدوروفنا، بە کوڵ دەگریا. هەنگێ ئەلیونا فرولوفنا چوو بەلای مارییەوە، دەستی دا بە شانیا و گوتی: "ئەگەر پێویستتان بە پارەیە، پارەکەی من بەرن." تومەز پێنج سەد ڕۆبڵی پاشەکەوت کردبوو. خۆشبەختانە، زەرەرەکە، بەبێ ئەوەی پێویست بە پارەکەی ئەلیوناى کارەکەری ماڵەکە بێت، پڕکرایەوە و موڵکەکە ئاوەدان کرایەوە. بەڵام ئەم بیرەوەرییە، وەکو بیرەوەرییەکەی ماریی موجیک، هەرگیز لە هزر و بیر و زەینی دوستویفسکی نەسڕدرایەوە، کە پاشان لەو بارەیەوە دەڵێت: "میللەتی ڕووس لەبەر ڕۆشنایی ئەو کارە هەڵە و خراپانەی کە زۆرجار دەیکەن هەڵمەسەنگێنن، بەڵکو لەبەر ڕۆشنایی ئەو کارە گەورە و پیرۆزانە هەڵی بسەنگێنن کە لە جەرگەی جەهالەت و نەزانی خۆیانەوە، دڵیان پێوەیەتی و حەزدەکەن بیکەن، ئەو کارانەن کە وەکو چرا ڕێگا بۆ ئێمە ڕوناک دەکەنەوە."

## فەسڵی سێیەم
### دەرسی یەکەمین،
### یەکەمین ماتەم

برایانی دوستوفسکی زۆر زوو خرانە بەر خوێندن و فێرکردن. ماری فیدوروفنا ئەرکی فێرکردنی فیدوری گرتە ئەستۆ. ماری بە گوێرەی ڕێبازی کۆن ئەلفبای بە فیدور دەگوتەوە. بە فۆنەتیکی سلاڤی پیتەکانی پێ دەگوتەوە. Az، Bauqui، Vede(a,b,v،) فیودور کە هێشتا چوار ساڵان بوو، کە گوێی لەم سیلابە سەیرو سەمەرانە دەبوو، سەرەگێژەکەی پێدەکەوت. یەکەمین دەقی خوێندنەوە، بریتی بوو لە سەد و چوار چیرۆکەکەی تەورات و ئینجیل، وێنە خراپەکانی، چاپی بەردینی کتێبەکە، چیرۆکی خەلقی جیهان، ئادەم و حەوا لە بەهەشت و، چیرۆکی تۆفانی... نیشاندەدا.

دۆستویفسکی، لە ساڵی ١٨٧٠ دا، کە هەنگێ تەمەنی گەیی بووە چلو نۆ ساڵان، کتێبێکی هاوشێوەی ئەو کتێبەی بەدەست کەوت کە لە منداڵیدا دەیخوێندو، وەکو شتێکی پیرۆز و گرانبەها لە کتێبخانەکەی خۆیدا هەڵیگرت و پاراستی.

کاتێ منداڵەکان کەوتنە ئەوەی بە باشی چیرۆکەکانی تەورات و ئینجیل بە باشی بخوێننەوە.باوکیان، مامۆستایەکی ڕۆشنبیری بۆ هێنانە ماڵەوە تا مێژووی پیرۆزیان فێربکات و پێ بڵێتەوە. ئەم پیاوە یەکێک بوو لە مامۆستایانی پەیمانگەی (کاترین)، پیاوێکی هێندە تەڕفام و بە زمان بوو، کە دەکەوتە قسان، بە فەساحەت و بەلاغەتی خۆی، هەموو ئەندامانی ماڵباتەکەی ئەفسوون دەکرد. ماری فیدوروفنا زۆرجار دەستی لە کاروباری ناو ماڵ هەڵدەگرت ودەچوو تا گوێ لە مامۆستاکە بگرێت کە بە ئاو و تاو باسی لەدایک بوون، ڕەنج و عەزاب و، مەرگی مەسیحی بۆ منداڵەکان دەگێڕایەوە. سەیری دەکرد، منداڵەکان کڕوکپ. ئانیشکیان ناوەتە سەر مێزەکە و ڕوومەتیان لەنێو دەستیان ناوە و پرشنگی سەرسامی لەچاویان دەبێتەوە. ئیدی ئەویش لە لەزەتی قسەکانی مامۆستا بێ بەهرە نەدەبوو.

دوای ئەوە مامۆستایەکی دیکەیان هێنا تا هەندێک بابەتی سەرەتایی دەربارەی زمان و ڕۆشنبیری فەرەنسی بە منداڵانی ماڵباتی دوستویفسکی بڵێتەوە. ئەم مامۆستایە بە ڕەگەز فەڕەنسی بوو و ناوی (سوشار) بوو، بەڵام داوای لە تزار کردبوو. کە ناوەکەی بۆ بگۆڕن بە ناوێکی ڕووسی. ئیدی بەمجۆرە ناوی بوو بە (دراشۆسۆف) ئەوەبوو پاشان منداڵەکان لەلای ئەم دراسوشوفە بە شێوەی نیمچە ناوخۆیی نرانە بەر خوێندن.

دراشوسوف، پیاوێکی ساویلکە، قەڵەو، کورتەباڵا و کەم سیوات بوو، هەندێ پیتی بە قورسی دەدرکاند، بۆنموونە ئاڕی وەک (غ) دەدرکاند. دراشوسوف، دەرسی فەرەنسی پێدەگوتنەوە، دوو کورەکەی دراسوشوف، دەرسی

بیرکاری و خوێندنەوەی سلاقیان پێدەگوتنەوە، ژنەکەشی باقی بابەتەکانی دیکەی پێدەگوتنەوە.
بەڵام لەم قوتابخانە و پەیمانگا بچووکدا، چ کەسێک زمانی لاتینی نەدەزانی. بۆیە ئەم ئەرکە خرایە ئەستۆی باوکی برایانی دوستویفسکی کە دەرسی زمانی لاتینی بە منداڵەکانی بڵێتەوە. ئیدی ماجۆر هەموو شەوێک منداڵەکانی لە دەوری خۆی کۆدەکردنەوەو ئیدی منداڵەکان دەکەوتنە عەزاب و ئەشکەنجەوە. بابیان، مامۆستایەکی ترسناک بوو. ئیدی لەبەردەم منداڵەکاندا، غەریزەی حوکمڕانی و ڕابەرایەتی دەکرایەوە. نەک هەر لە کاتی وانەکەدا، کە پتر لە سەعاتێکی دەخایاند، مۆڵەتی دانیشتنی بە منداڵەکان نەدەدا، بەڵکو ئەگەر یەکێک لە منداڵەکان، ماندوو بوایە و ئانیشکی نابایە سەر شتێک، یەکسەر وەکو هەورەگرمە، بەسەریا دەتەقییەوە و سەرکۆنەی دەکرد. ئیدی منداڵەکان، ناچار، لە حاڵێکا لە شەکەتیدا گۆت بووبوون و پشتیان دانەواندبوو و لە ترسا هەڵدەلەرزین، جووڵەیان لە خۆ دەربڕی و بەو دەقەوە، ڕاست یان غەڵەت فرمانە لاتینییەکانیان گەردان دەکرد: "mensa,mensae,amo,amas,amat" لەگەڵ بچووکترین هەڵەدا، بابیان هاواری دەکرد. بە مست دەیکێشا بەسەر مێزەکەدا. کتێبی دەستووری زمانی لاتینی دادەخرا، کاغەزەکان بەملا و بەولادا تووڕ دەدران، دەرگاکە توند بە یەکا دەدار و مامۆستاکە (باوکیان) دەتۆرا و دەڕۆیی. منداڵەکان گوێیان لە دەنگی هەنگاوەکانی دەبوو کە دوور دەکەوتەوە. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ئەم مامۆستایە(ماجۆر) قوتابییەکانی ناچار نەدەکرد کە لەسەر ئەرزەکە بە چۆکا بێن، یان بۆ ماوەیەکی زۆر لە سووچێکی ژوورەکەدا بە پێوە ڕایانبگرێت.

داک و بابی منداڵەکان، هەرگیز ڕازی نەبوون، منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانەی گیمناز، کە بە گوێرەی قانون، سزای بەدەنی قوتابیانی تێدا دەدرا. بۆیە گەلێک لە خانەوادەکان حەزیان دەکرد منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانەی تایبەتی. ئەوەبوو برایانی دوستویفسکی ،میشیل و فیدور، لە ساڵی ١٨٣٤دا لە قوتابخانەی تایبەتی چیرماک، هەرچەندە پارەکەی زۆر بوو، بەڵام شوێنێکی باش و مایەی ڕەزامەندی خەڵکی بوو،وەرگیران. چیرماک، مامۆستا و پەروەردەکارێکی باش و شایستە بوو، پیاوێکی نەجیب و دڵسۆز بوو، هەرچەندە کەم سیوات بوو، بەڵام توانی بووی کۆمەڵێک مامۆستای بژاردە و بەتوانا بۆ خۆی فەراهەم بکات. قوتابخانەکە، هاماجێکی خانەوادەیی و زۆر سادە و خۆش و دڵگیری هەبوو.

قوتابیانی شەوانە ڕۆژی، لەسەر هەمان مێز و خوانی ، کە خاوخێزانی چیرماک، نایان لەسەر دەخوارد، کۆدەبوونەوە و نانیان دەخوارد. خۆ ئەگەر قوتابیەک، شوێنێکی بریندار بوایە، برینەکەی سووک بوایە مەدام چیرماک، بە دەستی خۆی تیماری دەکرد. خۆ ئەگەر قوتابیەک شایستەی ئافەرین و هاندان و پاداشت بوایە، ئاغای چیرماک، بانگی دەکرد بۆ ئۆفیسەکەی خۆی و وەکو خەڵات نوقڵێک یان نەباتێکی دەدایە. هەڵبەتە قوتابیانی پۆلە باڵاکانیش،

ئەم خەڵات و پاداشتەیان، بە هەمان خۆشی و شادی قوتابیانی چکۆلەی سەرەتاییەوە وەردەگرت. هەموو شەموانێک میشێل و فیدور بۆ ماڵی خۆیان دەگەڕانەوە. کە نان و خوانێکی شاهانەی تایبەت بە ڕۆژانی جەژن، لە پێشوازیاندا بوو. هەڵبەتە ئەم خوان و زیافەتە نان و خواردنی دڵخوازی ئەوانیشی لە خۆ دەگرت. بەڵام پێش ئەوەی دەست بە نانخواردن بکەن، بە دوور و درێژی باسی ژیانی تازەی خۆیان دەگێڕایەوە، ئەو نمرانەی کە وەریان گرتبوو، ئەو ئەرکانەی کە دەبوا جێبەجێی بکەن، ئەو لاسارییانەی کە هاوڕێ و هاوپۆلەکانیان کردبوویان، هەموو ئەوانەیان دەگێڕایەوە. ماجۆر، کە ڕێگەی بچووکترین لاساریی و چاوقایمی بەرانبەر بە خۆی نەدەدا، کە گوێی لە حیکایەتی کوڕەکانی خۆی دەربارەی ڕەفتار و لاساریی و شەیتەنەتی منداڵە مەکتەبلیەکان دەبوو، زۆر خۆشحاڵ دەبوو. ئایا هۆی ئەم شادییەی ئەوەبوو کە هەستی بە جۆرە تۆڵەیەکی بەدخوایانە لە خەڵکی دەکرد؟ ئایا لەو ڕوانگەیەوە گلەیی لەو قوتابی و خوێندکارە لاسارانە دەکرد، تا هەستی گوێڕایەڵی لای منداڵەکانی خۆی بێدار بکاتەوە؟ بەهەرحاڵ، بابیان بە ڕەزامەندی و شادی ئاشکراوە، لەبن لێوانەوە دەیگوت: "ئەی گلاراوانی بەرەڵا! ئەی ڕێگرانی چکۆلە، ئەی هەرزەوێڵانی بچووک"

منداڵەکان، پاش ئەوەی شیویان دەخوارد، بەناو کتێبەکانیان دەکەوتن و دەستیان بە خوێندنەوە دەکرد. هەرچیەکیان بەر دەست بکەوتایە بە جۆش و خرۆشەوە دەیانخوێندەوە. سەرچاوەی خۆراکی ڕۆشنبیری و فیکریان لە سەرەتاوە بریتی بوو لە هەندێ بلاڤۆکی مانگانە بە ناوی (مەکتەبی خوێندنەوە) ئەم بلاڤۆکانە، بریتی بوون لە نامیلکەی چکۆلە، مانگانە دەردەچوون، بەرگی هەر ژمارەیەکی، بە ڕەنگێکی جیاواز چاپ دەکرا. بەڵام فیدور، سەرباری ئەو بڵاڤۆکانەش، زیاتر ئاشقی هەردوو ڕۆمانی مێژوویی (واڤیرلی) و (کانتان دور وارد) نووسەری بەناوبانگی بریتانی : "سیر والتەر سکۆت ١٧٧١ – ١٨٣٢" بوو، کە ڕۆمانی یەکەمی لە ساڵی ١٨١٤ و دووەمیانی لە ساڵی ١٨٢٨دا نووسی بوون. هەروەها حەزی لە خوێندنەوەی سەفەرنامان بوو. خەوی بە سەفەری ڤینیسیا یان قەستەنتینیەوە دەبینی. خەوی بە لێبوردەیی ڕۆژهەڵاتی و بە سەرکێشی و وڵاتگیری مەترسیدار و فیداکاری مەردانە و پاڵەوانانەوە دەبینی، بە جۆش وخرۆش و تاسەمەندییەوە و بەبێ جیاوازی کار و بەرهەمەکانی: والتەر سکوت، دیکنز، جورج ساند و هۆگۆی دەخوێندەوە، هەرسی دەکردن و لە بەینی هەردوو وانەی بیرکاری یان گرامەردا، لە زەینی خۆیدا تاوتوێی دەکردن و هەڵی دەسەنگاندن.

بەڵا میشیل، بەڕادەیەک، خووی دابووە ئەدەبیات، کە هەندێجار ژێراو ژێر و بەدزییەوە شیعر و هۆنراوەی دەهۆنییەوە. هەردوو برا، شیعرەکانی پوشکین و جوکوفسکییان لەبەردەکرد و پاشان بۆ دایکیان، کە بەهۆی نەخۆشی دەردەباریکە و سیلەوە زۆر لاواز بوو و، لە جێدا کەوتبوو، دەخوێندەوە و ئەویش وەختێ گەنگەشە و مشت و مڕی ئەدەبی دەکەوتە نێوان جووتە براوە،بە دەم

زەردە خەنەیەکەوە داوەری لە نێواندا دەکردن. لەو سەروبەندەدا پوشکین شاعیرێکی هاوچەرخ بوو، هێشتا گەنج بوو، شۆرەت و ناوبانگی نەدەگەییە جوکوفسکی. هەڵبەتە ماری زۆربەی جاران، بە قازانجی جوکوفسکی داوەری دەکرد. بەڵام فیدور کاتێ دەیبینی کەسێک هەیە قەسیدەی (کونت هابسبورگ) جوکوفسکی، دەگەڵ قەسیدەی (مەرگی ئولیگ)ی پوشکیندا کە قەسیدەیەکی یەجگار جوان بوو، بەراورد دەکرد و بە هاوتایی یەکیان دادەنێت، توورە دەبوو.

ڕۆژێک کوری یەکێک لە دۆست و ئاشنا زۆر کەمەکانی ماڵباتی دوستویفسکی، هاتە سەردانیان. ئەم کورە ناوی (فانیا ئومنوف) بوو، قەسیدەیەکی داشورینی بە ناونیشانی "خانەی شێتان" کە هی شاعیرێک بوو بە ناوی (ڤویکوف) دا بە فیدور و فێری کرد چۆنی بخوێنێتەوە. فیدور قەسیدەکەی بۆ باوکی خوێندەوە، بەڵام بابی بە گەنی نەکرد چونکە " تەوس و توانجێکی زۆری دەرهەق بە نووسەری ناودار بە گشتی و، دەرهەق بە جوکوفسکی بەتایبەتی، تێدابوو" ئەم (ڤانیا)یە تاقە کوری هاوتەمەنی میشێل و فیدور بوو کە بۆیان هەبوو بیهێننە ماڵەوە. هەڵبەتە دەبێ ئەوە بگوترێ کە ماجۆر بەتەنیا، هۆی ئەم تەنیایی و گۆشەگیرییەی منداڵەکانی خۆی نەبوو. بەڵکو بە خۆشیان، بەتەبیعەت، لە ئیجادی گۆشەگیر و تەریک بوون. بۆ نموونە، فیدور، زۆر حەزی دەکرد، کە لەنێو قوتابیانی قوتابخانەکەی چیرماکدا، هەندێ دۆست و برادەر بگرێت، بەڵام کبریا و فڕناخی لەڕادەبەدەر و خانەگومانی لە خەڵکی و شەرمنۆکی نەخۆشخانەی، دەیکردە کارێک هاوپۆلەکانی لێی دووربکەونەوە. خواخواى بوو خۆی لە پێناوی هەوەڵین دۆستیا فیدابکات، وەفاداری خۆی بۆ بسەلمێنێ، گرێی دڵی بۆ بکاتەوە و هەموو هەست و نەست و نهێنییەکی خۆی بۆ هەڵڕێژێ، لێ لەگەڵ یەکەمین بەرخوردا، دەچووەوە قاوغەکەی خۆی و بەسەر خۆیدا کڕ دەکەوت. فیدور، لە ژیان دەترسا. لەڕاستیا چ سیفەتێکی هاوبەش لەنێوان ئەو گەنجە چالاک و چەلەنگ و شاد و سادانە و لەنێوان ئەمی خەمین و دڵتەنگ و ڕەشبیندا، کە ژیانی بە تاریکی دەبینی هەبوو؟ چ خاڵێکی هاوبەش لەنێوان ئاوات و ئارەزووە ڕۆمانتیکی و خولیا ئەدەبی و کەڵکەڵە شۆرەتخوازی و دڵبەندییە ئەدەبیەکانی ئەو و لەنێوان خولیا سەرقەسەرقە و گەمەبازاڕییەکانی هاورێکانیا هەبوو؟ گەمە و شۆخیە بازاڕی و سەرقەسەرقەکانیان، ئەمی توورە و پەست دەکرد. لەوەیە ئەگەر ئاشنایەتی و دۆستایەتی دەگەڵ کچۆڵەیەکدا پەیدا کردبا، ئەم گۆشەگیری و شەرمنۆکییە زۆرەی ڕەوابایەوە. بەڵام دکتۆر، زۆر بە وردی چاودێری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری کورەکانی دەکرد. تا تەمەنی شازدە ساڵی، شتاقیان پارەی گیرفانیان پێ نەدرابوو. هەروەها کە بۆ قوتابخانەکەی چیرماک دەگەڕانەوە، بە گالیسکەی نەخۆشخانەکە دەبرانەوە، تا کەڵکەڵەی پیاسەکردنی ناو شاریان نەکەوێتە سەر. بەڵام لە ڕۆژانی پشووی یەک شەمموان و ڕۆژانی جەژندا، بابیان ڕیاری

دابوو کە فیدور و میشیل، یارمەتی برا بچووکەکانی خۆیان، ئەندرێ و نیکولا بدەن و دەرسیان پێ بڵێنەوە و هەروەها دەرس بە هەردوو خوشکە چکۆلەکەشیان بڵێنەوە.

نەخۆشیەکەی ماری، بەرەبەرە کوشندەتر دەبوو. ئیدی ژنەی بەلەنگاز، لە زستانی ساڵی ١٨٣٦دا، کەسیرە بوو، لەجێدا کەوت و ئیدی هەڵنەسایەوە. وێڕای ئەمەش، مێردەکەی کە بەدەم خانەگومانی گەوجانەی خۆیەوە دەتلایەوە، لە مانگی ئایاری هەمان ساڵدا، هیشتا هەر بە خیانەت تۆمەتباری دەکرد. هەنگێ ماری نامەیەکی بۆ نووسی: "هاوڕێکەم، من لە خۆم دەپرسم، ئایا تۆ دیسان تووشی خانەگومانی نەبوویت، گومانت لە وەفاداری و دڵسۆزی من پەیدا نەکردووەتەوە، ئەگەر وابێ، ئەم بیرکردنەوەیە چەند بۆ تۆ ترسناکە، بە هەمان ئەندازە بۆ منیش ترسناکە. جا هاوڕێکەم ئەگەر ئەو گومانەت لا پەیدا بووە، ئەوا من لەبەردەم تۆدا سوێند بە خوا، بە ئاسمان و بە زەوی دەخۆم، کە هەرگیز خیانەتم لێنەکردوویت و نایکەم. من پابەندی ئەو سوێندە پیرۆزەم کە لە هەنبەر میحرابی کلێسادا خواردوومە." بەڵام تا ژنەی بەلەنگاز نەمرد و چرای ژیانی بە تەواوەتی نەکوژایەوە، ئەم هەستی غیرە و خانەگومانیەی مێردەکەی دانەمرکایەوە.

ماری فیدورفنا، بەڕادەیەک لاواز و کەسیرەبوو کە نەیدەتوانی قژی خۆی شانە و خزمەت بکات. چونکە بە شایستەی نەدەزانی کە خزمەت و شانەکردنی قژی خۆی بدات بە سەر کەسێکی دیکەدا، سەری پاک تاشی، ئیدی خزمان و ئاشنا و دۆستان و ئەوانەی بەزەییان بە حاڵی نەخۆشەکەدا دەهاتەوە، زوو زوو، سەریان دەدا و، دەڕژان بەسەر ئەم بەشەی خەستەخانەی ماریدا. گەلێک لە پزیشکانی شار هاتنە کۆمەکی هاوڕێکەیان، تا لە مالیجە و چارەسەری دەردی ژنەکەیدا یارمەتی بدەن. بەڵام دەردەکەی دەردی بێ دەرمان و لە چارەنەهاتنگ بوو. بەوجۆرە دایکی دوستویفسکی لە ١٨٣٧/٧/٢٧دا، دوای ئەوەی گەردنی منداڵەکانی و مێردەکەی ئازادکرد و دوعای خێری بۆ کردن و دوا ئامۆژگاری خۆی بە هەموو خەڵکی ماڵەکە ڕاگەیاند، لە تەمەنی سی و حەوت ساڵیدا، ماڵاوایی لە جیهان کرد. مەرگی ماری، بونیادی خانەوادەکەی بە تەواوەتی هەژاند. فیدور و میشیل حەپەسابوون. ماجۆر لە داخ و سوێدا نیوە شێت بووبوو، سەری خۆی بە دیواردا دەدا. ئیدی لەسەر داوای ئەو، کێڵێکی مەڕمەڕیان، لەسەر گۆڕی هاوسەرەکەی چەقاند. کە ئەم دەستەواژەیەی کارامزینی لەسەر نەخشێنرابوو :"بنوو، ئەی ئێسک و پروسکی ئازیز، تا بیداری شادمانی" (کارامزین ١٧٦٦ – ١٨٢٦، نووسەر و دیرۆکنووسی ڕووسی، دانەری یەکەم کتێبی مێژووی گەورە کە لە ڕووسیادا، لە ژێر سەرناقی: مێژووی دەوڵەتی ڕووسیا ١٨١٦ – ١٨١٩، بڵاوبووەوە). جا پێش ئەوە بە مانگێک، پوشکینی شاعیر، لە دوئیلێکدا، بە دەستی بارون دۆنتس کوژرابوو،بەڵام ئەم هەواڵە دوای مردنی ماری، بە کورانی دوستویفسکی گەیی، کە زۆریان پێناخۆش بوو

و بەڕادەیەک خەفەتیـان بـۆ مەرگـی پوشـکین خـوارد کە فیـدور گـوتی ئەگەر ڕەشم بۆ دایکـم نەپۆشـیبا بێگومـان ڕەشـم بـۆ پوشـکینی شـاعیر دەپۆشـی و تـازیەم بـۆی دەگـرت. ئەگەر ئەوە ڕەچـاوبکەین کە کارەسـاتی کوشـتنی پوشـکین، لە سـەرانسـەری وڵاتدا، چ خەم و پەژارەیەکی نایەوە، هەنگێ بۆمـان دەردەکەوێ کە ئەم هەسـت و هەڵوێسـتەی فیـدور هـیچ زێـدەڕۆییەکی تێـدا نەبـووە. جەمـاوەری خـوێنەوار و ڕۆشـنبیری وڵات، بە شـێوەیەکی گۆنـگ، هەستیان دەکرد کە مەرگی کارەساتباری پوشکین، نیشانەی وەرچەرخـانێکی ترسـناکە، کـۆچی پوشـکین، تەنیـا نـابووت بـوونی بەهـرەیەک نەبـوو کە لە هەڕەتی توانا و شکۆفایی خۆیـدا بـوو، بەڵکـو لەگەڵ ئەوداو بە نـابووتبوونی ئەو ڕێبازێکی فیکری، تەرزێکی تایبەتی ژیان نابووت و ئاوا بوو. گۆگـۆل بەو بـۆنەیەوە دەڵێت: "خودایا ڕووسیا بەبێ پوشکین، چەنـد شـتێکی نـامۆ و غەریبە. ژیـانی من، شادی و لەزەتە بەرزەکـانی لەگەڵ ئەودا مـردن! ئەو پیـاوە گەورەیە ئیـدی لە ژیانا نییە."

لیرمانتۆف، کە لەو سـەردەمەدا، لە سوپای سـوارەی گـاردی تزاریـدا عەلەمـدار بـوو، بەو بـۆنەیەوە چـامەی "مەرگـی شـاعیر"ی هـۆنیەوە، کە بـووە مـایەی دوورخسـتنەوەی بـۆ قەفقـاز : کە ئەمە کـۆپلەیەکی شـیعری نـاقبریبە: "ئیـدی شاعیر لە ژیاندا نیە، قەدەر حوکمی خۆی جێبەجێەکرد، مەیـدانی شـیعر چـۆڵ وهۆڵە، پوشـکین مرد، شاعیر مرد و شیعر بـڕا." ئەم بەیـتە شـیعرە خەمنـاک و ئەدەبیانەی شاعیری نەناس، هێندەی دی فیـدور و میشـیلیان خەمبـار دەکـرد. بەرەبەرە ژیان لە ماڵەکەدا شێوا، تەحەمـول نەدەکـرا، بـابی ژنـی مـردە، کە بە تۆپزی و ناچاری دەستی بەکار کربووەوە، هەمـوو هـۆش و بیـری لای ئەوەبـوو، کە لە موڵکەکەی خۆیدا، لە داروقویی دا، خۆی پەنابدات. ئەوەبوو پڕیـاری دا کە هەردوو کـورە گەورەکەی بنێـرێتە قوتابخـانەی ئەنـدازیاری سـوپایی (سـان پترسـبورگ) ئەم پـڕۆژەیەی پـێ زۆر بـاش بـوو، چـونکە خوێنـدکارانی ئەم قوتابخانەیە، کە خوێندنیان تەواو دەکرد و شادەتنامەیان وەردەگـرت، دەیـانتوانی بە خوایشتی خۆیان لە یەکێک لە فەوجەکانی گاردی تزاریـدا بـبن بە ئەفسـەر، یـان بـبن بە ئەنـدازیار و کـاری ئەنـدازیاری بـکەن. بەڵام سـەفەرەکەیان بـۆ پایتەخت، بەهـۆی نەخۆشـینی لەناکـاوی فیـدورەوە دواکەوت. تووشـی دەنـگ کەوتن و دەنگ نووسان بووبوو. جۆرەها دەرمـانی خـوارد، بەڵام فایـدەی نەبـوو، تـا ئەنجـام دکتـۆرێکی پسـپۆڕ، ئامۆژگـاری کـرد، کە سـەفەری نـاوچەیەکی گەرمەسێری هەتاوگر بکات، کە ئەم ئەزمـوونە، سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا. بەڵام ئەم دەنگ کەوتن و دەنگ نووسـانەی لەگەڵـدا مـایەوە و دوستویفسـکی بە درێژایی تەمەنی هەر بە دەنگـی نـزم داخـاوت، دەنگـی سـەیر و دەسـتکرد دەهاتە بەرچاو و گوێگری قەڵس و ماندوو دەکرد. جیابوونەوە و داپڕانـی برایـانی دۆستویفسکی لە هاماج و ڕێورەسمێکی بەشکۆدا ئەنجام درا. قەشـە (ئیڤـان بارشـیف)ی کەشیشـی خەسـتەخانەکە نـوێژ و دوعـای سـەفەری خوێنـد. ئەنـدامانی خێـزانەکە، کە هەنـووکە کەم بووبـوونەوە بەگـوێرەی عـادەت، لە

دەوری مێزەکە دانیشتن و پاشان هەستان و نیشانەی خاچیان کێشا. ئەنجام باب و هەردوو کورەکەی، سواری ئەو گالیسکەیە بوون کە چاوەڕوانیان بوو.

سەفەرەکەیان نزیکەی هەفتەیەکی خایاند، ئەسپەکان لە ڕۆیشتنا خاو و تەمەڵ بوون. دەبوایە لە هەر قۆناغ و وێستگەیەکدا سێ دانە سەعات بوەستابان. ڕێبوارەکان لە کاروانسەرا و میوانخانی گوندەکانی نێوان قۆناغە ڕێگاکاندا ئیسراحەتیان دەکرد و نانیان دەخوارد، پاشان دەچوون بۆ تەویلەکان، کە مەیتەران لەوێدا ئەو ئەسپانەیان قەشاو وئامادە دەکرد، کە بۆ قۆناغی تازە بەکاردەبران، ئەوسا دەکەوتنە ڕێ، جۆری جوڵان و، ڕێکردنەکەیان وەکو کاروانی بەڕێکردنی جەنازە بوو. ئەم بەر و ئەو بەری جادە خزەکە، دەشتێکی تەختانی و هەموار بوو. جێ جێی، ئەم دەشتە بەرینە لە جەنگەڵێن سیاسەرو و دارکاژان و، زەلکاوێن ڕەنگ زەردا، ڕەش دەچووەوە. ئەم دیمەنە یەکهاویە، نیگای ماندوو دەکرد. ڕیتمی حەرەکەتی گالیسکەکەی خێڵی دوستویفسکییان، لە ڕیتم و جوڵەی کاروانی عەزیەتباری دەچوو. ماجۆر پەست و غەمگین بوو، بەڵام کوڕەکان سەرمەستی هەزاران هیوا و ئومێدی نادیار و گۆنگ بوون، چونکە ژیانێکی تازە چاوەڕوانی دەکردن. دەچوون خزمەتی "جوان و مەزن" بکەن. ئەم هاوکێشەیەیان بەلاوە ئازیز بوو. بیرکاری دەخوێنن، بەڵام شیعر، هەستی دەهاروژاندن و تاریکی ژیانی تایبەتی و نهێنیانی ڕوناک دەکردەوە. میشێل، خێراخێرا شیعری دەهۆنیەوە، شەو و ڕۆژی سێ قەسیدەی دەنووسی، فیدور، بە زیرەک و زرینگی کیمیاگەران، کۆمەڵێک ڕووداوی لە ڕۆمانین و سوارچاکی وشانێل و شمشێرەوە، کە زەمینەی سەرەکیان کۆشکەکانی شاری ڤینیسیا بوو، هەڵدەهێنجا و چیرۆکی لێدروست دەکردن. جووتە برا. بە دەنگێکی خەمناک، دوا بەرهەمەکانی پوشکینیان دەخوێندەوە و بەتەمابوون هەرکە بگەنە "سان پتروسبورگ" بچنە سەیری شوێنی دوئێلە شوومەکەی پوشکین و پاشان بچنە تەماشای خانووە کۆنەکەی پوشکین و ئەو ژوورە بدینن کە شاعیر دوا هەناسەی تیادا دابوو. دوای ئەوەش ئیدی... لەکاتێکا خۆیان دابووە دەم ئەو خەون و خەیاڵانەوە. لەپڕا بویەڕێکی ناخۆش، زنجیرەی خەیاڵەکانی پچڕین. لە وێستگەیەکی گۆڕینی ئەسپاندا، لە قەڵەمڕەوی حکومەتی تڤیرا، لە کاتێکا خێڵی دوستویفسکییان چاوەڕوانێ گۆڕینی ئەسپانی گالیسکەکەی خۆیان بوون. لەپڕا عەرەبانەیەکی سێ ئەسپ بەتاو هات و لەبەردەم ئەواندا وەستا. لەکاتێکا ئەسپەکان بە لەرزین و هانکەهانکەوە وەستابوون، مامورێکی پۆستەی دەوڵەتی، بە شەپقەیەکی سێ گۆشەی پەردارەوە، لە گالیسکەکە دابەزی، جلێکی تەنگی لەبەربوو، دەموچاوی عەینی پارچە گۆشتێک سوور دەچووەوە. بەدەم خواردنەوەی پەرداخێک ڤۆدکاوە، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد تا گالیسکەیەکی تازەی بۆ بێنن و بکەوێتە ڕێ . گالیسکەکەیان هێنا، سەرکەوت، هێشتا عەرەبانەکە بە تەواوەتی نەکەوتبووە ڕێ، کە کابرای ماموری پۆستە، هەستایە سەر پێیان و بە مست بەربووە، سەروگوێلاکی عەرەبانچیەکە،

عەرەبانچیە داماوەکە، خۆی بۆ پێشەوە دانەواند و بە هەموو هێزێکی خۆیەوە، بە قامچیە درێژەکەی بەربووە ئەسپەکان. تا یارۆی پۆستەبەر، لە دواوە زیاتری لەم دەدا، ئەمیش زیاتر لە ئەسپەکانی دەدا... دوستویفسکی لە بیرەوەریانی ڕۆژانەی نووسەرێکدا، لەم بارەیەوە دەنووسێت: "ئەم دیمەنە قێزەونە بە جۆرێک لە یادگە و زەینمدا نەخش بووە، کە بە عەمراتم لەبیرم ناچێت." دوستویڤسکی لە دیمەنی ئەم مامور و کارمەندی پۆستەیەدا، هۆی ئەم ڕەفتارە نزم و حەیوانیەدا، کە هەندێ کەس دەیدەنە پاڵ جوتیارانی ڕووس و، بەوەی تۆمەتبار دەکەن، بە ڕوونی دەرک دەکات و باوەڕی وایە ئەگەر دەستبەرداری ئەمرکردن، هاوارکردن و لێدانی ئەم جووتیارانە ببن، ئەمانە دووبارە سەربەرز دەکەنەوە و خوڵق و خووی میانڕەوانە و هزرینی مرۆڤانی پەیدا دەکەن و ئیدی بەوەوە دەق دەگرن.

لە ڕۆمانی (تاوان و سزا)دا راسکولنیکوف، باسی ئەسپێکی لەڕ و لاواز و مردەڵە دەکات کە لەژێر زەبر و جەزرەبەی عەرەبانچیەکی کەودەندا بە ناوی میکلوکا، دەپسێت و دەتۆپێت. دوستویفسکی دەڵێت: "ئەسپەکە لە ژێر جەزرەبەی داردا دەلەرزێ. پشتی دەچەمێ، کەچی سەرلەنوێ هەوڵدەدات بارەکە ببات. بەڵام کە دارێکی ئەستووری دیکە بە گازەرای پشتیدا دەدرێت، بە جۆرێ دەکەوێتە سەر عاردی و تەخت دەبێت، لە تۆ وایە هەر چوار پەلیان پڕیوەتەوە.

دوستویفسکی لە کتێبی بیرەوەریانی نووسەرێکدا باسی قەسیدەیەکی نیکراسوف، بە ناونیشانی (چاوانی میهرەبان) دەکات. لەم قەسیدەیەدا موجیکێک (جوتیاری کۆیلە) بە قامچیەکەی دەکێشێت بە چاوانی ئەسپەکەیدا و پێی دەڵێت: "تۆ ناتوانی عەرەبانە ڕابکێشیت، بەڵام هەردەبێ ڕابیکێشیت، ئەگەر تۆپیوی هەردەبێت ڕابیکێشیت." دوستویفسکی بە درێژایی تەمەنی هەمیشە لەژێر گوشاری بیرۆکەی ئازاردا بووە، لەو بیرۆکەیە نەخەلەسیوە. هەر تاوانێک لە بەرهەمەکانی ئەودا هەیە، ڕەگی چووەتەوە سەر ئازار و لەو ڕوانگەیەوە بەرخورد و مامەڵەی لەتەکدا کراوە و ڕاڤە و شرۆڤە کراوە. ڕەنج و ئازار بیانووە گەورەکەی بوونی ئێمەیە، هەوێنی ژیانە. بابی دوستویفسکی کە لەلایەوە دانیشتووە، بە شێوەیەکی ترسناک ئازار دەکێشێت. بە ئازارەوە دەتلێتەوە. قەدەر و چارەنووس ئەم ستەمەی لێکردووە و ئەم زوڵمەی کە دەبێ تەحەمولی بکات، ئەنگیزەی ئەو زبری و سەختگیریەیە کە دەگەڵ منداڵەکانیدا بەکاری دەبات. هەرکەسە و مەسئولیەت و باری نائومێدی و ڕق و ترسی خۆی بە ملی دراوسێکەیدا ەدات. هیچ شتێک لە خۆمانەوە دەست پێناکات. هیچ شتێک لە خۆمانا، لە ئێمەدا کۆتایی نایەت. هەر هەموومان گیرۆدەی یەک تۆری عەسەبین و ئەوەندە بەسە یەکێکمان حەرەکەتێک بکات تا دەوروبەر و کەسە نزیکەکانی، هەست بکەن ئەوانیش ڕادەکێشرێن و ئازار دەکێشن.

ئانـا گریگوڤینـا (هاوسـەری دوستویفسـکی) دەڵێـت "فیـدور میخـائیلۆفیچ بە خۆشحاڵییەوە باسـی منـداڵیتی خـۆش و ئـارامی خـۆی دەکـرد." بەڵـآم دکتـۆر یانوفسکی، کە دۆستی دڵسۆزی فیدور میخائیلۆفیچ بوو، بەرپەرچـی دەداتەوە و دەڵێت: "بێگومان فیدور، لە منداڵیەتدا ئاسوودە نەبووە و بەدەم کۆمەڵێـک لەو هەستە تاریک و بەسوێیانەوە ژیاوە و تـلاوەتەوە کە بە تێپەڕبـوونی ڕۆژگـار نەک هەر نـاڕەوێنەوە، بەڵکـو زەمیـنەش بـۆ کۆمەڵێـک نەخۆشـی عەسـەبی وەکـو فێـداری، ماخولیـاو، وازوازی و، گومـان و، دوودڵـی و سـڵۆکی و دوورەپەرێـزی خۆش دەکات."

کات درەنگە، مـاجور باوێشـک دەدات، زیـادبوونی قـۆپی و مـرداو و زۆنگـاوانی ئەم بەرو ئەوبەری جادەکە، نیشانەی نزیک بوونەوە بوو لە سان پتروسبورگ.

## فەسڵی چوارم

## کۆشکی ئەندازیاران

زیارەتی ماڵەکەی پوشکین، پیاسەێن دڵگیری کەنارێن ڕوباری نیفا، فەتح و کەشفی (جوان و مەزن) هەر هەمووی لە سایەی ویست و تەگبیری ئاقڵانەی ماجوردا دواخرا. بابیان کە گەییە سان پترسبورگ، فیدور ومیشێلی خستە قوتابخانەیەکی شەوانەڕۆژی تایبەتیەوە کە لەلایەن کورونادفیلیبوفیچ کوستاماروف ناوێکەوە بەڕێوەدەبرا. ئەم ئەفسەرە خانەنشینە، بەناوبانگە، ئەرکی دەورەی ئامادەکردنی لاوانی، بۆ بەشداری لە تاقیکردنەوەی وەرگرتن لە قوتابخانە، لە ئەستۆ بوو. کابرایەکی درێژی بەسامی، سمێڵ ڕەشی، سمێڵ باپری، نیگا سارد بوو، ترس و خۆفی دەخستە دڵی خوێندکارانی تازەوە. بەڵام هەرکە دەمی هەڵدێنا و دەکەوتە قسە، جۆرە نەرم و نیانیەکی دڵگیر و ناسکیەکی ژنانە لەژێر پەردەی ئەم ڕواڵەتە زبرە سوپاییەوە وەدەردەکەوت. دکتۆر، هەرکە لە جێگیربوون و چارەنووسی منداڵەکانی ئەرخایەن بوو، ئیدی بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، بەڵام جووتە برا، هەر چەندە، ئەم تەنیایی و دووریەیان لەبەر گران بوو، بەڵام زۆر بەجدی، لەو مەیدانە تازەیەدا کە لە بەردەمیاندا کرابووەوە، کەوتنە کاروکۆشش. میشێل لە نامەیەکدا بۆ بابی دەنووسێت: "کارەکانمان ڕەوتی ئاسایی خۆیان وەرگرتووە. جارێ ئەندازە دەخوێنین، جارێ جەبر. جارێ خشتەی قولله و قەڵاتان، بورج و سەنگەر و مەتەرێزان دەکێشین و جارێ بە فڵچە و قەڵەمان، دیمەنی چیا و کۆجاران ڕەسم دەکەین. جەنابی کوستاماروف، ۆرمان لێ ڕازیە. ڕێز و خۆشەویستیەکی تایبەتی بەرانبەرمان هەیە: بایی سی ڕۆبڵ ئەوزاری کاری بۆ کڕیوین و بایی دوازدە ڕۆبڵیش بۆیەی بۆ کڕیوین." هەروەها دڵێت: "ئێمە لەگەڵ هەشت قوتابی دیکەدا، لەیەک پۆلداین، بەڵام مامۆستا متمانەیەکی تایبەتی بە ئێمە هەیە."

ئەنجام ڕۆژی تاقیکردنەوە هات، فیدور دەرچوو، بەڵام میشیل، لەبەر هۆی تەندروستی و نالەباری مجێزی، دەرنەچوو. ئیدارەی قوتابخانەکە دەینێرێت بۆ شاری ڕیفیل، تا لە قوتابخانەیەکی ئەوێ، کە پاشکۆ و لقی هەمان قوتابخانەی خۆیان بوو، بخوێنێ، هەڵبەتە فیدور زۆری دڵ بەو یونیفۆرمە عەسکەریە فەرمیە خۆش بوو کە وەکو "قوتابی ئەندازە" لەبەری کرد، بەڵام ئەم خۆشیە، قەرەبووی ئەو خەم و پەژارەیەی بۆ نەکردەوە کە بە هۆی داپڕانی لە براکەی، تووشی بوو. جووتە برا، برایەتی و دۆستایەتیان زۆر خۆش و گەرم بوو. کێ دەیتوانی جێگای ئەم دۆست و، هاوڕێ ئەمین و ڕازپارێزە بۆ فیدور بگرێتەوە. جێی ئەم هاوڕێ دڵسۆز و شاعیرە بەجۆشەی بۆ پڕبکاتەوە، کە هێشتا فیدور دەمی بە تەواوەتی نەدەکردەوە، ئەو لە قسەکەی دەگەیی. لە هەموو کەڵکەڵە و ئارەزوو و ئاواتەکانی دەگەیی، ڕازەکانی ناخی دەخوێندەوە. بەڵام فیدور، لەهەنبەر بابیدا. هەڵبەتە لە ڕووی بەزەییەوە، وا خۆی دەنواند، کە قوتابیەکی ڕێک و پێکە و دڵی قوتابخانەکەی خۆشە، لە نامەیەکیدا دەڵێت: "ئەنجام لە قوتابخانەی ئەندازیاری قەبووڵ کرام،جلکی فەرمی سوپاییم لە بەرکردو داخڵی خزمەتی ولات بووم."

پاشان ساڵانێک لەوە دوا دەنووسێت : "من و میشێلی برامیان کە تەمەنی شازدە ساڵان بوو، لە سانپتروسبۆرگ، نایە قوتابخانەی ئەندازیاران،هەڵبەتە بەمە ئایندەیان وێران کردین. سەبارەت بە من، ئەمە هەڵەیەکی گەورە بوو." هەڵبەتە ئەمە هەستی ڕاستەقینەی ئەو بوو.

"کۆشکی ئەندازیاران" هەندێجار بەو ناوەوە،ناوی ئەم قوتابخانەیە دەبرا، بە فرمانی تزار(پۆڵسی یەکەم) بۆ سوکنەی تایبەتی خۆی دامەزرا. ئەم بینایە کەوتبووە جوانترین گەڕەکی شارەوە، کەوتبووە سەر یەکانگیری هەر دوو ڕوباری مونیکاو فۆنتانکاوە، بەهۆی پردێکی بزۆزەوە لە باخە هاوینەکە جیا دەکرایەوە.بورجێکی گەورەیان لە کەنار ئەم پردەدا دروست کردبوو،لەم بورجەدا ،ئیمپراتۆری دکتاتۆر، لە نیوەشەوی یازدەی ئازاری ساڵی ١٨٠١دا ،بە فەرمانی هادەم وهاوڕێی گیانی بە گیانی خۆی، کۆنت دوپاهلینی فەرماندار و حاکمی سوپایی سان پترۆسبۆرگ وبە ڕەزامەندی پەنهان وژێراو ژێری ئەلکساندەری کوڕی خۆی کوژرا. "چونکە مەشییەت وئیرادەی خوا لەسەر ئەوە بوو کە بابی خۆشەویستمان،تزار پۆڵس بیترۆفیچ بۆ خۆی بباتەوە، ئەوە بوو بە مەرگی مفاجات کۆچی دوایی کرد." ئەمە دەقی ئەو ڕاگەیەنراوە بوو، کە ئەلکساندەر، ڕۆژی دوای کوشتنەکەی بابی بڵاوی کردەوە.

لەساڵی ١٨١٩دا، کە کۆشکەکە چۆڵ بوو ودوای گواستنەوەی کەلوپەلەکانی ناوی، دەستێکیان پێدا هێنا و، پرێک نۆژەنکاری تێدا کرا و ئەوجا تەرخانکرا بۆ قوتابخانەی ئەندازیاران. هۆڵەکانی گەورە و بەرز و ڕووناک بوون. دیوارەکانی سپی و گەچکاری بوون. لە هۆڵە ئیمپراتۆریەکانی جاراندا، خەوتنگەیەک و خوارنگەیەک و چەند پۆلێکیان، دروستکرد، کە جێگای سەد و بیست و شەش خوێندکاری تێدا دەبووەوە. خوێندکارانی ئەم قوتابخانەیە تەمەنیان لەنێوان ١٤ – ١٩ ساڵاندا بوو. ئەمانەیان بە کۆمەڵێک ڕێ و ڕەسم و داب و نەریتی پتەو و جێگیر پەروەردە دەکرد. فێربوونی پرەنسیپی نەجیمزادەیی، ڕێزگرتن لە سەربازانی ئەقدەمی پێش خۆیان، پاراستنی خەڵکانی لاواز، بێباکی و بە هەند نەگرتنی خەتەر و مەترسیان، بایەخدانی تایبەتی بە سەما، ئەمانە هەمووی لە بەرنامەی خوێندندا بوون. "قوتابی ئەندازیاری" کە وەردەگیرا و دەچووە کۆشکی ئەندازیاران. سوێند دەدرا و دەخرایە ژێر باری مەسئولیەتەوە و، سنووری مەسئولیەتی خۆی بۆ دیاری دەکرا. بەرنامە و میتۆدی خوێندن لێرەدا هەمەجۆر و جدی و قورس بوو: جەبر، ئەندازە، بالستیک، فیزیا، تەلارکاری، قەڵات و مەتەرێزان، توبۆگرافیا، جوگرافیا، هەروەها ئەدەبیات و مێژوو و مەشق و ڕاهێنانی سوپایی... هەوڵیان دەدا نەخشەی باش بکێشن. فێری ڕەسمی ئاوی ببن، فێری چۆنیەتی مەتەرێز و سەنگەرسازی ببن. خوێندکارانی ئەم قوتابخانەیە، هەر لە ئێستاوە باسی سەرکەوتنەکانی ئایندەی خۆیان دەکەن، باسی وەزع و حاڵی شەخسی، پەیوەندی گرینگ و گشتی، شەوبێری و جەلال و شکۆ دەکەن. باسی ئەوە دەکەن چۆن دژی ئەو کەسانە بوەستنەوە کە دژی (سەربازانی کۆن)

ڕادەپەڕن. ئەوسا بە فەرمانی خوێندکارێکی ئەقدەمی ئەندازیاری، دژمنانی دوو دەستە و چینی هەڤدژ، ئاشت بکەنەوە و سوێند بۆ یەکتر بخۆن، کە دۆستی یەکتر بن و هەموو ڕق و کینەیەک وەلاوە بنەن و هەر سووکایەتی و بەدحاڵی بوونێک کە ڕوویداوە، لەبیربکەن. زەبت و ڕەبت و دیسیسپلین لەم قوتابخانەیەدا، زۆر سەختە، مەبەست ئەوەیە کە لاوان ڕامبکرێن و فێری ئەوە بکرێن کە تەحەمولی دژواریان و، زروف و بارودۆخی سەخت بکەن و بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش، هەموو ڕێگەیەک ڕەوا بوو، بەتایبەتی جەڵدە و شەلاخ. ئەوەتا سێرگ پیرکی، لە کتێبی چەند بیرەوەریەک لە پەیمانگای پردو ڕێگا و بانەوە، لەمبارەیەوە دەڵێت : "هەندێجار لە کەتیبەی نەجیمزاندا، واڕێدەکەوت لەسەر هەڵەیەکی بچکۆلە لەکاتی مەشق و، ڕاهێناندا قوتابی بە جۆرێ دەگیرایە بەر شەلاخ و جەڵدە، کە دەبوایە بە نیمچە مردوویی، بخرایەتە سەر دەسەبەرەیەک یان لە پەتۆکەیەوە بپێچرایە و لە مەیدانی مەشقەکە ببرایەتە دەرەوە."

دوستویفسکی، دوای ژیانێکی خانەوادەیی گۆشەگیرانە، لەژێر باڵی دایک و بابدا، لەناکاوا، دەکەوێتە ناو ئەم ژینگە سەرەتایی و زبر و جەنجاڵ و پڕجۆش و خرۆش و جم و جوڵەوە. فیدور میخائیلوفیچ، لەو سەروبەندەدا، گەنجێکی قەڵەوی چوارشانە، دەموچاو خڕ، کەپوو هەڵگەڕاوەی ڕەنگ زەردی، دەموچاو کەمێک نمووس بوو، قژە زەردەکەی زۆر کورت کردبووەوە. تەوێڵە بەرز و پانەکەی، بەسەر چاوە قاوەییەکانیادا هاتبووەوە. چاوەکانی زۆر لە قوڵا بوون و، تەمەشاکردنەکەی پیاوی بێزاردەکرد. برۆکانی تەنک و لێوەکانی ئەستور بوون. بە شێوەیەکی گشتی جۆرە خەمینی، گۆشەگیری و نیگەرانییەک لە سیمایدا دەخوێنرایەوە. لە جل و بەرگا، شەپڕێو بوو، یونیفۆرمی سوپایی فەرمی نە لێ دەهات و نە بایەخی پێدەدا. هاوڕێکانی نازناوی (فوتیوس)یان لێنابووو. (فوتیوس photiusکەشیش و زانایەکی خوداناسی مەسیحی بوو، کە لە پاپا هەڵگەڕایەوە و کلێسای ئەرتەدۆکسی دامەزراند و لە دووبەرەکی ئاینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دەورێکی دیار و بەرچاو و کاریگەری بینی.)

یەکەم بەرخوردی دوستویفسکی دەگەڵ هاوپۆلەکانیا، زۆر قورس، ناخۆش و تاقەتبەر بوو. لە کتێبی: "یاداشتە ژێرزەمینیەکان"دا دەڵێت: "چەند گێل دیاربوون، لە ئاژەڵان دەچوون! لە قوتابخانەکەی ئێمەدا، بەهۆی مەشق و ڕاهێنانی نادروستەوە، سیما و بەدەنی قوتابیەکان دەگۆڕا، دەشێوا و شەقلی گێلاتیان وەردەگرت. ئەو کوڕە جوان و بەژنو باڵا ڕێک و پێك و تەندروستانەی، کە دەهاتنە ئەم قوتابخانەیە، دوای چەند ساڵێک، ناشیرین دەبوون و هەیکەل و کەلەشێکی ناشیرین و شێواویان پەیدا دەکرد. هێشتا شازدە ساڵان بوون، من بە سەرسامیەکی خەمامێزەوە تەمەشام دەکردن. سەرم لە بچووکی بیرکردنەوەیان سوڕدەما. گەمە و یاریان، دەم و دوویان، خولیا و کەڵکەڵەیان هەر هەمووی پوچ و بێبایەخ دەهاتنە بەرچاوم. ئەمانە جگە لە خەمی قوتابخانە و دەرچوون، هیچ زیکر و فیکر و خەمێکی دیکەیان نەبوو. هەر

شـتێکی چـین و توێژەکـانی خـوارەوەی کۆمەڵگەیـان، ئەگەر دروسـت و ڕەواش بوایە، بەلاوە پەشم و بێبایەخ بوو، بە قێز و بێزەوە مامەڵەیـان لە تەکـدا دەکـرد و بەبـێ بێشـەرمیەوە ڕوو بە ڕووی دەبـوونەوە. ئەمـانە تەنیـا نـاو و ڕواڵەتیـان مەبەست بوو، گوێیان بە نـاوەڕۆک نەدەدا. لە تەمەنـی شـازدە سـاڵیدا باسـی ئەو پلە و پایە و پێگانەیان دەکـرد کە نـانی تیـا بـوو. هێنـدە گەنـدەڵ بـوون، پیـاو قێزی لێدەکردنەوە".

زۆر لەم گیانلەبەرە بچکۆلانە، چونکە زۆر سادە و ساویلکە بوون، هیچ خەمێکیان نەبوو، بە بچووکترین شت دڵیان خۆش دەبوو. جا ئێستا لێرەش، لەو سای قوتابخانە شەوانە ڕۆژانەکەی چیرماک، پتر تامی تاڵی جودایی دەچەشت. لە نامەیەکیدا بۆ میشێلی برای لەمبارەیەوە دەڵێت: "ژیان لێرە زۆر ناخۆش و قێزەونە. لێرە تەنیا ئەو شتانەی لە مادیەت و خۆشبەختی زەمینییەوە سەرچاوە دەگرن و هەڵدەقوڵێن، جوانن. "

هەمـوو بـاس و خواسـێکی هـاوڕێ قوتابیەکـانی بریتـی بـوون لەو بابەتـانەی پەیوەندییان بەم مادیەت و خۆشبەختیە زەمینیانەوە هەبوو. هەموو خەمێکیـان، خەمی دنیایی بوو، باسـی دەرچوون و بەدەسـت هێنانی پلە و پـایە و پۆسـت و پێگەی باش ولەباربوو. بەڵام ئایا فیدور بە خۆیشـی لە خەم و بیری پلە و پـایەدا نەبـوو؟... لەمبـارەیەوە دەڵێـت: "پێمـوایە، دنیـا مانـا و ئاڕاسـتەیەکی نەرێنـی وەرگرتووە و لە کانگا و قوڵایی مەعنەویەتێکی باڵا و درەخشـانەوە، هەجـویەکی زەمانەوانی هـاتووەتە دەرێ. کە ئەمە شـتێکی ترسـناکە! تەحـا لە سـووکی و ترسنۆکی ئینسـان!... هاملێت، هاملێت..." وەکو هاملێتێکی نەبەکام، خەمین، نائومێـــد، تەنیـــا، بەخـــۆی وکتێـــبەکەی دەســـتییەوە. بە داڵان و ڕاڕەو و گەلەریەکانی قوتابخانەکەدا دەسورێتەوە، خۆی لە مامۆسـتاکان دوور دەگرێـت. کە قسە دەگەڵ هاوڕێکانیدا دەکات، بێبـاک و بـێ پەروا قسـەکانیان پێـدەبڕێت. وێڕای ئەوەش درێغی لە کـارکردن ناکـات، بەڵکـو بە پـێچەوانەوە، زۆر کۆشـیارە، ئیعتیراز ناگرێت، هەر کارێکی پـێ بسـپێردرێت بە جـدی ئەنجـامی دەدا. کـاتێ کە مامۆسـتا، پرۆفیسـۆر پلاکـین، لە وانەکەی خۆیـدا پێـی گـوتن گوگـوڵ، نووسەرێکی بچـووکی بـێ بەهـرەیە و حەز دەکـات لە داب و نەریتـان لابـدات و دەربـارەی ژیـانی خەڵکـانی ڕەشـۆکی و گەجەر و گـوجەر و لات و لەوێرانـی کۆمەڵگە دەنووسێت، ئەو سەری خۆی کز دەکـات و هـیچ ئیعتیرازێـک ناگرێـت، کول و کۆڤان و خەمی خۆی دەدا بە کۆڵی خۆیا و هەقی هیچـی نیـیە. پاشـان لە کتێبـی "یادگاریەکـانی خـانەی مردوانـدا" دەنووسـێت: "بـوونەوەرێکە لەگەڵ هەموو شـتێکدا ڕادێت. من پێموایە، ئەمە باشترین پێناسـەیە بۆ ئینسـان."

هەڵـــبەتە، بە خۆیشـــی، خەریـــک بـــوو بەرەبەرە دەگەڵ ژیـــانی تـــازەی قوتابخانەکەیـدا ڕادەهـات. خـووی بە جـودایی و تەنیـاییەوە دەگـرت. یەکێـک لە هاوڕێکـانی لەو بـارەیەوە دەڵێـت: "حەزی دەکـرد خـۆی لە خەڵکـانی دی دوور بگرێت، ئایا بەڕاستی کلـۆڵ و دڵتەنـگ بـوو، یـان وای وێنـادەکرد؟ چـۆن بتـوانین

بچینە بنج و بناوانی ئەمە؟ هەڵگرتنی چەک و بەکارهێنانی، جم و جوڵی دەستەجەمی، داب و نەریت و ڕێورەسمی عەسکەری کۆن، ئەمانە هەر هەمووی زبر و ناخۆش بوون، بەڵام ڕاست و ڕاستگۆیانە بوون، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان بە دڵی ئەو نەبوون. غروورى نەخۆشانە و هەستیاریی دەروونی و لاوازی بەدەنی، تووشی تەنیایی و گۆشەگیرییان کردبوو." لە پشووی وانەکاندا کە زۆر کورت بوون، پەنای دەبردە کەناری چوارچێوەی ئەو پەنجەرەیەی کە دەیڕوانیە سەر ڕوباری فونتانکا. کتێبێکی کۆنەی دەکردەوە و خۆی بە خوێندنەوەوە مژووڵ دەکرد  و بەوجۆرە هەوڵی دەدا خۆی لە خەمە چکۆلەکانی قوتابخانە و ئەرکە قەتابخانەییەکان دوور بخاتەوە. قوتابییەکان بەدەم هەرا و زەناو، سوعبەت و شۆخیانی تێکەڵ و پێکەڵەوە، لە حەوشی قوتابخانەکەوە دەهاتن، ڕیزیان دەبەست و بە بەردەم ئەودا تێدەپەڕین و دەچوون بۆ هۆڵی نانخواردن و پاشان بەدەم قسە و پێکەنینەوە دەگەڕانەوە. بەڵام فیدور میخائیلیوفیچ، نە هیچی دەبیست و نە هیچی دەبینی. تەنیا ئەو کاتەی تەپڵی تەواوبوونی کار و دەوام لێی دەدا، کتێبەکانی کۆدەکردنەوە و ڕێکی دەخستن. بەڵام وەکو ساڤیلیقی چاودێری گشتی قوتابخانەکە دەیگێڕێتەوە، زۆر جار، لە نیوە شەواندا دوستویفسکییان دەبینی، کە بەدیار مێزە چکۆلەکەی خۆیەوە، لە ژوورە بازنەییەکەدا، بەپێ خاوسی، پەتۆیەکی بە شانیدا داوە و، دانیشتووە  و لەبەر ڕۆشنایی مۆمێکی نیوە سووتدا، کە لە مۆمدانێکی تەنەکەدا دەسووتا، خەریکی نووسین دەبوو.

ئیدارەی قوتابخانەکە لێی ڕازی بوو و ستایشی دەکرد، لە فایلی شەخسی قوتابخانەیدا، ئەم هەڵسەنگاندنە دەربارەی ئەو دەبینرێت: "ئایا قوتابی کۆشیارە؟ - زۆر کۆشیارە. لە ڕووی تواناوە چۆنە؟ - باشە." تەنیا ئەوەندەی دەربارە نووسرابوو و هیچی دی. هەڵبەتە هەقی خۆیەتی گومانی ئەوە بکەین کە ڕەنگە لەم سەر و بەندەدا، خەریکی ڕەشنووسی یەکەمین ڕۆمانی خۆی "هەژاران" بووبێ. کەسێتی سەیر و سەمەرەی ئەم خوێندکارەی ئەندازیارییە، کە ڕقی لە مەشقی چەک، گەمە و سەما، ئەو سەعاتە پیرۆزانە بوو کە لە هۆڵی خواردن بەسەر دەبران، سەرنجی هاوڕێکانی ڕادەکێشا. هەندێک لە قوتابییەکان لێی نزیک بوونەوە، بە خێرایی دڵبەندی جۆش و خرۆشی شاعیرانەی بوون. فیدور، کۆڕێکی چوار پێنج نەفەری گەنجی لە خۆی خڕکردبووەوە، کە لەو کۆڕەدا باسی شیعر و تەنانەت ئایدیال و بەها باڵاکانیشیان دەکرد. ئەمە بۆ ئەم قوتابخانەیە بویەر و ڕووداوێکی تازە و بێ پێشینە بوو. فیدور، سەرپەرشتی ئەم هاوڕێیانەی دەکرد و هانی خوێندنەوەی دەدان. هەندێ لە ئەندامانی ئەم گروپە لە ڕێگەی ئەوەوەو بە هاندانی ئەو ڕۆمانی پاڵتۆکەی گوگولیان خوێندەوەو ئاشنایەتیان دەگەڵ دیکنز و بەرهەمەکانی واڵتەر سکۆت دا پەیداکرد و خوێندیاننەوە.

ئەو هەوادارانەی "مەزن و جوان"ە زۆرجار بە بیانووی نەخۆشییەوە، لە خەوتنگەکە کۆدەبوونەوە و دۆستۆیفسکی بە دەنگە نووساو نزمەکەی خۆی

شـیعر یـان هەنـدێ دەقـی پەخشـانی بـۆ دەخوێنـدنەوە. ئەوسـا دەوەسـتا تـا ئەوەی خوێنــدبوویەوە شــەرح و شــرۆڤە بکــات. خــۆ ئەگەر ئەم موریــدانەی بچــووکترین ئیرادیــان بگرتــایە، ئەوا دەنگــی لێهەڵــدەپڕی و ســەدان بەڵــگە و بورهانی وەکو کـوتەک بەسـەر سـەریاندا دادەباراند. زۆرجـار ئەو گەنجـانەی لە هـۆڵەکەی تەنیشـتیەوە بـوون، دەیـانبینی چـۆن ئەو کەسـەی ئیـرادی گرتبـوو، بەپەلە لە ژوورەکە هەڵـــدەهات و دۆستویفســـکی بە خـــۆی و کتێـــبەکەی دەســـتییەوە، دوای دەکەوت، تـــا بـــابەتەکەی بە دروســـتی تێبگەیەنێـــت و قەنـاعەتی پێبکـات. یەکێـک لە هاودەورەکـانی دەڵێـت: "کـاتێ کە لە ئەرک و وەزیـفەی قوتابخـانە دەبـووینەوە و دەگەڵ یەکـدا دەکەوتیـنە قسـان، فیـدور دوستویفســـکی خـــۆی بە هـــۆڵەکەدا دەکـــرد و بە قســـە ئیلهـــام و ســـەرۆ ئاســاکانی، ســەرنجی ڕادەکێشــاین. لە نیـوە شـەوا کە شـەکەت و مانـدوو دەبووین، خەو دایدەگرتین، دۆستویفسکی بەردەرگاکەی لێدەگرتین و بەوپەڕی جۆش و خرۆشـەوە قسـەی بۆ دەکردین. دەنگە نزمەکەی ئەفسوونی دەکـردین و لەوی نزیک دەکردینەوە."

هەڵبەتە ئەم حەماس و جۆش و خرۆشـە ئەدەبیەی دوستویفسکی، کاری لە ئەرکە سوپاییەکانی دەکرد و وەکو پێویست پێیاندا ڕانەدەگەیی. ڕۆژێک کە چووبوو بۆ خزمەتی دۆقی گەورە میشێل پاڤلوڤیچ، بیری چووبوو، قسەکانی بەم کلێشـە باوە "بۆ حەزرەتی جەنابی با سەعادەتی تزاری" دەست پێبکات. ئیدی دۆقی گەورە، هاواری کردبوو: "سەیرە، ئەم گێلانە چ کەسێکی بێ ئەدەبیان بۆ ناردووم."

دژوارترین، ماوە و قۆناغی ئەو ساڵە، بۆ دوستویفسکی، مـاوەی مانۆرەکـانی "کرازنوی" یان "پیتر هـوف" بـوو، بەتـایبەتی کە یەجگـار بـێ پـارە بـوو. دنیـا زۆر گەرم بوو، ئەوەندەی پارە نەبوو، ئـاوی خـواردنەوە بـۆ خـۆی بکڕێـت. یـان ئەگەر دنیـا سـاردی کردبـا و بـاران باریبـا، پـارەی ئەوەی لە بەڕکـا نەبـوو کوپێـک چـای بکڕێــت، یــان جلــی زیــادەی هەبێــت و جــلە تەڕەکــانی بگۆڕێــت. بــاوکی دوستویفســکی کە پەنـای بردبـووە بەر گونـدی، ئیـدی بەوپەڕی خەمینـی و نائومێـدی، خـووی دابـووە مەیخـۆری و لەو پەڕی بێتاقەتیـدا دەژیـا و نە حەزی دەکرد کەس بدینێ و نە باسـی هیچ بکـات و نە گـوێی لە هـیچ شـتێک ببێـت، فیدور بۆی دەنووسێت: "هەرچی زووترە، شـتێکم بـۆ بنێـرە. بەوە لەم دۆزەخەم دەربازدەکەی کە تێی کەوتووم! پەح کە ناخۆشـە، ئینسـان موحتاج بێ."....!

هەروەهـا، لە نـامەیەکی دیـدا بـۆی دەنووسـێت: "بـابە ئـازیز و باشـەکەم. وا خەیاڵ نەکەی کە کوڕەکەت، لە پێناوی خۆشـی و ڕابواردنی خۆیدا داوای پارەت لێــدەکات... مــن ئەقڵــم هەیە، بــازووم هەیە، ئەگەر دەســـتم بەتــاڵ بــوایە و پەرزابــام داوای تــاقە کــوپیکێکم لە کەس نەدەکــرد. خــۆم لەگەڵ هەژاری و دەستکورتیدا ڕادێنا.. بەڵام بابی ئازیزیم، ئەوە بیـری خـۆت بێـنەوە، کە مـن لەم کـاتەدا، بە هەمـوو مانـای وشـەی "خـزمەت" لە خزمەتـدام، یـانی مژوولـی

خزمەتم، بۆیە بمەوێ و نەمەوێ، دەبێ پابەند و وەفاداری داب و نەریت و ڕێ و ڕەسمی ئەو کۆمەڵگەیە بم کە تیایدا دەژیم... ژیانی ئۆردویی، حاڵی حازر، بۆ هەر قوتابییەک بەلای کەمەوە، چل ڕۆبڵ دەکەوێ، من بۆیە هەموو ئەم شتانە بۆ تۆ دەنووسم، چونکە لەگەڵ بابی خۆدا قسان دەکەم. من لەم حیساب و کیتابەدا، پارەی شەکر و چام هەرچەندە زەروریشن حیساب نەکردووە. کاتێ ئینسان لەژێر خێوەتێکی قوماشدا، باران لێی دەدات و تەڕدەبێت، یان کاتێ شەکەت و ماندوو لە مەشقی سوپایی دەگەڕێتەوە و لە سەرما هەڵدەلەرزێ و چای بۆ خواردنەوە نەبێت، لەوانەیە نەخۆش بکەوێت، کە لە مانۆرەکانی پاردا ئەوە بەسەر خۆمدا هات. بەڵام وێڕای ئەوەش، چونکە دەزانم گرفتی دارایی‌ت هەیە، چاوپۆشی لە چای دەکەم، تەنیا داوای شتی زۆر پیویست لە تۆ دەکەم. یانی بڕە پارەیەک کە بەشی کڕینی جووتێک چەکمە بکات."

بابی دۆستویفسکی موڵک و زەوی هەبوو. دەرامەتێکی جێگیر و یەک سەفتە ئەسکەناسی گەورەی پاشەکەوت کردبوو، بۆ جیازی کچەکانی دایینابوو. لە گوندیدا پەنای گرتبوو و هیچ خەرجی و مەسرەفێکی نەبوو. لە دڵی خۆیدا قەناعەتی تەواوی بە دروستی و ڕەوایی داواکانی کوڕەکەی هەبوو. بەڵام پیرەمێردی ڕژد و قرچۆک، زۆر وەستایانە و فێڵبازانە، ڕەزیلیەکەی خۆی دەرشارێتەوە و بە زمانی لووس وەڵامی کوڕەکەی دەداتەوە و بۆی دەنووسێت: "ئازیزەکەم، چاک بزانە خوتە و بۆڵە و گلەیی و گازاندە لە بابێک، کە ئەوەندەی تووانای دارایی ڕێی دابێ، یارمەتی بۆ ناردوویت، نەک هەر شەرمە، بەڵکو تاوانیشە. ئەوەبێنەوە یادی خۆت کە سێ ساڵ لەمەپێش چیم بۆ تۆ و براکەت نووسی بوو، نووسیبووم کە بەروبووم و حاسڵاتی گەنمەکەم زۆر خراپە، پاریش هەر باسی خراپی بەرو بوومەکەم بۆ کردبوویت... هەموو ئەمە دەزانیت و هیشتا دەتەوێ گلەیی لە باوکی خۆت بکەی کە پارەی کەمت بۆ دەنێرێ؟ من، خۆیشم. جل و بەرگی پێویستم نییە. چواردانە ساڵە جلم بۆ خۆم نەکردووە و جلە کۆنەکانیشم شڕ و وڕبوون. تاقە کوپیکێک بۆ خۆم خەرج ناکەم. بەڵام چار نیە و سەبر دەکەم. ئێستا سی و پێنج ڕۆبڵی ئەسکەناست بە حەواڵەدا بۆ دەنێرم کە بە نرخی بازاڕی مۆسکۆ، دەکاتە چل و سێ ڕۆبڵ و هەفتا و پێنج کوپیک. ئیدی بە شێنەیی و ئاقڵانە خەرجی بکە، چونکە دووپاتی دەکەمەوە کە تا ماوەیەکی زۆری دی، تووانای ئەوەم نابێ هیچ پارەیەکت بۆ بنێرم."

فیدور، هەست بە نائومێدییەکی زۆر دەکات، لە ١٨٣٨/٨/٩ دا نامەیەک بۆ میشێلی برای دەنێرێت: "تۆ گلەیی لە بێ پارەیی خۆت دەکەیت، بەڵام منیش بووە نیم. باوەڕبکە بە درێژایی ماوەی مانۆڕەکان تاقە کوپیکێکم لە بەرکدا نەبووە. لە ڕێگادا لە سەرما و لە برسانا نەخۆش کەوتم (لە یەکبینە دەباری و هیچ شوێنی نەبوو خۆمانی بدەینە پەنا.) پارەی ئەوەم پێ نەبوو، کوپێک چایی گەرم بکڕم... نازانم کەی ئەم بیرە خەمناکانە بەرۆکم

بەردەدەن؟) ئەوسا لە پەراوێزی هەمان نامەدا دەنووسێت: "من پڕۆژەیەکم بەدەستەوەیە: شێت بوون." لە ١٨٣٨/١٠/٣١دا لە نامەیەکی دیکەدا دەڵێت: "بەڕاستی، لەوە ناخۆشتر نییە کە ئینسان بەبێ هیوا و ئومێد بژی برایەکەم. کە تەمەشای پێش خۆم دەکەم لە ئاینده دەترسم. من حاڵی حازر لە جەوێکی بەستەڵەکدا، لە ناوچەیەکی جەمسەریدا، کە کەمترین پرتەوی هەتاوی ناگاتێ، گیرم خواردووە. ماوەیەکی زۆرە نەک هیچ سەرۆ و ئیلهامێکی هونەری بە مێشکمدا نەهاتووە. بەڵکو زۆرجار هەمان هەستی زیندانییەکەی شیلون (شیلون: قەڵایەکە لە سویسرا، لە سەدەی سیانزە لە ڕەخی دەریاچەی لیمان، لە نزیکی مونترو دروستکراوە، مەڵبەند و بارەگا و نیشیمەنی میرانی ئال سافوا بوو، بونیڤار (١٤٩٣ - ١٥٧٠) کە تێکۆشەرێکی نیشتمانپەروەری خەڵکی جنێف لەوێدا زیندانی کرا، بایرونی شاعیری ئینگلیز قەسیدەیەکی بەو بۆنەیەوە بە ناونیشانی زیندانییەکەی شیلون داناوە). دەمگرێت، کە لە دوای مەرگی برایەکەی لەو زیندانەدا دەژیا."

هەڵــبەتە لەم نــامە ســـکاڵائامێزانەدا، بە ئاشـــکرا ئامــاژە بــۆ ئەو کتێـــب و بەرهەمانە دەکات کە تازە خوێندوونیەوە. ئەوەتـا بە بـراکەی دەڵێـت: "تـۆ لافـی ئەوە لێدەدەی کە زۆرت خوێندۆتەوە، بەڵام وانەزانی بەغیلیت پێـدەبەم، چـونکە منـــیش لە پتروســـبورگدا هـــیچم نەخوێنـــدبێتەوە بە ئەنـــدازەی تـــۆم کتێبـــان خوێنـدۆتەوە" لەڕاسـتیدا هەمـوو بەرهەمەکـانی هوفمـانی بە هەردوو زمـانی ئەڵمانی و ڕووسـی خوێنـدبووەوە. هەروەهـا زۆربەی هەرەزۆری بەرهەمەکـانی (بەلزاک)یشـی خوێندبووەوە و، لەمبارەیەوە دەنووسێت : "بەلـزاک گەورەیە".... هەروەهــا فاوســـتی گـــوتە و هەنـــدێ لە قەســـیدە کورتەکـــانی خوێنـــدبووەوە. هەروەها کارەکانی ڤیکتۆر هۆگۆشـی، جگە لە (هیرنـانی و، کرومویـل) هەمـوو خوێنــــدبووەوە. لەو بـــارەیەوە دەڵێـــت: "هۆگـــۆ، فریشـــتەی خالیســـەیە، بەڵام فەرەنســـییەکان وەکـــو پێویســـت قەدری نـــازانن و نـــاگرن، بەڵام ســـەبارەت بە نیســـارد nisard، کە ڕەخـنە لە قەسـیدە بەناوبانگەکـانی (odes et ballades) دەگرێت، هەرچەند پیاوێکی زیرەک و هزرڤانە، بەڵام درۆدەکات)

بەڵام شـیللەر، کـارێکی یەجگـار زۆر لە دوستویفسـکی دەکـات. لەمبـارەیەوە دەڵێــت: "هەمـوو بەرهەمەکــانی شـــیللەرم ئەزبەر کردبــوو، شـــیللەر بــوو بــوو بەوێـردی ســـەرزارم و خولیـای خەونەکـانم. ئەدی ســەبارەت بە ڕاســین؟ تــۆ دەڵێی کە ڕاسین شــیعری باشــی نیــیە، باشــە تــۆ (ئیفیژنــی)ت خوێنـدۆتەوە؟ دەتـوانی بڵێـی بەرهەمێکـی بەرز نیـیە؟ ئەدی شـانۆنامەی (فیـدر)؟ بـراله تـۆ ئەگەر ئەمە بە لوتکەی تەبیعەتـی ڕاسـتەقینە لە چوارچێـوەی شـیعرا نەزانـی، ئەوە تەنیا ڕەئی تۆیە و کەسـی دی ئەو ڕەئـیەی نـیە ونابێـت. (ئەدی کورنیـل)؟ شـــانۆنامەی (لوســـید)ت خوێنـــدووەتەوە؟ دامــاو بــڕۆ بیخــوێنەوە، بیخــوێنەوە و کڕنۆش بۆ کورنیل ببە و داوای بوردنی لێبکە چونکە سووکایەتیت پێکردووە..."

هەڵبەتە (میشیل)ش کە ئەم نامانەی بۆ دەچوو، خوێنەرێکی زۆر جدی و هەستیار، هێندەی شیعر دەخوێندەوە و دەنووسی تا گێژ دەبوو. جارێک نامەیەک بۆ ماجۆر دەنێرێت و دەڵێت: "باوکە، مژدەت لێ بێ، پێموایە توانا و بەهرەی شاعیریم تیایە، تائێستا کۆمەڵێک شیعر و قەسیدەی کورت و بچووکم نووسیوە، بەڵام ئێستا دەستم داوەتە دانانی شانۆنامەیەک..."

نامەکەی میشیل بۆ بابی، کە بێگومان دکتۆر پەست و تووڕە دەکات، بە ڕاشکاوی و بەمجۆرە دەست پێدەکات: "هەموو شتێکم لێ بسەننەوە، با ڕووت و ڕەجاڵ بم. تەنیا شیللەرم هەبێ، بەسمە، هەموو دنیا فەرامۆش دەکەم." قەسیدەکانی میشیل، سەرنجی براکەی ڕادەکێشن، لەمبارەیەوە دەنووسێت: "شیعرەکانم خوێندەوە. بە دیاریانەوە گریام، تا ماوەیەک ئارامیان بە ڕوحم بەخشی." هەڵبەتە بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەی خۆی، قسەکانی شیدلوفسکی هاوڕێ و هاوتەمەنی خۆیان، بە نموونە دێنێتەوە. ئەم شیدلوفسکییە کوڕێکی سەیر و ئەتوار غەریب بوو. فیدور، لەبارەی ئەوەوە دەڵێت: "کە سەیری دەکەی، سەروسیمای بابایەکی شەهیدی هەیە، تا بڵێی لەڕ و لاواز و باریک و بنێسە. گۆناکانی قوپاون. چاوەکانی وشک و نیگای گەرم و پرشنگدارە." برایانی دوستویفسکی، لە یەکەم ڕۆژی گەیشتنیان بە سان پترۆسبۆرگ، تووشی ئەم کوڕە بوون و دەگەڵی ئاشنا بوون، لە هەمان ئوتێلدا کە ئەمانی لێ دابەزین، تووشی بوون و ئاشنایەتیان دەگەڵیدا پەیداکرد، کاتێ کە فیدور و میشێل زانیان ئەم کوڕەی کە تازە لە وەزارەتی داراییدا دامەزراوە، شاعیرێکی ڕاستەقینەیە و بەتەمایە شیعرەکانی چاپ و بڵاوبکاتەوە، ئیدی بە جارێ ڕموودەی بوون و پەیوەندییان لەگەڵدا توخ کردەوە. تەنانەت خودی ماجۆرش دڵبەندی ئەم گەنجە بە زمان و تەڕفام و ڕۆشنبیرە بووبوو، کە هەمان شێواز و مەندی و گۆنگی شاعیری ئینگلیز، لۆرد بایرونی هەبوو. ئەم شیدلوفسکییە، لە سەرەتاوە جووتە برای بەنێو پایتەختدا گێڕا، پاشان لەگەڵیاندا چوو بۆ زیارەتی کەتەدرا و کڵێسا گەورەکەی قازان، پاشان کە کەوتە هاتوچۆ لەنێوان سان پترۆسبوگ و ڕیڤیلدا، نامەی جووتە برای بۆ یەکتر دەبرد. دۆستویفسکی لەمبارەیەوە دەڵێت: "ناسینی شیدولفسکی، هیچی تیا نەبووبێ، ئەمەی تیابوو، کە چەند سەعاتێکی پێ بەخشیم، کە بە جوانترین کاتی تەمەنم دێنە ژماردن.... تەحا کە ڕۆحێکی پاک و دۆستانەی هەبوو، کە ئەو کاتانەم بیر دەکەوێتەوە، لەخۆشیا فرمێسک لە چاوانم قەتیس دەمێنن!"

لە ڕاستیدا، فیدور و میشێل، شەیدای ئەم شاعیرە بوون، ئەم شاعیرەی کە دەڵێت: "من گڕکانم، ئاگر ماک و ڕەگەزی منە." کە هەر واش بیری دەکردەوە، زۆر کاری لە فیدور و میشیل دەکرد. شیدولوفسکی، کیژێکی خۆشدەویست بە ناوی ماری، شێت و شەیدای بووبوو. بەڵام کچە شووی بە کەسێکی دیکە کرد. دۆستویفسکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر ئەم ئەشقە نەبوایە، ئەم گەنجە نەدەبوو بەو ئەویندار و ڕەبەنە پاک و گەورەیەی شیعر"

شیدولوڤسکی، لە گومانی ئاینییدا دەژیا. جارێ خۆی لە خوا نزیک و جارێ خۆی دوور دەبینی. لەنێوان کوفر و ئیماندا وێڵ و سەرگەردان بوو. شەوان سەرقاڵی نووسینی کتێبێک بوو دەربارەی مێژووی کڵێسای ڕووسی. بەڵام کەش و هەوای پتروسبۆرگی بەدڵ نەبوو، بۆیە چوو بۆ گوندی و گۆشەگیر و تەریک دەگەڵ دایکیدا دەژیا. ئیدی تووشی وەجدو جەزمەیەکی عیرفانی ڕاستەقینە دەبێت و تووشی نیگەرانی و وازوازییەکی زۆر دەبێت و لە دەرمانێک دەگەڕێت. شڵەژان و پەشێوی و نیگەرانییە دەروونییەکانی خۆی پێ دابمرکێنێتەوە. هەڵبەتە ئەم دەرمانەی لەوەدا دەبینییەوە کە پەنا وەبەر پەرستگە و دێرێک بەرێت و بکەوێتە چلەکێشی. بەڵام ئەمەش دادی نەدا. بەڵام دوای ئەوەی نائومێد بوو و نەیتوانی ئاسوودەیی و ئارامی ڕوحی و دەروونی خۆی بەدەست بێنێ لێبڕا بچێتە زیارەی مەقامی سانت لوری، پەرستگە بە ناوبانگەکەی شاری کییف، یەکێک لە پیاوچاکانی ئەوێندەر کە لاف وگەزافی کەشف وکەراماتی لێدەدا کۆمەڵێک ئامۆژگاری و ڕینوێنی کرد. دیارە ئەم ڕەوش و ڕێبازەی شیدلوڤسکی پاشان لە ڕۆمانی کارامازۆفدا ڕەنگدەداتەوە، کاتێ کە زوسیم ئامۆژگاری ئەلیوشا کارامازوف دەکات کە ڕێگای ڕزگاری لەناو ژیاندا بەدەست بێنێ نەک لە پەرستگەدا. شیدلوڤسکی دەگەڕێتەوە بۆ موڵک و باخەکەی خۆی، بەڵام جل و بەرگی ئەهلی ڕەبەنایەتی دا ناکەنێت. زۆرجار دەچێتە سەفەران، لە ڕێگادا لە کاروانسەرایەک لادەدات و ئینجیل بۆ ئەو جووتیارانە دەخوێنێتەوە کە بەسەری کوتەوە رادەوەستن و گوێی بۆ ڕادەێرن. شیدولوڤسکی لە ساڵی ١٨٧٢دا کۆچی دوایی دەکات.

گومان لەوەدا نییە کە تەنع و تەبیعەتی گوێڕایەڵانە و ملکەچانەی مەسیحیانەی ئەلیوشا، و نکوڵی شەیتانیەکەی ئیڤان کارامازوف، لە سەرانسەری بەرهەمەکانی (فیدور میخائیلوفیچ دوستویفسکیدا) بەدی دەکرێت، و ئەگەرچی ئەمە کارپگەریی شیدلوفسکی بەسەر ڕۆحی دوستویفسکییەوە پێوە دیارە، بەڵام دوستویفسکی بە خۆیشی هەمان سیفەتی تێدا هەبووە و تا کۆتایی تەمەنی لێی نەبووەتەوە و بەری نەداوە. دۆستویفسکی وەکو زۆربەی قارەمانانی ڕۆمانەکانی بوونەوەرێک بوو لە "ئاگر و سەهۆڵ". دۆستویفسکی لە یەکێک لە تاقیکردنەوەکاندا دەرناچێت و ساڵێک دوادەکەوێت. نامەیەک بۆ براکەی دەنووسێت و دەڵێت: "ئەمساڵ دەرنەچووم، ناچمە پۆلێکی بالاتر. بەڕاستی ناخۆشە!... دەبێ یەک ساڵی دی، ساڵیکی ڕەبەق، من دیسان کاربکەم و هەمان ڕێگا بکوتمەوە!" گلەیی لە مامۆستای جەبر دەکات، کە بەنەهەق دەری نەچواندووە. ئەم مامۆستایە ڕقی لێیەتی. هەمووان ڕقیان لێیەتی دەنووسێت: "بە من بێ دنیا داغان بکەم."

هەر هەموو نمرەکانی بۆ بابی دەنێرێت، لە کۆ و تێکڕای نمرەکانیدا دەگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە زوڵمی لێکراوە. لیژنەی تاقیکردنەوە غەدریان لێکردووە.

بۆ بابی دەنووسێت: "خودایا من چیم کردووە تا غەزەبم لێبگریت. بۆچی بەهانامەوە نایەیت و دڵی بابم، کە زۆری خۆش دەوێم، خۆش ناکەیت. مەگەر خوا بزانێ چەندم فرمێسک ڕشتووە! هەندێ قوتابی هەن، وەڵامەکانیان لە هی من خراپترە و چونکە واسیتەیان هەیە دەرچوون." زۆری خەفەت بەمە خوارد، نەخۆش کەوت و چەند ڕۆژێک بە ناچاری لەجێدا کەوت. تاقە شتێک کە مایەی دڵنەوایی ئەوبوو، ئەو نامە و کتێبانە بوو کە براکەی لەو ماوەیەدا بۆی دەنارد. بە تاسەوە چاوەڕوانی نامەێن براکەی دەکرد. کە نامەکانی پێ دەگەیی، دوودڵ بوو لە کردنەوەیاندا. بە سەعاتان نامەکانی بە سنگ و بەرۆک و دەموچاوی خۆیەوە دەنووساند و زۆری لەزەت و خۆشی لێدەبینی. بەڵام لەم دواییانەدا، کاتێ کە نامەکانی هەڵدەپچڕی، هەستی بە جۆرە نائومێدییەک دەکردا! میشێل گۆڕابوو، میشێلەکەی جاران نەبوو. میشێل باسی خۆجوان کردن و بە خۆڕاگەیشتنی دەکرد، لە فیدوری دەپرسی کە ئایا سمێڵی هاتووە، سمێڵی داناوە؟ لە نامەکانیدا ئاماژەی بۆ کچۆڵەیەک دەکرد، هەرچەندە دەگەڵ بلیمەتی شیعریی ئەودا تێکی نەدەکردەوە، بەڵام بە هۆش و فامیدەبوو. بەهەرحاڵ ئەو کچە هاتبووە ژیانی ئەوەوە و ناوی ئیمیلی ڤۆن دیتمیر بوو. ئەم کچە لە شاری روڤیل دەژیا. بە شێوەیەکی گشتی لەوە دەچوو میشێل، بەتەمای زەماوەند و ژنهێنان بێت. دیارە ئەم کارە ڕێگەی نووسینی لێنەدەگرت. بەڵام بە جۆرێ قسەی دەکرد وەکو ئەوەی کاری شیعر و شاعیری بێگار بێت. هەموو ڕۆژێ دوای نانی بەیانی لە خەیالاتی بەرز و ڕۆمانتیکیانەی خۆیدا نقوم دەبوو. بەهەرحاڵ ئەم شاعیرە حاڵی حازر ئاشقی ئینسانێک بوو، کە لە واقیعدا هەبوو، دەبوایە پابەندی بێت و وەکو شیدلوڤسکی ئەم بیانوەشی نەبوو کە بڵێت عاشقێکی بەدبەختە و ماشوقەکەی حەزی لە کەسێکی دی کردووە.

فیدور، زۆر درەنگ کەڵکەڵە و خولیای ژیانی سۆزداری پەیدا دەکات، ئەویش بە چ شێوەیەکی خەمناک!... ئێستا بە دەم و چاوەڕوانی ئەوەوە کە بە خۆی تامی ئەشق بچێژێت، لە هەوڵی ئەوەدابوو کە مانای ئەشق لەلای خەڵکانی دی تێبگات و لەو بارەیەوە داوەرییەکی دروستی هەبێت، بەڵام لەپڕا، زۆر کلۆڵانە گومڕا دەبێت. لە کتێبی (یاداشتە ژێر زەمینییەکاندا) دەڵێت: "من تەنیام، ئەوان زۆرن!"

لەو سەربەند وماوەیەدا، چیوای نامێنێ ڕووداوێکی ترسناک ڕوودات، کە نیگەرانیی و پەریشانی فیدور دەگەیەنێتە لوتکە.

## فەسڵی پێنجەم

### مردنی باب

دوای ئەوەی دۆستویفسکی باوک، فیدور و میشێلی گەیاندە سان پترۆسبورگ، هەردوو کورە چکۆلەکەی خستنە قوتابخانەی شەوانەڕۆژی چیرماک، بە خۆی چوو بۆ موڵکەکەی "داروڤویی" تا لەوێ بە کاروباری کشتوکاڵیدا ڕابگات، هەردوو کیژە چکۆلەکەشی ڤیرا و ئەلکساندراشی دەگەڵ خۆیدا بۆ گوند برد.

تەنیایی لە داروڤوییدا زۆر خەمناک بوو، تەحەمول نەدەکرا، ماجۆر بەڕادەیەک سەری کردە بادەنۆشی، کە تووشی سەرەگێژکێ و ماخۆلان بوو. ئەلیونای کارەکەری ماڵەکە دەیگێڕیتەوە کە هەندێجار واڕێدەکەوت کە بە دەنگی بەرز دەگەڵ تاپۆی ژنەکەیدا قسەی دەکرد. لە کاتی پرسیار و وەڵامدا، دەنگی خۆی دەگۆڕی و هەمان ئەو وشە و دەستەواژانەی بەکاردەبرد کە کاتی خۆی ژنەکەی بە کاری دەبردن. شەوان، لەناکاوا خۆی بە ژووری کچەکانیدا (ڤیرا و، ئەلکساندرا)دا دەکرد و ژێر تەختەخەوەکانیان دەگەڕا، نەبادا کەپڵ و دەنکەکانی خۆیان هێنابنە ژوورەوە و لەژێر تەختە خەوەکاندا پەنایان دابن. ئەوسا دەهاتە دەرێ، ژوور بە ژوور دەگەڕا، بە دەنگی بەرز گلەیی لە ژیان، لەو زوڵمەی لێی کرابوو، لە ژیانی بە باچووی خۆی دەکرد. جا بۆ ئەوەی خۆی لەم تەنیایی و ڕەشبینییە ڕزگاربکات، هەستا یەکێک لە کارەکەرەکانی خۆی، بە نێوی کاترین کرد بە قەپاتمە و ماشقەی خۆی. پاشان بیری لەوەکردەوە کە یەکێک لە ژنانی موڵکداری ئەو دەڤەرە بە ناوی ئەلکساندرا لاگڤنوڤ بخوازێت، بەڵام سەرەنجام نەیتوانی خۆی یەکلایی بکاتەوە و بڕیاری جدی بدات و خوازگاری بکات.

بەرو بوومی موڵکەکان زۆر نەبوو. ئیدارەکەی ماجۆر یەجگار لاواز بوو، بە ئاشکرا نیشانەی نابووتی و ئیفلاسی پێوە دیاربوو. هەرکە باسی ئەوە هاتبا پێشێ کە کەمێک پارە بۆ نۆژەنکردنەوەی بارودۆخی کشتوکاڵی موڵکەکە تەرخان بکرێت، میخائیل ئاندریوفیچ وەکو فیشەکە شێتە دەچوو بە ئاسماندا، شێت و هاردەبوو و لە ئەنجامدا هەرجۆرە خەرجیەکی لەو بارەیەوە بە بێهوودە دەزانی. ڕژدی و ڕەزیلیەکی بێ ئەندازە، بەسەریدا زاڵ بوو بوو. "بارب"ی کچیشی لە ڕەزیلیدا چووبووەوە سەر بابی. دوای مردنی مێردەکەی، هەرچەندە سەروەت و سامانێکی زۆری هەبوو، کەچی نۆکەرانی ماڵەکەی جواب کرد، سۆپای دانەدەگیرساند تا ماڵەکەی گەرم بکات، لە خواردنا ڕەزیلی دەکرد، تەنیا نان و شیری دەخوارد، کە هەواڵی مەرگی بابی ژنەوت گوتی: "سەگ دەبێ وەکو سەگ بتۆپێ". ئەوەبوو بە خۆیشی لە ساڵی ١٨٩٣دا لەلایەن چەند دزێکەوە کوژرا و جەنازەکەیان سووتاند.

ماجۆر، کەسێکی خۆپەسەند و توندە تەبیعەت بوو. لە داروڤوییدا، لە بێکاری و نائومێدیدا، عەیبە دەروونیەکانی زیاتر دەردەکەوتن. ئیدی لێرەدا پشم و غەزەب و داخی خۆی بە موجیکەکان (جووتیاری کۆیلە) دەڕشت و تۆڵەی خەم و پەژارەی خۆی لەوان دەکردەوە. ڕۆژێک موجیکێک بەنێوی فیدوت، ئاگای لە هاتنی ئەو نابێت و سڵاوی لێناکات. ماجۆر ئەمری پێدەکات "دەبێ بچی بۆ تەویلەکە تا بەر شەلاقان بدرێی." ئەمرەکە یەکسەر جێبەجێ دەکرێت.

لە زستاناندا، موجیکەکان نەیاندەزانی چ ڕەفتارێک بکەن و چ هەڵوێستێک بنوێنن. ئەگەر سڵاویان لێکردبا، هاواری بەسەردا دەکردن: "تۆڵەبابینە، ئێوە بە ئانقەست شەپقەکانتان دادەگرن تا سەرماتان ببێت و بەو بیانووەوە نەچنە کار!" ئەگەر سڵاویان لێنەکردبا، دەبوایە شەلاق بخۆن.

لە ساڵی ١٨٣٩دا، موجیکەکان پلانێک لە ئەربابە ڕژد و پیسکە و بەدخووەکەی خۆیان دەگێڕن کە بیکوژن. بەیانیەکی ڕۆژێکی مانگی حوزەیران، ماجۆر هەموو موجیکەکان کۆدەکاتەوە تا پەین و زبڵ بگوازنەوە بۆ مولکەکە. سیان لەم موجیکانە کە لە گوندی چیرماچنی دەژیان، ئامادە نابن، ماجۆر لە هۆی ئامادە نەبوونەکەیان دەپرسێت. پێشکارەکەی وەڵامدەداتەوە کە نەخۆشن. ماجۆر، تووڕە دەبێت، لە حەژمەتاندا، دەکەوێتە کەفپڕژاندن و کوتەکە سەر بە بزمارەکەی ڕادەوەشێنێ و دەڵێت: "ئێستا دەڕۆم بەمە چاکیان دەکەمەوە." بەڵام گالیسکەچیەکە کە لە پیلانەکە ئاگاداربوو، هاواری کرد: "قوربان، بەو حاڵەوە مەڕۆ، لەوەیە شتێکت بەسەر بێت." دۆستویفسکی پیر پێ بە عاردیدا دەکوتێ و دەڵێت: "وادیارە تۆ ناتەوێ چاکیان بکەمەوە. خێرا ئەسپەکان لە عەرەبانەکە ببەستە و بە پەلە بازۆ با بڕۆین." عەرەبانچیەکە، عەرەبانەکەی ئامادە کرد. کاتێ گەیینە چیرماچینی، دکتۆر سەیری کرد نەخۆشەکان، لەو گۆڕە دەسوڕێنەوە و عەلەمیان نییە. لێی پرسین: "بۆچی نەچوون بۆ کار؟" یەکێکیان وەڵامی دایەوە: "ماندووین." ماجۆر دارێکی سرەواندێ و ئیدی هەموو خۆیان بە حەسارێکی چوڵدا کرد، کاتێ ئاغایان، بەدوای ئەواندا خۆی بە حەسارەکەدا کرد، یەکێک لە موجیکەکان بەنێوی ڤاسیلی نیکیت کین کە زەلامێکی کەتەی دەم و قەپۆز ناشیرین و دزێو بوو، لە دواوە هەردوو باسکی گرت، دوانەکەی دی کە لەترسا حەپەسابوون، لەجێی خۆ نەجوڵان. ڤاسیلی گوتی: "چیتانە؟ مەگەر بەڵێنمان نەدابوو؟" هەنگێ موجیکەکان پەلاماری ماجۆری بەد بەختیان دا. قۆڵبەستیان کرد و دایان بە عاردیدا. بەڵام لێیان نەدا، بۆ ئەوەی شوێنەواری لێدان بە جەستەیەوە دیار نەبێت، بەڵام کێردێکیان هێنا، خستیانە بەینی ددانەکانیەوە، دەمیان کردەوە و وێڕای ئەوەی زۆری لەقە فرتێ کرد، مەیەکی فرەیان کردە دەمیەوە و ئەوجا بە پەڕۆیەک دەمیان بەست تا بخنکێ. بەڵام ماجۆر گیان سەخت بوو، نەمرد، یەکێک لەو بێنەوایانە بەدەست هەردوو گونی گرت و تا هێزی تیابوو گوشینی. یەک دوو جار هەڵپلکا و ئەوجا ساردبووەوە. گوتیان: "سەرخۆش بوو و بە سزای خۆی گەیی." کابرای نیوە گیانیان لە عەرەبانەکە بارکرد، عەرەبانچیەکە

که لەترسا ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، قامچیەکی بە ئەسپەکاندا کێشا و عەرەبانەکە بەو دەشتە هێدی و ئارامەدا کەوتەڕێ. بەڵام لەو ساتانەدا، داب و نەریت و بیرێکی ئاینی ئەم تاوانبارانەی ئازار دەدا: بابایەکی مەسیحی هەرچەندە قێزەون و کرێتیش بێت، نابێ پێش ئەوەی لەبەردەم قەشەیەکدا ئیعتیراف بکات، بمرێت. ئەدی تەگبیریان چییە؟ هەر سێ موجیکە هاودەستەکە، ماجۆریان لە ژێر داربەڕوویەکدا دانا و چوون بۆ گوندەکەی دراوسێیان تا قەشەی بۆ بێنن. کاتێ قەشەکە گەیە ئەو شوێنە، ماجۆر هێشتا هەناسەی دەدا، بەڵام توانای قسەکردنی نەبوو، لە زمان کەوتبوو. ئیدی قەشەکە ئیعتیرافی بێدەنگی لێقەبووڵ کرد و بە دوعا و نزا یارمەتی دا و دوا هەناسەی دا. پاشان لە عەرەبانچیەکەی پرسی: چیتان لێکردووە؟ عەرەبانچیەکە بەرسقی دایەوە: "تووشی خوێنڕێژی ناوەوە بووە."

لە لێکۆڵینەوە وتاقیقدا هیچ شتێک دەرنەکەوت. تەنانەت خزم و خوێش و کەسەکاری ماجۆریش، هەوڵیاندا، مەسەلەکە دیزە بە دەرخۆنە بکەن و بیشارنەوە. چونکە ئەگەر قازی و دادسێنەکان بە کوشتنەکەی ماجۆریان زانیبا، هەر هەموو موجیکەکانی چیرماچینی، ڕادەکێشرانە پای دادگا و مەحکوم دەبوون و ڕەهەنەی سیبریا دەکران. دیارە ئەمەش کاری کشتوکاڵەکەی بە تەواوەتی پەک دەخستن و لە ئەنجامدا باری ئابووری خانەوادەکە دەشێوا و بێئەوەی هیچ قەرەبوویەکی مەعنەویان دەست بکەوێ. فیدور، هێشتا لە قوتابخانەی ئەندازیاری بوو کە ئەم هەواڵەی بیست. مانگێک پێشتر نامەیەکی توورە و پڕ لە گلەیی بۆ بابی ناردبوو وداوای پارەی لێکردبوو. ڕەنگە هەر هەمان ڕۆژی ڕووداوەکە، لە دڵی خۆیدا نەفرەتی لە پیسکەیی و نەژنەوی ماجۆر کرد بووبێ و ڕێک لەو ساتانەدا، کە دۆستۆیفسکی پیر دوا هەناسەی دەدا، کوڕەکەی لە دڵی خۆیدا لێی توورەبووبێت و گلەیی لە خۆپەرستیی پیرەمێردانەی بابی کردبووبێ.

تاوانی موجیکەکان، وەکو بارێکی قورس گوشاری دەخستە سەر دڵی فیدور، ئیدی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، هەستی بە بەرپرسیاریەتی تاوانێک دەکرد کە ئەو نەیکردبوو. بە جۆرێ هەستی بە عەزابی ویژدان دەکرد، وەکو ئەوەی مەسئولیەت و بەرپرسیاریەتی ڕاستەوخۆی تاوانبارە ڕاستەقینەکان لە چاو مەسئولیەتی ویژدانی ئەمدا نەکەنە هیچ. فیدور، تاوانباربوو بەڵام نەک لە ڕوانگەی یاسایی ئاسایی کۆمەڵگەوە، لە باری دەروونیەوە جۆرە هەستێکی دەروونی لا دروست بووبوو. کە هەواڵی مەرگی بابی ژنەوت تووشی خۆرە شوکێکی ترسناک بوو، ئازای هاتە لەرزین، گیانی هاتە گرژبوون، بەدەم لەرزین و کەف پرژاندنەوە، کەوتە سەر زەوی، ئایا ئەمە یەکەمین نۆرە فێ لێهاتنی ئەو بوو؟ دوورنیە! دۆستویفسکی، لە نامەکانی خۆیدا، هەرگیز باسی ئەم نۆرە فێ لێهاتنەی خۆی ناکات. بەڵام ئەم شۆکە لەوە بەهێزتر بوو کە بێتە شاردنەوە. دەبێ لە ڕۆمانەکانیدا بۆ شەرح و شرۆڤەی ئەم نیگەرانی و دەروون پەرێشیانەی نووسەر بگەڕێی. بۆ نموونە لە ڕۆمانی (برایانی

کارامـازۆف)دا دەبینـین سـمیردیاکوف، کارامـازوفی پیـری کوشـتووە، کەچـی نووسـەر گوناح و تاوانی ئەو بە کەمتر لە گوناح و تاوانی ئیڤان کارامازوفی کـوڕە نۆبەرەکەی کارامازوف، کە بکوژی ڕاستەقینەی باوکێتی، دەزانێ، چونکە ئیڤان ئاواتی بە مەرگی بابی خواستبوو و ئـارەزووی شـتێکی وای کردبـوو، هەڵـبەتە بێـئەوەی هـیچ هەنگـاوێکی پراکتیکـی، بـۆ ئەنجامـدان و پراکتیزەکردنـی ئەو بیرۆکەیە، بنێت. سمردیاکوڤ، بە ئیڤـان دەڵێـت: "تاوانبـار و بکـوژی ڕاسـتەقینە تۆیت نەک من، هەرچەندە مـن کوشـتوومە." ئیڤـان کارامـازوف دەڵێـت: "یـانی من تا ئەم ڕادەیە بە ئاواتی مەرگی بابمەوە بووم."

لە ڕۆمـانی (ئەهریمەنـان)دا، پییـر سـتیپانوفیچ، نەخشـەی سـەربڕین و خنکاندنی ژنەکەی ستاڤروگین دەکێشێت، کەچی ستاڤروگین، مەسـئولیەتی ئەو تاوانە، کە لە دڵی خۆیـدا و ژێراوژێـر بە ئـاواتیەوە بـووە هەڵـدەگەڕێت، بەڵام وێڕای ئەوەش دەڵێت: "من نەمکوشتووە، بەڵکو دژی ئەم نەخشـەیەش بـووم" بەڵام تەنیا ڕەزامەندییەکی ژێراو ژێری دڵ، یان بێزارییەکـی پەنهـانی سـەبارەت بە کـوژراوەکە، بـۆ ئەوەی بمانکـات بە شـەریک و هاودەسـت لە تـاوانەکەدا، زاڵبوونێکی سەیرە فیکرە، بەسـەر مـادەدا، پەڕینـەوە لە مـادەوە بـۆ فیکـر. قەت بەرۆکی زەین و هزری دۆستویفسکی بەرنەداوە و هەمیشە پێوەی تـلاوەتەوە. یاسا تایبەتی و باوەکانی تەبیعەت، ئەنجامگیریەکـانی زانسـتە سروشـتیەکان، بونیـادە سـارد و بێگیـانە ماتماتکیەکـان، هەر هەموویـان لەسـەر یەک کەڵەکە دەبن تا "دیوارێکی بەردین" بێننە ئـاراوە، دەڵێـت: "هەڵـبەتە مـن ئەم دیـوارە بە تەوێڵی خۆم ناشکێنم، بەڵام ناچم تەنیـا لەبەرئەوەی دیـوارە، لە هەنبەریـا مـل بدەم و تەسلیم ببم." هەڵبەتە هەرگیـز ڕادەسـتی ئەم دیـوارە نەبـوو. بەردەوام لە هەوڵـی ئەوەدا بـوو، ئەم دیـوارە ببەزێنـێ، خـۆی بگەیەنێـتە ئەو دیـوی ئەم دیوارە. پاش ئەوەی لەم دیوارە تێدەپەڕێ، دەگاتە قەڵەمڕەوێک کە لۆژیک تیایـدا فەرمـانڕەوا نـیە. ئەو قەڵەمـڕەوە مەڵبەنـد و نیشـتمانی ڕاسـتەقینەی قارەمانەکانی دوستویفسکییە. دیارە جەستەی عەزابدراو و شـوێنراوی بـاوکی دۆستویفسـکی، دۆستویفسـکی دەگەیەنێـتە ئەم قەڵەمڕەوە غەریـبەی کە نە واقیعی تیادا زاڵە نە عەدەم. قەڵەمڕەوێـک کە بە پێـوەر و یاسـاێن خەڵکـی دی قـابیلی ڕوونکـردنەوە و شـرۆڤە نـیە. ئەو کەسـانەی کە بە گـوێرەی یاسـاێن زەمینـی بـێ تـاوانن، لەو قەڵەمـڕەوەدا کەمـتەرخەم و تاوانبـارن. لەوێـدا، بەگـوێرەی کـردار، مـامەڵە دەگەڵ خـاوەن کـردارەکەدا ناکرێـت، لەوێـدا. سـۆز و گوداز جێگای دوکومێنت و بەڵگان دەگرێتەوە، هزرو بیران دەبـن بە هەڵـم، هـیچ شـتێکی جێگیر و نەگۆڕ و بەڵگەدار لە ئارادا نـیە. هـیچ شـتێک نیـیە پێشـوەختە داوەری کرابێ. دۆستویفسکی لەگەڵ هەر جەزرەبەیەکی تازەی قەدەرا، زیـاتر لە واقیعی بنجبڕی بێ چەند و چوونی ژیان دوور دەکەوێتەوە، تـا لە ڕاز و ڕەمـز و نهێنیان نزیک ببێتەوە. لەوبارەیەوە دەڵێـت: "لەدنیـادا، هەنـدێ ڕووداو و شـتان هەن، کە ئینسـان، ناوێرێ بۆ خودی خۆیشـی کەشـفیان بکات."

## فەسڵی شەشەم

### ئیلهام و سەرۆ

سەرەنجام دوای پڕینی کۆمەڵێک تاقیکردنەوە، دۆستویفسکی دەبێ بە ملازم. هەوەڵجار دەگەڵ "تۆتلیبین"ی هاوڕێیدا خانوویەکی بچکۆلە بەکرێ دەگرێت، پاشان خانوویەکی گەورەتر بەکرێ دەگرێت، هەرچەندە یەک ژووری مۆبێلە دەبێت، بەڵام هەزار و دووسەد ڕۆبڵی ئەسکەناس لەسەری دەکەوێت. بەڵام خاوەنی خانووەکە لە باری فیکرییەوە، بەدڵی ئەم دەبێت و ئەمەش بۆ دۆستویفسکی گرینگ دەبێت. هەروەها (سیمون)ی موراسیلی، پیاوێکی زۆر باش بوو و هی ئەوە نەبوو گلەیی لێبکات. دۆستویفسکی لەبارەیەوە دەڵێت: "با دزیم لێبکات، خۆ بەوە هیچم لێنایەت". لەڕاستیدا دۆستویفسکی زۆربەی کات دەستکورت و بێ پارەبوو. ئەگەرچی دەرامەتی، بەو بڕە پارەیەوە کە (کاربین)ی زاوایان، کە ئێستا بووبوو بە سەرپەرشتیار و سەروەسێتی خانەوادەکەیان، بۆی دەنارد، ساڵانە دەگەیە پێنج هەزار ڕۆبڵ. ژیانی لەو سەروبەندەدا زۆر پەشێو و پوچ و بێ بەرهەم بوو. هەموو بەیانیەک دەچوو بۆ دەرسی ئەفسەرانی قوتابخانەکە. شەوانی بۆ پیاسە و گەڕان تەرخان کردبوو. زۆری حەز لەو شانۆنامانە دەکرد کە لە شانۆی (ئەلیکساندر)دا پێسکەش دەکران. زۆری حەز لە ئاهەنگ و سەمای بالیە دەکرد، عاشق و شەیدای ئەو ئاهەنگە مۆسیقاییانە بوو کە کارەکانی (ئول - بول) و (لیست) یان پێشکەش دەکرد. دوای نیوەڕوان دەخزیە ژوورەکەی خۆیەوە و، لەنێو چەرە دووکەڵی شین و تاریکی جگەرەوە. سەرگەرمی کار دەبوو. ڕەنگی زەرد، گەورووی ئاوسابوو. زۆر دەکۆکی، زۆر خراپ داخاوت، گەرووی گیرابوو، بە ئاستەم دەنگی دەردەهات. ناوبەناو دکتۆر (ڕیزن کامپڤ) کە لە دۆستە نزیکەکانی برایانی دۆوستویفسکی بوو، دەهاتە دیدەنی و پڕێک دەرمانی بۆ دێنا، بەڵام دۆستویسفکی بەکاری نەدەهێنان.

لە ساڵی ١٨٤٠دا میشێل، دێت بۆ سان پتروسبورگ، تا بەشداری یەکێک لە تاقیکردنەوەکان بکات و تا شوباتی ساڵی ١٨٤١ لەوێندەر دەمێنێتەوە. بەر لە گەڕانەوەو سەفەری بۆ (ڕوڤیل) ئاهەنگێکی چکۆلەی دۆستانە سازدەکات. فیدور لەو کۆڕەدا، دوو درامای خۆی، یەکێکیان بە ناوی (ماری ستیوارت) و دووەمیان بە ناوی (بۆریس گودونوڤ) دەخوێنێتەوە. هەرچەندە دەستنووسی ئەم دوو درامایە دیار نەماون، بەڵام بە گوتەی هەندێک لەو کەسانەی کە لەو کۆڕەدا ئامادە بووبوون، دۆستویفسکی لەم دوو درامایەدا زۆر بە زەقی شتی لە بەرهەمەکانی شیللەر و پوشکینەوە وەرگرتبوو. سەرەنجام میشێل، پایتەخت (سان پتروسبورگ) بەجێدێڵێت و بۆ ڕوڤیل دەگەڕێتەوە، لەوێ، بە پێچەوانەی مەیلی سەروەسێتەکەیەوە، دەگەڵ (ئیمیلی ڤون دیتمیر) کە زۆرجار لە نامەکانیدا باسی کردووە، زەماوەند دەکات. دوای ئەوە بە چەند مانگێک. دۆستویفسکی ئاندرێی برای، کە بۆ خوێندن هاتبوو بۆ سان پتروسبورگ، دەباتە ماڵەکەی خۆی. فیدور ئەم کوڕە سست و خاو و لەش بە دۆشاو، بێ سەر و بەر و، وازوازیەی خۆش نەدەویست. لە نامەیەکیدا بۆ میشێل، لە بارەی (ئاندرێ)وە دەڵێت: "تەبیعەتێکی هێندە وشک و غەریب و کێویانەی هەیە، کە خەڵکی لێی دەڕەونەوە."

خۆشبەختانە ئاندرێ، لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٤٢دا لە قوتابخانەی ئەندازەی تەلارکاری وەردەگیرێت و فیدور تەنیاییە دڵخوازەکەی خۆی بەدەست دێنێتەوە. پارە بەرگەی ناگرێت، لەم دەستیەوە دێت و لەوی دیکەیانەوە دەڕوات. بەبێ پەروا خەرج دەکات. دۆسویفسکی پارەیەکی زۆر لە بلیاردا دەدۆڕێنێ، دەرفەتی خزمەتکاران دەدات، بەوپەڕی ئاسانی دزی لێبکەن. دەچێت بۆ لای میشێلی برای و دەبێت بە بابی تەعمیدی کوڕە نۆبەرەکەی میشێل. بەڵام سەروسیما و وەزع و حاڵێ تەندروستی و جل و بەرگی، هێندە نالەبار و خراپ و شپرێو دەبێت، کە میشێل و ژنەکەی لەبەردەم دۆستەکانیاندا، هەست بە شەرمەزاری دەکەن. ئیدی هەندێ جلوبەرگ و جلی ژێرەوەی بۆ دەکڕن. تکا لە دکتۆر (ڕیزن خامپڤ) کە دەگەڵ دۆستویفسکیدا لە یەک خانوودا بژی تا سەرپەرشتی تەندروستی و چاودێری مەسروفاتیشی بکات. دکتۆری ناوبراو بە خۆشحاڵییەوە ئەم داوایە قەبووڵ دەکات. بەڵام ئەم تەگبیرەش هیچ دادێکی نەداو، ڕەوتی مەسروفاتی فیدوری نەهێنایەوە تایم. چونکە هەر کاتێ نەخۆشیکی دیتبا کە بۆ چارەسەر بۆ لای دکتۆر هاتبوایە و بە ڕواڵەت هەژار و نەدیار دیاربوایە، نەخۆشەکەی بانگ دەکردە پەنایەکەوە و لە ژیان و گوزەرانی تایبەتی دەپرسی و دوای ئەوەی لە دروستی و ڕاستی وەڵامەکانی یارۆی نەخۆش دڵنیا دەبوو، پرێک پارەی دەدایە. دکتۆر ڕیزن کامپف، لە نامەیەکدا بۆ میشێل، دەڵێت: "فیدور لە نامەکانیدا بۆ تۆ دەنووسێت کە بە هەژاری و نداری دەژی، هەمیشە کێشەی نەداریی هەیە، کەچی ئەوانەی دەوروبەری کە زۆر بە باشی دەژین، بێ ئینسافانە دزی لەو دەکەن، تاڵانی دەکەن." ڕۆژێک دۆستۆیفسکی، بەوپەڕی

متمانەوە، خۆی بەلای دکتۆردا دەکات، شاد و خۆشحاڵ، سەری بەرز دەگرێت و دەڵێت: "هەزار ڕۆبڵم لە مۆسکۆوە بۆ هاتووە." کەچی بۆ رۆژی دوایی، بە سەرشۆرییەوە، دێتەوە و داوا لە هاورێکەی دەکات کە پێنج ڕۆبڵی بە قەرز بداتێ. تومەز پرێک لە پارەکەی بە بلیارد دۆڕاندبوو و باقیەکەیشی، خەیاتێک لێی دزی بوو، ئەم خەیاتەی، بێئەوەی پارەکەی خۆی لە شوێنێکی قایم تاقەت بکات، بۆ ماڵەوە دەعوەت کردبوو. دوای ماویەک، بێئەوەی عیبرەت لە ڕووداوەکەی پێشوو وەربگرێت، پەیوەندی دەگەڵ کابرایەکی خوێڕی و ناکامی ئەڵمانی نەژادی، بێکارەدا دەگرێت. جاری دەعوەتی چا و جارێ دەعوەتی شیوی دەکات. هەندێ پرسیاری لێدەکات و وەڵامەکانی تۆمار دەکات و، هەڵبەتە لەبری ئەم کارە پارەیەکی دەدایە. دەستبڵاوی فیدور دەگاتە ڕادەیەک کە دکتۆر لە چاکبوونی نائومێد دەبێت. بەڵام لەناکاوا هەزار ڕۆبڵی دیکەی لە مۆسکۆوە بۆ دەنێرن و ئەمجارەش لەو کێشەی نەبوونیە دەخەلەسێت. لێ مخابن، دۆستۆیفسکی، کە بەو هەواڵە دەزانێ، لە خۆشیدا، بۆ شێو دەچێت بۆ خوارنگەی دۆمینیک. دوای شیوخواردن، هەوەس دەستێک دۆمینۆی لەگەڵ کابرایەکی نەناسی گومان لێکراوی ناو خوارنگەکەدا، دەکەوێتە سەر. بەڵام لەجیاتی یەک دەست یاری، بیست و پێنج دەست یاری لەگەڵدا دەکات و دوا کوپێکی خۆی دەدۆڕێنێ. دوای ئەم هەڵە گەورانە، ناچار دەبێت، بە قازانجی زۆر، قەرز لە سووتخۆران وەربگرێت و ئیدی وای لێدێت، بە ناچاری ڕەزیلی لە هەموو شتێک بکات و هەموو خواردن و خۆراکێکی دێتە سەر نان و شیر. هەڵبەتە لەبەر نەداری ناچار دەبێت هاتوچۆی شانۆش نەکات. ئیدی لەم کاتەدا، فیدور دوا تاقیکردنەوە دەپرێت و ئیدی وەکو کادرێک لەسەر میلاکی گشتی سوپا، لە بەشی نووسینگەی نەخشەسازی قوتابخانەی ئەندازیاری سوپایی دادەمەزرێت. ئەمە لە مانگی ئابی ساڵی ١٨٤٢دا ڕوویدا. پێش ئەمە بە نزیکەی مانگێک، واتە لە بەرواری هەمان ساڵدا، بالزاک، دوای حەوت ساڵ دووری، بە مەبەستی دیدەنی مەدام هانسکا دێت بۆ سان پتروسبورگ (هانسکا، خانمێکی پۆڵەندی بوو، خوشکەزای نووسەری پۆڵەندی رزوفسکی بوو، نامە و نامەکاریەکانی دەگەڵ بالزاک دا، بەناوبانگە، پاش ئەوەی بێوەژن کەوت، لە ساڵی ١٨٥٠دا، شووی بە بالزاک کرد)

دۆستویفسکی کە لەمێژ بوو دڵبەندی ئەم نووسەرە بوو و، بە پێشەنگ و مامۆستای خۆی دەزانی، هاتنی بۆ پایتەختی وڵاتەکەی دۆستویفسکی، دەبێتە مایەی ئەوەی کە دڵبەندی و خۆشەویستی دۆستویفسکی سەبارەت بە دانەر و نووسەری (کۆمیدیای مرۆڤانی) تازە ببێتەوە و بڕیار دەدات کە ڕۆمانە بەنێوبانگەکەی بالزاک (ئۆژینی گراندە) پاچڤە بکات. ئیدی نامەیەک بۆ براکەی دەنووسێت و دەڵێت: "ئۆژینی گراندەی بالزاکم پاچڤە کردووە. بەڕاستی شاکارە!. پاچڤەکەی منیش بێ هاوتایە.بەلای کەمەوە سێ سەد و پەنجا ڕۆبڵی کاغەزی لەسەر وەردەگرم. بەڵام تو زاتی خوا، تو فریشتەکانی ئاسمان، سی و پێنج ڕۆبڵم بۆ بنێرە. (با کۆپیەکی لەبەر بگرمەوە) سوێند بە

هەرچـــیەک تـــۆ بـــاوەڕت پێیەتـــی، بە خواوەنـــدانی ئۆڵەمـــپ، بە یانکـــال (کە کاراکتەری ڕۆمانێکی خۆمە و تـازە تەواوم کـردووە) بەچـی دیکە بـاوەڕدەکەی؟ ســوێند بە ســمێڵم کە ئومێـدەوارم ڕۆژێـک لە ڕۆژان بێـت، نیـوەی ئەو دەســت هەقەی کە لەســـەر پـاچڤەی ئـوژینی وەری دەگـرم، دەدەم بە تـۆ، دەی بـا بتبینم."

لەو مـــاوەیەدا، دکتـــۆر ڕیـــزن کـــامپڤ، لە ســـان پتروســـبۆرگەوە دەڕوات بـــۆ شـــوێنێکی دیـــکە. بێـــئەوەی بتـــوانێ "پرەنســـیپی ئـــابووری ئەڵمـــانی" لە دوستویفســـکی بگەیەنێـــت و فێـــری بکـــات. بەڵام کەی ئەوە کێشـــەبوو؟ هەواڵێکی گرینگ لە ئـارادا بـوو. کە دڵـی دۆسـتویفسـکی خـۆش دەکـردەوە و، قەرەبـووی دووری (ڕیـزن کـامپڤ)ی بـۆ دەکـردەوە و ئەو هەواڵەش ئەوەبـوو کە ئـــوژینی گرانـــدە، لە گۆڤـــاری (ڕیپـــۆرتەر پـــانتیۆن)دا بڵاودەبێـــتەوە، بەڵام سەرنووسـەری گۆڤارەکە سێیەکی کتێبەکەی لا بردبـوو، دۆسـتویفسـکی زۆری لەبەرگـــران دەبێـــت و بە گلەیـــیەوە دەڵێـــت: "ئەمە تـــاوانە!" لەڕاســـتیدا، دۆسـتویفســکی بە خۆیشــی خیـانەتی لە بەلـزاک کردبـوو، دەســتدرێژییەکی خەتەری کردبـووە ســەر ئـوژینی گرانـدە. هەر لەو سـنوورەدا نەوەسـتا بـوو کە پاچڤەیەکی ئەمین و وردی کارەکە بکات. بە کەیفی دڵی خـۆی لایەنە دڵـداری و ئاشـــقێنیەکانی گەورە کردبـــوو، کاراکتەرەکـــانی بەرجەســـتەتر و بەرچـــاوتر کردبـــوو. دۆسـتویفســـکی چیـــرۆک و بەســـەرهاتی نـــاچیزی ئەو گونـــدییەی، خســـتبووە هامـاجێکی نائاســایی و غەریـبەوە. ئازارەکـانی ئـوژینی گرانـدە لە سایەی قەڵەمەکەی دۆستویفسکیەوە، کرابوون بە عەزاب و ئـازارێکی یەجگـار قووڵ و ترسـناک. روخسـاری ئـوژینی، بە گـوێرەی وەسـفەکەی بـالزاک "وەکـو گوڵێکی نەشـکۆفتەی بەر ڕوناکیەک وابوو" بەڵام لای دۆسـتویفسـکی دەبێـت بە "خەرمـــانەیەکی ئاســـمانی ڕازاوە"... ئایـــا ئەوهـــا باشـــتر نیـــیە؟ هەڵـــبەتە دۆسـتویفسـکی لە کارەکەی خـۆی ڕازیـیە. پێشـنیاز بـۆ بـراکەی دەکـات و بـۆی دەنووســـێت: "تـــۆش دۆن کـــارلوس"ی شـــیللەر، پـــاچڤە بـــکە. میشـــێل، پێشنیازەکەی جێبەجێ دەکات. ئیدی فیدور بـۆی دەنووسـێت: "دۆن کارلوسـم پێگەیی و ئەمەش ڕای منە دەربارەی: پاچڤەکەی باشـە. بگرە هەندێ شـوێنی زۆریـش باشــە. بەڵام هەنـدێ دێـڕیم بەدڵ نـیە، هـۆیەکەی ئەمەیە کە پڕێـک پەلەت کردووە. مـن لە خـۆمەوە هەنـدێ دەسـتەواژەیم چـاک کـردووە. ڕیتمـی وشە و پەیڤـی هەنـدێک لە بەیـتە شـیعرەکانم دەسـکاری کـردووە... بەتەمـام دون کارلوس، بدەمە ئەو گێلە پیـاوانەی گۆڤـاری ڕیپـۆرت پـانتیون. بـۆ ئەوەی لە سەرسامیدا واقیان وڕبمێنێ و بزانم چی دەڵێن. ئەگینا وەرزەنـامەی نیشـتمان مەمنوونیش دەبن. بەڵام دڵنیابە بە پاداشـتێکی کەم نایاندەمێ"

هەڵبەتە پرۆژەیەکی گەورەی لە بیـر و خەیاڵـدا بـوو، بیـری لەوە دەکـردەوە کە کـۆ بەرهەمەکـــانی شـــیللەر، بە ســـێ کەڕەت بڵاوبکـــاتەوە. "ســـەبارەت بە وەشـانکاری کـۆ بەرهەمەکە پاشـان بیـری لێـدەکەینەوە، بەڵام ئەوەی ڕاسـتی

بێ، باشتر وایە نووسەر یان وەرگێڕ، بەخۆی کارەکانی بڵاوبکاتەوە و بە چاپ بگەیەنێت"

بە ئەڵهـا و تاسـەیەکی زۆرەوە، کۆمەڵێـک ژمـارە دەخـاتە سـەر کـاغەز : بڕی ئەوەندە بۆ کاغەز، بڕی ئەوەندە بۆ بەرگەکەی، بڕی ئەوەندە هەقی چاپ، بڕی ئەوەنـدە بـۆ کـۆکردنەوە و لاپەڕەبەنـدی... هەمـوو حیسـاب و کیتابێـک دەخـاتە سـەر ئەم لیسـتە پێشـبینی کـراوە. کەچـی وێـڕای ئەوەش، پـڕۆژەکە ناکـام دەبێت. هەڵەی کارەکەی لەچیدایە؟ هەڵەکە لەمەدا بـوو کە ئەو فەرمـانبەرە و فریـای کـارێن چـاپ ناکەوێـت! هەڵـبەتە لە کـاری کـارگێڕی و ئیـداری وەڕەز و بێزاربوو. لە ١٨٤٤/٩/٣٠دا، نـامەیەک بـۆ میشـێلی بـرای دەنووسـێت و دەڵێـت: "من لە وەزعێکـی دۆزەخینـی دژواردام. بـا بـۆتی بـاس بـکەم: وازم لە کـاەکەم هێناوە... باوەڕبکە، سوێندت بۆ دەخۆم کە ناتوانم لەوەی پتر هەڵبکەم. کە پیـاو باشـترین کاتی خـۆی لەم کـارە بێهـودە و گەوجـانەیەدا بەسـەر بەرێـت، ژیـانی بەفیـڕۆ دەڕوات... لەمەش خراتـر بەنیـازبوون. بـۆ مـاموریەتێکم بنێـرن. جـا، مـن نالێم، تۆ بیڵێ، ئاخر من چۆن دەتوانم سان پتروسبورگ بەجێ بێڵم. پێم نـاڵێی چۆن لە دووری سـان پتروسـبورگ هەڵبکەم؟

هەڵبەتە، لەو سەروبەندەدا، فیدور، بەتەواوەتی کەوتبووە ژێر قەرزەوە. نەیدەزانی چۆن بژی و چۆن خۆی بژێنێ: "بۆ ماڵەوەم نووسیوە کە هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ قەرزدارم، چونکە من دەیانناسم، هەمیشە سێ یەکی ئەو پارەیەم بۆ دەنێرن کە داوای دەکەم، ئەگەر ئەم مۆسکۆییە بەراز سیفەتانە، زوو پارەکەم بۆ نەنێرن، تیادەچم."

هەڵبەتە مەزەندەکەی دروست دەرچوو، ئەوەتا دوای چەند مانگێک دەنووسێت: " پێنج سەد ڕۆبڵم لە مۆسکۆوە پێگەیی." بەڵام ئەم بڕە پارەیە بەشـی پڕکردنەوەی قەرز و قۆڵەکەی ئەوی نەدەکرد. ئیدی نەبوونی و نائومێدی بەرۆکی پێدەگرێت، دەکەوێتە هەڵپە. هەوڵدەدات، لە ڕێگای پاچقە و وەرگرتن و ئامادەکردنەوە شتێک بە شتێک بکات و لەو تەنگانەیە ڕزگاربێ، دەنووسێت: "تۆ دەڵێی ڕێگای ڕزگاری من، لە نووسینی درامایەکدایە، بەڵام دەرهێنانەکەی وەختێکی زۆری دەوێت، ئەمە جگە لەوەی کە پارەی دەوێ. من ئەم هەموو پارەیە لەکوێ بێنم، پارەی ئەمە بدەم، قەرز بدەمەوە؟!"

فیدور، وای لێدیت، ئامادەیە بە پێنج سەد ڕۆبل، دەستبەرداری بە شە میراتیەکەی خۆی ببێت، بۆ پارەیەکی کەم تەنانەت تەسلیم بە ئەهریمەن و هەر کارێکی ئەهریمەنانە ببێت. سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە سەر هەژاری، شیر، نان و چای و سوکنای سارد و سڕ و سەهۆڵبەندان و تەنیایی.

ڕۆژێـک، بەڕێـکەوت، لە سـیلەی شـەقامێکدا، تووشـی برادەرێکـی کـۆن و هاوقوتابخـانەی خـۆی بە نـاوی گریگـوروفیچ دەبێـت. جـووتە بـرادەر. دەسـت لە ملـی یەکـدی دەکەن. دوستویفسـکی باسـی ئیسـتیقالەکەی خـۆی، کـارە

ئاڵۆزەکانی و هیوا و ئاواتەکانی ئایندەی خۆی، بۆ دەکات. گریگۆروفیچ، بە پێچەوانەوە، بە شانازیەوە، باسی ئەوە دەکات، کە بە ئاواتی خۆی گەییوە: خەریکە دەنووسێت، بەرهەم بڵاودەکاتەوە، پاداشتی باش لەسەر نووسینەکانی وەردەگرێت. ئەم کوڕی قۆزە، بە ڕەفتاری ناسک و سەما ئاسای خۆی، بە دەم و زمانی شیرین و خۆشی خۆی، سەرنجی دوستویفسکی ڕادەکێشێت. (گریگوروفیچ)ش دەکەوێتە ژێر باندۆر و کاریگەری، جۆش و خرۆش و حەماسی گەرم و گوڕ و توندی برادەرەکەیەوە و دڵبەندی دەبێت. ئەمیان ئەهلی مەعنەویات و ڕوح سووک و سوێرە قسە و ئەویان مەند و، بێدەنگ و شپرزە و، پرجۆش و خرۆش. وێڕای ئەمەش، لە یەکەم قسەیانەوە، بەتەواوەتی و بە شێوەیەکی سەیر لێکدی حاڵی دەبن. ئیدی گریگوروفیچ، دۆستویفسکی بۆ ماڵەکەی خۆی دەبات و یەکێک لە کارەکانی خۆی، بە ناونیشان "ئۆرگ ژەنی گەڕۆک" کە تازە تەواوی کردبوو، بۆ دەخوێنێتەوە. ئیدی ئافەرین و ستایش و پیرۆزبایی و بەڵێن و پڕۆژە و میهر و خۆشەویستی دەکەوێتە نێوان ئەم دوانەوەو وایان لێدێت بەبێ یەکدی هەڵناکەن. بە دوو قۆڵی شوقەیەک بە شەریکی بەکرێ دەگرن و تیایدا دەژین. بەڵام دەرامەتی جووتە برادەر هەر لە سەرەتای مانگەوە تەواو دەبێت، ئیدی ناچار سکی خۆیان بە نان و چا و قاوە تێردەکەن. دۆستۆیفسکی، لە ماوەی ئەم ژیانە هاوبەشەیاندا، شەو و ڕۆژ کار لەسەر بەرهەمێک دەکات کە نایەوێ بۆ هیچ کەسێکی باس بکات. ناوی بە کەس ناڵێت. گریگوروفیچ، کۆمەڵێک کاغەز لەسەر مێزەکەی دوستویفسکی دەبینێ، کە زۆر بە تەرتیب دانراوە، بە خەتێکی زۆر ورد نووسراوە، "زۆر لە خەت و نووسینی ئەلکساندەر دۆمای باوک دەچێت."

فیدور میخائیلوفیچ، کە زۆر شەکەت دیار دەبێ، ناو بەناو لە نووسین دەوەستێ، چایەک دەخواتەوە، دەست دەداتە خوێندنەوەی کتێبێکی جورج ساند یان یادگارییەکانی ئەهریمەنی "فردریک سولیە". گریگورۆفیچ، تکای لێدەکات کە کەمێک بجوڵێت و وەرزش بکات. ئیدی فیدور لە ئەنجامدا بەگوێی دەکات و دەچێتە دەرێ. بەڵام هەوای ئازاد و تینی ڕوناکی و ژاوەژاوی شەقام و ڕێگەوبان، گوشاری بۆ دێنێ و تەحەمول ناکات و سەری بە گێژەوە دەچێت، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێت، خۆی دەدا بەسەر باسک و بازووی برادەرەکەیدا و ئەویش ناچاردەبێت. دوستویفسکی بە گالیسکە بۆ ماڵ بگێریتەوە.

بەیانییەک، کە هەواکەی خۆش دەبێت، بە دوو قۆڵی لەگەڵ برادەرەکەیدا دەچنە پیاسە. بەدەم پیاسەوە، تووشی ڕێ و ڕەسمێکی، جەنازە بە ڕێکردن دەبن. کابرای کەشیش، خاچ بەدەست، لەدوای دەستەی تازیەبارەکانەوە، کە لافیتەی ئاینی پیرۆزیان هەڵگرتووە، ڕێدەکات. دەستەی سروودێن ئاینی لە دوای ئەوەوە دێن. لە دوای ئەوانەوە گالیسکەی هەڵگری جەنازەکە دێت، کە چوار ئەسپ بە ئەسپایی ڕایدەکێشن. تابووتەکە واز بوو، دەموچاوی مردووەکە، کە زەرد دەچووەوە دیاربوو. تاجێکی کاغەزینی سپی، کە نووسینی

ئاسایی و ئاینی لەسەر نەخشێنرابوو، بەسەر ناوچەوانیەوە بوو. ئیکۆنەیەکی چکۆلەی بە دەستە وشکەکانیەوە گرتبوو. دۆستویفسکی بە دیتنی ئەم دیمەنە تێکدەچێت، لەرزی لێدێت، ئاوری پاشەوە دەداتەوە و دەیەوێ هەڵێت. بەڵام لەگەڵ یەکەم هەنگاودا هەرەس دێنێت. دەبورێتەوە، چەند ڕێبوارێک لێی کۆدەبنەوە و یارمەتی گریگورۆفیچی هاورێی دەدەن و دەیگەنـنە دوکانێکی شیرەمەنی فرۆشی ئەو نزیکانە. دوای زەحمەت و هەوڵێکی زۆر ئەوسا دەتوانن، وەهۆشی بێننەوە. دۆستویسفکی بۆ رۆژانی پاشتر، خەم دایدەگرێت، ئازای دادەهێزرێ، حەواسی پەرتە، دەڵێی بەسەر ئەم دنیایەوە نییە. بە ئاستەم قسەی پێدەکرێت، خواردن کەم دەخوات. زەوقی نووسینی نییە. بەڵام دوای ماوەیەک دەچێتەوە سەر هەمان کاری کە خەریکی نووسینی بوو. چی دەنووسی؟ میشێلی برای تاقە کەسێک بوو کە بەم ڕاز و نهێنیەی دەزانی. فیدور، لە نامەیەکیا بۆ براکەی کە لە شاری ڕوڤیل بوو، دەڵێت: "من حاڵی حازر، دڵم خۆشە ، ڕۆمانێکم بەدەستەوەیە، بە قەوارە بە قەد(ئوژینی گراندە)ی بالزاکە، تەواوم کردووە، ڕۆمانێکی تاڕادەیەک تازەیە. حاڵی حازر خەریکم پێیدا دەچمەوە و پاکنووسی دەکەمەوە".

لە ١٨٤٥/٣/٢٤دا، دیسان بۆ براکەی دەنووسێت: "من زۆر لە ڕۆمانەکەم ڕازیم. کارێکی جدی و ڕوونە بەڵام لە ڕاستیدا لە هەندێ کێماسی جدی بەدەرنییە"... هەڵبەتە دوستویفسکی بە ئاوات و تاسەی ئەوەوە بوو کە بگاتە لوتکەی کەماڵ. بۆیە ئەم خولیایە جۆرە وازوازییەکی لا دروست کردبوو و کردبوویە کارێک کە ئەو کاتە ئەم کارەی خۆی چاپ و بڵاو نەکاتەوە. ئەوەتا بەخۆی دەڵێت: "لە مانگی شوباتدا، دەستم بە هەڵەچنی و پێداچوونەوە کرد، شتم لێ لابردووە، شتم بۆی زیادکردووە، دەستکاریم کردووە، لە نیوەی مانگی ئازاردا، کاری پێداچوونەوە و داڕشتنەوەم تەواوکرد و لە کارەکەم ڕازیم و دڵم پێی خۆشە... سوێندم خواردووە، کە چەند ژیانم دژوار و ناخۆشیش بێت، بەگوێرەی داواو دەستووری کەس، هیچ شتێک نەنووسم. نووسینی فەرمایشی، داهێنان دەکوژێت. دەمەوێ هەموو کارەکانم ڕەسەن و جوان بن. تۆ تەمەشای پوشکین یان گوگوڵ بکە، هەردووکیان بەرهەمیان کەمە. بەڵام هەردووکیان پێگەی خۆیان هەیە. خاوەنی پەیکەری خۆیانن."

هەڵبەتە گلەیی لە براکەی خۆی دەکات، چونکە پشتیوانی لەم جدیەت و وردی و پێداچوونەوانەی ئەم ناکات. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "چاری بەرهەمێن سەرەتایی، ئەوەیە کە تا دەکرێ، پێداچوونەوەی بۆ بکرێت و دەستکاری بکرێت. پوشکین لەڕادە بەدەر بە بچووکترین قەسیدەی خۆیدا دەچووەوە و دەستکاری دەکرد. گوگوڵ، بە چیرۆکەکانی خۆیدا دەچوەوە، دەستکارییەکی زۆری دەکردن، تا دوو دانە ساڵ و بگرە پتر لەلای خۆی دەیهێشتنەوە و دەستکاری دەکردن."

کاتێ کە کتێبەکەی تەواوکرد، دەبوایە بیر لە چاپکردنی بکاتەوە. بەڵام "خۆ لە هەر گۆڤارێکدا، تەنیا یەک دکتاتۆر نیە. بگرە نزیکەی بیست دانە دکتاتۆر هەن. نووسەر ئەگەر بیەوێ بەخۆی کتێبەکەی چاپ بکات، وەکو ئەوەیە بە خۆی درزی جلەکانی بدورێتەوە." دۆستویفسکی ئەنجام مل بۆ ئامۆژگاری هەندێ لە دۆستانی شارەزا دەدات، کە پێی دەڵێن کتێبەکەی لەسەر ئەرکی خۆی چاپ نەکات. ئەم دۆستانە پێی دەڵێن: "وا چاپت کرد، کێ بانگەشەی بۆ دەکات و لەنێو خەڵکیدا بڵاوی دەکاتەوە، کتێب فرۆشان، شتی واناکەن و بانگەشەی جدی بۆ نووسەرێکی گومناو ناکەن.: دۆستویفسکی، ئەنجام ماندوو دەبێت، لە مشت و مڕ و گەنگەشە بێتاقەت دەبێت و ناچار و بە نەبەدڵی و نائومێدی کتێبەکەی بە مەبەستی چاپکردن، دەدات بە گۆڤاری (وەرزنامەی نیشتمان) بەڵام پێشوەختە نائومێد و ڕەشبین دەبێت، وا تەسەور دەکات کە دەستنووسەکەی ڕەفزدەکرێت، ڕەخنەی زۆری لێدەگرن، لە نووسینەکەی تێناگەن. لەمبارەیەوە دەنووسێت: "ئەگەر ڕۆمانەکەم بڵاونەبێتەوەو پێگەی شایستەی خۆی وەرنەگرێت، لەوەیە خۆم بخەمە ڕوباری (نیڤا)وە، ئەدی چیبکەم، چارم چیە؟ بیرم لە هەموو شتێک کردووەتەوە. دوای مردنی بیرە ڕەسەن و جێگرەکەی خۆم، ناژیم، ناتوانم بژیم." ئەم "بیرە ڕەسەن و جێگرە"ی کە هەرگیز لە نامەکانیا باسی ناکات، پاشان ناونیشانی "هەژاران" لە خۆ دەگرێت و بە یەکەمین ڕۆمانی دۆستویسفسکی دێتە ژماردن. بەڵام دۆستویفسکی کە خودانی زەوقێکی ئەدەبی باڵابوو، کە عاشق و شەیدای شێوازی لیریکی هەر بەرهەم و شیعر و چالاکیەکی هونەری بوو، شیفتەی "هەر شتێکی جوان و شکۆدار" بوو، کە دڵبەندی شاکارە بە ناوبانگ و ناوازەکان بوو، چ پەیوەندی یان خاڵێکی هاوبەش، لە نێوان ئەم و ڕۆمانە متوازیعەی "هەژاران" و، ئەو زەوق و کەڵکەڵە و خولیا هونەریە بەرزەدا دەبینیەوە؟ ئەو نووسەرانەی، کە مایەی ستایش و دڵبەندی ئەوبوون، کێ بوون؟ شیللەر، کە دۆستوفسکی لەبارەیەوە دەڵێت: "کە گوێم لەناوی شیللەر دەبێت، نەخۆش دەکەوم. ڤیکتۆر هۆگۆی بەڕادەیەک خۆشدەوێ کە دەڵێت: "بێ هاوتایە. کەس هاوتای ناکاتەوە." دەربارەی ڕاسین دەڵێت: "هۆمەری تاڵان کردووە، بەڵام بە شێوازێکی هێندە جوان، هەر قابیلە دەستخۆشی لێبکرێت!" جورج ساند: "کە بۆ یەکەمجار خوێندمەوە، تایەکم لێهات کە تا بەیانی بەری نەدام!" دەربارەی والتەر سکۆت دەڵێت: "نازانم چۆن توانیویەتی لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، شاکارێکی پرشنگداری وەکو مانیرینگ بنووسێت؟"

شەکسپیر، پوشکین، لامارتین، بایرۆن، هەموو ئەم کەڵە نووسەرانە، بە فەڕ و شکۆ و ڤیانی باڵاوە، بە تاوانێن پرشکۆ و جەلالی ناو بەرهەمەکانیانەوە، بە ئاهو زاری ستایش ئامێزیانەوە، لە هەنبەر چپرۆکی (هەژاران)دا دەوەستنەوە کە باسی کۆپیکار و کاتبێکی بەلەنگازی شڕۆڵە دەکات بەنێوی "دییڤوشکین". ئەم پیاوە، هەژارێکی شڕپۆشە، لە کوختەیەکی پەرپووتدا دەژی، تەنیا سۆز و

مەحەبەت و میهری کیژێکی چکۆلە، کە لە کوختەیەکی هاوشێوەی کوختەکەی ئەمدا و لە دراوسیەتی ئەمدا دەژی، گەرمی دەکاتەوە و گوڕ و تین و تاوی ژیانی پێدەبەخشێت. لە تۆ وایە لەلایەکەوە ئۆرکستەرێکی بەشکۆ و جەلال، ئاهەنگی تۆفانی سۆز دەژەنێ و لەلایەکی دیکەوە نایە تەنهاکەی دوستویفسکی، هەڵیکردووەتە ئاوازی بەجۆشی خۆی. ئیدی هیچ دیار و خویا نییە کە دۆستویفسکی بە چ هونەرێکی کیمیاگەری، کەرەستە و ماکی نەرم و خەمینی (هەژاران)ی لەم سەرچاوە نایاب و زوڵاڵە کلاسیک و ڕۆمانتیکانەوە هەڵێنجاوە؟ بە چ نیرەنگ و توانا و بەهرەیەکی زیرەکانە، چەتە و دزانی جوامێر و دڵاوا و شازادەخانمانی خەیاڵی مانگ ئاسای لە قاڵبی ئەم پیاوە لاتە شارستانیەدا، جێکردونەتەوە؟ بە چ میکانیزمێکی ئەفسووناوی، هاتووە دیکۆراتی ڕازاوەی ڤینیسیایی تواندووەتەوە و کوچە و کۆڵانە تاریک و نوتەکەکان و، ژوور و، کوختە پەرپووت و، مەیخانە گومان لێکراوەکان و، سۆزانی خانەکانی ناو کتێبەکەی خۆی لێدروست کردوون؟

هەڵبەتە دۆستیوفسکی، زۆر دڵبەند و شەیدای بەلزاک و گوگوڵ، ئەم جووتە مامۆستا و پێشەنگەی ڕێبازی ڕیالیزمی تازە بووە و ستایشی کردوون.بەڵام ئاخۆ ئەمانەی بەسەر ئەو "فەوجە کەڵەنووسەرانەدا" پەسەند داوە؟ لەوەناچێت، وابووبێ. ئایا کاتێ کە ئوژینی گراندەی پاچەڤە کرد، هەستی بەوە نەکردبوو کە پێویستە جۆرە شکۆیەک بە ڕیسکەکەی ئوژینی گراندە بدات؟ ئایا دوستویفسکی ئەم پاچڤەیەی بە دوعا و پاڕانەوەیەکی پرشکۆ خەتم نەکردووە کە لەوێدا کیژەکەی سومور بە پەیکەرێکی یۆنانی کۆن شوبهێنراوە؟ هەڵبەتە کاراکتەرەکانی بالزاک، دەگەڵ دید و بۆچوون و حەزە تایبەتیەکانی دۆستویفسکیدا تێکناکەنەوە و بە دڵی ئەو نین و پڕێک کاڵ و کرچن، کەچی بە خۆی کاراکتەر و سیمایێن کاڵ و کرچتر وێنە دەگرێت و بەرجەستە دەکات. ئایا ئەم نووسەرە، یانی دوستویفسکی، لە زەرفی چەند هەیڤێکدا دید و بۆچوونە هونەرییەکانی خۆی گۆڕی بوو؟ یان بە هۆی ئیلهام و کەشفێکی ئەدەبی یان سۆزدارییەوە، تووشی شۆک بوو بوو؟

با ئەو گەنجەی کە لە "کۆشکی ئەندازیاران" پەروەردەبوو بوو، بێنینە بەرچاوی خەیاڵی خۆ، کە ئێستا مەستانە شیعر و ڕۆمانی دەخوێندەوە. خۆی بە "پریکلس یا ماریوس، یا مەسیحێکی زەمانی نیرون، یان قارەمانێکی دوئێلبازی سەدەکانی ناڤین، یا ئیدواردی قارەمانی ڕۆمانی موناستەری والتەر سکوت" دەزانێت. (پریکلس: سیاسەتوان و خەتیبی یۆنانی ٤٩٥ – ٤٢٩ پ.ز، لە زەمان و سەردەمی ئەودا شاعیرانی وەکو سوفوکلوس و ئۆرپید، پەیدابوون و دەورانی حکومەتەکەی ئەو لە ڕووی هونەری و پیشەسازییەوە گەیە ئاستێک کە ناوی سەردەمی پریکلسی لێنرا... ماریوس: سەرداری ڕۆمی٨٦ – ١٥٦ پ.ز. لە ساڵی ١٠٨ پ.ز گەیە پایەی کونسوڵی ڕۆم. خەڵکی بە خۆشی و شادییەکی زۆرەوە هێنایانە ناو شارەوە و نازناوی ڕمولوسی سێیەمیان پێبەخشی. هەڵبەتە مەبەست لەناوبردنی ئەم دوو سەردارە

یۆنانی و ڕۆمیە، لێرەدا ئاماژەیە بۆ بایەخدانی دۆستویفسکی بە کەلتوری یۆنان و ڕۆم) ڕایدەگەنێت کە برادەر و دۆستی شیدلوفسکیی شاعیرە: "بەڵێ، من گڕکانێکم، ئاگر ڕەگەزی سەرەکیمە." کە شیعرە خەمین و شیوەننامەکانی براکەی دەخوێنێتەوە، سۆز و بەزەیی دەبزوێت و دەست بە گریان دەکات. هیچ شتێک دەربارەی ژیان نازانێ. چوار دیواری قوتابخانەکەی، وەکو چوار دیواری خەستەخانەکەی ماری جاران، وەکو خەونێکی ڕوناک و ناسک، بەجۆرێ مەست و ئەفسوونی دەکات و ئاگای لە خۆ دەبڕێت، کە ناتوانێ بیر لەوە بکاتەوە، کەی و چۆن لەم خەوە گرانە ڕادەبێت. ئیدی سان پتروسبۆرگ، بە شەقام و جادە جەنجاڵ و قەرەباڵغەکانیەوە، بە کۆشک و تەلارە زۆر نوێیەکانیەوە، بە ساختمانە ئیداریە پڕ لە کاتب و فەرمانبەرەکانیەوە، چاوی دەکاتەوە و دوای ئەوەی لە گەڕەکە کەشخە و دەوڵەمەندەکانی دوور دەکەوینەوە ئەو ماڵە گەورە و فراوان و تێکڕژاوانە دەبینین کە زیاتر لە ئۆردوگا و سەربازخانە دەچن، کە پڕن لە خەڵکی هەژار و نەدار و کلۆڵ، لە کارمەندان و فەرمانبەرانی بچووک. گەڕەکێن پر لە سووتخۆر، لەو پیشەوەرانەی کە لە ماڵەکانی خۆیاندا کاردەکەن، شت دەفرۆشن و دەکڕن، پڕن لە لەشفرۆشان، لە خوێندکاران. ئیدی ئێرە پڕە لە خوارنگەی پیس، بۆنی دووکەڵە جگەرە و تووتن، بۆسۆی پەڕۆکۆنە، بۆنی چڵکاوی قاپ شۆردن. کوێرە کۆڵانانی بنبەست، کە فانۆسێکیان تیادا بە عامودێکەوە هەڵواسیوە تا ڕوناک ببێتەوە. هەروەها دوکانی چکۆلەی پەرپووت، کە ژنانی شڕندە و بێحەیا و چەنەباز و دەنگ بەرز، سەرو پەرداخ چایان بەدەستەوەیە و، بەدەم چاوەڕوانی مشتەرییەوە، بە هەموو لایەکدا، سەردەکێشن و سەرەتاتکێ دەکەن. دیوارەکانی ئەم شارە، کە لەسەر مرداوێک ڕۆنراوە یەکپارچە رتۆبەت و تەڕەشوعە. تەم و مژێکی چڕی سپیواژی شیرئاسا، سەربانەکانی گرتووە. بەفری تەڕ و ئاودار، لەژێر پاژنەی پێڵاواندا، بەدەم جیرە جیرەوە دەخزێت. ڕێبواران، گرژ و مۆن، بەپەلە ڕێدەکەون، دەچنە ژێری، بیر لە کارێن ئیداری، لە پێشکەوتن و سەرکەوتنی خۆ دەکەنەوە یا بیر لە کارە بازرگانیەکانی خۆیان دەکەنەوە. دۆستویفسکی لەنێو ئەم ئاپۆرا بێ کۆتاییەدا، وەکو ئەو کەسانەی بەدەم خەوەوە ڕێدەکەن، بەو ئاوایە هەنگاو دەنێت و ڕێدەکات. لە هەوەڵدا، هێشتا لە دنیای خەون و خەیاڵەکانی خۆیدا دەژیا، بەڵام بەرەبەرە هوشیار دەبێتەوە، چاوانی دەکرێنەوە و ئەم دنیا تازەیە دەبینێ و لە کتێبی "سەرابە خاپینۆکەکانی سان پتروسبورگ"دا "کە بە هۆنراوە و پەخشانە" دەڵێت: لە کەنارەکانی ڕوباری نیڤادا بۆ یەکەمجار ئیلهام و کەشف دڵی روناک دەکاتەوە: "دنیا نیمچە تاریک بوو، زۆر ساردبوو، پلەی گەرما بیستی ژێر سفر بوو، هەوەڵی شەو بوو، هەڵمێکی چر لە دەم و قەپۆزی ئەسپەکانی ژێر عەرەبانەکەوە دەردەچوو. توێژاڵە شەختەیەکی سپی شەکر ئاسا، سەری ڕوبارەکەی گرتبوو. بورجی کۆشکی هێزی دەریایی. بە دەستی چەپی ڕوبارەکەدا، بەرەو ئاسمانی سارد، بە دوورەنگی وەنەوشەیی و زەرد، هەڵکشابوو، شووشە سەهۆڵ بە کۆڵەکەکانی بارەگای ئەنجوومەنی پیران و

بینای کۆڕی کەنەسییەوە ئاوێزان بوون. "بیرێکی سەیر لە مێشکما کەوتە جم و جوڵ... وام هەستکرد کە لەو دەمەدا، هەندی شتم بۆ ڕوون بووەوە و تێی گەییشتم کە پێشتر تەنیا هەستێکی گۆنگ و ناڕوونم دەربارەی هەبوو. چاوم بە دنیایەکی تازە کرایەوە کە تا ئەو ساتە بۆ من و لای من بێگانە و نامۆ بوو، تەنیا لە ڕێگای چیرۆک و ئەفسانانی ئاڵۆز و بەرەمز و ڕازەوە، سووکە زانیارییەکم دەربارەیان هەبوو. پێموایە ژیان و بوونی ڕاستەقینەی من لەو ساتەوە دەستی پێکرد."

ئەم جیهانەی کە دۆستویفسکی تیایا بێداربووەوە، چتۆ جیهانێکە؟ ئەم جیهانە، جیهانێکی سەیر و غەریبە. دنیای سیماێن غەریب و سەیرە. دنیای کارەکتەرانی هیچ و بازاڕی و ناشاعیرانەیە، کاراکتەری وەکو دۆن کارلۆسی شیللەر و پوزای نە لە دوور و نە لە نزیک تیا بەدی ناکرێت. دونیایەکە، تێکڕای خەڵکەکەی، خەڵکی بچووک و بێنەوان و ئەم بەلەنگاز و بێنەوایانە، نووسەر بۆ ناو قوڵایی ئەم دنیایە ڕێنوێنی دەکەن. ئەمانە بۆ نووسەر شیرەتکارێن فیکرین. بەڵێ ئەم کارمەند و فەرمانبەرە بچووکانە بە کەپووی جەمەدییەوە، ئەم کیژانە بە جل و بەرگی پینەکراوەوە، لەوەدەچوو غروورێکی ئەوتۆیان هەبێ، کە ئامادە نەبوون سەر لە ئاستی هیچ شازادەیەک دانەوێنن. فەرمانبەرانی بچووک، ژنانی بەرەڵا، کچۆڵانی نەخۆش، پیرەپیاوانی خڵەفاو، پیاوانی بەدمەست و ئالوودە، ئەمانە هەر هەموو لە کەش و هەوایەکی ئاڵۆزدا، هەرکەسە و دەگەڵ نهێنییەکانی خۆیدا، دەگەڵ ئارەزووەکانی خۆیدا، لەگەڵ حەز و فیداکاریە تایبەتیەکانی خۆیدا و تەنانەت دەگەڵ تاوانەکانی خۆیدا، دەژی. بیلینسکی ڕەخنەگر، دەنووسێت: "شکۆ و سەربەرزی بۆ ئەو شاعیرە لاوەی کە بە قەریحە و بەهرە، کرێچیانی کوختە و ژێرزەمینە تاریک و نوتەکەکانی خۆشدەوێ و بە دانیشتوانی کۆشکە زێڕینەکان دەڵێت: ئەوانەش بەشەرن، برای ئێوەن."

برا، بەشەر، ئەم گوتانە، لە شێوەی شۆکێکدا، ناخی دۆستویفسکی دەشڵەقێنن، ئیدی زینەت و دیکۆراتی بەنەخش و نیگاری ڕۆژهەڵاتی لە هزر و بیری ئەودا هەرەس پێ دێنن. ئیدی تاپۆی کارەکتەرانی گەورەی نێو چیرۆکان، بەخێرایی مەحو دەبنەوە و بۆ هەمیشە دەکەونە عەدەمەوە. تەنیا خەڵکی بێنەوا، هەژاران، ڕەنجکێش و تڕۆکراوان و تەوهین کراوانی کۆمەڵگە لە زەین و بیری ئەودا دەمێننەوە. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "لە گۆشەیەکی تاریکی ئەم کۆمەڵگەیەوە، دڵێکی ساف و بێگەرد. پاک و ئابروومەند، ئینسانێکی بەویژدان و دڵسۆز و گوێڕایەڵی بەرپرسانی خۆی، کە ڕێنوێنێکی یەکجار باشە بۆ ناساندنی خەڵکانی کڵۆڵ و بەلەنگازی سەر بە چینەکەی خۆی. دەگەڵ کچۆڵەیەکی داماوی ڕەهەنەی دەستی کۆمەڵگەو سووکایەتی پێکراو. تەسەور و وێناکردنی ژیانی ئەم خەڵکە، تان و پۆ و بەندی ڕوحم دەپچڕێت"

دۆستویفسکی لەوێندەرەوە، ڕێگای خۆی دۆزییەوە.

## فەسڵی حەوتەم
## هەژاران

"گریگوروفیچ، وەرە ژوورێ دانیشە، لە پاکنووسی کتێبەکەم بوومەتەوە دەمەوێ بۆتی بخوێنمەوە."

دوستویفسکی، لەسەر قەنەفەکەی دانیشتبوو، تەپڵەکێکی بچووکی لەبەردەمدا بوو، دەفتەرێکی گەورەی لەسەردا کرابووەوە: ئەمە دەستنووسی ڕۆمانی "هەژاران" بوو.

هەڵبەتە گریگوروفیچ، لە کونجکاویدا لە پێستی خۆی نەدەهێوری. هەمیشە دڵبەندی دۆستویفسکی بوو، ستایشی دەکرد و ئەفسووسی دەخوارد کە بۆچی ئەم برادەرە خوینەوار و ڕۆشنبیر و هەستیارەی، تاکو ئێستا جگە لە چەند هەوڵێکی درامی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، کە هیچ ئایندەیەکیان نەبوو، چیتری نەنووسیوە. گریگوروفیچ، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا، لەمبارەیەوە دەڵێت: "لەدڵی خۆدا دەمگوت، چۆن من تا ئێستا هەندێ کاری ئەدەبی چکۆلەم نووسیوە و بڵاو کردووەتەوە، هەندێجار خۆم بە ئەدیب و ئەهلی ئەدەب دەزانم، کەچی دوستویفسکی تاکو ئێستا لەم مەیدان و قەڵەمڕەوەدا، بەبێ بەرهەمە؟"

گریگوروفیچ، پاشـان بۆمـانی دەگێڕێتـەوە کـە کـاتێ دوسـتویفسـکی ڕۆمـانی "هـەژاران"ی بـۆ خوێندووەتـەوە، چ هەسـتێکی لـەلا دروسـت بـووە و بێگومـان ئەمیش وەکو خـەڵکانی دی، چـاوەڕوانی ئـەوە بـوو کـە ئـەم بەرهەمـە تازەیـە، کارێـک بـێ کـە لـەڕیزی (مـاری سـتوارت) و (بـوریس گونـدونوف) بێـت. (مـاری سـتوارت: درامایـەکی شـیعری شـیللەرە دەربـارەی مردنـی مـاری سـتوراتی شـابانۆی ئاکوس. بوریس گودونـوف: تراجیدیایـەکی میژوویـی پوشـکینە،کە لـە مێـژووی ڕووسـیاکەی کارامزینـەوە هـەڵی هێنجـاوە. ئـەم بەرهەمـە یەکـەمین درامـای میللـی و ئـەدەبی ڕووسـە.) بـەڵام هەرکـە گـوێی لـە هـەوەڵین ڕسـتەکانی ڕۆمانەکـە بـوو، پـەی بـەوە بـرد، کـە لـەو بۆچوونەیـدا هەڵـە بـووە. دوستویفسکی پاشان لە کتێبی "تـەوهین کـراوان"دا، لـەبارەی ئـەم ڕۆمانـەوە دەنووسـێت: "ئەمـە چیرۆکێکـی زۆر سـادەیە، دەگـەڵ واقیعـی ڕۆژانـەدا تێکدەکاتـەوە. قارەمانەکـەی پیـاوێکی گـەورە یـان کاراکتـەرێکی مێژوویـی لـە بابـەتی ڕوسـلاڤلیف یـان یـۆری میلوسلاڤسـکی نییـە. بـەڵکو فەرمانبـەرێکی سادە و بچووکە. کابرایەکی ڕەنجکێش و بێغـەل و غەشـە، بگـرە پڕێـک گـەوج و گێلۆکەشـە. جلە شڕو شە پڕیوەکانی، قۆپچەیان پێوە نەماوە."

ئەم ڕۆمانە، لە شێوەی نامـەدا نووسـراوە. دوو کاراکتـەری سـەرەکی تێدایـە: دییڤوشـکین، کـە کاراکتـەرێکی دێهـاتی گومنـاوی ئـاڵۆز وگۆنـگ.،سـاویلکەو نەزان.بە تەمەن، کلۆڵ و داماو،بەڵام دڵپاک و لێبوردە، بە ڕادەیەک کـە ئامادەیـە خۆی فیدا بکات.

بەرانبەر بە ژوورەکەی ئەم پیاوە، ژنێکی گەنج دەژی بەنێوی ڤارینکا، کە خزمایەتیەکی دووری لەگەڵ ئەمدا هەیە. بەڵام ئەم ژنە لەبەر قسـە و قسـەڵۆکی خەڵکی، نایەوێت لە ژوورەکەی خۆیدا پێشـوازی بکات، یان پڕوات بۆ ژوورەکەی ئەو و سـەردانی بکات.

ئیدی پەنا دەبەنـە بـەر نامـە و نامـەکاری. ئـەم دوانـە یـەک لەیـەک نـەدارتر و کلۆڵتر. پیاوەکە بە دڵپاکی و ساویلکەیی و جۆرە سۆزێکی باوکانـە و ناشـیانە و لەئەندازە بەدەر ڕەفتار دەگـەڵ ژنـەی تاینـدا دەکـات. ژنەکـە هەوڵـدەدات ئـەم دۆستە پیـرەی ئامۆژگـاری بکـات و شـتی فێربکـات، چونکـە ژنێکـی خوێنـەوار و ڕۆشـنبیرە و کتێبـانی زۆری خوێندووەتـەوە. لەنامەکانیـدا باسـی ڕەنـج و ئـازار و نەگبەتیەکانی خۆی دەکات. بەشێوازێکی خۆش ودڵگیر، چیرۆکی ژیـانی خـۆی دەگێڕێتـەوە. کورتـە و پوختـەی ژیـانی ئـەوە بـووە کـە منداڵیـەکی داماوانـەی بەسـەر بـردووە، پاشـان لـە کـوت و پڕێکـا حـەزی لـە خوێنـدکارێکی سـیلاوی کردووە و مردنی خوێندکارەکە زۆری کارتێکردووە و خەفەتی بۆ خواردووە.

ئیدی دییڤوشکین، زۆری دڵ بەم نامانە خۆشدەبێت، ڕوحی ئاوەدان دەکاتەوە، هەستدەکات تەنیا نییە، بەڵکو دەگەڵ کەسێکی دیدا دەژی، لە پێناوی ئەم کەسەدا کاردەکات، لەبەر خاتری ئەو و بۆ ئەوەی شتێک پێشکەش بەو بکات، خۆی لە زۆر لەزەتی ژیان بێبەش دەکات. بەخۆشـی و شـادییەکی ئەوتۆوە کە ئازای دێنێتە لەرزین، لە ماڵەوە خەریکی ڕوونووسکردنەوە وکۆپی کردنەوەی نووسینان دەبێت، یان قەرز لە هاوقیتارانی خۆی دەکات تا گوڵ و

نوقڵ و نەبات بۆ دۆستە گەنجەکەی بکڕێت. بەڵام بەدبەختی بۆی لە بۆسەدایە: لەکاتێکا جلەکانی شڕو شەپرێون، پێڵاوەکانی پاژنەیان پێوە نەماوە، ڤارینکا نەخۆش دەکەوێت و دەرودراوسێکانیش گومانی ئەوەی لێدەکەن کە پەیوەندی نادروستی دەگەڵ ڤارینکادا هەیە.

ژنەی خاوەنماڵ دەڵێت: "ئەمە پەیوەندی شەیتانە دەگەڵ کچۆڵەیەکدا." یەکێک لەو کاتبانەی کە لەهەمان بینادا دەژی وەکو فێڵباز و خاپینۆکێک، وەکو ڕەمزی نێرەنگ و ڕیا، تەمەشای دییڤوشکین دەکات و مامەڵەی لەتەکدا دەکات. پێشخزمەتی ئیدارەکە هیچ بایەخێکی بۆ دانانێت. بۆیە دەنووسێت: "ڤارینکا، دەزانی چی من دەکوژێت؟ تەنیا بێ پارەیی نیە. ڤارینکا هەموو کێشە و گیروداەکانی ژیان لە سەرشانی من کەڵەکە بوون، ئەمە جگە لە وتی وتی ئەم و ئەو، چپە چپ و، ژارخەنی دەستکرد و بزەی بەماناو تەوس و تەشەرانی ژەهرین.."

ئاخر چۆن ڕێزی بگرن، لە کاتێکا جووتێ چەکمەی کۆن و شڕی لەپێدایە، جلەکانی لە ئانیشکەوە دڕاون؟ دەڵێت: "خۆزگە یەکێک لە بەرپرسەکانی من، لەوە دەگەیی کە من چەند ئارەزووی پاک و خاوێنی دەکەم. ڤارینکا، نەگبەتیە، نەگبەتیەکی ڕاستەقینەیە کە کەسێک نییە لەم واقیعە تێبگات." ڕیک لەم کاتە نالەبارەدا، جەنابی بەرپرسەکەی، بانگی دەکات و لەسەر هەڵەیەک کە لەکاتی ڕوونووسکردندا، کردوویەتی، سەرزەنشتی دەکات.

کاتێ کە دییڤوشکین، بە حاڵەتی خەبەردار، لە بەرانبەر جەنابی بەرپرسەکەیدا دەوەستێ، دوگمەیەکی جلەکانی دەپچڕێت و ڕێک لەبەر پێی جەنەڕاڵدا (بەرپرسی گەورە) دەکەوێت و دەخولێتەوە کە ئەمە کارێکی ناشایستەیە و دەکاتە بەدڕەفتاری لەبەردەم هەر بەرپرسێکدا و دەبێ لێپێچینەوەی لەسەر بکرێت و یارۆی فەرمانبەری لەسەر دەربکرێت.

بەڵام جەنابی بەرپرس، کە چاوی بەڕواڵەتی شڕوشەپرێوی فەرمانبەرە بەلەنگاز و داماوەکەی خۆی دەکەوێت، چەند پرسیارێکی لێدەکات و تەوقەی دەگەڵدا دەکات و دڵی دەداتەوە و سەد ڕۆبڵی دەداتێ تا بۆ خۆی بیدات بە جل و بەرگ. دییڤوشکین دەڵێت: "باوەڕبکە، ئەم سەد ڕۆبڵەم، زۆر بەلاوە کەمتر بوو، لەو لوتفەی کە جەنابی بەرپرس، بەرانبەرم نواندی و تەوقەی دەگەڵ کردم و منی کڵۆڵ، منی سووکتر لە بەڵمە برنج، منی هەمیشە مەستی، پێ گەورە کرد."!...

دییڤوشکین، بۆیە خووی دابووە بادەنۆشی و خواردنەوە، تا کڵۆڵی و داماوی خۆی، خەم و پەژارەی خۆی لە بیربکات. بەڵام ئێستا دەوڵەمەند بوو و دەیتوانی پشت ڕاستبکاتەوە.

بەڵام ئەم شادییەی زۆر دەوام ناکات. پیاوێکی نیمچە دەوڵەمەند، پرێک گەندەڵ، خوازگاری ڤارینکا دەکات، ڤارینکاش، لەبەر ئەوەی نەخۆشی و نەبوونی، تەواو کۆڵەیان کوتابوو، قاییل دەبێت شووی پێبکات، ئیدی کڵۆڵی و عەزابی ڕاستەقینەی دییڤوشکین لێرەوە دەست پێدەکات.

ئیدی ڤارینکا، بە کەماڵی ئارامی دەکەوێتە خۆ ئامادەکردن بـۆ کڕینـی جیـازی و کەلوپەلی پێویست بۆ ژیانی تازەی. جۆرێـک بێخـەم و خـەیاڵی بـە نامـەکانی ئەم دواییانەیەوە بەدی دەکرێت. دەزگیرانەکەی پارەیەکی دابویە، تـا جـەواهێر و تفـاقی میکیـاجی، بـۆ خـۆی، پێبکڕێـت. ڤارنکـاش، بـە هـەموو بێگـەردی و ساویلکەییەکی خۆیەوە دییڤوشکین ڕادەسـپێرێت کـە سـەروکاری کڕینـی ئـەو شـتانەی بـۆ بکـات. پێـی دەڵێـت: "دەبـێ، حـەرفی سـەر دەستەسـڕ و دەسـتماڵەکان، بـە دەرزی گوڵـدۆزی کـرابن، تێدەگـەی؟ نـەک هـەر تەقـەڵی ئاسایی بن... تکایە، تو زاتی خوا، پێیان بڵـێ کـە قردیلـەی بچـووکی ئاوریشـم بە مانتۆکانەوە بدورن، یەخەکەی دانتێلای پان بێ. یانی زۆر شیک بێـت. ئیـدی خۆت وەکیل بە."

دییڤوشکین کە لەوپەڕی خەمباری و نائومێدیدایە، لەنێو ئەو هەموو کۆمەڵە پارچە و قوماش و دوگمە و قەیتانە زۆر زەبەندەدا سەری بەگێژەوە دەچێت. بەڵام بەوپەڕی نیازپاکی و بە دڵێکی پڕ لەخەم و پەژارەوە، بەڕاست و بە چەپدا، ڕادەکات. سەری جەواهێر فرۆشان، خەیاتان، شەپقە فرۆشان دەدات. دەڵێت ڤارینکا "لە نامەکەیدا باسی نەواری چینداری کردووە کە کراسەکەی پێ بنەخشێنن. زۆرچاکە، ئێستا ئەویش دەتوانێ باسی زینەت و ڕازانەوە بکات، بەڵام لە بیرم نەماوە ئەو نازەنینە، سەبارەت بە دورینی ئەم نەوارو قەیتانانە ئەمری بەچیە."

ئەنجام زەماوەندەکەی ڤارینکا سـەر دەگرێـت و دییڤوشـکین کـە تـا ئەوکاتـە، هیچ گلەییەکی دەرنەبڕی بوو و خۆی لە هەر ئاهو ناڵە و زارییەک دوور گرتبـوو، لە ڕێورەسمی خواحافیزیدا جڵەوی خۆی لە دەسـت دەدات و لـەپڕ بـە ئاشـکرا خەم و پەژارە دایدەگرێت و نائومێدی لێدەردەکـەوێت. نامـەکانی زۆر بێسـەروبەر دەبن، هیچیـان بەسـەر هیچـەوە نایێـت. دەیـەوێت بەهـەر جۆرێـک بـووە، ئـەوە بڵێت کە چەند ڤارینکـای ئـازیزی خۆشـدەوێ و هـەر وشـەیەکی بـەلاوە جـوان بێ، بەکاری دەبـات. دەیـەوێ بڵێـت ڕۆیشـتنی ڤارینکـا چ بۆشـاییەکی قـووڵی خستووەتە ژیانی ئەوەوە. کتێبەکـە بـەم هـاوارە کۆتـایی دێـت: "نـا، نـابێ ئـەم نامەیە، دوا نامە بێت. ئاخر چۆن دەبێت، نامەی نێوانمان، بـەمجۆرە و بـەم کـوت و پڕییە کۆتایی بێت؟... نەخێر، مـن نامـەت بـۆ دەنووسـم و تـۆش نامـە بـۆ مـن بنووسـە... ڤارینکا گیان، شـێوازی نووسـینم خەریکـە تـۆزێ بـاش دەبـێ. ئاهـا! گیانەکەم، باسـی شـێوازی چیـت بـۆ بکـەم؟ خـۆ مـن لـەم سـاتەدا بەخۆیشـم نـازانم چـی دەنووسـم. چـی دەڵـێم، نـەخێر نـازانم. نووسـینەکەم دووبـارە ناخوینمەوە، پێیدا ناچمەوە، هەڵەکـانم ڕاسـت ناکەمـەوە، دەسـتکاری شـێوازم ناکەم. من هەموو زیکر و فیکـرم ئەمەیـە کـە نامـە بـۆ تـۆ بنووسـم، تـا دەتـوانم باشترت بۆ بنووسم.. ئەی نازەنینە خۆشەویستەکەم، (ماتوچکا.)"

بێگومان، ڕۆمانی هەژاران، سێبەری ڕۆمانی پاڵتۆکەی گۆگوڵی پێوە دیارەو لـە کاریگـەریی و بانـدۆری ئـەو بـەدەر نییـە. دییڤوشـکین، ئـەم ڕابـەر و ڕێنوێنـە فەخرییە، بەرەو دنیای چینی چەوسـاوە و مـەزڵوومان، کـە لەسـایەی ڕێزگـرتن لـە سـەرانی خـۆی و، دڵسـۆزی بـۆ کـاری کۆپیکـاری خۆیـدا گـەورە بـووە، ئـەم

هاووڵاتیە پەرێشـان خەیاڵـەی سـان پتروسـبورگ، کەمایـەی تـەوس و تـوانج و مەخسـەرەی هاوکار و هاوپیشـەکانی خۆیەتی، ئەم پیاوەی کە لەژێر گوشـاری نـەبوونی و ئـەرک و ڕەنجـی ژیانـدا، گێـژ و حـۆل بـووە، بەگیانـە لێبوردەییـە ئایینیەکەی خۆی، هەموو شتێک قەبووڵ دەکـات و لـە هەنبـەر هـەر کەسـێکدا سـەر دادەنەوێنێ، دەقاو دەق، کۆپی ئـەو ئاکـاکی ئاکاڤیچەیـە کـە گوگـوڵ، لـە چیرۆکی پاڵتۆدا بەرجەسـتە و جاویـدانی کـردووە. بـەڵام قارەمانەکـەی گوگـول، بەشێوە و سیمای خۆی، بەزەیی خـەڵکی دەهاڕوژێنی، بـەبێ توانـایی خـۆی سـەرنجی خـەڵکی ڕادەکێشـێت و بـە کـەڵکی هـیچ شـتێک نایـەت و زۆر بێسەروبەرە لێ (ماکار دییڤوشکین)ی قارەمـانی ڕۆمانەکـەی دوسـتویفسـکی لـە هەنـدێ ڕووەوە مایـەی ستایشـە، هەنـدێ سـیفەت و خەسـڵەتی وەکـو بەزەیی و فیداکاری و باسـنەکردن و شـاردنەوەی کڵـۆڵێ و بەدبـەختی خـۆی، نیشانەی ئاستی باڵاو کەم وێنەی ئەخلاقیی ئەون. نزمی ئاستی ژیـان کـۆڵی پێنادات. بەڵکو زیاتر هـانی دەدات و متمانـە بـەخۆی پەیـدا دەکـات. نەگبـەتی و بێبـەختی و سـاویلکەیی، لـەدڵی خۆیـدا دەشـارێتەوە و لەناخـدا، عـەزاب دەچێژێ، بەڵام ناگاتە ئەو ئاسـتەی ببـێ بـە کاریکـاتۆر و شـێوەیەکی شـێواوی دزێو پەیدا بکات.
کۆمەڵێک کاراکتـەری لاوەکـی بێمانـا لـە دەوری قـوت دەبنـەوە، کـە دیارترینیـان بـاوکی پوکروفسـکی، خوێنـدکارە سـیلاوییەکەیە. ئـەم پیرەمێـردە، درۆزن و بەدفەڕ و خوێڕیلەیە، سۆز و خۆشـەویستیەکی حیرەت و ترسامێزی بەرانبەر بـە کوڕەکەی هەیە. ڕێزی سـەربەخۆیی و خوێنەوارییەکـەی دەگرێـت. ئـەویش لـە ڕێگـەی ئـەم سـۆزداری و تـەوازوع و شـەرم و حەیایـەی خۆیـەوە، قـەرەبووی عەیبەکانی دەکاتەوە. " لە یەکەم سەرنجدا، وا وێنا دەکرێت کە دەیـەوێ خـۆی خاکی و بچووک بنوێنێ، بۆیە گومانی ئەوە دەکرێت کە شەرم لە خـۆی بکـات، تاقـە هەسـتێکی ڕاسـتگۆیانە و ئاپرومەندانـەی ئـەم پیـاوە، خۆشـەویسـتی بێپایـانی بـوو دەرهـەق بـە کوڕەکـەی." نموونەیـەکی دیکـەی نـاو ڕۆمـانی (هـەژاران) گورچیکـوفی کرێچیـە. ئەمـە تووشـی گێچـەڵێک بـووە، داوایـەکیان لەسـەر تۆمـار کـردووە کـە ئـاپرو و سـەروەت و سـامان و ئاینـدەی کەوتووەتـە مەترسـییەوە. بـەڵام لـە دادگـادا تـەبرێ دەبێـت. کـە حـوکمی بەرائـەت و بێتاوانیەکەی دەردەچێت، ئیدی لە هیچ شوێنێک توێتکە ناگرێت. بـەناو خـەڵکی دەکەوێ و قسەی سەیر دەکات: "شـەرەفی من... شـەرافەت... شـۆڕەت، نێـو و ناوبانگی باشـی منداڵەکانم..!" هەمان شەو، لەخۆشـیدا دەمرێت.
ئا بەمجۆرە، ئەو بابەت و سکێچانەی کە پاشان لە ڕۆمانەکانی دیکەی دوستویفسکیدا، دووبارە دەبنەوە یان دەخرێنە ڕوو، لەم یەکەمین بەرهەمەی دۆستویفسکیدا، کەم و زۆر بەدی دەکرێن. بۆ نموونە ئەو باوکە پەرپووت و خوێڕەڵە و ڕەشبین و بێشەخسیەتەی کە منداڵەکانی بەچاوێکی سووک و بەزەیی ئامێزەوە تەمەشای دەکەن، هەمان ئەو کاراکتەرەیە کە بەنێوی (مارمولادوف)ەوە لە ڕۆمانی (تاوان و سزا)دا دەردەکەوێت. کە لە ڕۆمانی (برایانی کارمازوفدا) لە دەوری کارامازوفی پیرو، لە ڕۆمانی گەمژەدا لە دەوری

ئیڤۆلگینی (بەدبەختی ئیستیقالەدەر)دا دەردەکەوێ. بەدمەستانی دەرونپاک و دڵپاک و ئازا، لە تێکڕای بەرهەمەکانی دۆستویفسکیدا هەن. باشە لە سەرەتاوە، بیری لەوە نەدەکردەوە کە ڕۆمانی تاوان و سزا ناوبنێت "مشەختانی دڵپاک"؟
ئەو پیرەمێردەی کە پاش دادگاییەکە تەبرێ دەبێت، وێڕای بوودەڵەیی و گەندەڵیەکەشی، بە تەبرێ بوونەکەی تەواو سەرمەست دەبێت و شانازی بەخۆیەوە دەکات و زۆر بەخۆی دەفشێت، لە کەسایەتی (ئیخ مینیف)ی کاراکتەری ڕۆمانی (تەوهین کراوان)دا دەبینینەوە. لوجین یان سویدریگائیلوف، لە ڕۆمانی تاوان و سزادا، نموونەی ئەو دەوڵەمەندە هیچ و پووچ و عەیبدارانەن، کە چاو پڕکێ دەگەڵ ئەو کیژە جوانانەدا دەکەن کە ژیان غەدری لێکردوون و تووشی چەوسانەوە و عەزاب بوون. هەموو ئەم کاراکتەر و کەسایەتیانە، تەقریبەن هەر هەموویان، لەم یەکەمین بەرهەمەی نووسەردا، حوزوریان هەیە، بەڵام سیفەت و خەسڵەتەکانیان، تەبع و تەبیعەتیان بە ڕوونی دەرنەپڕدراوە. نووسەر هێشتا لە قۆناغی تاقیکردنەوە و جەڕباندندایە. وەکو نیگارکێشێک، کە ڕەنگەکان لە پاینی کاغەزێکی سپیدا تاقیدەکاتەوە، بەو ئاوایە دەیان جەڕبێنێ. پاشان، زات وەبەرخۆی دەنێت، بەچاوی تیژتر و هوشیاری زیاترەوە تەمەشایان دەکات. وردەکارییەکان و مینیاتورەکان گەورەتر دەبینێ، دەستکارییان دەکات ودروستیان دەکاتەوە.ئیدی لەم پاڵێتەوە کە زۆر بە وردی و بەدیقەت ئامادە کراوە و تێکڕا، دیمەنی هەزاری و بێنەواییە تابلۆ ناوادەرەکانی خۆی هەڵدەهێنجێ و دێنێتە دەرێ. ئیدی لەم ئاهەنگ و ئاوازو نەوا پڕ دوو دڵی و گومانانەوە، سەمفونیا، نایاب و دەگمەنەکەی برایانی کارامازوف لە دایک دەبێت. بەڵام بۆ لەدایک بوونی ئەم شاکارانە، پێویستە چاوەڕوانی ئەوە بکەین تا بەهرەی دوستویفسکی دەگەشێتەوە و بەسیرەتی تەواو دەربارەی بابەتە سەرەکیەکانی پەیدا دەکات، چونکە هەژاران، دییڤوشکین و ڤارینکا هێشتا لە سنوور و قاوغی خۆیدا قەتیس ماون و دەرنەچوون.نە ئاسمانێک بەسەر سەریانەوە هەیە، نەسێبەرێک لە بەرپێیاندا بەدی دەکرێت. ئەمانە ئازار دەچێژن، بەڵام ئازارەکانیان ئازارێکی مەعنەوییە زادەی نایەکسانی کۆمەڵایەتیە، بە شێوەیەکی گشتی شەقڵێکی مادی و زەمینی لەخۆ گرتووە. هێشتا نیگەرانی و ئازاری میتافیزیکی دەرک ناکەن. هێشتا لە دنیایەکدا دەژین کە "دوو جاران دوو دەکاتە چوار". کە دوستویفسکی دەور بەسەر کاراکتەرەکانیدا دابەش دەکات، کاراکتەرێکی کەمە: ئەویش خودایە.
بۆیە پێویست بوو ئەزموونی سێدارەو شاربەدەری و دوورخستنەوە بۆ تاراوگەی سیبریا بجەڕێنێ و ببینێ، تا ئەم کاراکتەرەش (خوا) لە زەمینەو پاشخانی دنیای دوستویفسکیدا دەربکەوێت و خۆی بنوێنێ.
بەهەرحاڵ گریگوروفیچ، ڕۆمانی (هەژاران)ی زۆر بەدڵ دەبێت، چەند جارێک بە دەنگی بەرز دەستخۆشی لە دوستویفسکی دەکات و دەیەوێت دەستەکانی بە گەرمی بگوشێت، لێ دوستویفسکی بە خەمساردی و بە

دەنگەگیراو ناخۆشەکەی خۆی، کە زۆرجار گوێگری ئازار دەداو پەست دەکرد، درێژە بە خوێندنەوەکەی خۆی دەدات.
دوای ئەوەی دوستویفسکی دوا ڕستەی ڕۆمانەکە دەخوێنێتەوە، گریگوروفیچ، بەچاوانی تەژی ڕوندکەوە، خۆی دەخاتە باوەشی دوستویفسکییەوەو تکای لێدەکات دەستنووسەکەی بداتێ. پاشان دەیدات بە نیکراسوف، کە لە هەوڵی دەرکردنی گۆڤارێکدا بوو. ئەم شاعیرە (نیکراسوف) زۆر بەگەرمی ستایشی نووسەری ڕۆمانەکە دەکات و دووپاتی دەکاتەوە کە کارێکی سەرکەوتووە.
ئەم نیکراسوفە، گەنجێکی سەیر بوو! باوکی کۆنە سوپاییەکی یەجگار بەغیل وسەختگیر بوو، بابی لێدەپرێت بۆ فەوجی نەجیمزادانی سوپای ڕووسی بنێرێت، لێ نیکراسوف قەبووڵ ناکات و لە بابی جیادەبێتەوە و یاخی دەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بە خوێندنی ئازاد لە زانستگەدا بدات.
بابی، مووچەی ڕۆژانەی ژیانی لێدەپرێت، ئیدی ئەم کوڕە گەنجە، لە سان پترۆسبورگدا، ژیانێکی هەژارانە دەباتە سەر: لەخوارنگەکاندا نان دەدزێت. لە پەناگایانی شەوانەی هەژاران و بینەوایاندا دەخەوێ. بەڵام خەون و خولیا و ئاواتەکانی سنووریان بۆ نەبوو. چیرۆک و وتاران دەنووسێت ، جورئەت و بوێریەکی زۆر لە نووسینەکانیدا نیشاندەدات. زۆرجار شیعری دەنووسی و دەینارد بۆ گۆڤار و بڵاڤۆکەکان و پاداشتێکی کەمی لە بریان وەردەگرت. یەکێک لە شیعرەکانی لەژێر سەرناڤی (لەڕێگادا) سەرنجی بیلینسکی ڕادەکێشێت و پەسەندی دەکات. ئەم ڕەخنەگرە بەناوبانگە، ئەم شاعیرە گەنج و تازەیە هاندەدات و ڕێنوێنی دەکات و لە ناوەند و کۆڕە ئەدەبیەکاندا دەیناسێنێ، ئیدی نیکراسوف، لەمەوە زۆر بەلەز نێو دەردەکات و ئەستێرەی دەکەوێتە بەرزی. ئیدی وەکو شاعیری هەژاران و خاوەن جیهانبینییەکی فراوان شۆرەت پەیدا دەکات.
ڕۆژنامەنووسی پیر دەربارەی دەڵێت: "نیکراسوف، تا دوور دەڕوات. ئەو وەکو ئێمە نییە... ئەو سەرمایەیەکی بچووک فەراهەم دەکات."
لەڕاستیدا، ئەم نیکراسوفە بەخۆی دەڵێت:
ئەی گەلی ملکەچ و گوێڕایەڵ!
من هاتووم، تا ئازارەکانی تۆ
بەدەنگی بەرز بگێڕمەوە
بە پرتەوی نوری ویژدان
ئەو جادەیە ڕوناک بکەمەوە
کە خوا تۆی خستووەتە سەری
و ڕابەریت دەکات.
هەر ئەم نیکراسوفەیە کە بەزەبری بەهرە و قەریحەی هونەریی خۆی کچێکی کۆیلەمان پێدەناسێنێ کە لەژێر قامچیدا ئازای بەدەنی لەخوێندا هەڵدەکشێت. هەر ئەم نیکراسۆفەیە کە هاوسۆزی و هاوخەمی بەلەمڕانانی ڕوباری ڤۆلگا دەکات، بۆ ئەو موجیکانە دەگری کە لەسەرما لووتیان سوور

بوەتــەوە و نەگبەتیــە گــەورە و بچووکــەکانی ڕووســیا لــەقاو دەدات. هــەروەها هەمان نیکراسۆفە، کە بەشێوەیەکی ناشیرین لە کۆمەڵگەدا پـەروەردە دەبـێ و پەیوەنـدی بـە(بانـاییف)ی نووســەرەوە دەکـات، لـە ماڵەکـەی ئـەودا ئـاکنجی دەبێت و ژنەکەی لە خشتە دەبات و پازدە ساڵی تەواو دەگەڵیا دەژی، و مێـردە فریوخواردووەکە، والێدەکات ئیمتیازی گۆڤارێک بکڕێت و بـە دوو قـۆڵی بـەڕێوەی ببەن.
بەبۆچوونی ئەم شاعیرە، پێدا هەڵگوتنی پرولیتاریا و فەند و فێڵی بازرگانی و کۆمەڵایەتی نەک هیچ ناکۆکی و هەڤدژییەکیان لەنێواندا نییە، بەڵکو تەواوکەری یەکدین. دژمن و ناحەزەکانی دەیانگوت بەشەرێکی هەرزە و ئەهلی ڕابواردنە، دۆست و برادەرەکانی وەڵامیان دەدایەوە: بەشێوەیەکی نائاگا ئەوە دەکات.
کاتێ گریگوروفیچ ڕۆمانی (هەژاران)ی بۆ هێنا، نیکراسوف وا خۆی دەنوێنێ کە مژوولە و دەرفەتی گوێگرتنی نییە و حەواسـی پەرتە، ئەنجام بەکەش و فشەوە قایل بوو کە دە لاپەڕەیەکی بۆ بخوێننەوە، بەو عیسابەی کە "هەرچیەک بێ، بە دە لاپەڕەیەک دەردەکەوێ کە بابی چەندە." گریگوروفیچ، دەست بەخوێندەنەوە دەکات. دە لاپەڕە، بیست لاپەڕە سـی لاپەڕە، بەبی هیچ وەستانێک دەخوێنێتەوە هەر کە دەگەنە ڕێ و ڕەسمی ناشتنی خوێندکارە سیلاوییەکە، نیکراسوف خۆی پێناگیرێت و لە خۆشیدا هاوار دەکات و جنێو دەدات. کە دەگەنە نامەی خواحافیزییەکە، گریگوروفیچ جلەوی فرمێسکی خۆی پێناگیرێت و لە هۆڕژنی گریان دەدات و، ژێرا و ژێر تەمەشایەکی نیکراسوف دەکات و دەبینێ دەموچاوی لە فرمێسکا هەڵکشاوە. چونکە نیکراسوفی بێ پەروا و ئەهلی ژیان و ڕابواردن و قازانجی مادی، هێشتا دڵێکی تەڕی سەر ڕێژ لە سۆزی هەبوو و لەوە گەنجتر بوو، بتوانێ جلەوی خۆی بگرێت و بەخوڕ نەگری. گریگوری کە ئەمە دەبینێ لە کەیف و خۆشیان لە پێستی خۆی ناهێوری و دەڵێت: "دەبێ بەزووترین کات بڕۆین بۆ لای دوستویفسکی و مژدەی بدەینێ، بەڵام چ بکەین بە ئێستاشەوە و بێگومان خەوتووە." نیکراسوف دەڵێت: "چ قەیدیە، با خەوتبێ، بیداری دەکەینەوە. ئەم هەواڵە بۆ ئەو لەخەو گرینگترە."
بەڵام دۆستویفسکی نەخەوتبوو، هەموو شەوەکەی لای برادەرێکی بە خوێندنەوە ڕۆمانی گیانە مردووەکان بەسەر برد بوو، بپ جاری سەدەمین، گەنگەشەی ناوەڕۆکی ئەم کتێبەی کرد بوو و سەعات چواری بەیانی بۆ ماڵ گەڕابووەوە. ئەم شەوە، یەکێک لە هەیڤە شەوەکانی سان پتروسبۆرگ، شەوێکی ڕوناک و خۆش وەکو ڕۆژێکی بەهاری. دوستویفسکی کە دەگاتە ماڵەوە، ناتوانێ بخەوێت، پەنجەرەکە دەکاتەوە و بەرانبەر بە ئاسمانی ساف و بێگەرد دادەنیشێت، ئاسمانی بەرین و درەخشان کە بەدەم پرتەوێکی زایوینەوە تریفە تریف شەپۆلی دەدا.
ماڵەکانی شار، لەبەر پرتەوی ئەم هەیڤە شەوەدا، کە بەڕاستی شەوی، شەو بێداران بوو، مت بوو بوون. بە دەگمەن ڕێبوارێک بە جادەکانەوە دەبینرا.

دوستویفسکی هێشتا دڵنیا نەبوو کە لەدنیایەکتی واقیعی دایە، لەنێو دوو دنیادا بوو، بەدەم چاوەڕوانی هەڵاتنی هەتاوەوە دنیشتبوو کە لەئان و ساتدا بوو هەڵێت. ڕێک لەم کاتەدا، لە دەنگی زەنگی دەرگا ڕادەپەڕێ. هەڵدەستێ و دەرگا دەکاتەوە. گریگوروفیچ دەگەڵ پیاوێکی نەناسدا، لەبەر دەرگا دەردەکەون. دۆستویفسکی ڕووی گرژ دەبێت و کەمێک دڵی دادەخورپێ، بەڵام میوانەکان زوو بەدەم هاواری خۆشییەوە، باوەشی پێدا دەکەن، بەتوندی و گەرمی تەوقەی دەگەڵ دەکەن، کتێبەکەیان خویندووەوە و زۆریان بەدڵ بوو. دەڵێن: "کارێکی بلیمەتانەیە!... کارە نەگاڵتە."
دوستویفسکی، حایر و خۆشحاڵ، نازانێ بە چ زمانێک سوپاسی ئەو هەموو مەدح و ستایشەیان بکات. نیو سەعاتێک دادەنیشن و ئیدی باسی شیعر، حەقیقەت، سیاسەت و شانۆ دەکەن. باسی هەرچیەک دەکەن، وتەیەکی گوگۆڵ بە نموونە دێننەوە. باسی بیلینسکی و دەسەڵاتی ڕۆپشنبیری بیلینسکی دەکەن، لێرەدا نیکراسوف هاوار دەکات: "من ئەمڕۆ دەستنووسەکەت دەبەم بۆ بیلینسکی و دوایی بۆت دەردەکەوێت کە چ پیاوێکە! با بیناسیت و تەعاروفی لەگەڵ دا بکەیت، هەنگێ بۆت دەردەکەوێ چۆن پیاوێکە!... ئێستا بۆ خۆت بخەوە. ئێمە دەڕۆین، تۆش سبەینێ وەرە."
ئەنجام، گریگوروفیچ و نیکراسوف، دەڕۆن، بەڵام ئیدی خەو لە چاوانی دوستویفسکی ناکەوێت. لە ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێکدا دەنوسێت: "دوای ئەم دیدارە ئیدی خەوم زڕا. چ حەماسێک، چ فەتح و سەرکەوتێنیک! بەڵام ئەوەی بۆ من زۆر بایەخدار و گرینگ بوو، ئەو گرینگی یە بوو کە ئەوان بە بەرهەمەکەیان دابوو. ئێستاش بەڕوونی لە یادمە کە لەوکاتەدا، چ بیرو هزرینێک بەسەرما زاڵ بوو: بەڵێ، من پێشکەوتووم. پیرۆزبایی و دەستخۆشیم لێدەکەن، کتێبەکەمیان زۆر بەدڵ بوو و ستایسیان دەکرد، بەڵام بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە ستایشیان دەکرد. بەو سەعات چواری بەیانیە هاتبوون، چونکە ئەم دیدارەیان لەخەو پێ گرینگتر بووا! کە دیمەنێکی دڵگیر و خۆش بووا!"
گریگوروفیچ، تا بەرەبەیان لەسەر قەنەفەکەی خۆی ڕادەکشێت. گوێی لە دەنگی پێی دوستویفسکی دەبێت کە لە ژوورەکەی تەنیشتەوە، دێت و دەچێت.
نیکراسوف بۆ بەیانی بەڵێنەکەی خۆی دەباتە سەر و دەچێت بۆ لای بیلینسکی و بەهەڵچوون و جۆش و خرۆشەوە هاوار دەکات: "گوگولیکی تازە لەدایک بووە."
بیلینسکی، بەتوندی وەڵامی دەداتەوە: "چما ئێوە وا تەسەور دەکەن، نووسەرانی وەکو گۆگۆڵ، قارچکن، خۆ بەخۆ هەڵتۆقن." بەڵام وێڕای ئەوەش قاییل دەبیت دەستنووسەکە لای خۆی گل بداتەوە. بەڵێنی ئەوە دەدات بیخوێنێتەوە. دیارە ئەمە خۆی لەخۆیدا، بەسەرکەوتنیکی گرینگ دێتە ژماردن. چونکە بیلینسکی، لەو سەردەمەدا بە ڕەخنەگری هەرە گەورە دەژمێردرا و گوێی لێدەگیرا و، لێی دەترسان و قسەی گەڕانەوەی نەبوو، کەسێکی

ڕاستگۆ و پاک بوو، خاترانەی لانەبوو. بیلینسکی، پیاوێکی لاوازی دەستکورت بوو، لە خانوویەکی چکۆلەی پەرپووتدا دەژیا دەکۆکی، بەڵغەمی فڕێ دەدا، خوێنی هەڵدەهێنا. دەیزانی بەو زوانە دەمرێت. بەڵام پیاوێک بوو تووڕە و هەچوو، بە تووڕە بوونەکانتی خۆی ڕای گشتی خەڵکی دەهەژاند. لەکاری خۆیدا، جدی و، لێهاتوو و بەپەلە بوو. بادانەوەی زۆر بوو، جاری وا هەبوو ستایشی دەکرد و پاشان ژێوان دەبووەوە و بەپەلە بایدەدایەوە. دوستویفسکی دەربارەی ئەو دەڵێت: "پەلەترین پیاوی سەرانسەری ڕووسیایە."
بەڵێ، پەلەترین و چالاکترین پیاوە: "ڤیساریون بیلینسکی تووڕە" زۆر بەپەلە خوێندنی خۆی تەواو دەکات و ئێستا خەریکی ئەو لێکۆڵینەوە و تیۆریانەیە کە پێشتر و لە ڕابردوا ماوەی تەواوی نەبووە بە تەواوەتی دەرکیان بکات و لێیان تێبگات و هەرسیان بکات. ئیدی بە پچڕ پچڕی خووی داوەتە ئەو کارانە، دەمێ بەجدی کاری لەسەر کردوون و پاشان وازی لێهێناون و دوایی دووبارە چووەتەوە سەریان. بەهەرحاڵ ئەم پیاوە لەسەرەتای کارەکانیا، سەراپا لە ئایدیالیزمدا نقووم دەبێت. هونەر لەپێناوی هونەردا وردبوونەوەی قووڵ لە خیلقەت، دوورکەوتنەوە لە خەڵک. بەڵام بەرە بەرە ئەم هاماجەی لێتەنگ دەبیت، باری سەرشانی قورس دەکات. ئیدی ناتوانێ تەنیا لەچوارچێوەی ئەدەبدا بمێنێتەوە، تەنیا لە سنووری خودی خۆیدا بمێنیتەوە.
لە نامەکیدا بۆ دۆستێکی خۆی دەنووسێت: "ئەوەی ڕاست بێ هونەر خنکاندوومی. بەهەرحاڵ من دەمتوانی بەو شێوەیە لە ناو خودی خۆمدا بژیم، لە دەروونی خۆمدا بژیم. وام وێنا دەکرد، هەر کەسێک بگرێت، جگە لە ژیانی دەروونی، هیچ بوون و ژیانێکی دیکەی نییە، بەڵام ئێستا لە خودی خۆم هاتوومەتە دەرێ. هەرچەندە لەوێدا، لەناخی خۆدا ئاسوودە دەژیام، بەڵام ئێستا بەرەو جیهانێکی تازە هاتووم، جیهانێکی سەرڕێژ و تەژی لە ڕەنج و ئازار."
ئیدی جارێکی دی تەماس دەگەڵ واقیع و جەماوەردا پەیدا دەکات. لە جەماوەری خەڵک نزیک دەبێتەوە و خۆی وەقفی دۆز و مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان دەکات. قەدەر و چارەنووسی میللەتی ڕووس، زۆر دژوارە و تەحەموول ناکرێت. ئەرکی نووسەرە کە داکۆکی لە خەڵکی چەوساوە بکات و کلۆڵی و داماوی ڕەعیەت و فەلاحات لە قاو بدات و داکۆکیان لێبکات. کتێب وەختێ بایەخ پەیدا دەکات کە بابەتی مرۆڤانی لەخۆ بگرێت. بەهرە کاتێ بایەخی هەیە، کە بەسوود و قازانجی کۆمەڵگە بێت.
لە دەوروبەری ئەودا حیزبی (ڕۆژئاوا) دروست دەبێت کە ڕێک پێچەوانەو دژی حیزبی "سلاڤدۆستان"ە. لەوە بەدواوە تەنیا سوێند بە سوسیالیستانی فەرەنسی دەخوات و تەنیا باس و ستایشی ئەوان دەکات و تەنیا بانگەشە بۆ پێشکەوتنی زانست و جەماوەری خەڵک دەکات. تەنانەت کەسێکی وەکو (پوشکین)ش کە جاران، مایەی ستایش و پەسەندی بێ قەید و مەرجی ئەو بوو، ئێستا لە دید و بۆچوونی و ڕوانگەی ئەوەوە تەنیا هۆنەرێکی شیعری

ئەنجوومەن و کۆڕە ئەدەبیەکان بوو. مەگەر پوشکین پێی نەگووتوە: "مەنجەڵەکەت لە هەموو شتێک لا ئازیزترە، چونکە خواردنی تیا لێدەنەیت." و بیلینسکی، بەچاوانی یەبڵەقەوە، بە ژوورەکەدا دێت و دەچێت وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "بێگومان، مەنجەڵەکەم لەلا ئازیزە، لە هەموو شتێکی دی ئازیزترە! چونکە تەنیا هی من نییە، بەڵکو هی خانەوادەکەشمە، بۆ ئەو هەژار و بێنەوایانەشە، کە خواردنیان بۆ تیا لێدەنەم. من بەکوێرایی چاوی هەموو ئەرستوکراتان و هەموو گەنجانی فیشاڵباز و خۆهەڵکێشەوە، ئەرک و مافی سەرەکی من زیاتر تێر کردنی خانەوادەو کەسوکارەکەم و خۆمە تا بایەخدان بێ بەو دیمەن و دیاردە ئیستاتیکیەی کە هونەر بۆم دەڕەخسێنێ."* (* - پڕوانە بیرەوەرییەکانی تورگینیف).

پەیوەندی بیلینسکی، تەنیا لەگەڵ گۆگۆل دا زۆر خۆش و نەگۆڕ دەبێت. لێ مخابن! کاتێ گۆگۆل، نامەکانی نێوان خۆی و برادەرەکانی بڵاودەکاتەوە، بیلینسکی، زۆر تووڕە دەبێت و بە جارێ گڕ دەگرێت. ئەم نووسەرەی کە سەروەختێ بیلینسکی لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەبەرهەمەکانیا، عەیب و عارەکانی کۆمەڵگەی هاوچەرخی لەقاو دەدا، دەیپەرست، ئێستا لەبەرچاوی کەوت، وەکو سۆفیەکی باشقەڕۆ، سڵاڤدۆستێکی گۆشەگیر و کۆنە پەرستێکی هۆڤی و کێوی تەمەشای دەکرد. بیلینسکی نامەیەکی دوورو درێژ و پڕ لە ڕق و کینە بۆ گۆگۆل دەنێرێت، کە ئەم نامەیە دەگاتە دەستی دوستیوفسکی و کارێکی زۆر خراپی لێدەکات.

بیلینسکی بۆ گۆگۆل دەنووسێت: "بەڵێ، من وەکو ئینسانێک کە لەڕێگای خوێنەوە وابەستەی وڵاتی خۆی بێت و بەناچاری هەموو هیواو ئومێدێکی ئەم وڵاتە، شانازییەکانی ئەم وڵاتە، پێشەواو ڕابەرانی پەروەردەی ئەخلاق و ویژدانی ئەم وڵاتە، گەشە کردن و پەرەسەندنی ئەم وڵاتە و پێشڤەچوونی ئەم وڵاتەی خۆش بوویت، بەو ئاوایە خۆشم دەویستی، بەڵام ئێستا مەگەر هەر خۆم بزانم ئەم کتێبەت چەندی تووڕە کردوم و چ نەفرەتێکی لەلا دروستکردووم. تۆ ئاگات لەوە نییە کە ڕووسیا ئەمن و ئاسایش و شادی و ڕزگاری خۆی لە عیرفان و دینداریدا نابینێ، بەڵکو لە نەشونماو گەشە کردن و پەرەسەندنی شارستانیدا دەی بینێ، بەڵکو لە خەمڵینی ئەو کەرامەت و بەها مرۆڤانییەیدا دەبینێ کە سەدان ساڵە پێخوست دەکرێت و حاڵی حازر لە قوڕسیاندا چەقیوە... تەمەشای بەرپێیەکانی خۆت بکە، بزانە لە قەراخ چ هەڵدێرێکدا وەستاوی.".

بەڵام تا ساڵی ١٨٤٥، کە گۆگۆل هێشتا نامەکانی بڵاونەکردبووەوە. بیلینسکی زۆری خۆشدەویست و وەکو چۆن دایکێک بە سۆزەوە بایەخ بە جگەرگۆشەکەی دەدات، بەو ئاوایە مدارای دەکرد. کاتێ نیکراسوف دەڵێت: "گۆگۆلێکی تازە لەدایک بووە" بیلینسکی گاڵتەی پێدەکات. کەچی بۆ بەیانی کاتێ ئانانکوفی ڕۆژنامەوانی، پسپۆڕی بواری ئەدەبیات دەچێت بۆ دیدەنی بیلینسکی، لە دوورەوە دەبینێ کە لەوپەڕی حەوشە، لەبەرانبەر پەنجەرەیەک وەستاوە و دەفتەرێکی گەورەی بەدەستەوەیە. بیلینسکی هەر

کە چاوی بە ئانانکوف دەکەوێت، بانگی لێدەکات: "خێرا وەژوور بکەوە، با هەواڵێکت بدەمێ... ئەم دەستنووسە دەبینی، زۆر سەیر ڕامدەکێشێت، لەوەتای دەستم داوەتێ. نەمتوانیوە وازی لێبینم.. ئەمە نووسینی گەنجێکی بەهرەدارە: من ئەم کوڕە ناناسم، نازانم شێوەی چۆنە، چ بیرو هزرێکی لەمێشکدایە، بەڵام ئەم ڕۆمانە بە جۆرێ کەموکوڕییەکانی ژیان و تەبیعەتی میللەتی ڕووسی کەشف و بەرجەستە کردووە، کە تائێستا کەس بەخەویش پەی پێ نەبردووە. ئەمە یەکەمین بەرهەمە، کە دەشێت بەیەکەمین هەوڵی نووسینی ڕۆمانی کۆمەڵایەتی لەوڵاتی ڕووسیا دابنرێ. بەڵام بەشێووەیەکی هونەرمەندانە، بەشێوەیەک کە تەنیا کەسێکی هونەرمەند لە عۆیەی بێت ئەم کارەی کردووە. یانی شتێکە خۆڕسک.".
بیلینسکی، چەند لاپەڕەیەکی (هەژاران) بە دەنگێکی گڕ و پڕ لە هەڵچوونەوە بۆ ئانانکوف دەخوێنێتەوە. شەوێ نۆرەی نیکراسوف دێت کە پرواتْ بۆ لای بیلینسکی و هەواڵێکی ڕۆمانی ناقبری بزانێت. بیلینسکی بەم وشە سادەو ساکارانە پێشوازی دەکات: "بیهێنە"... خێرا خۆی بێنە.
بەمجۆرە، سێ دانە ڕۆژ، پاش ئەوەی کە دوستویفسکی دەستنووسەکەی خۆی بۆ گریگوروفیچ دەخوێنێتەوە، تەعاروف لەگەڵ گەورەترین ڕەخنەگر و واریقات نووسی ڕووسدا دەکات.
تورگینیف، ئەم وەسفە کورتەی دەربارەی ئەو ڕەخنەگرە نووسیوە: "پیاوێکی دەستە باڵای چوارشانەم بینی، سیمای ناڕێک بوو، بەڵام ڕەسەنایەتی پێوە دیار بوو، قژە خورماییەکەی بە ناڕێک و پێکی بەسەر هەنیەیدا کەوتبوو. جۆرە نیگەرانیەک بە دەموچاوی یەوە دیار بوو، لەو باباتە نیگەرانیانەی کە بەسیمای خەڵکانی شەرمنۆک و گۆشەگیرەوە، بەدی دەکرێت. هەر کە دەستی بە قسان لەگەڵ مندا کرد، کۆکە گرتی، ئامانی نەدەدا. داوای لێکردم دانیشم، ئەوجا بە خۆیشی، لەکاتێکا چاوی پڕی بوونە زەمینەی ژوورەکە و جگەرەیەکی لەنێو قامکە چکۆلە و ناسکەکانیدا، هەڵدەسوڕاند، بەلەز لەسەر تەختەکە دانیشیت."
بێگومان، (دوستویفسکی)ش بە هەمان شێوەی دەبینێ. پیاوێکی مەند، سەنگین، خەمین. بەڵام بیلینسکی زۆر خێرا دەگۆڕا، ڕووی دەگەشایەوە و دەکرایەوە. دوستویفسکی دەڵێت: "بەگوێرەی خوو عادەتی هەمیشەیی خۆی، بە دەنگێکی بەرز، پڕ لە کەش و فشەوە، لێی دووپات کردمەوە، تێدەگەیت، لەوە تێدەگەی کە بۆم نووسیوت؟" ئیدی عادەتی وابوو، کە دەکەوتە ژێر باندۆر و کاریگەریی هەستێکی بەهێزەوە دەنگی بەرز بکاتەوە. "چونکە تۆ هونەرمەندێکی پەجگار بەهەست و هەستیاریت کە توانیوتە بەرهەمێکی وابنووسیت. بەڵام تۆ خۆت بەڕاستی پەیت بەو حەقیقەتە ترسناکە بردووە کە بۆ ئێمەت وەسف و بەرجەستە کردووە؟ مەحاڵە تۆ کە لەتەمەنی بیست ساڵیدایت پەیت بە نهێنی یەکانی ئەم مەیدانە بەربڵاوە بردبێت. سەرباری هەموو ئەمانەش، ئەم فەرمانبەرە کلۆڵ و بەدبەختەی تۆ، کە بەو هەموو دڵسۆزی و فیداکارییەوە، بەو هەموو خۆشکێنی یەوە ئەرکی

خۆی ئەنجامداوە، کەمترین بایەخی بەخودی خۆی نەداوە، هیچ حیسابێک بۆ بوونی خۆی ناکات. خۆی زۆر لەوە بە بچووکتر و بێ ڕووتر دەزانێ کە هیچ حیساب و ئیحتوبارێک بۆ خۆی دابنێت، سەرەنجام ئەم فەرمانبەرە دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئاهوناڵە و گلەیی و گازاندە ناڕەوایە. وای لێهاتووە، جورئەت ناکات و ئەو هەقە بەخۆی نادات گلەیی لە بەدبەختی و کلۆڵی خۆیشی بکات!... حەقیقەت لەلای تۆ زۆر باش کەشف بووە و هونەرمەندانە دەرت بڕیوە و گوزارشتت لیکردووە. تۆ حەقیقەتت بە زەبری قەریحە و بەهرە دۆزیوەتەوە بۆیە ئاگاداربە کە بایەخی ئەم بەهرە خودا دادیە بزانیت و پابەند و وەفاداری بیت، هەنگێ دەبیت بە نووسەرێکی گەورە."

دوستویفسکی، سەرمەستی ئەم قسانە دەبێت. سەری گێژ دەخوات. بەو بێ هەر کەسێک بدینێ باوەشی بکات، سوپاسی هەموو کەسێک بکات، بەڵێن دەدات، تا هەتا هەتایە هەموو کەسێکی خۆشبوێت. کە لەوێ هەڵدەستێت و دێتە سەرجادە، هەستدەکات پێی لە دووی نایەت، بەزەحمەت دەتوانێ ڕێ بکات. لە گۆشەیەکی سەر شۆستەکەدا دەوەستێت و هایم و حەیران دەڕوانێتە ئاسمان و هەتاوی پرشنگدار و ڕێبواران. بەڵام بچووکترین خاڵی هاوبەشی لەگەڵ ئەواندا نییە، لەپڕا و بە قەڵەمبازێک، بەرزبووەتەوە و گەییوەتە جیهانێکی دیکە. لەوێندەرەوە ئەم خەڵکە وەکو مێرولە دەبینێ.

لەو بارەیەوە دەنووسێت: "لەکاتێکا کە هەڵچوونێکی شەرمنانە باڵی بەسەردا کێشابووم، لەدڵی خۆدا دەمگوت ئایا دەشێت بە ڕاستی ئەوەندە گەورە بوو بووم؟ ئاهـ، گاڵتەتان پێم نەیەت، هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان ببم بە پیاوێکی گەورە، بەڵام کە ئێستا ئەم بویەرە ڕوویداوە، ئایا دەکرێت، دەستی پێوە بنرێت و ڕەفز بکرێت؟ باشە من شایستەی ئەم هەموو ڕێز و ستایشەم. بەڵام ئەمانە چ پیاو گەلێکن!.. ئایا من شایستەی قەدرزانی ئەمانەم. هەوڵدەدەم وەکو ئەوان بەرز و بەڕێز بم. دڵسۆز و وەفاداربم... سەردەکەوین. ئۆهـ، با بەگەڵ ئەوان بکەوم."

بەڵام ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەواندا نامینێتەوە. هەڵبەتە ڕۆمانی (هەژاران) کارێکی زۆر لە بیلینسکی دەکات و زۆری بەدڵ دەبێت، بەڵام ئەو مەبەستەکانی دۆستویفسکی بە گوێرەی تیۆری و بۆچوونە دڵخوازەکانی خۆی شرۆڤە کردبوو. دەشێت بگوترێ کە بیلینسکی، تەنیا چەند دیمەنێکی جوان و درەخشانی بیرکردنەوە کۆمەڵایەتی و چڤاکیەکانی خۆی لەم ڕۆمانەدا بینی بوو. لەباسی ڕۆمانەکەدا بە ئانانکوفی گوتبوو: "مەسەلەکە سادەیە، نووسەر کۆمەڵێک خەڵکی گێل و دڵساف و باشی هێناوە تا سۆزی خەڵکیان دەرهەق بجوڵێنێ و بیسەلمێنێت کە بەشەردۆستی، هەم لەزەتێکی ڕوحیە و هەم ئەرکی هەر تاکێکە. بەڵام ئەمانە غافڵن لەوەی کە کاتێ چەرخی ڕۆژگار بە گوێرەی یاساو ڕێسای خۆی دەگەڕێت، هێدی هێدی ئێسک و پروسکی ئەم خەڵکە هەژارە دەشکێنێ و دەهاڕێت و تەواو. ئەمە هەموو مەسەلەکەیە. بەڵام بەڕاستی تراجیدیایە، بەڕاستی کاراکتەرن، چ تەبع و تەبیعەتێکیان هەیە."!..

دیارە بیلینسکی لایەنی ئەرێنی، کاراکتەرانی ڕۆمانەکەی دوستویفسکی بەدی نەکردووە، گیانی ملکەچی و ڕەزامەندی کپ و پەنهانی قارەمانەکان و، هەڵوێستی نەرم و ڕەفتاری پەسندیان لە هەنبەر ڕووداوەکاندا، کاریان لە بیلینسکی نەکردووە و بە هەندی نەگرتوون، پەی بەوە نەبردووە کە ماکاردییڤوشکین لە قوربانیەکی ئاسایی، زۆر گەورەتر و قوربانی ترە، چونکە بەخۆی، بەخوایشتی خۆی ئەوەی قەبووڵ کردووە کە ببێتە قوربانی. بیلینسکی، لە ڕۆمانی هەژاراندا، تەنیا ئەوەی خوێندوەتەوە، کە بیانوویەکە بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینی کۆمەڵایەتی. نەک بانگەوازێک بێ بۆ هاوسۆزی و هاوخەمی مرۆڤانی نێوان تیرەی بەشەر، لە جەلادان و پیاوکوژان، پەست و توورەیە، بەڵام لەبیری چووە، شەهیدانی ڕێگاکەش ستایش بکات.

با واز لەم بێنین، گرینگ ئەوەیە هەردوو ڕەخنەگر و نووسەر، حاڵی حازر دێوانە و شەیدای یەکترن. بیلینسکی کە لەگەڵ هەر کەسێکدا قسان بکات، باسی کەشفە تازەکەی خۆی بۆ دەکات. ئیدی ئەم کەشفە بوو بوو بو وێردی سەر زاری. ئاکساکوف، بەشۆخیەوە دەنووسێت: "ئەمانە ئەستێرەیەکی تازەیان دۆزیوەتەوە. کەسێک بەنێوی دوستویفسکی، کە تەقریبەن لەسەرووی گۆگۆلەوەی دادەنەن."

## فەسڵی هەشتەم
## ناوەندە ئەدەبییەکان

هێشتا ڕۆمانی (هەژاران) چاپ نەبوو بوو، کە ئەنجوومەن و ناوەندە ئەدەبییەکان، بەهۆی بیلینسکییەوە، بەجۆش و جرۆش و کونجکاوییەکی سەیر و گەرم و گورەوە پێشوازیان لەم نووسەرە گەنجە دەکرد. کۆڕیان بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکەی دەگرت. بۆ ساڵۆن و ناوەندە ئەدەبییەکان دەعوەت دەکرا و دوستویفسکی سەری لە خۆی سوڕ دەما. ئیدی لە فرۆشگاکانی

زیمیرماندا، کە لەو سـەروبەندەدا زۆر بەناوبانـگ دەبێـت، شـەپقەیەکی تـایبەت بە بـۆنە و تەشـریفات بە ڕادان دەدات، بـایەخ بە جـل و بەرگ و ڕواڵەتـی خـۆی دەدات ئیدی خۆی لێدەبێت بە ڕاستیناک (ڕاستیناک، یەکێکە لە قارەمانەکـانی ڕۆمانی "باباگوریو"ی بالزاک، کە نموونەی کەسێکی شیکپۆشـی هەلپەرستی ڕیسـکبازی خۆپەسـندە، ئەم کـاراکتەرە لە زۆربەی ئەو ڕۆمانـانەی بالزاکـدا کە لەژێر سەرناڤی (کومیدیای مرۆڤـانی)دا کـۆی کـردونەتەوە، دووبـارە دەبێـتەوە.) وبەچـاوی لوتـف و خۆشەویسـتییەوە سـەیری هەمـوو خەڵکـی دەکـات و بیلینسکی بە باوکی دووەمی خۆی حەساو دەکات و لە نامەیەکدا بـۆ بـراکەی دەڵێت: "پێویستە ئەوەت پـێ بڵـێم کە دوو هەفـتەیەک لەوەپێش، بیلینسـکی ئامۆژگارییەکی باشـی کردم کە چۆن لە ڕێگەی قەڵەمەوە و بەقەڵەم بژیم. مـن زۆرجار دەچمە دیدەنی. زۆر لەگەڵما بە لوتفەو مدارام دەکات. بیـرو باوەڕەکـانی خۆی دەربارەی جەماوەری خەڵک، لەنووسین و هزرەکـانی منـدا دەبینێـتەوە... ئیـدی ئەمـرۆکە پتـر لەنیـوەی خەڵکـی سـان پتروسـبۆرگ، باسـی (هەژاران) دەکەن و بـووە بەداسـتانی سـەر زاری خەڵکـی... و گریگـوروفیچ، پیـاوێکە بە قورسـایی خـۆی زێـڕ دێنێـت. بەخـۆی پێـی گـوتم کە مـن موریـد و گەرمـکەری بـازاڕی تـۆم." مێـژووی ئەم نـامەیە دەگەڕێـتەوە بـۆ ١٨٤٥/١٠/٨. ئەگەر چـی ڕۆمـانی (هەژاران) تـا ١٨٤٥/١١/١٦ هێشـتا بڵاونەبـوو بـووەوە، بەڵام شـادی و مەستی دوستویفسکی لە ڕادەبەدەر بوو. لەمبـارەیەوە دەنووسـێت: "براگیـان، بە عەمـراتم، شـادی و خۆشـی و شـانازی وام بەخـۆوە نەدیتـوە، گەییـوومەتە ترۆپکی شانازی، ڕوو دەکەمە هەر شوێنێ، خەڵکـی ڕێزێکـی یەجگـار سـەیر و بـاوەڕنەکردەنیم دەگـرن. بە کونجکـاوییەکی سـەیرەوە تەمەشـام دەکەن. تەعاروفم لەگەڵ خەڵکانێکی زۆر پـایە بەرز و سـەر بەچیـنە باڵاکـانی کـۆمەڵگە کردووە. میر ئودییفسکی، تکای کردووە کە سـەردانی بـکەم و گەورەی بـکەم. کۆنت سـولوگوب خەمی ئەوەیەتی کە سەردانی نەکەم: پاناییف، پێی گوتـووە، کە نووسـەرێکی بەهرەمەنـد پەیـدا بـووە، کە هەر هەمـوو نووسـەرەکانی دی دەخـاتە گیرفـانییەوە و پێشـی گشـتیان دەداتەوە. ئیـدی سـولوگوب، بە هەڵەداوان کەوتووەتە تاقیب و سۆراخ لەم و لەو. کە کراییفسکی دیتـووە، لێـی پرسـیوە: "ئەرێ ئەم دوستویفسـکی نـاوە کێـیە؟ لەکـوێ بیـدۆزمەوە؟" "کراییفسـکی"ش کە هـیچ ڕووبینـی و مجـامەلەیەکی لەلا نـیە، ڕێـک و ڕەوان پێی گوتووە کە دۆستویفسکی شەرەف و شانازی تەعاروفی پێنابەخشێت.
جا ئەمە حەقیقەتی مەسەلەکەیە، ئەم خوردە ئەرستۆکراتە، کە حـاڵی حـازر خولیـا و کەڵکەڵەی دیـداری منـی کەوتـووەتە سـەرو وا وێنـا دەکـات بە زەبـری گەورەیی پێگەکەی و لەڕێگای ڕەفتاری پڕ ئەدەبی خۆیەوە، دەتوانێ مـن بەلای خۆیـدا ڕابکێشـێت. هەمـوو خەڵکـی بەچـاوی سـتایش و ئیعجـابەوە تەمەشـام دەکەن. وام لێهـاتووە، هەرکە دەم هەڵـدێنم و قسـەیەک دەکەم، خەڵکـی لە هەمـوو شـوێنێکی شـاردا، قسـەکەم دووبـارە دەکەنەوەو دەڵـێن: "دوستویفسکی وا دەڵێت. دۆستویفسکی دەیەوێت فڵان کـار بکـات..." بـرای

ئازیز، ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەندەم کاغەز نییە، بەشی ئەوە بکات، هەموو سەرکەوتنە ئەدەبییەکانی خۆمت بۆ بگێڕمەوە."...
سەرەنجام هەواڵێکی گرینگ بڵاوبووەوە: "دوستویفسکی، دیدار دەگەڵ تورگینیفدا دەکات. دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەنووسێت: "تورگینیف شەیدای من بووە، منیش چیوای نەماوە کە ئاشقی ئەو ببم! شاعیرێکی بەهرەدار، ئەرستۆکرات. قۆز و جوان، داراو دەوڵەمەند، زیرەک و ڕۆشنبیر، تەمەنی بیست و پێنج ساڵە. پێموایە، تەبیعەت هەموو شتێکی پێ بەخشیوەو هیچ درێغییەکی بەرانبەر نەکردووە. وێڕای ڕەوشت بەرزی و خۆشڕەفتاری، کەسێکی یەجگار ساغ و سەر ڕاستە. برادەرەکانی بریتین لە خەڵکانی بەتوانا و بەهرەدار، بەکورتیەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە شایانی ستایشە. بیر و بیرۆکانێکی زۆرم لەلایە، ئەوەندە بەسە ئەم بیرۆکانە بۆ یەکێک، بۆ نموونە بۆ کەسێکی وەکو تورگینێفی بگێڕمەوە، دەربارەی کتێبێک بدوێم، ئیدی بۆ سبەینێ لە سەرانسەری سان پتروسبۆرگدا بڵاودەبێتەوە کە دوستۆیفسکی وای گوت، بەتەمایە فڵان کتێب بنووسێت."
دوستۆیفسکی سەرمەست و شیفتەی شۆرەت و ڕەونەق و پێشقەچوونی کارەکەی خۆی بوو، لە خۆشیان لە پێستی خۆی نەدەهێوری وەکو چۆن مێر منداڵێک، ڕۆژانی یەک شەموان بەدەستێک جلی تازەوە، دەچێتە بەر ئاوێنە و خۆی دەنوێنێ  و بەخۆی دەفشێت، هەست بە شادییەکی لەڕادەبەدەر و تەحەمول نەکری دەکات، بەو ئاوایە شاد و سەرمەست بوو. دیارە ئەمە حاڵەتێکی زۆر ئاساییە، بەتایبەتی بۆ کەسێکی وەکو ئەو کە تادوێنێ لەوپەڕی تەنیایی و گۆشەگیریدا، لەوپەڕی گومان و دوودڵیدا، لەوپەڕی گومناویدا دەژیا، بەسەر خۆیدا کڕ کەوتبوو و لە هاماجێکی تەم و مژاوی و تاریکدا دەینووسی، هەرگیز باوەڕی نەدەکرد، کەسانێک هەبن، قەدری کارەکانی بزانن، خەڵکانێکی نەناس بەرهەمەکانی بخوێننەوە و دەستخۆشی لێبکەن و ستایشی بکەن. کەچی لە فاسیلەی شەو ڕۆژێکدا، دێتە ناسین و شۆرەت و نێوبانگ پەیدا دەکات و خەڵکانێک شیفتەی دەبن و خەڵکی نەناس، بەرهەمەکانی دەخوێننەوە، لێی تێدەگەن، شیفتەی دەبن و هەوڵی ئەوە دەدەن بیناسن و دۆستایەتی بکەن. چەند ناخۆش بوو کە ماوەیەکی زۆر، بەڕادەیەک گومناو بوو، نەک خەڵکی بەڵکو خۆیشی ئەوەی بەخۆ ڕەوا نەدەبینی کە بەخۆی بنازێت.
هەڵبەتە هەموو خۆ نواندنێکی ئەو لە ڕێگای نووسینەوە بوو، پاش ئەوەی لەقەڵەم و کاغەز دادەبڕا، ئیدی دەگەڕایەوە سەر حاڵەتی شەرمنۆکییەکەی خۆی، جورئەتی خۆی لەدەست دەدا و دەترسا لیاقەت و شایستەیی ئەو پێگەیەی نەبێ کە خەڵکی پێیان دەدا. بۆیە دەبوایە بە دروستی دەوری خۆی بدینێ.. لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە کە نەبادا کارەکەی نێرەنگ بوو بێ و خەڵکەکە بەرە بەرە بە فێڵ و نێرەنگەکەی بزانن و گاڵتەی پێبکەن.
کۆنت سولوگوب، دوای خوێندنەوەی ڕۆمانی (هەژاران) دەچێتە دیدەنی و، خۆی لە هەنبەر گەنجێکی ڕەنگزەردی، بەڕواڵەت نەخۆشدا، دەبینێتەوە.

پاشان لە بارەیەوە دەنووسێت: "لە ژوورەکەی خۆیدا بوو، جلی ماڵەوەی لەبەر بوو، جلەکانی کۆن دەهاتنە بەرچاو. قۆڵەکانی ئەوەندە کورت بوون، لەتۆ وایە بە بەری کەسێکی دی پراوە. کاتێ ناوی خۆم پێگوت و بە چەند وشەیەکی هەڵبژاردەی پێشوەختە ئامادە کراو، هەستی قووڵ و دڵبەندی خۆمم دەربارەی ڕۆمانەکەی دەربڕی، دەتگوت هەر لەگەڵ ئەویشم نیە، زۆر ناڕەحەت و بێزار دیاربوو، بە بێتاقەتیەوە، ئەو تاقە کورسییەی، کە لە ژوورەکەیدا بوو، بۆ دانام. کورسییەکی کۆن و شەق و شڕ بوو.

نزیکەی بیست دەقیقەیەک لەلای مامەوە و تکام لێکرد کە بۆ ئێوارە بێتە ماڵی من و پێکەوە شیو بخۆین. ئەوەی ڕاستی بێ ئەم دەعوەتە سادەیە بەجۆرێ دوستویفسکی ترساند و حەپەساند، کە دوای دوو مانگان، ئەوسا ترسی ڕەوایەوەو توانی بڕیار بدات و لە ناغافڵاو بەشێوەیەکی کوت و پڕ بێت بۆ ماڵی من.*" (پڕوانە یادەوەرییەکانی سولوگوب)

"ترسان، حەپەسان" ئەم زاراوەیە پڕ بە پێستی خۆیەتی: دوستویفسکی لەو کاتانەدا، زۆر ئاسایی، هەم دەترسا و هەم دەحەپەسا. بە جۆرێ دەحەپەسا وەکو ئەوەی تیشکی ڕوناکیەکی بەهێز چاوانی خستبێتە ڕێشکەوپێشکە و توانای دیتنی لێبڕی بێ. بەجۆرێ پێشوازی لە دژمن و ناحەزەکانی دەکرد و لە هەمێزی دەگرتن، باوەڕی نەدەکرد لەکاتێکا ئەو هەموو خەڵکی خۆش دەوێت، کەسانێک هەبن کە ئەویان خۆش نەوێ. ئەوەتا بەخۆی دەڵێت: "ئیدی ئەو خەڵکە باشە، نەیاندەزانی چۆن خۆشەویستی خۆیان بۆ من دەرببڕن. هەر هەموویان، دوا بەیەکیان، شیفتەی منن." ویڕای ئەمەش لە سالۆنی موزیکدا، لە ماڵەکەی کونت "فیلفورسکی"دا، کە دەگەڵ بیلینسکیدا چوو بووە ئەوێندەر، زۆر بە ڕوونی ئەوەی بۆ دەردەکەوێ کە ئەمە نمایشێکە و بۆ ئەو ساز کراوە. کاتێ کە لەهەمان هۆڵدا، بیلینسکی، لە ڕووی غەفڵەتەوە پەرداخێک دەشکێنێت، فیدور بەگوێی خۆی گوێی لە مەدام سولوگوب دەبێت، لە پشت ئەوەوە دەڵێت: "بریا هەر ناشی و کێوی بوان، لێ مخابن، لە فەرهەنگ و ئەتەکێتیشەوە دوورن."

پاشان بۆی دەرکەوت کە هەندێ لە هاوڕیکانی گاڵتەیان پێدەکرد کە گوایە بە تەمایە چوارچێوە و پەراوێزی کتێبەکەی بە مینیاتۆری تایبەتی برازێننەوە.

چەند ساڵێک لەوەدوا، کاتێ دوستویفسکی ڕەهەندی سیبریا کرابوو و لەوێ دەژیا، تورگینیف، ئامۆژگاری "لیونتیف"ی دەکرد، کە خۆی لەو خۆپەسەندیە بپارێزێت کە زۆرجار تووشی خەڵکانی تازەکار دەبێت. دەڵێت: "وەکو ئەم دوستویفسکییە بێنەوایە، کاتێ کە ڕۆمانەکەی بە مەبەستی چاپکردن دابووە بیلینسکی، ئەو بەلەنگازە بە جۆرێ لە خۆی گۆڕا بوو، کە گوتبووی: "پێویستە چوارچێوەی لاپەڕەکانی ڕۆمانەکەم، مینیاتۆرکاری بێت." هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە هەرگیز بە دروستی ڕوون نەبووەوە. لەساڵی ١٨٨٠دا واتە ساڵێک دوای مردنی تورگینیف، دوستویفسکی لە بڵاوکراوەی (زەمانی نوێ)دا، ناڕەزاییەکی توندی دەربارەی ئەم ئەفسانەیە بڵاوکردەوە. بەڵام وێڕای ئەوەش ئانانکوف، دەڵێت بە خۆی پرۆڤەکانی چاپی ڕۆمانەکەی

دیتووە، کە چوارچێوە و پەراوێزی لاپەڕەکانی نەخشین و بەنەخش و نیگاربوون. گریگوروفیچش زات ناکات بەرپەرچی ئەو ئیدیعایە بداتەوە، بەڵام ڕۆمانەکە بێهیچ نەخش و نیگار و مینیاتۆرکارییەک بڵاو بووەوە.
بەهەرحاڵ هیچ دوور نییە کە دوستویفسکی، سەرمەستی ئەو ئافەرین و ستایش و پیرۆزباییانە بووبێ کە لێی کراون و داوای لە بیلینسکی ڕەخنەگر کردبێت، کە ڕۆمانەکەی بەشێوەو دیزاینێکی تازەو جوان و سەرنجڕاکێش بڵاوبکرێتەوە، بە تایبەتی لەو سەردەمەدا، مێشکی زۆر ماندوو بوو، بە خۆیشی نەیدەزانی چ دەکات و چی دەوێت، بۆیە نابی، هیچ جۆرە بەخۆنازین و خۆپەسەندییەکی لێبگیرێت، یان بە سەیر و بەدوور بزانرێت.
پانایيف دەڵێت: "چیوای نەمابوو، کارێکی وەها بکەین ئەم پیاوە، کە بوو بە قارەمانی ڕۆژ شێت بکەین، بەڵام لە ئەنجامدا بەخۆی کەوتە هەرزەبێژی و ورێنە، ئیدی زۆر زوو لەبەرچاوان کەوت و بە تەواوەتی لە بیر چووەوەو داماوە! کردمان بە گەپجاڕی هەموو خەڵکی!" (پڕوانە بیرەوەرییەکانی پانایف.)
جارێک برادەرێک دوستویفسکی لەگەڵ خۆیدا بۆ ئاهەنگێک دەبات و لەوێ بە خانمێکی جوانی کۆمەڵگەی دەناسێنن، خانمەکە ناوی سینیاڤینا دەبێت. دوستویفسکی خۆی لە هەنبەر کیژێکی گەنجدا دەبینێتەوە، کیژێکی دەم ولێو تەڕی ،ناسک وەکو دەم و لێوی منداڵ، بە قژێکی ئەڵقەئەڵقەی خورمایی و دوو چاوی هێمن و ساردەوە. کیژێ دەیەوێ هەر چۆنێ بووە شتێک دەربارەی کتێبەکەی بڵێت و ستایشی بکات. بەڵام دوستویفسکی ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێت، لارەلاری پێدەکەوێت ولەخۆ دەچێ. دەیبەنە ژوورەکەی تەنیشتەوە، شووشەیەک قۆڵۆنیا، دێنن و دەموچاوی قۆڵۆنیا پرژێن دەکەن تا وەخۆیێتەوە.
دوای ماوەیەک، هەمان ئەو تورگینیفەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەیگوت: "شیفتە و دێوانەی منە" و نیکراسوف کە بەڕای دوستویفسکی "شاعیری خۆشەویستی چەوساوان" بوو. قەسیدەیەکی داشۆرین، دادەنەن، کە ئەو ڕووداوەی تێهەڵکێش دەکەن:
دوستویفسکی ئەی فیشاڵبازی خۆشەویست
ئەی سوار چاکی خەمین،
تۆ وەکو زیپکەیەکی سوور
لەسەر کەپووی ئەدەبیات
دەرهاتوویت.
بەو زوانە شای تورکان
وەزیرەکانی بۆ لای تۆ دەنێرێت،
لێ کاتێ کە لە کۆڕی ئاهەنگێکدا،
لە نێو کۆمەڵێک میران و خانەداناندا
ئەی ئەفسانەو کێشەی ڕۆژ،
لە هەنبەر ژنێکی جوانی
قژ خورماییدا،

وەکو ئەستێرەیەک ڕاخوشیت
کەپووت وەکو ترومپێت
لوول بوو و هاتەوە یەک
ئەوسا، بە بێدەنگیەکی تراجیدی
کەوتیتە تەمەشا کردنی
ئەم شۆخە قژ خورماییە
و خەریک بوو بمریت
هەر باش بوو نەمردیت
و لەبەهاری تەمەندا
گوڵی عومرت نەوەری...

ئیدی ئەم قەسیدەیە بەو تۆنە بەردەوام دەبێت. دوو هاوڕێی تری دوستویفسکی بە کۆمەکی ئانانکوف، زۆر چیرۆک و نوکتەی تەوسامێز و ناشیرین و نەنگین دەربارەی دوستویفسکی هەڵدەبەستن.

ئایا دوستویفسکی بەم تانەو تەشەرانەی نەدەزانی، یان خۆی لە گێلی دەداو وای دەنواند کە پێ نازانیێ؟ بەڵام ئەوەی خولیایەو چەند و چوون هەڵناگرێت، دوستویفسکی درێژە بە پەیوەندیەکانی خۆی دەگەڵ ئەم دۆستانە دەدات و، خۆی لە گێلی دەدات.

خانەوادەی پانایف، دەعوەتێکی دەکەن. ئەویش خۆی دەگۆڕێ، بۆن لە خۆی دەدات، وەکو ئەوەی بۆ ژوانێکی ئەڤینداری پرۆات، بە هەشتاو بەرەو ماڵی وان دەچێت. خۆی بە هۆڵێکدا دەکات، کە لە بەرتیشکی درەخشانی ڕوناکی و ئاوێناندا، گەورەتر دێتە بەرچاو. مەدام پانایف، بە نیگا هەڵیدەسەنگێنیێ و ئەم ژنە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێت:

"ئینسان لە یەکەم بەرخوردا، بۆی دەردەکەوێت کە دوستویفسکی گەنجێکی یەجگار عەسەبی و هەستیارە کورێکی هەندێک لاوازی دەستە باڵا بوو. ڕەنگی زەرد و پێستی نەخۆش دیار بوو. بیلبیلەی بچووک و کەوەیی چاوەکانی، بە نیگەرانیەوە، بەسەر شتەکانی ناو ژوورەکەدا دەگێرا، لێوە بێ ڕەنگەکانی دەتگوت پێکەوە دوراون. شوکر بۆ خوا کە زۆربەی هەرە زۆری ئامادە بوانی کۆرو ئاهەنگەکەی دەناسی، بەڵام دەبوو باسی چی لە گەڵدا بکەین؟ ئایا لە ئاستی ئەو شۆرەت و ناوبانگەدا بوو کە هەیبوو؟ ئایا دەیتوانی تاریف و ستایشی ڕاستگۆیانە، لە تانەو تەشەری پەنهان و ناڕاستەوخۆ جیابکاتەوە؟ کەسێکە پەست و غەمگین، لوت بەرز و لەخۆبایی، کە ڕێدەکات ناز بەسەر ئەرزدا دەکات. لەتۆ وایە تەنیا بیر لەوە دەکاتەوە، کە هەرچی زووترە، کۆڕ و ئاهەنگ و قەرەباڵغییەکە بەجێ بێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ ژوورە چکۆلە کەم ڕوناکیەکەی خۆی، ئەو ژوورەی کە یەکپارچە بۆنە جگەرە بوو، پڕ بوو لە کتێب و دەفتەر و کاغەزان، دەیەوێ، بەتەنیا، گۆشەگیر و دوورە پەرێز، لەوێ بێ! کەچی وێڕای ئەمەش دووبارە بۆ ئەم جۆرە ئاهەنگانە دێتەوە.

مەدام پانایف، لە شوێنێکی دیکەدا دەنووسێت:

"دوستۆیفسکی زۆرجار شەوان دێتە ماڵی ئێمە. پەستی و پەشۆکاوی وشپرزەییەکەی ڕەویوەتەوە. تەنانەت هەندێجار سوعبەت و گاڵتەش دەکات. گەنگەشە لەگەڵ هەموو ئامادەبوواندا دەکات، سەرسەختانە بەرپەرچیان دەداتەوە."

ئیدی پەرچە کرداری هەر کەسێکی شەرمن، ئەمەیە کە لەترسی ئەمەی هێرشی نەکرێتە سەر، ئەو هێرش دەکات. بۆ ئەوەی گاڵتەی پێنەکرێت، لاف و گەزاف لێدەدات و خۆهەڵدەکێشێت و تەسەور دەکات کەسێکی بەڕێز و خۆشەویستە، بەڵام لەڕاستیدا، تەحەمول ناکرێت. وا وێنا دەکات کەسێکی بێوەی و بەزەوق و سەلیقەیە، بەڵام لەڕاستیدا، کەسێکی شەڕانی و کەودەنە. وا دەزانێت لەوپەڕی شکۆ و جەلالی ئوروستۆکراتیانەدایە بەڵام هەموو کەسێک گوێی لە جیڕە جیڕی قۆندەر قورسە دێهاتیەکانیەتی. هاورێیانی بچووک، وەکو پورە مێش و مەگەزان لەم چەشە خۆراییە دەوڕکێن و پەیتا پەیتا، وردە نێشی لێدەگرن، گاڵتەی پێدەکەن، پێی ڕادەبوێرن، سەردەکەنە سەری. کە تورگینیف لەم مەیدانەدا مامۆستا بوو. بە ئانقەست گەنگەشەی دەگەڵ دوستۆیفسکیدا دەکرد، تەنیا بۆ ئەوەی تووڕەی بکات." (پروانە بیرەوەریەکانی مەدام پانایف.) دۆستۆیفسکی بەلەنگاز، تووڕە دەبوو، شتەکەی بەجدی وەردەگرت، توند ڕەوانە وەڵامی دەدایەوە، لە سنووری ماقووڵ دەردەچوو و هەموو ئەوانەی دەوروبەری دەکەوتنە پێکەنین. لەو سەرو بەندەدا، ڕابواردن و گاڵتە کردن و غەیبەتکردن و لە پاشملەگوێی و پیلانگێڕی لە دنیای ئەدەبدا، باو بوو. دۆستویفسکی ئەو هاماج و کەش و هەوا بۆگەنەی زۆر لەبەر گران بوو، دڵی پێی تەنگ دەبوو. بۆ نموونە، بە کینایە پێیان دەگوت: "من نامەوێ ئەو قسانە دووبارە بکەمەوە کە لەپاشملەی تۆ دەیڵێن، ئیدی بەخۆت دەزانی فڵانکەس چی دەربارەی تۆ دەڵێت. ئەرێ بەڕاست خۆت لە فڵانە ژن بپارێزە." ئیدی زۆر قسەی دیکەی لەو بابەتە دەکران. بە کورتیەکەی هەمووان بەغیلییان پێدەبرد! تەنانەت (بیلینسکی)ش وەکو جاران خۆشی نەدویست، لەبری ئەوەی باسی ڕۆمانی (هەژاران)ی دەگەڵدا بکات، خەریکی وەرەقبازی دەبوو دەگەڵ دۆست و بناژۆکانی خۆیدا. دوستویفسکی لەدڵی خۆیدا دەیگوت، چۆن کەسێکی ڕۆشنبیر و زیرەک دڵی دێت، تەنانەت دە دەقیقە وەختی خۆی بەگەمەیەکی هیچ و سەخیفی وەکو وەرەقبازییەوە بەفیڕۆ بدات... بەڕاستی هیچ شتێک خێڵی فەرمانبەرانی لە ئەهلی ئەدەب جیا نەدەکردەوە، هەموویان خەریکی هەمان گەمەو سەرگەرمی گەوجانەن.

بیلینسکی، ناڕاستەوخۆ چاودێری دەکرد، لەبن لێوانەوە و بە دەنگی نەوی بە نیکراسوفی، حەریفی وەرەقبازی خۆی دەگوت: "ئەرێ ئەوە دوستویفسکی چیەتی؟ قسەی قۆڕ دەکات، جا بەچ ئاو و تاوێک، بەچ گەرم و گوڕی و حەماسەتێکەوە!" مەدام پانایف دەڵێت: "کاتێ کە بەردەوام بە بیلینسکییان دەگوت، کە دوستویفسکی خۆی بە بلیمەت دەزانێ، شانەکانی هەڵدەتەکان و دەیگوت: "ئەمەیە نەگبەتی! دوستویفسکی بەهرەیەکی حاشا هەڵنەگری هەیە، بەڵام ئەگەر لەجیاتی ئەوەی کاربکات، لەخۆی

بگۆڕێـت و وا وێنـا بکـات بلیمەتـە، هـەرگیز پـێش ناکـەوێت. دەبـێ ئاگـای لـە کارەکانی خۆی بێ، دەبێ مشوری خۆی بخوات، ڕەنگە پێویستی بە مالیجە و چارەسـەر بێـت، چونکـە هـەر هـەموو ئەمـە زادەی ئەعسـابی مانـدوو و گـرژی ئەوە." مەدام پانایف، لەسـەری دەڕوات و دەڵێـت: "ڕۆژێـک تورگینیـف لەبـەردەم دوستویفسـکیدا گێڕایەوە کە لە گوندیدا، تووشـی کابرایـەک بـووە کـە خـۆی بـە بلیمـەت دەزانـی، ئیـدی بـە شـێوەیەکی سـەیر سەروسـیما و ڕەفتـاری ئـەو پیـاوەی بـۆ شـەرح دەکـات. دوستویفسـکی ڕەنگـی زەرد هەڵدەگـەڕێت و بەرلـەوەی تورگینیـف حیکایەتەکـەی تـەواو بکـات، هەڵدەسـتێ و کـۆڕ و مەجلیسـەکە بەجێـدێڵێت. هـەنگێ بـە ئامـادەبوانم گـوت: "ئـەرێ بـۆچی بـەم شێوەیە دوستویفسکی ئەزیەت دەدەن؟"

دوستویفسـکی لـە هۆڵـە گـەورە و ڕوونـاک و درەخشـانەکان وەدەردەکـەوێ، بـەغار بـەنێو کوچـە و کۆڵانـە چـۆڵ و بێدەنگـەکان دەکـەوێت و دەگەڕێتـەوە بـۆ ژوورەکەی خۆی، خۆی بەسـەر تەختە خەوەکەیدا دەدات تابە ئارامی نـەفرەت و تـوورەیی خـۆی کـاوێژ بکاتـەوە. بەڕاسـتی شـەرمە، ئـەو خەڵکـە لات و لـەوێرە ئەهلی کۆڕ و ساڵۆنان، گاڵتەی پێبکەن و پێی ڕابوێرن! ئەوانەی لەسـەر بنکـڕی ئەدەبیات دەژین، سووکایەتی پێبکەن. ئەگەر دارکـاری بکـەن و لێـی بـدەن، زۆر باشـترە لەوەی پاشقولی لێبگرن و نوقورچی لێبگرن و تانـەو تەشـەری لێبـدەن! ئایـا تـەنیا لـەم شـەونشـینیەدا، سـووکایەتی پێکرابـوو؟ نـەخێر. هـەر کـاتێ کـە مەدام پانایف، پێـی پێدەکـەنی، خـوێن دەزاییـە دەموچـاوی، سـوور دەبـووەوە و جارێکی دی دەیڕوانیە سیما و ڕوخسـاری کـاڵ و جـوانی ئـەم ژنـە، کـە جـوتێ چـاوی درشـتی ڕەشـی هـەبوو و بزەیـەکی تەوسـامێز بـە ڕوویـەوە دیـاربوو. لەمجۆرە کەسانە، با جـوانێکی سـەرنج ڕاکێشـی وەکـو مـەدام پانـایفش بێـت، بێزار بوو. ئەم ژنە پێویستە ئەخلاقێکی شایستەتری هـەبێت، کـێ شایسـتەی عەشقی ئەم ژنـە بـوو. خـودی ئـەو؟ بـەڵام ئاوێنـە، وێنـەی مێردێکـی هیچـی، دەموچـاو خـاکی و قـژ کـاڵی نیشـاندەدا. تـا حەزکـەی ناشـرین و ناحـەز، جـا خەمین و خەمبار.

دوستویفسکی، بەهەمان وردی کەسێکی شارەزا لە کاروباری خۆی، مل بۆ نائومێدی خۆی دەدات و خۆی دەکات بە گەپجاڕی ئەم هەڵچوون و کەڵکەڵانەی خۆی. ئیدی بۆ تەواوکردنی بەدبەختی و نەگبەتی خۆی، تەنیا لە عەشق و ڤیانێکی نەگونجاو و ناهاوسەنگی کەم بوو، ئەوەش بەدەست دێنێ، ئیدی ئاشق دەبێت، دەگاتە قوڵایی بەدبەختی مرۆڤانی خۆی.

لەنامەیەکیدا بۆ براکەی دەڵێت: "بەدڵ ئاشقی مەدام پانایف بووم." هەموو شتێکی ئەم ژنە جوانە؛ ڕوخساری، ڕوحی، ژیانی، ئەمە کیژی بریانسکیی ئەکتەرە. خۆی خۆی پێگەیاندووە. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا حەزی لە پانیف کردووەو بە نهێنی شووی پێکردووە. چونکە دایکی پانایف پێی ناخۆش بووەو بەم زەماوەندە ڕازی نەبووە.

بیلینسکی، دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: "دایکی پانایف، هەڕەشەی کردووە، کە ئەگەر کوڕەکەی ئەم کیژە بخوازێت، خۆی دەکوژێت. وێڕای ئەوەش، هێشتا لە

ژیاندایە و دوور نییە کوڕەکەی و بووکەکەشی بەخاک بسپێرێت."
ئەدڤوتیاپانایف، ئەو ژنە گەنجە، قەڵەمێکی ئەفسوناوی هەیە و زۆرجار ناسکە شۆخییان تێهەڵکێش و ئاوێتەی نووسینەکانی دەکات. کەسێکی ڕوح سووک و بەزەوق و سەلیقەیە، کە ئەم سیفەتانە لە دوستویفسکیدا نین. دۆستویفسکی، لەدڵی خۆیدا دەڵێت چۆنە ئەشق و ڤیانی خۆی بۆ دەربپڕێت؟ چۆنە وەکو سوشکوف، کە ئاشقێکی دیکەی مەدام پانایف بوو، شیعری ئاشقانە بۆ ئەم ژنە بڵێت؟ نە، هەرگیز جورئەتی ئەم کارە پەیدا ناکات.
دۆستویفسکی بێزار لەخۆی و، وەڕز لە هەموو خەڵکی دنیا، لێدەپڕێت تا لە فسق و فجور و ڕابواردنی سێکسدا خۆی لەبیر بکات. پێشوەختە بیلینسکی لەم نیازەی خۆی ئاگادار دەکاتەوە. بیلینسکی ئەم ڕەفتارەی ئەو پەسەند ناکات و کۆمەڵێک ڕێنوێنی و ئامۆژگاری ئەخلاقی دەکات.
دۆستویفسکی، لەناخی خۆیدا زۆر خۆشحاڵ دەبێت بەوەی کە جۆرە نیگەرانیەکی بۆ دۆستەکە (بیلینسکی) دروستکردووە. بەهەرحاڵ، لەم قۆناخ و سەرو بەندەدا، بەڕادەیەک و بە شێوەیەک خوو دەداتە سێکس، وەکو ئەوەی لە شەڕو هێرشدا بێ. لەو بارەیەوە بۆ براکەی دەنووسێت: "ئاخ لە دەستی ئەم کلارا، و مینا و ماریایانە، چەند جوان بوون، بەقەد چاوی خۆم خۆشم دەوێن."
ئیدی وەکو مێبازێکی شاوەتڕانی، لەزەتخوازی پیشەیی ڕەفتار دەکات، بەڵام بێگومان کە دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، لە کارو کردەوەکەی خۆی ژێوان دەبووەوە. دەمی دەشۆرد بۆ ئەوەی ئەو بۆن عەترەی لێ پرەوێتەوە، کە دڵی لێی تێک هەڵدەهات.
دکتۆر یانوفسکی لەبارەیەوە دەنووسێت: "لە هەموو ئەو قسە و گفتوگۆیانەی کە لەگەڵ ئەودا هەمبوون (لەساڵی ١٨٤٦ -١٨٤٩) قەت جارێ لە جاران گوێم لێنەبوو کە مەیلێکی ئاشقانەی دەرهەق بەکەسێک هەبێ، گوێم لێنەبوو، باسی ئەوە بکات کە حەزی لە ئافرەتێک کردبێت، گوێم لێنەبوو، باسی ژنێک بکات کە خۆشی ویستبێت. باسی ئەوانەی نەدەکرد کە خۆشی دەویستن. باسی ئەوانەی دیکەشی نەدەکرد چونکە ڕقی لێیان بوو. هەموو هەینییەک دەچوو بۆماڵی پانایف. ئانانکوفی، گۆساخی دەبینی، کە دەگەڵ هەر کەسێکدا قسەی کردبا، بەدڵی ئەو قسەی دەکرد. سولوگوبی مەنگ و بە ویقاری، بەخۆ و چاویلکە یەکچاوەکەیەوە دەبینی. تورگینیفی بێزراوی دەبینی، کە وەکو نەجیمزادەو کەسێکی خانەدان خۆی دەنواند. هەموو ئەو ڕەقیبانەی خۆی، هەموو جماعەتی وەرزنامەی نیشتمان و جماعەتە خۆییەکانی دەبینی. کەچی هێشتا هەر عەزابی دەکێشا، تووڕە دەبوو، قسەی نابەجای ئەوتۆی دەکرد، کە لەهەموو هۆڵەکاندا دەگێڕادرایەوە و دەبوو بە وێردی سەر زاران.."
ڕۆژێک، مەدام پانایف، دۆستویفسکی دەبینێ کە بە هەڵەداوان لە نووسینگەکەی نیکراسۆفەوە دێتە دەرێ لەو بارەیەوە دەڵێت: "ڕەنگی مردووی

لـێ نیشــتبوو. بـەجۆرێ شــپرزە بــوو بــوو، نەیـدەتوانی قـۆڵی پاڵتۆکـەی، کـە خزمەکارەکەی بۆی ڕاگرتبـوو، بدۆزێتـەوە تـا قـۆڵی تـێ هەڵکێشـێت و لەبـەری بکات. ئەنجام پاڵتۆکەی لەدەستی خزمەتکارەکـەی ڕاپســکاند و بـەغار بەســەر پلیکانەکان کەوت. کە چوومە نووسینگە و ئۆفیسـەکەی نیکراسـۆفەوە، سـەیرم کـرد زۆر پەشــێو و پەرێشــانە. نیکراســوف بــە دەنگێکــی پــڕ لــە هــەڵچوون و لەرزۆکەوە پێی گوتم: دۆستویفسکی بەتەواوەتی شێت بووە! نـازانم کـێ ئـەم بوختانەی بۆ من کردووە، ئەم چیرۆکەی هەڵبەسـتووە کـە گوایـە مـن شـیعری داشـۆرینم پێیدا گوتووە و بۆ هەموو کەسێکی دەخوێنمەوە" لەڕاستیدا ئەمە نـە بوختـان بـوو، نـە چیرۆکـی هەڵبەسـتراو. (بافلوفســکی)ش دەیگێڕێتـەوە، کـە شــەوێک دەگــەڵ ئۆگــاریف، بیلینســکی و هیــرزین دا لــە مــاڵی تورگینیــف کۆدەبنەوە تا وەرەقبـازی بکـەن، کـە یـەکێکیان نوکتەیـەکی خـۆش دەگێڕێتـەوە، هــەموو ئامــادەبوان، لــە قاقــای پێکــەنین دەدەن، ڕێــک لــەم ســاتەدا دەرگــا دەکرێتەوە و دۆستۆیفسـکی لـە ئاسـتانەی دەرگاکـەوە، سـەر دەکێشـێت. کـە ئامــادەبوان بــە حــاڵی پێکەنینــەوە دەبینــێ، ڕەنگــی هەڵــدەبزرکێ و بەلــەز دەگەڕێتەوە."

دوای سەعاتێک، تورگینیف، دوستویفسکی لە حەوشەدا دەبینێ، کە شپرزە، گرژ و مۆن، نیگەران، پەشێو و پەرێشان، وێرای سەرمای بە ترەف و با، بەسەری کۆت، بە حەوشەکەدا دێت و دەچێت. لێی دەپرسێت: "دوستویفسکی، خێرە، چیتە؟" دوستویفسکی وەڵامی دەداتەوە: "بەڕاستی ئەمە وەزع نییە من تیایام. ڕوو دەکەمە هەر کوێیەک گاڵتەم پێدەکەن . ئێوە هەرکە چاوتان بەمن کەوت، دەستتان بە پێکەنین کرد. بۆچی نازانم...

لە هەموو شوێنێک پێی پێدەکەنن و گاڵتەی پێدەکەن، هەرچی سەردێنێ و دەبات، هۆی ئەم پێکەنین و گاڵتە بازاڕەی خەڵک نازانێت. باشە توانا و بەهرە، بەس نییە، کە ڕێز و حورمەت بسەپێنێ؟ خۆزگە، ڕۆمانی هەژاران زوو چاپ دەبوو، تا مەدح و ستایشی ڕۆژنامان، قوڕی بدایە بە دەمی ئەم چۆلەکە چەنەباز و موزیڕانەدا. بەڵام بڵاوبوونەوەی ڕۆمانەکە دواکەوت، ماوەیەکی زۆرە لە سانسۆرەو هیچ وەڵامێکیان دیار نییە.

دوستویفسکی بۆ براکەی دەنووسێت: "بەڕاستی نەگبەتیە، سانسۆر گـوێی خۆی لێخەواندووە وهیچ قسەیەک ناکات... ڕۆمانەکە، زەرەری بـۆ کـەس نییـە، کــەچی ئــەوان، بــە ئانقەســت دەســتی دەســتی پێدەکــەن، لــەم ژوورەوە هەواڵـەی ئـەو ژووری دەکـەن، ئیـدی نـازانم ئـەم بەزمـە کـەی تـەواو دەبـێ و چارەنووسی ڕۆمانەکەم بەکوێ دەگات."

## فەسڵی نۆیەم
## ژنی خاوەنماڵ

ڕۆمانی (هەژاران) لە ١٥/ك٢/١٨٤٦دا، لە گۆڤارە ساڵانەکەی نیکراسوف و هەروەها لە روکوی سان پترسبورگدا بڵاو دەبێتەوە و بیلینسکی خێرا لە بڵاوکراوەی (وەرزنامەی نیشتماندا) لێکۆڵینەوەیەکی پڕ ستایشی دەربارە بڵاو دەکاتەوەو دەڵێت: "کار لە ڕوحی خوێنەر دەکات، دەی هێنێتە پێکەنین، و بەدەم گریاندنیەوە، بزەی دەخاتە سەر لێوان، ئەمە توانایە، بەهرەیەکی دەگمەنە!".. بەڵام هاوڕیکانی تری، لە مەیدانی بەرینی ڕۆژنامەوانیدا، هەمان ڕێبازی ئەویان نەگرتە بەر.

دوستویفسکی، بۆ میشێلی برای دەنووسێت: "ڕۆمانی هەژاران لە پازدەی ئەم مانگەدا بڵاوبووەوە. خۆزگە دەتزانی بە چ دەمڕێژێکی جنێوی شێتانەوە، لە هەموو شوێنێک پێشوازی کرا... لە بڵاوکراوەی ئیلوستراسیوندا، ڕەخنەیەکی دەربارە نووسراوە، خوێندمەوە، فڕی بە ڕەخنەوە نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێک نەفرەت و جنێوی بازاڕی بوو. لە گۆڤاری "مێش هەنگی باکوور"دا مەگەر خوا بزانێ، چ فەزیحەتێکیان پێکردووم. بەڵام من سەرەتاکانی گۆگۆڵ وەبیر خۆ دێنمەوە و هەموو دەزانین کە چ پێشوازییەک لە پوشکین کرا. ئیدی ئەوەیە جەماوەر.. "سێ چارەکی خوێنەران، لە قوڕ و قوڕاوم هەڵدەکێشن، بەڵام چارەکەکەی دی (ڕەنگە کەمتریش لە چارەک بن) زۆر بەگەرمی دەستخۆشیم لێدەکەن. مشت و مڕ و گەنگەشەیەکی ترسناک، لەسەر ڕۆمانەکە دەستی پێکردووە. ئیدی جنێو بە من دەدەن، سووکایەتیم پێدەکەن، بەڵام وێڕای ئەوەش کتێبەکەم دەخوێننەوە... ئیدی من ئێسقانێکم بۆ فڕێ داون، با بەکەیفی دڵی خۆیان بیلێسنەوەو بیکڕێننەوە. ئەم گێلە پیاوانە، بەخۆ بزانن یان نا، کار بۆ بڵاوکردنەوەی ناو و ناوبانگی من دەکەن... هەڵبەتە لەپاڵ

ئەمانەشدا، هەندێجار، مەدح و ستایشی ڕاستگۆیانەشم بەرگوێ دەکەون. برای ئازیز تەسەور بکە، کە هەموو دۆستانی خۆمان، بە (بیلینسکی)شەوە ستایشم دەکەن. بیلینسکی دەڵێت کە گوگولم زۆر تێپەڕاندووە. ئەمانە (بیلینسکی و ئەوانی دی)، شتێکی تایبەتی لەمندا دەبینن، ئەوان پێیان وایە ڕێباز و میتۆدی شیکاری بەکار دەبەم نەک ڕێبازی لێکدان، واتە من بەرەو قوڵایی دەڕۆم و هەموو ڕەگەزە وردەکان دەخەمە بەر وردەبینی شیکردنەوە و لەو ڕێگایەوە تێکڕای چیرۆکەکە وەکو یەکەیەکی یەکپارچە کەشف دەکەم، یانی لە بەشەوە بۆ گشت دەڕۆم، بەڵام گۆگۆل، لە گشتەوە دەست پێدەکات، هەڵبەتە گشت وەکو چۆن هەیە، وەکو چۆن ئەو دەیبینێ. ئیدی بەم پێودانگە، ئەو کەمتر قوڵ دەبێتەوە. قووڵی کارەکانی لە قووڵی کارەکەی من کەمترە."...

به کورتیەکەی. دوستویفسکی دڵی خۆش دەبێت، ورەی بەرز دەبێتەوە، ڕەخنەی لێدەگرن، ستایشی دەکەن. بیری مژوول کردوون. ڕۆمانەکە، دۆستان و ناحەزانی ڕاستەقینەی ئەو لێکدی هەڵداوێرێت. دوو ئۆردوو بەرانبەر بەیەکدی دەوەستن ئیدی شەڕ کەوتووەتە پێدەشت و ئیمکانی هیچ پەنهانکارییەک لە ئارادا نەماوە، کەو ئەو کەوەیە لەبەرانبەر کەو بخوێنێ، کە شەڕێکی جوان و دڵگیرە!...

دوستویفسکی،بێ ئەوەی چاوەڕوانی بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی (هەژاران) بکات، دەستی بە نووسینی ڕۆمانی دووەم کرد بە ناونیشانی (هەڤشێوە). ئەو نامانەی کە بۆ برایەکەی دەنێرێت، پڕن لە ئاماژەو هێما بۆ ئەم شاکارە تازەیەی خۆی. (ئیاکوف پیتروفیچ گولیادکین) قارەمانی ئەم ڕۆمانە بەخۆی دان بەوەدا دەنێت کە پیاوێکی سپڵەی، خوێری بودەڵە و ئیش نەکەرە. پیاو نازانێت چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەو بیانووەی کە ئامادەگی بۆ کار کردن و پێشکەوتن تیا نییە، نایەوێت لەجێی خۆی ببزوێت... ڕازی نییە کارەکەی پێش مانگی تشرینی دووەم تەواو بکات" (ڕوانە نامەی ١٨٤٥/١٠/٨). ڕۆمانی گولیادکین، کەوتووەتە سەرسکە، زۆر بەباشی دەڕوات، ئەمە دەبێت بە شاکاری من (ڕوانە نامەی ١٨٤٥/١١/١٦).

"گولیادکین" دە هێندەی (هەژاران) باشترە. لایەنگرانی ئیمە دەڵێن، لە ڕووسیادا، لە دوای ڕۆمانی (گیانە مردووەکان)ەوە ئیدی ڕۆمانی وا نەنووسراوە. بەڕاستی داهێنانێکی گەورەیە و بلیمەتی پێوە دیارە، نازانم چی دیکەش دەڵێن؟...! (ڕوانە نامەی ١٨٤٦/٢/١) هەر بەڕاستیش، ئەو چەند فەسڵەی ڕۆمانی (هەڤشێوە) کە دۆستویفسکی بۆ دۆست و برادەرەکانی خۆیی خوێندبوونەوە، کارێکی گەورەی لێکردبوون.

گریگوروفیچ، دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: "بیلینسکی، لەبەرانبەر دوستویفسکی دانیشتبوو، بەوپەڕی دیقەت، گوێی لە هەر وشەیەک دەگرت کە لەزاری ئەوەوە دەردەچوو و لە ئاسمان ڕا دەیقۆزتەوە. هەندێجار خۆی پێنەدەگیراو، بەدەم گویگرتنەوە دڵبەندی و ستایشی خۆی دەردەبڕی و زوو زوو دەیگوت و دیگوتەوە، تەنیا دوستویفسکی، دەتوانێ بەم وردیە، نهێنگەکانی دەروونی بەشەر، کەشف بکات."

دوستویفسکی لەساڵی ١٨٧٧دا، وێڕای ئیعترافکردنی بە خاڵە لاوازەکانی ڕۆمانەکەی، دەنووسێت و دەڵێت: "بیرۆکەی ڕۆمانەکە، تا ڕادەیەک جوانە. من هەرگیز لە ژیانی نووسەراتی خۆمدا، چەمک و بابەتی لەمانە سەختترو دژوارترم نەخستووەتە ڕوو. کورتە و پوختەی چیرۆکەکە ئەمەیە: "گولیادکین، فەرمانبەرێکی گێلۆکە و داماوە، لاواز و موحتاجە، شەرمن و بێ ڕووە، ڕەنگ و ڕوو سیسەڵە و چرچەڵە، هێندە نەبووە، شەرمی بەخۆ دێ. ئەم قارەمانە لە ڕۆژێکی خۆشی هەتاودا هەڤشێوەکەی خۆی دەبینێ. لەوە بەدواوە ئەم هەڤشێوەیە، شەوان دەچێتە دیدەنی گولیادکین و جەنابی گولیادکین تەعاروفی دەگەڵ دەکات. ئەم میوانە شەوانەیە، خودی خۆیەتی، جەنابی گولیادکین خۆیەتی، گولیادکینێکی دیکەیە، لە ڕووی خولق و خووەوە، بەموو دەگەڵ گولیادکینی یەکەمدا، جیاواز نییە، کوت و مت هاوشێوەی ئەمە. بەڵام چەند گولیادکینی ڕاستەقینە، ساویلکە و دڵپاک و گەوج و ئابڕوومەند و نەجیبە، هاوشێوەکەی، ئەوەندە، شەیتان و هەڵپەرست، لاسارو بەفێڵ و دەهۆ و ماستاوچی و موزیر و مەردم ئازارە. ئەم بوونەوەر و گووراوە. بەد سروشتە، زوو بەزوو ناسنامەی گولیادکینی ڕاستەقینە داگیر دەکات و ڕێک دەچیتە کڵێشەی ئەوەوە، ئەو دەسڕێتەوە و دەیکات بە سێبەرێکی ترسناک، لەبەرچاوی سەرانی خۆیی دەخات و ئەو ڕێزەی جارانیان بۆی نامێنی، جا لەبەرئەوەی ناکرێت دوو گولیادکین، پێکەوە و لە هەمان کاتدا، هەبن، بۆیە گولیادکینە بەهێزەکە، گولیادکینە لاوازەکە دەکوژێت. گولیادکینە شەڕانیەکە، گولیادکینە باشەکە دەکوژێت و ئیدی شتەکان ئاوەڕۆ و نەزم و تەرتیبیکی دیکە وەردەگرن.

دوستویفسکی ئەم چیرۆکە دریژەی ناو ناوە قەسیدە. لەڕاستیدا ئەمە یەکێکە لە ئیعترافنامەکانی ئەو کە لەپشت پەردەی شێوازی حیکایەتەکانی هوفمانی نووسەرو ئاوازدانەری ئەڵمانیەوە، کە ساتیری ئاوێتەی خەیاڵی نائاسایی و میتافیزیکی دەکرد، شاردبووەوە و، هاوچەرخەکانی نەیانتوانی پەی بەمە ببەن.

وگولیادکین، غەوارەو میوانی ناوەختی هەمیشەیی، بێگانەی هەمیشەیی و ڕەزا قورس و بێزاراوە. دەڵێت: "من بە تەنیام و ئەوان زۆرن" ئەم پیاوە داماو و بەلەنگازە، خۆی بە هۆڵی "ئاندرێ فیلیپوفیچ"دا دەکات، کە هەموو ئەوانەی لەوێندەرن، ناحەز و نەیاری ئەون. واهەست دەکات، هەموو ئەوانەی کە لە هۆڵەکەدان، بەچاوی تەوس و توانجەوە تەمەشای ئەو دەکەن. دەیەوێت هەر چۆنێ بووە، خۆی بگرێت و خۆی دەگەڵ ئەو واقیعەدا بگونجێنێ. بەڵام دەپەشۆکێ و شپرزە دەبێت، دەیەوێت کۆرەکە بەجێ بێڵێت، بەڵام هەرچی دەکات دڵی ڕێ داناگرێت. ئایا ئەم کاراکتەرە خودی دوستویفسکی نییە؟ کە لەنێو ئاپۆڕایەکی ئەهلی ئەدەبدا، لە هۆتێلدا گیرۆدە بووە و حەپەساوە؟

کاتێ کە گولیادکین، ئەوپەڕی سووکایەتی پێدەکرێت لە هۆڵە ڕوناک و پرشنگدارەکە وەدەر دەکەوێت، تا بە درێژایی کەناری ڕوبارەکەدا هەڵێت تا "خۆی لە دەست ناحەز و دژمنەکانی ڕزگار بکات، خۆی لە تەوس و توانجیان،

کـە وەکــو تــەرزەی بوهــار، بەســەریا دەبارێــت. دەربــاز بکــات." ئایــا ئەمــە دوسـتویفسـکیمان وەبیر نایەنێتەوە؟ ئایا ئەمە خودی دوسـتویفسـکی نییـە، کـە لـە شـەوێکی مـانگی نوقەمبـەردا، لـەو شـەوە تـەڕو تـووش و بەترەفـەدا، لـەو شەوە بەتەمتومان و بەفر و بارانەدا، بەکورتییەکەی لـە شـەوێکی زۆر تووشـی ســان پتروســبۆرگدا،دەگەڕێتەوە؟ بــەڵێ ئــەم گەڕانەوەیــەی گولیــادکین، گەڕانەوەی خودی نووسـەرە. ئەو گولیادکینـەی کـە خـۆی لـە جـەلال و شـکۆی کـۆڕ و ئاهـەنگی سـەما دەدزێتـەوەو پـەنا بـۆ ژووره تاریکەکـەی خـۆی دەبـات. خـودی دوسـتویفسـکییە. دیـارە ترسـان و پەشـۆکانی گولیـادکین لەهەنبـەر کیژێکی گەنجی وەکو کلارا ئەلسوڤیقنا، ترس و پەشۆکانی دەروونـی نووسـەر لەهەنبەر ژنانی وەکو سیناڤنا یـان مـەدام پانـایف وەبیردێنێتـەوە. لـە شـوێنێکدا دەنووسێت: "ئاغای گولیادکین، ڕەنـگ زەرد و لێوبـەبار، تـەواو گێژبـوو بـوو. لـەوە دەچوو لەناکاوا شـەکەتی بەسـەریا زاڵ بووبێ و بە زەحمەت دەیتوانی لە جێـی خۆی بجووڵێت."
ئەمـە گولیادکینێـک، ئـەدی گولیادکینەکـەی دیکـە، دوسـتویفسـکی گوتـەنی گولیـــادکینە داگیرکەرەکــە، قـــەڵب و ســـاختەکە، کێیـــە؟ ئـــەویش هـــەر دوستویفســـکییە؟ ئـــەویش دوستویفســـکییە، ئەمـــەیان دوستویفســـکی ســەرکەوتووە پابەنـدی ئەتەکێتـە کۆمەڵایەتیـەکـان، لـە خـەمی دۆسـتایەتی خــەڵکانی دیکەدایــە. ئــەو دوسـتویفســکییەیە کــە دژی تەبیعــەتی خــۆی دەوەسـتێتەوە. ئیـدی دووفـاقی شـەخسـیەتی نووسـەر زەق و ئاشـکرایە. لـە سـەرێکەوە فیدۆر میخائیلوفیچی ڕاستەقینە، بچووک و خەمین و تـووڕە و تونـدە تەبیعەت، لە سـەرێکی دیکەوە فیدۆرمیخائیلوفیچی سـەرمەسـتی سـەرکەوتن و شۆرەت هەیە، کە پۆز لێدەدات، لووتی بەرز دەگرێت، خۆی دەنوێنێ، بـەخۆی دەفشــێت و بەهــەق و بــە نەهــەق، هێــرش دەکــات. فیــدۆر میخــائیلوفی ڕاستەقینە ڕقی لە هاوشێوە نەفرەت ئەنگێزەکەی خۆیەتی، دەی کورهێنێ. وا هەست دەکات، لەوەیە ئەم هاوشێوەیە بە جۆرێ بەسـەر تەبیعـەتی ئـەودا زاڵ بێت، کە شـەخسیەتی ڕاستەقینەی ئەو لە مەیـدان وەدەربنێـت و بیسـڕێتەوە. لەوە دەترسێت کە نـەبا لەبـەر خـاتری بەدەسـت هێنـانی ناوبانـگ و شـۆرەتی ئاســان و نەرمــە قــووت، بــەجۆرێ بکەوێتــە داوی تەبیعــەت و خەســڵەتی هاوشێوەکەی خۆیەوە کە تەبیعەت و خەسڵەتی ڕاستەقینەی خۆی لەدەسـت بدات. دەترسێت، مل بۆ بۆچوونی ئەو خەڵکانە بدات، کە تەبیعـەتی خۆڕسـکی ئەویان قـەبووڵ نییـە. بەکورتیەکـەی نووسـەر، لـەوە دەترسـێت کـە بـەرە بـەرە بەتێپــەڕبوونی ڕۆژگــار بەتــەواوەتی بســڕدرێتەوە. کــاتێ کــە گولیــادکینی ڕاسـتەقینە مـەحو دەبێتـەوە و دەسـڕێتەوە: "هـورا و هـاواری تیـژ و نامرۆڤـانی دژمنەکانی بەڕێی دەکەن." هەنگێ، هاوشێوە ڤێزەون و نـەفرەت ئەنگێزەکـەی بەسـەر وەزع و ڕەوشـەکەدا زاڵ دەبێت.
لەڕاستیدا، بیرۆکەی هاوشێوەو دووفاقی و کەسایەتی، بەدرێژایی ژیان لە دوستویفسکی نەبووەتەوە.یەکەم سزای تاوانبار،سەرهەڵدانی دووفاقییە لە شەخسیەتی ئەودا. هاوشێوەیەک لە تەسەوری ئەودا پەیدا دەبێت و

بەرجەستەبوونێکی مەتریالی پەیدا دەکات، هاوشێوەیەک کە هەم ئەوەو هەم ئەو نییە. هاوشێوەیەک کە کاریکاتۆرێکی دزێو و ترسناکی خودی ئەوە. ئاوێنەیەکە کە دیمەن و ڕواڵەتەکان بەشێواوی نیشاندەدات، لە ڕوخساری بەشەری ئەوا بە ئاوساوی و پڕ زیپکە و شێواو دەنوێنێ و هەرچی بەدنیهادی و کرێتی و شەڕەنگێزییەک لە ناخ و دەروونی ئەودا هەیە، دەی نوێنێتەوە.
ڕاسکولنیکوف، قارەمانی تاوان و سزا، خۆی لە سفیدریفاییلوفی، سپڵە و ڕیسوادا دەبینێتەوە: "بینیت. ئەدی من پێم نەگوتیت کە خاڵێکی هاوبەشمان لەنێواندا هەیە؟"
لە ڕۆمانی (هەرزەکار)دا ڤیرسیلوڤش وەکو گولیادکین تووشی هەمان دووفاقیەت دەبێ: "گوێبگرە، وا هەست دەکەم تووشی دووفاقی و دوالیزم بووم. یانی لە ڕووی هزرین و بیرکردنەوەوە، دەبم بە دووکەس. من دەترسم، وەک بڵێی لەناکاوا کەسێکی هاوشێوەی تۆ، لەلاتەوە پەیدا ببێ! تۆ خۆت کەسێکی فاماو ئاقڵیت، بەڵام هاوشێوەکەت گەرەکیەتی لە جیاتی تۆ و بەناوی تۆوە کاری گەوجانە بکات، بگرە هەندێجار دەیەوێت کاری قۆڕ و دزێو و نەنگین بکات.."
ستافروگین، لە ڕۆمانی (ئەهریمەنان) المهووسوون دا، لە شێوەی پیرسیتپانوفیچدا، کە کەسێکی ئاژاوەگێڕ و هاندەرە بۆ شۆڕش، دەردەکەوێت. پێی دەڵێت: "من گاڵتەم بەم کەسە دێت کە وەکو مەیمون لاساییم دەکاتەوە." ئەو کەسەی دی دوای تۆزێک وەڵامی دەداتەوە: "من کەسێکی لێبوکم، بەڵام من نامەوێ تۆش کە نیوە باشەکەی منی، ببی بە بابایەکی لێبوک."
هەڵبەتە قسەکانی ستافروگین دەربارەی ئەهریمەن، ئەم خاڵانە زیاتر ڕوون دەکاتەوە. دەڵێت: "من باوەڕم بە شەیتان (ئەهریمەن) نییە، هێشتا باوەڕم پێی نەهێناوەو دەزانم کە شەیتان منم، خۆمم لەشێوەو قاڵبی جیاوازدا، من دەبم بە دوان، من لەگەڵ خۆمدا قسە دەکەم."* (* -دوستویفسکی ئەم پەرەگرافەی لەدوا چاپی ڕۆمانەکەدا لابردووە.)
ئیڤان کارامازوف، لە خەون و وڕێنەکانی خۆیدا شەیتان دەبینێ. ئەم شەیتانە خودی ئەوە. سێبەری ئەوە. ئیڤان پێی دەڵێت: "کە جوێن بەخۆت دەدەیت، سووکایەتی بەخۆت دەکەی، جوێن بە من دەدەیت، سووکایەتی بەمن دەکەی. تۆ خودی منیت، بەڵام بەشێوە و سیمایەکی جیاواز... جیاوازی من و تۆ تەنیا ئەوەیە کە تۆ گەوجانەترین بیرو ئەتواری منت بۆ خۆت هەڵبژاردووە."
هەروەها دەڵێت: "هەر هەموو ئەو شتانەی کە من زۆر لـەمێژە لێیـان تێگـەیی بووم و وەکو ژرو زبڵ توورم دابوون، تۆ وەکو ئەوەی شتێکی تازە بـن و کەشـفت کردبن، بـۆ منـی دێنیتـەوە. نـازانم ڕوحـی مـن چـۆن توانیویـەتی بوونـەوەرێکی بەدنیهاد و بودەڵە و خوێڕی وەکو تۆ بەرهەم بێنێ؟!"
سەمیردیاکوفی، خزمەتکاری ماڵەکەش بوونەوەر و کەسێکی هاوشێوەی ئیڤان کارامازوفی گەنجە، بەڵام بە دیوە دزێو و کرێت و لێبوکانەکەیدا. لیبۆک و

هەرزەیەکەو لە ڕوحی ئیڤاندا ئاکنجی بووە. بودلێر دەڵێت: "هەر ئینسانێ بگریت، دوو کەڵکەڵە و مەیلی هاوزەمانی تێدایە، یەکێکیان بەرەو خوای ڕادەکێشێت و ئەویتریان بەرەو شەیتان."
ئەم بیرۆکەیە کە دوستویفسکی، لە سەردەمی تەمەنی پوختەیی خۆیدا، بەڕوونی و ڕەوانی، بە تێروتەسەلی ڕاڤەو شرۆڤەی کردووە، لە چیرۆکی "هاوشێوە"شدا دەری بڕیوە، بەڵام بەشێوەیەکی سەرڤە سەرڤەو لامسەرلایی بەسەریا تێپەڕیوەو نەیتوانیوە خۆی لە کاریگەریی و باندۆری گۆگۆل، ڕزگار بکات.
هەڵبەتە ڕۆمانی "هاوشێوە" نەک هەر لە ژێر کاریگەری و ئیلهام و سەرۆی چیرۆکی "لووت"ی گۆگولدا نووسراوە، بەڵکو دەشێت بگوترێ لاسایی کردنەوەیەکی زەق و تەواوی ڕۆمانەکەی گۆگۆلە. مەشق و ڕاهێنانێکی قوتابخانەییە، کە بەئاشکرا، دەستەواژە و ڕستەی دەقاو دەقی گوگولی تێدا بەدی دەکرێت.
نوڤڵێتی "لووت"ی گۆگول، بریتیە لە سەربهوردوو چیرۆکی فەرمانبەرێک کە لووتی لێی جیادەبێتەوە، بۆ خۆی و بەسەربەخۆیی تەواو دەژی. ڕۆمانەکەی دوستویفسکییش فەرمانبەرێکە، کە ڕوحی دەبێ بە دوو بەشەوەو هەر بەشەیان کەسایەتی و شەخسیەتی جیاو سەربەخۆ پەیدا دەکات، فەسڵی دووەمی چیرۆکی "لووت" بەم ڕستانە دەست پێدەکات: "کوڤالیڤی یاریدەدەری قوتابخانە ناوەندییەکە، بەیانی زوو لەخەو ڕابوو، دەنگێکی لەدەم و لێوییەوە "پڕڕ" دەرهێنا. پاشان کێشمانێکی خۆی دا، ملی قوت کردەوە، دەستوری دا، ئەو ئاوێنە چکۆلەیەی بۆ بێنن کە لەسەر مێزەکە دانرابوو. دەیویست تەمەشای ئەو زیپکەیە بکات، کە دوێنێ ئێوارە لەسەر لووتی هاتبوو."
و ڕۆمانی "هاوشێوە"ش بەمجۆرە دەست پێدەکات: "سەعات نزیکی هەشتی بەیانی بوو، کە یاکوف پتروفیچ گولیادکینی پایە بەرز لە خەوێکی دوورو درێژ ڕابوو، بەدەم باوێشک دانەوە، کێشمانێکی خۆی دا، ئەنجام چاوی کردنەوە، خۆی لە تەختە خەوەکە هەڵدایە خوارەوە، بە هەشتاو چوو بۆ لای ئەو ئاوێنە چکۆلە بازنەییەی کە لەسەر کۆمەدییەکە دانرا بوو. ئاغای گولیادکین لەدڵی خۆیدا گوتی: چ دەبوو ئەگەر زیپکەو دومەڵێکی گەورە لە دەموچاوم هاتبا"! ئیدی ئەم جۆرە کاریگەری و لێکچوونەی دەقەکەی گۆگۆل، لە سەرانسەری ڕۆمانەکەی دوستویفسکیدا بەدی دەکرێت. کارەکەی دوستویفسکی پڕە لە دەستەواژەێن وەکو: "لووتیان بوو بە لووتی یەکەوە. سەری لووتی خۆی تۆزاندەوە، لووتی بەو شوێنەدا کرد، سەری لووتی دەرخست... هتد."
دوستویفسکی، کاتێ کە ڕۆمانەکەی بۆ چاپی تازە ئامادە دەکرد، هەوڵێکی زۆری دا، شوێنەواری ئەم کاریگەری و لاسایی کردنەوەیە بسڕێتەوە. بۆیە ناچار بوو بەشێکی زۆر لە کتێبەکەی خۆی، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کە باسی لووتیان تیا بوو، لا ببات. ئیدی ئەمە بۆ خۆی قەتڵ و عامێکی گەورە بوو،

هەرچەندە ئەم قەتڵ و عامەش بەس نەبوو بۆ ڕزگار کردنی ڕۆمانی هاوشێوە لە لاسایی کردنەوە. بەڵام بەو حاڵەشەوە، هێشتا هەر وەکو ڕۆمانێکی تازەی بارگاوی بە بیرۆکەیەکی تازەو بلیمەتانە دێتە ژماردن. لەسەرانسەر ڕۆمانی "هاوشێوە"دا کاراکتەرانی وەکو ئەوانەی گۆگۆل بەدی دەکرێن، نیشانەکان دیارن، سێبەری مجێز و تەوس و توانجەکانی گۆگۆل، زۆر زەق و ئاشکران. دۆستویفکی بەخۆیشی لەگەڵ دەرکەوتنی شەخسیەتی گولیادکیندا ، دان بەم هەڵەیەی خۆیدا دەنێت.

لە ١٨٤٦/٤/١دا، لە نامەیەکیا بۆ میشیلی برای، دەڵێت: "ئەوەی پەست و بێزارم دەکات، برادەرانی ئێمە، لەسەرووی هەموویانەوە بیلینسکی، بەهۆی گولیادکینەوە لە من ناڕازین. سەرەتا هەموو بێچەند و چوون کەوتنە ستایش و ئافەرین، بەڵام پاشان، فسکە فسک و چپە چپ دەستی پێکرد، پاشان بوو بە زنجیرەیەک شەرە قەڵەم. دووەم پەرچە کرداریان بوو بە ئیراد و ڕەخنە. لە ڕاستیدا هەر هەموویان، واتە چ برادەرانی خۆمان و چ جەماوەری خوێنەر، لەمەدا هاودەنگ و هاوڕەئین کە گولیادکین، قارەمانێکی زۆر بێسەروبەرە، خوێنەر زوو لێی بێزار دەبێت، من شتی وام لێبارکردووە و داوە بەملیا، باری چیرۆکەکەم بەجۆرێ قورس کردووە کە ناخوێنرێتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ، من بەش بەحاڵی خۆم، حاڵی حازر هیچ وەڵامێکم پێ نییە و، لە سۆنگەی ئەوەوە زۆریش خەفەتبار و بێتاقەتم. کیماسی و هەڵەیەکی گەورە لەمندا هەیە، ئەویش غروور و لووتبەرزی لەڕادەبەدەرە. کە بیر لەوە دەکەمەوە کە خەڵکەکەم فریو داوەو ئەو کارەم، کە دەشیا کارێکی زۆر گەورە بوایە، ڕوحم ئازارم دەدات. ئەمە لەباری ئەدەبییەوە، دەمکوژێت. من گولیادکینم خۆش ناوێ گەلێک لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی بێمانان. هەر هەموو ئەمانە ژیانیان لێکردووم بە دۆزەخ و لە خەم و پەژارە و نائومێدیدا نەخۆش کەوتووم." ئەوەی ڕاستی بێ ئەو ئیراد و ڕەخنەیەی لەم کتێبە گیراون، زۆر توندە. ئاکساکوف، نووسیویەتی: "نازانم چۆن ڕێگای بڵاوبوونەوەی ئەم ڕۆمانە دراوە. هەموو خەڵکی ڕووسیا گۆگۆل دەناسن و بەرهەمەکانیان ئەزبەرە. کەچی جەنابی دۆستویفسکی هەمان دەستەواژە و ڕستەکانی گۆگۆل، بەناوی خۆیەوە دووبارە دەکاتەوە. هاتووە هەندێ پارچەی لە جلە نایابەکەی هونەرمەندێک دزیوەو، داونیەتێ دەم یەکەوە و بۆ خۆی جلێکی جوانی لێدروست کردووە و بە کەماڵی بێ پەروایی بەم جلانەوە، خۆی بە جەماوەری خەڵک نیشاندەدات.

بیلینسکی، کەوتووەتە گومان و دوو دڵییەوە. وازی لە ستایش و پەسەنددانی کتێبەکە هێناوە، خۆی دەدزێتەوە؛ دەنوسێت: "وادیارە، نووسەری ڕۆمانی "هاوشێوە" هێشتا بەسەر تەکنیک و نهێنییەکانی کارەکەدا زاڵ نییە، بێئاگایە لەو پرەنسیپ و بنەما هونەریانەی کە ڕیتم و ئاهەنگ و، هاوئاهەنگی ئیستاتیکی بە هەرکارێکی هونەری دەبەخشن و دەبێ هەر نووسەرێک ئەو شارەزاییەی هەبێت. بۆیە گەلێک لە خوێنەران، گلەیی لێدەکەن و ئیرادی لێدەگرن کە کارەکەی لاواز و بێ پێزەو نەهەقیانیش نییە."

دوستویفسکی، هەستدەکات، جەماوەرەکە لێی تۆراون، ئەو هاوسۆزییەی جارانیان بەرانبەری نەماوە. بۆیە بیر لەوە دەکاتەوە، جارێکی دی، هەرچی زووترە، ئاشتیان بکاتەوە و هاوسۆزییان بەدەست بێنێتەوە. بۆ ئەمەش دەبێ شتێک بنووسێت، بە نووسین ئاشتیان بکاتەوە، بەڵام چی بنووسێت؟ ئیدی چیرۆکێکی درێژ بەناونیشانی "ئاغای پروخارچین" دەنووسێت، کە بریتیە لە سەربهورد و چیرۆکی پیرەمێردێکی پیسکەی ڕەزیلی چاوچنۆک. دوای مردنی ئەم پیرەمێردە، چەندین قاڵبە زێڕ لەنێو دۆشەکەکەیدا، کە لە پوش و کا دروستی کردبوو، دەدۆزنەوە. ئیدی وەزع و ڕەوشێکی نالەبار دێتە ئاراوە. خەڵکی لە دەوری ماڵەکەی خڕ دەبنەوە، پەلاماری جەنازەکەی دەدەن "لە ناکاوا، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، جەنازەکە لەسەر قەرەوێڵەکە دەجوڵێت، سەری بە قەراخ تەختە خەوەکەدا شۆڕ دەبێتەوە، هەردوو لاقە باریک و لاواز و شینەکانی، وەکو دوو ڕەگی دارێکی وشک دەچن بە حەوادا."

دوستویفسکی بۆ براکەی دەنووسێت: "لەم چیرۆکە سادە و بێ کەڵکەدا، سانسۆر بە کەیفی خۆی تێی بەربووە و دەستکاری کردووە و گۆڕیویەتی. چیرۆکی پروخارچین لە هەندێ شوێندا، زۆر خراپ شێوێنراوە، ئەو ئاغایانە، وشەی فەرمانبەریان لابردووە و بەکاربردنی ئەو وشەیەیان قەدەغە کردووە. مەگەر هەر خوا بزانێ بۆچی ئەوەیان کردووە؟... ئەوەی لەم چیرۆکەدا زندوویەتی و ژیانی تیابووە، کوشتوویانە. ئەو بوونەوەرەی من لەم چیرۆکەدا دروستم کرد بوو، تەنیا قاوەغەکەیان هێشتووەتەوە."

بیلینسکی، کە هەمیشە پشتیوانی لەم نووسەرە، واتە دوستویفسکی دەکرد، ئەم کارە بەگەن ناکات و دەڵێت: "لەم بەرهەمەدا پزیسکی جۆرە بەهرەیەک دەدرەوشێتەوە، بەڵام ئەم پزیسکانە لە زوڵمەت و تاریکی یەکی ئەوتۆدان کە ناتوانن دەوروبەری خۆیان ڕوناک بکەنەوە. ئەمە زادەی ئیلهام و سەرۆ نییە. کاری ئازادی هونەرمەندێک نییە. شتێکی دیکەیە، نازانم ناوی بنەم چی؟ دەشێت بەکارێکی دەستکرد، یا جۆرە خونوێنییەک لەقەڵەم بدرێت."

هەروەها چیرۆکی "لە نۆ نامەدا" کە بە شەوێک تەواوی دەکات و لە بڵاڤۆکی "سەردەم"دا بڵاوی دەکاتەوە، کە بریتیە لە مشت و مڕی نێوان دوو کەسی خوێڕی و بودەڵە لە ڕێگای نامەوە، بە دڵی ئەم ڕەخنەگرە نابێت.

بیلینسکی، لە نامەیەکدا بۆ تورگینیف دەڵێت: "ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو شەڕەنامەیەی نێوان ئەو دوو پیاوە بەدخواو بودەڵەیەم نەک هەر بەدڵ نەبوو، بەڵکو زۆریش پەستی کردم، زۆر بەزەحمەت توانیم تا کۆتایی بیخوێنمەوەو تەواوی بکەم. هەموو ڕەخنەگرەکانیش هەمان ڕاو بۆچوونی منیان هەیە."

دوستویفسکی بەهۆی ئەم ناکامیە یەک لە دووی یەکانەوە، خەریک بوو شێت دەبوو ئیدی بە مەبەستی خۆ دزینەوە وهاتنەوە تایم، ماوەیەکی زۆر خوو دەداتە نووسینی وتارێن کەم بایەخ و بێ ئایندە و لەو وتارانەدا ون دەبێت. ئیدی قاییل دەبێت لە گۆڤاری کۆمیکی زۆبسکان بەشداری بکات و ئاگادارییەکانی ناو گۆڤارەکە، بەبێ ناو دەنووسێت: پاشان لەو بارەیەوە دەڵێت:

"ئەم ئاگاداریانە سەرو سەدایەکیان نایەوە، دەنگدانەوەی خۆیان هەبوو. ئەمە یەکەمین ڕۆمانی زنجیرەی "لوسیان دو روبیمپری" وەبیر دێنامەوە. (لە کتێبی ئارەزووە ون بووەکانی بالزاکدا، باسی گەنجێک بەنێوی لوسیان دو روبیمپری کراوە کە ڕەمز و نموونەی شکست و ناکامیە. هەوەڵجار لەشاری ئانگومدا، بەهۆی بەهرە و تواناکانیەوە شۆرەت و ناوبانگ دەردەکات، پاشان دێت بۆ پاریس و خوو دەداتە کاری ڕۆژنامەوانی، بەڵام هەموو هەوڵ کۆششەکانی شکست دێنێت کارلوسی قەشەش کە دەیەوێ یارمەتی بدات، نەگبەتی و بەدبەختی دەیگرێت. سەرەنجام لوسیان خۆی دەخنکێنێ.)

ئیدی کرایفسکی وەشانکار، سلفەیەکی پێشوەختەی دەداتێ و هانی دەدات، بەرهەمەکانی بڵاوبکاتەوە. دوستویفسکی لەمبارەیەوە. دەنووسێت: "من بەهۆی ئەو سلفەیەی کرایفسکییەوە هەموو قەرزەکانم دەداتەوەو تاقە ئارەزووم ئەوەیە کە ئەم زستانە بەجدی کار بۆ ئەو بکەم، بەڵکو تا هاوین دێت تاقە پولێکی کەسم لەسەر نامێنێ."

ئیدی هەموو کاتێ خۆی بۆ نووسینی دوو چیرۆک تەرخان دەکات یەکێکیان بەناونیشانی "دوو ڕدێن تاشراو"و ئەویتریان بەناونیشانی "نوێنەرایەتی سیاسی هەڵوەشاوە". لە ١٨٤٦/٤/١دا لە نامەیەکدا بۆ براکەی دەڵێت: "ئەم دوو چیرۆکە، هەردووکیان دەربارەی ڕووداو بویەرێکی خەمناک و کاریگەرن، با پێشوەختە ئەوەت پێ بڵێم کە زۆر کورت و چڕن."

بەڵام لە ئوکتوبەری هەمان ساڵدا (١٨٤٦) لە نامەیەکی دیدا براکەی ئاگادار دەکاتەوە کە ئەو دوو چیرۆکە شتاقیان بڵاونابنەوە. "وازم لێیان هێناوە، چونکە ئەوەی لەم چیرۆکانەدا گوتوومن، کاوێژ کردنەوە و دووبارە کردنەوەن، ئەو شتانەن کە پێشتر گوتوومن یا نووسیومن. چونکە ئێستا خوێنەران، بیری تازەتر، ڕەسەنتر، زندووتر و ڕوونتر لەوەیان دەوێ کە من نووسیومە. ئێستا چیرۆکێکی دیکەم بەدەستەوەیەو خۆش دێتە دەستەوە. وەهای دەنووسم کە کەس نەتوانێ لەوە باشتری بنووسێت."

لە نامەیەکی دیکەدا بۆ براکەی، لە ساڵی ١٨٤٧دا دەڵێت: "بەو زوانە چیرۆکی (نیتوچکا نیزڤانوڤنا) دەخوێنیتەوە، بابەت و تیمەکەی ئیعترافێکە لە شێوەی چیرۆکی گولیادکیندا، بەڵام بە زمان و نێوەڕۆکێکی تەواو جیاواز. حاڵی حازر سەرقاڵی ڕۆمانێکی تازەم بە ناونیشانی (ژنەی ماڵ بەکرێ دەر). شتێکە لە بابەتی ڕۆمانی (هەژاران) بەڵام لە ئێستاوە دیارە کە لەو باشتر دەردەچێت. هەستدەکەم ئیلهام و سەرۆیەک لە ڕوحمەوە هەڵدەقوڵێت و ڕێنوێنی قەڵەمەکەم دەکات."

ئیدی چیرۆکی نیتوچکا، دواکەوت و لەساڵی ١٨٤٩دا بڵاوبووەوە. قارەمانی ئەم چیرۆکە کچۆڵەیەکە دەگەڵ باوەپیارەیەکی (مامی خۆی و مێردی دایکی) بەدمەستدا، کە وا تەسەور دەکات یەکێکە لە بلیمەتەکانی واری موزیک و دەگەڵ دایکێکی نەخۆشدا دەژی و گەورە دەبێت. بەکورتی لەنێو چوار دیواری ژوورێکی تەنگ و نزم دا دەژی و پەروەردە دەبێت."

دوستویفسکی لەبارەیەوە دەڵێت: "نیتوچکا، لەو تەمەنەدا کە هەموو منداڵێک، تواناو وزەی خۆیان ئاڕاستەی دەرەوە دەکەن، چاویان لە دیمەن و دیاردەکانی دەرەوەیە، ئەو هەموو هەست و تێبینییە دەرەکیەکان لە ناخی خۆیدا کۆدەکاتەوە. ئەم منداڵە بەخەون و خەیاڵ دەژی. ئەم کچۆڵەیە لەم ژینگە تەنگ و تاریک و بەتەمتومانە، هێزی مەعنەوی خۆی لەدەست دەدات. زۆر دڵبەندی مامیەتی، چونکە لە سەرێکەوە کەسێکی بەهرەدارەو لەسەرێکی دیکەوە مایەی بەزەییە. بەڵام موزیکزانە، کەسێکی دەمدەمی مجێزە. ڕۆژێک دەڵێت من "هیچ" نیم، ڕۆژێکی دی هاوار دەکات "من بلیمەتی موزیکم." لە ڕاستیدا ئاوێتەیەکە لە غروور و تەوازوع. نووسەر لەبارەیەوە دەڵێت: "حەزدەکات خۆی بە چەوساوەو مەغدوور بزانێت."
بەڵام نیتوچکا، لەدایکی پەست و بێزارە، چونکە وا وێنا دەکات کە ئەم بوونەوەرە لاواز و لەش بەبار و دەغەزارە، ڕێگە نادات کە ئەم پیاوە هونەرمەندە، خۆی بۆ هونەرەکەی تەرخان بکات.
هەڵبەتە ئەم قینە بەزەیی ئامێزە و ئەم ئەشق و خۆشەویستیە نەفرەت ئامێزە، هەمان ئەو حاڵەت و هەستەیە کە دوستویفسکی لە ڕۆژانی منداڵیەتیدا سەبارەت بە بابی خۆی هەی بووە. بۆیە لە هەر دەرفەتێکا کە بۆی هەڵدەکەوێ، بە ملی قارەمانانی چیرۆکەکانی خۆیدا، دەدات و لە زاری ئەوانەوە دەری دەبڕێت، قارەمانی ڕۆمان و چیرۆکەکانی دەکات بە پەیقدار و نوینەری دەربڕینی هەستە دەروونیەکانی خۆی و بەمجۆرە، خۆی لە گوشاری ئەم هەست و سۆزە کۆنانە ڕزگار دەکات. هەرچیەکی لەدڵدا هەیە، لە زمانی قارەمانانی چیرۆکەکانیەوە دەری دەبڕێت.
دایکی نیتوچکا، بەشێوەیەکی خەمناک و لە هەلومەرجێکی تراجیدیدا دەمرێت و، باوە پیارەکەی شێت دەبێت. ئیدی شازادەیەکی مۆزیکدۆست، کە وێنەیەکی کۆنت ڤیلیگورسکییە، کیژێ دەگرێتە ژێر باڵی خۆی. ئەم شازادەیە کچێکی چکۆلەی هەیە بەناوی (کاتیا). ئەمە شابانۆیەکە لەو گۆرە، زاڵ، پڕ داواو داواکاری، مەند و کرو کپ. هەرچی لەو ماڵەدایە، نازی دەکێشێت و وەکو گەنجینەیەکی پڕ بەها چاودێری دەکەن و نەوازشی دەکەن. کاتیا، هەوەڵجار و لەسەرەتاوە خۆشی بەچارەی ئەم میوانی ناوەختەدا نایەت و دەیبوغزێنێ. بە کچەتیوەی بێ دایک و باب ناوی دەبات، گاڵتەی پێدەکات کە جل و بەرگەکەی شڕو شەپڕێوە و ئیدی بەو جۆرە ئازاری دەدات. بەڵام پاشان وردە وردە مەیلی دەچێتە سەری و خۆشی دەوێت. ئیدی بەرەبەرە ڤیان و خۆشەویستییەکی گەرم و گوڕ دەکەوێتە نێوان ئەم دوو کیژەوە، خۆشەویستیەکەیان دەگاتە ڕادەی حەزی سێکیسی و شەهوانی، چپە چپ و فسکە فسک لەناو جێگای خەودا، نوقوڕچ گرتن، ماچ و موچ، مشت و مڕ و تووڕە بوون و شەڕ.
بەنیتوچکا دەڵێت: "من هەستم دەکرد کە تۆ ناتوانی بەبێ من بژیت. لەدڵی خۆمدا دەمگوت دەبێ تۆ ئازار بدەم. ڕاوەستە بۆم! ئەوسا لەدڵی خۆدا دەمگوت: حەز دەکەم لە هەمێزی بگرم، ماچی بکەم، هێندەی نوقوڕچ لێبگرم تا دەمرێت."

دۆستویفسکی، ئەم تەبیعەتە گەرم و گوڕە ژنانەیەی کەسێکی ڕەنجدیدەی، لە چیرۆکی (ژنەی، ماڵ بەکری دەر)شدا، کە زۆر لە پێش نیتوچکادا بڵاو بووەتەوە، بەرجەستە کردووە. لە (ژنەی، ماڵ بەکری دەر)دا زانایەگی گەنج بەنێوی ئۆردینوڤ، کە لەژێر کاریگەریی کەڵکەڵە و خەیاڵاتە ئاینیەکانی خۆیدا، لە کۆمەڵگە دوور کەوتووەتەوە، لای پیرەمێردێک کە ئیدیعای جادووگەری دەکات، ژوورێک بەکرێ دەگرێت. پیرەمێری جادووگەر ڕدێنێکی فەیلەسووفانە و نیگایەکی ئاگرینی پشکۆ ئاسای هەیە. پیرەمێرد دەگەڵ ژنێکی یەجگار جواندا دەژی و، ئوردینوف، ئاشق و شەیدای ئەم ژنە دەبێت. بەڵام ئوردینوف، کەسێکی سەودایە. نیگەران و شپرزە و پەشێوە. ئەشق و ڤیانی سەبارەت بە کاترینی جوان و ڕازئامێز، لە میانەی قسە وڕێنە ئاساکانیەوە، وەکو چۆن پرتەوی ڕوناکییەک لە درزی چڕە تەمێکەوە دەردەکەوێ، بەو ئاوایە دەردەکەوت. بەردەوام لە نێوان خەون و خەیاڵدا دەژی، کاتێ کە چاو دەکاتەوە. خۆی لە دنیایەکدا دەبینێتەوە کە سەرپاکی دژی ئەوە. بەڵام ئەگەری ئەوە هەبوو ئەو کاتەی کە بێدار بوو، لە خەون و خەیاڵدابووبێ، یا ئەوکاتەی وێنای دەکرد لە دنیای خەون و خەیاڵدایە، بێدار بووبێ، خوێنەریش وەکو ئەو و لەگەڵ ئەودا لە دنیای خەون و حەقیقەت و واقیعدا، لە هاتوچۆی بەردەوامدایە.

ئوردینوف، لە شوێنێکی نادیارەوە، دەنگی گێرانەوەی چیرۆکێکی ئەفسانەیی دێتە گوی، ئەوسا ئەو دەنگەی کە چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، بەرە بەرە نزم دەبێتەوەو بەدەم زەمزەیەکی خۆشەوە کۆتایی دێت. "بەڵام چیرۆکە ئەفسانەییەکە لە شوێنانی دیکەوە بەردەوام دەبێت و درێژە پەیدا دەکات." لەم کاتەدا، گزوگومەت دەرگا دەکرێتەوە. دوو لێوی گەرم و گوڕ دەنیشنە سەر لێوانی ئوردینوف، ئەوسا ڕیزێک ماچی بەدوودا دێت. ئەمە کاترینە، دوای ئەوە یەکسەر لەبەردەم ئیکۆنەکاندا بەچۆکا دێت و خۆی بەتاوانی کوشتن تۆمەتبار دەکات. مورین، پیرەمێرە جادووگەرەکە، هەوڵدەدات کاترین لە ئوردینوف و خۆشەویستی ئوردینوف دووربخاتەوە. جا لەمەدا حەقیقەت لەکوییە؟ درۆ لەکوێیە؟ ئەم حیکایەت و چیرۆکە بە ڕەڤین و هەڵاتنی پیرەمێرەکەو کیژە گەنجەکە کۆتایی دێت. جا ئەم چیرۆکە و ئیلهامی ئەم چیرۆکە، بێگومان لە چیرۆکی "تۆڵەی سامناک"ی گۆگۆلەوە وەرگیراوە، کە لەوێشدا، پیاوێکی جادووباز، بەشێوەیەکی نهێنی ئاشقی کاترینی کیژی خۆی دەبێت. ئیدی هەرچی دوعاو وێردی غەیبانی و فەندو فێڵ و تووک و نەفرەت و ماجووم و دەرمان هەیە بەکاری دەبات تا کچەکەی لە مێردەکەی جیابکاتەوە.

هەر هەموو ئەو دیمەنانەو تەنانەت ئەو گەرداوەش کە لە ڕوباری دنیپەردا هەڵدەکات و گۆگۆل باسی کردووە، لەم چیرۆکەی دوستۆیفسکیدا دووبارە بوونەتەوە، بەڵام لە چیرۆکەکەی کاترین و ئوردینوفدا، گەرداوەکە لە ڕوباری ڤۆلگادا ڕوو دەدات. هەڵبەتە دەبێ لێردا ئەوە بگوترێ، کە وێڕای ئەوەش، ئەم کارە، تەنیا وەرگرتن و لاسایی کردنەوەیەکی ئەدەبی ڕووت نییە.

ئوردینوف، ئەم پیاوە زانایە، کە لە هزرین و خوێندنەوەکانی خۆیدا بەجۆرێ نقوم بووە کە تەواو لە ژیانی ئاسایی دوور کەوتووەتەوەو دابڕاوەو، بەقەد

منداڵێک ئاگای لە ژیان نییە، تانەو تەشەر و نەفرەت و بێزاری و بەرخوردی زبری دۆست و برادەرەکانی، تەحەمووڵ دەکات کە لە ڕەفتاری سەیرو سەمەرەی ئەو پەست و بێزارن، ئەمە دەقاو دەق خودی دوستۆیفسکییە. ڤیان و ئەشقی قارەمانە گەنجەکەی ڕۆمانەکە سەبارەت بە کاترین، هەمان ئەشق و ڤیانی دوتۆیفسکییە دەربارەی مەدام پانایف، کە داب و نەریتە کۆمەڵایەتیەکان ڕێگەی مەدام پانایف نادەن مل بۆ ئەو ئەشق و ڤیانە بدات. دوستۆیفسکی لە شەوە سپیەکاندا دەنوسێت: "من تەمەنم بیست و حەوت ساڵە و تا ئێستا هیچ کەسێکم نەدیتووە. باوەڕم پێبکە، هەرگیز لەژیانما ژنێک نەبووە، هەرگیز، هەرگیز، دۆست و دەزگیرانێکم نەبووە. من هەموو ڕۆژێک بیر لەوە دەکەمەوە، کە ئان ئاخری ئەوساتە دێت، کە ناسیاوی و ئاشنایەتی دەگەڵ کەسێکدا پەیدا بکەم."

ئەم تەکنیکەی کە نووسەر، بۆ دەربڕینی خەون و خەیاڵەکانی خۆی بەکاری بردووە، جگە لەوە ی ڕەخنەی هاوچەرخ کە لەژێر کاریگەری و باندۆری شێوازی ریالزمی و مەسەلە و بابەتە کۆمەڵایەتی و جڤاکیەکاندا بوو، تووشی گومڕایی و تووڕە بوون بکات، هیچی تری لێنەکەوتەوە.

ئەوەتا بیلینسکی، لە تووڕەییدا خوای نامێنێ و بۆ ئانانکوف دەنووسێت: "بۆم باس کردیت کە دوستۆیفسکی ڕۆمانێکی تازەی لەژێر سەرناڤی "ژنەی، ماڵ بەکرێ دەر" بڵاو کردووەتەوە؟ ئەمە خراپترین گەوجایەتی ئەم پیاوەیە. دەگەڵ هەر کارێکی تازەیدا، پایەیەک دێتە خوارەوە. بەڕاستی ئێمە هەڵە بووین کەوامان وێنا دەکرد کە ئەم پیاوە جۆرە بلیمەتیەکی تێدایە... من کە لە پێشەنگانی ناساندنی ئەو بووم، ئەوپەڕی کەرێتیم کردووە... من لەم ڕۆژانەدا، کتێبی "ئیعترافنامە"کەی جان جاک ڕۆسۆم خوێندەوە، لە ڕێگای ئەم کتێبەوە زۆرم ڕق لێی هەستا، بەڕاستی ڤێزم لەم ئاغایە بووەوە، کە ئەویش وەکو دۆستویفسکی پێی وایە هەموو تیرەی بەشەر بەغیلی پێدەبەن و دەیانەوێ بیچەوسێننەوە."...

و ئەو ڕاپۆرەی کە بیلینسکی لە بڵاڤۆکی سەردەمدا دەربارەی چیرۆکی (ژنەی ماڵ بەکرێ دەر) بڵاوی کردەوە، زیاتر ڕەفزکردنی ئەم کارەو شکاندنی بوو. بۆ نموونە دەنووسێت: "لە سەرانسەری ئەم چیرۆکەدا، تاقە وشەیەک، یان دەستەواژەیەکی ناسک و زندوو بەدی ناکرێت. یەجگار دەستکرد و ئاڵۆزە. هیچ کەسێک لەم چیرۆکەدا بەپێی خۆی ناڕوات، بەزەبری دارعاسا ڕێ دەکەن. هەموو شتەکان دەستکرد و درۆ و ساختەیە."

هەڵبەتە دوستۆیفسکی ئەم ڕەخنە توندەی لە بەرگران دەبێت و زۆر دەڕەنجێت. هەست بە نائومێدییەکی زۆر دەکات. نامەیەک بۆ میشێلی برای دەنووسێت: "ئەمە سێیەمین ساڵی کاری نووسەرایەتی منە. لەوە دەچی لە چڕە تەم و مژێکدا بژیم، ژیانی ڕاستەقینە بە دروستی نەبینم. برام دەبێ لێرەدا بوەستم. شۆرەتێکی گوماناویان بۆ دروستکردم. نازانم ئەم دۆزەخەی کە بۆ خۆمم دروستکرد، خۆمم تێی خست تا کەی بەردەوام دەبێت؟

"هەژاری، کاری زۆری بێئاکام! کەی دەگەمە ئیسراحەت و ئاسوودەیی و ئارامی؟".

## فەسڵی دەیەم
## شکست و هەرەسهێنان

لەڕاستیدا، لەم قۆناغی بەرهەمێن بە پەلەو بێ ڕەونەقەدا، غەم و پەژارە بەسەر دۆستویفسکیدا زاڵ بوو. خیانەتی نامەردانە، زەم و زەمکاری و لەعەلەیی گوتنی دەوروبەرەکەی، ڕوحیان ئازار دەدا. کێشەی ژیان لەو ژوورەی کە بەکرێی گرتبوو و وەرگرتنی قەرز و قۆڵەو کێشەی دانەوەی و ڕاگرتنی دڵی برادەرەکانی، دەکەنە کارێک بەخۆی ئەم هەموو عەزاب و بەدبەختیە دوورو درێژانە بجەڕبێنێ کە خەڵکی هەژارو نەدار پێوەی گیرۆدەن.

یەکێک لە سیفەتەکانی بەدبەختی و بەڵای گەورە ئەوەیە کە تەنانەت ئەوانەشی کە تووشی دەبن، دڵخۆشی خۆیان دەدەنەوە. بەڵام کێشەو عەزابی ڕۆژانە، بەرە بەرە وەکو مۆرانە دەدەنە گیانی ئینسان، لەبنی دێنن، دەیفەوتێنن، بێئەوەی ئینسان بتوانێ بیربکاتەوەو بە هاوارێک خۆی لە چنگیان دەربێنێ. دیارە قەزاوەت و حوکمی گشتی زۆر سەختە، بەتایبەتی بۆ یەکێکی وەکو دوستویفسکی، لە هەر کەسێکی دی قورستر و سەختتر بوو. بەرە بەرە دۆستایەتیە ئەدەبییەکانی لەدەست دەدات، بیلینسکی، لێی دووردەکەوێتەوە، هۆی ئەم ناکۆکی و دوورکەوتنەوەیە، تا ڕادەیەک لە قەڵەمڕەو و سنووری کاری هونەری دەردەچێت.

کێشەی دۆستویفسکی، ڤیساریونە، کە لێی توورەیە، بەشێوەیەکی هیستریانە هێرشی دەکاتە سەر. بیروبۆچوونی جیاوازی لەمەڕ دۆز و مەسەلە جڤاکیەکاندا، لە گەڵیا هەیە.
ئیدی دوو ڕێباز و ڕەوشی ئەخلاقی جیاواز بەرانبەر یەکدی دەوەستنەوە و زۆر زوو ڕایدەگەیەنن، کە بیرو بۆچوونەکانیان تێکناکەنەوە و یەکدی ناگرنەوە.
بیلینسکی، لە دوا شیکردنەوەی خۆیدا ڕێبازی زانستی هەڵدەبژێرێت. پێشکەوتنی جفاکی و کەرامەتی تاک لە هزر و هزرینی ئەودا، لە خەمە هزری و ڕۆشنبیرییەکاندا، پێگەی یەکەم وەردەگرێت. کە دەبینێ سکەیەکی قیتار دروستکراوە "ڕوحی ئاسوودە دەبێت"
بەڵام دوستۆیفسکی لە "ڕۆژانە یاداشتێن نووسەرێکدا" دەنووسێت: "ئەو لەسەرەتای ئاشنابوونمانەوە لە کانگای دڵەوە خۆشیویستم و بە هەموو ئەقڵێکی خۆیەوە دەیویست، من لە قاڵبی هزر و بیرو بۆچوونەکانی خۆی بدات. من ئەوم وەکو سوسیالیستێکی دووئاتەشە ناسی. هەر لەسەرەتاوە لە هەوڵی ئەوەدا بوو نکوڵی لەبوونی خودا بکەم.. و پشت بکەمە ڕێنماییەکانی مەسیح. وای هەستدەکرد وەکو کەسێکی سوسیالیست لەسەرێتی ئەم جۆرە بیرو باوەڕە ئاینییەی من بسڕێتەوە. تاقە شتێ کە لای ئەو دەمایەوە تەنیا ڕوخسارو سیمای پرشنگداری ئینسانی خودا ئاساو، ئەخلاقی بەرزو جوانی نائاسایی سەرچاوەی پەڕجوانی ئینسانە. لێ بیلینسکی، لە هەنبەر ئەم لەمپەرە سەخت و عاسێیانەدا، وەکو چۆن ئارنست ڕینان کۆڵ نادات، ئەویش کۆڵ نادات و دەستبەردار نابێت." لە ساڵی ١٨٧١دا کە هێشتا توورەیی و نەفرەتی دوستویفسکی دانەمرکا بووەوە، نامەیەک بۆ ستراخوڤ دەنووسێت: "ئەم پیاوە لەبەردەم مندا، جنێوی بە مەسیح دا... بەڵام کاتێ کە جنێوەکەی دەدا، هەرگیز لە خۆی نەپرسی: "باشە کێی لە جێگا دابنەین؟ خۆمانی لەجێگا دابنەین؟ نەخێر هەرگیز بیری لەمە نەکردووەتەوە: زۆر لەخۆی ڕازییە. ئایا ئەم جۆرە بیرکردنەوە وهزرینە نیشانەی گەوجیەتی و خۆپەسەندی نییە؟"
لە شوێنێکی دیکەدا، دەنووسێت: "تۆ بە من دەڵێی کەسێکی بەتواناو بەهرەدارە. هەرگیز وانییە، داوەرییەکانی دەربارەی قارەمانەکانی گۆگۆل یەجگار لامسەرلایی و سەرڤە سەرڤەیە. تەنیا ئەو شتانەی گۆگۆلی بەدڵە کە نکوڵی لە شتێک دەکەن و شتێک مەحکوم دەکەن. من لێرەدا، بە درێژایی چوار دانە ساڵ لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکانی ئەوم خوێندووەتەوە. کاتێ پۆشکین دەستبەرداری ژانرە ئەدەبیە دەستکردەکانی خۆی بوو و چیرۆکانی بیلکین و زنجی نووسی ڕەخنەی لێگرت و هێرشی کردە سەری. بەشی کۆتایی کتێبی "ئۆجین ئونیگینی" پەسەند نەکردو، یەکەم کەس بوو کە دەستەواژەی (پوشکین، شاعیری ساڵۆنان)ی بەکار بردو خستە سەر زاران.
دوستویفسکی لەملاوە بۆ ئەولا دەڕوات. ئیدی هیچ بەهایەک بۆ ئەو کەسە دانانێت کە جاران پێی دەگوت "دڵێکی پاک". وای لێهات ڕقی لە هەموو ئەو شتانە بوو کە بیلینسکی حەزی لێی دەکرد، وەکو: هونەری بەسوود، دانانی

بەرنامەیەکی فەرهەنگی مرۆڤانی بۆ خزمەتی تیرەی بەشەر. هەموو ئەو شتانەی خۆشدەویست کە بیلینسکی حەزی لێنەدەکردن وەکو وێنەی خوداو هونەری ئازاد.
دوستویفسکی چیتر قەبووڵ ناکات لەلایەن کەسێکەوە، کە لە قسەکانی نەدەگەیی، هەڵبسەنگێنرێ و ڕەخنەی لێبگیرێت. ئامادە نییە لە کۆڕ و مەجلیسێکدا بەرهەمی خۆی بخوێنێتەوە، کە ئەو کابرا شێتە، بەدەم هاوار و کەف پرژاندنەوە، بە ڕویا هەڵشاخێت و سووکایەتی پێبکات.
ئیدی دوستویفسکی وای لێهات هەموو ئەوانەی کە لە دەوری ئەم ڕەخنەگرە کۆبووبوونەوە، بە دژمن بزانێ لەپێش هەموویانەوە تورگینیف، ئەم زەبەلاحە پەنجە کورتە، ئەم پیاوە خاو و سستە، ئەم پیاوە هەستیار و زمان لووسە، خۆ بەرەپێشەوەیە. بیلینسکی چاک ئەم تورگینیفەی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە و مێشکی بە بۆچوونە غەرەبگەراییەکانی خۆی، بە سوسیالیزم و بیر و باوەڕە ئەنتی خواییە بێبنج و بناوانەکانی خۆی ئاخنیوە. ئیدی ئەم هەڵوێستانەی بەڕادەیەک دوستویفسکی پەست کردبوو کە پاشان سەبارەت بە تورگینیف بنووسێت: "من بەش بەحاڵی خۆم هەرگیز ئەم پیاوەم خۆش نەویستووە."ئەوەی لە بیرچوو بوو، کە ڕۆژی پاش یەکەم دیداری دەگەڵ ئەم نووسەرەدا گوتبووی: "خەریک بوو ئاشقی ببم."
پاشان تورگینیف پشتیوانی لەو قسەیە دەکات و لەو بارەیەوە دەڵێت: "کاتێ کە هەردووکمان هێشتا گەنج بووین و لەسەرەتای ژیانی ئەدەبی خۆدا بووین، ڕقی لێم بوو، هەڵبەتە لە خوت و خۆرایی، هیچ هۆیەک بۆ ئەم ڕق و کینەیەی لەئارادا نەبوو."
وادیارە "تورگینیف"ش ئەوەی بیرچوو بوو کە قەسیدەی "سوارچاکی سیما خەمین"ی دژی ئەو نووسیبوو. ئەو تانەو تەشەرانەی لە ساڵۆن و ئەنجوومەنە ئەدەبیەکاندا لێی دابوو، ئەو تەوس و توانجانەی دەربارەی دیزاین و ڕازانەوەی بەرپەڕێن چیرۆکەکەی، خستبوونیە سەرزاری خەڵکی و هەزارو یەک کلکەتیزەی دیکەی خۆی بیر چوو بوو، کە بۆ توورە کردنی ڕەقیب و خەنیمەکەی خۆی بەکاری بردبوو.
دژایەتی نێوان تورگینیف و دوستویفسکی، دەگەڵ چاپ و بڵاوبوونەوەی چیرۆکی "هاوشێوەدا" دەستی پێکرد، دوای ماوەیەکی کەم فیدور، لە نیکراسوفیش زویر دەبێ وپەیوەندی دەگەڵدا دەپرێ. ئیدی نامەیەک بۆ براکەی دەنووسێت: "حەزدەکەم ئەوە بزانی کە من لەبەر نیکراسوف، پەیوەندیم لەگەڵ بڵاوکراوەی سەردەمدا پریوە. دیارە ئەم دڕدۆنگیەم پێناخۆشە. نیکراسوف، گلەیی ئەوەم لێدەکات کە بۆچی دوو چیرۆکم داوە بە کراییفسکی و نەمداوە بە گۆڤاری وەرزنامەی نیشتمان، بۆچی وێڕای ئەوەی پرێک پارە بەو قەرزارم بەبێ پرس وازم لێهێناوە. جا چونکە ئومێدی ئەوەی نەماوە کە بتوانم لە ماوەیەکی هەندێ کورتا، چیرۆکێکی بدەمێ، کۆمەڵێک قسەی ناخۆشی پێگوتووم. بە زبری و بێ ئەدەبی داوای قەرزەکەی

کردووەتەوە. منیش بێئەوەی بیر بکەمەوە، بەڵێنم داوە کە تا ٩/١٥ قەرزەکەی بدەمەوە.. کە حیکایەتێکی سەخیفە.
"ئێستا ئەوەیان بۆ هەڵبەستووم و دواخستووم کە تووشی نەخۆشی غروور و خۆبەزلزانی بووم. نیکراسوف، خۆی ئامادە دەکات کە بەتوندی ڕەخنەم لێبگریت. بەڵام بیلینسکی، پیاوێکی یەجگار لاوازە، بەڕادەیەک لاوازە، کە تەنانەت ئامادەیە ڕاوبۆچوونە ڕەخنەییەکانی، وەکو چۆن کراسەکەی بەئاسانی دەگۆڕێت، بەو ئاوایە و بەهەمان ئاسانی بیگۆڕێت."...
لەو سەروبەندەدا، نووسەرانی تازە هاتنە ئاراوە و دەستبەکار بوون. ئیدی دوستویفسکی ئەو گەنجە بەهرەمەند و دیارەی کاتی چاپ و بڵاوبوونەوەی هەژاران نەبوو. تا ئەوکاتە چەند کتێبێکی بڵاو کردبوونەوە کە هەندێکیان مایەی دڵبەندی و پەسندی خەڵکی بوون و هەندێکیان، مایەی نائومێدی و تۆرانی جەماوەری خەڵکی بوون. ئێستا نە نووسەرێکی تازە کارو، نە نووسەرێکی سەرکەوتوو بوو. نەکونجکاوی خەڵکی دەوروژاند و نە ڕێز و حورمەتێکی جێگیر و نەگۆڕی بەدەست دێنا، لەبەر پێبلیکانەی چاوەڕوانیدا، ئەم پێ و ئەم پێی دەکرد، کە دەی بیست ئەو خەڵکانەی دوای ئەو خەریکە پێشی دەدەنەوە و دیانەوێ بە پێبلیکانەکەدا سەرکەون، تووڕە دەبوو.. خەڵکی باسی ئەم نووسەرە تازانە دەکەن، کە ژمارەیان زۆرە و خەریکە لەو نزیک دەبنەوە. ئایا دەستبەرداری پێشەنگایەتی خۆی دەبێ؟ ئایا دێڵێت پێشی بدەنەوە؟ هەموو ئایندەی دوای بێداربوونەوە، لە هەوەڵێن دەورانی غروور و مەستی شۆرەت و نێو بانگ، بە با دەڕوات. بەڕاستی غروور کارێکی گەوجانەیە. لەنامەیەکدا بۆ میشێلی برای دەنووسێت: "کۆمەڵێک نووسەری گەنج پەیدا بوون، هەندێکیان هەڤڕەکی من دەکەن. لەنێو ئەوانەدا هیرتزن و گونجاڕوف، دیار و مایەی سەرنجن. یەکەمیان هەندێک بەرهەمی بڵاوکردووەتەوە، بەڵام دووەمیان هێشتا هیچی بڵاو نەکردووەتەوە. ڕەخنەگران، زۆریان ستایش دەکەن و لەڕادە بەدەر پێیاندا هەڵدەڵێن . بەڵام تا ئێستاش هەر من پێشەنگم و هیوادارم هەمیشە هەر وا بمێنم..."
هەڵبەتە لەبەر دڵی میشێل وشەی هەمیشە...ی بەکار بردبوو، دەنا لەڕاستیا لەناخی خۆیدا، وانەبوو. گومانی لە خۆی هەبوو. تۆ بڵێی هیچی پێ مابێ؟ لەوەیە بیلینسکی و داروەدستەکەی نەهەقیان نەبوو بێ، کە نکوڵیان لە هەر بەهرە و توانایەکی ئەو دەکرد. ڕەنگە وا باش بێ، مەیدان چۆڵ بکات و خۆی لەبەرچاو دووربخاتەوە. بەڵام نا، ئەمە کاری کردەنی نییە، ئەگەر ئەو تا ئێستا تواناى ڕاستەقینەی خۆی نەنواندووە هۆیەکەی ئەمە کە لە هەلومەرجێکی دارایی نالەباردا دەژی. هەژاری و دەستکورتی، هەلومەرجی لەبار بۆ ئیلهام و سەرۆ فەراهەم ناکات و ناڕەخسێنێ. هەمیشە بێ پارەیە و نەداری و نەبوونی خەریکە دەیکوژێت و لەنێوی دەبات. لە زۆربەی نامەکانیا، ئەم بنرۆکەیە، دووبارە دەبێتەوە: "چەند ناخۆشە، چەند ترسناکە پیاو لەپێناوی دابینکردنی بژێویدا کاری نووسین بکات! جۆری کارەکەی من دەگەڵ گوشار و ناچاریدا تێک ناکاتەوە..."

"لەوەتای لێکدی جیابووینەتەوە پری چوار هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵی تەواوم خەرج کردووە. بابی تەنیا یەک هەزار ڕۆبڵم لەکاڵا بازرگانیەکەی خۆم پێشفرۆش کردووە.
"لەکاتێکا من هەمیشە هەمان قەوان لێدەدەمەوە. تاقە یەک کوپێک شک نابەم. قەرزێکی زۆرم لەسەرە. خەریکی نووسینم و بەرەنجامی کارەکەم لێدیار نییە. ئیدی وەڕەز و بیتاقەت، بەدەم چاوەڕوانی وەزعێکی لەمە لەبارتر و باشترەوە، دەتلێمەوە.
ئەو سیستەمی قەرزی بەردەوامەی کە کرایفسکی پێشنیازی کردووە، لە لایەکەوە نیشانەی گەورەیی منە و لەلایەکی دیکەوە دەبێتە مایەی کۆیلایەتی ڕەهای ئەدەبی من. خۆ ئەگەر دۆستانی جوامێر لەم دنیایەدا فریام نەکەوتبان، ئەوا تیا دەچووم... زۆر هەژارانە دەژیم. لەوەتای لەتۆ جیابوومەتەوە تەنیا دووسەدو پەنجا ڕۆبڵم خەرج کردووە و سێسەد ڕۆبڵیش قەرزم داوەتەوە... نیکراسۆف، کارێکی زۆر خراپی دەگەڵدا کردم، کە ناچاری کردم، ئەو سەدو پەنجا ڕۆبڵە پێشەکیەی کە پێی دابووم، کاش بدەمەوە."
پارە، پارە، هەمیشە پارە. بەڵام دوستویفسکی نازانێ چۆن پارە بەدەست بێنێ، کە بەدەستی دێنێ نازانێ چۆنی بەکاربێنێ، نازانێ چۆنی هەڵگرێ و پاشەکەوتی بکات. هەمیشە پەلەیەتی. لە هەموو ژیانیا ئەم پەلە پەلەی پێوە دیارە. لەم دنیایەدا وەکو ئەوەیە لەماڵی خۆیدا نەبێت. بەردەوام لە هەوڵی گۆڕاندایە، لە هەوڵی ئەوەدایە، هەوایەک بگۆڕێت.
ئیدی ئەم گۆڕانکارییە لە ژوورەکەیەوە دەست پێدەکات. جارو، دوان و سێیان دەگوازێتەوە، بەدەم گواستنەوەو بارکردنەوە، ئەم سەرو ئەوسەری سان پترۆسبۆرگ تەی دەکات. بۆ خۆی دۆست و ئاشنای تازە پەیدا دەکات ماڵباتی "بیکیتوف"، "مایکوف"، دکتۆر "یانوفسکی" دەناسێت، دەگەڵ ئەواندا هەست بە ئاسوودەیی و ئەرخایەنی دەکات، ئەوانیش ئەمیان خۆشدەوێ، حەسوودی و بەغیلی پێ نابەن. گاڵتەی پێناکەن. لەدیوەخانە ئەدەبییەکەی ماڵباتی مایکوفدا کە دەبینێ کوران و کچانی گەنج سەما دەکەن و دەڕەقسن، ئەویش دەڕەقسێ.
بەڵام هیچ دیار نییە ئەو پۆزشنامەیەی بەرواری ١٨٤٨/٥/١٤ کە بۆ مەدام "مایکوف"ی ناردووە، بە بۆنەی چ ناکۆکی و بەدحاڵی بوونێکەوە بووە. دەنووسێت: "من وا هەستدەکەم کە دوێنێ تۆم بەتوورەیی بەجێهێشت. دەترسم بەکەسێکی بێ ئەدەب و بێ تەربێت هاتبمە بەرچاوت، بە کەسێکی بێ زەوق و کێوی و فێڵبازت لەقەڵەم دابم... تکایە لێم تێبگە: چونکە بونیادێکی سست و عەسەبیم هەیە، بۆیە بە زەحمەت وەڵامی پرسیارانی دوولۆنە(جووت مانایی)م پێدەدرێتەوە."
نەخێر، نەکۆڕێن دۆستانە و نە ئەو ئێوارە شێوە بچووک و سادانەی کە لە ئوتێلی دوفرانسدا بۆ دۆستەکانی خۆی سازی دەکرد و، نە ئەو ستایشەی کە دۆستە نزیکەکانی لێیان دەکرد، هیچیان نائومیدی ئەویان نەدەڕەواندەوە. لە عەسەبیەت و بێ پارەییدا نەخۆش دەکەوێت. دکتۆر یانوفسکی دەکەوێتە

چارە سەرکردنی. دوستویفسکی هەموو بەیانییەک سەری دەدات. زوو بەزوو دۆستایەتیەکی پتەویان دەکەوێتە نێوان. سەرەنجام لێدەبڕێن کە پێکەوە بژین و بەشەریکی مەسرەف بکەن. نەخۆشییەکەی دوستویفسکی سەیرە: کە ئێوارانی لێدێت، خەم و پەژارەیەکی سەیر دایدەگرێت و هەست بە ترسێکی پەنهان و شاراوە دەکات. لە ڕۆمانی (مزلون مهانون)دا دەڵێت: "بە ئازارترین ترس، ترسێکە کە نەتوانین دیاری بکەین. لەشتێک بترسین کە لێی تێنەگەین. ڕووداوێک کە لە زنجیرەی ڕووداوەکاندا بوونی نەبێت، بەڵام لەگین بێ لەهەر ئان و ساتێکدا ڕووبدات."

هەندێک ڕووداوان، هەندێک وردەکاری ژیانی ڕۆژانە، لە دیدی ئەودا، بە مانای ترسناک بارگاوین. وێڵ و سەرگەردان بەناو چڕە جەنگەڵی خەیاڵات و پێشبینیان دەکەوێت. وا وێنا دەکات کە تووشی سیل بووە یا شێت بووە. بۆیە خوو دەداتە خوێندنەوەی هەندێ کتێب و سەرچاوەێن پزیشکی. ئیدی لێکۆڵینەوە پزیشکی یەکانی زانای کاسە سەرناس "گال" دەربارەی کارو پێکهاتەی کاسە سەران، زۆر سەرنجی ڕادەکێشێ و ئیدی داوا لە دکتۆر دەکات بەوردی شێوە و پێکهاتەی کاسە سەری بۆ بخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی مانگی تەمووزی ساڵی ١٨٤٧دا، دکتۆر یانوفسکی، لە جادەدا تووشی فیدرو میخائیلوفیچ دەبێت. کە ڕەنگ زەرد و نیگا وێڵ، بەلارەلا ڕێدەکات و فەرمانبەرێکی سوپایی، ژێر باڵی گرتووە. تازە لە نۆرە فێیەک، کە تۆزێ لەوە پێش لێی دابوو، هەستابووەوە. یانوفسکی بەگالیسکەیەک بۆ ماڵی خۆی دەباتەوەو خوێنی لێدەگرێت. خوێنێکی خەستی ڕەشی وەکو مەرەکەب لە گیانیەوە فیچقە دەکات و دوستویفسکی هاوار دەکات: "نەجاتم بوو، نەجاتم بوو."!

جارێکی دیکە هەر ئەم یانوفسکییە، لە مەیدانێکی گشتیدا، تووشی دۆستویفسکی دەبێت کە بەکەیف و بە دەماخ، یەجگار شەنگوڵ، بە جلو بەرگی یەخەکراوە و بەسەری کۆتەوەو بەو پەڕی بێپەروایی، قۆڵ لە قۆڵی بابایەکی سوپاییدا ڕێ دەکات. دۆستویفسکی چاوی بە برادەرەکەی دەکەوێ، ئاماژە بۆ ئەو پیاوە دەکات کە یارۆی سوپایی نایناسێت و هاوار دەکات: "ئا ئەمەیە، ئەمە ئەو کەسەیە کە فریام دەکەوێ و ڕزگارم دەکات."!

دەچێت بۆ لای براکەی. بیر لەوە دەکاتەوە کە سەفەری ئیتاڵیا بکات. ئاوات بەوە دەخوازێت کە شوکێک لێی بدات کە لە ڕابردوو و لە ئێستاو لەخودی خۆیشی ڕزگاری بکات. دەڵێت: "وەکو ماسییەکی ژێر بەستەڵەک تەقەلا دەدەم." چ دەبوو گەر بکەوتبایە ژێر عەرەبانەیەکەوە؟ یا خۆی بخستبایە ئاوێکەوە و بخنکایە؟ ئایا ئەگەر تووشی ڕووداوێکی لەو بابەتە بوایە، باشتر نەبوو، لەم بێزاری و ناڕەحەتیەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر تیایدا نقوم دەبوو. بۆچی دەژی، چاوەڕوانی چی دەکات؟ مارمولادۆف، لە ڕۆمانی تاوان و سزادا دەڵێت: "دەزانن ئەمە مانای چیە؟ مانای ئەمەیە کە کەسمان نازانین بۆ کوێ دەڕۆین."

دوستویفسکی بەدەم ئەم هەستە ترسناکەوە دەتلایەوە کە هێچ بیانوویەک بۆ ژیان نییە. ئەو ڕێگایەی کە گرتوویەتیە بەر، بن بەستە و دەرناچێت. دیوارێکی ئەستوور لەبەردەم خۆیدا دەبینێ، دوای چەند هەنگاوێکی دیکە دەیگاتێ و ئیدی ناتوانێ یەک هەنگاوی دی بچێتە پێشێ.

## بەشی دووەم
## فەسڵی یەکەم
### پیلان

شەڕی سالانی ١٨١٢ -١٨١٤، سەربازانی ڕووسیای گەیاندە ناوجەگەری ئەوروپا. ئیدی ئەفسەرانی سوپای داگیرکەر زۆر زوو، لە نزیکەوە ئاشنایەتیان دەگەڵ فەرهەنگ و کەلتووری ئەوروپادا پەیدا کرد و تامەزرۆی فێربوونی بوون.

ئەو وڵاتانەی کە ماندوو و شەکەتی دەستی ستەمکاری سوپایی ناپلیون بوون، بێداربوونەوە و چاویان بە ژیانێکی جڤاکی و کۆمەڵایەتی تازە کرایەوە. ڕێکخراوانی نهێنی لە فەرەنسا، ئیتاڵیا و ئەڵمانیدا ڕووی لە زیادی کرد، وەکو ڕێکخراوی چاربونری و توگندبوند و... هتد. کە سوپای ڕووسی گەڕایەوە بۆ وڵات، بە چاولێکەری ئەو ڕێکخراوە نهێنیانەی ئەوروپا، کۆمەڵێک ڕێکخراو و کۆمەڵە دروستکران، وەکو ڕێکخراوێن (یەکێتی باکوور، یەکێتی باشوور، و یەکێتی سلاڤیان.) ئەم کۆمەڵە و ڕێکخراوانە لە سەرەتاوە ئاشکرا بوون، پاشان قەدەغە کران و بوون بە نهێنی. ئەندامانی ئەم ڕێکخراوانە بریتی بوون لە خەڵکێن خانەدان و نەجمیزادە و فەرمانبەرانی گەورەی دەوڵەتی. بەرنامەی کار و پروگرامیان بریتی بوو لە داوا کردنی هەڵوەشانەوەی کۆیلایەتی، هەڵوەشاندنەوە و لابردنی ئەشکەنجەی بەدەنی، خەبات دژی ڕژێمی کۆنە پەرست و پاشکەوتووی ئەلکساندەری یەکەم. ئەلکساندەری یەکەم دژی ئازادی کۆیلە و مسکێنەکان نەبوو، بەڵام لە ئاقیبەت و ئاکامی، دانی ئازادییەکی بەپەلەو کوت و پڕ دەترسا.

کاتێ نیکولای یەکەم هاتە سەر تەخت ، لە لایەن گروپانی ئوپوزیسیونەوە، بزوتنەوەیەکی توندی ڕاپەڕین ئاسا بەرپا بوو کە بۆ ناو سوپاش سیرایەتی کرد و ئەوە بوو ڕاپەڕینە خوێناوییەکەی ١٤/ک١/١٨٢٥ لێکەوتەوە. ئیدی گاردی تزاری توانی ڕاپەڕینەکە دابمرکێنێتەوە وبەسەر شۆڕشگێڕەکاندا،کە "دیسامبەرییەکان" یان پێدەگوترا زاڵ بێت و هەندێ لە پێشەوایانی ڕاپەڕینەکە لە سێدارە بدات و هەندێکیان ڕەهەنەی سیبریا بکات. هەرچەندە ڕاپەڕین و یاخبوونەکە سەرکوتکرا، بەڵام جم و جۆڵ و چالاکی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکە نەوەستاو نەکوژایەوە. بەهەرحاڵ تزار بەوە قایل بوو هەندێک لەو ڕیفۆرم و چاکسازیانە ئەنجام بدات کە دیسامبەرییەکان داوایان کرد بوو، بەڵام دەیویست بەخۆی ئەو ڕیفورمانە بکات. نەیدەویست چینی ئورستوکراتی شۆڕشگێڕ، دەست لە کاروباری سیاسەتی ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا وەربدەن. ئیدی یەکسەر مەسەلەی کشتوکاڵی و کێشەی جووتیاران خرایە بەرنامەی لیکۆڵینەوەوەو لە هەمان کاتدا سانسۆرێکی پۆلیسی (ئەمنی) توند خرایە سەر ڕۆشنبیران و هزرڤانان، لە گەورەیانەوە تا بچووکیان.

بەمجۆرە هەرچەندە تزاری تازە، مۆدێرنزمی ڕۆژئاوایی قەبووڵ کرد و خەمخۆری و پەرۆشی خۆی سەبارەت بە چارەنووسی موجکیان (جووتیارێن کۆیلە، مسکێن، ڕەعیەت) ڕاگەیاند، سەرباری ئەم ڕیفۆرمانەش، لەدیدی ڕۆشنبیرانەوە، هەر نوێنەری ستەمکارییەکی ڕەهاو، ڕەمزی حکومەتێکی دیکتاتۆری ڕەهای پاشکەوتووی کۆنەپەرستی، مایەی گومان بوو. "کیکین"ی دێرۆکنووس دەڵێت: "ئازادی بیرکردنەوە نەبوو، خەڵکی لەو ڕووەوە لە تەنگانەیەکی تەواودا بوون." خەڵکی لە هیچ قۆناغ و شوێنێکی دیکەدا، بەقەد ئەم قۆناغ و سەردەمە تامەزرۆ و ئارەزومەندی بیرکردنەوە نەبوون. بیریان بۆ کەسانێک و لەجیاتی کەسانێک دەکردەوە کە خۆیان بیریان نەدەکردەوە. کە ڕێگەی بیرکردنەوەیان پێنەدەدرا. ئیدی خەڵکی بە تەنیا بیریان دەکردەوە، بە

کۆمەڵ بیریان دەکردەووە، بە نهێنی، لە ژوورا، لە دیوەخانان و ساڵۆناندا، تەنانەت لە شەقام و جادە و بانانیشدا بیریان دەکردەوە، بەڵام بیرکردنەوەی ڕووتیان قەبووڵ نەدەکرد، پیاوانی کامڵ (ئەوانەی لە چڵ ساڵ بە بانەوە بوون) دژی بیرکردنەوەی غەیبانی و میتافیزیکی بوون، هەموو خەمێکیان، خەمی بەرژەوەندییە زەروری و هەنووکەییەکانی جەماوەری خەڵک بوو.
بیلینسکی، لە ساڵی ١٨٤٢ دا دەنووسێت: "ڕۆحی زەمانی ئێمە ئەوە دەنوێنێ کە گەورەترین نێروی داهێنەرانە، ئەگەر وا تەسەور بکات کە زەوی لایەقی ئەو نییە، شوێنی ئەو سەروی هەورانە. و ژان و ژار و ئاوات و ئامانجی دنیایی بەردەوام و کۆنی میللەت، نابێ ئاسۆ و چاوئەندازی خەون و خەیاڵە شاعیرانەکەی و ڕامانە نهێنی ئامێزەکانی بشێوێنێ، ناتوانێ لەچەند ساتێکی تیژتێپەڕ، پتر دەوام بکات و سەرنج ڕابکێشێ..."
هەوادارانی فەرهەنگ و کەلتووری ڕۆژئاوایی ولایەنگرانی سلاڤییەکان، هەر هەموویان لە دیدی دەسەڵاتەوە، خەڵکانی گومان لێکراو بوون. هەوادارانی ڕۆژئاوا، باوەڕیان وابوو کە ڕووسیا وڵاتێکی پاشکەوتووە و بەبێ زنجیرە ڕیفۆرمێکی ڕیشەیی قووڵی وەکو ڕیفۆرمەکانی وڵاتە گەورەکانی ئەوروپا، هەرگیز ناژێتەوە و هەڵناسێتەوە. لەم لاشەوە سلاڤییەکان، پێیان وابوو ئەو ڕژیمەی کە پترۆسی گەورە بونیاتی نابوو، لاساییکردنەوەیەکی ناشیانەی ڕژێمی ئەوروپایی بووەو کۆپیەکی خراپی سیستەمی حوکمی ئەوروپیە، بۆیە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ڕوحی هاوچەرخی موسکۆیی. ئەمانە خەونیان بەکڵێسایەکی سەربەخۆ و جیا لە دەوڵەت، بە ڕووسیایەکی بەڕاستی ڕووسەوە دەبینی کە هەموو دام و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی زادەو هەڵقوڵاوی کەلەپووری خۆماڵی خۆی بێت.
تاقە خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم دوولایەنە هەڤرکە ناڕەزایی بوو لەو دەورو دوکانەی کە هەبوو، هەڵبەتە ئەمە فاکتەرێکی زۆر گرینگە و ناکرێت حیسابی بۆ نەکرێت و بەهەند نەگیرێ. کتێبان بە نهێنی دەستاو دەستیان دەکرد. خوێندکارانی زانکۆ، بەردەوام نووسینەکانی (جورج ساند، فوریە و لویس بلان)یان دەخوێندەوە. (فوریە: فەیلەسوف و کۆمەڵناسی فەرەنسییە ١٧٧٢ - ١٨٣٧، لویس بلان: دیرۆکنوس و سیاسەتوانی فەرەنسیە ١٨١١ -١٨٨٢، ڕۆژنامەوانێکی داشداری بیرو بۆچوونی سوسیالیستی بوو. یەکێکە لە دامەزرێنەرانی بزوتنەوەی ١٨٣٩ فەرەنسا. ئەندامی حکومەتی کاتی بوو، کتێبیکی دەربارەی مافی کرێکاران و یەکێکی تری دەربارەی مێژووی شۆرشی فەرەنسا نووسیوە.) هەرکەسەو دەمی لە نەتەوەپەروەری وەردەداو بێ ئەوەی هیچ دەربارەی گەل و نەتەوە بزانێ. هەرکەسەو داوای کۆمەڵگەیەکی درەخشانی پڕ لە خەڵکی بەختەوەر و بەتەربێت و بە ئەدەب دەکرد. هەموو کەس پشتیوانی لە یەکسانی چینایەتی و ئابوری دەکرد. باسی ئابووری سیاسی شەقڵی ڕۆمانتیکی و شاعیرانەی وەردەگرت. شۆڕشی ناوچەیی توند و تیژی شەقڵی خوێن ڕێژی لە خۆی دەتەکێنێ. پێشکەوتنی زانستی، دەگەڵ بیروباوەڕێن دۆگماتیزمی مەزەبی ئەرتەدۆسکیدا ئاوێتە. ئیدی

مەسـەلەی ڕاپـەڕین و سـەرهەڵدان لـەنێو لاوانـی زانکۆییـدا بـرەو دەسـتێنێ و بـەجۆرە ئـەرکێکی پێویسـتی دەزانـن. گروپـی دیسـامبەرییەکان لـە خـەڵکی خانەدان و نەجیمزادە پێک هاتبوو، گروپەکانی (تەمەنی چل ساڵان) گەلێک لـە فەرمانبـەران و خوێنـدکاران و ڕۆژنامەنووسـان و نووسـەران و بازرگانـانی لـەخۆ گرتبوو. چینـی بـورژوای بچـووک خـەریک بـوو وردە وردە و بەیێـدەنگی دروسـت دەبوو و دەخەملی. ئیدی مەسـەلەکە شۆڕشێک نـەبوو کـە جـەماوەری گـەل و خەڵک بەرپای بکـەن، بـەڵکو شۆڕشـێک بـوو کـە لـەپێناوی جـەماوەری خەڵکـدا بەرپا بکرێت.

یەکێک لەم گروپە شۆڕشگێڕیانە لەلایەن پیتراشفیسکییەوە، دادەمەزرێت، کە جاران خوێندکار و ئێستا فەرمانبەری وەزارەتی دەرەوە بوو. ئەم پیتراشفیسکییە هەرچەندە فەرمانبەری دەوڵەت بوو، ڕدێنێکی ڕەشـی حەبەشیانەی دانابوو و شەپقەیەکی قەراخ پانی وەکو شەپقەی پیلانگێڕانی لەسـەر دەنا.

دوستویفسکی لە مانگی ئایاری ساڵی ١٨٤٦دا دۆستایەتی و ناسیاوی دەگەڵدا پەیدا دەکات.

دوای ساڵێک ئەوسا فیدور میخائیلوفیچ، وردە وردە لە کۆڕەکانیاندا، کە هەموو ڕۆژانی هەینی دەگیرا، پەیدا دەبێت. هەڵبەتە فیدور لە هەوەڵەوە لە بەر بێکاری و لەڕووی کونجکاوی و فزوڵیەتەوە دەچێت بۆ ئەو کۆمەڵەیە. هەڵبەتە ئەم ماڵە بچکۆلە دارینە پەنجەرە دارەی، زۆر بەلاوە جوان و دڵگیر دەبێت، کە پەیژەیەکی لەرزۆکی بۆ قاتی دووەم دەبێت و فانۆسێکی چکۆلە کە بە زەیتی کەتان ئیشـی دەکرد، بە پرتە پرتە سـەر پەیژەکەی ڕوناک دەکردەوە و ئیدی کە دەچوویتە سـەرەوە. دەبوو بە تاریکە شـەو.

ئەم ژوورە چکۆلەیە یەک تاکە قەنەفەی تیا بوو. کە پارچە جـاوێکی ئەسـتوری بەسـەردا درا بوو لەگەڵ چەند کورسییەکی کۆنـەو مێزێکـدا. تـەنیا یـەک مـۆمی گـەورە ئـەم ژوورە چکۆلەیـەی ڕونـاک دەکـردەوە. هەرچەنـدە پیتراشـفیسـکی گەنجێکی دەوڵەمەند بوو، بەڵام زۆر هەسـتیار بـوو و حـەزی نـەدەکرد زەنگینـی خۆی دەربخـات و بنـوێنێ. قەناعـەتی وابـوو کـە ناکرێـت لـە مـاڵێکی بورژوازیـدا باسـی میللەت بکرێت. هەروەها تەسـەوری ئـەوەش ناکرێـت بـە ڕۆژی ڕونـاک، یان لەبەر ڕوناکی چلچرایاندا، کار بۆ پیلانگێڕی بکرێت!

هەڵبەتە هیچ پیلان و پیلانگێڕییەک لەئارادا نەبوو. یان بەلای کەمـەوە هێشـتا بیرۆکەی لەو جۆرە لەئارادا نەبوو. دۆسـت و برادەرانی بیتراشـفیسـکی دەهـاتن بۆ ماڵەکەی تا گەنگەشـە و موناقەشـەی دوا دەنگوباس و هـەواڵێن سیاسـی و ئەدەبی بکەن. ئیدی بە کـەماڵی ئیسـراحەت لەسـەر قەنەفـە و کورسـییەکان دادەنیشـتن، دوگمـەی پاڵتۆکانیـان دەکـردەوە، چایـان دەخـواردەوەو پایپیـان دەکێشـا، پـایپی دەسـکدرێژ و سـەر بچـووک. سـالتیکوف شـدرین، کایـدانوف، برایانی مایکوف، پلشیف، میلیوتین، دوروڤ، دیبـو، سپشـنیف و زۆری دی لـەو کـۆڕ و کۆبوونەوانـە ئامـادە دەبـوون. ئاکشـاروموف، لەبیرەوەرییـەکانی خۆیـدا دەنووسێت: "ئێمە لەم ئەنجوومەنەدا، ڕێکخراوێکی جدی و کـۆک نـەبووین، لـە

کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا، بەرنامەیەکی دیاریکراومان نەبوو کە تاوتوێی بکەین، بەڵکو هەموو ڕەخنەمان لە ڕژێم دەگرت و لە بارودۆخەکە ڕازی نەبووین."
یەکێکی دیکە لە هەوادارانی پیتراشفیسکی بەنێوی کورمین، هەمان بۆچوونی سەرەوە دووپات دەکاتەوەو دەڵێت: "هەر جۆرە بێدادی و زوڵم و زۆرێک، هەر توندڕەوییەکی دەسەڵات، هەر جۆرە گوشار و زۆرێک،هەر کارێکی توند و ملهوڕانە، ڕوحی ئازار دەداین و پەستی دەکردین."
هەروەها بوگوسلوف لەو بارەیەوە دەنووسێت: "تاقە بیری هاوبەش لەنێو ئێمەدا، جۆرە پەرچەکردارێک بوو دژی وەرەقبازی و چەنەبازی نێو دیوەخان و ساڵۆنەکان." هەر هەموو ئەمانە کاری بێ ئازاربوون، بەڕواڵەت زەرەری بۆ پەزی دەسەڵات نەبوو. فیدرور میخائیلوفیچ، لە یەکەم کۆبوونەوەدا هەستی بەمە کرد. میوانەکانی بەدڵ بوو، هەموو گەنجی خوێنگەرم و لەبەردڵان بوون. کۆمەڵەکە، کتێبخانەیەکیان هەبوو پڕ بوو لە کتێبی قەدەغە و یاساغ، کە دوستویفسکی تاسەمەندی خوێندنەوەیان بوو. هەروەها هەستی دەکرد کە پێویستە پەیوەندی بەگروپ و کۆمەڵەیەکەوە بکات، تا لە تەنیایی بخەلەسێت، تا قەناعەتێکی ئەوتۆی، چ چاک و چ خراپ، لا دروست ببێ کە بە ئاسوودەیی و ئەرخایەنی بژی و درێژە بە ژیان بدات. ئیدی ناو بەناو هاتوچۆی ئەوێندەر دەکات. زۆری کەیف بەو مشت و مڕو گەنگەشە بێکۆتاییانە دەهات. هەڵبەتە هەموو دەیانگوت بارودۆخەکە سەراپا وێرانە، خراپە، دەبێ هەموو شتێک تازە بکرێتەوە، بگۆڕدرێت، نوێ بکرێتەوە. بەڵام چۆن؟
گروپەکەی پیتراشفیسکی، لەنێوان خۆیاندا لەسەر میکانیزمی جێبەجێکردنی سیستەمی سوسیالیستی فەرەنسی کۆک نەبوون. ئاکشاروموف، بۆ نموونە قاییل بوو بەوەی کە تزار لەسەر تەخت بمێنێتەوە. بەمەرجێ بەگوێرەی دەستوور، دەسەڵاتەکانی کەم بکرێنەوە. سپشینف لە هەوادارانی کاری ڕاستەوخۆ بوو. بەڵام پیتراشفیسکی، دوو دڵ بوو، قسەی لەسەر بۆچوون و تیورییەکانی فوریە دەکرد، بێئەوەی، هیچ وێناو تەسەورێکی دیاریکراوی ڕوونی دەربارەی ئایندە هەبێت. بەڵام دوستویفسکی دووڵ و بەگومان بوو، هەرچەندە ئەم پیاوە دڵسۆزانەی خۆشدەویست و بۆچوونەکانیانی بە نموونەی مرۆڤدوستی دەزانی، بەڵام قەناعەتی بەوە نەبوو بۆ بارودۆخ و هەلومەرجی ڕووسیا بەکەڵک بێن. بەلای ئەوەوە، دەبوا ڕووسەکان بۆ مێژووی تایبەتی خۆیان بگەڕێنەوەو لەوێوە میکانیزمی ڕزگاربوونی خۆیان هەڵێنجن. چوونکە پێشتر لە کۆمەڵگەی ڕووسیدا، یەکسانی مۆڵکداری وهاوبەشی کۆمەڵایەتی و زەمانەتی جڤاکی هەبووە، بۆیە بوژاندنەوە و پەرەپێدانی ئەو چەمک و دام و دەزگایانە، زۆر باشتر بوو لەوەی دوای تەسەور و بۆچوونە خەیاڵییەکانی سان سیمون و ڕێبازەکەی ئەو بکەون.(سان سیمون ١٧٦٠ -١٨٢٥: فەیلەسوفێکی کۆمەڵناسی فەرەنسی بوو بیرو بۆچوون و جیهانبینییەکانی ئەو، کاریگەرییەکی زۆریان لە بواری پەیدابوونی سوسیالیزم، یەکێتی گەلانی ئەوروپا و فەلسەفەی ئوگوست کونتدا هەبوو. موریدو شوێنکەوتووەکانی، لایەنگری ئازادی ژیان،

هەڵوەشانەوەی میرات و بەدەوڵەتی کردنی ئەوزارە گـەورەکانی بەرهـەمهێنان بوون.)
میلیکوف، دەیگێڕێتەوە کە دوستویفسکی دەیگوت: "ژیان، لە تەنیاییەکی ئیکاریوسیدا، یا لە یەکەیەکی سوسیالیستیدا، بۆ من زۆر ترسناکتر و قێزەوەرترە لە بێگاری." (ئیکاریوس: قارەمانی یەکێک لە ئەفسانە یونانیەکانە. خۆی و بابی لەلایەن مینۆسەوە دەست بەسەر دەکرێن و دەخرێنە زندانێکی ئینفرادییەوە. ژنەکەی مینوس، ڕزگاریان دەکات و پاشان بەهۆی ئەو باڵانەوە کە بەمۆم لەشانی خۆیانی دەنەن، دەفڕن. ئیکارۆس، ئامۆژگارییەکەی بابی فەرامۆش دەکات و بەڕادەیەک بە ئاسماندا بەرزدەبێتەوە، نزیکی هەتاو دەبێتەوە و بەهۆی گەرمی هەتاوەکەوە، مۆمەکانی باڵی دەتوێتەوە. باڵەکانی دەکەون و بەخۆیشی دەکەوێتە دەریاوە. ئیدی لەوکاتەوە ئەم دەریایە ناو دەنرێ دەریای ئیکارۆس (لە نزیکی دورگەی سامۆسی یونانە) مەبەست لەم ئاماژەیەی دوستویفسکی بۆ ئیکارۆس، زندانی بوونە لە ژوورێکی ئینفرادیدا وەکو ئیکارۆس.)
دەیانویست دوستویفسکی بکەن بە بابایەکی شۆڕشگێڕ، لەکاتێکا ئەو هەرگیز کەسێکی شۆڕشگێڕ نەبووە. لەوەڵامی لیژنەی لێکۆڵینەوەی دادگاییدا، دەڵێت: "هیچ شتێکم لەوە بەلاوە بێهودە ترو نابەجێتر نەبووە کە تەسەوری ئەوە بکەم کە ڕووسیا حکومەتێکی شۆڕشگێڕی هەبێت، هەموو ئەوانەش کە من دەناسن، بیرو بۆچوونی من لەو بارەیەوە دەزانن."
ئەوەی دوستویفسکی دەیویست، کودەتاو هەڵگێڕانەوەی ئەو بارو دۆخ و ڕەوشە نەبوو کە لەئارادا بوو، واتە شۆڕشی مەبەست نەبوو، بەڵکو جۆرە ڕیفۆرم و پەرەسەندنێکی واقیعی و کردەیی مەبەست بوو. خوازیاری گۆڕانی جڤاکی نەبوو، بەڵکو خوازیاری پەرەسەندنێکی ماقول و بەجێ بوو. بەئاشکرا دەیگوت: "میللەتی ڕووس، بەهەمان ڕێگا و ڕێبازی شۆڕشگێڕانی ئەوروپاییدا ناڕوات."
وشیعری (جودایی) پوشکینی بۆ هاوڕێکانی دەخوێندەوە: هاوڕێ، ئایا ئـەوەی مـن دەی بیـنم ئـازادی گەلـە، لـەکاتێکا کۆیلایـەتی بـە ئاماژەیـەکی تـزار لا دەبرێت."
بەڵێ، هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی و بەندایەتی، لابردنی سانسۆر، قەدەغەکردنی ئەشکەنجەی بەدەنی، هەر هەموو ئەمانە دەبوایە لەلایەن تزارەوە، سەرچاوە بگرێت. دۆستویفسکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "تزار، بۆ میللەت، بەرجەستە بوونی خودی میللەت، و ئایدیا و هزری میللەت، باوەڕو ئومێدی میللەتە." پەیوەندی نێوان پاشاو ڕەعیەتەکەی، پەیوەندی نێوان ئاغاو خولام و نۆکەر نییە، بەڵکو پەیوەندی نێوان باب و فرزەندە کوشتنی ئەم پەیوەندی وخۆشەویستیە، کوشتنی ڕووسیایە. بەلام گەشاندنەوەی ئەم خۆشەویستیە، ئاڕاستەکردنی، کارێکە بە قازنج وخێری جەماوەری خەڵک، دەبێ چاوەڕوان بکەین. دەبێ "باوەڕ"مان هەبێت.

وێڕای ئەمەش، مانگان دێن و دەبورن، جووتیار بەدەقی خۆوە ماونەتەوە و ئازاد نەبوون، سانسۆری ئەمنی زیاتر و توندتر دەبێت. لە ناوچەو دیار و دەڤەرێن جیاوازدا، موجیکان دژی ئاغاکانیان ڕادەپەڕن. (موجیک: جووتیاری کۆیلەی ڕووسی، واتە ئەو جووتیارانەی کە دەگەڵ زەوی وزاراندا، دەکڕدران و دەفرۆشران.) لەساڵی ١٨٤٦دا، دوازدە موڵکدار (فیودال) لەلایەن موجیکەکانی خۆیانەوە کوژران. لەساڵی ١٨٤٨دا ئەم ژمارەیە هەڵیبوارد بۆ هەژدە موڵکدار. لەساڵی ١٨٤٦دا، بیست و حەوت بزوتنەوەی یاخیگەری لەلایەن جەماوەری گوندنشینەوە بەرپا بوو لەساڵی ١٨٤٨دا ژمارەی ئەم بزوتنەوانە گەییە چل و پێنج بزوتنەوەی یاخیگەریی. ئیدی نزیکەی نیوەی موجیکانی ئاکنجی شاری ڤیتبیسک و دەوروبەری ڕادەپەڕن و بەرەو سان پتروسبۆرگ هێرش دەبەن، بەڵام هێزی چەکداری حکومەت لە نیوەی ڕێگادا پێشیان لێدەگرن و دەیانگرن. دەنگدانەوە و ڕەنگدانەوەی شۆڕشی ١٨٤٨ی فەرەنسا، کارێکی زۆر، لەمانە دەکات و هێندەی دی دەیان هێنێتە جۆش و خرۆش. دۆستویفسکی متمانەی بە بیروبۆچوونەکانی خۆی لەق دەبێت. کاتێ کە یەکێک لەو یاخییانە لێی دەپرسێت: "کاتێ کە جگە لە شۆڕش، هیچ ڕێگایەکی دی بۆ ئازادکردنی موجیکان نەبێت، چار چیە؟" فیدور میخائیلوفیچ هاوار دەکات: "باشە، پێویستە شۆڕش بەرپا بکرێت!" ئیدی زۆر بێتاقەت دەبێ. شکستە ئەدەبی و کێشە عەسەبیەکانی، تەواو بێتاقەتی دەکەن، چەند جارێک دەکەوێتە خوتبەخوانی بۆ جەماوەر و دەیەوێت هۆڤیگەری موڵکداران و توند و تیژی سیستەمی سوپایی لەقاو بدات و لە بنج و بناوانەوە ڕیشەکەنی بکات. دیبۆ، دەڵێت: "ئێستاش دەنگی لەگوێمدا دەزرنگێتەوە کە بۆی دەگێڕاینەوە چۆن ئەفسەرێکیان لە فیرقەی فنلاندی خستبووە ژێر جەڵدەو شەلاق."

هەروەها سیمینوف تیان چانسکی هەر لەو بارەیەوە دەڵێت: "لەو ساتانەدا، دۆستویفسکی بەجۆرێ دەهاتە جۆش ، ئامادە بوو، بە بەیداخێکی سوورەوە، خۆی بە مەیدانی شارا بکات." فیدور میخائیلوفیچ، قاییل دەبێت، کۆمەڵێک بەیاننامەی مەحکوم کردن، ئامادەبکات و لە کۆبوونەوەکانی گروپەکەی خۆیاندا بیانخوێنێتەوە، بەڵام ئەم بەڵێنەی خۆ ناباتە سەرو لەجیاتی ئەوە چەند لاپەڕەیەکی ،هەندێ لە بەرهەمەکانی درژاڤین و پوشکین و گۆگۆل دەخوێنێتەوە.

لەو سەروبەندەدا میشیلی برای، دوای ئەوەی دەستبەرداری کارەکەی دەبێت، دێت بۆ سان پتروسبۆرگ. دۆستویفسکی براکەی بە سەرۆکی (پیلانگێڕەکان) دەناسێنێ. (میشیل)ش هەمان ڕاوبۆچوونی فیدور میخائیلوفیچی دەربارەی پیتراشفیسکییە هەبوو: ئەم پیتراشفیسکییە، کەسێکی فشەکەری دەماوەرە، ئەکتەرێکی بەتوانای شپرزە و پەرێشان بیرە، بیرو خەیاڵەکانی لەسەروی دەرک و تێگەیشتنی خۆیەوەیە. هەر قسەیەو کردەوەی نییە، کردەوە شەرتە، دەبێ لە میانەی کارەوە پێشبینی ئایندە بکرێت. ئەوەی مایەی سەرنجە، ئەم پیتراشفیسکییە. دەیەوێت لە لێرەوارێکی

موڵکی خۆیدا، کۆمەڵگەیەکی سوسیالیستی دابمەزرێنێ. بەڵام موجیکەکان کە نووسین و بەرهەم و کتێبی سوسیالیستەکانی فەرەنسایان نەخوێندبووەوە، ئەو بینایە، کە ڕەمزی بەختەوەری ئایندەیان بوو دەسووتێنن.

لەلایەکی ترەوە، "دوروف"ی شاعیری عیرفانی، لە پەراوێزی گروپەکەی بیتراشفسکیدا، گروپێک دادەمەزرێنێ. لە دید وبۆچوونی ئە شاعیرە خەیاڵپەروەر و میهرەبان و ناسک خەیاڵ وکەڵەوەکێشەدا، سوسیالیزم و مەسیحایی ئاوێتە دەبن و یەکانگیر دەبن. دوستویفسکی لە لیژنەی لێکۆڵینەوەی دادگاییدا دەڵێت: "دوروف بەڕاستی دینداریکی بێتام بوو." کەچی پالم و پلیشیف و دوستویفسکی هەنگێ پەیوەندی بەگروپەکەی ئەوەوە دەکەن.

هەڵبەتە کۆمەڵگەی سان پتروسبۆرگ، ئاگاداری شەوکۆری ئەو گروپ و کۆمەڵانە، بوو و هیچ بایەخێکی پێنەدەدان. لیبیدیفی سیناتۆر (ئەندامی ئەنجوومەنی پیران) لە یاداشت و بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی ئەو گەنجانە دەکات و بەگەنجی "چەنەبازو" "منداڵانی پیلانگێر"یان ناو دەبات و کارەکانیان بەکاری منداڵانە و نمایشی کۆمیدیانەی قوتابخانەیی دادەنێت. لە ساڵی ١٨٤٥دا شانۆنامەیەکی ڕەخنەیی هەجو ئامێز، لەژێر سەرناقی: "دوو کەڵکەڵەی خۆپەرستی" دەربارەی بۆچوونی فوریە دێتە نووسین. لەم شانۆنامەیەدا ناوی پیتراشفیسکی گۆڕدراوە بۆ پیتوشوفسکی و ئاکساکوف کراوە بە بیکاکوف. باکونین کە پسپۆڕی بواری مەسەلە نەهلیزمیەکان بوو، بۆ هرتزن دەنووسێت کە ئەم گروپانە هیچ زیانێکیان نییە و لەوە لاوازترن کە زیان بە هیچ کەسێک بگەیەنن.

بەهەرحاڵ لەنێو ئەم گروپە گەنجە ترسنۆک و بێکەڵکەدا، بەرە بەرە سیمای ئاڵۆز و مەتەڵ ئاسای سپیشنف بەدیار دەکەوێت. سیمایەکی ژنانە و ناسک، بە دوو لێوی ئەستورو دووچاوی درشت و قژێکی لوولی پرەوە، کە بەسەر شان و ملیا ڕژابوو. ئەم گەنجە لایەنگری کاری ڕاستەوخۆ بوو و ئامادە بوو ئاکام و ئەنجامی ئەو جۆرە کارەش تەحەمووڵ بکات. لە پێناوی سەرنگونی دەسەڵاتدا هەموو جۆرە ڕێگایەکی بەڕەوا دەزانی: سەرکێشی و یاخیبوون، بەکارهێنانی چەک، ڕەشکوژی سیاسی، هەرگیز نەیاندەترساند. کاتێ کە دەستگیر کرا، لە نێو کاغەزەکانیدا، فورمولەی سوێندێکی شۆڕشگێڕانە دۆزرایەوە بەم شێوەو ناوەڕۆکە: "من، کە لە خوارەوە ئیمزام کردووە، ئامادەم بۆ قەبووڵ کردنی ئەم ئەرکانە: کاتێ کە لیژنەی باڵا، بڕیار بدات کە وەختی ئەوە هاتووە ڕاپەڕین بەرپا بکرێت و شۆڕش دەست پێبکات، بێ چەندو چوون بەشداری تێدا دەکەم، دوای ئەوەی چەکی سارد یا چەکی گەرم هەڵدەگرم..."

ئەم بوونەوەرە سەیرو سەمەرەیە کە دوستویفسکی ناوی (مفیستوفلس)ی لێدەنێت (مفیستوفلس: ڕەمزی شەیتانە لە شانۆنامەی فاوستی گوتەدا) بەڕاستی کارێکی خراپ لە دوستویفسکی دەکات. هەرچەندە دوستویفسکی، بەهۆی گاڵتەوگەپە ساردو سڕو بێتامەکانی ئەم کوڕەوە و بە

هۆی خوانەناسی ئاشکرایەوە، خۆشی ناوێت، بەڵام هەر ناتوانێ خۆی لە کاریگەریی ئەو دەرباز بکات.
سپشنیف، کەسێکی زۆر زیتەڵەو چالاک و چەلەنگ و ڕوح سووک، نابێت، ڕەزا قورسە، جۆرە لووتبەرزی و غرورێکی تێدایە کە کەس ناتوانێ خۆشی بووێت. هیچ کەسێک خۆشی ناوێ، یا دەبێ دەگەڵی بەشەڕ بێی، یا ملکەچ وگوێڕایەڵی بیت. دوستویفسکی لە ئەنجامدا بەترس و قێزو بێزەوە ڕادەستی دەبێت. ئیدی دوستویفسکی، لە ساتێکی پێویستدا، یا ڕەنگە بۆ عەیش و نۆشێکی تایبەتی، پێنج سەد ڕۆبڵی لێ قەرز دەکات. ئیدی ئەم قەرزە، دوستویفسکی زۆر ئەزیەت دەدات. خەمبارو، گرژ و مۆن و، کەم حەوسەڵە و جینگن دەبێت. کاتێ کە دکتۆر یانوفسکی پێی دەڵێت ئەمە حاڵەتێکی ڕەوتەنیە و زوو لەکۆڵی دەبێتەوە، وەڵامی دەداتەوە: "نەخێر، ئەمە حاڵەتێکی دەروونیە، وا زوو لە کۆڵم نابێتەوە، ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت و ئەزیەتم دەدات. من پارەم لە سپشنیف قەرز کردووە... حاڵی حازر لەگەڵ ئەودام، سەر بە ئەوم، من هەرگیز ناتوانم ئەم قەرزەی بدەمەوە، ئەمە جگەلەوەی لەگینە ئەو پارەیەم کاش لێوەرنەگرێتەوە، ئیدی تەبیعەتی ئەو پیاوە وایە. تێدەگەی. من حاڵی حازر مفیستوفلسی خۆمم لەگەڵدایە.
مفیستوفلس (شەیتان)! ئینسان بیەوێ و نەیەوێ لە بەرهەمەکانی دوستویفسکیدا، لێرەو لەوێ، تووشی ئەم شەیتان و هاوشێوانە دەبێت، کە وێنەیەکی کاڵ و شێواوی قارەمانەکانی ئەو دەنوێنن. بێگومان دوستویفسکی لە ئەنجامدا نامرادی ئازدیخواییەکەی خۆی لە (سپشینیف)ی شۆرشگێردا دەبینێ. دوستویفسکی دەیویست وەزع و حاڵی جووتیاران باش بکرێت. یاساکانی سانسۆر دەستکاری و هەموار بکرێنەوە. تزار لە کڵۆڵی و نەگبەتی و بێنەوایی جەماوەری خەڵکی هەژار ئاگادار بکاتەوە. ئیدی هەمان ئەو بیرو بۆچوونانەی لەلای سپشنیف دەبێت بە بانگەوازی شۆرش و کوشت و کوشتار و خوێن ڕشتن. ئەو بیرەی کە لای یەکێکیان هێشتا گەڵاڵە نەبووەو ، لەحاڵی خەملیندایە، لای ئەوی دی گەییوەتە لوتکەی ترسناکی خۆی. هیچ ڕێگایەک، بۆ هاوکاری نێوانیان نییە. دوستویفسکی بەرە بەرە دەبێت بەسەرەتایەک بۆ سپشینیف و ئەو ڕێنوێنی دەکات. (سپشنیف)ش دوستویفسکییەکی شێواوە. سپشنیف، سزای کاری دوستویفسکییە. "دوستویفسکی شتی وای نەویستووە." مەبەستی ئەوە نەبووە میللەتی ڕووس شۆرش بکات. بەڵام بیروبۆچوونە خێرخوازییەکانی وەکو دروشم بۆ شۆرشێکی تەقلیدی و بێئاکام بەکار دەبرێت و، وەکو چۆن لەبەرهەمەکانیشیدا، هاوشێوە و مەیموونی لاسایی کەرەوەی ئەو بەدی دەکرێن و هەن. جا دەربارەی هاوزا و هاوشێوە (المثل) دەنووسێت و دەڵێت: "هەر هەموو ئەوەی کە من لە مێژە وەکو چۆن زروزبڵ فڕێ دەدرێت، بەو ئاوایە توورم داوە، تۆ وەکو ئەوەی شتێکی تازەت کەشف کردبێت و دۆزی بێتەوە، بۆمی دێنیتەوەو بە نرخی تازە پێمی دەفرۆشێتەوە. نازانم چۆن ڕۆحی من، بەڵکو زەینی من توانیویەتی بوونەوەرێکی موزیرو پروپوچی وەکو تۆ بێنێتە ئاراوە؟"

دەبوایە پاشەکشە بکات، پەیوەندی دەگەڵ ئەم هاوڕێ ترسناکەدا ببڕێت. بەڵام دۆستویفسکی تووش بوو بوو، هەستی دەکرد کەوتووەتە گێژاوێکی بێئامانەوەو ناتوانێ لێی دەربچێت و لە هەنبەر مەسئولیەتی خۆیدا هەست بەبێ دەسەڵاتی دەکات. بۆیە پێشنیاز بۆ سپشینیف دەکات، لە گروپ و کۆمەڵەیەکی بچووکی ئەوپەڕی چوار یا حەوت کەسی، زۆر سنووردار دروست بکرێت. سپشنیف، ئەو پێشنیازە قەبووڵ دەکات و ئیدی باسی ئەوە دەکەن کە چاپخانە و بڵاوکراوەی نهێنیان هەبێت، بڵاوکراوەو بەیاننامەی ڕەخنەیی و شۆڕشگێڕانە لەنێو جەماوەری خەڵکیدا بڵاوبکەنەوە. فیلیپوف، نەخشەی چاپخانەکە دەکێشێت و بەشە جیاوازەکانی ئەم چاپخانەیە، لە کارخانە جۆراو جۆرەکانی سان پتروسبۆرگدا، بەکرد دەدەن.

ئیدی پارچەکانی ئەم چاپخانەیە، لە ماڵی یەکێک لە ئەندامانی گروپی پیلانگێڕاندا، لێکدەدەن و دایدەمەزرێنن کە لە کاتی تەحقیق و لێکۆڵینەوەدا، بەڕێکەوت ئەم چاپخانەیە کەشف نابێت. دوستویفسکی هەر بەوەندەوە ناوەستێ پێشنیازی دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنی بە سەرۆکایەتی سپشنیف بکات، بەڵکو موریدو لایەنگر و ئەندامیشی بۆ پەیدا دەکات تا یارمەتی بدەن و هاوکاری بکەن. لە مانگی ئازاری/١٨٤٩دا سەرێکی مایکوفی شاعیر دەدات، ماوەیەکی زۆر لەلای دەمێنێتەوەو دێردەکەوێ، ئیدی قاییل دەبێ کە لەنک ئەو بمێنێتەوەو لەسەر ئەو قەنەفە بچووکەی بەرانبەر تەختە خەوەکەی ئەو بخەوێت. کە جووتە هاوڕێ دەکەونە خۆگۆڕین، دوستویفسکی بابەتی بانگەشەی شۆڕشگێڕی دەکاتەوەو دەڵێت: "ئەم پیتراشفیسکییە کابرایەکی گێل و بێ ئەدەبە، لێبۆکێکی چەنەبازو هیچ لەبارا نەبووە. هیچ کارێکی جدی و بەکەڵکی لەدەست نایەت، بەڵام هەندێک لە ناسیاوەکانی، کە زۆر لەو چالاکترن، کارێکیان بەدەستەوەیە کە پیتراشفیسکی بەهیچ جۆرێ لێی ئاگادار نییە و لێبڕاون نە ئاگاداری بکەن و نە لەو کارەدا بەشداری بکەن."

مەبەستی دوستویفسکی، ئەو کۆمەڵەیە بوو کە سپشنیف و فیلیپوف و خودی دوستویفسکی و هاوڕێکانی دیکەیان خەریکی دامەزراندنی بوون. مایکوف، قاییل نابێ پەیوەندی بەم کۆمەڵە تازەیەوە بکات و لە نامەیەکیدا بۆ "ڤیسکوڤاتوڤ" دەڵێت: "من بێهودەیی و خەتەرناکی ئەو پرۆژە و نەخشەیەم بۆ ڕوونکردەوە و تێمگەیاند کە ئەم کارە ئاقیبەتی باشی نابێت و بەڵایەکی گەورە بەسەر هەموویاندا دێنێت. قسەی سەرەکیشم زیاتر ئەمە بوو، کە ئێمە هەردووکمان واتە تۆ و من، شاعیرین، واتە خەڵکانی دەست و پێ سپین و هیچ هەستێکی کارکردنمان نییەو تەنانەت ناتوانین وەکو پێویست کاروباری خۆمانیش بەڕێوەبەرین، لەکاتێکا چالاکی سیاسی پێویستی بە هەستێکی عەمەلی پراکتیکی یەجگار گەورەو فراوان هەیە."

مایکوف، لەسەری دەڕوات و لەنامەکەیدا دەڵێت: "ئێستاش دوستویفسکیم لەبەرچاوە کە وەکو سوقرات، بەدەم مەرگەوە لە بیچامەدا و بەیەخەی کراوەوە لەبەردەم مورید و قوتابییەکانیدا دانیشتووە و هەموو بەلاغەت و فەساحەتێکی خۆی دەخاتە کار بۆ ڕوونکردنەوە وشرۆڤەکردنی بیرو بۆچوون و ئامانجە

پیرۆزەکەی خۆی و ئەرکی ئێمەمانان لە ڕزگارکردنی وڵاتەکەمان و زۆر شتی دیکەی لەو بابەتە..."
بۆ بەیانی کاتێ کە دوستویفسکی لەماڵی مایکوف وەدەر دەکەوێت، سوێندی دەدات، کە ئەو قسانەی شەوێ لای کەس نەگێڕێتەوە.
هەر لەو سەروبەندەدا، لە ١٨٤٨/٢/٢٧دا، بە فەرمانی نیکۆلای یەکەم، بە مەبەستی گوایە ئەمن و ئاسایشی هاووڵاتیان و بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کاریگەریی قسەو دەسەڵاتی هیچ کەسێکەوە، دایەرەیەک بەناوی دەزگای "شوعبەی سێیەم" دامەزرا بوو. ئەم دەزگایە زانی بووی کە پیتراشفیسکی "کۆمۆنیست" "هەموو ڕۆژانێکی هەینی قوتابیانی قۆناغی ئامادەیی و هزرڤانانی ئازاد و خوێندکارانی زانکۆ، لای خۆ کۆدەکاتەوە و کۆڕ دەگرن..."
ئیدی جەنەڕاڵ کۆنت ئورلوڤ، سەرۆکی گشتی جاندرمە، کەسێک بەناوی لیپراندی، کە کارمەندی وەزارەتی ناوخۆ دەبێت، ڕادەسپێرێت کە تاقیب و پەیگیری ئەو مەسەلەیە بکات. ئیدی لیپراندی، وەکو خۆی دەڵێت نزیکەی یەک دانەساڵ بەدوای جاسووس و سیخوڕێکی شایستەو ئایدیالیدا دەگەڕێت، کە لە ئاستی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری و خوێنەوارییەکی هاوتای ئەندامانی کۆمەڵەی ناڤبریدا بێ، بۆ ئەوەی بخزێنرێتە ڕیزی ئەندامانی کۆمەڵەکەوە و ئەوجا تاقیب و پەیگیری ئەم مەسەلەیە بکرێت. سەرەنجام ئەم مرواریە کەم وێنەیە لە شەخسی ئانتونیلیدا دەدۆزێتەوە. ئەم ئانتونیلییە، کوڕی نیگارکێشێکی ئیتاڵی نەژاد دەبێت. پیاوێکی سورفلی کەپوو زلی، چاو درشتی، نیگا تیژ بوو. بەهەمان شێوازی چەرچیان، بە زمانی لووس و دەمی تەڕو ڕووبینی ومجامەلەی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد. ئەمە زانستگەی سان پتروسبورگی تەواو کردبوو، فەرمانبەر بوو لە دایەرەیەکی دەوڵەتێدا، قابیل بوو بە ئەنجامدانی ئەو کارە، بەو مەرجەی ناوی ئاشکرا و ڕاستەقینەی لە فایلی مەسەلەکەدا نەبرێت.
ئیدی ئانتونیلی لە ١٨٤٩/٣/٢دا، بۆ یەکەمجار لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەی ناڤبریدا ئامادە دەبێت. بەخۆ و ئیلەکە ئەرخەوانیەکەیەوە سەرنجی ئامادەبووان ڕادەکێشێت. کەمێک سڵۆک و پەشۆکاو دێتە بەرچاو. جگەرەی فەڕەنگی بەسەر ئەوانەی تەنیشتی خۆیدا دابەش دەکات، بەشداری لە گفتوگۆو گەنگەشەکاندا دەکات، بیرو باوەڕێن ئازادیخوازانە دەردەبڕێت و هەوڵدەدات ڕەخنەی توند لەحکومەت و کڵێسا بگرێت.
کوزمین، لە بوگوسوگلوی هاوڕێی دەپرسێت: "ئەمە چی دەکات لێرە، بۆچی هاتووە؟" بوگوسوگلو وەڵامی دەداتەوە: "هەقمان چیە، تۆ بەخۆت چاک دەزانیت کە میشیل ڤاسیلیڤیچ (واتە پیتراشفیسکی ) ئامادەیە پێشوازی لە هەر کەسێکی تازە بکات و زۆریش بایەخی دەداتێ و بە دەوریدا دێت..."
ئیدی لەو ڕۆژەوە بەدواوە، ئانتونیلی دەبێت بە یەکێک لە میوانە هەمیشەییەکانی ماڵەکەی پیتراشفیسکی تەنانەت دەچێت بۆ ئەو کۆبوونەوە و کۆڕانەی کە لەماڵی ئەندامەکانی دیکەی کۆمەڵەکەشدا، دەگیرێت، کە بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، ئیدی هەرچیەکی لەو کۆڕ و کۆبوونەوەیەدا دیتووە و

بیستووە، جوان تۆماری دەکات و دەیکات بە ڕاپۆرت و ڕێک بۆ وەزارەتی ناوخۆی ڤڕێدەکات. لیپراندی هەموو ڕاپۆرتەکان دەخوێنێتەوەو تاوتوێیان دەکات و لەیەک شوێندا هەڵیاندەگرێت..

وێڕای ئەوەش، ئەو ڕاپۆرتانەی کە دەربارەی گروپەکەی پیتراشفیسکی کۆکراونەتەوە، هێشتا ڕاپۆرتی ئاسایین و شتی بقەیان تیا نییە. بریتین لە ڕاوبۆچوونی ئاسایی و بێسەروبەر، ڕەخنە و ئیرادی سوک و بێ بنج وبناوان... ئانتونیلی زۆری پێناخۆش دەبێت. ئایا پیلانگێڕەکان. خۆیانی لێدەپارێزن؟ یان هەر بەڕاستی قوتابی بێوەین و هیچی دی؟

ڕۆژێک دوستویفسکی دیدەنی دوروف دەکات، دوروڤ کۆپیەکی نامە بەناوبانگەکەی بیلینسکی بۆ گۆگۆل، کە پێشتر باسی کردبوو، دەدات بە دوستویفسکی. پلیشییف ئەو نامەیەی لە مۆسکۆوە ناردبوو. دوستویفسکی کۆپی نامەکە بە پالم، بە مومبیلی و بە ئیڤانوڤ نیشان دەدات و بەڵێن بە پیتراشفیسکی دەدات کە لە یەکێک لە جومعە کۆڕەکانی ماڵی ئەودا بیخوێنێتەوە. ئەم بەڵێنە لە مانگی ئازاری ١٨٤٩دا دەدرێت. دوستویفسکی لە ١٨٤٩/٤/١٥دا بەڵێنەکەی خۆی دەباتە سەرو نامەکە دەخوێنێتەوە. دوستویفسکی پاشان نکوڵی لەوە دەکات کە ناوەڕۆکی ئەم پەیام و نامە پڕ قین و بوغزەی قەبووڵ بووبێت. دوستویفسکی لەوەڵامی پرس و جۆی لیژنەی لێکۆڵینەوەدا دەڵێت: "باشە ئەوەی کە ڕاپۆری لە من داوە دەتوانێ ئەوە بڵێ کە من پەیوەندیم دەگەڵ کام لەم دوونامە نووسەدا زیاتر بووە؟... بۆیە تکاتان لێدەکەم کە ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەن: ئایا دەشێت من نامەی کەسێک بخوێنمەوە، کە بەهۆی کۆمەڵێک ناکۆکی ئایدولوجیەوە، پەیوەندیم لەگەڵیا پڕی بوو (هەڵبەتە ئەم پەیوەندی داپڕانەی ئێمە شتێکی نهێنی نییە و زۆر کەس پێی دەزانن) باشە ماقولە من نامەی ئەو بە سەرمەشقێکی پیرۆز و یاساو ڕێسایەکی ئەوتۆ دابنەم کە هەموو خەڵکی پەیڕەوی بکەن؟... من خوێندمەتەوە، بەڵام هەوڵمداوە، بێلایەنانە، بێئەوەی هیچ یەکێک لەم دوو نامەنووسە بەسەر ئەوی دیدا پەسەند بدەم".

چۆن پاکانە بۆ ئەم هەڵوێستەی دۆستویفسکی بکەین و بە چ بارێکا لێکیبدەینەوە و شرۆڤەی بکەین کە هاتووە دەنگ و بەهرەی خۆی خستووەتە پاڵ دەنگی دەقێک کە نەیارەکەی نووسیویەتی. گومان لەوەدا نیە نامەکەی بیلینسکی هەندێ بیرو بۆچوونی تیابوو کە دوستویفسکی نەک هەر لەگەڵیدا نەبوو بەڵکو دژیشی بوو. بۆ نموونە هێرشی ئەم ڕەخنەگرە پیرە بۆ سەر عیرفان و سۆفیگەری، بۆ سەر کڵێسا، بۆ سەر تزار، کە هەرگیز دەگەڵ بیرو بۆچوونی دوستویفسکیدا تێکینەدەکردەوە. بەڵام نامەکە لەسەرێکی دیکەوە کۆمەڵێک ناڕەزایی توندی دەربارەی کۆیلایەتی تیا بوو و، بەگەرمی ستایشی ڕۆڵی نووسەری دەکرد، کە ئەم بیرو بۆچوونانە دەگەڵ ڕاوبۆچوونی دوستویفسکیدا تێکیاندەکردەوەو ڕەنگە لەبەر خاتری ئەم لایەنە، ئەو بانگەشەیە زۆر و فراوانەی بۆ کردبێت.

ئانتونیلی، گوێی بۆ یەک بەیەکی ئەو ڕستانە دەگرت کە لەنامەکەی بیلینسکیدا هاتبوون و دوستویفسکی و گوێگرەکانی مەحکووم دەکرد: "کڵێسا بەشێوەیەکی زنجیرەیی چینایەتی لەسەرێ ڕا بۆ خوارێ کار دەکات و، ئەمەش خۆی لەخۆیدا نیشانەی جیاوازی و نا یەکسانیە، نیشانەی پشتیوانیە لە دەسەڵات و ناکۆکی و دژایەتی دەخاتە نێوان جەماوەری خەڵکەکەوە و برایەتیان لەنێواندا نایەڵێت. چینی "ئەکلیرۆس" واتە چینی ڕۆحانی، بەزۆری بە ورگە زلەکانیان بە قسە بۆش و بەتاڵەکانیان، بە فەزڵفرۆشی کڵێسایی و بەبێ ئەدەبییە سەیر و هۆڤیانەکانیاندا دەناسرێنەوە. من باسی ئەو ستایش و ئافەرینەی تۆ لە میللەتی ڕووس ناکەم کە بەڕای تۆ شاهانی خۆیان خۆش گەرەکە. بەڵام ڕێک و ڕەوان، بەکورتی و ڕاشکاوی ئەمەت پێدەڵێم: "مەدح و ستایش کاتی بەسەر چووە و هیچ کەسێک گوێی لێناگرێت و پەسەندی ناکات..."

لە کاتی خوێندنەوەی نامەکەدا، گەنجەکانی دەوروبەری دوستویفسکی بە دەنگی بەرز هاوار دەکەن، جنێو دەدەن. قاقا پێدەکەنن، چەپڵە لێدەدەن. کەیفیان بەقسەکانی دێت. (ئانتونیلی)ش لە زەین و بیری خۆیدا بیری لە چۆنیەتی داڕشتنی ڕاپۆرتەکەی دەکردەوە.

کۆڕو کۆمەڵە جیاوازەکانی دیکەش، کە لەم جۆرە کەسانە پێک هاتبوون، بۆ ئەم نۆکەر و جاسووسەی وەزارەتی ناوخۆ، لە دەسکەوتی باش بەدەر نەبوون. بۆ نموونە، لە ئێوارە کۆڕێکدا، لە ماڵی سپشینف، دوستویفسکی لە خوێندنەوەی چیرۆکێکی گریگورفیچدا بەناونیشانی (سەربهوردی سەربازێک) ئامادە دەبێت (چیرۆکەکە، بابەتێکی شۆڕشگێڕانە بوو بەدژی سوپا و حکومەت). چەند ڕۆژێک لەوە پیشتریش لەماڵی یەکێک لە جماعەتی پیلانگێڕان، بەنێوی (ئیفرابوس) کۆڕ و ئاهەنگێک بەیادی شارل فوریەوە ساز کرابوو، دوستویفسکی نەیتوانی بوو، ئامادە بیێت. بەڵام ئاهەنگ و کۆڕەکە زۆر سەرکەوتوانە ئەنجام درا بوو. پیتراشفیسکی بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، بەم ڕستانە کۆتایی بە وتارەکەی خۆی هێنا بوو: "ئێمە حکومی ئیعدامی ئەم کۆمەڵگەیەی ئێستامان داوە، جا ئێستا ئەرکی ئێمە تەنیا ئەوەیە کە ئەم حوکمی ئیعدامە جێبەجێ بکەین."

بەڵام ئاکشاروموفی ئەندام وردیلەی چکۆلە، بە چەند ڕستەیەکی کورت و توند داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی خێزانی، موڵکیەتی تایبەتی و دەوڵەت و یاساو سوپا و کڵێسای کردبوو و دوای چەند سانێک بەوپەڕی ئاسوودەیی، بەو حیسابەی ئەرکی خۆی ئەنجام داوە، لە شوێن خۆی دانیشتبووەوە.

پاش ئەوەی ئانتونیلی، فایلەکەی خۆی پڕکرد لەم زانیاریە ورد و دروست و ئاشکرا و مەترسیدارانە، هەنگێ جەنەڕاڵ ئورولوف، مەسەلەکەی گەیاندە تزار "نیکۆلای یەکەم". تزار کە ڕاپۆرتەکە دەخوێنێتەوە، یەکسەر دیسامبەریەکانی وەبیردێتەوە کە لەگەڵ یەکەم ڕۆژی هاتنە سەر حوکمی خۆیدا، لێبڕابوو، ڕیشەکێشیان بکات، سەرانی ڕاپەڕینەکەی ئیعدام یا دوور

خستبووەوە بۆ سیبریا. کەچی ئێستا پاشماوە و نەوەکانیان، لەناکاو و سەرلەنوێ لە هەنبەریدا سەریان قوت کردووەتەوە. باشە نەیدەتوانی کۆتایی بەم بیروباوەڕە ژهراوییە ڕۆژئاواییانە بێنێ؟
جا لەترسی ئەوەی نەبا ڕاپەڕینانی وەکو ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٨٢٥ سەرهەڵبداتەوە، مەسەلەی ئەم پیلانگێڕانە زۆر بە هەند وەردەگرێت وحیسابی گەورەتر لە قەوارەی خۆیان بۆ دەکات و بیر لەوە دەکاتەوە، سزایەکی قورسیان بۆ ببڕێتەوەو ببن بە پەند وعیبرەت بۆ خەڵکانی دیکەش. بۆیە تزار لە پەراوێزی ڕاپۆرتەکەدا دەنووسێت: "من هەموویم خوێندەوە. مەسەلەکە قورس و پڕ مەترسییە. خۆ ئەگەر هەر هەموویشی تەنیا قسەی ڕووت و چەنەبازیش بوویێت، هەر کارێکی تاوانکارانەیە و قابیلی قبووڵ نییە. وەکو پێشنیازت کردووە، پێویستە بگیرێن. دەیسا ناوی خوای لێبێنە و دەست بەکاربەو با ویست و ئیرادەی خوا جێبەجێ ببێت.
ئورلوف، سەرەنجام بڕیاری خۆی دەدات. لە ١٨٤٩/٤/٢٢دا چودینوفی، فەرماندەی تیپی سەربەخۆی جەندرمەی ناوچەکە، فەرمانی "دەستگیرکردنی فیدرو میخائیلوفیچی، ئەندازیاری خانەنشین و نووسەر"ی پێدەگات.
٤/٢٢ ڕۆژی هەینی بوو فیدور میخائیلوفیچ، چوو بوو بۆ ماڵی پیتراشفیسکی و لەوێ باسی ئەوەیان کردبوو کە ڕۆژنامەیەک بەشەریکی دەربکەن. دوستویفسکی سەعات چواری بەرەبەیانی شەکەت و ماندوو بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە. نمە بارانێکی سارد جلەکانی تەڕ کردبوو. جلەکانی دادەکەنێ، دەچێتە ناو جێگاوەو زوو بە زوو خەوی لێدەکەوێت. بەڵام زۆری پێناچێت، کە دەنگی ڕینگ و هۆڕی شمسێر و ڕمبان لەبەر دەرگاکەی بەرز دەبێتەوە و خەبەری دەکاتەوە. چاوان هەڵدێنێ، چرا پێدەکات، بەرپرسی پۆلیسی گەڕەک لە هەنبەر خۆیدا دەبینێت، کە موقەدەمێک بوو بەجووتێ کەتافیە و قەیتانی کەشخە و شکۆدارەوە، لەگەڵ سەربازێکدا: "هەستە، فەرمانە دەبێ هەستیت، چیت پێدەڵێین وابکە." دوستویفسکی بە شپرزەیی دەڵێت: "بەیارمەتیتان..." ئەفسەرەکە دەڵێت: "خێرا جلەکانت لەبەربکە. ئێمە چاوەڕوانی تۆین."
موقەدەمەکە، پیاوێکی نەرم و نیان و ڕووخۆش دیاربوو، دەنگی دڵگیر بوو. دوستویفسکی هێور دەبێتەوەو لەدڵی خۆیدا دەڵێت دیارە دەبێ بەدحاڵی بوونێک لەئارادا بێت، دەیبەن چەند پرس وجۆیەکی دەگەڵدا دەکەن و بێگومان یەکسەر ئازادی دەکەن. چونکە هیچ تاوانێکی نەکردووە کە شایستەی ئەوە بێت بگیرێت و دە زندان بپەسترێت.
لەوکاتەدا کە دوستویفسکی خەریکی خۆگۆڕین دەبێت، ئەوان دەکەونە پشکنینی کتێبەکانی و زۆر بەدیقەت کاغەزەکانی هەڵدەدەنەوەو هەندێکیان لێهەڵدەبژێرن و بە پەتێک دەیبەستن. پولیسێک سەر بە موغەیریەکەدا دەکات و بە پایپەکەی دۆستویفسکی دەکەوێتە تێکدانی خۆڵەکەوەکە. دەرەجەدارێکی دیکە، سەردەکەوێتە سەر کورسییەک تا بزانێت چی لەسەر

سۆپاکە هەیە، بەڵام لەسەر کورسییەکە دەخزێت و بەردەبێتەوە سەر ئەرزەکە. دراوێکی پێنج کوپێکی خوار و خێچ لە سەرمێزەکە، سەرنجی ئەفسەرەکە ڕادەکێشێت. دوستویفسکی لێی دەپرسێت: "چیە، قەڵبە؟" ئەفسەرەکە بەدەم بۆڵەیەکەوە دەڵێت: "دەبێ تاقی بکەینەوە" و دراوەکە بەگەڵ شتەکانی دیکە دەخات.

دوستویفسکی بەلەز جلەکانی لەبەر دەکات و هەموو پێکەوە ژوورە داڕزاو و داپژاوەکە بەجێدێڵن عەرەبانەیەک لە بەرانبەر ماڵەکەدا چاوەڕوانی دەکردن. ژنەی خاوەنماڵ و دەرگاوانی ماڵەکە کاتێ دەبینن کریچییەکان دەگەڵ چەند کەسێکی چەکداردا بەپەلە سواری گالیسکەکە دەبن، سەر دەلەقێنن.

عەرەبانەکە بەو بەیانیە زووە کە هێشتا دنیا تاریک بوو، کۆچە و کۆڵانەکان چۆڵ و هەوا سارد بوو، بەپەلە کەوتەڕێ.

## فەسڵی دووەم
## زندان

گالیسکان خۆ بە حەساری شوعبەی سێیەمدا دەکەن، پێچێک دەکەنەوە ودەوەستن. ئەو تۆمەتبارانەی کە لە هەر چوارگۆشەی شاری پترسبۆرگەوە ڕاپێچ کرابوون، پیادە دەکەن. تەمەشای ناسنامەکانیان دەکەن. ئەوسا بەسەر هۆڵ و قاوشی جیاوازدا دابەشیان دەکەن. لەبەر دەرگای هەر ژوور و هۆڵێکدا، چەند سەربازێکی چەکدار بە حاڵی ئامادەباشییەوە وەستاون. گیراوەکان هەموو ڕەنگ زەرد و خەمین و سەروسیما خەواڵوون. دوستویفسکی هەندێ لە دۆست و هاوڕێکانی خۆی دەناسێتەوە. لەپێش هەمواندا "ئاندرێ"ی برای دەبینێ. لێی دەپرسێت: "تۆ چ دەکەی لێرە؟" بەڵام پاسەوانەکان بەلەز لێکدییان جیادەکەنەوە. فەرمانبەرێکی وەزارەتی ناوخۆ، پیلانگێرەکان لە دەوری خۆی خڕدەکاتەوە، لیستێکی ناوەکانی بەدەستەوەیە، دۆستویفسکی لە سەرووی لاپەڕەی لیستی ناوەکانەوە، ئەم وشانە، کە بەقەڵەمی ڕەساس نوسرابوون، دەخوێنێتەوە: "باوەڕپێکراوی فایل: ئانتونیلی". هەر ئەو ڕۆژە میشیل دوستویفسکی دەچێتە دیدەنی میلیکوف و زۆر شپرزە و پەرێشان دەبێت. میلیکوف لێی دەپرسێت:

-چیتە؟

-چۆن؟ ئاگات لە هیچ نییە؟

-نا، چی بووە؟

-فیدوری برام گیراوە.

-ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەمە کەی ڕوویداوە؟

-دوێشەو، داویانە بەسەر ماڵەکەیدا، پشکنیویانە و ئیدی لەگەڵ خۆدا بردویانەو، دەرگای ماڵەکەیان مۆرکردووە...
-ئەدی ئەوانی دی؟
-"پیتراشڤیسکی و سپشنیف"ش گیراون. نازانم ئاخۆ خەڵکی دیکەش گیراون یان نا.. سەبارەت بە منیش ئەگەر ئەمڕۆ نەگیرێم. ئەوا سبەینێ دەگیرێم...
-بەچیا دەزانیت؟
-ئاندرێی برامیان گرتووە، ئەو ئاگای لە هیچ نییە... نەچووەتە هیچ کۆڕ کۆبوونەوەیەکیش. ئەویان بەهەڵە، لەجیاتی من گرتووە.*(پڕوانە بیرەوەرییەکانی میلیکوف)
بڕیار دەدەن، پیاسەیەک بکەن و سەرێکی برادەرەکانیان بدەن. بۆیان دەردەکەوێت کە هەر هەموویان خانەبگیر کراون و دەرگای ماڵەکانیان مۆر کراوە.
ئیدی لەو کەین و بەینەدا جەنەڕاڵ کۆنت ئورلوف، بۆ نیکولای یەکەم دەنووسێت: "مایەی شانازیمە کە خاوەنشکۆتان لەوە ئاگاداربکەمەوە کە پرۆسەی دەستگیرکاریەکە ئەنجام دراو، سی و چوار نەفەر، بەتەواوی کاغەز و بەڵگەنامەکانیانەوە، هەواڵەی شوعبەی سێیەم کراون."
لە ٢٣/٤دا، سەعات یازدەی شەو، هەموو زندانییەکان گوێزرانەوە بۆ قەڵای (پوترس و پولس) ئەم قەڵایە لەلایەن پوترسی گەورەوە دروستکرابوو ولەساڵی ١٧١٨دا ئەندامانی پیلانەکەی شازادە "ئەلیکسی" کوڕە گەورەی تزار، لەوێدا زندانی کران. ئیدی کوڕەکەی تزار، لە یەکێک لە بیناکانی ئەم قەڵایەدا پرس و جۆی دەگەڵ دەکرێت و بەتاوانی ئەوەی کە بیروبۆچوونەکانی بابی پەسەند ناکات زندانی دەکرێت و تا دەمرێت ئەشکەنجەی دەدەن. لە سەردەمی دەسەڵات و سەڵتەنەتی ئانا ئیڤانوڤنادا، زندانێکی تایبەتی لەم قەڵایەدا دروستدەکرێت و ناوی "قەڵای ئەلیکسی" لێدەنرێت، سەیر لەوەدایە ئەم بەشەی ئەو زندانە گەورەیە وەکو ڕێزێک بۆ ئیمپراتۆر "ئەلیکسی میخائیلوفیچ" بەناوی ئەوەوە ناو دەنەن. یەکەم کەس کە دەخرێتە ئەم زندانە تایبەتیەوە. شازادەخانم "تاراکانوڤا"ی زرکچی شاژنە ئەلیزابت پتروفنا دەبێت کە خۆی بە میراتگری تەخت و تاجی ڕووسیا دەزانێت و داوای دەکات. "دیسامبەرییەکان"یش لێرەدا زندانی دەکرێن، دوای ئەوە بە بیست و پێنج ساڵ، ژێر زەمینان و ڕەشچاڵانی ئەم قەڵایە، پێشوازی لە گروپە چکۆلەکەی پیتراشفیسکی دەکەن.
لەڕاستیا، پیلانگێرانی ساڵی ١٨٤٩ بەسەر دوو گروپدا دابەش کران. گروپێکیان لە ژوورەکانی قەڵاکەدا زندانی کران و گروپی دووەمیان، کە بە خیانەتکاری گەورەتر دادەنران، خرانە زندانە تایبەتیەکەوە، کە دوستویفسکی یەکێک بوو لە گروپی دووەم.
زندانە تایبەتیەکە، بریتی بوو لە بینایەکی سێگۆشە، شەپۆلە شینباوەکانی ڕوباری نیڤا خۆیان بەدیوی دەرەوەی دیوارەکانی باشووری ئەم زندانەدا دەکێشا. باخچەیەکی بچووکی بۆڕاوێچکە و پیاسەی زندانییەکان تێدا بوو.

ڕاڕەوێکی درێژی هەبوو کە نۆزدە دەرکەی دەلاقە ئاسای لەمبەرو لەو بەرەوە هەبوو. دەنگی پێ و دەنگی زیندانییەکان، لەژێرخانێکەوە بۆ ژێرخانێکی دی دەڕۆیی و لە ڕاڕەوەکەدا دەنگی دەدایەوە. ناو زندانەکە زۆر تاریک بوو. هەرکە گروپەکەی پیتراشفیسکی هێنرانە نێو زندانەکەوە، لەڕێگاوە، لە پرسگەوە، جلەکانی خۆیان لێ سەندن و جلکی یەک شێوەی زندانیان لەبەرکردن کە بریتی بوو لە کراس و پانتۆڵی لە گوش دروستکراو، و ڕۆبێکی زبری جۆخی عەسکەری ناشیرین. ئیدی دوستویفسکی بەو قەدو قەڵافات و دیمەنە کۆمیدییەوە دەچێتە ژووری تاریکی زندانەوە. ژوورەکەی تا ڕادەیەک گەورە دەبێت: شەش مەتر درێژ و سێ مەترنیو پان دەبێت. قەرەوێڵەیەکی سەفەری عەسکەری، لەگەڵ دۆشەک و بالیفێکی پڕ لە کا، تەپڵەکێک و سوراحیەکی ئاو و مۆمێکی لەپیو کە لە نزیکی پەنجەرەکەدا بوو، ئەمانە هەموو پێویستیەکانی ژیانی نێو ئەم سالوولە بوو.

پەنجەرەکە بە قسڵی سپی تەڕاو کراوبوو، لەپشتەوە کەتیبەیەکی ئاسنی قایمی بۆ کرابوو. کونێکی بچووک لەناوەندی دەرگاکەدا هەبوو، کە زندانییەکان لەنێو خۆیاندا ناویان نابوو چاو، هەمیشە بە پارچە پەڕۆیەک داپۆشرا بوو. ئەم دەرگایە ڕۆژی پێنج کەڕەتان دەکرایەوە: سەعات حەوت بۆ چای، سەعات دە بۆ پشکنین، نیوەڕۆ بۆ فراڤین کە (بریتی بوو کە قاپێک شۆرباو کوتێک گۆشت.)و ئێوارە بۆ شام. لە کۆتایی ڕۆژیشدا وەردیانێک دەهات مۆمەکەی دادەگیرساند و دەڕۆیی.

لێرەدا هەموو شتێک کروکپە، لەم سالوولەدا غەڵبە غەڵب و هەراو زەنای شار نایەت، دەنگی پێی قەرەوڵ و ئێشکگران، دەڵێی لە دنیایەکی دیکەوە دێت. لە سەردەم و ڕۆژگارێکی دیکەوە دەگاتە گوێ. بێدەنگی بەرد ئاسا باڵ بەسەر دنیادا دەکێشێت. بۆساردی سەلبەندی نمساری ڕاڕەو و ژوورەکان پیاو کاس دەکات. مۆمەکە بەرە بەرە دەکەوێتە پرتە پرت، گڕەکەی کز دەبێت و دەتەمرێت. ئیدی تاریکی وەکو دیوار، وەکو مەرگ، بەسەر سالوولەکەدا دادەڕوخێت.

دوستویفسکی، لەجێی خۆی ڕادەچڵەکێت، دەست دەخاتە سەر لاجانگەکانی. تەواو، هەموو شتێک تەواو. دەبێ بخەوێت، بەهەر نرخێک بووە دەبێت بخەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا زەینی لە کارا بوو. ئایا بەدبەختە؟ نەخێر. لەگەرمەی پەرێشانی و نیگەرانی خۆیدا، هەست بە جۆرە بارسووکی و ئاسوودەییەک دەکات. کە جورئەت ناکات بۆ کەسی باسبکات. دەمێک بوو هەستی دەکرد کە ڕووداوی کارەساتێک بۆ ئەو زەروری و پێویستە. گرنگ ئەوە بوو، کە ڕووداوێک، کارەساتێک، ڕێڕەوی ژیانی پوچ و بێ بایەخ و بێهودەی ئەو بگۆڕێت. جا ئێستا گرتن و زیندان، ئەوی لەو ژیان و بوونە یەکهاوی و یەکنەواو ڕۆتینییە ڕزگار دەکرد. مەترسی ئەم کارەسات و بەدبەختیەی ئەو، ئەمە بوو کە لە خەڵکی دادەبڕی. بەهەرحاڵ ئیدی ئەمە ڕووداوێکی ئاوارتەو ڕیزپەڕە. حاڵی حازر ئەو لەهیچ شتێک مەسئوول نییە، ئیدی دەتوانێ بۆ خۆی ئیسراحەت بکات و هەناسەی ئۆخەی هەڵکێشێت. قەدەر یاری بە

چارەنووسی دەکات. ئیدی لەو واز وازیە ڕزگار بوو کە پیاوێکی مەزن بێ یا هێلکە شەیتانۆکەیەکی بچووک بێت. ئیدی خۆی لەبەردەستی خودا دەبینێتەوە.
ئیدی دوای سی دانە ساڵ کاتێ پێی دەڵێن: "گرتن و دوورخستنەوەی ئێوە بۆ سیبریا، کارێکی یەجگار زاڵمانە بوو." بەرسڤ دادەتەوە و دەڵێت: "نەخێر، کارێکی دادوەرانە بوو، میللەتی ڕووس مەحکومی کردبووین، کێ دەڵێت کە قودرەتی بێ پایانی خوایی بۆ ئەوە منی بۆ زندان و تاراوگە نەناردووە، تا لەوێدا شتە هەرە گرینگەکان، فێر ببم، کە دەرک کردن و تێگەیشتنیان بەبێ ئەو ژیانە مەیسەر نەبوو."؟
تا دوو مانگ و نیو قەدەغە بوو کە زندانییەکان نامە بۆ کەس و کاریان بنووسن و کەمترین پەیوەندییان دەگەڵدا بگرن، یا نامەیان لەوانەوە بۆ بێت. هەندێک لە لایەنگرەکانی پیتراشفیسکی زۆر بەزەحمەت تەحەمولی ئەم حەپسە سەرەتاییەیان کردو زۆریان لەبەر گران بوو. گریگوریف، تووشی سستی و لاوازی ئەعساب بوو. کاتینیڤ، تووشی جۆرە شێتاتیەک بوو، ناچار بوون بۆ نەخۆشخانەی دەروونی ببەن، کە دوای ماوەیەکی کەم مرد. "یا سترژامبسکی"ش. بیری لە خۆکوژی دەکردەوە. لە بیرەرییەکانی خۆیدا دەڵێت: "من لە ٤/٢٣ تا ٢٣ دیسامبەر، لەم زندانەدا مامەوە، خۆ ئەگەر زیاتر لەوێ مابامەوە بێگومان ئەقڵم لەدەست دەداو شێت دەبووم."
"بیتراشفیسکی"ی پڕ ئەزموونیش، کە وەزعی زۆر خراپ دەبێت، سکاڵانامەیەکی مەیلەو خەیاڵی و باوەڕنەکردەنی بۆ لیژنەی زیندان دەنێرێت کە: گوایە بەلێدانی سووکی دیوارەکە خەوی دەزڕێنن و لە بێخەویدا تووشی حەواس پەرێشی، یادگە شێوان دەبێت، دەنگی فسکە فسک و ژاوەژاو لە هەر چوارگۆشەی زندانەکەوە دێت و خۆی لە بیر دەکات و کات و شوێنی لێتێکدەچێت.
بەڵام ئاکشاروموف، بزمارێک لە قەرەوێڵەکەی دەردێنێ و، بۆ کات بەسەربردن دەکەوێتە تیژکردنی نووکەکەی. لە مبارەیەوە دەنووسێت: "هەندێجار لەبەر پەنجەرەکەدا دەوەستام. هەندێجار بەنێو قەفەزەکەم دا، دەهاتم و دەچووم. زۆر جار لەسەر ئەژنۆ لە ئەرزەکەدا دادەنیشتم، ڕوخسارم لەنێو هەردوو دەستم دەنا، بەدەنگی بەرز قسەم دەکرد، دەگریام، ئەوسا ڕادەپەڕیم، هەڵدەستامە سەر پێیان و دەگەڕامەوە بەر پەنجەرەکە."
بەڵام ئاندرێ دوستویفسکی، کە لە هەمان ڕۆژی دەستگیرکردنی براکەیدا، بە هەڵە گیرابوو، لە ١٨٤٩/٥/٦دا ئازاد کراو لەجیاتی ئەو ، میشیل دوستویفسکی گیرا، کە ئەویش لە ١٨٤٩/٦/٢٤دا ئازاد کراو، ڕاپۆرتەکە دەڵێت: "نەک هیچ تاوانێکی بەرانبەر بە حکومەت نەکردووە، بەڵکو هەوڵیشی داوە، ئەو گروپە ئاگادار بکاتەوە کە هیچ تاوانێك دەرهەق بە حکومەت نەکەن."
لە مانگی تەمووزدا، گۆڕانێکی گەورە و ڕیشەیی لە ژیانی زندانییەکاندا ڕوو دەدات. ڕێگە دەدرێن کتێبان بخوێننەوە، نامە بنێرن و نامەیان لە دەرەوە بۆ بێت.

فیدرو میخائیلوفیچ، له ١٨٤٩/٧/١٨دا له نامەیەکدا بۆ براکەی دەڵێت: "برای ئازیزم، که له ١١/تەمووزدا نامەکەتم پێگەیی، هێنده خۆشحاڵ بووم، که لەوەسف کردن نایەت. دەتوانم تەسەوری ئەوە بکەم، که کاتێ گەڕاویتەوە ناو ماڵ و منداڵ و خاو خێزانی خۆت، چەند بەدیداریان شاد بوویت... بۆت نووسی بووم که ئومێد و جورئەت له دەست نەدەم، ورەو نەتره بەرنەدەم. نا من ورە بەرنادەم. بەڵام بێگومان هەست به بێزاری و دڵتەنگی دەکەم. ئیدی چار چییە؟

به شێوەیەکی گشتی کات بەشێوەی نایەکسان دەگوزەرێت: هەندێجار زۆر بەخۆرایی تێدەپەڕێت، هەندێجار زۆر بەخاوی تەنانەت هەندێجار وا هەستدەکەم خووم بەم ژیانەوە گرتووه، لەگەڵیدا ڕاهاتووم و هەموو شتەکانم بەلاوه وەکو یەکه و گوێ بەهیچ نادەم... ئێستا، حاڵی حازر، هەواکەی خۆشە و ئەمه کەمێک دڵخۆشیم پێدەبەخشێت. بەڵام له ڕۆژانی باراندا، زندانەکە زۆر تەنگ و ناخۆش و خەمئەنگێز دەبێت. هەڵبەته من وەختی خۆم به فیڕۆ نادەم. نەخشەو وێنای سێ چیرۆک و دوو ڕۆمانم له مێشکی خۆدا گەڵاڵە کردووه... ژیان و زندوویەتیەکی یەجگار سەیر لە تەبع و تەبیعەتی ئینساندا هەیە. ئەوەی ڕاستی بێ من هەرگیز تەسەورم نەدەکرد کە مرۆڤ ئەم تەبیعەتە زندووەی هەبێت. بەڵام ئێستا، به ئەزموون و تەجرەبە ئەمەم بۆ دەرکەوتووه."

سەیر ئەوەیە کە دۆستویفسکی، هەرچەندە، هێشتا چارەنووسی دیار نەبوو و نەیدەزانی تەماس دەگەڵ هیچ یەکێک لە دۆست و برادهرەکانیدا بگرێت، جۆره ئاسوودەیی و دڵنیاییەکی لەلا هەبوو، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا نیشانەی ئەوە بوو، کە تەنیایی دەگەڵ مجێز و تەبیعەتی ئەودا تێکی دەکردەوه. زۆر له جاران به ڕەنگ و ڕووتر بوو، دڵی به ژیان خۆشتر بوو، ئیدی ئەم گەشبینییەی شتێکی سەیر بوو. ئیدی بیرەوەری و یادگاریی منداڵیەتی و هیواو ئاواتی ئازاد بوونی نزیک، ناڕەحەتی قەرەوێڵە چکۆلەکەی، ناخۆشی بۆدووکەڵی مۆمه پیوەکه و دەنگدانەوەی ناخۆشی پێ و هاتوچۆی قەرەوڵ و پاسەوانەکانی بەرداڵانی زندانەکەی، له دڵ و دەروون سووک دەکردەووه.

له زنداندا چیرۆکی "قارەمانی چکۆله" دەنووسێت. چیرۆکەکه له قاڵبێکی ئەدەبی، ڕۆمانتیکیدا، مەسەلەیەکی سێکسی دەنوێنێ. تۆمەتبار بەدەم چاوەڕوانی قەرار و حوکمی دادگاوه، مەسەلەی بێدار بوونەوەی هەست و غەریزەی سێکی لای منداڵێک دەردەبڕێت. ئەم چیرۆکه تا ساڵی ١٨٥٧ بڵاو نابێتەوه.

ئیدی ڕۆژ و هەفتان دێن و دەڕۆن و ئیدی نامەکانی دوستۆیفسکی بۆ براکەی بەره بەره کاڵ دەبنەوه و ئەو جۆش و خرۆش و گەشبینییەی نامەی یەکەمیان تیا نامێنێ. لە نامەیەکی ١٨٤٩/٨/٢٧ دا بۆ براکەی دەڵێت: "دەربارەی خۆم ناتوانم هیچ شتێکی بنجبڕ بڵێم، هێشتا نازانم مەسەلەکەمان چۆن دەکەوێتەوەو بەکوێ دەگات. مەسەلەکه هەر بەنادیاری و وەکو خۆی ماوەتەوه. ژیانم وەکو جاران، یەکهاوی و یەکنەواو ڕۆتینییە. بەڵام ماوەیەکە ڕێگەیان پێداوم که لەباخەکەدا پیاسه بکەم. ئەم باخە هەڤدە درەختی تیایە.

ئەم پیاسەیە دڵم خۆش دەکات. خۆشحاڵیەکی دیکەی من ئەمەیە، کە ڕێگەیان داوم، کە شەوان مۆمێکی باشم هەبێت... ئەگەر بتوانی هەندێ کتێبی مێژووم بۆ بنێریت، کارێکی زۆر چاکە. خۆ ئەگەر تەوراتێکم (بە هەردوو بەشی کۆن و تازەیەوە) بۆ بنێریت، دەها باشتر... دەربارەی تەندروستی خۆم هیچ شتێکی تازەم پێ نییە. نزیکەی یەک مانگی تەواوە من بە ڕۆن گەرچەک دەژیم، ئازاری مایەسیریەکەم ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت. ئازارێک لە سینگمدا پەیدا بووە کە جاران هەستم بە شتی وا نەدەکرد. هەست بە جۆرە بێ شەخسیەتیەک دەکەم. ماوەیەکی کەمە ڕموزن و مۆتەکە پێم فێر بووەو زۆرم ئەزیەت دەدات. وا هەستدەکەم، زەمینە تەختە پۆشەکەی سالوولەکە لەژێر پێمدا دەلەرزێ. دەڵێی لەناو کابینەی کەشتی دام..."

لە بەرواری ١٨٤٩/٩/١٤دا لەنامەیەکیدا دەڵێت: "حاڵم باش نییە، تەندروستیم خراتر دەبێت. گەدەم دێشێت. مایەسیریەکەم ئەزیەتم دەدات. کەی ئەم وەزعە تەواو دەبێت؟ پایز بەڕێوەیە ، لەم وەرزەدا باری تەندروستی و دەروونیم خراپ دەبێ، هەور بەری ئاسۆ دەگرێت، بەڵام وێرای ئەوەش ئەو گۆشە چکۆلەیەی ئاسمانی شین، کە لە سالوولەکەمەوە دیارە، هەم دڵم خۆش دەکات و هەم تەندروستیم پێی باش دەبێت.

لەڕاستیدا، ورەی تەواو ڕوخا بوو. ئەو تەنیاییە سەخت و دژوارەی کە تیایا دەژیا، بەرەبەرە زەیفی لێ دەسەند. جا بۆ ئەوەی خۆی لەو تەنیاییە ڕزگار بکات. لەڕێگای لێدانی دیوارەکەی نێوان سالوولەکەی خۆی و سالووکەی دراوسێیەوە کە فیلیپوفی تێدا بوو، جۆرە تەماسێکی دەگرت، لە بیرکردنەوەو لە نەدیتنی هیچ شتێک وەڕەز بوو، وای هەستدەکرد خراوەتە ژێر چادری بوژانەوەوە. هەستی دەکرد کەتووەتە بۆشاییەکی تەواوەوە، ناتوانێ هەناسە بدات. خەریکە دەخنکێ. نەیدەزانی لە واقیعدا دەژی یا لە خەیاڵ. لە خەودایە یا بێدارە. کاتێ کە منداڵ بوو، هەموو شەوێک پارچە کاغەزێکی چکۆلەی لەسەر تەپڵەکەکەی تەنیشت قەرەوێڵەکەی دادەنا کە لێی نووسرا بوو: "لەوەیە ئەمڕۆ تووشی سەکتەیەک بم. تکایە تا چەند ڕۆژێک مەمنێژن."

ئێستا لە حاڵی بێ ئاگاییدا بوو، بەڕاستی نێژرا بوو. ئیدی بوونی نەبوو.

ئیدی پرسوجۆ و لێکۆڵینەوەی دادگایی ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوو. جار بە جار پرسیاری زۆرتر دەکرا. تۆمەتبارەکان یەک یەک لە پرسیاری قورس و هەمە جۆرتر دەگیران و لێکۆڵەرەکان هەوڵیان دەدا، قسەیان لێدەربێنن. ناو بەناو ئەفسەرێک دەگەڵ پولیسێکدا خۆی بە سالوولێکدا دەکرد، ئەمری بە زندانیەکە دەکرد کە جلکی سڤیل لەبەر بکات، لە ڕاڕەوە درێژ و تاریکەکەوە بەرەو دەرگای دەرەوەیان دەبرد. دوای ئەوەی لە حەوشە وەدەردەکەوتن، خۆیان بە "کۆشکی سپیدا" دەکرد، کە لیژنەی لێکۆڵینەوە لەوێندەر دادەنیشت.

ئەم لیژنەیە لە پینج کەس پێکهاتبوو: میرگاگارین، سەرۆکی پۆلیسی دوبلیت، میر دولگورکی، جەنەڕاڵ روستوڤتزوف و جەنەڕاڵ فەرماندەی قەڵای نابوکوف، کە سەرۆکی لیژنەکە بوو. دوستویفسکی بەوە تۆمەتبار بوو، کە بەشداری

ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانە بوو بوو، کە تیایاندا ڕەخنە لە کارەکانی حکومەت، لە هەبوونی سانسۆر، و لە سیستەمی کۆیلایەتی گیرابوو، هەروەها بەوەش تاوانبار بوو کە نامەیەکی بیلینسکی بۆ گۆگۆل ، لەوێ خوێندبوووەوە، لەم نامەیەدا "جنێو بە کڵێسای ئەرتەدۆکس درابوو و سووکایەتی بە دەسەڵاتی خوای گەورە کرا بوو" هەروەها لە کۆڕی خوێندنەوەی چیرۆکی "سەربهوردی سەربازێک"، لە نووسینی گریگوریف، بەشداری کردبوو، کە "نێوەڕۆک و تیمەیەکی شۆڕشگێڕانەی دەبێ و بانگەواز بۆ شۆڕش دەکات." ئەندامانی لیژنەکە، هەوڵدەدەن، بە زمانی نەرم دۆستویفسکی بخەنە تەڵەوە. (ئەمە هەمان دیمەنی. بەرگری ڕاسکولنیکوفی شا قارەمانی ڕۆمانی تاوان و سزا، لە هەنبەر پورفیری دادڤان و قازی وەبیر دێنێتەوە.) روستوڤتزوڤ بە دوستویفکی دەڵێت: "ئەگەر مەسەلەکەمان بەتەواوی پێ بڵێیت، تزار دەتبەخشێت." دوستویفسکی هیچ وەڵامێکتی ناداتەوە. هەنگێ جەنەڕاڵ، لە سەر کورسییەکەی خۆی هەڵدەستێت و بەهەشتا و لە ژووری کۆبوونەوەکە وەدەردەکەوێت و هاوار دەکات: "من ناتوانم چیتر چڕ و چارەی ئەم دۆستویفسکییە ببینم."

لیکۆڵینەوەو پرس و جۆیەکە بەردەوام دەبێت. دوستویفسکی حاشا دەکات و دەڵێت: "ئەگەر قەرار بێ خەڵکی لەسەر بیرو باوەڕە پەنهانەکانیان بێنەگرتن یا لەسەر بابەت و قسەو باسێک کە بەسوعبەتەوە لە کۆڕێکی دۆستانەدا کرابێت، تۆمەتبار بکەن، کێ هەیە بەبێ تاوان دەربچێت؟"

مەسەلەی خوێندنەوەی "سەربهووردی سەربازێک" بە خوت و خۆڕایی و بەشێوەیەکی چاوەڕوان کراو لێرەدا قوت کرا بووەوە و بەگەڵ ئەم مەسەلەیە خرابوو. لەکاتێکدا هیچ جۆرە هاندانێکی تێدا نەبوو.

بەڵام سەبارەت بە نامەکەی بیلینسکی، دوستویفسکی دان بەوەدا دەنێت، کە بەبێ بیرکردنەوە بەشداری لە خوێندنەوەی نامەکە کردووەو، جۆرە بانگەشەیەکی بۆ کردووە، لەکاتێکا نامەکە شایستەی ئەو بانگەشەیەش نەبووە. دان بەوەشدا دەنێت کە "لیبرالیەتی ئەو "دوستویفسکی" لەو ڕادەیەدا بووە کە حەزی کردووە خزمەتێکی نیشتمانەکەی بکات و کەسێکی بەسوود بێ بۆ وڵات و نیشتمان." هەورەها دەڵێت: "من قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان سوسیالیست نەبووم. هەرچەندە حەزم کردووە، کتێب و سەرچاوان دەربارەی سوسیالیزم و کێشە جڤاکییەکان بخوێنمەوە."

هەڵبەتە ناتوانن، کەمترین قسەی، دژ بە هاوڕێ داماوەکانی، لێدەربینن. هەروەها دەربارەی میشێلی برای، دوستویفسکی بەخوایشتی خۆی دەچێتە ژێر باری مەسئولییەتەوە تا بەزووترین کات ئازاد ببێت، و لەو بارەیەوە دەڵێت: "من دڵنیاتان دەکەم کە براکەم هیچ ئاشنایەتیەکی لەگەڵ پیتراشفیسکیدا نەبوو، لە ڕێگای منەوەو بەهۆی منەوە تەعاروفی لەگەڵدا کردو من لەم ئاشنایەتی و پەیوەندییە بەرپرسم، وەکو چۆن من بەرپرس و سەبەبکاری ئەم بەڵایەم کە بەبسەر براکەم و خانەوادەکەیدا هاتووە. ئەم گرتنە بۆ براکەم سزایەکی گەورەیە، لەکاتێکا ئەو هیچ تاوانیکی نییە."

ئەندامانی لیژنەی لێکۆڵینەوەکە، تیامابوون و نەیاندەزانی بە چ مادەیەکی دادڤانی و بە چ بەندێکی یاسایی، مامەڵە لەگەڵ تاوانێکدا بکەن کە نەکرابوو. ئایا تەنیا نیازی شۆڕشکردن، بۆ مەحکووم کردنی چالاکی و هەڵوێستی ئەم گروپە چکۆلەیە بەسە؟ ئایا ئەم گروپە لیبڕاڵ و ئازادیخوازە، چەنەباز و سەرلێشێواوە، بەڕاستی نیازی شۆڕشیان هەبووە؟ ئەنجامی ئەم کۆڕو کۆبوونەوانەیان بە کوێ دەگەیی و شۆڕشەکەیان چۆن و کەی دەستی پێدەکرد؟
لێکۆڵینەوەو پرس وجۆ، پێنج دانە مانگ بەردەوام دەبێت. لە زەرفی ئەم مودەتەدا، ٢٣٢ کەس، بە تۆمەتبار و شایەدەوە، پرس و جۆی زارەکی یا نووسراویان دەگەڵ دەکرێت. سەرباری پێداگری و سوور بوون و سەختگیری لیپراندی، دوابڕیاڕی لیژنەکە بە بەرائەت و بێتاوانی تۆمەتبارەکان دەشکێتەوە. قەرارنامەی ٨/٣١ی لیژنەکە دەڵێت: "ئەو چاودێریە ورد و جدییەی کە لیپراندی، بەدرێژایی نزیکەی ساڵێک خستبوویە سەر هەڵس و کەوت و ڕەفتاری پیتراشفیسکی، نە ئەو لێکۆڵینەوەو پرس و جۆیە بەردەوامانەی لەگەڵ تومەتبارەکاندا کراوە، ئەوە ساغ دەکەنەوە و دەسەلمێنن کە کۆمەڵەیەکی بەرنامەداری ڕێکخراوی بانگەشەدار لە ئارادا هەبووبێ."
وێڕای ئەوەش وەزیری ناوخۆ داوا دەکات کە جارێکی دی بە دۆسیەکەدا بچنەوە. ئەمجارەیان لیژنەکە قاییل دەبێت کە تۆمەتبارەکان، واتە گروپی پیلانگێران سزا بدرێن. بەو هەنجەتەی کە "لیژنەکە قەناعەتی وایە ئەو کارانەی کە کەشف بوون، خۆی لە خۆیدا، شایستەی ئەوەن حکومەت حیسابێکیان بۆ بکات و لە بنج و بناوانیان بکات."
لە بەرواری ١٨٤٩/٩/٣٠دا، "دۆزەکەی پیتراشفیسکی دەدرێت بە دادگای سوپایی. ئیدی لیژنەیەکی تایبەتی لە شەش ئەندامی مەدەنی و لە شەش جەنەڕاڵ پێک دەهێنرێت، بۆ ئەوەی لە کارو کردەوەی بیست و هەشت گەنجی مەدەنی دژی ئەمن و ئاسایشی وڵات بکۆڵنەوە و ڕادەی مەسئولیەتی هەر یەکێکیان دیاری بکەن. لیژنەی ناڤبری لە ١٦/نوڤەمبەردا قەراری خۆی دەردەکات، بەگوێرەی قەرارەکە حەوت کەس لە زندانیەکان دوور دەخرێنەوە، پازدەیان حوکمی ئیعدام دەدرێن و شەشەکەی دیکەشیان تەبرێ دەکەن.
بەڵام لێکۆڵینەوە وپرس و جۆیەکە لێرەدا تەواو نابێت. تزار بە پێچەوانەی ،هەموو یاساو ڕێسا دادڤانیەکانەوە، قەزیە و فایلەکە هەواڵەی ئەنجوومەنی گشتی دەوڵەت دەکات، کە بەگوێرەی دەقی قانوونی عوروفی توند حوکمی دەکرد. ئەنجوومەنی ناڤبری لە سەرەتاوە حوکمی ئیعدامی هەر هەموو زندانیەکان دەدات. بەڵام پاشان پێشنیاز بۆ تزار دەکات کە حوکمی ئیعدامەکە بگۆڕێت بۆ حوکمی ئەبەدی. دوا قەرار بەم شێوەیە دەردەچێت "دوستویفسکی، لەبەرئەوەی خەڵکانێکی بۆ کارێن تاوانباری هانداوە، نامەی بیلینسکی ئەدیبی خوێندووەتەوە، مەحکوومە بە هەشت ساڵ بێگارە زندان لە سیبریادا." نیکۆلای یەکەم لە پەراوێزی ئەم قەرارەدا دەنووسێت: "بکرێت

به چوار ساڵ و کە تەواوی کرد بەسەربازی ئاسایی بگیرێت. بەڵام داوا دەکات، کە ئەم عەفوو بەخشینە بە نهێنی بمێنێتەوە.

## فەسڵی سێیەم
## سێدارە

تا ١٨٤٩/١ک/٢١، زندانییەکان هیچیان دەربارەی ئەو سزایە نەدەزانی کە بۆیان پڕابووەوە. کەس لێکۆڵینەوەو پرس و جۆی دەگەڵ نەدەکردن. بەرپرسان هیچ زانیاریەکیان نەدەدانی. ئایا بەو زوانە ئازاد دەکرێن؟

لە ١٨٤٩/١ک/٢٢دا، نزیکەی سەعات شەشی بەیانی، گەنجەکان لە دەنگی هەندێ پێیان کە نزیک دەبنەوە، خەبەریان دەبێتەوە. ئیدی دەنگی فەرمانان دێ، دەنگی تەق و هۆڕی پاژنەی پێڵاوان دێت، ڕینگ و هۆڕی شمشێر، بەرزدەبێتەوە. ئەوسا کلیلێک دەخرێتە قفڵی دەرگاکەو بادەدرێت. دەرگا دەکرێتەوە. ئەفسەرێکی پۆلیس لەگەڵ سەرپەرشتیاری زندانەکەدا وەژوور دەکەوێت. داوا لە زندانیانی هەموو ژوورەکان دەکەن کە خۆبگۆڕن و جلکی مەدەنی لەبەر بکەن. ئیدی گروپەکەی پیتراشفیسکی یەک بەیەک بەرەو دەرگای دەرەوە دەبەن.

هێشتا لە ئاستانەی دەرگاکە وەدەرناکەون کە هەوایەکی سارد دەچزێت بە دەموچاوی دوستویفسکیدا، دەکەوێتە لەرزین . بەدەم لەرزینەوە دەڕوانێتە ڕوناکی کزی ئەو بەیانییە تەم و مژاوییە. لەنێو حەوشی زندانەکەدا، کۆمەڵێک گالیسکەی کرێ، بەڕیز وەستاون. ئەسپی جەندرمە و پۆلیسەکان بەدەم جم وجوڵەوە سمکۆڵان دەکەن، دەنگی سم و زین و قایش و قروش و گێز و گوڵینگ لێرەو لەوێ دەنگ دەدەنەوە. پیاوانێک بە جلکی فەرمی شینباوەوە بەڕاست و چەپدا دێن و دەچن.

زیندانییەکان، سواری گالیسکەکان دەکەن. دەنگێکی بەرز هاوار دەکات: "هەر گالیسکەیەک و یەکێک." لە هەر گالیسکەیەکدا یەک جەندرمە لەگەڵ زندانییەکدا سوار دەبێت. پاش ئەوەی هەموو زندانییەکان سواری گالیسکەکان دەکرێن، ئیدی بە دەنگێکی بەرز ئەمر دەکرێت و، کاروانەکە دەکەوێتە ڕێ. و پۆلیسی سوارە بە شمشێری هەڵکێشراوەوە، دەکەونە ئەم لاو ئەولای کاروانەکە. بۆ کوێیان دەبەن؟ ئایا دەیانبەن قەراری دادگای عورفیان بۆ بخوێننەوە؟ ئەگەر وایە، ئەم هەموو تەشریفات و ڕێورەسم و قەرەباڵغیەی بۆ چیە؟

سپشنیف، لەو جەندرمەیەی کە دەگەڵیدا دەبێت، دەپرسێت: "بۆ کوێ دەڕۆین؟" جەندرمەکە پێی دەڵێت: "قسە کردن قەدەغەیە."

گلێرەو باسریشک شووشەی پەنجەرەو دەرگای گالیسکەکان دادەپۆشێت. لەوە دەچوو لە ڕوباری نیڤا بپەڕنەوە، چونکە سمی ئەسپەکان لەسەر تەختەی پردێکی لەقەیاغ دروستکراو دەخزین. ئایا ئەم ڕێگا پڕ بەردو چەوە، ڕێگەی "لیتینایا"یە کە ئێستا لەژێر چەرخی گالیسکەکاندا دەنگ دەداتەوە؟

سپشنیف، هەوڵدەدات، زوقم و بەفرە سپیەکەی سەر شووشەی پەنجەرەی گالیسکەکە بسڕێت. بەڵام جەندرمەکە ڕێگەی نادات و دەڵێت: "شتی وانەکەیت، دەنا من بەر شەلاقان دەدەن."
دوای سێ چارەکە ڕێگا، ئەنجام گالیسکەکان دەوەستن. دەرگاکان دەکرێنەوە. ئێرە مەیدانی تیرەندازی فەوجی "سیمونوفسکییە". شەوێ بەفرێکی زۆر کەوتبوو. سەربانی پاسگاکانی سەربازخانەکە، کە بەخۆیان زەرد بوون. ئێستا لە بەفرا سپی دەچوونەوە. زۆر پاک و تازە دەیاننواند، هەڵم و دووکەڵیان، بە ئارامی لێ بەرز دەبووەوە. ئاپۆرایەکی زۆر لە دوولای مەیدانەکە بەڕیز وەستابوون. بازرگانانی ڕیشن بە پاڵتۆی یەخە فەرووەوە، ژنان بەلەچکەوە کە لەژێر چەناگەیاندا گرێیان دابوون، خوێندکاران بە کاسکێتەوە، فەرمانبەران بە میداڵ و نیشانانی نیشتمانیەوە، تێکڕا سێ چوار هەزار کەسێک دەبوون.
لە ناوەندی مەیدانەکەدا، سەکۆیەکی تەختەی سپی دانرابوو، بەپەردەیەک دەوری گیرا بوو. سەربازان لەشێوەی چوارگۆشەدا لەبەردەم ئەم شوێنە وەستابوون. کەمێک دوور لەوێ سێ ئەستوونی دار لە ئەرزەکەوە سەریان قوت کردبووەوە. نەفەرەکان لە گالیسکەکان دادەگرن. دوستویفسکی، سپشنیف دەناسێتەوە کە وەکو هەمیشە سیمای گەش و غروور ئامێز، گریگوریف بەدی دەکات کە لەترسا نەترەی بەرداوە. پیتراشفیسکی، بەرەو لایان دەڕوات و یەک یەک لە ئامێزیان دەگرێت. لەوکاتەدا، دەنگێکی ترسناک هاوار دەکات: "دەی ڕیز بن"!
قەشەیەک، خاچ و ئینجیل بەدەست، بە جبەیەکی ڕەشەوە، پێش گروپی زندانییەکان دەکەوێت. زندانییەکان بەڕیز دوای دەکەون. هەموو پەشۆکاو، شپرزە و حەپەساو، لەسەر بەفرە شل و تازەکە دەخزێن. یەکێکیان بە دەنگی نزم دەپرسێت: "بەتەمان چیمان لێبکەن؟"
-قەراری دادگامان بۆ دەخوێننەوە، هەمووومان حوکمی ئەبەدین...
-ئەدی ئەم قەنارانە چیە؟
-بەو دارانەوە دەمانبەستنەوە...
-ڕەنگە بیانەوێ گوللە بارانمان بکەن.
-تۆ پێتوایە؟
بیست گەنج بە بەر ڕیزی سەربازەکاندا دەڕۆن، بە پلیکانەی سەکۆدارینەکەدا سەردەکەونە سەرێ. ئەفسەرێک، ناوی مەحکوومەکان دەخوێنێتەوە و سەرژمێریان دەکات. پاشان بەگوێرەی قەرارێکی نهێنی دابەش و جیایان دەکاتەوە: نۆ کەس لەسەمتی ڕاستی سەکۆدارینەکەوە ڕیز دەکات و یازدە کەسیش لە سەمتی چەپدا. لەپشت هەریەکێکیانەوە جەندرمەیەک ڕادەوەستێ. کۆمەڵێک جەنەڕاڵ بە جلکی ڕەسمی یەوە، بە کەش و فش و لەخۆبایی بوونەوە بەدەوری سەکۆدارینەکەدا دێن و دەچن.
دوستویفسکی، لەلای مومبیلییەوە ڕاوەستاوە. زۆر شپرزەو پەشۆکاو دیار نییە. لەوە دەچێ گوێی لەم جموجوڵ و نمایشە پڕ شکۆ سوپاییەی

دەوروبەری خۆی نەبێت. لە فکران ڕاچووە. لە شوێنێکی دیکەیە. لەناکاوا هەست بەوە دەکات کە پێویستە بیرۆکەی ئەو چیرۆکەی کە لەزینداندا بیری لێکردبووەوە و لە خەیاڵی خۆیدا گەڵاڵەی کردبوو، بۆ ئەو کەسەی تەنیشت خۆی بگێڕێتەوە. بەڵام لەناکاوا دەنگێکی گەورە، قسەکەی پێدەبڕێت: "خەبەردار"! کڵاوەکانتان داکەنن.

هیچ کەس لەجێی خۆی ناجوڵێت. پیلانگێڕەکان، نازانن کە لەگەڵ ئەوانیان بوو. دووبارە دەنگەکە لەنێو گروپی جەنەڕاڵەکانەوە بەرز دەبێتەوە: "کڵاوەکانتان داکەنن! ئێستا قەراری حوکمەکانتان بۆ دەخوێنرێتەوە."

جەماعەتەکەی پیتراشفیسکی ئەنجام تێدەگەن کە ئەم ئەمرە بۆ ئەوانە و ئیدی کڵاوەکانیان دادەکەنن. ئیدی بەسەری کۆتەوە لەبەر ئەو سەرما تووشەدا دەوەستن و چاویان ئاو دەکات و ئاو بە ڕوومەتیاندا دێتە خوارەوە.

ئاسمان، ساماڵە، شتێکی درەخشانە. بەفرە زۆرەکە لە ژێر پێی گەنجەکاندا ڕۆچووە و چاڵ بووە. بەفر بەسەر نووکی پێڵاوەکانیانەوە دەدرەوشێتەوە. جەندرمە پاسەوانەکە، لە دواوە هەناسەی گەرمی خۆی دەکات بە پشت ملیاندا. ئەو کابرایەی کە قەرار بوو، دەقی حوکمەکە بخوێنێتەوە. دەچێتە ناوەندی سەکۆ دارینەکە، بە دەنگێکی یەکنەواو خێرا دەکەوێتە خوێندنەوەی دەقی حوکمەکان، بۆ هەر مەحکوومێک، ئەو تاوانانە دەژمێرێت کە پێی مەحکووم کراوە. ئەوسا بەوپەڕی خوێنساردی بەم وشە سادانە کۆتایی بە کۆنووسەکە دێت؛ مەحکومان بە مەرگ: پیتراشفیسکی، مومبیللی، گریگوریوف، ئاکشاروف... یارۆ نۆ حوکمی ئیعدام دەخوێنێتەوە و ئەوسا لەسەری دەڕوات... دوستویفسکی مەحکوم بە مەرگ." دوستویفسکی وەکو ئەوەی لە خەوێکی قورس بێدار بێتەوە، بەو ئاوایە ڕادەچڵەکێ: "ئیعدام" ڕێک لەوکاتەدا هەتاو لەنێو چڕە تەم و مژەکەوە دەردەکەوێت و، قوبە زێڕینەکەی کڵێسای سیمونوفسکی ڕوناک دەکاتەوە کە چلورە و شووشە سۆڵ بە هەر چوار دەوریدا دالەقیوە.

دوستویفسکی هاوار دەکات. "مەحاڵە گوللە بارانمان بکەن." بەڵام مومبیلی، لەجیاتی وەڵام، عەرەبانەیەکی پڕ لە قوماشی جاوی نیشان دەدات. ئەم جاوانە خۆ بەخۆ دیمەنی کفنیان دەنواند. بەڵام لەڕاستیدا ئەمانە کۆمەڵێک جل و بەرگی بەسەر یەکدا هەڵڕژاو بوون.

دوستویفسکی هێشتا حەپەسا بوو، هیچی بۆ دەرنەکەوتبوو. بێ ئختیار سەرنجی لەسەر زیپکەیەکی سەر ڕوومەتی یەکێک لە جەندرمەکان دەگیرسێتەوە. ڕەنگدانەوەی تیشکی سەر دوگمەی مسینی جەندرمەکە سەرنجی ڕادەکێشێت. بە عەمراتی ئەم دیمەنەی لەبیر ناچێتەوە. دەڕوانێتە کابرای مەحزەر بەدەست کە کاغەزەکانی لەسەر هەمان قەدەکانی پێشووی خۆی قەد دەکاتەوەو لە بەرکی دەنێت و بەنووکی قامک گوێی دەخورێنێ و بەکاوەخۆ لە پەیژەی سەکۆدارینەکەوە، دێتە خوارەوە.

ئیدی یەکسەر کەشیشێک دێتە جێگای ئەو. بە دەنگێکی خەمناک چەند وێردو دوعایەکی ناو کتێبی سان پۆلس دەخوێنێ: "سزای گوناح و خەتا،

مەرگە." یارۆی کەشیش، لەهەنبەر ئەم گەنجە بەدبەخت و کڵۆڵانەدا. دەکەوێتە وەعزخوانی کە هیچ شتێک لێرەدا، لەم دنیایەدا کۆتایی نایەت و شادییەکی هەمیشەیی چاوەڕوانی ئەوانەیە کە دەتوانن ژێوان ببنەوە و تۆبە بکەن. ئەوسا خاچێکیان دەداتێ تا ماچی بکەن. لەنێو ئەم مەحکوومانەدا تەنیا شاپوش نیکوف، کە پیاوێکی عامی دەبێت، داوا دەکات کە ڕێگەی بدەن ئیعتراف بکات. بەڵام هیچ کەسێکیان هەستیان بەوە نەکرد کە یارۆی کەشیش، لەو ساتەداو لە ڕووی مەزەبییەوە ئامادە نەبوو گوێ لە ئیعترافان بگرێت.
دوستویفسکی، خاچە زیوینە چکۆلەکە، کە وەکو جەمەد و سەهۆڵ سەخت و سارد بوو، ماچ دەکات و ئەوسا سەر هەڵدەبڕێت. ئیدی هیچ گومانێکی لەلا نامێنێ و بوونی کەشیشەکە لەوێندەر، دوا هیوای ژیان و مانی لادەسڕێتەوە: کێ دەتوانێ بە درۆوە کەشیش و کڵێسا بکات بە شەریک لەم گاڵتە جاڕیەدا؟
بەڵام بە نۆڕینی ئەو سزاکە زۆر قورس بوو، دەگەڵ تاوانەکەدا تێکی نەدەکردەوە. "من شایستەی ئەم سزایە نەبووم." هیچ کەسێك لەوانە شایستەی ئەو سزایە نەبوو. ئەم نەهەقی و بێدادیەی دەرهەق بەوان دەکرێت، گەورەیان دەکات. ئەو بێدادیەی کە لەم گەنجانە دەکرێت، لەم گەنجانەی کە حاڵی حازر لە ناوەندی ئەم مەیدانەدا، لەسەر سەکۆیەکی تەختە ڕاگیراون و لەسەرما هەڵدەلەرزن، دەیانگەیەنێتە پلەی شەهید. ئەوانە بەخۆشیان هەست بەمە دەکەن . بەهەموو بوونیانەوە، هەست بە لەزەتی ئەم قوربانی و فیداکاریە خۆڕاییە دەکەن. پاشان دوستویفسکی لە ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێکدا دەنووسێت: "ئەو مەسەلەیەی کە ئێمەیان لەسەر دادگایی کردو حوکمیان داین. ئەو بیرو بۆچوون و کەڵکەڵانەی کە هەمان بوون. هیچ جۆرە هەستێکی پەشیمانیان لەلا دروست نەکردین، بەڵکو وامان هەست دەکرد، کە ئەشکەنجە، ڕوحمان پاک دەکاتەوە، گەلێک لە گوناحەکانمان پێی (بە ئەشکەنجە) هەڵدەوەرێ."
لەڕاستیدا ئەو بیروبۆچوون و بابەتە ڕێکەوتەکی و ڕەوتەنیانەی کەلە کۆڕو کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەکەی پیتراشیفسکیدا، باس دەکران و گەنگەشەیان لەسەر دەکرا. کە زیاتر خەیاڵ پڵاو و خەون و کاردانەوە بوون، ئێستا ئەو قسەو بیروبۆچوونانە،لە ڕوانگەی ئەوانەوە جۆرە پیرۆزییەکیان پەیدا کردبوو، چونکە لە پێناویاندا، دەمردن. لەم کاتەدا کەشیشەکە لەسەر سەکۆدارینەکە دێتە خوارەوە. دوو کەس لە مەحکوومەکان نزیک دەبنەوە. ئەمانە جەلادن. جلی دەڵب و ڕەنگاو ڕەنگیان لەبەرە. دەستیان گەورەو زبرو تووکن، دەستی پیاو کوژانە. شەپپور لێدەدرێ. چەند تەپڵێک بەیەک کەڕەت لێدەدرێن، وەکو ئاهەنگی تازیەباری لە نێو دیواری سەربازخانەکەدا دەنگدەداتەوە. دەنگەکە کەمێک نەوی دەبێت و جارێکی دی بەشێوەیەکی هێندە بەرز کە گوێ کەڕ دەکات، بەرز دەبێتەوە. ئیدی ئەم دەنگە ناخۆشە کۆتایی نایەت. پیلانگێڕەکان هێنراونەتە سەر چۆکان، جەلادەکان بەدیاریانەوە، شمشێری هەڵکێشراوەوە، کە بۆنی مەرگیان لێدێت، وەستاون. جلی سپی لەبەر پیلانگێڕەکان دەکەن.

جلـی لـە گـوش دروسـتکراو، بـە قـۆڵی درێـژ و کـڵاوی تایبەتیـەوە دیمـەنێکی کۆمیدیان پێدەبەخشێت.
سـێ کەسـی یەکەم، واتە پیتراشـفیسـکی، مومبیلی، و گریگوریوف، بە ئەستوونانی شەرمەزاریەوە دەبەسترێنەوە. جەلادەکان، کڵاوەکانیان دێننە سەر چاویان. ئەمرێکی کورت دەردەکرێت. سـێ سەرباز لە ڕیز دێنە دەرێ و حازر و ئامادە لەبەردەم تۆمەتبارەکاندا ڕیز دەبەستن.
دوستویفسکی چاوانی دەنوقێنێ. شەشەمین کەسی لیستی ئیعدامەکانە، یانی لە نۆرەی دووەمدا، سریەتی. دوای پێنج دەقیقەی دیکە ئەویش بە یەکێک لەم ئەستوونانەوە دەبەسترێتەوە. دوای پێنج دەقیقەی دی بەسەر دنیاوە نامێنێ. نیگەرانییەکی ترسناک بەسەریدا زاڵ دەبێت. نابێ ئەم پێنج دەقیقەیە بە فیڕۆ بدات، دەبێ بە باشترین شێوە سوودیان لێ ببینێ. دەبێ ئەوپەڕی لەزەت لەم چەند دەقیقەیە وەربگرێت، شیلەی شادی پەنهانی لێ بگرێت. ئەو چەند دەقیقە کەمەی کە لەژیانیدا ماویەتی، بەسەر سێ بەشدا دابەش دەکات: دوو دەقیقە بۆ خواحافیزی لە هاوڕیکانی. دوو دەقیقە بۆ ڕامان و بیرکردنەوە، دەقیقەیەکیش بۆ ئەوەی بۆ دواجار سەیری دنیا بکات. بەڵام بیر لەچی بکاتەوە؟ تەمەشای چی بکات؟ تەمەنی بیست و حەوت ساڵە. لە هەڕەتی توانا و بەهرەی خۆیدایە، بەخۆی هەست بەمە دەکات. کەچی مەرگ لەناکاوا بەر دەرکەی پێگرتووە. ئێستا هەیە، زندووە، سێ دەقیقەی دی دەبێ بەهیچ. ڕەنگە ببێ بە شتێکی دی یا مرۆڤێکی دی. دەڕوانێتە گومەزی کڵێساکە. هەرچی دەکات ناتوانێ چاوی لەم گومەزە زێرینە، کە لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دەدرەوشێتەوە، بگوازێتەوە. وا هەست دەکات، لەچاو تروکانێکدا، جگە لەو و لەم تیشکە ئارامە، هیچ شتێکی دی لە ئارادا نامێنێ. دەبن بەیەک، ئاوێتە دەبن، بوونی ئەو دەگۆڕێت بۆ ئەم تیشەکە و بۆ ئەم ئارامییە. لە دنیایەکی نادیاردا دەتوێتەوە. ترسێکی سەیر دایدەگرێت "چ دەبێ ئەگەر نەمرم؟ ئەگەر ژیانم پێبدنەوە؟ چ شادییەکی هەمیشەییە!... هەر هەموو ئەم شتانە دەبن بە هی من. هەنگێ هەر دەقیقەیەکی ژیان دەکەم بە سەدەیەک. تاقە یەک دەقیقەی بە فیڕۆ نادەم. حیسابی هەموو ساتێکی دەکەم. بۆ ئەوەی تاقە یەک ساتی بەفیڕۆ نەڕوات." (بڕوانە ڕۆمانی گەمژە.)
سەربازەکان، لەو ماوەیەدا، تفەنگەکانیان سوار دەکەن. نیشانە دەگرنەوە. یێدەنگیەکی خەمین و بەژان باڵ بەسەر دنیادا دەکێشێت. دەنگی فەرمانی "ئاتەش" بەرز دەبێتەوە. هەر ئێستا ئەم سێ زەلامە، هەرەس دێنن، بە خاویەکی خەمناکەوە، بەردەبنەوە و دەکەونە سەر ئەرزەکە. ئەوان دەبەن و سێ مەحکوومی دیکە دیننە شوێنیان. بەڵام چیە؟ بۆ دەنگی تەقە بەرز نابێتەوە؟ پیتراشفیسکی، بەوپەڕی خوێنساردی و بێموبالاتی، سووچی کڵاوەکەی لەسەر چاوی لادەدات، تا ببینێ مەسەلە چیە: یەکێک لە ئەفسەرە یاوەرەکان، دەستەسڕێک بادەدات. فوو بە بۆقیەکەدا دەکرێت، ڕاگرتنی تەقە ڕادەگەنێت. چەلادەکان پیتراشفیسکی، مومبیلی و گریگوریوف،

لە ئەستوونەکان دەکەنەوە و دەیانبەنەوە بۆ بەر سەکۆدارینەکە. نوێنەرەکەی ڕژێم دووبارە دێتە پێشێ و بەشادییەکی زۆرەوە. ئەو فەرمانی بە خشینە دەخوێنێتەوە کە ئەو ساتە هاتبوو، ناوەڕۆکی فەرمانەکە بەمجۆرە بوو: "ئەو تاوانبارانەی کە بەگوێرەی یاسا شایستەی ئیعدام بوون، بە میهر و دلۆڤانی بێسنووری تزار هاتوونەتە بەخشین."
ئیدی بێگارە زندان، دوورخستنەوە، هەرچیەک دەبێ با ببێ، ئیدی دوستویفسکی دەکەوێتە ژێر هەرەسی شادییەکی یەجگار گەورەوە: لە مەرگ ڕزگاری بوو. دوای ئەوە هەرچیەک دەبێ، با ببێ، گرینگ نییە. دوای بیست ساڵ، بە ژنەکەی دەڵێت: "هەرگیز بیرم نایەت کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوەندە شاد و خۆشحاڵ بوو بم."
بەڵام هەندێ لە هاوڕێکانی، ئەوەندە شەکەت و ماندوو بوو بوون، هێندە لەم گاڵتەجاڕە درۆینەیە پەست و وەڕەز بوو بوون، کە خۆزیایان بە مەرگ دەخواست، بەو مەرگەی کە حاڵی حازر لێی ڕزگار بوو بوون. گریگۆریوف، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، دەلەرزی، دانی بە چیرەوە دەچوون، شێت بوو بوو.
لە سەرەتاوە، باوەڕیان نەدەکرد، کە بە پرس و ڕەزامەندی خودی تزار، ئەم گاڵتەجاڕە ڕێکخرا بێت، بەڵام لەڕاستیدا لە دەرهێنانی خودی تزار بوو، بەدرێژایی دوو ڕۆژان، لە ڕێگای نامەو نامەکارییەوە لەنێوان هەندی دایەرەو دام و دەزگادا، تەگبیری ئامادە کردنی ئەم سیناریۆ گاڵتەجاڕییە کرابوو. چەند ڕووپۆشی سپی ئامادەبکرێت؟ چەند ئەستوون بچەقێنرێ؟ ئەدی گۆڕیش هەڵبکەندرێ؟ ئایا مەحکوومەکان بە ئەستوونەکانەوە ببەسترێن؟ چاویان ببەستنەوە؟ تزار نیکولای یەکەم دەیویست، دەرسێکی باش بەم "گەنجە خۆسەرانە" بدات و عیبرەت وەربگرن، بەڵام لە حەدی تێپەڕاند بوو. لەجیاتی هەستی پەشیمانی و گیانی تۆبە کردنیان لەلا بجوڵێنێ، زیاتر ڕقی هەستاندبوون.
هەڵبەتە، بیرەوەری ئەم سیناریۆی ئیعدامە، لە نەستی دوستویفسکیدا هەر دەمێنێ و لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە. بۆ نموونە لە ڕۆمانی گەمژەدا دەڵێت: "خەڵکانێک هەن قەراری ئیعدامەکەیان بۆ خوێندنەتەوە و بۆ ماوەیەک وازیان لێ هێناون تا بەو عەزاب و ئەشکەنجەیەوە بتلێنەوە. پاشان پێیان گوتوون: "بڕۆن، لێتان خۆش بووین." هەر لەهەمان ڕۆماندا میرزادە میشکین حیکایەتێک دەگێڕێتەوە کە لە هەموو ڕوویەکەوە لە هەمان چیرۆک دەچێت کە لەو مەیدانەدا ڕووی دابوو. فیدور میخائیلوفیچ دوستویفسکی لە ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێکدا دەپرسێت: "دەزانی سزای مەرگ چیە؟ هەر کەسێک بە چاوی خۆی مەرگی نەبینی بێ، لە نزیکەوە تاقی نەکردبێتەوە، نازانێ مەرگ چیە."
دوستویفسکی هەرگیز لەبیری ناچێتەوە، هەرگیز ئەم دیمەنە فەرامۆش ناکات. جەلادەکان، جلە دەڵبەکان لەبەر مەحکوومەکان دادەکەنن. قاپووتی لبادیان لە بەردەکەن، چەکمەی لبادیان لەپێ دەکەن و کڵاوی ئەستووریان لەسەر دەکەن. چەند ئاسنگەرێک سەردەکەونە سەر سەکۆدارینەکە. دەچن

بـەلای پیتراشـفیسـکی یـەوە. کـە قـەراره لەوێنـدەرەوە ڕاسـتەوخۆ ڕەهەنـەی سـیبریا بکرێـت. یـەکێک باوەشـێک زنجیـر هەڵدەداتـە سـەر سـەکۆیەکە، کـە بەتـەق و هـۆر لەسـەر سـەکۆیەکە دەگیرسـێتەوە. ئاسـنگەرەکان زنجیرەکـە لـەپێی پیتراشـفیسـکی دەبەسـتن. پیتراشـفیسـکی، زۆر بـەئارامی یارمـەتی ئاسنگەرەکان دەدات کە زنجیرەکـەی لـەپێیان ببەسـتن. دوای ئـەوە دۆسـتان و هاورێیانی ڕۆژی تەنگانە لەئامێز دەگرێت، دوو جەندرمە ئەم لاو ئـەولای دەگـرن و، بـەدەم زرەوهـۆری زنجیـرەوە بەزەحمـەت لاق دەبزوێنـێ و لـە پلەکانـەوە دادەبەزێ. دەیخەنە ناو گالیسکەیەکەوە. ئەمر دەدرێ ،عەرەبانچیەکـە شـریخە لەقامچیەکـەوە هەڵدەسـتێنێ. گالیسـکەکە دڕ بـە ئـاپۆرای خەڵکەکـە دەدات و تێدەپەڕێت، ئەوسا ئاپۆراکە دێنەوە یەک.

مەحکوومەکان، لەسەرما هەڵدەلەرزن. یەکێک دەڵێت: "کەپووتان هەڵگلۆفن." یەکێکی دی دەڵێت: "دەموچاوتان هەڵگلۆفن، بەستوویەتی." کاچکین و پالم دەکەونە سەرچۆکان و دەکەونە نویژو نزا: "خوا دەست بە باڵی ئیمپراتۆرەوە بگرێت. تەمەنی درێژ بێ."

دوای ئەوە، گالیسکەکان، مەحکوومەکانیان بردەوە بۆ قەڵای "پتروس و پوڵس". پاش ئەوەی مەحکوومەکان دەگەنەوە زندان، دکتۆرێک یەک یەک معایەنەیان دەکات. تا بزانێ ئاخۆ لەژێر گوشاری ئەو ڕووداوەدا ئەقڵیان تێک نەچووە. ئەوجا یەک یەک بەسەر سالوولەکانی خۆیاندا دابەشیان دەکەنەوە.

دوستویفسکی هەرکە دەگاتەوە سالوولەکەی خۆی، نامەیـەک بـۆ میشـێلی برای دەنێرێت و دەڵێت: "هەموو شتێک ڕوون بووەوە، مـن حـوکمی چـوار سـاڵ بێگارە زنـدان دراوم و (وابـزانم لـە ئورنبـوگ دا بەسـەری دەبـەم) پاشـان دەبـێ وەکو سـەربازێکی ئاسایی، پەیوەندی بەڕیزی سوپاوە بکەم. ئێسـتا خەبـەرمان زانی کە ئەمڕۆ یا سبەی ڕەوانـەمان دەکـەن. مـن داوای دیـداری تـۆم کـردووە، بـەڵام دڵنیایـان کـردم کـە شـتی وا مەحاڵـە. براکـەم، لێیـان نـەداوم. ورەم نەڕوخاوە، نەترەم بەرنەداوە، ئیـدی ژیـان لـە هـەموو شـوێنێ هـەر ژیانـە. ژیـان لەبوونی ئێمەدایە، لە دڵ و دەروونماندایە، نەک لەو دنیایەی کـە دەوری داویـن. لە نزیکی منەوە پیاوانێک هـەن، قـەرارم داوە پیـاوی نـاو پیـاوان بـم، هەمیشـە پیاوبم، لە هیچ وەزع و حاڵێکدا لاوازی نەنوێنم، ورە بەر نەدەم، نەڕوخێم. ئیـدی ئەمە ژیانە. ئەمە مانای ڕاستەقینەی ژیانە. من لـەم مانەیـە تێگەیشـووم. ئـەم بیرۆکەیە تێکەڵ بە گۆشـت و خـوێنم بـووە... لەوەیـە یەکـدی ببینینـەوە براکـەم. ئاگاداری خۆت بە. توزاتی خوا هەوڵبدە بژی. بە هیوای دیدار. لەگینـە ڕۆژێ لـە ڕۆژان، یەکدی لە ئامێز بگرین، بـە یەکـدی شـاو شـوکور ببینـەوە، یـادی ژیـانی ڕابـردووی خۆشـی خۆمـان، قۆنـاغی گەنجیـەتی خۆمـان، یـادی ئـەو هیـواو ئاواتانـەمان بکەینـەوە کـە حـاڵی حـازر لـە دڵـی خـوێنینی خـۆمم دەرهێنـاون و ناشـتوومن. تـۆ بڵێـی جـارێکی دی قەڵـەم نەگرمـە دەسـتەوە؟ نـەخێر شـتی وانییە. تەسـەور دەکەم دوای چوار ساڵی دیکـە بتـوانم قەڵـەم بگرمـە دەسـت. خۆ ئەگەر قەڵەم بکرێم، قەڵەمم لێ قەدەغە بکرێـت، ئـەوا دەمـرم . مـن پـازدە ساڵ زاندانیم بە قەڵەمەوە پێ باشـترە لـە چـوار سـاڵ زنـدانی بـەبێ قەڵـەم.

ئەگەر کەسێک یادەوەرییەکی خراپی دەرهەق بە من هەیە، ئەگەر پەیوەندیم دەگەڵ هەندی کەسدا پڕیوە، ئەگەر هەندێ کەس گلەییان لێم هەیە، ئەوا ئەگەر تووشیان بووی بەناوی منەوە داوای بوردنیان لێبکەو پێیان بڵێ گەردنم ئازا بکەن و لاپەڕەیەکی تازە هەڵبدەنەوە. چونکە من هیچ شتێکم لە دڵدا نییە، نەڕقم لێیانەو نە خراپەیانم دەوێ، لەم ساتەدا حەزدەکەم هەر هەموویان لە ئامێزبگرم، هەموویانم خۆشدەوێ، کاتێ تەمەشای ڕابردوو دەکەم، بیر لەو هەموو کاتە دەکەمەوە کە بەفیڕۆم داوە، بەسەر گەردانی بردوومەتە سەر، بیر لەو هەموو هەڵەیە دەکەم کە لە نەزانیەوە کردوومە، جەرگم خوێن دەدەڵێنێ. ئەگەر عەمر باقی بێ و تەمەن مەودا بدات، بە باشترین شێوە خۆم بگۆڕم و، هەموو هیواو ئاواتێکم هاتووەتە سەر ئەمە. ئاه، ئاخۆ کەی تۆ دەبینمەوە؟ چ کاتێک؟ جارێ خواحافیز، من دەست بەرداری هەموو شتێک دەبم. لە هەر هەموو ئەو شتانەی کە خۆشم ویستوون، دوورم. زۆر دژوارە پیاو لە هەموو ئەو شتانە دابڕێت. زۆر زەحمەت و دژوارە پیاو ببێ بە دوو بەشەوە. دڵی ببێ بە دوو بەشەوە. بەدوعا، خواحافیز!... هەڵبەتە جارێکی دیکە دەتبینمەوە، من دڵنیام دەتبینمەوە، هەموو خۆزیایەکم ئەمەیە. دەرهەق بە من مەگۆڕێ. خۆشت بوێم. لەبیرم مەکە، لە یادگەی خۆتم مەسڕەوە. هەموو شادیەکم ئەوەیە کە لە بیرم نەکەی. جارێکی دی خوا حافیز. خودا حافیز لە هەمووان، لە هەموو کەسێک"

قەرار وابوو لە ٢٤/ک١ دا، لە شەوی جەژنی نوئیلدا دوستویفسکی ڕەوانەی سیبریا بکەن. میشێلی برای و "میلیوکوف"ی نووسەر، مۆڵەت لە فەرمانڕەوای قەڵاکە وەردەگرن کە بەر لە ڕەوانە کردن، دیدەنی دوستویفسکی بکەن، دیدارەکە لە بارەگای فەرمانڕەواکە، لە هۆڵێکی گەورەی ڕوت و ڕەجاڵی، نیمچە تاریکدا، کە یەک چرای تیا بوو، لە نزیکی نیوە شەودا ئەنجام دەدرێت.

میشێل و هاوڕێکەی نزیکەی نیو سەعاتێک چاوەڕوان دەکەن. تا فیدور میخائیلوفیچ و دوروفیان بۆ دێنن. هەر دووکیان خەندان و ئاسوودە بوون. میلیوکوف پاشان دەنووسێت: "کە خودا حافیزی برایانی دوستویفکسی"م لێکدی بینی، وام هەست دەکرد ئەوەی کە زیاتر ئازاری دەچەشت، ئەوەیان بوو کە لەسان پتروسبۆرگ دەمایەوە، نەک ئەوەی هەواڵەی تاراوگەی سیبریا دەکرا. ڕوندک بینایی چاوانی برا گەورەکەی لێڵ دەکرد. لێوەکانی بە تووڕەییەوە دەلەرزین. فیدور، بەهێوری دڵخۆشی براکەی دەدایەوە و دەیگوت: بەسە، کاکی خۆم. تۆ من دەناسیت، نە من بۆ گۆڕستان دەبرێم و نە تۆش دوای کاروانی جەنازەکەی من دەکەویت. خۆ ئەوانەشی کە لە زیندان و تاراوگەدا تووشیان دەبم ئاژەڵ نین. ئەوانیش وەکو من بەشەرن. ڕەنگە زۆریش لەمن باشتر بن، لە من خانەدانتر بن... کە لە زندان ئازاد بووم، دووبارە دەست بەکاری نووسین دەکەمەوە. من لەم چەند مانگەی دواییدا زۆر شتم جەڕباندووە، دیارە لەوێندەرش، لە تاراوگەشدا، زۆر شتی دی دەبینم و دەجەڕبێنم و ئەزموونی دەوڵەمەند پەیدا دەکەم و بێگومان کەرەستەو تیمەی زۆرم لا کەڵەکە دەبێت کە بینووسم."

ئەم پیاوە، کە چەند هەیڤەک لەوەپێش، وەختایەک لە ژینگەیەکی تەواو ئازادا دەژیا، هەزارو یەک سەریەشەو کێشەی بۆ خۆی چێدەکرد. کە شەوی لێدەهات بەدەم خەم و پەژارەوە دەتلایەوە. دەگەڵ خودی خۆیدا بەشەڕ دەهات. بە بچووکترین شت دەهاڕووژا، کەچی ئێستا بەو پەری ورە بەرزی و ئارامی ئەزموونی چوونە سەر سێدارە و و کول و کۆڤانی جودایی، دەگوزەراند و تەحەموول دەکرد. ئەوەی سەیر بوو، ئەم پیاوە ئاڵۆز و دەغەزارە چ لە ڕووی جەستەیی و چ لە ڕووی دەروونییەوە، بەهەموو هەستیارییەکی خۆیەوە، ئێستا هیچ باکی بە چوار ساڵ سەرما، مەینەتی و بێگاری نەبوو. هەڵبەتە نابێ ئەمەمان پێ سەیر بێ، چونکە دوستویفسکی، کەسێکی زۆر هەستیار و لەڕادەبەر عاتفیی بوو، کەسێک بوو تەنیا لە حاڵەتە ئاوارتەو ڕیز پەڕەکاندا ئارامی دەگرت و ئۆخەی دەکرد، لە ناوجەرگەی گەرداوانددا، بەباشی هەناسەی دەداو ئۆخژنی لە دڵ و دەروون دەگەڕا. لە یاداشتە ژێر زەمینییەکاندا دەڵێت: "من لەژیانمدا ئەو کارانەم کردووە و گەیاندومنەتە سەر، کە ئێوە ناتوانن تا نیوەشی بەرن." ئەوسا لەسەری دەڕوات: "لەبەر ئەمەیە کە ڕەنگە من لە ئێوە زندووتر بم."

دوای نیو دانە سەعات، ئەفسەری خەفەر هەردوو زندانییەکە دەباتەوە بۆ سالوولەکانی خۆیان، ڕێک لە نیوەشەودا، پێوەندانی ئاسن، کە کێشیان پێنج دانە کیلۆ بوو، لە گوزینگی پێییەکانی دوستویفسکی دەبەستن. دوای ئەوە فیدور میخائیلوفیچ و، دوروف و، یاستر جمبسکی، دێننە ناو حەوشەی زندانەکە.سێ دانە خزاکی سەر والای سێ ئەسپە چاوەڕوانیان بوو. گالیسکەیەکی سەرداخراوی پۆستەبەری وەزارەت لەپێش خزاگەکانەوە وەستا بوو، قەرار بوو تاکو توبولسک لەگەڵیاندا بڕوات. دنیا ساردو سایەقەو ڕوناک بوو. هەڵمێکی شینباو لەدەم و قەپۆزی ئەسپەکانەوە دەهاتە دەرێ.

جەندرمەکان، زندانییەکان سواری خزاگەکان دەکەن و بە خۆشیان لە تەنیشتیانەوە سوار دەبن، بەگوێرەی فەرمانی یارۆی پۆستەبەری وەزارەت، کاروانەکە، بەناو بەفرو بەستەڵەک داو، بەدەم قرچە قرچی شکانی جەمەد و بەستەڵەکەوە دەکەوێتە ڕێ.

میشیل دوستویفسکی و میلیکوف، کە لەبەر دەرگای زندانەکە وەستا بوون، بەدەنگی بەرز هاوار دەکەن و بەڕێبوارەکان دەڵێن: "خودا حافیز"و ئەوانیش بەرسڤیان دەدەنەوە: "بەهیوای دیدار." خزاگەکان، بەلەز بە کۆڵانە کش و مات و چۆڵەکاندا دەڕۆن. پەنجەرەی ماڵەکان ڕوناک بوون، دارکاژی نوئیل، سەراپا ڕوناک و ڕازاوە بە گێز و گوڵینگ و ئەسپاب وازی ڕەنگاو ڕەنگ. سێبەر و تارمایی ژنان و پیاوان بەدەم ڕەقسینەوە، لەسەر پەردەی تەنکی پەنجەرەکانەوە، دەردەکەوتن. ئەو شەوە شەوی جەژنی نوئێل، جەژنی دڵخوازی دوستویفسکی بوو. خەڵکی شادو بەکەیف ئاهەنگ دەگێڕن. پێدەکەنن، دەخۆن، دەخۆنەوە، منداڵەکانیان لە هەمیز دەگرن، نەوازشیان دەکەن، بیر لە کاروباری ئایندەی خۆ دەکەنەوە. کەس لەو ساتەدا لە بیرو خەیاڵی ئەوەدا نەبوو، کە سێ پیاو، لەناو خزاکانی کرێدا، خزاکێن سێ ئەسپەدا، لەسەرما

هەڵدەلەرزن و، خۆ گرمۆڵە دەکەن، هیلاک و ماندوو، خەمین و بە پەژارە، لە سان پتروسبۆرگەوە بەرەو زندان و تاراوگەی سیبریا دەبرێن و بەڕێوەن.
دوستویفسکی پاشان، لە ساڵی ١٨٥٤دا لە نامەیەکیدا بۆ براکەی دەڵێت: "کە بەناو سان پتروسبۆرگدا تێدەپەڕین. زۆر بەتاسەو تامەزرۆیی تەمەشام دەکرد. بە بەر ماڵەکەی تۆدا ڕۆیشتین . ماڵەکەی کرایفسکی تەواو ڕوناک بوو. لێرەدا خەمێکی کوشندە دایگرتم. چونکە تۆ بەخۆت پێت گوتبووم کە لەوێدا درەختی نوئێل دەڕازێننەوە و ئیمیلی و فیدورفنا، منداڵەکان بۆ ئەوێ دەبەن. لەو ساتەدا وام هاتە بەرچاو کە خواحافیزیان لێدەکەم. چەندم خەفەت خوارد. چەندم بیر دەکردن. دوای چەندین ساڵیش کە ئەو دیمەن و بیرەوەریەم وەیاد دەهاتەوە چاوانم تەژی ڕوندک دەبوون."!
هەڵبەتە سەفەرەکەیان زۆر سەخت و ناڕەحەت بوو. خزاگە سێ ئەسپەکان سەریان واڵا بوو. ئەو فەروانەی کە لەبەر زندانییەکاندا بوون، کورت بوون، وەکو پێویست لەو سەرما تووشەی نەدەپاراستن. دوای ئەوەی چەند جارێک، بۆ ئیسراحەت و پشوودان لە چەند وێستگەیەک لایاندا، کاروانەکە لەبەرەبەیاندا، لە ئوتێلی شلیسلبورگدا لایدا. هەر سێ زندانییە گەنجەکە، بەدەم بکێش کردنی زنجیرو پێوەندەکانیانەوە، لەکاتێکا فویان بە قامکە تەزیوو ڕچیوەکانیاندا دەکرد، چوون بۆ هۆڵە گشتیەکە تا سەرو کوپ چای بخۆنەوە. دۆستویفسکی لە وەسفی ئەو دیمەن و ڕووداوەدا دەنووسێت: "من خۆشحاڵ بووم. دوروف لەپەستاو بێ پسانەوە قسەی دەکرد. یسترجمبسکی، ڕەشبین بوو وئایندەی تاریک دەبینی."
یارۆی پۆستەچی وەزارەت کە پیرەمێردێکی باش وبە ئەزموون بوو، قاییل بوو کە گالیسکەی سەرگیراو بۆ زندانییەکان فەراهەم بکرێت. هەروەها بەڵێنی دا، کە لەنێوان قۆناخ و وێستگەکاندا ماوەیەکی زیاتر بۆ پشوودان و ئیسراحەت،بوەستن و نیوەی خەرجیەکانیش لە ئەستۆی خۆی بگرێت.قافڵەکە دەمەو نیوەڕۆ کەوتە ڕێ. عەرەبانچیەکان، بە بۆنەی ئاهەنگ وجەژنی نوئێلەوە، چاکەتی ماهوتی کەوەیی ئەڵمانییان لەبەر کردبوو و قوماشی ئەرخەوانییان لەسەر بەستبوو.گوندەکان لە چۆڵ دەچوون. سەربانی خانووەکان لە بەفرا دەچریسکانەوە، لق و پۆپی درەختان بێ جوڵە، ڕەق ڕاوەستابوون، لە تۆ وایە لە ئاوێکی بەستوودا نقوم بوون. ئاسمانی ساماڵ وسایەقە، شینێکی ئامال سەوز بوو.ماوەی نیوان ویستگەیەک و وێستگەیەکی دی دە سەعاتە ڕێگا بوو. ئیدی هەم ئەسپەکان وهەم ڕێبوارەکان بە ڕادەیەک ماندوو دەبووک، پرزەیان لێدەبڕا. سەرما لە کێشانەبوو. کە گەیینە شارۆچکەی پیرم، سەرما گەییە چل ژێر سفرەوە...
تێپەڕین بە چیاکانی ئوراڵدا، کارەساتێک بوو لەو گۆڕە.ئەسپەکان لە نێو گێژەڵووکەی بەفرا ڕێیان دەر نەدەکرد و بە هەموو لایەکدا دادەخزین. گالیسەکە و خزاگەکان، دەچەقین و لەبەفرا ڕۆدەچوون، ئیدی رێبوارەکان ناچار بوون بەو نیوە شەوە تاریکە دابەزن و پاڵ بە خزاگ و گالیسکەکانەوە بنەن و لە بەفریان دەربێنن. ئەسپەکان هێور بکەنەوە و بەفرەکەی پێشیان تەخت بکەن.

بەفرەکە بەدەم باوە گێژی دەخوارد و وەکو قامچی دەچزا بە دەموچاو و دەستدا، تیشکی کزی چرای گالیسەکەکان، بە جۆری پرتە پرتی دەکرد. کە تەسەور دەکرا لە هەر ساتێکدا بکوژێنەوە. دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەنووسێت: "چوار دەورمان، بەفر و بەستەڵەک و گێژەڵووکەی بەفر بوو... بەردەممان سیبریاو ئایندەی نادیار بوو، پشتمان یەکپارچە ڕابردووی خەمناک بوو، بەڕاستی دیمەنێکی خەم ئەنگێز بوو، بۆیە هۆن هۆن گریام."

لە ڕۆژی ١١/ک١/١٨٥٠دا، دوای هەژدە ڕۆژە ڕێگا، ئەنجام زندانییەکان گەیینە توبولسک. لەم سەروبەندەدا توبولسک مەڵبەندی دابەشکردنی زندانییان بوو بەسەر حەپسخانە جۆراو جۆرەکاندا. هەرکە سێ زندانییەکە دابەزین، یەکسەر ڕادەستی نووسینگە و ئۆفیسی زندانەکان کران.

ئەم شوێنە تاریکانە، هەندێ فەرمانبەر و کارمەندیان، بە جلی فەرمی تایبەتی زندانەوە تیابوو. ئەمانەش زندانی بوون و هەندێ پیتی نەنگین بەنێوچەوانیانەوە بوو. هەموو کەپوو درێژ و دەموچاویان جێ زام بوو، ئیدی بەهەمن چالاکی و چەلەنگی قوتابیانی ناوەندییەوە، تۆمارەکانیان دەنووسی سەرپەرشتیاری زندانەکە پرسی:

-باشە ئەمانە زنجیر کراون؟

-بەڵێ.

-دەی بیان پشکنن.

گیرفانیان گەڕان، پارەکانیان لێسەندن، بوتڵێک شەرابی ڕۆمیان لە ڕێگادا کڕی بوو، ئەوەشیان لێسەندن. پاشان بردیانن بۆ هۆڵی گشتی، کە "بریتی بوو لە ژوورێکی تەنگ و تاریک و سارد و پیس" سێ قەرەوێڵەی سەفەری بچووکی تیابوو، کە سێ بەناو دۆشەکی لەگونیە دروستکراوی ناواخن کاو کۆتاییان لەسەر بوو. بۆنی گۆشتی بۆگەن و پیوی بەستوو لە شوێنەکە دەهات. ئیدی لە هەر چوار لاوە دەنگی هاوار و جنیو و پێکەنینی خەڵکی دەهات. کە هەراو هەنگامە و دەنگەکان کپ دەبوونەوە، ئیدی دەنگی پێی قەرەوڵ، لەپشت دەرگاکەوە دەهاتە گوێ.

دوروف، لەسەرما دەست و پێی سڕ بوو بوون. بسترجمبسکی، سەری لووتی بەستبووی. دوستویفسکی، زیپکەیەک لە زاری هاتبوو و حەواندنەوەی لێهەڵگرتبوو. وێڕای ئەمەش جم و جوڵێکی گەرم و گوڕ، لەنێو دانیشتوانی ئەم ژوورەدا هەبوو. مەحکوومەکان خۆیان بۆ دوا قۆناغی سەفەرەکەیان ئامادە دەکرد. بەرپرسان، زنجیر و پێوەندەکانیان ڕێک دەخستن، سەریان سفر دەکردن. نیشانە و مۆری نەنگ و شەرمەزارییان، بە باسک و شانەوە دەنان، ئەم نیشانانە مانای نهێنی و جیاوازیان هەبوو: " KAT=واتە مەحکووم بە بێگارە زندان.. sk=واتە دوورخراوە، SK=واتە مەحکووم بە بێگارە زاندنی فیرار."

ئەگەر هەر زندانییەک هەوڵی هەڵاتنی بدایە، مۆرێکی تازەیان بە باسکیەوە دەنا. دیارە ئەم کارانە لەلایەن خودی مەحکوومەکانەوە ئەنجا دەدراو بە چارەی گرژ و مۆن و لەناچاریدا ئەم کارەیان دەکرد، هەڵبەتە زۆر ناخۆش بوو و زۆریان لەبەر گران بوو. یاسترجمبسکی، زۆر بێزار بوو، بەدەنگی بەرز گلەیی دەکرد و

باسی خۆکوژی دەکرد. دەنووسێت و دەڵێت: "بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر ئێستا خوشکەکەم لێرەبا و بەم حاڵەوەی دیتبام، ئاخۆ چی دەگوت." دوستویفسکی دڵی دەدایەوە.

دوای ئەوە مۆڵەت وەردەگرن تۆزێک چای بخۆنەوەو ئەو جگەرانە بکێشن، کە دۆستویفسکی توانی بووی لەکاتی پشکنینەکەدا، لە پشکنەرەکەی بشارێتەوە.

فیدرو میخائیلوفیچ وهاوڕێکانی شەش ڕۆژ لە توبولسک دەمێننەوە. هەندێک لە دیسامبەرییەکان (شۆڕشگێڕانی کانوونی یەکەم) لەم شارەدا دەژیان. ئەمانە ماوەی زندانی خۆیان تەواو کردبوو، واتە لە بێگارە زندان ڕزگار بوو بوون، بەڵام بۆ ئەوەی سزای خۆیان تەواو بکەن، دەبوایە بەناچاری لە تاراوگەی سیبریادا بژین، ئەمانە بریتی بوون لە: موراڤیف، ئانانکوف، ڤون ڤیزن... ژنانی ئەم پیاوانە، کاری خێرخوازیان دەکرد و بەگوێرەی توانای خۆیان خزمەتی ئەو زندانییانەیان دەکرد، کە بۆ چەند ڕۆژێک لە ژوورە پیس و پۆخڵەکانی شارەوانیدا، لێرە دەمانەوە و دڵخۆشیان دەدانەوە.

کاتێ ئەم شۆڕشگێرانەی ساڵی ١٨٢٥، بە هاتنی ئەو کەسانەیان زانی کە وەکو ئەوان لەپێناوی ئازادیدا خەباتیان کردبوو، وەکو ئەو بەر چەپۆکی حوکمێکی ناڕەواو ستەمکار کەوتبوون، زۆریان لەبەر گران دەبێت، دەکەونە هەوڵی ئەوەی یارمەتیەکیان بدەن، ورەیان بەرزبکەنەوە، دڵخۆشیان بدەنەوە. ژنانی ئەم دوورخراوانە، خواردن و خواردنەوە بۆ تازە مەحکوومەکان دەبەن و داوا لە سەرپەرشتیارەکە دەکەن، کە ڕێگەیان بدات، کە لەماڵەکەی خودی سەرپەشتیاردا، دیدەنی ئەو تازە مەحکوومە گەنجانە بکەن.

دوستویفسکی پاشان لە کتێبی ڕۆژانە یادشتەکانی نووسەرێکدا لەمبارەیەوە دەنووسێت:"کۆمەڵێک ژنی فیداکاری گەورەمان بینی کە بە خوایشتی خۆیان، کەوتبوونە دووی مێردەکانیان بۆ سیبریا، ئەمانە بێئەوەی هیچ خەتایەکیان کردبێ، بەدرێژایی بیست و پێنج دانە ساڵ، هەمان ئەشکەنجە و عەزابیان کێشا بوو، کە مێردەکانیان کێشابوویان."

دیدارەکەیان، یەک سەعاتی خایاندبوو. هاوسەرانی "شۆڕشگێرانی کانوون" دوعای خێریان بۆ مەحکوومەکان "دوستویفسکی و هاوڕێکانی" کردبوو و سەرو ئینجیلیان بە دیاری دابوو بە هەر یەکێکیان. ئینجیل تاقە کتێبێک بوو کە لە زنداند ڕێگەی خوێندنەوەی دەدرا. دوستویفسکی ئەم دیارییەی زۆر پێخۆش و هەمیشە پێی بوو.

کاتێ کە ژنەکان دوعاخوازی دەکەن و دەڕۆن، دوستویفسکی دەڕوانێتە ئینجیلەکەی دەستی خۆی، بەرگەکەی لەناوەوە درزی برد بوو، سەیر دەکات ئەسکەناسێکی دە ڕۆبڵی خرابووە بەینی ئەو درزەوە.

لە بەرواری ١٦/ک٢/دا، دوستویفسکی و دوروف لە توبولسکەوە ڕەوانەی ئومیسک دەکرێن، لە فەرمانی حوکمداری سیبریای ڕۆژئاوادا هاتبوو کە زۆر بەتوندی وبێهیچ چاو پۆشییەک مامەڵە دەگەڵ ئەو دووانەدا بکرێت.

لە حەوت هەشت کیلۆمەتری توبولسکدا، عەرەبانەکە لە دەشتێکی چۆڵ و هۆڵدا دەوەستێت. تومەز هەردوو خانم ڤون ڤیزن و ڤرانتسیف، دەمی جەندرمەکانیان چەور کردبوو، بەرتیلیان دابوونێ، کە لەوێدا ڕێگا بدەن کە دیدەنی مەحکوومەکان بکەن و خواحافیزیان لێبکەن. ئەم ژنانە وەکو تارمایی وتاپۆی چکۆلە لەنیو بەفرەکەدا وەستابوون. دیدارەکەیان کورت بوو: خانمەکان تەوقە دەگەڵ زندانییەکاندا دەکەن، دڵخۆشیان دەدەنەوە، ورەیان بەرز دەکەنەوە، پێیان دەڵێن: "خەمتان نەبێ، نامەمان بۆ ئومسک ناردووە کە ئاگایان لێتان بێ، خەمتان نەبێ لەوێ ئاگایان لێتان دەبێ و هەوڵدەدەن یارمەتیتان بدەن و..." جەندرمەکان، بەبێ سەبرییەوە، لە دووری چەند هەنگاوێک، بەدەم چاوەڕوانییەوە دەوەستن، جووتە خانم، نیشانەی خاچ بەسەر سەری زندانییەکاندا دەکێشن و دوعایان بۆ دەکەن: "مەسیح ئاگای لێتان بێت."

دوستویفسکی و دوروف، سواری گالیسکەکەیان دەبن. عەرەبانچیەکە خەریکی خواردنی شتێکە. قامچیەکەی بادەدات و کاروانەکە بەدەم زرینگ و هۆڕی زەنگۆڵانەوە، هێدی هێدی بەسەر جادە سپیە دوورو درێژەکەدا بەرەو "خانەی مردووان" دەکەوێتەڕێ.

## فەسڵی چوارەم
## بێگارە زندان

لە ١٨٥٠/٢ک/٢٣دا، دوای سێ ڕۆژە ڕێگا، بەدەشتی چۆڵ وهۆڵدا، بەناو بەفرو باو بەستەڵەکدا، سەرەنجام دوستویفسکی ودوروف دەگەنە مەنزڵ. قەڵای ئومسک، کەوتبووە چاڵاییەکەوە، کە هەزار و پێنج سەد دیرەکی دار بەرووی لە شێوەی حەساردا لە دەور چەقێنرا بوو. بینای بەڕێوەبەرایەتی قەڵاکە، دایەرەی ئەندازیاران و بینای سەرکردایەتی گشتی، لەناو قەڵاکەدا بوون، لەدوای ئەو بینایانەوە، هەندی کۆنە سەربازخانە، کە لە قەدی نەتاشراو و ناهەمواری درەختان دروست کرابوون، بەدی دەکران. لە دوورترەوە، عەماری گەنم و کەپر و مووبەق هەبوو، مەیدانێکی زۆر گەورەو چۆڵ لەناوەندی حەسارەکەدا هەبوو، بۆ ڕیزکردن و سەرژمێری زندانییەکان.

فەرماندەی پایەگای تاراوگەی ئومسک، کابرایەکی جینگینی، عەبووسی، ترسناک بوو، بەنێوی کریفتزوف، بەڵام زندانییەکان لەنێو خۆیاندا نێوایان نابوو "ڤاسکای هەشت چاو"، چونکە هیچ شتێک لە نیگای وردو کونجکاوی ئەو دەرباز نەدەبوو. ئاگای لە خشەی مارو مێرو بوو.

کریفتزوف، پیاوێکی زۆر گەوج، لەخۆبایی و زبر و دڵڕەق بوو. ئەو بیرو خەیاڵەی کە دەسەڵاتی ئەو سنووری نییە، سەرمەستی دەکرد. ئەمە جگە لەوەی مەستیی کۆنیاک و شەرابیش، هێندەی دی ئەم غرووری سەرمەستیەی زیاد دەکرد. شەرابخۆر و مەینۆشێک بوو لینگەی نەبوو، بەردەوام دەیخواردەوەو تێر نەدەبوو.

کاتێ کریفتزوف، خۆی بە هۆڵەکەدا دەکرد، گڕ لە چاوانی دەبووەوە، بەدەم جوێن و قسەی ناشیرینەوە کەفی دەپرژاند، کام زندانییە زۆر بەورە و دلێر بوو، لەترسا وەکو منداڵ دەلەرزی. جاری وا هەبوو لەنیوەشەودا ڕادەبوو، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە داماوە بپشکنێت و پرسو جۆ و لێکۆڵینەوەیان دەگەڵدا بکات، هەڵبەتە مامەڵەی پەزو ئاژەڵانی دەگەڵ دەکردن. ئیدی بە قژی بژەوە، مەست و خومار، لەناوەندی خەوتنگەکەدا دەوەستا، لەکاتێکا بەخۆی لە مەستیا لەتری دەدا، باسی زەرەر و خراپی بادەنۆشی، بۆ زندانییەکان دەکرد.

دوستویفسکی لە نامەیەکیدا بۆ براکەی، لەبارەی ئەو پیاوەوە دەڵێت: "هەندێجار، جنێوی بەزندانییەکان دەدا کە بۆچی لەسەر تەنیشتی ڕاست نەخەوتوون، یان بۆچی بەدەم خەوەوە هاواریان کردووە یا وڕێنەیان کردووە..." سزای زندانییەکان هەمیشە هەر هەمان سزا بوو؛ دارکاری. کریفتزوف، مانگانە، ڕاپۆرێکی دەربارەی ڕەفتارو ئەتواری زندانییەکان دەنووسی و بۆ ئیدارەی باڵای دەنارد.

سکاڵای زیندانییەکان، هەر هەمووی کۆ دەکرایەوە، پاشان ئەو تاو توێی دەکردن و داوەری دەکرد. ئیدی خۆی هەمە کارە بوو، دەیتوانی زیندانی لەسزا معاف بکات، یان کارێکی هێندە قورس و تاقەتبەری بەسەردا بدات کە لەبنیا دەرنەچێت و بمرێت. جارێک فەرمانی دا، سەد دار لە کابرایەکی پۆلاندی پەنجا ساڵە، کە کاتی خۆی مامۆستای زانستگە دەبێت، بدەن. تەنیا لەبەرئەوەی ئەم بەدبەختە کاتێ گەیی بووە، زیندانی ناوبراو گوتبووی: "خۆ ئێمە دزو ڕێگر نین، ئێمە زیندانیانی سیاسین."
دوستویفسکی و دوروف، هەمان ئەو ڕۆژەی کە دەگەنە ئەوێ دەبرێنە بەردەم کریفتزوف .خۆیان لەبەردەم دێوێکی ترسناکدا دەبیننەوە. دەپرسێت:
-تۆ ناوت چیە؟
-دوروف.
-ئەی تۆ؟
-دوستویفسکی.
-ئەهای یاریدەدەر... یەکسەر بۆ زیندانیان بەرن، لە بنکەی پاسەوانەکاندا، سەریان بە شێوەیەکی مەدەنی، واتە نیوەی سەریان بتاشن. سبەینێ کۆت و زنجیرەکانیان بگۆڕن. ئەم جلانەیان لەبەر داکەنن، تەنیا جلی ژێرەوەیان لەبەردا بێڵنەوە، بەمەرجێ سپی بێ. باقی شتەکان بەهەڕاج بفرۆشن. بیگارە زیندانی نابێ هیچی هەبێت. ئێوەش هەرووکتان باش گوێ بگرن، ئاقڵ بن بۆ خۆتان! نامەوێ هیچ شتێکتان دەربارە ببیستم. دەنا تووشی سزای بەدەنی دەبن. بچووکترین سەرپێچی بکەن، دار و دارکاری لە خزمەتاندایە.
دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، دەلاکی زیندانەکە، ئەمرەکەی مێجەر کریفتزوفی جێبەجی کرد. نیوە سەری دوستویفسکی، هەموو ڕدێنی و لایەکی سمێڵی تاشی. ئەمە هەفتەی جارێک دووبارە دەبووەوە. بەڕاستی ئەشکەنجەیەکی ناخۆش بوو، چونکە تیغی کابرای بەر بەر هێندە کول بوو، هەزار خۆزگە بە پارچە تەنەکەیەک. دەمی تیغەکە هێندە کول بوو، هیچی نەدەتاشی، بەڵکو پێستەکەی دادەماڵی و برینداری دەکرد و مووەکانی هەڵدەکێشا. پیاوەکان لەسەر تەپڵەکێک دادەنیشتن، بەدەم ئازارەوە لوولیان دەخوارد، هاواریان دەکرد، هەڕەشەیان دەکرد کە یاخی دەبن. پاشان، زیندانییەک، کە گوێزان و کەرەستەی تەراشی هەبوو، قاییل بوو، هەموو جارێک، بە کوپیکێک سەرو ڕیشی دوستویفسکی بتاشێ.
جل و بەرگی مەحکوومانی بێگارە زیندان بریتی بوو لە پانتۆڵێکی کەوەیی، چاکەتێک کە نیوەی کەوەیی و نیوەکەی دیکەی ڕەش بوو، کە نیشانەیەکی زەردی چوار گۆشەی بە پشتەوە دورا بوو، دەگەڵ پاڵتۆیەکی کورتی فەروو و کاسکێتێکی بێ لێواردا. جا وەرە، دۆستویفسکی، ئەم "نووسەرەی ئایندە"یەو دۆستی نزیکی ماڵباتی مایکوف، عاشقی مەدام ئاڤدوتیا پانایف، بۆ ساتێک لە جل و بەرگی کۆمیدیانەی لێبۆکانی سێرکدا، بێنە بەرچاوی خۆت کە لایەکی سەری تاشراوەو شین دەچێتەوە، لایەکەی دیکەی سەری قژیکی خورمایی پێوەیەو بەسەر لاسەرو لاملیدا ڕژاوە، بەلا سمێڵێکەوە پێ بە کۆت و

زنجیرەوە، کۆمەڵێک خەڵکی ڕەشۆکی و گەجەر و گوجەر بەدەوریەوەن کە جگە لە جنێودان بەیەکدی و گاڵتەکردن و ڕابواردن بەم و بەو، هیچ کارێکی دیکەیان نییە.
دوستویفسکی پاشان لە ڕۆمانی "یادگارییەکانی خانەی مردوواندا" دەڵێت: "لێرەدا هیچ شتێک سەیر نەبوو. کەس نەیدەتوانی کەس بخاتە سەر سامی و حەپەسان." ئەم مودووە -زندووانە، لە نەژاد و تیرەی جیاواز بوون. چەرکەس، جوولەکە، مەغول، ئوکرانی، پۆلاندی، مۆسکۆیی تیابوو. هەر یەکەو بە تاوانێک گیرا بوو: دزی، قەڵبەزەنی "دروستکردنی پارەی قەڵب)، بکوژی. بابکوژی، دایک کوژی، تاوانی سیاسی. لەناو ئەمانەدا میخائیلو ناوێک هەبوو کە ئاغاکەی خۆی بە تەور کوشتبوو؛ چونکە ئاغاکەی، چەند سەعاتێک دوای شێوی زەماوەند، ژنە گەنجەکەی ئەم داماوەی، بردبووە ژووری نووستنەکەی خۆی و لەگەڵیدا خەوتبوو. جا ئەم میخائیلویە، ورگی کابرایەکی، ماموری گۆڕینی ئەسپانی نێوان ڕێگاکانی، لە سەر بەدحاڵی بوونێکی بچووک، هەڵدڕی بوو و کوشتبووی. میخائیلو کوڕێکی گەنج بوو، بەڕواڵەت ئارام و جوان و شەرمن دەتگوت کچە. کابرایەکی دیکەی لێبوو بەناوی ئاریستوف کە بەتاوانی پارە لە خەڵک کێشانەوە لە ڕێگای هەڕەشە و ترساندنەوە گیرا بوو و لێرەشدا جاسووسی و شۆفاری بەسەر هاوڕێکانی خۆیەوە دەکرد و ڤۆدگا و وەرەقی قوماری بۆ فەراهەم دەکردن. هەروەها کوڕێکی گەنجی دێهاتیشی لێبوو، کە لەڕووی خزمایەتی و کەسایەتی خانەوادەییەوە یارمەتی برایەکانی خۆی دابوو کە بەتۆبزی کابرایەکی بازرگانی ئەرمەنی ڕووت بکەنەوە. هەروەها چەتەو ڕێگرێکی کۆنەکاری لە زەبری لێبوو، کە منداڵێکی پێنج سالانی، بە هەندێ گەمە و یاریان خافڵاند بوو و کوشتبووی. هەندێک لەو زندانیانە هەرگیز باسی تاوانەکانی خۆیان نەدەکرد و هەر بە خەیاڵیانشدا نەدەهات. هەندێکی دی بە دەم عەزابی ویژدانەوە دەتلانەوە و خوا خوایان بوو یەکێکیان دەست بکەوێ و گرێی دڵی خۆیانی بۆ بکەنەوە. بەڵام لەنێو مەحکوومانی بێگارە زنداندا، یاسایەکی جدی هەبوو کە: "نەدەبوو قسەی هیچ کەسێک بگێڕدرێتەوە و بۆ شوێنێکی دی ببرێت، گێرانەوەی قسە کارێکی ناپەسەند بوو." ئیدی ئەمە کردبوویە کارێک کە کەس خۆی لە کاروباری کەس هەڵنەقورتێنێ. ئیدی ئەوانەی کە تازە دەهێنران بۆ ئەوێندەر، هەر زوو پەیان بەوە دەبرد کە ئەو ڕووداوانەی بەسەر ئەوان هاتبوو و خۆیان زۆریان پێ سەیر بوو، کەس لێرە گوێی پێنەدەدا، لێرە هەر کەسەو کەوتبوو بە کۆستی خۆیدا، هەموو بێزار و بێتاقەت بوون. حوکمی بێگارە زندان، نەک شەرم نەبوو، بگرە مایەی شانازی بوو. و هەموو کەس و ناکەسێک ئەو شانازییەی پێنەدەبڕا. گوێڕایەڵی بۆ فەرمانی بەرپرسان و کارمەندانی زیندان لە نک ئەم مەحکوومانە شەرم و نەنگ نەبوو، بەڵکو بەجۆرە باج و باجدانێکی کارو کردەوەی خۆیانیان دەزانی و پابەندی بوون. یانی جۆرە پەیمانێک بوو مەحکووم بە کۆمەڵگەی دابوو و قازانج و سوودی هەردوولای تیا بوو.

دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "زندان و تاراوگە و بێگار، تاوانبار ناگۆڕێت، بەڵکو سزایەکە، تاوانبار بەباشی تەمێ دەکات و کۆمەڵگە لە تاوانێن ئایندەی، تاوانبار، دەپارێزێت."

دۆستویفسکی، باشترین چوار ساڵی تەمەنی لەنێو ئەم دارو دەستە قێزەون و بێسەرو بەرو، دزو چەتەو ڕێگرو، پیاو کوژو ناپاکانە بردە سەر.

هەرکە دنیا تاریک دەبوو، شەو دادەهات دەرگای خەوگایەکە دادەخرا. ئەم خەوگایە بریتی بوو لە هۆڵێکی گەورە، کە بەدارو تەختە دروستکرا بوو، تا حەزکەی کۆن، داڕوخاو و داڕزیو، سارد بوو. ئەرزەکەی بە تەختەی کۆن و ڕزیو فەرش کرابوو، بەڵام ئەوەندە پیس بوو، پیاو دڵی لێی تێک هەڵدەهات. شووشەی پەنجەرە چکۆلەکانی لە هاویندا، لە تەپوتۆز و خۆلا سەوز دەچووەوە و لە زستاندا هەر شەختەو بەستەڵەک بوو. میچەکەی تکەی دەکرد. لە درزی تەختەی دیوارەکانیەوە، کە باش بەیەکەوە نەچەسپێنرا بوون، هەر سا نا ساتێ شەپۆلە بایەکی ساردی سارد، هوروژمی دێنایە ژوورەوە.

پاشان دوستویفسکی لە نامەیەکیدا بۆ براکەی دەنووسێت: "لەسەرما وەکو ماسییانی ناو یەک کووپە، خۆمان پێکەوە نووساندبوو. چەند پارچە دارێک لە سۆپاکەدا دەسووتا، بەڵام لە نرخی نەبوودا بوو، گەرمایی تیا نەبوو. (ناو هۆڵەکەش هەر بەفر بوو، بە دەگمەن دەتوایەوە.) سۆپاکەش، تەنیا چەڕە دووکەڵی لیهەڵدەستا، زندانییەکان، جلی ژێرەوەی خۆیان لە هەمان هۆڵدا دەشت. هەمیشە گۆلاوی بچووک لەناو هۆڵەکەدا لێرەو لەوێ، بەدی دەکرا. پیاو کە ڕێی دەکرد نەیدەزانی پێ لەکوێ دابنێ. لەئێوارەوە تاکو بەیانی چوونە دەرەوە قەدەغە بوو. لەلای دەرگای هەر قاوشێکەوە، تەشتێکی داری گەورەیان دادەنا کە بەخۆت دەتوانی بە مەزەندە بزانیت بۆچیان دادەنا. بەدرێژایی شەو بۆنی بۆگەنی ئەم تەشتانە پیاوی کاس و هێڕ دەکرد. زندانییەکانیش بەخۆیان بۆنیکی پیسی وەکو بۆنی بەرازیان لێدەهات... تەختە خەوەکانمان، بریتی بوو لە دوو تەختە داری ڕووت. پاڵتۆ کورتەکانمان لە جیاتی پێخەف و لێفە بەکار دێنا، پێمان لەو سەریانەوە دەردەکەوت و شەو تا بەیانی لەسەرما هەڵدەلەرزین . خۆ پێشکەو ئەسپێ و سیسارک، ئەوەندە زۆر بوو، بە تەرازوو پێوانەت کردبا.

شەوان، هەرکە دەنگی پێی چاودێر و پاسەوانەکان دووردەکەوتەوە، شەونشینی زیندانییانی بێگارە زندان دەستی پێدەکرد. خواردنەوە، قومار و وەرەقبازی، ناو بەناو شەڕە مست، هەموو ئەمانە بەشێک بوون لە بەرنامەی شەونشینییەکان. هەندێ لە بێگارە زندانییەکان، کە ناویان لێنرا بوو "کابارەدار" ئەمانە ڤۆدگایان دەفرۆشت. ئەمانە شەریک و یاریدەدەریان هەبوو، کە بۆ کار دەچوونە دەرەوەی زندانەکە، ڤۆدگاکەیان دێنا، ئەمانە ڤۆدگاکەیان دەکردە ڕیخۆڵەی مانگاوە و لەقەدی خۆیان دەئاڵاند و دەیانهێنا بۆ ناو تاراوگەکە.

هەڵبەتە ئەم خواردنەوەیە غەشی لێدەکرا، ئەو قاچاغچیانەی دەیانهێنا، ئاویان تێدەکرد، بۆیە ئەوەی دەیخواردەوە، دەبوایە پڕێکی زۆر بخواتەوە تا مەست ببێ، زندانییەکان ئەمەیان لەبەر گران و ناخۆش بوو. قومار، لە

زندانەکەدا زۆر قەدەغە بوو، هەندێک لە زندانیان، کە نازناوی "پاسەوانانی مەیدان"یان لێنرا بوو، قەبووڵیان دەکرد لە ژوورێکی ناوەڕاستەوە ئێشک بگرن و هاورێکانیان لە هاتنی مێجەر ئاگادار بکەنەوە. خۆ ئەگەر بچووکترین غەفڵەت ڕوویدابا، ئیدی سزای دارکاری دەستی پێدەکرد. زۆرجار شەڕو قەرقەشە دەکەوتە نێو زندانییەکانەوە. ئەوجا شەڕ نەگاڵتە! هەندێک لە زندانییەکان، بەدەم پیسی و جنێوی تایبەت بە خۆیان بەنێو بانگ بوون. ئیدی زندانییەکان لە دەوریان خڕ دەبوونەوە، تا ئەو دیمەنانە ببینن و گوێ لە پیسترین جۆری جنێوانیان بگرن. هەر گروپێک،؛ جنێو فرۆشی تایبەتی خۆی هەبوو، کە بە هوراکێشان و فیکەکیشان هانیان دەداو پشتیوانیان لێدەکرد.

دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "من پاشان زانیم، کە ئەم دیمەنی شەڕو قەرقەشانە، هیچ ڕق و کینەیەکی تیا نەبوو، بەڵکو تەنیا بۆ خۆشی هەمووان بوو." هەندێجار شەڕو پێکادانی قورس ڕووی دەدا. پاشان شەڕکەرەکان ماندوو دەبوون و لە پەلوپۆ دەکەوتن، دەچوون لەسەر تەختەکانیان دەکەوتن و دەخەوتن، کە مۆمەکان دەکوژانەوە، ئیدی خامۆشی باڵی بەسەر ئەو هۆڵە گەورەیەدا دەکێشا و جگە لە دەنگی زرەی زنجیر و پرخ و هۆڕی نوستوان هیچ دەنگێکی دی نەدەهات. جا لەم ژینگە بۆگەنەدا، لەم سەرمایەدا، لەم هۆڵەدا کە لە تەویلەو پشتیری ئاژەڵان دەچوو، دوستویفسکی لەجێیەکی ئارام دەگەڕا، کە خۆی لەبیر بکات و بە ئاسوودەیی بخەوێت. جا دراوسێکەی، هەرکە هەستی دەکرد دوستویفسکی خەوی لێکەوتەوە، بەئەسپایی لەژێر جیگاکەیەوە دەستی دەبرد و گیرفانەکانی دەگەڕا. یەکێک لەولاوە بەدەم خەوەوە دەیناڵاند. لەوسەری هۆڵەکەوە یەکێک لە پڕ دەپژمی. ئیدی دەنگی نزگرەو هەنسک لێرەو لەوێ دەهاتە گوێ. یەکێک هەڵدەستاو بەچاوانی خەواڵووەوە، بەرەو لای تەشتی میزەکە دەڕۆیی. ئیدی دوستویفسکی لەناوجەرگەی ئەم کلۆڵی و داماویەدا،لە نێو ئەو جەستە ئینسانییە ئەشکەنجە دیدانەدا ،لەنێو ئەو بیرو بۆچوونە سەرەتایی و کاڵوکرچانەدا دەژیا. زۆرجار، کە دڵی تەنگ دەبوو لەژێر پاڵتۆ کورتەکەیەوە، کە بەزەحمەت دەگەییە ئەژنۆکانی، دەستی بۆ ئەو ئینجیلە دەگێڕا، کە ژنی یەکێک لە "شۆرشگێڕانی کانوون" "دیسامبەرییەکان" دابوویە.

بەیانیانی زوو، تەپڵی بێدار باش، لە پاسگای ناوەندیی زندانەکەوە، بەرزدەبووەوە. ئەفسەرێک دەرگای قاوشەکەی دەکردەوە، هەوایەکی ساردو پاک بەخێرایی دەهاتە ژوورەوە و دڕی بە بۆنی بۆگەنی ئەم ئاژەڵانە دەداو دەیکردە دەرەوە، و تەمێکی مەیلەو سپی لەژێر تەختە خەوەکانەوە، وەکو گەردەلوول بەرز دەکردەوەو دەیبرد بە ئاسماندا. زندانییەکان، پەست و غەمگین ڕادەبوون، خۆیان بەسەر ئانیشکیاندا دەدا. هەندێکیان وەکو عادەت نیشانەی خاچیان دەکێشا، هەندێکی دی بەخوت و خۆرایی شەڕیان دەفرۆشت. هەر هەموو ئەو دیمەنانە لەبەر ڕوناکی تاقە یەک مۆمی پیودا دەبینران.

پاشان، زیندانییەکان، بەدەم زڕەی کوت و زنجیرەکانی پێیانەوە، لە دەوری مەنجەڵێکی گەورەی ئاودا خڕ دەبوونەوەو، هەر کەسەو جامێ ئاوی هەڵدەگرت. تۆزێکی لە دەم و زاری وەردەدا، لەناو دەمیا غەر غەرەی پێدەکرد، .لەم گوپەیەوە دەیبرد بۆ گوپەکەی تری، پاشان دەیکردەوە نێو هەردوو دەستی و دەموچاوی پێدەشۆرد

دوستویفسکی لە ڕیزی چاوەڕوانیدا دەوەستا. فووی بە قامک و دەستەکانی خۆیدا دەکرد، کە لەسەرما سڕ بوو بوون و لەجێی خۆی ئەم پێو ئەو پێی دەکرد. خواردنەکەیان زۆر خراپ بوو، پیاو قێزی لێدەکردەوە: نانی ڕووت و شۆربای کەلەرم، کە بە حاڵ گۆشتی تیابوو. جەژنان، پڵاوی ساوار و گۆشتی فەرخە قورینگیان دەدانێ. لە ڕۆژانی ڕۆژوودا، کەلەرمی زەرد کراویان دەدانێ. دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "زیندانیانی ئاسایی بێگارە زیندانیش وەکو زیندانییانی سیاسی، لەم ڕژیمە خۆراکییە ناڕازی بوون، بەڵام هەر هەموویان بۆ خۆ لەناو ئۆردوگاکەدا، جۆرە کارێکیان دەکردو چەند کوپیکێکیان بەدەست دێنا. من چایم دەخواردەوەو، جار جارێک، بەپارە پارچە گۆشتێکم بەدەست دێنا. ئەمە ڕزگاری کردم. ئەمە جگە لەوەی کە لەم کەش و هەواو ژینگەیەدا مەحاڵ بوو پیاو بەبێ جگەرە هەڵبکات، هەرچەندە جگەرەکێشان قەدەغە بوو، بەڵام بەدزییەوە، هەر دەمانکێشا."

دوستویفسکی و دوروف، بە دڕدۆنگی و گومانەوە لەلایەن زیندانییەکانەوە، پێشوازی کران. ئەم دوانە، خەڵکانی خوێنەوار بوون و بە ئەرستوکرات و خانەدان دەژمێردران، لەبەر ئەمە بە چاوی نەیارو دژمنەوە تەمەشا دەکران. ئەمە جگە لەوەی تاوانەکەیان سیاسی بوو. دیار نەبوو کێیان کوشتووە؟ یا چیان دزیوە؟

دوستویفسکی پاشان دەنووسێت: "خۆ ئەگەر دەرفەتیان هەبوایە و دەسەڵاتیان هەبایە، بە خواردن دەیانخواردین." ئەوجا لەسەری دەڕوات: "ئیدی ئێمە ناچار بووین چەندین ساڵ لەگەڵ ئەمانەدا بژین، بخۆین و بخۆینەوە، ژمارەشیان زۆر بوو، چۆن دەمانتوانی خۆمان لەشەڕیان، لە گەڕیان، لە جنێویان بپارێزین، سکاڵامان بەرینە لای کێ؟ دەیانگوت ئێوە نەجیمزادەن زاڵمن، زماندرێژن، نەماندەتوانی سەر بەرزبکەینەوە. تێیان دەسرەواندین، جاران ئاغا بوون، خەڵکیتان ئەزیەت دەدا، ڕۆڵەی میللەتتان دەچەوساندەوە. ئێستا کەرێتان کەوتووەتە ئێرە، لە کەمترین کەسی ناو ئێمە، کەمترن."

وێڕای ئەوەش دوستویفسکی، بەوپەڕی سەبر و حەوسەڵەوە، هەوڵیدەدا لێیان بچێتە پێشەوە، دۆستایەتیان بکات، بەوردی و لە نزیکەوە، لە بیرو بۆچوونەکانیان، لە شەڕو قەرقەشەکانیان تێبگات. بەڵام زیندانییانی ئاسایی، هەر لێی دڕدۆنگ و بەگومان بوون و ئەمەیان بە جۆرە ڕووبینی و مەراییەک دەزانی و بە شایستەی ڕێزگرتنیان نەدەزانی.

ڕۆژێک زیندانییانی بێگارە زیندان، کە لە خواردنەکە ناڕازی بوون، بڕیاریان دا لای میجەر کریفتزوف سکاڵا بکەن، دوستویفسکیش بەگەڵیان کەوت. یەکێک لە زیندانییەکان بەروویدا هەڵشاخی: "برادەر تۆ چیدەکەی لێرە؟ تۆش لە

کونەکەی خۆت هاتیتە دەرێ! ئێوە تەماشای ئەم مێشکۆژە بکەن.. تۆ بەشە گۆشتی خۆت لە مووبەقەکە دەخۆیت!.."
دوستویفسکی بەرسقی دەداتەوە: "خۆ ئێوەش خەڵکانێکتان تیایە، بەجیا نانی خۆ دەخۆن، بەڵام هەر مەغدوورن. ئێمە دەبێ یەک و یەکگرتوو بین، هاوڕێی یەکتر بین."
-پیف! ئاخر تۆ چۆن دەتوانی ببی بە هاوڕێی ئێمە؟
دوستویفسکی ناچار دەبێت پاشەکشە بکات. دۆستویفسکی پاشان لەو بارەیەوە دەنووسێت: "هەر کەسێکی تازە کە دەگەیيە ئەوێ، دوای دوو سەعات، خۆی لە ڕیزی ئەوانی دیدا دەبینییەوە. بەڵام بۆ کەسێکی خوێنەوار و بەتەرپێت، مەسەلەکە بەو ئاسانییە نەبوو. پیاو تا لە ئاستێکی خوێنەواری بەرزتر بوایە، لێرەدا زیاتر هەستی بە نامۆیی دەکرد و بەدرێژایی ساڵان دەبوغزێنرا." لەم تاراوگەو زندانەدا، هەندی ڕۆشنبیری پۆڵاندی هەبوون، کە بەتۆمەتی بەشداری لە ڕاپەڕینێکدا، حوکمدار بوون. یەکێک لەوانە مامۆستاو پرۆفیسۆرێکی زانکۆ بوو بەناوی جادوفسکی، کە زندانییەکان ناویان نابوو "قەدیس" چونکە زۆری نوێژ و نزا دەکرد. یەکێکی دیکەیان بوگوسلاڤسکی ناو بوو، زندانییەکان نازناوی "نەخۆش"یان لێنا بوو. هەروەها دوانی دیکە هەبوون بەناوی توکارجیفسکی و میرتیزکی. ئەم دوانەش پێش ئەوەی بۆ سیبریا ڕەوانە بکرین، لە زیندانەدا دارکاری کرابوون. بەڵام ئەوانەش نە هیچ پەیوەندییەکیان دەگەڵ دوستویفسکیدا هەبوو و، نەخۆشیانیش دەویست.
ئەم پۆڵاندیانە، خەڵکانێکی ناسیونالیستی پۆڵاندی بوون، ڕقیان لە ڕووسیا و هەموو ڕووسێک بوو. بەشانازییەوە، لە هەر بۆنەیەکدا، بەئاشکرا ئەم ڕق و نەفرەتەی خۆیان دەردەبڕی. ئەمانە دانیان بەوەدا نەدەنا کە دوستویفسکی کەسێکی سوسیالیست یا دیموکرات، و تەنانەت کەسێکی لیبراڵ و ئازادیخوازی پێشڕەو بێت. بەڵام لە ڕوانگەی ئەوانەوە دوستویفسکی کەسێکی لاوازی، بێنموودی، بێشەخسیەتی، نەفس نزم بوو. هەرگیز ئەوەیان قەبووڵ نەبوو کەسێک کە بەتۆمەتی تاوان دژی ئەمن و ئاسایشی وڵاتەکەی و بە ئەمری تزار حوکم درابی، دوور خرابێتەوە، هەزار جۆرە زەبوونی و کەساسی و داماوییەک تەحەمول بکات و بەو سەرماو سەهۆڵبەندانە، ببێ بە هاوزندانی ئەو هەموو پیاوکوژ و دز و چەتانە و هیچ گلەییەکی لە دەسەڵاتی ناوەندی نەبێت، و بە ڕزگاری بەخشێکی مەسیحایی بزانێت. ئەم ملکەچییەی دۆستویفسکی، لە ئاست ئەو هەموو ڕیسوایی و زەلیلی و ئەو زوڵمە زۆر و زەبەندەی لە خەڵک دەکرا، بەلای ئەم پۆڵاندیانەوە کارێکی بێهودە و نا ماقووڵ بوو، وای لیدەکردن ڕقیان لە دوستویفسکی ببێت و بیبوغزێنن.
وێڕای ئەوەش دوستویفسکی، لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بوو و بەڕاستی بوو کە هیچ ڕقێکی لەو کەسانە نەبوو کە ڕۆژیان گەیاندبوو بەو ڕۆژگارە و ژیانیان وێران کردبوو.
لە ژیاندا هەندێ جەزرەبە بە مرۆڤ دەکەوێ، کە هەر جۆرە کاردانەوە و بەرەڤانیەک لە هەنبەریدا بێسوودە و جگە لە ملکەچی و تەسلیم بوون هیچ

چـارێکی دیکـە نییـە. ئـەم جـۆرە جەزرەبانـە ئینسـان دەگەیەنێتـە ئەوپـەڕی نەگبەتی و بەدبەختی. ئیـدی هەسـتی مرۆڤانیمـان دەبـزوێ، قسـە دەکـەین، وتار دەنووسـین، بـەڕەڤانی لـە مـافی خـەڵکی دەکـەین، لـەناکاوا، دەسـتێکی قـورس، بەسـەرماندا دەکێشـێت، لـەهاوارمان دەخـات و هـیچ بوونێکمـان بـۆ نایەڵێتەوە، کە هەست دەکەین، ئیـدی تـەواو، هـیچ نـین، مەیـدان بـۆ خـەڵکی دی چـۆڵ دەکـەین. ڕێگـەی دەدەیـن لـەجیاتی ئێمـە گەمـە بکـات. بـدۆڕێنێ، بباتەوە، ئیـدی ئاینـدە شـادی یـا کلـۆڵی ئێمـە دابـین دەکـات. بەڕاسـتی لـەوە گەوجێتر نییە، کە ئینسان بیەوێ هەمیشە ڕۆڵی یەکەمی هـەبێت. بەڕاسـتی بێ شـەرمییە کە مرۆڤ بیەوێ بەسـەچارەنووسـدا زاڵ بێت!
بەڵێ، هەندێجار حوزووری خودا، لەدڵدا هێندە بنجیڕ و بەڵگە نەویستە، هێندە ئاشکرا و خویایە، هێندە ترسناک و لەهەمان کاتدا هێندە خۆشە، کە لەژیانی تایبەتی خۆتت جیادەکاتەوە، دوورت دەخاتەوە. ئەم حاڵەتە لەگینە چەند سەعاتیک، چەند ڕۆژیک یا چەند ساتیک بەردەوام بێت. پاشان وەکو ئاوڕێک کە بەلایەکی ترا بیدەیتەوە، یا هەوسارێک لەدەست بەربێ، بەو ئاوایە بەرت دەدات و هەنگی ئینسان بەخۆی لە هەموو شتێک بەرپرسە، دەبێ کاربکات، ڕەفتاربکات، جگە لەخۆی پشت بەکسی دی نەبەستێت. تراجیدیای ڕاستەقینەی مرۆڤ لێرەوە دەست پێدەکات.
هەموو قارەمانەکانی دوستویفسکی، لەگەرمەی ڕوداوەکاندا، تووشـی ئەو حاڵەتی خەونی کوت و پڕ و بێئاگایی و پاشان وەهۆش هاتنەوانە بوون و وەکو خودی خۆی جەڕباندوویانە.
بۆ نموونە ڕاسکولنیکوف، کاتێ لێدەپڕێت پیرەژنە سووتخۆرەکە بکوژێت، هەست دەکات ئازای ئیفلیچ بووە، بەجۆرێ جڵەوی خۆی لەدەست بەربووە، وەکو ئەوەی کەسێکی دی ئەمری پێبکات و، نەتوانێ لە هەنبەر ئەم ئەمر و فرمانەدا، هیچ مقاوەمەتێک بکات: "وەکو ئەوەی کە خۆی بەرەو ئیعدام ببەن، وەکو ئەوەی داوێنی پاڵتۆکەی لە مەکینەیەکەوە گیرابێ و، خۆی و پاڵتۆکەی هەڵبلوشێ." بەڵام دوای ئەنجامدانی تاوانەکە، ئیدی مەکینەکە خاو دەبێتەوە و کابرا دەردێتەوە و لەسەر پێی خۆی دەوەستێ و خۆی دەتەکێنێ و هەست بە ئازادی دەکات. بەڵام مەحکووم ئێستا هەر خۆیەتی، بەبێ ئەوەی چ کەسێک تاقیبی بکات هەڵدێت.
دوستویفسکی توانی لە ئەزموونی تاراوگە بە سەرکەوتووی دەربچێت. واتە بەسەر ئەزموونی تاراوگەدا زاڵ بێت، چونکە لە هەوەڵەوە خۆی بۆ ئامادە کردبوو. پاشان توانی بگەڕێتەوە بۆلای خودی خۆی و بیێتەوە بە خۆی، چونکە بۆ ماوەیەک دەستبەرداری خودی خۆی بوو. توانی گەمەکە بباتەوە، چونکە لە هەوەڵەوە دۆڕانی قەبووڵ کردبوو.
دوستویفسکی لەبەشی دووەمی زینداندا، کە تایبەت بوو بە جووتیارانی کۆیلە، حەپس بوو. ئەم بەشەش وەکو بەشی یەکەم، کە تایبەت بوو بە مەعدەنچیانی خەڵوزو، وەکو بەشی سێیەم کە تایبەت بوو بە کرێکارانی ڕێگاو بان بوو، ترسناک و مەترسیدار بوو، چونکە هەموو ئەم بەشانە، لەژێر

سەرپەرشتی دەزگای سوپاییدا بوون و لەلایەن ئیدارەیەکی زۆر بەزەبت و ڕەبتەوە، بەڕێوە دەبران. دەنووسێت: "هەمیشە پێ بەکۆت و زنجیر، هەمیشە پاسەوان و ئێشکگر، هەمیشە بەقفڵ و کلیل." هەموو ڕۆژێک زندانییەکانیان بۆ کاری قورس و بێگاری دەنارد، ئیدی هەندێجار بریتی بوو لە خشت بارکردن، هەندێجار، بادانی بەرداش و هەندێجار کۆکردنەوەی پارچە مەڕ مەڕ و وردکردنی بوو.

دوستویفسکی لەنامەیەکیدا بۆ براکەی دەنووسێت: "کاری زۆر قورسمان پێدەکەن. هەندیجار وا ڕێدەکەوت، بەوپەڕی ماندوویەتی، لە کەشوهەوایەکی زۆر نالەبار و تووشدا، لەژێر باراندا، لەنێو قوڕا کاربکەم. یا لەسەرمای زۆر ساردا، لە چلەی زستاندا کاربکەم. جارێکیان وا ڕێکەوت کە کارێکی زیادە بکەم، چواردانە سەعاتم پێچوو، سەرمایەک بوو تفت هەڵدابا، لە ئاسمان دەیبەست، پلەی سەرما گەیی بووە چلی ژێر سفر، جیوەی سەرما پێوەکە بەستبووی. هەستم کرد لاقێکم بە تەواوەتی بەستی."

ئەوکارەی کە دوستویفسکی، تا ڕادەیەک پێیخۆش بوو، ئەوە بوو کە خشت لەکەناری ڕوباری "ئیرتیچ"ەوە بۆ سەربازخانەکە بگوازێتەوە. لەمبارەیەوە دەڵێت: "بۆیە ئەم کارەم پێخۆش بوو، هەرچەند ئەو حەبلەی بۆ بەستنی خشتەکان بەکار دەبرا، شانی بریندار دەکردم، چونکە وام هەست دەکرد ئەمە جۆرە وەرزشێکە و، ماسولکەکانم پێی بەهێز دەبن."

لە ڕۆژانی یەکەمدا تەنیا شەش خشتی (کە شەش کیلۆ بوون) پێ هەڵدەگیرا، پاشان کردی بە دە خشت و دواتر کردی بە دوازدە، واتە دەرزەنێک. ڕوبارێکی گەورە لە بەردەم زندانییەکاندا بوو، بە ئارامی دەڕۆیی. لەوبەری ڕووبارەکەوە، دەشتێک هەبوو، تا چاو بڕی دەکرد، دەڕۆیی. چریکەو دەنگی گۆرانی و سترینی کیژە قەرغیزیان، بەدەم بایە ساردەکەوە، لەوبەری ڕوبارەکەوە دەگەییە ئەمبەر. لە دوور ترەوە. ڕەشماڵێک دیار بوو، کە زۆر بەهێمنی دووکەڵی لێبەرز دەبووەوەو دەچوو بە ئاسماندا، ژنە قەرغیزییەک، بەدەم کارکردنەوە، لەو دەوروبەرەدا، چاودێری پەزو بەرخەلەکانی دەکرد. هەموو شتێک بۆنی ئازادی لێدەهات. زندانییەکان بەدەم کارکردنەوە، باسی ئازادی، هەڵاتن و ڕەڤین، ژیانی ئاسوودە و سادەیان دەکرد. لەکەنار ڕوبارەکەدا، لە بەینی بەردەکان و لە درزی تاوێرەکاندا، گوڵ و گیا ڕوا بوون. زندانیەکان کە ئەو دیمەنە جوانانەیان دەبینی، دڵیان دەگوشرا، بیریان لەوە دەکردەوە چۆن لە لەزەتی ژیان بێبەش دەبن و عومری شیرینیان بەبا دەڕوات.

دوستویفسکی، حەزی دەکرد بەفری بەردەم بینای شارەوانی بماڵێ. بێڵەکەی دەستی تا دەسکەکەی لە بەفرە نەرم و شلەکە ڕۆدەچوو. دەگەڵ هەر ڕاوەشاندنێکی بێڵەکەدا پڕێک بەفر و گەردی سپی دەچوو بە ئاسماندا، دیسان بێڵەکە لە تۆپەڵێک بەفری درەخشان ڕۆدەچوو. بەدەم ئەم کارەوە پیاو خۆی لەبیر دەکرد، تا ڕادەیەک ئەو کۆت و زنجیرەی پێیە بریندار و ڕوشاوەکانی لەبیر بەرێتەوە. دەتوانێ بۆ ساتێک وا خەیاڵ بکات کە ئازادە. بەڵام لەناکاوا، ئەمرێک وەئاگات دێنێتەوە، دەبێ گوێڕایەڵی ئەمرەکە ببی، سەروگوێلاکی

خـۆت بتـەکێنی و بچیتـە ڕیـزەوەو جـارێکی دی بەمەبەسـتی سـەرژمێری بـۆ ئۆردوگا بگەڕێیتەوە.
هەندێجار، هەندێک لە خەڵکی شار، لەسەر ڕێگای کاروانی زندانییەکان دەوەستان و لە ڕووی بەزەییەوە، یەک دوو کوپیکیان بە یەک دوو زندانی دەدا.
دەسەڵاتە ناوچەییەکان، جگە لە مێجەر کریفتزوف، هاوسۆزییان دەگەڵ دوستویفسکیدا هەبوو. ئیدی سەرچاوەی ئەم هاوسۆزییە یەکەم ئەوە بوو کە نەخۆش بوو ومجێزی تەواو نەبوو، دووەم ئەوە بوو کە دۆست و هاوڕێکانی چ لە سان پتروسبۆرگ و چ لە توبولسک، بەردەوام خەڵکانیان ڕادەسپارد چاویان لێی بێ و ئاگاداری ببن. ئەوە بوو ڕۆژێک بانگیان کرد و کاری قەڵەمییان لە ئیدارەی زنداندا پێ سپارد. ئیدی ئەم کارەی پێخۆش بوو، سێ مانگێک، بەردەوام بوو، لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە ئیسراحەت و ئاسوودە بوو. بەڵام کۆڵۆنیل مارتنس، لەو ڕوانگەیەوە کە بابایەکی تاوانباری سیاسی، ماقوول نییە لە دەزگایەکی کارگێڕی سیاسیدا کاربکات، دوستویفسکی گەڕاندەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، بۆ ناو هاوڕیکانی پێشووی.
ئەو دەرەجەدارانەی کە لەزندانەکەدا خزمەتیان دەکرد، لە کۆنە دەریاوانانی هێزی دەریایی بەڵتیک بوون. ئەمانە بە تۆمەتی ئەوەی کە لە قوتابخانەی هێزی دەرییاییدا، ئاژاوەیان نابووەوە و ڕاپەڕینیان بەرپا کرد بوو، تەنزیل دەرەجە کرابوون و ڕەهەنەی سیبریا کرابوون. دوای ئەوەی ساڵێکیان لە تاراوگە بەسەر بردبوو، بە عینوانی مولازم، ئەرکی ئەوەیان پێسپێردرا بوو، کە لەناو زندانەکەدا چاودێری و سەرپەرشتی ئەو زندانیانە بکەن، کە سووکە بێگاریان پێدەکرا.
هەندیجار ئەم دەریاوانە بچووکانە (زندانییەکان لە بەینی خۆیاندا وایان ناو نابوون) کە خۆیان ئەم جۆرە سووکە بێگارانەیان بۆ زندانییەکان دادەنا، ناوی "دوستویفسکی"یانش دەخستە لیستی ئەوانەوەو هەر کاتێ بۆیان لوابا، لەسە کاری کارگێڕی و ئیداری دایان دەناو ئیدارەی مەرکەزیش، چاوپۆشیان لەم سەرپێچییە نایاسایە سادەو بچووکانە دەکرد.
ڕۆژیک کە دوستویفسکی بە بیانووی ئەنجامدانی هەندێ کار بۆ مەڵبەندی نیگابانی، لە ئۆردوگادا دەمێنێتەوە، مێجەر کریفتزوف، لە پڕێکا خۆی بەژوورا دەکات، سەیر دەکات دوستویفسکی لەسەر تەختێک لێی ڕاکشاوە، دەهری دەبێ و چاوی دەپەڕێتە تۆقی سەری، هاوار دەکات: ئەمە چیە؟ بۆ نەچووە بۆ کار؟ دەریاوانی خەفەری ئەو ڕۆژە دەڵێت: نەخۆشە.
-قسەی بەلاش! من دەزانم ئێوە هەمیشە پشتیوانی لێدەکەن و پەنای دەدەن! چاوپۆشی لێدەکەن، دەی بۆ مەڵبەندی نیگابانان! دارکاری!...
لەکاتێکا ئامادەکاری دەکرا بۆ ئەنجامدانی سزای دارکاری، دەریاوانەکە توانی مەسەلەکە بگەیەنێتە فەرماندەی قەڵاکە. جەنەڕاڵ دوگراف یەکسەر خۆی گەیاندە ئەوێندەر و بەئاشکرا بە مێجەر گریفتزوفی ڕاگەیاند کە لەوە دوا سزای جەستەیی نەخۆشانی بێگارە زندان نەدات. کریفتزوف، خەبەردار، گوێی لە سەرزەنشتەکانی جەنەڕاڵ گرت. لەتورەییدا سوور بوو بووەوە و هەناسەی تەنگ بوو بوو.

هەروەها دکتۆر باشی خەستەخانەی زندانەکەش، دکتۆر ترویتزکی، بەگوێرەی توانا، یارمەتی باشی دوستویفسکی دەداو خاتری دەگرت. زۆرجار دەیبرد بۆ خەستەخانەکە، بە بیانووی معایەنەوە، چەند ڕۆژێک پشووی بۆ دەنووسی و یا لەوێ گلی دەدایەوە.
دوستویفسکی بالاپۆشێکی چڵکنی نەخۆشانی لەبەر دەکرد کە هەر پەڵەی کێم و زوخ و بەڵغەمی وشکەوە بوو، بوو. شەوکڵاوێکی کەتانی پیسی لەسەر دەکرد، جووتێ نەعلی شڕی لەپێ دەکرد، ئیدی هەموو دیوارەکان ، پەردەکان، چەرچەف و نوێنەکان یەکپارچە پەڵەی گومانلێکراو بوو: ئیدی پەڵەی ڕشانەوە، پارچە لەزگە، کونی سیسرک، پارچە پلاستەر، شوێنەواری هەتوان و مەڵحەم و بۆن بۆگەنی. شەوان، لەگەنێکی گەورەیان لە ژوورەوە دادەنا، هەرچەندە لە دوو شەقاوی ئەو شوێنەو لە دالانەکەدا، ئاودەست هەبوو.
چرایەکی چکۆلەی کز، بەئاستەم ئەو ژوورەی ڕوناک دەکردەوە کە ئەو جەستە شەکەت و ماندووانەی لەخۆ گرتبوو. ئیدی ئەم زندانییە نەخۆشانە، بەدەنگی کزی منداڵانە دەیان ناڵاندا و بەدەم نەخۆشییەوە دەتلانەوە. هەندێجار چاودێرەکەیان، دەی نارد بە شوێن ئاسنگەرێکدا، تا زنجیرەکانی پێی یەکێک لەو نەخۆشانەی کە مردبوو، بکاتەوە.
هاوسەرەکەی دکتۆر ترویتزکی، چای بۆ دوستویفسکی دەنارد و تەنانەت زۆرجار شەراب و خواردنەوەو، ڕۆژنامەی فەرەنسی "باکوور"ی بۆ دەنارد.
هەڵبەتە، ئەم ڕەفتارانە لەلایەن یەکێک لە هاوکارانی دکتۆر تروتیزکییەوە کەشف دەکرێت و ڕاپۆرتێک بۆ پایتەخت دەنێرێ. ئیدی ڕاوێژکارێکی دادگای تاوان لە توبولسک ڕادەسپێردرێت، کە بڕوات بۆ ئومسک و تاقیبی مەسەلەکە بکات. بەڵام ڕاوێژکاری تاین، نەیتوانی هیچ بەڵگەیەکی بنجبڕ بەدەست بێنێ و ناچار مەسلەکەیان پەردەپۆش کردو بەردێکیان نایە سەری. کاتێ ڕاوێژکارەکە لە دۆستویفسکی دەپرسێت: "ئایا لە زینداندا یا لەو ماوەیەدا کە لە خەستەخانە بووی، هیچت نووسیوە؟"
دوستویفسکی بەرسڤی دادەتەوە: "نا، هیچم نە نووسیوەو هیچیش نانووسم. بەڵام کەرەستەو بابەتان کۆدەکەمەوە کە پاشان دەیانکەم بە نووسین." ڕاوێژکارەکە دەپرسێت: "ئەو کەرەستە و بابەتانەت لەکوێ هەڵگرتوون؟" دوستویفسکی وەڵامی دەداتەوە: "لێرەدا، لەمێشکمدا." لەڕاستیدا بابەتەکان، لەژێر سەرین و نوێنەکانی یاریدەدەری پزیشکی خەستەخانەکەدا بوو.
لەکاتێکا جماعەتێک لە زندانییانی بێگارە زندان، بـرا بـوون بـۆ ڕەخـی دەریـای ئیـرتیج و خـەریک بـوون بەلـەمێکیان دەشـکاند، تـەوری دەسـتی یـەکێک لـە زندانییەکان بەنێوی روجنوفسکی کەوتە ڕوبارەکەوە. پاسـەوانەکە زۆری لێکـرد، کـە بچێتـە ڕوبارەکـەوە و تەورەکـەی دەربێنێتـەوە. روجنوفسـکی بـەدەم بۆڵـە بۆڵـەوە جلـەکانی داکەنـد، ئـەوجا زنجیرەکـانی پێـی تونـد کـردەوەو چـووە نـاو ئاوەکەوە. دوستویفسکی و یەکێک لە هاوڕێکانی بە حەبلێکی درێـژ گرتبوویـان، لەوکاتەدا مێجەر بە ڕێکەوت و لە ناکاوا پەیدا بوو، وەکو زۆربـەی کـات مەسـت و

سەرخۆش بوو، گوتی: "کەس هەقی بەسەرپەوە نەبێ، نابێ کەس دەست لەکار هەڵگرێت! دەبێ خۆی تەگبیری حاڵی خۆی بکات. دەی حەبلەکە بەردەن."!
بەڵام نە دوستویفسکی بەگوێی کردو نە هاورێکەی. مێجەر کریفتزوف، توورە بوو، گۆنا قەڵەوەکانی کەوتنە لەرزین و بە هەموو هێزی خۆیەوە هاواری کرد: "کە لە کارەکەتان بوونەوە یەکسەر پرۆن بۆ مەڵبەندی نیگابانان". ئێوارە درەنگ دوستویفسکی بۆ ئوردوگاپەکە گەڕایەوە. گێژو وێژ و ڕەنگ زەرد، نیگا، وێڵ و سەرگەردان. دەم و لێو هەڵقورتاو، سیما پەشۆکاو و حەپەساو. پاشان لە نیوە شەوا، هەندێ لە زندانییەکان، لەنیوە شەوا، لە دەنگ و هاوار و نوزە نوزێکی ترسناک کە لە لوورەی گیانلەبەرێک دەچوو، لەخەو ڕاپەڕین. سەیریان کرد دوستویفسکی فێی لێهاتووە و لەسەر ئەرزەکە هەڵدەپلکێ و شێت ئاسا سەری خۆی بە دیوارەکەی تەنیشتیدا دەکێشێت. ناچار بوون دەست و لاقی ببەستنەوە.
ئایا دۆستویفسکی بەڕاستی، بە فەرمانی مێجەر دارکاری کرابوو، یان ئەم چیرۆکەی گێرامانەوە، تەنیا ئەفسانە بوو؟ ڕای جیاواز لەم بارەیەوە هەیە.
دیارە دارکاری کردنی پیاوێکی بەڕێز و خانەدان و نەجمیزادە، لەنێو زندانییانی بێگارە زندان و لەناو زنداندا، ڕووداوێکی گەورە و نەکردەنی بوو. کاتێ کە جادوفسکی، نەجیمزادەی پۆڵاندی دارکاری کرا، ئەم هەواڵە لە سەرانسەری شاری ئومسکدا دەنگی دایەوە و دەماو دەم بڵاوبووەوەو هەموو خەڵکەکە کەوتنە گلەیی لەم توندوتیژی و سەختگیرییەی مێجەر. بەڵام سەبارەت بە دارکاری کردنەکەی دوستویفسکی، خەڵکی شارەکە هیچ زانیارییەکی وردو دروستیان دەست نەکەوت. دکتۆر یانوفسکی، لەم بارەیەوە دەڵێت: "من هەرگیز شتی وام نەبیستووە" چ لە خودی دوستویفسکییەوە چ لە میشێلی برایەوە، کە چەندینجار، بەئاشکرا لەو بارەیەوە قسەم لەگەڵیدا کردووە." (پروانە نامەی بەرواری ١٨٨١/٣/١٣، کە دکتۆر یانوفسکی بۆ مارییکوفی ناردووە.) هەروەها لەسەری دەڕوات: "من، ماوەیەک لەمەپێش، یانی بەم زوانە، کاتێ کە لەجنیف لامدا، چەند سەعاتێک لەگەڵ قەشەباشی، پیتروف دا بە دورودرێژی قسەم کرد. دوستویفسکی و بێوەژنەکەی دوستویفسکی لە نزیکەوە دەناسین، بۆی گێرامەوە کە دوستویفسکی زۆرجار باسی هەموو شتێکی بۆ دەکرد و ڕاستگۆیانە قسەی دەکرد و هیچی لێنەدەشاردەوە، بەڵام هەرگیز، بەئاماژەش، باسی ئەم ڕووداوە "ترسناکە، فەرامۆش نەکردەنیەی" نەکردووە." "بارون ڤرانگل"ش هەمان قسەی کردووە و دەڵێت: "من، بەگوێرەی قسەی دوستویفسکی خۆی، دەتوانم ئەوە دوپات بکەمەوە کە نە لە زندان و تاراوگە، نە لەکاتی خزمەتی سوپاییدا، وەکو سەربازیکی سادە، هیچ بەرپرسێک یا هاوزندانییەکی خۆی یا کەسێکی سوپایی، دەستی لەڕووی بەرزنەکردووەتەوە." هەروەها ئیمیە دۆستویفسکی، کیژی فیدورمیخائیلوفیچ، لە هەڤپەیڤینێکدا دەگەڵ گۆڤاری زەمانی نوێدا، بەمجۆرە گلەیی لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ناڤبری دەکات: "من نازانم ئەم

ئەفسانە ئەدەبییە نابەجێیەی کە گوایە بابم لە بێگارە زنداندا، سزای بەدەنی دراوە، لە کوێوە هێنراوە؟" بەهەرحاڵ گومان لەوەدا نییە، کە مەینەتی ژیانی تاراوگە و بێگارە زندان. کاری لە دوستویفسکی کردووە و زەمینەی بۆ زیاتر گەشەکردنی پەرکەم و فێدارییەکەی خۆش کردووە. هەڵبەتە دوستویفسکی یەکەمجار، لە مەرگی باوکیدا فێی لێهات. لەو سەروبەندەدا کە لە سان پتروسبۆرگ دەژیاو خەریکی کاری نووسین بوو، زۆرجار فێی لێدەهات، بەڵام لە بێگارە زنداندا، ئەم نەخۆشییە شووم و نەگریسە، گەییە پۆپەی خۆی.

میلیکوف دەڵێت: "پێش ئەوەی لە سیبریا بگەڕێتەوە، من هیچ شتێکم دەربارەی ئەم نەخۆشییەی نەدەزانی وهیچ نیشانەکیشم لێ بەدی نەدەکرد. بەڵام پاش ئەوەی بۆ سان پتروسبۆرگ گەڕایەوە، ئیدی نەخۆشییەکەی بە تەواوەتی دەرکەوت و لە کەس شاراوە نەبوو."

لە ئازاری ساڵی ١٨٥٢دا، جەنەڕاڵ، فەرماندەی قەڵایی ئومسک، داوای لە بەرپرسانی دەوڵەتی کرد، کە ڕێگەی بدەن، هەردوو زندانی بێگارە زندان، واتە دوستویفسکی و دوروف لەڕیزی بێگارە زندانییان دەربێنێ و کۆت و زنجیرەکانیان لێبکرێتەوە. ئەم پێشنیازە تەقریبەن هەموو قۆناغە ئیدارییەکانی بڕی تا گەییە بەردەستی تزار، بەڵام تزار قاییل نەبوو و پێشنیازەکەی ئیمزا نەکرد. ئیدی "هەمان ژیانی ڕوتینی و یەکهاوی و یەکنەواو پڕ بێزاری و وەڕەزی دەستی پێکردەوە، هەموو ڕۆژێک عەینی ڕۆژەکەی پێش خۆی بوو، وەکو چۆن دوو دڵۆپە ئاو وەکو یەکن، ڕۆژەکانیش بەو ئاوایە وەکو یەک بوون."

پێش هەر جەژنێک زندانییەکان دەبران بۆ گەرماو، جا چتۆ گەرماوێک، بریتی بوو لە هۆڵێکی تەنگ و تاریک، زۆر گەرم و پڕ لە دووکەڵی سپی. نزیکەی سەد کەسێکی تێ پەستێنرا بوو، بەناو قوڕ و چڵکاودا هەنگاویان دەنا. دەچوونە سەر پلەکان، ئاوی پیسیان بەیەکدیدا دەکرد. گیا گەسکیان لە جیاتی لیفکە لەخۆ دەدا. سەراپا ڕووت بوون. بەڕاستی دیمەنیان ناشرین و ناقۆڵا بوو، پێستی پشتیان کە بەهۆی هەڵمەکەوە خوسابووەوە، بەئاشکرا جێ داری پێوە دیار بوو، ئیدی هەمووی شین و مۆر بوو بووەوە. بەدەم هاوارەوە، زنجیرەکانی پێیان تەکان دەداو داوای لەگەنێ ئاوی زیادەیان دەکرد.

دستویفسکی لەو بارەیەوە دەنووسێت: "لەنێو هەڵم و بوخارە چڕەکەوە، مۆرەغەی زامداری پشت، سەری تاشراو و قۆڵ و باسکی لاواز و، لاق و لەتەری خوار بەرچاو دەکەوت. وام بیردەکردەوە کە ئەگەر قەرار بێ ئێمە، جارێکی دی، لە دۆزەخدا یەکدی ببینینەوە، ئەوا شوێنێک دەبێت ڕێک وەکو ئەو گەرماوەی کە ئەوسا تیای بووین."

دوستویفسکی، لە زنداندا، بە جەژنی ڕۆژووی گەورە، زۆر خەمبار دەبوو، خۆی لێدەبووەوە بە منداڵێکی بچووک، دەچووە کڵێسایەکی پڕ نوور و ڕوناکییەوە، دەنگ و ئاوازی کۆرسی سروود خوانان. لە سەرانسەری کڵێساکەدا، دەنگی دەدایەوەو زەمزەمەی شەپۆلی دەریای وەبیر دێنایەوە،سەراپای بەدەن و ڕوحی بەهۆی ئەم موسیقا شکۆدارەوە، بەدەم ئەم نەواو دوعاو نزا ئاهەنگدارانەوە، تازە دەبووەوە.

جاران، ئەوساکە، ئەو بەچاوی سۆز و بەزەییەوە دەیڕوانیە ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتەی لەبەر دەروازەی کڵێساکەدا خڕ دەبوونەوە. "وام دەهاتە بەرچاو ئەوانەی کە لە بەردەرگاکەوە وەستاون، وەکو ئێمە، کە لەسەرەوە و لەناو کڵێساکەدا بووین، نویژ ناکەن، ئێمە بەوپەڕی ملکەچی و گەرمی، بەدڵ و بەگیان، بەچۆکدا دەهاتین، دوعامان دەخوێند. جا ئێستا نۆرەی من بوو لە خواری خوارەوە، لە بارودۆخێکی زۆر لەوەی ئەوان خراپترا بوەستم، بەلاقی بەزنجیرو، بە مۆرو تەمغەی نەنگینەوە بوەستم . لە دووری نویژ کەرەکان دەوەستاین، لەوە دەچوو سڵمان لێبکەنەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش سەدەقەیان دەداینێ، خێریان پێدەکردین. ئێستاش لەبیرمە کە ئەو کارەی ئەوانم زۆر بەلاوە خۆش و دڵگیر بوو."

لە جەژنە گەورە مەزەبییەکاندا. زندانییەکان جلکی پاک و بلوزی خاوێنیان لەبەر دەکرد. هەوڵیان دەدا، مجامەلەی کارمەندانی زندانەکە بکەن و ڕویان لەگەڵیاندا خۆش بێت... خواردن مشە بوو، هەمووی لەسەر یەک خوان، کە سفرەیەکی سپیان پێدا دەدا، دادەنرا.

بەڵام ئەو شەوە، زندانییانی بێگارە زندان، هەر هەموویان سیامەست دەبوون، کردەوەی کرێت و ناشیرینیان دەەنواند، وەکو دڕندە بەردەبوونە گیانی یەکدی و یەکتریان کوڵەوار دەکرد. چەرکەسییەکان، کە شەرابیان نەدەخواردەوە، لە ئاستانەی دەرگاکەدا دادەنیشتن و بە کونجکاوییەکی ئاوێتە بە قێز و بێزەوە دەیانڕوانییە ئەو مەست و سەرخۆشانە کە پڕ بەزار هاواریان دەکرد، گۆرانیان دەچڕی و بالالایکایان لێدەدا. هەندێکیان دەڕشانەوە، هەندێکی دیکەیان دەڕەقسین، هەندێکی دی بەردەوام قوماریان دەکرد.

دوستویفسکی، پاشان لە وەسفی ئەو دیمەنەدا، نووسیویەتی: "فەزاو هاماجی ژوورەکە بەرە بەرە تەنگ دەبوو، هەواکەی بە کەڵکی هەڵمژین نەدەهات، پیاو دڵی تێکهەڵدەهات، بەڵام وێڕای ئەمەش، ئەم دیمەن و ڕووداوە کرێت و قێزەونانە زۆرجار دیمەنی کۆمیدی و پێکەنیناویانیش تێدەکەوت. بەڵام من زۆرم خەفەت پێدەخوارد، هێندەم بەزەیی بەم بوونەوەرە بێنەوایانەدا دەهاتەوە، دڵم دەگوشرا."

زندانییەکان لە ڕۆژی سێیەمی جەژندا، شانۆنامەیەکیان پێشکەش دەکرد. شوێنی شانۆکە و نمایشکردنەکەیان لە بەشی سوپایی ئۆردوگاکەدا، تەرتیب کرد. ئیدی چەند تەختێکیان بۆ دەرەجەدارەکان و چەند کورسییەکان بۆ ئەفسەرانی میوان دادەنا. زندانییەکان، لە کۆتایی هۆڵەکەدا وەستا بوون، بەسەری کۆت و دەموچاوی پڕ جێ برینەوە، یەکیان دەڵەک دەدا. "هەر کەسەو دەیویست، لەو ڕۆژەدا، بەشێوەیەکی باش، خۆی نیشانی بەرپرسان و میوانانی شانۆنامەکە نیشان بدات." سەرەنجام پەردە لادەبرا، دیکۆرێکی سەیری فەقیرانە دەردەکەوت. ئەو زندانییانەی کە دەوریان لە شانۆگەرییەکەدا هەبوو و دەوری موڵکداران یا دەوری ژنانی دەوڵەمەندی کۆمەڵگەیان دەبینی، وەکو هەموو زندانییەکانی دی، لەسەر تەختەی شانۆکەدا، زنجیرەکانی لاقیان لە دووی خۆ ڕادەکێشا،

دوستویفسکی دەڵێت:
"بەلای تەمەشاڤانەکانەوە، زۆر خۆشبوو، بۆ نموونە ڤانکا، کە کوڕێژ گەیەکی لاسار بوو، یا نیتسفیتاییف یا باکلوشین، بە جلێکی دیکەوە بدینن، بە جلێکی غەیری ئەو جلانەوە کە چەندین ساڵ بوو، هەر ئەو جلەیان لەبەر بوو. وەکو بابایەکی زندانی، بەردەوام کۆت و زنجیرەکەی لە دوو خۆی ڕادەکێشاو ئێستاش وەکو ئاغایەک بەردینکۆت و پاڵتۆی نایاب و شەپقەی خڕەوە، لەسەر شانۆ دەربکەوێت."
دوای تەواو بوونی جەژنەکان، ئیدی ژیانی زیندانییەکان، دەگەڕایەوە سەر بارودۆخی ئاسایی خۆی. ڕۆژان دەبورین و مانگان دەهاتن ودەچوون. ئیدی ترس و غوربەتێکی یەکهاوی و یەکنەوا باڵی بەسەر دوستویفسکیدا دەکێشا. تەنیایی بێتاقەتی دەکرد، کەسێ نەبوو گرێی دڵی خۆی بۆ بکاتەوە و دەردە دڵی بۆ بکات. هیچ شتێک نەبوو بیخوێنێتەوە جگە لە ئینجیل و هەندێ ڕۆژنامەی فەرەنسی کە بەزەحمەت پەیدا دەبوو. ئەم تەنیایی و گۆشەگیرییە بۆ دوستویفسکی خراپترین عەزاب و ئەشکەنجە بوو. خۆزگە، بەلای کەمەوە توانیبای تەماس و پەیوەندی دەگەڵ خزم و کەسوکارەکەیدا هەبێت، بەڵام نامەو نامەکاری، جگە لە هەندێ حاڵەتی ئاوارتە وریزپەڕی زۆر زەروری، لە زیندانییانی بیگارە زندان قەدەغە بوو (میشێل)ش لەترسی ئەوەی نەکەوێتە بەرچاو و گومانی لێنەکرێت و سزا نەدرێت، نامەی بۆ سیبریا نەدەنارد. ژنی هینابوو و بوو بوو بە باوک و خاوەن منداڵ. ماوەیەک بە نەهەق و بە غەدر حەپس کرا بوو و ئێستا دەترسا نامە بنووسێت و خۆی بخاتە بەر گومان و براکەشی بخاتە مەترسیەوە.
دوستویفسکی پاش ئازادبوونی لە تاراوگەی ئومسک نامەیەکی پڕ گلەیی یەجگار ناسک و کاریگەر بۆ براکەی دەنێرێت و دەڵێت: "پێش هەموو شتێک تو زاتی خوا، بۆچی تاکو ئێستا تاقە یەک دێرت بۆ من نەنووسیوە؟ هەرگیز چاوەڕوانی شتی وام لە تۆ نەدەکرد. من لە ڕێگای ئیدارەی خۆمانەوە نامەیەکم بۆ تۆ نارد، بێگومان پێت گەییوە، چاوەڕوانی وەڵامی تۆ بووم، تا ئێستا هیچ وەڵامێکم پێنەگەییوە. تۆ بڵێی نامە نووسینیان بۆ من لێ قەدەغە کردبیت؟ بەڵام خۆ نامە قەدەغە نییە، هەموو زندانییە سیاسییەکان ساڵانە چەند نامەیەکیان بۆ دێت. دوروف، چەند نامەیەکی پێگەییوە. تەسەور دەکەم هۆی ڕاستەقینەی ئەم بێدەنگیەی تۆ بزانم. مەسەلەکە پۆلیسە. تۆ لەبەر تەمەڵی خۆت نەچوویتە بۆ دارەی پۆلیس، تا لەو ڕووەوە زانیاری بەدەست بێنی. یا ئەگەر چووبیشی، ئەوا کارمەندێکی خەشیم و هیچ نەزان، پولێکی پێوە ناویت و بەڕیی کردوویت و پێی گوتوویت قەدەغەیە و تۆش باوەڕت کردووە."
پاشان، میشێل لە نامەیەکی بەرواری ١٨٥٦/٤/١٨دا بەمجۆرە پاکانە بۆ ئەو هەڵوێستە نەرێنییەی خۆی دەکات: "من دوای سێ مانگ لە ڕۆیشتنی تۆ، هەوڵمدا، مۆڵەتی نامەنووسین بۆ تۆ وەربگرم. خودا شایەدە، کە چەندم تەشەبوز بەم و بەو کردووە، بەڵام هیچم بە هیچ نەکرد، ڕوم دەکردە هەر

شوێنێ، بەناوی یاساوە دەستیان بەڕوومدا دەناو دەیانگوت تا زیندانییەکە لە بێگارە زنداندا بێ، مەحاڵە ڕێ بدرێت، نامەی بۆ بنێردێت. سەبارەت بەوەش کە بەنهێنی نامەت بۆ بنێرم، لە زۆر لاوە ئاگاداریان دەکردم کە کاری وانەکەم بۆیە پڕیارم دا، هەر دەرفەتێکم بۆ هەڵبکەوێ یارمەتیت بدەم، بیئەوەی تۆ یا خۆم بخەمە مەترسییەوە. براکەم، ئازیزەکەم من ئێستا خاوەنی شەش منداڵم، من پێموا بوو، ئێستاش لەو باوەڕەدام کە پۆلیس ژێراو ژێر چاودێریم دەکەن، وا تەسەور نەکەی، ئەگەر نامەی نهێنی منیان گرتبا، بە ئاسانی لێم خۆش دەبوون."

بەهەرحاڵ، ئەوەی شایانی باسە، دوای ئازادبوونی "دوستویفسکی"ش، میشێلی برای نامەی زۆری بۆ ناردبێ. بۆ دوستویفسکی ساڵی کۆتایی زندانییەکەی، وەکو ساڵانی یەکەم دژوار و ناخۆش نەبوو، توانیبووی لوتف و میهری هەندێ لە زندانییەکان بەدەست بێنێ. ناسیاوی دەگەڵ هەندیک لە خەڵکانی شارا پەیدا کرد بوو، مۆڵەتی خوێندنەوەی هەندێ کتێبانی بەدەست هێنابوو. لەو بارەیەوە دەڵێت: "یەجگار زەحمەتە بتوانم گوزارشت لەو ساتەم بکەم کە یەکەم بڵاوەکراوەی چاپکراوم، کە گۆڤارێک بوو، خوێندەوە... بە من بوایە وشەکان بخۆم، دەمویست هەرچی بن دێر و سەردێڕ هەیە، بەچاو قووتی بدەم. دەمویست ڕازو ڕەمزەکانی ئەو دیوی وشەکان کەشف بکەم، ئەو ئاماژە و بیرۆکانە بدۆزمەوە، کە کاتی خۆی، کاتێ کە من ئازاد بووم، زەین و هزریان دەهاڕوژان. کە دەمبینی چەند بەم ژیانەی کە ئێستا، لەم شوێنەدا هەمبوو، نامۆ و بیگانەم، زۆرم خەفەت دەخوارد."

ئەنجام گەڵای درەختان زەرد بوون. گیای دەشت و بیابان وشک بوو. یەکەمین بەفری ساڵ دەستی پێکرد، سووک و هێدی بەدەم باوە دەکەوت. کاتی ئازاد بوون نزیک بووەوە. دوستویفسکی زۆر ئارامە، زندانییانی بێگارە زندان لە حەوشەکەدا تووشی دەبن، پیرۆزبایی لێدەکەن. دوستویفسکی پێیان دەڵێت: "نوخشە بێ لە ئێوەش، ڕۆژێ دێ ئێوەش ئازاد دەبن."

یەکێک لەوانە، نیگای پەرێشانی دەبڕێتە ئاسمان و دەڵێت: "ئاهـ، نا، من، نا، هەیهوو، من لەکوێ و ئازادی لە کوێ. هێشتا حەوت ساڵی دیم ماوە."

ڕۆژێ، پێش ئازادی. بەیانی زوو، بەر لە ڕۆژهەڵات، دوستویفسکی، وەکو عادەتی هەمیشەیی خۆی، پیاسەیەکی دەوری دیوارە دارینەکە دەکات، بەدڵێکی خەمینەوە ماڵاوایی لەم دیوارەو لە کاریتە دارینەکانی کە لەگەڵ تێپەڕبونی ڕۆژگاردا ڕەنگیان بوارد بوو، لەو کوشکە کۆنانە دەکات. خەفەت بۆ ئەوە دەخوات کە تەمەنی لاوی و ئاواتەکانی لەم گۆڕستانەدا ناشتبوو و ئێستا کە شەکەت و ماندوو، نائومێد و بێ هیوا، پیر و خەڕۆ، لە تاراوگە و زندان ئازاد دەبوو، دەبێ سەرلەنوێ بخەبتێ، ڕەنج بدات و بژی... لەپای چی؟ بۆکێ؟

دوستویفسکی، بەیانی زوو، پێش دەست پێکردنی کاتێ چوونە بێگاری، دەچێت بۆ قاوشەکان تا خودا حافیزی لە هاوڕێکانی بکات. لەوبارەیەوە دەنووسێت: "زۆر دەستێن لاوازو زبرم بۆ درێژ کران، بەڵام ژمارەی ئەوانەی کە دۆستانە تەوقەیان لەگەڵدا کردم زۆر نەبوو. تێکڕا وایان هەستدەکرد، کە من

تۆزێکی دی دەبم بە کەسێکی دی. هەندێکیان ڕوویان لێوەردەگێرام. پشتیان تێدەکردم و سوور بوون لەسەر ئەوەی سڵاوەکەم نەسەننەوە. تەنانەت هەندێکیان مۆرەو خێسەیان لێدەکردم."

پاش ئەوەی جماعەت چوون بۆ بێگار. "دوستویفسکی"یان برد بۆ کارگە و وەرشەی ئاسنگەران، کە زندانییانی بیگارە زندان، ئەوانەی ئاسنگەرییان دەزانی، کاریان تێدا دەکرد و کۆت و زنجیرەکەیان بۆ کردەوە. بە چەکوشێک زنجیرەکەیان بۆ شکاند و لە پێی کەوتە خوارەوە. دوستویفسکی هەڵیدەگرێتەوەو نیگایەکی قووڵ و دوورودرێژی دەکات. زندانییەکان، بەدەم پیرۆزبایی و خوداحافیزییەوە، چەندین جار دووبارەی دەکەنەوە: "پیرۆزە، خودا حافیز، خودا ئاگادارت بێ." بەڵام دوستویفسکی لەجێی خۆی ناجوڵێت، گریانێکی بەکوڵ لە ئەوکی دەگیرێت. حەز دەکات بگری، هاوار بکات. ئازاد، ئازادە! بەلارە لار لە کارگەی ئاسنگەرییەکە وەدەر دەکەوێ و دەڕوانێتە ئاسمان.

دوستویفسکی لە ١٨٥٤/٢/١٠ لە تاراوگە دەگەڕێتەوە. بەڵام لە مانگی ئازاری هەمان ساڵدا دەنێردرێت بۆ سیمی پالاتینسک. بەڵام پێش ئەوەی بۆ ئەوێندەر بڕوات، دوو هەفتەیەک لە شاری ئومسک، لای ماڵباتی ئیڤانوف، کە دۆست و ناسیاوی بوون، دەمێنێتەوە. خانم ئیڤانوڤی کچی ئانانکوف دیسامبەریست بوو. کاتی خۆی کە دوستویفسکی بەرەو زندان و تاراوگە، بە شاری توبولسکدا تێدەپەڕێ، یەکدی دەبینن. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە نووسەر: "دوستویفسکی" لە زیندان و تاراوگەدا دەبێت، ئەو خانمە ومێردەکەی، بە ئەرکی خۆیانی دەزانن، کەم و زۆر، بەهەر شێوەیەک بووە، یارمەتی بدەن و لە دەردو ڕەنجی کەم بکەنەوە. هەندێجار، کەمێک پارەیان بۆ دەنارد، هەندێجار سووکە پێویستی ژیان و هەندێ کتێبیان بۆ دەنارد، دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "بەڕاستی ئاغای ک. ئیڤانوف، بۆ من برایەکی ڕاستەقینە بوو. هەر چییەکی لەدەست هاتبێ بۆ منی کردووە، من بیست و پێنج ڕۆبڵی ئەو قەرزدارم."

"دوستویفسکی"یان بە چەند قۆناغێک بۆ سیمی پالاتینسک نارد، تا لەوێندەر پاشماوەی سزایەکەی، وەکو سەربازی سادە لە فەوجی حەوتەمی سیبریا تەواو بکات.

دوستویفسکی، دەگەڵ زندانییەکانی دیکەدا بە پێیان دەڕۆیشتن. لەڕێگادا تووشی عەرەبانەیەکی پڕ لە کێبڵ بوون. دوستویفسکی و هاوڕێکانی، سوار بوون، لەسەر گورزە کێبڵەکان دانیشتن، عەرەبانەکە زۆر بەخاوی دەڕۆیی. دنیا زۆر سارد بوو. هەوران بەئاسمانەوە، بە بێدەنگی پەراگەندە دەبوون و دەڕەوینەوە. فیدور میخائیلوفیچ، خۆشحاڵ بوو، غەمگین بوو، لە دڵی خۆیدا و بەشێوەیەکی سەیر منەتبارو مەمنوون بوو.

## فەسڵی پێنجەم
## ئیلهام و کەشفی سێ لایەنە

نیکراسوف، بەقسەی خۆی لە قەسیدەی "رێنەوایان"دا چیرۆکی، ژیانی دوستویفسکی لە تاراوگەو بێگارە زنداندا، دەگێڕێتەوە: زندانییەکی سیاسی، دەنگ خۆش، بە دوو دەستی سپیەوە لە سەرەتاوە، لەلایەن هاوزنجیرەکانیەوە دەبوغزێنرێت و ڕووی نادرێتێ. بەڵام شەوێک بە دیار زندانییەکەوە کە لە گیانەڵڵاندا دەبێت، ئەوانی دی ئامۆژگاری دەکات، کە ڕێزی دوا ساتەکانی ژیانی دۆستە هاوبەشەکەیان بگرن. ئیدی لەمەوە بەرە بەرە لێی نزیک دەبنەوە و ڕێزی دەگرن و بە مامۆستای خۆیانی دەزانن.

پاشان دوستویفسکی، دەگەڕێتەوە ودووبارە لە سان پتروسبۆرگدا دەردەکەوێتەوە، نیکراسوف قەسیدەکەی خۆی نیشان دەدات و بۆی دەخوێنێتەوە، دوستویفسکی دەڵێت: "بە پێچەوانەوە، من بووم بە مورید و قوتابی زندانییانی بێگارە زندان."

بەڵێ، بەڕاستی دۆستویفسکی بوو بە مورید و قوتابی ئەوان. ئەوەی لەوانەوە فێری بوو، لە زندانییانی بێگارە زندانەوە فێری بوو، هەرگیز لەبیری

نەچووەوە. ئەم چوار ساڵە، بۆ ئەو نەشونماو گەشەکردنی بلیمەتی و بەهرەی ئەو، زەخیرەو گەنجینەیەکی پەنهان و دەوڵەمەند بوو. ئەم چوار ساڵە بوو بە کۆڵەکە و ئەستوندەگی ژیانی ئەو. ژیانی ئەوی تەقریبەن کرد بە دوو بەشی یەکسانەوە. دوستویفسکییەکی پێش یادگارییەکانی خانەی مردووان و دوستویفسکییەکی پاش یادگاریەکانی خانەی مردووان. هەڵبەتە ئەم دوو کاراکتەرە، جیاوازی بنەڕەتیان لەنێواندا نییە. بەڵام دووەمیان لە یەکەمیان دەوڵەمەندترەو لە هەمان کاتدا درێژەی یەکەمە.

دوستویفسکی، بۆچوونی دەربارەی قۆناغی سیبریای، جیاواز و بگرە هەڤدژە. هەندێجار بەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستییەوە یادی دەکاتەوە و هەندێجاریش نەفرەتی بۆ دەنێرێت. لەو نامانەدا کە دوای ئازاد بوون نووسیونی، گلەیی و گازاندەیەکی ئاوێتە بە دوعای منەتباری و شوکرانە بژێری و ملکەچی مەسیحییانە بەدی دەکرێت.

"چەندیش گلەیی لە وەزعی خراپی خۆ بکەم هێشتا هەر کەمە! چوار ساڵ، چوار دانە ساڵ هەر بەدەم ئاسانە." یا "ئەو ڕامان و تێفکرینەی کە لەزینداندا بەردەوام پەنام بۆ دەبرد بێفایدە نەبوو. لە سایەی ئەو ڕامان و هزرینانەوە، کۆمەڵێک ئاوات و هیڤیم لا پەیدابوون کە جاران هەر بە بیرمدا نەدەهاتن."

"هەندێجار، هەر کەسێکی تازە هاتبا، ئیدی تاوانبار بوایە یا بێتاوان، وەکو دزێک تەمەشام دەکرد، کە هاتبێ ژیانی من بە ڕۆژی ڕوناک بدزێت و کەس لێینەپێچێتەوە و وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەربچێت." "من چاوەنۆڕی شتێک بووم کە خۆیشم نەمدەزانی چییە. هەمیشە وام هەست دەکرد، شتێک لە حاڵی ڕوودانداىەو کاریکی بنجیڕ لە وەزع و حاڵی من دەکات. وام وێنا دەکرد لە قەیرانیکی ڕاستەقینە نزیک دەبمەوە. دەتگوت خۆ بۆ ئایندەیەکی نهێنی ئامێز ئامادە دەکەم. وام خەیاڵ دەکرد بەو زوانە ڕووداوێکی خۆش و شیرین و ئارام، یا لەوەیە کەمێ شووم و ترسناک لە ئاستانەی ڕوودانداىە، ڕووداوێک کە هەرگیز ناکرێ ڕێی لێ بێتە گرتن..." هەروەها دەنووسێت: "زندان و تاراوگە، زۆر شتی لەمندا کوشت و زۆر شتی تیامدا ژیانەوە. ئەمە مەینەتی و قەدەری من بوو و مستەهەقی ئەوە بووم..." "بەڵام چوار ساڵ، من لەماوەی ئەو چوار ساڵەدا وام هەست دەکرد، بەزندوویەتی لە تابووت نراوم و زندە بە گۆڕکراوم. چ دەورانێکی ترسناک بوو! هاورێم، من توانای ئەوەم نییە، بەوردی چیرۆکی ئەو ماوەیەت بۆ بگێڕمەوە. بەدرێژایی ئەو چوار ساڵە بۆ ساتێکیش، ئەوەم لەبیر نەچوو کە لەتاراوگە و زنداندام."

دوستویفسکی لە کتێبی "یادگارییەکانی خانەی مردوواندا" ئەزموونی سیبریا دەگێڕێتەوە. هەرچەندە هەوڵیداوە لەم کتێبەدا خۆی لەژێر پەردەی کاراکتەرێکدا بەنێوی ئەلکساندر پتروفیچدا بشارێتەوە کە یەکێکە لە زندانیانی گروپی دووەمی بێگارە زندان، لەسەر ئەوەی ژنەکەی خۆی کوشتووە، زندانی کراوە.

هەڵبەتە ئەوەی سەبارەت بەم کەسە نووسیویەتی و گێڕاویەتیەوە، بەئاشکرا باسی سەربهوردی خۆیەتی. دیارە کاتێ دوستویفسکی کتێبی

یادگارییەکانی خانەی مردوانی بڵاوکردەوە، یاساو ڕێساو ڕێکارەکانی تاراوگە و زندانەکان گۆڕابوون، ئەوە نەبوون کە لەسەردەمی ئەودا باوبوون و پەیڕەو دەکران. ئەو ڕیفۆرمانەی ئەلکساندری دووەم کردنی، بارودۆخی تاراوگە و زندانەکانیشی گرتەوە، ئیدی ئەو سیستەمە قورس و پاشکەوتووانەی کە نیکولای یەکەم داینا بوو، هەر هەموو ژێرو ژوور بوو. ئیدی لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە چاودێرییەکی ورد و تەواوی کارمەندان و بەڕێوەبەران و بەرپرسانی تاراوگە و زندانەکان دەکرا. بۆ نموونە ئەشکەنجەی بەدەنی لەسەر زندانییەکان بە یەکجارەکی هەڵگیرا بوو و ئەمە یەکێک بوو لەو ڕیفورمانەی کە کرا بوو.
ئیدی کتێبەکەی دوستویفسکی، ڕەخنەی لە ڕەوش و بارو دۆخێک دەگرت، کە تزار بە خۆیشی پێی قاییل نەبوو. بۆیە سانسۆر و دام و دەزگای سانسۆر، زۆر بەئاسانی ڕێگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕمانەکەی دا بەو مەرجەی "هەندی ڕستەی ناشایستەی لێ لابدات."
هەڵبەتە دوستویفسکی بەخۆیشی مەبەستی بوو هەندێ ڕوونکردنەوە، لە پەراوێزی کتێبەکەیدا تۆمار بکات بۆ نموونە لە پەراوێزێکدا دەنووسێت: "ئەوەی دەربارەی ئەشکەنجەی بەدەنی نووسیومە، هی ئەو سەردەمەیە کە من تیایدا لە زندان بووم، بیستوومە گوایە ئێستا ڕەوشەکە بە تەواوەتی گۆڕاوە یا لەحاڵی گۆڕاندایە." یا دەنووسێت: "لە زەمانی مندا، نەک هەر مێجەر، بەڵکو گەلێک لە کارمەندان و بەرپرسانی بچووکیش، ئەم جۆرە زاراوانەیان بەکار دەبرد."
هەڵبەتە نابێ وا وێنا بکرێت کە دوستویفسکی بە نووسینی یادگارییەکانی خانەی مردووان، هەر هەموو ئەزموونەکانی سەردەمی تاراوگەی خۆی کۆکردبێتەوە و تۆماری کردبێت و ئیدی جارێکی دی نەگەڕێتەوە سەری. بەڵکو ئەم بەرهەمە بەرزە، کە بەوپەڕی ڕاستگۆیی و بەڕاشکاوییەکی دڵتەزێنەوە پەردە لەسەر حەقیقەتە بەشەرییەکان لادەبات، یەکەمین نۆبەرە و دیاری ئەم چوار ساڵەیە.
دوستویفسکی بەرخوردی دەگەڵ دنیایەکدا کردووە، بەخۆی و لە نزیکەوە جەڕباندوویەتی و وێنەی گرتووە و گوزارشتی لێکردووە. بەڵام ئەم ڕۆمانە لە ڕاستیدا چەند دراوێکی وردەیە کە لەو گەنجینەیەی دەرهێناوە یانی بەنووسینی ئەم کتێبە تەنیا بارێکی قورسی لەسەر شانی خۆی لابردووە و کەمێک باری خۆی پێ سووک کردووە.
کاتێ دەتوانێ لە سیحری سیبریا ڕزگار بێت و ئازادانە ئاسمانی بخاتە ژێر باڵی فڕینەوە، کە بە تەواوەتی خۆی لەژێر ئەم بارە قورسە ڕزگار بکات و ئەم سەرە سفرکراوانە و دەم و زارە شێواوانە و جنێوە پیسانە و بیرو بۆچوونە نزمانە فەرامۆش بکات کە گوزارشتیان لێبکات. دوستویفسکی لە یادگارییەکانی خانەی مردووانـدا، تەنیا ئەو شتانەی نووسیوە کە لەتاراوگەو زنداندا بەچاو دیتوونی، ئەوجا لەسەرێتی، ئەو شتانە بڵێت و بنووسێت کە لەوێندەر فێریان بوو بوو، بەڵام هەر هەموو تەمەنی بەشی ئەوەی نەدەکرد

ئـەوەی لـەدڵ و دەروونیـا بـوو، وەکـو پێویســت دەرببڕێـت و گرێیـەکانی دڵ و دەروونی بکاتەوە.
بەرخورد دەگەڵ جەماوەری خەڵکدا، بەرخوردو مامەڵە دەگەڵ ڕووسیادا، مامەڵە دەگەڵ ئینجیلدا، ئەم پەڕجووە سییانیە، لە ژوورێکدا، لە ژووریکی بۆگەندا، لە قوڵایی سیبریادا و لە کات و ڕۆژانێکدا ڕوویاندا، کە هەموو کەس و کارو دوست و ناسیاوانی دوستویفسکی وایان وێنا دەکرد، کە ئیدی ئەو پیاوە تەواو، تیا چوو.
لە سـەرەتاکانی سـەدەی نـۆزدەدا، دەسـتەبژێری ڕۆشـنبیری ڕووسـیا، لـەنێو جەرگـەی ئیمپراتۆریـەتێکی بـەربڵاودا، کـە هێشـتا ئامـادە نـەبوو، بەئاسـانی پێشوازی لـەو جـۆرە دەسـتەبژێرە بکـات، زۆر بەلـەز سـەری هەڵـداو بـەخێرایی بەرەو گەشەکردن و نەشونما دەڕۆیی. ئەم دیاردەیە، دیاردەیـەکی دەسـتکرد و نائاسایی بوو، زەمینـە و داب و نـەریت و کەلـەپوور و پاشـخانی تایبـەتی خـۆی نەبوو.
ئیـدی گروپـی ڕۆشـنبیران، لـە هەوەڵـەوە خـۆی لـە نێـوان دوو جەمسـەری بەهێزدا، یەکسان لە ڕووی تواناو هێزەوە دەبینێتەوە. لە سـەرووی خۆیـەوە تـزار دەبینێ کە توانا و دەسـەڵاتی لەلایـەن کڵێسـاوە پشـتیوانی و پیـرۆز دەکرێـت. تزار بۆ خۆی دەسـەڵات و پایـەی هـەرە باڵایـەو توانـاو دەسـەڵاتی هـەموو پایـە باڵاکـانی دیکـە لـەودا کۆبوونەتـەوە و خـوای سـەر ئـەرزە. یـانی تـزار ڕەمـز و سـونبلی ژیـانی میللەتـە. لەژێریشـەوە میللـەت هەیـە. میللـەتێکی پەشـێو و پەرێشـان. بـەڵام چـالاک و چەلـەنگ: نـەدەکرێت وەکـو پێویسـت و بەئاسـانی تێکەڵاوی ببیت و نەدەتوانرێت بە ئاستەمیش لە دەسەڵاتی تزار بدرێت یـا کـەم بکرێتەوە. ئیدی تزار و میللەت دوو یەکەی هەمیشـەیی و ئەبـەدین و چـەرخی ڕۆژگـار، کـار لـە بوونیـان ناکـات و هـەموو هێـز و توانـای خۆیـان لـەم نـەمری و ئەبەدیەتـەی خۆیانــەوە هەڵــدەهێنجن و وەردەگــرن. بــەڵام تــزار و میللــەت لەیەکـدی تێناگـەن. ئـەم دوانـە هـەن، بـەڵام هـەر یەکـەیان بـۆ خۆیـان هـەن. هەریەکەیان بـۆ خـۆی ڕەمـز و ڕازی پـەنهان و سـەیری خۆیـان هەیـە. دەکرێـت بـاوەڕ بــە بــوونی هــەردووکیان بکرێــت، چونکــە هــەردووکیان لــە "گروپــی ڕۆشنبیران" جیاوازن.
جـا ئـەم بانگـەواز و هاندانـە گۆنگـەی جـەماوەر، لـە ڕۆژئـاوادا، و بـۆ ڕۆژئـاوا دیاردەیەکی ناواقیعی و نەناسراو بوو. چونکە ئەم بانگ و بانگـەوازە لـە وڵاتێکـدا قـابیلی قبووڵـە و پەسـەند دەکرێـت، کـە چینـە کۆمەڵایـەتی وجڤاکیـەکان، بەڕوونی و بە ئاشکرا، لە هەنبـەر یەکدا وەسـتابن: لـەم بـەرەوە ڕۆشـنبیران و لەو بەرەوە جەماوەری خـەڵک. فەرهـەنگ و کـەلتووری ناسـک و پیشـکەوتووی ئەوروپایی لـە هەنبـەر نـەزانی تـەواوی هۆڤیـەکان. لـەنێوان ئـەم دوو جیهانـەدا هیچ جۆرە هەڤبەندی و لێک حاڵی بوونێک نییـە. لـە ڕووسـیادا ژمـارەی چـین و توێژی ڕۆشنبیران کەم بـوو، ژمـارەی جـەماوەری خـەڵک و میللـەت یـەجگار زۆر بـوو. ئیـدی ئـەم گروپـە ڕۆشـنبیرە بـژاردەو کەمـە، کەوتبوونـە ژێـر کاریگـەری و ئەفسـوونی جـەماوەری خەڵکـەوە. دەترسـان لـەنێو جـەماوەردا بتوێنـەوە. ئـەم

گروپە بژاردەیە دەیانویست لە جەماوەری خەڵک تێبگەن، تێی بگەیەنن و فێری بکەن تا بتوانن کۆنتڕۆڵ و ئاڕاستەی بکەن. تا کەمتر لە جەماوەر حاڵی دەبوون و تێی دەگەیشتن، کەمتر دەیانتوانی فێری بکەن و ئاڕاستەی بکەن.
کاتێ کە دوستویفسکی منداڵێکی چکۆلە بوو. زیاتر دڵبەندی موجیکانی گوندی داروڤوی و نەخۆشانی هەژار و نەداری نەخۆشخانەی ماری بوو. پاشان کە چووە سان پتروسبۆرگ، زیاتر کەوتە بایەخدان بە جەماوەری خەڵک، بەڵام تەنیا لەڕووی مادیەوە: داواکارییەکانی بریتی بوو لە هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆیلایەتی، لابردنی ئەشکەنجەی بەدەنی. کردنەوەی قوتابخانان لە گوندەکاندا. بەڵام کە زندانی کراو ڕەهەنەی تاراوگان بوو، مەیل و ئارەزوویەکی دیکەی لا پەیدا بوو، خۆی لەنێو میللەت و لە پیشی میللەتدا بینییەوە، بەڵام ئەو میللەتەی کە ئەو حەزی دەکرد، تیکەڵاویان ببێ و پەیوەندییان پێوە بکات، ڕەفزی دەکات. چونکە ئەو بابایەکی ئاغایە، ئەربابە و ناتوانێ ببێ بەیەکێک لە موجیکان، کەسێک کە هەموو تەمەنی ئاغا بوویێت، چۆن دەتوانێ ببێ بە موجیک.
دۆستویفسکی، بە خەمباری و سەرسامی، بەڵام بێهیچ کەرب و کینیک، ئەو ڕەفز کردنە قبووڵ و تەحەمول دەکات. چوار دانە ساڵ بەتەنیا، بەگۆشەگیری، لە نێو خەڵکانێکدا دەژی کە هاونەژادی ئەو نەبوون. چوار دانە ساڵ، تەحەمولی دەسەڵاتی ئەم خەڵکە هەژار و بێنەوایە دەکات. چواردانە ساڵ دادەنەوێتەوە و دەڕوانێتە ئەم چاڵە قوڵەو هەوڵدەدات کە نەکەوێتە ناویەوە. بەدرێژایی ئەم ماوەیە لەنێو کۆمەڵێک خەڵکی کێوی و پاشکەوتوو و نەزان گیرۆدە بوو بوو. ئیدی ئازاری بە گەوجێتی، بە دزێوی، بە بەدخوایی و دڵڕەقی و شەڕەنگێزییانەوە دەکێشا
"مادامێکی بوونەوەرانێکی زندوون، چۆن دەشێت هەمان کارێن خراپ و نەنگینی بوونەوەرێکی زندوو نەکەن." بەڵام وردە وردە، ڕوحێکیان تیا کەشف دەکات. لە نامەیەکدا بۆ براکەی دەڵێت: "ئەنجام لەنێو زندانیانی، بیگارە زنداندا، خەڵکانێکم دۆزییەوە. خەڵکانێکی، مەردو ڕەند، نەفس بەرز و پیاوانە، بە ورەو جوان: ئاڵتوونی ژێر سەرەنوێلکان."
ئەم کەشفە، هەم دڵخۆشی دەکات و هەم ئازاری دەدا. ئیدی ئەمە بوو بە خولیا و خەمی. میللەت نە زیرەکەو نە خوێندەوارە. میللەت ئەوانەن کە بەشان و بازوو و دەستی خۆ کاردەکەن. بیرناکەنەوە، جەماوەر لە ڕاستیدا هەمان ژیانی ئۆرگانیکی و فیزیولۆجی میللەتی ڕووسە. بابەیەکی موجیک بەر لەهەر شتێک وەکو منداڵێک وایە. لەناخی خۆیدا هەمیشە هەمان سادەیی و ساکاری وپێگەردی منداڵی هەڵگرتووە. حەقیقەتی منداڵیەتی لەخۆیدا دەپارێزێت . لە دنیای ڕۆشنبیری و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و درۆ ودەلەسان دوورە. لە زانست دورە. لە خواوە نزیکەو بێئەوەی بە خۆی بزانێت نهێنی ژیان و مومارەسەی ژیانی بەگوێرەی خواستی خۆی لە خۆیدا پاراستووە. چوون بەرەو پیری جەماوەری ڕەش و ڕووتی خەڵک، دەکاتە بە پیرەوەچوونی خودا.

ئەم جۆرە هزر و بیرە، هەمان هزر و بیرە کە دوستویفسکی زۆر جار لە ڕۆمان و یادەوەرییەکانی خۆیدا باسی کردووە و شاخ و باڵی لێناوە. با "ماریی" موجیک وەبیر خۆبێنینەوە، کاتێ دوستویفسکی گوێی لە هاوارێک دەبێ: "ئەهای گورگ، تاوی دەنێ" دەترسێت و بەغار بەرەو لای "ماریی" دەڕوات و توند سەری قۆڵی دەگرێت، "ماری" قامکە ئەستوورە خۆڵاویەکانی، بەدەم و لێویدا دێنێ و بە کاوەخۆ هێوری دەکاتەوە و دەڵێت: "مەترسە، مەسیح ئاگادارت بێ."

دوستویفسکی لەنامەیەکی بەرواری ١٨٥٤/٢/٢٢دا دەڵێت: "بەڕاستی میللەتێکی سەیرە! من وەختەکەی خۆم بە فیڕۆ نەداوە. هەرچەندە هەموو ڕووسیام نەخستووەتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە، بەڵام میللەتی ڕووسیا، دەناسم. کەم کەس وەکو من ئەم میللەتە دەناسێت."

ئیدی دوستویفسکی، دوای ماوەیەک، دەوری فریاڕەسێکی، بەڕاستی مەسیحایی، بۆ جەماوەری ڕەش و ڕووتی میللەتی ڕووس دەبینێ. لەحاڵی حازردا، تەنیا بەوەوە دەوەستێ کە ئەو میللەتەی خۆش بوێ و سەری ڕێز و حورمەت لە هەنبەریدا دابنەوێنێ. پیرتز، کە لە دۆستانی دوستویفسکی بوو، دوای چەند ساڵێک دەیگێڕێتەوە کە ڕۆژێک دوستویفسکی لە ماڵی سوسلوف میوان دەبێ، دکتۆرێکی گەنج، ئیراد لە بیرو بۆچوونە سۆفیانەکانی دەربارەی ڕووسیا دەگرێت. ئەنجام دکتۆرەکە دەڵێت: "کێ ئەو مافەی بەتۆ داوە کە بەمجۆرە بەناوی میللەتی ڕووسیاوە قسە بکەی؟"

دوستویفسکی، گزو گومەت، دەلنگی پانتۆڵەکەی هەڵدەکات و شوێنەواری زنجیری سەر لاقی کە هێشتا بەلاقیەوە دیار بوو، نیشان داو گوتی: "ئەمە، ئەو مافەی داومەتێ."

هەڵبەتە ڕووکردنە جەماوەری خەڵک و میللەت بەو جیهانبینی و نۆرینە ئایدیالیە و پشت کردنە کەلتوور ڕۆشنبیری بەو توندییە، زادەی ئەوە بوو کە ئەو لە ناوەندی ڕۆشنبیریی و لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ڕۆشنبیران دابڕا بوو. نە کەس نامەی بۆ دەنووسی و نە کتێبی دەخوێندەوە، تاقە توێشووی ڕوحی ئەو، خوێندنەوەی ئینجیل بوو. ئیدی ئینجیل بۆ ئەو دەیکردە زاڵبوونی دڵ (سۆز) بەسەر ئەقڵدا. بیرو بۆچوونەکانی ناو ئینجیل، بۆ ئەو زۆر گرینگ و لە ڕیزی پێشەوە بوو. ئیدی لەوە بەدواوە، شوێنەوار و سێبەری فەلسەفەی ئینجیلی، لەتێکڕای کارەکانی و ژیانیدا، دەنگدانەوە و ڕەنگدانەوەی ئاشکرای هەیە.

ئایا بابەتی ڕۆمانەکانی قۆناغی دووەمی ئەو، جگە لە سەربهورد و چیرۆکی ژیانی زاهیدانی هاوعەسری خۆی شتێکی دی هەن؟ ئەو زاهیدانەی کە لە سەرەتاوە بەرخورداری لوتفی خوایی بوون، پاشان کەوتنە گومان و دوو دڵیەوە، دووبارە گوناحکار و فەرامۆشکراو و پاشان گەڕانەوە و گەیینە مەعریفەتێکی دەروونی لە گوتن نەهاتگ.

خوێندنەوەی دەقی مەزەبی، ڕێڕەوی سەرەکی بەرهەمەکانی دۆستویفسکی دەگۆڕێت و کار لە بونیاد و سکیچی گشتییان دەکات، شادی

و ناشـادی، خۆشــی وناخۆشــی خەلقەنـدەکانی دۆستویفسـکی، لـە ڕەنـج و شادیانی زەمینـی دەردەچـن. ڕۆمانـەکانی دەبـن بـە ڕۆمـانی دوو نهـۆمی. لـە نهۆمی یەکەمدا، ژیانی ڕۆژانە بە هەموو ژاوەژاو وغەڵبە غـەڵبێکی خۆیـەوە، بـە هــەموو کێشــە و سەریەشــەکانیەوە، بــە هــەموو حەســوودی و بــەغیلی و غیرەیەکیەوە، بـە هـەموو مەسـەلەیەکی جەسـتەیی و داراییـەوە، بـە هـەموو ڕووبینی و مجامەلەیەکەوە، تێپەڕێت و شـێوە و فـۆرمی جیـاواز لـەخۆ دەگرێـت. بەڵام لـە نهـۆمی دووەمـدا کارەسـاتە یـەک لـە دووی یـەک و ڕاسـتەقینەکانی ئینسـان دەسـت پێـدەکات، ئـەویش گەڕانـە بـەدووی خـوادا، هەوڵدانـە بـۆ دۆزینەوەی ئینسانی تازە.
خوێندکارێک پیرەژنێکی سووتخۆر دەکوژێت. کوڕیک بەڕادەیەک لە بـابی بێـزارە کـە مـەرگی بـە ئـاوات دەخـوازێ. مێردێکـی بـەرەڵڵا و بێغیـرەت لـە بەرامبـەر ژنەکەیدا کە دەرگای ژوورەکەی لە نـاوەوە لـە ڕوویا داخسـتووە، دەگـری. هـەر هـەموو ئەمانـە لـە ڕێـڕەوی ڕووداوەکـەدا ئاسـاییە، ناکاتـە تراجیـدیا. تراجیـدیای ڕاستەقینە، تراجیدیایـەکی تـەواو ئەخلاقیـە،لە نـۆرین و ڕوانگەیـەکی بـەزرەوە، ڕوانگەیـەک کـە لـە بـەرزترین خـاڵی ڕوحـی مرۆڤـانیش تێدەپـەڕێت. ئامـانج و مەبەســـتی دوستویفســـکی و ئـــەوەی لەبەرهەمەکانیـــدا ڕەنگدانـــەوە و دەنگدانەوەی هەیە، تـەنیا خۆشـبەختی و بەدبەختیـەکانی خـەڵکی نییـە، کـە بـەلای خەڵکیـەوە مەبەسـتن. لـە بەرهەمـەکانی ئـەودا، سـەروەت و سـامان مەبەسـت نیـە، پێگـە و پایـەی کۆمەڵایـەتی مەبەسـت نییـە. بەختـەوەری و سـەرکەوتن و گونجـانی زەوجـین ئامـانج نییـە، ئەمانـە خولیـا و خـەمی ئـەو قارەمانـە ڕوحانیانـە نییـە، قارەمانـەکانی عـەوداڵی شـتە ئایدیالیـەکانن. هـیچ شتێکیان لەم دنیایەی ئێمەدا ناوێت. عەوداڵی یەقینیەتن و لـەخودا دەگـەڕێن و گەرەکیانە بگەنە خوا.
بۆ نموونە کیریلوف لە ڕۆمانی "المهووسون"دا دەڵێت: "لەوەتای هەم، بەدرێژایی تەمەنی خۆم، بیرۆکەی خوا، عەزابی داوم و بەدەم بیرۆکەی خواوە تلاومەتەوە." ئەمە هەمان ئەو عەزابەیە کە دوستویفسکی لە ژیانی خۆیدا پێوەی تلاوەتەوە. فیدورو میخائیلوفیچ، بەعەمراتی خۆی، نەگەیووەتە باوەڕ و ئیمانێکی پتەوی خاڵیسەی دوور لەهەر گومانێک. ڕاستە پرتەوی ئەشقێک لە بوونیا درەوشاوەتەوە، پەرەی سەندووە، بەڵام بەو ڕادەیە نەبووە بیکات بە کەسێکی ئیماندار و ئاسوودە بیر و دڵ ڕەحەت. چونکە لە هەنبەر ئەو پریشکە نورانیانەدا، پریشکێن ئەهریمەنانەش لە ناخیدا پرشنگ دەدەن و نایەڵن بگاتە ئیمانی خاڵیسەو یەقین. یانی وای لێدەکەن لە پەراوێزی لوتفی خودادا بوەستێ و هێوەتر نەڕوات. لەناخی خۆیدا، بەردەوام لە گفتوگۆ و گەنگەشـەدایە. پرسیار لەخۆی دەکات. بە دەقەکاندا دەچێتەوە، هەمیشـە لە حاڵی گەنگەشـەدایە، بە گومان و دوو دڵە.
دوای ئەوەی لە زندان بەر دەبێت، نامەیەک بۆ مەدام فون ڤیـزین دەنووسـێت: "جا با باسـی خۆمت بۆ بکـەم. مـن منـداڵێکی سـەردەمی خـۆمم. تـاکو ئێسـتا فرزەند و ڕۆڵەی گومان و بیباوەڕی بووم و (چاک دەزانم) تا دەچمە گـۆڕەوە هـەر

بەو شێوەیە دەمێنم. تینویەتی ئیمان کـاتێ کـە ڕوو بـەڕووی دنیایـەک بەڵگـەی دژی ئیمـان دەبێتـەوە، بەتـەواوەتی ڕوحـم دەئـاڵۆزێنێ و پەرێشـان دەکـات و بەشـێوەیەکی ترسـناک ئـازارم دەدات. وێـڕای ئەمـەش هەنـدێجار خواوەنـد، هەنـدێ سـاتی لێوانلێـو لـە خۆشـی و ڕۆشـناییم پێدەبەخشـێت. ئـا لـەم ساتانەدایە کە بیرو باوەڕ و ئیمانێکی پتەو و مکوم بۆ خۆم دەسازم. باوەڕێک کـە هەموو لایەنێکی ڕوون و خۆیا و پیرۆزە. جا ئەم سـەرهەڵدانی ئیمانە، لە ڕوحـی مندا، لە دڵ و دەروونی مندا زۆر بەئاسانی چێدەبێت: قەبووڵکردنی ئەمەی کـە هیچ شتێک لە مەسیح جوانتر، قووڵتر، ڕیشـەدارتر، خۆشـەویسـت تـر، لـۆژیکی تر، شـەوق ئەنگێزتر و پڕ کـەماڵ تـر نییـە، بەڕادەیەکـە کـە نـەک هـیچ شـتێکی دیکە لە سەروویەوە نییە، بـەڵکو بـە ئەشـق و ڤیـانێکی غیـرە ئـامێزی ئـەوتۆوە قـەبووڵی دەکـەم کـە هـیچ شـتێکی دیکـەی ناگـاتێ. هـیچ شـتێکی دیکـە لـە سـەرووی ئـەوەوە نییـە. خـۆ ئەگـەر لەوسـاتانەدا کەسـێک بـە بەڵگـەوە بـۆم بسـەلمێنێ کـە مەسـیح درۆیـەکی ڕووتـەو هـیچ حەقیقـەتێکی نییـە، ئەگـەر بەڕاسـتیش ئـەوە بێتـەوە و بێتـە سـەلماندن کـە حەقیقـەت لـە دەرێـی مەسیحدایە، من حەز دەکەم دەگەڵ مەسیحدا بم نەک دەگەڵ حەقیقەتدا."

دوستویفسکی لەکاتێکا ئەم بەرخوردە دەگەڵ فەلسەفەی فەرمی کڵێسا دەکات، کە کیرکیگارد و یا "ئوڤیر بیک"ی نەناسیوون. ئەو هەرگیز بە تەواوەتی ملکەچی ئیمان نەبوو، پێی وابوو، ئیمان شتێکی خۆرسکە، وەرناگیرێت، بۆیە دەبێ بەردەوام لەهەنبەر ناحەز و دژمندا، لە هەنبەر خودی ئینساندا بەرگری لێبکرێت.

هەڵبەتـە ئیمـانی خـودایی ئـەو، هەمیشـە لەبـەر هەڕەشـەی گومـان و دوو دڵیدا بوو، واتە گومان و دوو دڵی ئافەتی ئیمانـە. جـا ئیمانـداری بـەلای ئـەوەوە جۆرە ڕیسکێک بوو، ڕیسـکیش بـاجی خـۆی هەیـە. بـەڵام کڵێسـا، بـەو یاسـاو ڕێسا و ڕێکارە مکومانەی کە دایناوە، تـا ڕادەیـەک ئـەم ڕیسـکە سـووک و کـەم دەکاتەوە. کڵێسا ئیمانیکە خراوەتە بەردەسـتی خـەڵکی. کڵێسـا ڕێگەیەکـە بـۆ گەیشتن بـە ئیمـان و بـاوەڕێکی ئاسـان و نەرمـەقووت. بـەڵام دوستویفسـکی هیچ شتێکی ئاسان و نەرمە قووتی قەبووڵ نییە. دەیـەوێ بـە خـۆی و بەتـەنیا بخەبتێ و بەخۆی ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە.

لەو بارەیەوە دەڵێت: "سرووود و ستایشەکانی من بە کوورەی گوماندا تێپەڕیوون."

مەبەسـت لـە سـروود و ستایشـان، هـەموو بەرهەمەکانیـەتی، هەڵبەتـە بەرهەمە ڕەسـەن و ڕاستەقینەکانی ئەو لە راسـتیدا، بەیەکـەمین نۆتـەێن ئـەم سرووده دەست پێدەکەن.

## فەسڵی شەشەم

## سیمی پالاتینسک: patatinsk semi

سیمی پالاتینسک ئاواییەکی ئاسایی بوو، بە بازاڕ و خانووی لێکدی بڵاو. وەکو جۆرە کاروانسەرایەک بوو، قافڵە و کاروانی وشتران لەوێندەر لایان دەدا و بارەکانیان دەخست. خانووەکانیان یەک نهۆم بوون، لەسەر کۆڵەکە و ڕایەڵی درەختان ڕۆنرا بوون. پەنجەرەی خانووەکان بەسەر دیوی ناوەوەی حەوشەکاندا دەیانڕوانی، تاکو ڕێبواران دەگەڵ ژنە موسوڵماندا، کە لەناو ژوورەکاندا مژوول و خجڵی کار بوون، نەکەونە سەرەتاتکێ و چاوپڕکێ. دەرگای ژوورەکان نزم بوون، تا ئەگەر غەوارەیەک بەبێ ئیزن و بەخۆرتی سەری هێنایە ژوورەوە سەرگەڤاری ماڵ بتوانێ بەئاسانی سەری بپەرێنێ. ئەمبەر و ئەوبەری جادەکان، بەداری درێژ کرابوون بە تەیمان و چەپەر. شەوان هەموو شوێنێک تاریک بوو. جادەکان قیرتاو یان سەڵبەند و بەردرێژ نەکرا بوون. تاقە دارێک یا دەوەنێک لەو ئاواییەدا بەدی نەدەکرا. تا چاو پڕبکات، هەر چەو و لمەڵان بوو، لمی وشک و گەرم، تا گۆزینگی پێیانی قووت دەدا. لەگەڵ هەر بایەکدا گەردەلوولی لم دەچوو بە ئاسماندا، لوولی دەخوارد، گیژی دەخوارد بە دەموچاوی ڕێبواراندا دەچوو. لەگەڵ یەکەم بارانیساڵیشدا دەبوو بە قوڕەلیتەیەکی خاکی ئەوتۆ کە بەراز لێی دەرنەدەچوو. زوو بەزوویش وشک دەبووەوەو، دەبوو بە سندەگڵ و کەستەک.

شانبەشان و نزیکی کڵێسایەکی لەبەرد دروستکراو و پاسگەیەکی سەربازانی جەبهەدا، حەوت مزگەوت هەبوو. دەرمانخانەیەکی حکومەتی و قوتابخانەیەکی سەرەتایی تیا بوو. دوکانێکی خەیاتی لە ئاواییدا بوو کە شتی دیکەی وەکو بزمار، عەتر، و تەنانەت خۆراکیشی دەفرۆشت. ئەمە هەموو شتێکی ئەو ئاواییە بوو. جگە لەوانە هەندێ کتێبی زۆر کەم و ڕۆژنامانی لێبوو، کە لەنێو خوێنەراندا دەستاو دەستیان دەکرد. پۆستەخانەیەکی بێ سەروبەری تیا بوو. لەوە بترازێت ئیدی تا خەیاڵ بڕ دەکات تەنیایی و گۆشەگیری بوو، فەرامۆشی تەواو بوو، تا هەتەری چاو دەشت و بیابان و

چۆڵەوانی بوو. ژمارەی دانیشتوانی ئەم باژێرۆکە (شارەدێ) دەگەییە پێنج شەش هەزار کەس. کە زۆربەیان بازرگانانی تاتاری و سەربازان و فەرمانبەرانی حکومەتی بوون. لەوبەری ئاواییەکەوە قوزاقان، شوانکارانی قەرغیزی لەژێر خێوەت و دەواراندا دەژیان.
مێژووی ئەم باژێرۆکە پتر لە سەد ساڵێک دەبوو. لە ساڵی ١٧١٨دا قەڵایەک لەم باژێرۆکەدا دروستکرا بوو، ئیدی هەر بەو دەقەوە مابووەوە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتبوو. زۆرجار خێڵە ڕێگرەکانی کارا قەرقیز، دەستەو تاقمی شەقاوە و تالانچیان دروست دەکرد و پەلاماری خانان و تەنانەت ئۆردووی سوپایشیان دەدا.
دوستویفسکی هەرکە گەییە سیمی پالاتینسک، وەکو سەرباز، پەیوەندی بە بەشی یەکەمی فەوجی حەوتەمی بەرەی سیبریاوە کرد. دیارە خزمەت لە سوپای سیبریادا زۆر قورس و زەحمەت بوو. سەربازەکان بەدرێژایی ڕۆژ، بەردەوام لە مەشق و ڕاهێناندا بوون: پیادە ڕۆیی، بەکارهێنانی چەک. نمایش و تەفتیش، کاری هەمیشەیی و بەردەوامی ڕۆژانە بوو. شەوان، سەربازان بۆ نیگابانی وئێشکگری دەنێردران بۆ شوێنی دوورە دەستی قەراخ دەشتە پان و بەرینەکە. ئەم مەشق و ئەم پاسەوانی و ئێشکگریانە و بێخەوی، دۆستویفسکیان تەواو شەکەت و ماندوو کرد بوو.
لە نامەیەکیدا بۆ براکەی دەڵێت: "من لە مانگی ئازاردا گەیمە ئێرە، هیچ شتێکم دەبارەی مەشق و ڕاهێنانی سوپایی نەدەزانی، بەڵام بەو حاڵەشەوە، لە مانگی تەموزدا، توانیم وەکو هەموو ئەوانی دی، بەشداری نمایشە سوپاییەکان بکەم و هەر کارێکم پێ بسپێردرێ وەکو ئەوان ڕایی بکەم. دیارە فێر بوون، ماندوویەتی دەوێ، من هیچ لاری و گلەییەکم لەم ڕووەوە نییە. ئەمە ئەو نەگبەتی و باجەیە کە بەملمدا هات و موستەهەقم."
فەوجەکە، لە کۆیلەێن نەخوێنەوار، سەربازانی پیشەیی، و مەحکومان بە دوور خستنەوە، پێکهاتبوو. ئاستی ڕۆشنبیری ئەم ئۆردوگا سوپاییە، هەرگیز لە ئاستی ڕۆشنبیریی، ناو تاراوگەکان بەرزتر نەبوو. ئیدی دوستویفسکی جارێکی دی کەوتەوە ئەوەی ژیان لە هۆڵێکی پیس و بۆگەندا، لەنێو قەرقەشە و کێشما کێشی دەوروبەردا، لەنێو خەوی دەستەجەمی و زوو ڕابووندا بجەڕێنێ.
هاوسێ خەوی دوستویفسکی، گەنجێکی هەڤدە ساڵان بوو لە هەمان فەوجدا، نێوی کاتز بوو. دۆستویفسکی ئەم کوڕەی کرد بە هاوڕێ و برادەری خۆی. متمانەی بەدەست هێنا و پێشنیازی ئەوەی بۆ کرد، کە دەغیلەیەکی هابەش بۆ مەسرەفی خۆیان دابنەن. ئیدی کارەکانیان بە سەر خۆیاندا دابەش کرد، بەنۆرە دەچوون بۆ ناو شار ، هەر پێویستیەکی خۆیان بکڕن یا دەچوون بۆ موبەقەکە تا کەلەرم و ساوار بۆ خۆ بێنن. بەنۆرە جلی یەکدیان پاک دەکردەوە و، نیتاق و کەمەربەدە ئەستوورە سوپاییەکانی یەکتریان ڕەونەق دەدا. کاتزا، توانی لە ڕێگەی پاشەکەوتەوە، سەماوەرێک بکڕێت، ئیدی دۆستویفسکی لەوە بەدواوە، زۆرجار لەجیاتی خۆراکی خراپی سفرەخانەی گشتی، نانەکەی

خۆی بەچەند کوپێک چاوە دەخوارد. ئـەو خواردنـەی لـەو فەوجـەدا بەسـەربازان دەدرا زۆر خـراپ بـوو، لـە ناچاریـدا نەبوایـە نـەدەخورا. بودجـەی فـەرمی هـەر نەفـەرێکیش تـەنیا چـوار کوپیـک بـوو. جـا فەرمانـدەی سـریە و ژمێریـار و بەرپرسانی موونە، بەلای کەمەوە کوپیک و نیوێکیان لـەو چـوار کوپیکـە دەدزی. جا ئەم دەڵە دزییە، بۆ دزەکان ساڵانە بڕی "٧٤٤" ڕۆبڵـی دابـین دەکـرد، دیارە ئەم قاچوو قووچە لـە شـارۆچکەی سیمیبالاتنیسـکدا لەکـەس شـاراوە نـەبوو، بەڵام کەس زاتی ئەوەی نەبوو، بە گژیا بچێتەوەو ناڕەزایی دەربڕێت.
دوستویفسـکی، لـە هـەوڵی بێوچانـدا بـوو، کـە دۆسـتایەتی و متمانـەی هاوڕێکانی بەدەست بێنێ. لە کارو بێگاریاندا یارمـەتی دەدان، لـەو خۆراکانـەدا، کـە لـەدەرێی ئۆردوگایەکـە، پەیـدای دەکـرد، بەشـی دەدان. هەنـدێجار پـارەی بەقەرز دەدانێ. بەرپرسـەکانی لێی ڕازی بوون. چونکـە هەنـدێ لـە هاوڕێیـانی تاراوگەی ئومسک ستایشیان کردبوو، ئیدی ڕێگە درابوو لە شـارەکەدا ئـاکنجی ببێ. ژوورێکی لە نزیکـی سـەربازخانەکەدا بـەکرێ گـرت. خـاوەنی خانووەکـە، بێوەژنی سـەربازێک بوو. خانووەکە، بریتـی بـوو لـە کوختەیـەکی دارینـی خـوارو خـێچ، دەتگـوت لـە لمەڵانەکـدا ڕواندویانـە. باخچەیـەکی چکۆلـەی پـەرپووت و بێخزمەت لەپشت خانووەکـەوە هـەبوو، بیرێکـی تیـا بـوو بـە کۆنـە ترومپایـەکی دەسـتی ئـاوی لێـدەردەهێنرا و باخچەکـەی پـێ ئـاو دەدرا. دوستویفسـکی ژوورێکی نزمی تاریکی لەم خانووەدا بـەکرێ گرتبـوو. دیوارەکـانی ژوورەکـە. بـە گڵـە سـوور، سـواغ درا بـوون. هەنـدێ وێنـە و نیگـاران کـە لـە سـەر تەختـەدار دروست کرابوون بە دیوارەکانەوە هەڵواسـرا بـوون. هـەموو موبێلیـاتی نـاو ئـەم ژووره بریتی بوو لە تەپڵەکێکی خڕ کە پەردەیەکی سادەی پێدا درا بـوو، تەختـە خەوێک، مێزێک، کورسییەک و سەندوقێک کە لەجیاتی کۆمـەدی بـەکار دەبـرا. لـە نزیکـی دەرگاکـەوە، سـۆپایەکی گـەورەی ڕووسـی دانـرا بـوو. پەردەیـەکی قوماشـی ئەسـتوور، چـوار گۆشـە، ئـەم ژوورەی لـە بـاقی خانووەکـە جیـا دەکردەوە. دۆستویفسکی مانگانە پری پێـنج ڕۆبڵـی بـە ژنـەی خاوەنمـاڵ دەدا، کە ئەم پرە پارەیـە هـەم کرێـی ژوورەکـە و هـەم کرێـی خـواردن و هـەم کرێـی شـوردنی جلەکانیشـی بـوو. بـەڵام بێوەژنەکـە، لـە سـایەی سـەری جووتـە کیژەکەیەوە، دەرامەتی دیکەشـی دەسـت دەکـەوت، چونکـە بـەخۆی دەڵاڵـی و قەوێدەیی بۆ دەکردن.
زۆرجار، دەیگوت: "ئاهـ، ئاغا، ئەمانە دەبوا لەپێناوی دوو شـەکرلەمەدا، نیو کیلۆ میوەدا، دەگەڵ کاتبێکی فەوج دا، یا دەگەڵ ملازمێکدا بنوون و ڕابوێرن، بەڵام هەڤخەوی دەگەڵ کەسێکی خانەدانی وەکو تۆدا، بۆ ئەوان شانازیە، نیعمەتی خوایە.."..
لە بەرواری ٢٠/ت٢/١٨٥٤دا، بارون ڤرانگیل، کە تەمـەنی بیسـت و دوو سـاڵ بـوو، بـە پۆسـتی نوێنـەری حکومـەت، گەییـە سیمیپالاتینسـک واتـە بـوو بـە نوێنەری گشتی حکومەت لەوێندەر، دەموچاوێکی جـوانی هـەبوو، قـژی ڕەش، دەستێک جلی زۆر فاخیری دەسـتدرووی سـان پتروسـبۆرگی لەبـەر بـوو، هـەر زینـەت بـوو تەمەشـای بکـەیت، کـاتێ ئـەم ئەشـرافزادە خانـەدان وپایـە بـەرزە

گەییە ئەم دەڤەرە دوورە دەست و پاشکەوتووەی کە چەند هەزار کیلۆمەترێک لە پایتەختەوە دوور بوو، زۆر دڵی گوشرا. بیری لەوە دەکردەوە، چۆن دوو دانە ساڵ، لە قوڵایی ئەم بیابانەدا، لەم ئاواییە دوورە دەستەدا، لەنێو لمەڵانی بیابان و ئەم خەڵکە نەزان و نەخوێنەوار و ساویلکانەدا بەسەر بەرێت و بقەتێنێ؟ خۆ لێرەدا جگە لەڕاوی تەیر و تو یا ڕاوە ماسی هیچ شتێکی دی نییە پیاو خۆی پێوە مژوول بکات. بارون ڤیرانگیل، بەرلەوەی لەسان پترو سبۆرگەوە بۆ ئێرە بەڕێ بکەوێت، میشێل دوستویفسکی بینی بوو. کە کۆمەڵێک کتێبی دابویە تا بۆ دوستویفسکی، بێنێ. بارون ڤیرانگیل دوستویفسکی نەدەناسی، تەنیا لەڕێگەی بەرهەمەکانییەوە دەیناسی. بەهەرحاڵ لێرەدا پێتقیە ئەوە وەیادبهێنرێتەوە، کە بەڕیکەوتێکی سەیر، ئاغای ڤیرانگیل لە کاتی ئەنجامدانی ڕێوەڕەسمی ئیعدامی گروپەکەی پیتراشفسکیدا لەهەمان مەیداندا ئامادەگی دەبێت کە لەو کاتەدا هێشتا خوێندکاری زانکۆ دەبێت.

ڤیرانگیل، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا، لەو بارەیەوە دەنووسێت: "بە چاوی خۆم ئەو تارمایی و نیمچە تاپۆیانەم بینی کە چۆن سەردەکەوتنە سەر سەکۆ دارینەکانی پای سێدارەکان و دادەبەزین. بەچاوی خۆم دیتم کە چۆن کۆمەڵێک پیاویان بە جلی سپی کفن ئاساوە، بەو کۆڵەکانەوە دەبەستەوە کە لە ئەرزەکەدا چەقاندبوویانن و چۆن لە کۆڵەکەکانیان کردنەوە و پاشان چۆن عەرەبانانی سێ ئەسپە هاتن و هەموویان بردن. دواى ئەوە مەیدانەکە چۆڵ بوو، خەڵکەکە بەدەم خاچ کێشانەوە درووديان بۆ تزار دەنارد و بڵاوەیان لێکرد."

پاش ئەوەی بارۆن ڤیرانگیل، بەفەرمی سەردانی فەرمانداری شاری کرد، ئیدی خوڵامەکەی خۆی نارد بۆ سۆراخ و تاقیبی دۆستویفسکی.

فیدور میخائیلوفیچ، بە دوو دڵی و گومانێکی زۆرەوە پێشوازی خوڵامەکەی کرد. ئاخر ئەم بارۆنەی نەدەناسی، دەبێ کێ بێ و چ کارێکی بەم هەبێت؟ چی لەم دەوێت؟ پۆستی "نوێنەری گشتی" بەلای ئەمەوە، مایەی ئاسوودەیی نەبوو. بەڵام وێرای هەموو ئەمەش، بەناچاری قەبووڵی کرد کە بڕوات و چایەکی دەگەڵدا بخواتەوە.

لەکاتی دیاریکراودا، بارۆن ڤیرانگیل، سەیری کرد سەربازێک بە پاڵتۆیەکی دەڵبی خاکی یەخە سوورەوە، خۆی بەژوورەکەیدا کرد. یارۆ کەمێک پشتی دانەواند بوو. هەردوو باسکی بەقەدیا شۆڕ بوو بوونەوە، کەسێکی دفناک "لووت زل" و ڕەنگ زەرد بوو، دەموچاوی یەکپارچە نمووس بوو، ڕەنگی چاوی، لە ڕەنگی پۆڵای کەوەیی دەچوو، بەشێوەیەکی خەمناک ڕاستەوخۆ دەیڕوانیە پێشێ. قژە خورماییەکەی بە گوێرەی پێوەری عەسکەری چاککرا بوو. ئەم پیاوە نەناسە، پەست و نیگەران، چاوەڕوانی قسەیەکی خانەخۆییەکەی خۆی بوو، کە بارۆن ڤیرانگیل بوو، تا بزانێ بۆچی بۆ ئێرە بانگکراوە. کاتێ کە بارۆن ڤیرانگیل گوتی کە لەسان پتروسبۆرگ میشێلی برای دیتووە و نامەکە و بەستە کتێبەکەی دایە، ئیدی دوستویفسکی ئاهێکی پێدا هات و ڕووی گەشایەوە و جۆرە منەتباری و سوپاسگوزایەکی منداڵانە بەڕوویەوە دەرکەوت.

هەستی بەجۆرە ئاسوودەییەک کرد. مۆڵەتی خواست کە ڕێگەی بدات هەر لەوێ نامەکە بخوێنێتەوە و بەدەم خوێندنەوەی نامەکەوە، هۆن هۆن ڕوندک بەچاوانیدا دەهاتنە خوارێ. ڤیرانگیل کە بەخۆیشی کۆمەڵێک نامەی تازە و گرینگی بۆ هاتبوو، هەندێک لە زەرفەکانی هەڵپچڕی و هەندێک لە نامەکانی خوێندەوە، نامەکان، نامەێن کەسوکار و خزم و خۆیش و دۆست و برادەران بوو کە لە سان پترۆسبۆرگەوە بۆیان نارد بوو، ژیانی شیرینی ئەوێندەری وەبیر دێنایەوە. بارۆن بەمە دڵی گوشرا. بەتایبەتی کە ئەم پیاوە غەریبەی لە هەنبەر خۆیدا بینی، هەستی بە تەنیاییەکی سەیر کرد. ئەم دوو پیاوە، ئێستا لە دوورترین خاڵی سیبریادا بوون. دوور لە هەر شتیکی دڵخوازی خۆیان. دوور لە هەموو ئەو کەسانەی کە لێیان تێدەگەیشتن، هەردوو تەنیاو لەبیرکراو، بگرە تیا چوو.

بارۆن ڤیرانگیل، نوێنەری گشتی خاوەنشکۆ تزار، ڕێک بە پێچەوانەی هەر داب و نەریتێکی ئاساییەوە، دەستی بەگریان کرد، بەدەم گریانەوە خۆی لە هەمێزی دوستویفسکی نا. ئیدی لەمەوە دۆستایەتیەکی قووڵ و ڕاستگۆیانەیان لەنێواندا پەیدا بوو.

ڤیرانگیل لە نامەیەکیدا بۆ کەسوکارەکەی دەنووسیت: "قەدەر و چارەنووس تووشی پیاوێکی سەیری کردووم چ لە ڕووی تایبەتمەندی عاتیفییەوە و چ لە ڕووی تایبەتمەندییە مەعنەوییەکانەوە. ئەم پیاوە نووسەری لاو و نەگبەت دوستویفسکییە. من لە زۆربەی شادییەکانمدا قەرزاریاری ئەوم. پەند و ئامۆژگارییەکانی بەڕادەیەک ورەی وەبەرناوم کە بۆ هەتا هەتایە، لە بیری ناکەم. باوە گیان توخوا تاقیبێ بکە، بزانە هیچ عەفوویەکی گشتی دەرنەچووە کە ئەو بگرێتەوە."

هەروەها دەنووسێت: "لەوانەیە ئەم پیاوە باشە، لێرە لەم چۆڵەوانیە، وەکو سەربازێکی سادە تیا بچێت، بفەوتێ. کە ئەمە شتێکی زۆر ناخۆشە. زوڵمێکی گەورەیە. بەڕاستی زۆر بۆی بەداخم. وەکو برایەکی خۆم خۆشم دەوێ، بەقەد باوکم ڕێز و حورمەتی دەگرم." ڤیرانگیل، لە ڕادەبەدەر خۆشی دەویست، هەرچیەکی لەتوانادا بوایە بۆی دەکرد، زۆری ڕێز دەگرت، بە هەموو توانایەکی خۆیەوە هەوڵیدەدا، دڵخۆشی بداتەوە و ورەی بەرز بکاتەوە و تین و تاو وشادی بەژیانی ببەخشێت.

ناوەندی گەورە فەرماندانی دەوڵەت لە سیمیپالاتینسکدا بە باوەشی واڵاوە پێشوازیان لەم نەجیمزادە سیما جوانەکرد کە سیما و ڕوخساری دەتگوت نەخشی سەر میداڵانە، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ناسک و سەنگین بوو، لەڕووی جل و بەرگەوە زۆر بۆشناغ بوو. لە یەکەم ڕۆژەوە، هەمووان زانیان کە خوڵامێکی تایبەتی لەگەڵە. خانوویەکی گەورەی بەکرێ گرت. گالیسکەیەکی جوانی لە خزمەتدایە و مووچەکەی وەکو نوێنەری گشتی تزار، ڕێگەی ئەوەی دەدا، بە ئارەزووی خۆی بژی. ئیدی خەڵکەکە لە بەینی خۆیاندا دەیانگوت، ئەمە لە بنەماڵەیەکی خانەدان و نەجیمزادەیە و ئایندەیەکی پرشنگداری

لەپێشــە. ژنــان شــێت و شــەیدای بــوون، کیــژان خــەونیان بــەوەوە دەبینــی کــە دەزگێرانێکی وەکو ئەویان هەبێت.
ڤیرانگیل، لەکاتێکا کە خەریک بوو بەو دەڤەرەدا گەشــتی دەکــرد، هەوڵیــدەدا، دوستویفســکی بــە دۆســتە تازەکــانی خــۆی بناســێنێ. ئەمــە کــارێکی زۆر هەستیاربوو، چونکە هیچ کەسێک نەبوو نەزانێت کە دوستویفســکی بابایــەکی زیندانی بووە. ئەمە جگە لەوەی کە دوستویفسکی جــل و بــەرگێکی نــاقۆڵای، ناشیرینی یەخە ســووری لەبــەر دەکــرد، کــە بــۆ ســادەترین کــۆڕ و مــەجلیس و ئاهــەنگان نەدەشــیا و ئاهەنگەکــەی دەشــێوان. خــەڵکانێکی زۆر هــەوڵیان دەدا ئەوە لە بارۆن بگەیەنن کە دۆستایەتی و هاوڕێیــەتی بابایــەکی کۆنــە زینــدانی، شتێکی باش نییە و دەگەڵ پلــە و پایــەی ئــەودا تێکناکاتــەوە. نوێنــەری گشــتی تــزار، دەبــێ لــە هــەڵبژاردنی دۆســت و هاوڕێیانیــدا، زۆر وردو وریــا بێــت. بــەڵام ڤیرانگیل، گوێی بیستنی ئەو قسە و ئامۆژگارییانەی نــەبوو. بەڕادەیــەک ســوور بـــوو لەســـــەر دۆســـتایەتی و هاوڕێیـــاتی دۆستویفســـکی، کە جەنـــەڕاڵ سپیریدونۆڤ، فەرمانداری سوپایی شار، قاییــل بــوو کــە لــە ماڵــە تایبەتیەکــەی خۆیدا، پێشوازی دوستویفسکی بکات. جەنەڕاڵ گــوتی: "دەی باشــە، دەگــەڵ خۆتیا بێنــە، بــەڵام بــا بەوپــەڕی ســادەیی، بەهــەمان جــل و بــەرگی مەشــق و ڕاهێنانەوە بێت."
جەنەڕاڵ سپیریدونوف، پیاوێکی باش، میهرەبان، جوامێر و میوانپەروەر بوو. زۆر زوو پەی بە گرینگی توانا و بەهرەی دوستویفسکی برد و داوای لێکرد، هەر کاتێک مەیلی لێبوو، بێتە دیدەنی.
ئیدی لەمە بەدواوە، هەر هەموو ئەنجوومەن و دیوانانی شــار دەرگاکانیــان بــۆ ئەم کۆنە زندانییە، خستە سەرگازی پشت. بیلیخوفی فەرمانــدەی فــەوج، کــە جاران، دوستویفسکی سەربازی بانگ دەکرد تــا ڕۆژنامــەی بــۆ بخوێنێتــەوە، لــە هــەموو بۆنەیەکــدا دەعــوەتی دەکــرد و دەیکــرد بــە هاوســفرەو خــوانی خــۆی. ژنەکەی ملازم ستیپانوف، شیعرەکانی خۆی بۆ دوستویفســکی دەخوێنــدەوە و تکــای لێــدەکرد چاکیــان بکاتــەوە بــۆی. کۆڵۆنێــل میســارۆچ، قوماربــازی بێوێنــە، ڕێکخــەری ئورکســتەری فانفــاری ســوپایی لــە سیمیپالاتینســک، نەیــدەتوانی دوستویفســکی پشــت گــوێ بخــات. جلــە خاکیــەکانی نووســەر و، جلــە زۆر شیکەکانی نوێنەری تزار، لە هــەموو بۆنــە و ئاهــەنگ و کــۆڕە جفاکیەکانــدا، دەر دەکەوتن و سەرنجی ئامادەبوانیان ڕادەکێشا.
بەڵام دوستویفسکی، بە نەبەدڵی دەچوو بۆ دەعوەتی گەورە سوپاییان و پیاو ماقوڵانی شار، لەو دیوەخان و ناوەندە گوندییانەدا، هەستی بە بێزاری و بێتاقەتیەکی کوشندە دەکرد. حەزی دەکرد لە ماڵەوە بمێنێ و بەدرێژایی شەو قسان دەگەڵ دۆستە تازەکەیدا بکات.
دوستویفسکی، هەرکە دەوامی تەواو دەبوو، خێــرا دەچــوو بــۆ لای ڤیرانگیــل، لەســـەر کورســـیەک دادەنیشـــت، یەخـــەی جلـــەکانی دەکـــردەوە و پایپەکـــەی پڕێــدەکرد. لــەم ســەروبەندەدا بیــری لــە نووســینی ڕۆمــانی: "خــەونی هــاپۆ سیلوستیپان چیکوڤۆ"و کتێبی "یادگارییەکانی خانــەی مــردوان" دەکــردەوە. زۆر

خۆشـحاڵ بـوو، لەبـەر خۆیـەوە و لـەبن لێوانـەوە، ئـاوازی ئۆپیرایـەکی زەمزەمـە دەکرد و هەندێ بویەری ڕۆمانە تازەکـەی بـۆ هـاوڕێ گەنجەکـەی دەگێڕایـەوە و کاتێ ئادەم، ئەو پێشخزمەتەی کە هەم کاری خەیاتی و هەم کاری ئاشـپەزی دەکـرد، بـەخۆو مەنجـەڵێکی پـڕ شـۆرباى بەماسـی، دەهاتـە ژوورەوە، ئـەم هاواری دەکرد.

ئـەم ئادەمـە، خـوڵامی ڤیرانگیـل بـوو. کەسـێکی چڵکـن و پڵکـن و هەمیشـە سـەرخۆش و خەمبار و بێحـەواس بـوو، سـەر زل و لـووت کـوڵ و لاق خـوار بـوو. زۆرجـار لـە ژێـر پەنجەرەکـەدا دادەنیشـت و بـە دەنگێکـی گیـراو گۆرانییـەکی خەمباری دەگوت. بەجۆرێ دەیناڵاند و دەگریا، کە جووتـە دۆسـت دوای ئـەوەی چەند جارێک ئاگاداریان دەکردەوە و وەخـۆ نەدەهاتـەوە، ناچـار دەبـوون سـەتڵێ ئاوی بەسـەردا بکەن تا لەوێ دووربکەوێتەوە.

دوسـتویفسـکی وڤیرانگیـل، دوای فـراڤین، دەکەوتنـە بـاس وگەنگەشـەی هەندێ بابەتی ئـەدەبی. دوسـتویفسـکی "شـەوانی میسـر"ی پوشـکینی بـۆ هاوڕێکەی دەخوێندەوە، یا گیانە مردووەکانی گۆگۆلی بۆ دەخوێندەوە. تکای لـە ڤیرانگیل دەکرد کـە واز لـە "کتێبـی مامۆسـتا" بێنـێ و ئاوڕێـک بـەلای شـیعردا بداتەوە. دوسـتویفسـکی هەندێجار باسـی خـۆی بـۆ دەکـرد، ژیـانی منداڵیـەتی خۆی بۆ دەگێڕایەوە. باسـی خۆشەویسـتی خۆی سەبارەت بـە میشـێلی بـرای دەگێڕایەوە. باسـی سـەرەتا و دەسـتپێکی ئەدەبی خۆی بـۆ دەکـرد. بـەڵام کـەم وزۆر، بە ئاماژەش، خۆی لە قەرەی باس و گێڕانەوەی بەسـەرهاتەکەی گروپـی پتراشـفسکی نەدەدا.

ئەنجام، دوسـتویفسـکی درەنگانێکی شـەو، بۆ کوختـە دووکەڵاویەکـەی خـۆی دەگەڕایەوە. ئیدی مۆمێکی پیوی دادەگیرساند و دەسـتی بـە نووسـین دەکـرد. بەشـی هـەرە زۆری "یادگارییـەکانی خانـەی مـردووان" لـەم کوختـەدا و لەبـەر ڕۆشـنایی مۆمی پیو هاتووەتە نووسـین. دنیا، لە دەرێی ئەم کوختەدا، خـامۆش و ئارام بوو. لێرەو لەوێ، لە دوور و نزیک حەپە و لوورەی سـەگێک دەهاتە گـوێ. بێوەژنەی خـاوەن مـاڵ، لەپشـت پـەردە ئەسـتورەکە، لەسـەر جێگاکـەی خـۆی گینگڵـی دەدا و بـەدەم خـەوەوە دەیناڵانـد. دوای تۆزێـک دوسـتویفسـکی کاغـەزەکانی دەخسـتنە لاوە، قەڵەمەکـەی دادەنـا. نەیـدەتوانی لـەو جـەوە ئارامەدا کار بکات.

لە نامەیەکیدا بۆ مایکوف دەڵێت: "ناتوانم کار بکەم، هەندێ زروف یا ڕووداوی تایبەتی کە لە مێژبوو چاوەڕوانیان بووم، ئاقیبەت ڕوویان داو هاتنە پێشـێ، بە شێوەیەکی کوتوپڕ ڕوویان دا، کاریان لە سەراپام کرد، بەتەواوەتی مژوولیان کردم. زۆر خۆشحاڵم، لە خۆشیاندا دەستم ناچێتە کارو کارم پێناکرێت.

ئەم زروف و ڕوداوانە چ بوون و مەبەستی نووسەر لەم ڕووداوانە چیە؟

## فەسڵی حەوتەم
## ماری دیمیتریڤنا ئیسایێف.

پێش هاتنی ڤیرانگیل بۆ سیمیپالاتینسک، دۆستویفسکی ئاشنایەتی و ناسیاوی دەگەڵ ماڵباتی ئیسایێف دا پەیدا کرد بوو.

ماری دیمیتریڤنا ئیسایێف، ژنێکی گەنجی، نزیکەی سی ساڵان بوو. نەخۆشی سیل و دەردە باریکە تەواو کەسیرە و لاوازی کرد بوو. زەرییەکی قژ زەردی، جوانکیلەی خۆش خەت و خاڵی ناسکۆڵەی لێو ئەستوور بوو. دەگەڵ کەمترین هەڵچووندا، دەموچاوی سور هەڵدەگەڕاو چاوانی پرشنگیان دەداو ئەبڵەق دەبوون. کەسێکی توندە تەبیعەت و توندمجێز بوو. باوکی، واتە جەنابی کونستان، کوڕی بابایەکی موهاجیری فەرەنسایی بوو کە بەڕێوەبەری

قەرەنتینەکەی حاجی تەرخان بوو. هەر سێ کچەکەی ئاغای کونستان چووبوونە بەرخوێندن و خوێنەوارییەکی باشیان هەبوو. ئەمانە دەچوونە کۆڕی ڕەقس و سەمای نەجیمزادان، ماری، سەماکارێکی زۆر باش بوو، بەتایبەتی لە سەمای مۆدێرندا، کەسێکی زەبەر دەست و لێهاتوو بوو. زۆر شانازی بە پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی و سەرکەوتنەکانیەوە دەکرد. بیری لەوە دەکردەوە کە لەم کەنارە وشک و دەشتانیە چۆڵ و هۆڵەی دەریای خەزەر باربکەن، تا لە کۆمەڵگەی شارستاندا، پێگەی شایستەی خۆی بەدەست بێنێ، پێی وابوو، شوو کردنی بە فێرکارێکی گەنجی وەکو ئاغای ئیسایف، پێگەیەکی شایستەی بۆ دابین کردووە. بەڵام ئەم پیاوە بێنەواو داماوە کە نە کەسێکی گەوج و نە کەسێکی شەڕانی و شەڕەنگێز بوو، لە ڕادە بەدەر ئالوودە و گیرۆدەی بادەنۆشی بوو.

بەهۆی ئەم گرفتارییەوە، پلە و پایەکانی خۆی یەک لە دووی یەک لەدەست دابوو. سەرەنجام دەگەڵ هاوسەرەکەی و کوڕەکەیدا لەم گۆشە دوورە دەستەی سیمیپالاتینسکدا، گیرسابووەوە. بەڵام لێرەشدا، وەکو هەموو شوێنەکانی دی، بەهۆی ئالوودەبوون و بەدمەستیە نەنگینەکانیەوە، لە قوتابخانەکە دەرکرا و ئێستا، بە بێهیچ دەرامەتێکی جێگیر و، بە بێهیچ ئاوات و ئامانجێک، وێڵ و سەرگەردان دەسوڕایەوە. دەیویست بەمەی و مەینۆشی، خۆی لەو ناکامی و چارەنووسە خراپەی لە ژیاندا تووشی بوو بوو بدزێتەوە. تا خەڵکی زیاتر گلەیی و گازندەیان لێکردبا، تا پتر سەرزەنشتیان کردبا، زیاتر پەنای وەبەر مەی و خواردنەوە دەبرد. غروورو کبریای هاوسەرەکەی کە بەهۆی هەژاری و نەدارییەوە، بریندار بوو بوو، کردیە کارێک ئەم ژنە بە هەموو تواناکانی خۆیەوە، هەوڵیدەدا، ئەم ڕەوشە خانەوادەییە ناجۆر و نالەبارەی خۆیان، لە خەڵکی بشارێتەوە. بەدرێژایی ڕۆژ لە ماڵەوە خەریکی کار بوو، پینەو پەڕۆی دەکرد، جلی دەشت، ماڵەکەی ڕێک دەخست. لە هەنبەر ئەم خەڵکە دێهاتیانەی کە مێشیان دەکرد بە گامێش، کە تینوی پاشملەگۆیی و چەنەبازی بوون، وای دەنواند کە زۆر لە ژیانی خانەوادەیی خۆیان ڕازیەو ژیان و گوزەرانیان فرە خۆشەو لە هیچیان کەم نییە. کەچی مێردەکەی ڕۆژ تا ئێوارێ لەم شارۆچکەیەدا، بەدەستی بەتاڵ، بێکار، لۆژ لۆژ دەسواڕایەوە و کاتی خۆی بەدەم چەنەبازی بێهودە و بۆش و بەتاڵەوە دەبردە سەر. ئاغای ئیسایف، یەکەمجار دۆستویفسکی لەلای کولونێل بیلیخوف بینی و ئەم دوو پیاوە کۆنگ و تا ڕادەیەک ئاڵۆزە، جۆرە دڵبەندییەکی سەیریان لەنێواندا پەیدا بوو. هیچ دیار نییە کە ئەم پیاوە، هەمیشە مەستە چ کارێکی لە دۆستویفسکی کرد؟ بێگومان لە ناخی خۆیدا بەزەیی پێیدا هاتووەتەوە. بەڵام لە گینشە، وای وێنا کردبێ، کە ئەمە نیچیرێکی چەورە بۆ بابەتی یەکێک لە ڕۆمانەکانی. ئەم پیاوە ئالوودە چاو بەفرمێسکە، کە بەسەعاتان باسی قەدەر و چارەنووسی بەشەر، ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی مەسیح، خێر و شەڕ، کەلتوور و شارستانیەت، نەزانی و هۆڤیگەری دەکات، هەمان مارمیلادۆفی قارەمانی ڕۆمانی تاوان و سزایە. مار میلادوف، فەرمانبەرێکی تڕۆکراوی دەرکراوە، ژنەکەی دووچاری

نەخۆشی سیل و دەردە باریکە بووە کچەکەی بەناچاری دەکەوێتە لەشفرۆشی، ئەویش بۆ ئەوەی خەم و پەژارەی بێکۆتایی خۆی ژبیر بکات، پەنا وەبەر بادەنۆشی دەبات. ئەوەتا دەڵێت: "ئەی فرۆشیاری ڕەزیل و ڕژد، تۆ وا دەزانی، ئەم نیو قاپە مەشروبەی تۆ دەتوانێ خەم و پەژارەی من ڕەوێنێتەوە؟ نا، ئەوەی من لە بنی ئەم پەرداخەدا بۆی دەگەڕێم، خەم و پەژارەیە، ئەشک و فرمێسک و ئاهوناڵەیە..." وەکو چۆن مارمیلادۆڤ، ڕاسکولنیکوفی خوێندکارن زانکۆ دەبات بۆ ماڵی خۆی، "ئیساییف"ش دوستویفسکی بۆ ماڵەکەی خۆی دەبات و بەهاوسەرەکەی خۆیی دەناسێنێت. بەڵام دیدار و تەعاروفی ئەم دوانە، زۆر دۆستانە ترە لەو حاڵەتەی کە لە ڕۆمانەکەدا بەرجەستەکراوە. مەدام ئیساییف، زۆر خۆش حاڵ دەبیت بە ناسینی کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی، کە دەتوانێت، بەکامی دڵ باسی هونەر و ئەدەب، سیاسەت و ئاهەنگێن گەورە و شکۆدار و ڕەقس و سەمای دەگەڵدا بکات.

مەدام ئیساییف، دۆستایەتی دەگەڵ سەربازە سادەکەدا، فیدور دۆستویفسکیدا دەگرێت، زۆر خەفەت بۆ کێشە و گرفتاری و ناکامیەکانی دوستویفسکی دەخوات و دڵسۆزی و خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕێت و دەیلاوێنێ، بەڵام بەقسەی ڤیرانگیل، نایێت بەدڵداری ڕاستەقینەی دوستویفسکی. ڤیرانگیل لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێت: "ئەو ژنە دەیزانی کە دوستویفسکی کەسێکی پەرکەمدار و هەژارە و دەیگوت ئەم پیاوە هیچ ئایندەیەکی نایێت."

ئیدی خویا نییە کە ئەم سەربازە سادەیە، بەو مجێزە خراپەوە، بەو ڕوخسارە گرژ و مۆنەوە، بەو قژە کورت و ناشیرینەوە، چۆنی توانیویەتی ئەو ئافرەتە کە هەمیشە خەونی بە شکۆ و جەلالەوە، بە ناسکە ڤیان و دڵداریی فەرەنسیانەوە دەبینی، بۆ لای خۆی ڕاکێشێت؟ بەڵام دوستویفسکی هەر لە سەرەتاوە کەوتە داوی ئەشق و ڤیانی ماری دیمتریڤناوە. ئەمە یەکەمجار بوو، دوای ماوەیەکی زۆر، کە ژنێک، بەم سۆزو میهرە ئاشکرایەوە گوێی لە قسەی ئەو دەگرت و بەو نەرم و نیانی و دڵگیرییەوە وەڵامی دەدایەوە. ئەم جووتە داماوە، هەردووکیان پایە ماڵی ستەمی چارەنووس بوون، کۆمەڵگە تڕۆی کردبوون، غەدری لێکردبوون، هەرچی ئاوات و ئارەزووی گەنجایەتیان هەبوو، لەهەنبەر واقیعی تاڵ و خەمناکدا هەرەسی هێنا بوو، بە با ڕۆیی بوو، هیچ ئومێدێکیان بەئایندە نەبوو، ئایندە بەلای ئەوانەوە نەیدەکردە هیچ و هیچ مانایەکی نەبوو. دۆستویفسکی سۆز و بەزەیی مەدام ئیسایيفی دەرهەق بەخۆی، بە نۆبەرەی ئەشقێکی نۆزا دەزانی.

بەڵام وێڕای ئەوەش، دۆستویفسکی هەرگیز زاتی ئەوەی نەکرد کە ئەشقی خۆی بۆ ژنی برادەرەکەی، دەربپڕێت. بەڵام زوو زوو دەچووە دیدەنی و سەردانیان، ئەمەش پەیوەندییەکانی قوولتر و ئاماژە و چاوپرکێیەکانی زیاتر دەکرد، ئیدی جۆرە پەیوەندییەکی دۆستانەی پڕ لە نیگەرانی و نائومێدی لە

نێوانیانــدا چێبــوو. ئیــدی ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم ئەشــقە لەلای نووســەر پتــر بنجــی دادەکوتا، وای لێهات، خەوی لێنەدەکەوت، دەستی نەدەچووە کار.
بارون ڤیرانگیل، هەموو ڕۆژێک، دەبوا بەناچاری گوێ بۆ قسە نهێنی و پڕ سۆزەکانی دۆستەکەی ڕادێرێت. دۆستویفسکی لێی دەپاڕایەوە کە لەگەڵیدا بچێت بۆ ماڵی ئیسایيف. ڤیرانگیل لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئەم ژینگەیە، بەهۆی مێردەکەی مارییەوە، بۆ من خۆش نەبوو." مەدام ئیسایيف کوڕێکی هەشت ساڵانی هەبوو بەناوی "پول" کە لە خۆشەویستیدا، لە ماڵەوە بە "پاشا" بانگیان دەکرد. ئەم منداڵە، ڕەشتاڵەیەکی زیتەڵی، گورج و گۆڵ و نەسرەوتی وەکو مەیموون وابوو. دۆستویفسکی قاییل بوو کە دەرس بەم منداڵە بڵێتەوە، کە ئەمە بوو بە بیانوویەک بۆ دیداری زیاتری دایکی.
ئاهـ خۆزگە ئەو ژنە ئازاد بوایە، خۆزگە ئەم "دوستویفسکی" ئازاد بوایە. کۆمەڵێک خولیاو خەونی بێهودە و ناماقووڵ، دۆستویفسکییان مەست و نیگەران دەکرد. گوێی لە ئامۆژگاریە ئاقڵانەکانی ڤیرانگیل نەدەگرت. قەناعەت و باوەڕی وابوو کە بەجۆرێ ئاشق بووە، کە ئیدی هەرگیز ناشێت لە هەموو ژیانیدا، ئەشقێکی دیکەی وا بەخۆوە ببینێ.
مــاری بەرە بەرە، کەوتە ژێــر کــاریگەری ســـۆز و گـــودازی دڵـــدارە یەخە سوورەکەیەوە. شـانازی بەم ئاشـقێنیە شـەرمنانەیەی دۆسـتەکەیەوە دەکـرد. هەمان هەسـت، جۆش و خرۆش، سۆز گوداز و لەزەتی ڕۆژگاری گەنجی خـۆی لەلا زندوو دەبووەوە کە لەکۆڕ و ئاهەنگەکاندا سـەمای دەکرد. زۆر بێتـاقەت بـوو. جووتە ئاشـق بەدەم ئازاری چاوەڕوانیەوە دەتلانەوە، هەردووکیان سـەرمەسـتی خـانەدانی و نەجیمزادەیـی خۆیـان بـوون. ئیـدی ئەم چیـرۆکە ئاشــقانەیە، بە بێـدەنگیەکی نەخۆشـانەدا تێـدەپەڕی و کـرانەوەی گرێـی چیـرۆکەکە، مەحـاڵ دەهاتە بەرچـاوی هەردووکیـان. ڕۆژی ١٨٥٥/٣/١٢، پـایەبەرز ئەخمـاتوف، وەکـو یاریـدەدەری فەرمانـدەی فەوج، گەیـیە سیمیپالاتینسـک و پەیـامێکی سـەیری دەگەڵ خـۆدا هێنـا بـوو: "تـزار نیکـولای یەکەم، لە ١٨٥٥/٢/١٨دا، لە سـەعات دوازدە و بیست دەقیقەدا مردووە."
دانیشـــتوانی، موســـوڵمانی سیمیپالاتینســـک، هەواڵەکەیـــان بەهەنـــد وەرنەگـرت. بەڵام "فەرمـانبەرانی ڕۆشــنبیر" کە زۆربەیـان، جەزرەبەی ڕژێمیـان خوارد بوو، جم و جوڵیان پێکەوت. ئیدی لە هەموو شـوێنێک، باس باسـی دڵـی میهرەبان و زیرەکی و زرینگی مرۆڤدۆستانەی تزاری تازە بوو. کەوتـنە ژمـاردنی ئەو ڕیفۆرمــانەی، کە تەســەوریان دەکــرد، لە ئاینــدەیەکی نزیکــدا، لەســـەر دەستی ئەو ئەنجام بدرێن. دوستویفسکی ئومێدی ئەوە پەیدا دەکـات کە بەو نزیکـانە دەروویەکـی لێبکـرێتەوەو بخەلەسـێت. دەگەڵ ڤیرانگیلـدا، چـوو بـۆ مەجلیســی مـاتەمینی ئەو کەسـەی کە ئەمـی هەواڵەی تـاراوگەو زنـدانی ســیبیریا کــرد بــوو. لە کلێســادا ئەوانەی دەوروبەری دۆستویفســکی، هەر هەموویان مات و خەمین و گرژو پەست بوون، بەڵام بەگوتەی ڤیرانگیـل، هـیچ کەسێک نەدەگریا.

له هەوەڵـین ڕۆژانـی وەرزی هـاوینەوە، هەوای سیمیپالاتینسـک، زۆر گەرم دەبێت. لمەڵانەکەی ئەوێندەر، بەجۆرێ داغ دەبێت، کە بنی پێ لەناو پێڵاوەوە دەسووتێنێ. پلەی گەرما دەگاتە سی و دوو نمرە. بارون ڤیرانگیل لێدەبڕێت. هاوینەوارێک بەکرێ بگرێت و تەنیا یەک خانووی لەو جۆرە لە دەڤەرەکەدا هەبوو و بارۆن بەکرێی دەگرێت. ئەم خانووە ناوی "باخی قوزاقان" بوو. زۆر لە شارەوە دوور نەبوو. بینایەکی گەورەی دارین بوو، سەربانەکەی لە هەندێ شوێنەوە خراپ بوو بوو، زەمینەکەشی چاڵ بوو بوو. بەڵام پارک و باخێکی فراوانی بەدەورەوە بوو. فوارە و حەوزی جوانی تیا بوو. سەوزەزار و مێرگێکی جوان، لە لێژاییەکی هەنبەر باخەکەوە تا ڕەخی ڕوباری ئیرتیچ درێژ دەبووەوە.

دوستویفکی و فیرانگیل، لێدەبڕن. بەدرێژایی ئەمبەر و ئەوبەری شۆستە و ڕاڕەوەکانی ناو باخەکە گوڵ ڕوێنن.

بارۆن فیرانگیل، پاشان لەو بارەیەوە دەڵێت: "بیرەوەری خۆشم دەربارەی ئەو کاتانە لەلایە کە دوستویفسکی لە ئاودانی گوڵە تازەکاندا یارمەتی دەدام. ئارەقەی دەڕشت. پاڵتۆ سوپاییەکەی داکەند بوو، تەنیا یەک کراسی لەبەر بوو، کە هێندە شۆردرا بوو، ڕەنگە ئامال پەمبەییەکەی تەوا کاڵ بووبووەوە. زنجیرێکی چکۆلەی درشت و ناهەمواری لە ملدا بوو کەس نەیدەزانی لەکوێی پەیدا کرد بوو، هەندێ وردە مرواری شووشەی شینی پێوە بوو. سەعاتێکی زیوی شێوە هەیقۆکی پێوە هەڵواسرا بوو."

جووتە هاورێ بە ئارامی و هێوری لە باخی قوزاقاندا ژیانیان دەبردە سەر. خۆیان دەشت، مەلەیان دەکرد، جگەرەیان دەکێشا. کۆنە ڕۆژنامانیان دەخوێندەوە. ئەسپ سوارییان دەکرد. بەڵام دۆستویفسکی سوارێکی بێ سەروبەر و ناشی بوو و زۆرجار خۆی گاڵتەی بەخۆ دەکرد و بەخۆی پێدەکەنی. هەروەها هەوڵیان دەدا ئەو مارە بێ ژارانەی ژێر گوێسەبانە و بانیژەکان کەوی و ڕام بکەن. شیریان دەدانێ، ئیدی مارەکان وایان لێهات نەدەترسان و نەدەڕەڤین.

ڕۆژێک، کاتێ کە چەند خانمێکی سیمیپالاتینسک هاتبوونە دیدەنی "نەجیمزادە گوند نشینەکان" کە چاویان بەو مارانە کەوتبوو، تەواو ترسان و هەڵاتن و ئیدی لەوە بەدواوە چ کەسێک زاتی نەکرد ڕوو بکاتە ئەم خانووە چەپەکە. دوستویفسکی ڕۆژ بە ڕۆژ پتر عاشقی ماری دیمیتریڤنا دەبوو. زوو زوو دەچووە دیدەنی ماڵباتی ئیساییف. ڤیرانگیل لەو بارەیەوە دەنووسێت: "کە لەوێندەر دەگەڕایەوە هەستی بەجۆرە نەشەو خەواڵۆییەک دەکرد."

ئەم هاتووچۆ و تێکەڵاوییە، ڕاستەوخۆ ئەو ڕۆژگارانەمان وەبیردێنێتەوە کە دوستویفسکی هاتوچۆی ماڵباتی پاناییفی دەکرد. مەدام پانایفی ئەو ڕۆژگارە، وەکو مەدام ئیساییفی ئەمڕۆکە بۆ ئەو جازیبەیەکی هێندە بەرزی هەبوو، کە مەحاڵ بوو دەست بیگاتێ. هەردوو ژنەکە بەمێرد بوون. هەردووکیان لەماڵی خۆیاندا پێشوازی ئەمیان دەکرد، ئەمیش وێڕای ئەوەی سوور دەیزانی کە ناتوانێ ببێ بە ئاشقیان، هەردووکیانی خۆشدەویست.

ژیانی سێکسـی دۆستویفسـکی، تـا گەڕانەوەی لە تـاراوگە، بـۆ ئـێمە خویـاو ڕوون نییە. ئایا کەسێکی مجێز سارد بوو لەڕووی سێکسیەوە؟ یـان کەسـێکی، پڕ جۆش بوو؟ چوکوڤسکی لە وەڵامی پرسـیارێکی خـانم کاشـینا ئیڤرینوڤـادا، دەڵێـت: "مـن دڵنیـام کە نیکراسـوف و دوستویفسـکی هیچیـان بەبـێ ژن، بـۆ هەفتەیەکیش، هەڵیان نەدەکرد." وێـڕای ئەوەش دکتـۆر یانوفسـکیی دۆسـتی ڕۆژانـی لاوی دوستویفسـکی بەدڵنیـاییەوە دەڵێـت: "مـن هەرگیـز لەکەسـم نەبیسـتووە کە دۆستویفسـکی ئاشــق و شــەیدای ژنێــك بــووبێ، تەنــانەت ئەوەشم نەبیستووە کە ژنێکی بەشێوەیەکی ئاسایی خۆش ویسـتبێت." ریـزن کـامپڤ، لە بیرەوەرییەکـانی خۆیـدا دەڵێـت: "بەرانـبەر بە ئافرەتـان خەمسـارد و بێموبـالات بـوو. بگـرە لێشـیان دەڕەویـیەوە." لە ڕاسـتیا، باسـی تـاقە یەک پەیوەنـدی سێکسـی دۆستویفسـکی، بەر لە ژنهێنـانی لە ئـارادا نیـیە. لەوە دەچـێ ئـارەزووی سێکسـی دۆستویفسـکی درەنـگ گەشـەی کردبێـت. ئەم پیـاوە نەخـۆش، تـووڕە، خەیـاڵپەروەرە، تەنیـا لە دوورەوە دڵبەنـدی ژن بـوو، ترسێکی گۆنگی لە ژنـان هەبـوو. ڕەنـگە لە دڵەوە حەزی لێبـووبن، بەڵام خـۆی لەسـەر ئەم حەز و مەیلە سەرزەنشت دەکرد.

قارەمانانی ژن، لە هەوەڵین ڕۆمانەکانیدا، جگە لە نیتوچکا، بێ نموود و شاعیرانەن، خوێن و گۆشت و جەستە و ئامادەگیان نییە. ئەمانە، هەریەکە دەگەڵ پیاوێکدان، بەدڵی خۆیان و حەزیان لێی نییە.

جا ئەم کەپتە سەیرە، ئەم بایەخدانە بە بارودۆخی شێواو، ئەم حەزلێکەرییە ڕەوتەنی و بێ ئایندەیە، ئەم ئاوڕدانەوە و بایەخدانە بە ئارەزوێن سێکسی سەرکوتکرا و، هەر هەمووی ڕەنگدانەوەی حاڵی نووسەرە لە ڕۆژانی گەنجیدا. ئیدی ئەم پیاوە چکڵدانە تەنگە، بەخۆی لە عەزابی چاوەڕوانی دەگەڕێت، ئەم پیاوە پاک و شەرمنە لەزەتی لە ڕیسککاری نزیکە گوناح دەبینێ. تەنانەت ئامادەیە وەکو قارەمانەکانی، تەمەنی خۆی فیدای مەحاڵان بکات.

بەهەرحاڵ، گرێی چیرۆکی ڤیانی دوستویفسکی زۆر لەوە زووتر کرایەوە و تەواو بوو کە خۆی وێنای دەکرد. ئاغای ئیسایێف، بە پۆستی یاریدەدەری دادڤانی لەگوندی کوزنتسک دادەمەزرێت. ئەم گوندە نزیکەی حەوت سەد کیلۆمەترێک لە سیمیپالاتینسکەوە دوور بوو. ئیدی چار نەبوو دەبوایە دوستویفسکی و ماری لێکدی جودا ببنەوە. دوستویفسکی ئەمەی زۆر لەبەرگران دەبێت، بە نیگەرانیەوە دەپرسێت: "باشە ماری قاییل بووە؟ هیچ ناڕەزاییەکی دەرنەبڕیوە؟ بەڕاستی سەیرە!"

تووڕە و نا ئومێـد، وەکـو یەکێـک بەدەم خەوەوە ڕێبکـات وێـڵ و سـەرگەردان بە ژوورەکەدا دێ و دەچێت. ناو بەنـاو دەوەسـتێ تـا ئەوە بـۆ بـارون فیرانگیـل ڕوون بکاتەوە کە ژیانی وێران بووە و پڕ بەدڵ خۆزیـاخوازی مەرگـی خـۆیەتی. ئەوسـا دەست بە هاتوچۆیە شوومەکەی خۆی دەکاتەوە.

ڤیرانگیـل، زۆری هەوڵـدا، کە دڵخۆشـی هـاوڕێکەی خـۆی "دوستویفسـکی" بــداتەوە. هەمــوو قەرزەکــانی ماڵبــاتی ئیســاییفی بــۆدانەوە و زەمیــنەی سـەفەرەکەی بـۆ خۆشـکردن. دەگەڵ دوستویفسـکیدا، ڕێبوارەکانیـان بەڕێکـرد،

ماوەیەکی زۆر بەگالیسکەکەیان بەدوویاندا ڕۆییشتن. خانەوادەی ئیسایف، ئەوەندەیان پارە نەبوو کە گالیسکەیەکی باش و گەورە بەکرێ بگرن. بۆیە بەناچاری عەرەبانەیەکی سێ ئەسپەی سەر واڵایان بەکرێ گرت.
بارۆن ڤیرانگیل، ڕۆژی سەفەرەکە، ئیسایف و هاوسەرەکەی دەعوەتی شامپانیای خوداحافیزی دەکات. دەرفەت دێنێ و شامپانیایەکی زۆر دەخواردی ئیسایف دەدات، مەستی مەست دەبێت. لەکاتی حەرەکەتدا، بارۆن پێشنیازی کرد کە ئەو و ئاغای ئیسایف، پێکەوە سواری عەرەبانەکەی ئەو بن، ئیدی ئەو مەستە بێوەیە کە بەئاستەم خۆی بەپێوە دەگرت، بێ چەند و چوون قەبووڵی کرد. ئەنجام دۆستویفسکی سواری گالیسکەکەی دیکە بوو، لەنێوان ماری و پاشای کوریدا، سوار بوو. ئەم جێگۆڕکێیە، هەموویانی ڕازی کرد. هەموو بەدڵیان بوو. هەردوو گالیسکەکە بە هێوری دەچوونە پێشێ. ئاغای ئیسسایف، سەری کردە سەر شانی بارۆن فیرانگیل و خەوی لێکەوت. دوستویفسکی و ماری بەئەسپایی قسانیان بۆ یەکدی دەکرد. مانگی ئایار بوو، ئەو شەوە ئاسمان ساف و سایەقە بوو. بۆن و بەرامەی گوڵ و گولیلکە کێویان، پیاوی مەست دەکرد، تاریکی بەئاستەم خۆی لە ترۆپکی دارکاژان هەڵدەسوو، تریفەی مانگ، ڕێگاکەی لە پرتەوی شیر ئاسای خۆی هەڵکێشا بوو. ئارامی ئەم دیمەنە دڵگیرە، خەمی ئەو کەسانەی کە بەستایشەوە تەماشایان دەکرد و لێی ورد دەبوونەوە، زیاد دەکرد. ئەنجام کاروانەکە، لە قەراخ جادەکە وەستاو ئیدی کاتی ماڵاوایی و جیابوونەوە هات.
کابرای مەستی بێوەی، لە سووچێکا خەوی لێکەوتبوو، لە پرخەی خەوا بوو، پولی چکۆلە بەدەم خەوەوە وراوەی دەکرد. ماری و دوستویفسکی باوەشیان بەیەکدا کرد بوو، بەدەم گریان و فرمێسک ڕشتنەوە وێردیان دەخوێند و ئاماژەی خاچیان دەکێشا و سوێندیان بۆ یەکدی دەخوارد کە یەکدی لەبیر نەکەن و نامە لەیەکدی نەبڕن. بارون ڤیرانگیل، مێردەکەی ماری هەڵگرت و گواستیەوە بۆ ناو گالیسکە سەر واڵاکەی خۆیان. کابرای مەست هەر چاویشی هەڵنەهێنا. ماری و پاشاش، لەگەڵ یارۆی مەستدا سوار بوون. کابرای عەرەبانچی، قامچیەکەی لە ئەسپەکان باداو عەرەبانەکە لەنێو تەپوتۆزدا ون بوو. بەو جۆرە هەموو شتێک کۆتایی هات.
دۆستویفسکی، لەناوەندی ڕێگاکەدا، ڕەق ڕاوەستا بوو، تەواوێک کۆمابووەوە، جوڵەی لێوە نەدەهات، سەری خوار کردبووەوە و فرمێسک خوڕ خوڕ بە گۆناکانیدا دەهاتە خوارێ و دەڕژایە سەر عاردی. ڤیرانگیل چوو بەلای هاوڕێکەیەوە، دەستی گرت و بێئەوەی تاقە وشەیەک بڵێ، سواری گالیسکەکەی کرد.
جووتە هاوڕێ بەرەبەیان گەیینە سیمیپالاتینسک. دوستویفسکی خۆی بە ژوورەکەی خۆیدا کرد. تا ڕۆژهەڵات، بەپانی و بەدرێژی ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. پاشان چوو بۆ ئۆردگا، تا لە مەشق و ڕاهێناندا بەشداری بکات. کە لەوێندەر گەڕایەوە، بێئەوەی شتێک بخوات یان بخواتەوە، لەسەر گازی پشت

ڕاکشا، خەوی لێنەکەوت، چاوی بڕینە بن میچەکە و دەستی بە پایپ کێشان کرد، پایپ لە دووی پایپی پێدەکرد.
دوستویفسکی لە ٦/٤دا نامەیەک بۆ ماری دەنووسێت: "خۆزگە دەتزانی لێرەدا، چەند هەست بە تەنیایی دەکەم. لەڕاستیدا. وەزع و حاڵم ڕێک لەوکاتە دەچێت کە لەساڵی ١٨٤٩دا دەستگیر کرام و لە زندانێکدا زندەبەگۆڕیان کردم. بەخورتی لە هەموو خۆشی و شادییەک دایان بڕیم. چەند خووم بەتۆوە گرتبوو. هەرگیز دۆستایەتی خۆمانم بە دۆستایەتیەکی ئاسایی نەدەزانی. بەڵام من ئێستا لە دیداری تۆ بێبەشم. زۆر شتم جەڕباند و لە ئەزموونەوە فێری بووم. من پێنج دانە ساڵ لە دەرێی کۆمەڵگەدا بەتاقی تەنیا، ژیاوم، تەنیا بە هەموو مانایەکی تەنیایی. کەسێک نەبوو گرێی دڵی خۆمی بۆ بکەمەوە و خەمەکانی خۆمی بۆ هەڵبڕێژم. بەڵام تۆ وەکو کەسێکی خۆت، وەکو خزمێکی نزیکی خۆت پێشوازیت لێکردم... مەگەر هەر خۆم بزانم، بەم مجێزە تووند و خراپەی خۆم، چەندم ئازار داویت، چەندم خەفەت پێداوی، کەچی وێڕای ئەمەش تۆ و مێردەکەت خۆشتان دەوێم، من لەم هەڵوێستە تێدەگەم، هەستی پێدەکەم، کەسێکی ئەوەندەش بێ دڵ نیم. تۆ ژنێکی سەیریت، ڕوحێکی بێ وێنەت هەیە، هەمان پاکی و بێگەردی منداڵت هەیە. تۆ لەجێی خوشکم بووی. کە ژنێک دەستی میهر و مەحەبەتی بۆ درێژ کردووم، ئەمە خاڵێکی مێژوویی گرینگە لە ژیانی مندا. ئێستاش شەوانە، لە باوەشی تاریکیدا، ڕێک لەو کاتانەدا کە جاران ڕازی دڵی خۆمم بۆت هەڵدەڕشت، خەمەکانی خۆمم بۆ هەڵدەڕشتیت. خەمێکی بەژان دامدەگرێت، گریان ئەوکم دەگرێت و... هیوادارم ئەم قسانەم، بە گەوجە گەوج نەزانیت. حاڵی حازر لەوپەڕی گۆشەگیری و تەنیاییدا دەژیم. تەنیای تەنیا، نازانم ڕوو بکەمە کوێ، شەو ڕۆژ چۆن ببەمە سەر.. لە هەموو شتێک بێزارم.. لە چ بۆشاییەکدا دەژیم!.."
دوستویفسکی، جۆش و خرۆشی نووسین لە دەست دەدات، تووشی ڕەشبینی تەواو دەبێت، خەمینی دایدەگرێت. زوو توورە دەبێت و تەنانەت باوەڕ بە هەندێ خورافات دێنێ.
چارەنووسی خۆی دەگەڵ چارەنووسی ڤیرانگیلی دۆستیدا بەراورد دەکات، کە کەوتبووە داوی ئەوینی ژنێکی سی و چوار ساڵەوە، کە دایکی شەش منداڵ بوو، لە دووری چوار سەد کیلۆ مەتری سیمیپالا –تینسکدا دەژیا. ئیدی دەکەوێتە گلەیی لە بەخت و چارەنووسی خۆی و هاوڕێکەی. دەکەوێتە ڕاڤە و لێکدانەوەی سەیری ئەو خەونانەی کە دەیان بینێ. پێشبینی هەندێ ترس و شادی ناواقیعی بۆ خۆی دەکات. پەنا وەبەر سیحر و جادوو دەبات و سەرەنجام دەچێتە لای ژنێکی فاڵگرەوە، کە دەڵێت بە دەنکە نۆکان فاڵدەگرێتەوە و پێشگۆیی ئایندەی بەشەران دەکات.
ئەو هەواڵانەی کە لە کوزنتسکەوە، دەگەیشتن، دڵخۆشکەرە نەبوون. ماری گلەیی لە تەنیایی خۆی هەبوو، "بە دەست هەژاری بەردەوامەوە، مەینۆشی هەمیشەیی و بێ حیسابی مێردەکەیەوە، قسەو قسەڵۆکی ئەم و ئەو لەم

شارە بچووکەدا، دەناڵێنێ. تاقە شادی ئەو هاتووەتە سەر ئەوەی کە قسان دەگەڵ دۆستێکی مێردەکەیدا، کە فێرکارێکی گەنج و پیاوێکی باشە، بکات."
دوستویفسکی کە بەمە دەزانێ، لە ناخا غیرە وحەسوودی دەیگرێت. ئەم فێرکارە گەنجە کێیە؟ ناکا ماری ئەم پیاوە نەناسراوەی خۆش بوێت؟ ئایا ڕابردووی لەبیر کردووە؟ ئیدی لەمە بەدواوە نامەکانی دۆستویفسکی زیاد دەکەن و زۆر درێژ دەبنەوەو بە ئەندازەی نیمچە کتێبیان لێدێت. ئیدی بەدەم چاوەڕوانی هاتنی پۆستەوە دەژیا. ئیشتیای لە خواردن تۆرا، تەواو لاواز بوو، هەمیشە پەست، شەڕی بە سێبەری خۆی دەفرۆشت.
بارۆن ڤیرانگیل، لێدەبڕێ یارمەتی برادەرەکەی بدات و بۆ ئەم مەبەستە، دیدارێک لەنێوان ئەو و ماریدا، لەشاری زمیفدا ساز دەکات. زمیف شارێکی چکۆلەیە دەکەوێتە نیوەی ڕێگای نێوان سیمیپالاتینسک و کوزنتسکەوە. لە ڕێگەی نامەوە، ماری لە کات و شوێنی دیدارەکە ئاگادار دەکاتەوە. بەڵام دام و دەزگا و دەسەڵاتی سوپایی، ڕێگە بە سەربازێکی وەکو دوستویفسکی نادەن، سەفەری شوێنانی وا دوور بکات. ئیدی ڤیرانگیل، فێڵێک دەدۆزێتەوە. لە هەموو شوێنێ دەیکات بە قاو کە دۆستویفسکی، نۆرەفێی لێهاتووە، بۆیە دەبێ ڕۆژێکی تەواو لە ژوورەکەی خۆی وەدەرنەکەوێت، تا ئیسراحەت بکات و وەخۆبێتەوە. لاموت، دکتۆری فەوجەکە، کە لەم نەخشەیەدا شەریک بوو، پشتیوانی لە قسەکانی نوێنەری گشتی دەکات. ئیدی فەرمان بە ئادەمی خوڵامی ڤیرانگیل دەدەن، کە هەموو پەنجەرەکان توند دابخات و ڕێگە بەکەس نەدا بێتە ماڵەکەوە. سەعات دەی شەوێ، کاتێ کە هەموو گڵۆپەکانی شارۆچکەی سیمیپالاتینسک خامۆش دەبێت، جووتە هاوڕێ بەسواری گالیسکەکەی ڤیرانگیل، بەرەو شاری زمیف کەوتنەڕێ.
ڤیرانگیل، پاشان، لە باسی ئەم سەفەرەدا دەنووسێت: "وەکو ئەوە بوو بە ئاسماندا بفڕین، وەکو باهۆز دەڕۆیشتین، بەڵام دوستویفسکی داماو، هەستی بەم خێراییە نەدەکرد، بەردەوام دەیگوت، ئێمە بەسواری کیسەڵ دەڕۆین، بەردەوام داوای لە عەرەبانچیەکە دەکرد کە خێراتر باژوێ".
لێ مخابن! ڤیرانگیل و دۆستویفسکی، لەجیاتی مەدام ئیسایيف، ئەم ژنە گەنجە، تەنیا نامەیەکی ئەو وەردەگرن، کە داوای بوردنیان لێدەکات کە نەیتوانیوە، بە مەوعیدەکەوە بێ، چونکە مێردەکەی لەوە نەخۆشتر بووە، بتوانێ بەتەنیا بەجێ بێڵێ. گەڕانەوەیان زۆر ناخۆش بوو. پتر لە سێ سەد کیلۆمەتریان لە ماوەی کەمتر لە بیست و هەشت سەعاتدا بڕی بوو، ئەمە جگە لەوەی ترسی ئەوەش لەئارادا هەبوو کە دۆستویفسکی داخڵی فیراری ببێت و تووشی کێشە ببێت. ئیدی هەموو ڕیسکەیان بووەوە بەخوری، بەڵام خۆشبەختانە هیچ کەسێک بە غیابی ئەم جوتە هاورێیەی نەزانی بوو. لێ بارون ڤیرانگیل کۆڵی نەدا، دوای چەند ڕۆژێک داوای مۆڵەتی کرد کە دەگەڵ دوستویفسکیدا سەفەرێکی چەند ڕۆژە بۆ زمیف، بۆ لای هەندێ لەو دۆستە ئەندازیارانە بکەن کە لەوێندەر کاریان دەکرد. مۆڵەتەکەیان درایە. خوڵامەکەی ڤیرانگیل، پاڵتۆیەکی کورتی جوانی بۆ دوستویفسکی دووری. ئەمە یەکەمجار

بوو، ئەم دوورخراوەیە، دوای ئازادبوونی لە بێگارە زندان، جلکی مەدەنی لەبەر دەکرد. جووتە هاوڕێ، بەو ئومێدەی کە ئەم هەوڵەیان ناکام نەبێت و ئەنجامێکی هەبێت، کەوتنەڕێ. ئەمجارەش شەوەکەی، زۆر خۆش بوو، کەش و هەواکەی خۆشبوو. ڕێگاکە قیرتاو و هەموار بوو، هیچ چاڵ و قۆرتێکی تیا نەبوو. گالیسکە سێ ئەسپەکە، بەخێرایی بەناو دیمەنانێکدا دەڕۆیی، وەکو ئەو دیمەنانەی لەخەودا دەبینرێن. لە فاسیلەو دووری پێنج کیلۆمەتری شارەوە، لەناکاوا، ئاسۆیەکی سووری خوێن ئاسایان لێ بەدیار کەوت. جووتیارانی گوندەکان پووش و پەڵاشی پایزەیان دەسووتاند، ئاگرەکە وەکو لافاوی گڕ، شەپۆلی دەدا. بڵێسەی ئاگر، دەچوو بە ئاسماندا و بە دەوری خۆیدا گێژی دەخوارد، پزیسکی ئاگر دەتەقییەوە ، بەم لاو بەولادا بڵاو دەبووەوە و ئاگری تازە دەکەوتەوە. ئەسپەکان بەترسەوە، بەلای ئەم کوورەی ئاگرانەدا تێپەڕین. ئەنجام ڕێبوارەکان، لە کانە زیوەکانی زمیف نزیک بوونەوە.
  ماڵی کریکارەکان، دەوری کارخانە سەرەکییەکەیان دابوو. کەمێ لە دوورتر، ڤێلای ئەندازیاران و گەورە فەرمانبەرەکان دیار بوون. لە دوورەوە، ڕوبارەکە دیار بوو کە دەڕۆیی.
  هەرکە دەگەنە شار، دوستویفسکی خێرا نامەیەک بۆ ماری دەنووسێت و تکای لێدەکات بەزووترین کات بێتە دیدەنی. بەڵام پێنج دانە ڕۆژ تێدەپەڕێت و هیچ وەڵامێک لە مارییەوە نایێت. کەس نازانێ ماوە یا مردووە. چاری نامێنێ، دەبێ بۆ سیمیپالاتینسک بگەڕێتەوە و دەست بە ژیانی یەکهاوی ڕوتینی ناو سەربازخانە بکاتەوە. دەبێ چاوەڕوان بکات، چاوەڕوان، هەمیشە چاوەڕوانی. دوستویفسکی گەییوەتە لوتکەی پەستی.
 دوستویفسکی، لە ئەنجامدا، لە ١٨٥٥/٨/١٤دا نامەیەکی لە شاری کۆرتسکەوە پێدەگات، کە مێردەکەی مەدام ئیسایف، دوای نەخۆشیەکی دوورو درێژی کوشندە مردووە. لە نامەکەی ماردی دا، باسی ئەوە کرا بوو، کە ڕۆژگاری نەخۆشییەکە و ڕێوەڕەسمی کفن و دفن وبەخاک سپاردنی مێردەکەی زۆر هەژارانە ئەنجام دراوە، بەڕادەیەک کە پارەی کرێی گالیسکەکەی گواستنەوەی جەنازەکەی لە دراوسێیەکیان قەرز کردووە. کەسێکی نەناس سێ ڕۆبڵی بۆی ناردووە و ئەمیش وەکو خێر و سەدەقە قەبووڵی کردووە. هەرچەندە دوستویفسکی لەڕووی بەزەییەوە، ئەو کابرا ئالوودە و هەمیشە مەستەی خۆش دەویست و ئەو هەواڵە تاساندی، بەڵام لەدڵی خۆیدا، هەستی بە ئاسوودەییەکی سەیرو شادییەکی پەنهان و بەدنیهادانە دەکرد: هەست دەکات دوا کۆسپی سەر ڕێگای تەخت بوو، ماری ئیدی سەربەست و ئازادە و دەتوانن زەماوەند بکەن. ئیدی دوا لەمپەر خۆ بەخۆ هەرەسی هێناوە. بەڵام وێڕای ئەمەش، تووڕە دەبێت و گازاندە لەخۆی دەکات کە بۆچی هەندێجار گاڵتەی بەم پیاوە داماوە دەکرد و حەزی نەدەکرد لە ماڵەکەی خۆیدا بێت، ڕەنگە لەدڵی خۆیدا بە ئاواتی مردنیەوە بووبێ. ئەوا ئەو ئاواتەی هاتەدی، وەکو چۆن کاتی خۆی هەمان ئاواتی دەرهەق بە باوکی

خـۆی هـەبوو. ئیـدی جـارێکی دی، بـەدەر لـە هـەر یاسـایەکی بـاو، خـۆی بـە کەمتەرخەم دەزانێت.
ڤیرانگیـل، بـەکاری فـەرمی لـە شـاری بیسـک دەبێـت. دوستویفسـکی نامەیەکی پڕ سۆزی بۆ دەنێرێـت، تکـای لێـدەکات کـە هەنـدێک پـارە بـۆ مـەدام ئیسـاییف بنێرێت: "دڵنیابە کە ئەو پارەیەت بۆ دەگێڕمـەوە. بـەڵام بـەو زوانـە نـا.. هەڵبەتـە نامـەوێ ئـەو خانمـە، وا هەسـت بکـات منـەتبار و قـەرزاری منـە، هەرچەندە بەنیازم ئەو پارەیە بدەمەوە، بەڵام دەبێ جارێ لە گیرفانی یـەکێکی دی بـدرێت.. بـەڵام هـەر چـۆنێ بـووە، هـەر دەیدەمـەوە، لـێ نـازانم کـەی."
هـەروەها تکـا لـە هاوڕێکـەی دەکـات لەگـەڵ پارەکـەدا نامەیـەکیش بنێرێـت و سـەرخۆشـی لێبکـات و دڵـی بداتـەوە. دەنووسـێت: "دەبـێ زۆر بـە وریاییـەوە مامەڵە دەگەڵ ئەو کەسـەدا بکرێت کە قەرزاربارتە. بەتایبـەتی کەسـێکی وەکـو مـاری کـە یـەجگار هەسـتیار و بەگومانـە. هەمیشـە ئـەو هەسـتەی لایـە کـە فەرامۆش کراوە و دەیەوێ قەرەبووی ئەو چاکانە بکاتەوە کە دوسـت و ئاشـنا و خزمان دەگەڵی دەیکەن." پاشـان لەنامەیەکـدا بـۆ ڤیرانگیـل دەنووسـێت: "مـن پێمگوتووە، کە ئەو بیسـت و پێـنج ڕۆبڵـە تـۆ بـۆت نـاردووە نـەک مـن. خودایـا! چ ژنێکە!... حەیفێ کە تۆ باش نایناسیت."
ئومێدی کرانەوەی دەرووپەک، هێندەی دی جۆشی سۆز و ڤیانی زیاد دەکات. لەنامەیەکدا بۆ میشێلی برای لەو بارەیەوە دەڵێت: "براکەم، باش گوێ لە قسەکانم بگرە. من ماوەیەکی زۆرە ئەم ژنەم خۆش دەوێ و دەزانم ڕەنگە ئەویش منی خۆش بوێت. من بەبێ ئەو هەڵناکەم. هەرکاتێ وەزعم تۆزێک باش بێت. زەماوەندی دەگەڵ دەکەم. دەزانم کە ڕەفزم ناکات."
دوای چەند هەفتەیەک، لە نامەیەکی دیدا بۆ میشیل دەنووسێت: "ئێمە لە دوورەوە پەیمانمان بەیەک داوە. سوێندمان بۆ یەک خواردووە. ئەویش منی خۆشدەوێ. بە کردەوە ئەوەی بۆ سەلماندووم."
لـە ڕاسـتیدا، ژنـەی پێنـەوا، لـە سـاتێکی زۆر هەسـتیار و تەنگانـەدا بـەڵێنی شووکردنی پێدا بوو. بەڵام لەم بڕیار و بەڵێنەی خۆی یەجگار دوو دڵ بوو.
ماری، ژنێکی بێکەس و بێ پشت و پەنا بوو، هیچ دەرامەتێکی ژیـانی نـەبوو، کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەو سۆز و بەزەییەوە کە دوستویفسکی دەرهـەق بـەو هەیبوو، بەڵام خۆشـی نەدەویست. چونکە پیاوێک بوو هەژار و نەدار، نـەخۆش. ئیدی دەنگوباس لە سیمیپالاتینسکدا بڵاوبووەوە کە ماری بـە تەمایـە شـوو بـە پیاوێکی دیکـە بکـات. ئـەوەی ڕاسـتی بـێ دۆسـتویفسـکی لـە نامـەکانی ئـەو دواییانـەی دەزگیرانەکەیـدا، هەسـتی بـە جـۆرە سـارد و سـڕی و دوو دڵییـەک دەکرد کە زۆری لەبەر گران بوو.
ماری دیمیتریڤنا لە نامەیەکدا بۆ دۆستویفسـکی دەڵێـت: "چـار چیـە؟ ئەگـەر پیاوێک لە تەمەنێکی گونجاودا بێ، وەزیفەیەکی جێگیـر و بـەردەوامی هـەبێت، پیاوێکی باش بێت، داوام لێبکات شووی پێبکەم، چ وەڵامێکی بدەمەوە؟" مـاری وەکو دۆستێک پرس بـە دۆسـتویفسـکی دەکـات و تـەواو، ئیـدی بەمـە چـەکی دەکات. ئەمە مانۆڕێکی زیرەکانە بوو. نەدەتوانێ بـەماری بڵـێ شـوو بـەو پیـاوە

ده‌وڵه‌مه‌نـد و خانه‌دانـه نـه‌كات و، نـه‌ده‌توانێ بڵـێ مێـردی پێبكـات. جـا دۆستویفسكییه‌كی كۆنه زندانی و دوور خـراوه‌ی ئێسـتا، ئه‌گـه‌ر به‌رهه‌ڵسـتی ئه‌م ژنه بكات، ئه‌مه ده‌كاته ئه‌وپـه‌ڕی خۆپه‌رسـتی. ئـاخر سـه‌ربازێكی سـاده و تڕۆكراوی كۆمه‌ڵگه ده‌بـی چـاوه‌ڕوانی چـی بێـت؟ بـه‌ڵام ناشـتوانێ مـل بداتـه خه‌ت و به‌وه قاییل بێ، ژنێك كـه ئـه‌می خۆشـده‌وێ، مێـرد بـه پیـاوێكی دیكـه بكات. له‌به‌رخۆیه‌وه بیر ده‌كاته‌وه كه ماری ئاماده نییه بیر له‌وه بكاته‌وه شـوو بـه بابایه‌كی نه‌ناسـی بێگانه بكات، پت و پیره‌ژنانی دێهاتی ده‌چنه بن كلێشـه‌یه‌وه و هانی ده‌دان كاری وا بكات. ماریپش ژنێكی ساویلكه و دڵساف و ده‌سـتكورت و هـه‌ژاره و فریـوی خـواردوون. بـه‌ڵام دوستویفسـكی جگـه لـه‌و چه‌نـد دێـڕه‌ی ده‌یخاته سـه‌ر كاغه‌ز، ناتوانێ هیچ به‌رگری و داكۆكییه‌ك لـه‌خۆی بكـات. ئیـدی له هه‌ر ده‌قیقه‌یه‌كدا، لـه هـه‌ر چركه‌یه‌كـدا ئه‌گـه‌ری ئـه‌وه هـه‌بوو، لـه ئاكـامی بڕیـاری مـاری دا، چاره‌نووسـی دوستویفسـكی به‌تـه‌واوه‌تی بگۆڕێـت. مـاری به‌تاقی ته‌نیا، لاواز و بێ توانا. بێ پشـت و په‌نا، نه‌بوو و نـه‌دار، كـه‌وتبووه نێـوان خه‌ڵكانێكه‌وه ئاگایان له حـاڵی ئـه‌و نـه‌بوو، لێـی تێنه‌ده‌گه‌یشـتن. دوسـتویفكی هه‌سته‌ده‌كات، ئه‌گه‌ر په‌یوه‌ندی، ده‌گه‌ڵ ماریـدا، بـه تـه‌واوه‌تی بپچڕێـت، نـاژی، ده‌مرێـت. ڤیرانگیـل، له‌وكاتـه‌دا، لـه سـیبریاوه، چـووه بـۆ سـان پتروسـبۆرگ. دوستویفسكی بۆی ده‌نووسێت: "ئه‌گه‌ر فریشـته‌كه‌م لێـزه‌وت بكـه‌ن، بێگومـان ده‌مرم یا شێت ده‌بم، یا خـۆ ده‌خه‌مـه ڕوبـاری "ئیـرتیچ"ه‌وه. مـن مـاری بـه‌هی خۆم ده‌زانم، هی خۆم، تێده‌گه‌ی؟ بیكه به‌خاتری خـوا نامه‌یـه‌كی بـۆ بنووسـه، به‌ئاشـكرا خولیـا و حـه‌زو ئاواتـه‌كانی منـی بـۆ شـرۆڤه بكـه، و ئه‌گـه‌ر شـتێك ده‌رباره‌ی ڕزگاری من لـه‌م تاراوگه‌یـه، لـه ئـارادا هه‌یـه، بـۆی بنووسـه. هـه‌موو شـتێكی بـۆ بنووسـه، تـا بـه‌ڵكو ئومێـدێك بـه ئاینـده‌ی مـن په‌یـدا بكـات. بـه‌ڵام له‌وه‌یه تۆ نـه‌زانی چـۆن نامه‌یـه‌كی بـۆ بنووسـیت. ئه‌مـه كـارێكی زۆر ئاسـانه، بـه‌مجۆره بـۆی بنووسـه: "فیـدور میخـائیلوفیچ، سـڵاوی تـۆی پێگه‌یانـدم... جـا چونكـه ده‌زانـم تـۆ ورده‌كـاری ژیـان و چاره‌نووسـی ئـه‌وت زۆر بـه‌لاوه گرینـگ و مه‌به‌سته. بۆیه مژده‌ت ده‌ده‌مێ، كه خه‌به‌ری زۆر دڵخۆشـكه‌ره سـه‌باره‌ت بـه‌و به‌ڕێوه‌یه..."

ئاهـ، خۆزگه، ده‌یتوانی له سوپادا، پله‌یه‌ك وه‌ربگرێت. له ڤیرانگیل ده‌پاڕێتـه‌وه كـه كـارێكی بـۆ بكـات. ئیـدی بـه‌ده‌م چـاوه‌ڕوانی وه‌ڵامـی دۆسـته‌كه‌یه‌وه، نامه‌یـه‌كی شـێتانه بـۆ مـه‌دام ئیسـاییف ده‌نێرێـت، لـه نامـه‌كـه‌دا له‌لایه‌كـه‌وه هه‌ڕه‌شـه ده‌كـات و له‌لایـه‌كی دییـه‌وه ده‌پاڕێتـه‌وه و شـین و زاری ده‌كـات و ئه‌شقی خۆی بۆ ده‌رده‌بڕێت. دوای دوو سـاڵی ئه‌شـقی خـامۆش و ده مانـگ دووری ئیـدی نـاتوانێ ده‌سـت لـه‌م ژنـه هـه‌ڵبگرێت. به‌ته‌مایـه عـه‌فوانێك بیگرێته‌وه و ئه‌م دێهات و ئاوایی و شارۆچكانه‌ی سیبریا به‌جێ بێڵـی. هـه‌نگێ ده‌كه‌وێتـه نووسـین "ده‌تـوانم بـه‌ناوی خـوازراوه‌وه نووسـین بـڵاو بكه‌مـه‌وه" پاره‌یه‌ك به‌ده‌ست دێنێ و دكارێت به‌و پارانه ماری و كوڕه‌كه‌شـی لـه هـه‌ژاری و نـه‌داری ڕزگـار بكـات. بـه‌ڵام وه‌ڵامه‌كـه‌ی مـه‌دام ئیسـاییف، تـا ڕاده‌یـه‌ك سوكنایی به دڵه‌ی په‌شێوی ده‌به‌خشێت. بۆی ده‌نووسێت، تـه‌نیا ویسـتویه‌تی

ئەشق و ڤیانی ئەو "دوستویفسکی" سەبارەت بەخۆی بئەزمووێ، چونکە ئەو ژنێکی غیرەدارە. دۆستویفسکی هێندە بەو قسەیەی خۆشحاڵ دەبێت کە لەکەیفان لە پێستی خۆی ناهێورێ. خۆی هێور دەکاتەوە، داوای بوردن لە ماری دەکات کە بەو زبری و توندیە ڕەفتاری دەگەڵ کردووە و دواندویەتی. ئیدی دووبارە هیواو ئومێد پەیدا دەکاتەوە.

بەڵام ئەم خۆشی و ئاسودەییە زۆر ناخایەنێت. ماری لە نامەکانی دواتریدا، باسی ئەو فێرکارە گەنجەی بۆ دەکات کە دۆستی مێردەکەی بوو. ستایشی هۆشنی و زیرەکی و بەهرەداری و خوڵق و خووی جوانی ئەو دەکات. بە دۆستویفسکی دەڵێت: "من، لەو ژنانە نیم کە بتوانم هیچ پیاوێک بەختەوەر بکەم. من و تۆ دوو مرۆڤی بێنەوا و بەلەنگازین، بێگومان ئەم زەماوەندە بۆ هیچ کاممان، بەکەڵک نایەت و هیچ بەرێکی نابێت."

دۆستویفسکی، بە جۆرێ دەهری دەبێ، لێدەپرێ ڕیسک بە هەموو شتێک بکات. بۆ یەکەمجار بیر دەکاتەوە کە بە بیانوی نەخۆشییەوە، لە سیمیپالاتینسک هەڵێت، بەڵام ناچار دەبێت زەمینە بۆ ئەم ڕیسکە خۆشبکات، ئیدی سەرەنجام مۆڵەتی فەرمی بەدەست دێنێ و دیدەنی ماری دەکات. لەم دیدارەدا ماری بەدەم دەست هەڵگلۆفین و ئاخ هەڵکێشانەوە، دەست بەگریان دەکات، ڕوو لە ئاسمان و خودا دەپاڕێتەوە. ئەنجام ماری دوای قسەی خۆی دەکات و دان بەوەدا دەنێت، کە ئاشقی ئاغای ڤیرگونوف، مامۆستا گەنجەکە بووە و دڵبەستەی ئەوە. ماری تەمەنی بیست و نۆ ساڵە و مامۆستاکە تەمەنی بیست و چوار ساڵە. ماری ژنێکی سەنگین و سەلار، خوێنەوار و تێگەیشتووە. کورەش خەڵکی سیبریایە، مامۆستایەکی سەرەتایی کەم سیواتی قوتابخانەیەکە. مووچەیەکی کەمی هەیە، کورێکی ساویلکەیە، وەکو تاووس بە خۆی دەفشێ.

دوستویفسکی، دەکەوێتە دژایەتی ڕەقیبەکەی، تا بەرگری لەخۆی بکات و ئەم شانسەی لەدەست نەچێت. ئایا ئەم کوڕە مێردێکی لەبارە بۆ ماری؟ ئایا لەماری تێدەگات، دەتوانێ مدارای بکات؟ ئایا لەو پیاوانەیە بتوانێ داڵدەی ماری بدات و لەژیاندا، پشتیوانی بکات و بیپارێزێت؟ ئێستا تاقە ڕەسید و دەستمایەی ئەو گەنجیەتیەکەیەتی و هیچی دی. ئەدی دوایی، لە ئایندەدا دەبێ بەچی؟ ئایا ماری دەگەڵ کۆلکە خوێنەوارێکی وەکو ئەودا هەڵدەکات؟ ئایا سوو ناخوات لە بەهەدەردانی، سۆز و هەستی بەرزی ئەم پیاوەی دی کە ئێستا لە هەنبەریا وەستاوە و لێی دەپاڕێتەوە، کە جوان بیر لەم کارە،ناکاتەوە ؟ ژێوان نابێتەوە.

ماری، بە قسەکانی ئەو، تەواو دەپەشۆکێ، شپرزە دەبێت. بەو قسە گەرم و گوڕ و سکاڵا ئامێزانە، تەواو سارد دەبێتەوە. لەبن لێوانەوە دەڵێت: "مەگری، خەفەت مەخۆ، هێشتا دوا بڕیارم نەداوە، نە سەبارەت بەتۆ و نە سەبارەت بەکەسی دی."

دوستویفسکی وەخۆ دێتەوە، دەبوژێتەوە، هێور دەبێتەوە و دەڕوات بۆ دیدەنی ئەو کوڕەی کە دەنکەکەی ئەمی تەفرە دابوو. فیرگونوفی بەلەنگاز،

هیچی پێ نایێت، هەر کە دۆستویفسکی دەگەڵیا دەکەوێتە گەنگەشە، ورە بەر دەدات و دەست بەگریان دەکات و ڕوندک بە چاوانیدا دێنە خوارێ. دوستویفسکی پاشان لەو بارەیەوە دەنووسێت: "گریان هەموو هونەرێکی ئەو بوو، تەنیا گریانی دەزانی."

دوای دوو ڕۆژان، دوستویفسکی پاش ئەوەی قەناعەت بە هەردووکیان دەکات. بۆ سیمیپالاتینسک دەگەڕێتەوە و لەوێوە نامەیەکی ڕۆمانسی جوان و کاریگەر بۆ هەردووکیان دەنێرێت. بەڵام دوای گەڕانەوەی ئەو، ئەم جووتە ئاشقە دیسان لەیەکدی نزیک دەبنەوە و، ئەنجام دوستویفسکی نامەیەکی تووڕەی ماری و نامەیەکی تانە ئامێزی پڕ جنێوی ئاغای ڤیرگونوفی پێ دەپڕێت. هەنگێ دوستویفسکی بەوپەڕی خەمینی و دڵتەنگی ئەم چەند دێڕە دەنووسێت: "من هەمان شتم بەسەرهات، کە بەسەر جیل بلاسی قەشەباشی غەرناتە هات کاتێ کە حەقیقەتی گوت."

هەموو شتێک تەواو بوو، دوستویفسکی بۆڕ دەخوات و بە خەمینییەوە ئەم شکستە قەبووڵ دەکات و ئیدی مل بۆ کارەسات و بێ بەختی خۆی دەدات. دووبارە دنیای لێ تاریک دەبێ. ئیدی بیر لە فیداکارییەکی تەواو دەکاتەوە. لەدڵی خۆیدا، بیری لەوە دەکاتەوە کە ناتوانێ ئەو ژنە بخوازێت، بەڵام خۆ دەتوانێ یارمەتی بدات و کارێکی وا بکات لە ژیانیدا خۆشحاڵ و بەختەوەر بێت. دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو بیرۆکە جوانەوە ئیدی ئەرکێکی پیرۆز، وەکو فریشتەی نیگابان، بەرانبەر بەو ژنە، لە ئەستۆی خۆی دەگرێت. ڕەنگە ئەمەی لێ قەبووڵ نەکات. چ قەیدیە، خۆ ئەم دکارێت بەسۆزی ناسک و مرۆڤدۆستانەی خۆی، خەڵکی سەرسام بکات. ئیدی لەو کاتەوە بڕیار دەدات کە دۆستی ئەو دوو مرۆڤە بێ، ئەگەر چی ئەوان هەستیان بریندار کرد بوو. هەوڵێکی زۆر دەدات کە کورەکەی ئیساییف، لە تیپی پێشەنگی سەربازانی نەجیمزادەی سیبریا وەربگیرێت. داوا لە دۆستان و برادەرانی خۆی لە ئومسک و لە سان پتروسبۆرگ دەکات، کە یارمەتی و پیتاک بۆ بێوەژنە گەنجەکە کۆبکەنەوە. نامەیەکی پڕ پاڕانەوە بۆ بارۆن ڤیرانگیل دەنووسێت و بە کڕنۆشەوە لێی دەپاڕێتەوە کە وەزیفەیەکی چاکتر و بە مووچەیەکی زۆرترەوە، بۆ ئەو پیاوە بدۆزێتەوە کە دەبێ بە مێردی ئایندەی ماری دیمیتریڤنا. "هەر هەموو ئەمەم لەبەر خاتری مارییە، تەنیا ماری و بەس!... بۆ ئەوەی چیتر بە کولەمەرگی و کڵۆڵی نەژی!.. جا چونکە بڕیاری داوە شوو بەو فێرکارە بکات، خۆ دەبێ پارەیەکیان پێ بێت. جا حاڵی حازر ئەو کورە بۆ من و لای من لەبرا ئازیزترە.. بۆیە هیچ گوناح نییە، ئەگەر داوای هەموو شتێک بۆ ماری بکەم. ماری شایستەی هەموو شتێکە."

ئەم هەستی هاودەردی و هاوسۆزییەی کە ئاشقی خیانەت لێکراو، دەرهەق بە غەنیم و ڕەقیبەکەی دەری دەپڕێت، دەبێت بە بابەت و تیمەی سەرەکی ڕۆمانی (مزلون مهانون). قارەمانە ژنەکەی ئەم ڕۆمانەش دەڵێت: "من بەرانبەر بەتۆ بێوەفاییم کردووە، کەچی تۆ لە هەموو خەتاو گوناهەکانم خۆش بوویت و جگە لە بەختەوەری من بیر لە هیچ شتێکی دی ناکەیتەوە."

هـەروەها لـە ڕۆمـانی گـەمژەدا، میـرزادە میشــکین، هەرچەنـدە ناستاسـیا فیلیپوفنای زۆر خۆشـدەوێ، و ناستاسـیا ڕەدووی ڕوگـوژین دەکـەوێت، کـەچی میـرزادە میشــکین، پەیوەندییــەکی دۆســتانە دەگــەڵ، هەڤڕکەکـەی خۆیـدا دەگرێت. لەوەدەچێت کـە چیرۆکـی ڤیـانی دۆستویفسـکی، هـەمان کۆتـایی و چارەنووسـی قارەمانانی ڕۆمانەکەی خۆی هەبێت. بەڵام ڕووداوێکی کوت و پڕ، لە ئەنجامدا، سـەرانسـەری ڕێڕەوی چیرۆکەکە دەگۆڕێت.

لـە ١٨٥٦/١٠/٢٠دا دۆسـتویفســکی، تـەرفیع دەکـات و دەبـێ بـە ملازمـی دووەم، ئەم بەرزبوونەوەیە، پێگەیەکی شایستە و موچەیەکی باشی بـۆ دابـین کرد. ئەمە جگە لەوەی ئەگەری عەفووی تەواوەتی و گەڕانەوەی بـۆ ڕووسـیای بۆ ڕەخساند. دوستویفسکی دەبوژێتەوە و مەیلی تـازە دەبێتـەوە و سـەرلەنوێ خوازگاریەکەی خۆی تازە دەکاتەوە.

لە بەرواری ١١/٢٤/دا مۆڵەتی سـەفەر بـۆ کوزنیتسـک وەردەگرێـت. بەوپـەڕی شـادی و خۆشحاڵی دەگاتە ئەو شـارە. ئەمجارەیان لەسـەرکەوتنی خـۆی دڵنیـا دەبێـت. ورەی زۆر بـەرزە. مـاری دەبینـێ و ئیـدی زۆر شـتی بـۆ بـاس دەکـات و بەهار دێنێتە چۆکان، هێندە بە ئاو و تاو و گەرم و گوڕی قسان دەکات کە مـاری دێتە جۆش و خرۆش. بۆی دەسـەلمێنێ کە ئەوان بـۆ یەکـدی دروسـت بـوون و خوڵقاون و دەبێ زەماوەند بکـەن. بـەڵام کێشـەکەیان ئەوەیـە کـە پـارە لـەکوێ پەیـدا بکـەن. بـەلای کەمـەوە شـەش سـەد ڕۆبڵیـان بـۆ ئـەم کـارە پێویسـتە. دوستویفســـکی نەخشـــەیەکی بـــە دەســـتەوەیە، هەرکـــە دەگاتـــە سیمیپالاتینسک یەکسـەر نامەیەک بۆ ڤیرانگیـل دەنووسـێت: "ئەگـەر موقـەدەر نەبێ و هیچ ڕووداوێک نەیەتە پێشـێ،، بـەر لـە جـەژنی "کەرنـەڤاڵ" ژن دێـنم. هەڵبەتە تۆ دەزانیت کێ دێنم. هێشتا خۆشـی دەوێم. بـە خـۆی قایلـە... وەکـو بۆی نووسـیوم، وازی لە هـەواو هەوەسـەکەی ئـەم دواییانـەی هێنـاوە. خۆزگـە دەتزانی چۆن ژنێکە! بـەلام مـن تاقـە پولێکم پـێ نییـە. ئـەم کـارە، بـە هـەموو حیســابێک، بـەلای کەمـەوە شــەش ســەد ڕۆبڵــی دەوێـت و تێـدەچێت. مــن بەتەمام ئەم پارەیـە لـە ئاغـای ک "کـوڤریگین" قـەرز بکـەم. مـامم لـە مۆسـکۆ دەژی ، پیاوێکی دەوڵەمەنـدە و زۆرجـاریش یارمـەتی خانەوادەکـەی داویـن. بـە پۆســتەی ئـەمجارەدا نامەیـەکی بـۆ دەنووســم و داوای شــەش ســەد ڕۆبڵــی لێدەکــەم. ئەگــەر ئــەو بــڕە پارەیــەی بــۆ نــاردم، یەکســـەر قەرزەکــەی "ک" لێدەدەمەوە.

جا بۆ ئەوەی ئەو پڕە پارەیە مسۆگەر بکات، خوشکەکەی خـۆی دەکـات بـەگژ مامیـدا. ئـەم نامەیـەی بـۆ دەنووسـێت: "خوشـکی ئـازیزم، هاوڕێکـەم، هـیچ ئیرادێک لەم کارەم مەگرە. لەبەر خـاتری مـن کـەمێک زەحمـەت بکێشـە. جگـە لەمە هیچ چارێکی دیکەم نییە. ئەم ژنـە ئەوەیـە کـە مـن بـۆی دەگـەڕێم، کـاڵا لەقەد باڵایە. لە ڕووی خوێنەواری و ڕۆشنبیریی و پەروردەوە هاوتاین، بەباشـی لێکـدی دەگـەین... مـن تەمـەنم سـی و پێـنج سـاڵە و ئـەو بیسـت و هەشـت ساڵە. من دەزانم تۆ وەکو هەر خوشـکێکی دڵسـۆز، کـە براکـەی خـۆی خـۆش دەوێت، یەکەمین پرسـیارت ئەمەیـە کـە: "کـە چـۆن و بـەچی دەژیـم؟" چونکـە

دەرامەتی من بەشی ژیاندن و بژێوی دوو کەس ناکات... بەڵام هەر چۆنێ بێ تەگبیری حاڵی خۆم دەکەم. من پیاوێکی باش و دەوڵەمەند دەناسم کە خۆشی دەوێم و نێوانمان خۆشە. داوای قەرزی لێدەکەم و پاشان قەرزەکەی دەدەمەوە. بۆیە بەتەمام پەنا بەرمە بەر مامم، هەمو شتێکی بۆ شەرح دەکەم، هیچ شتێکی لێناشارمەوە. نامەکە بە ئەدرەسی تۆدا دەنێرم... تکایە هەر کاتێ هەستت کرد، مجێزی خۆشە نامەکەی بدەیەو هەموو شتێکی بۆ باس بکە."

لە ١٨٥٧/٢ک/٢٣دا نەقیب کوڤریگین، کارمەندی کارخانەی لوکتیڤسک، ئەو شەش سەد ڕۆبڵەی کە دوستویفسکی داوای کرد بوو، بۆ دەنێرێت.

لە ١٨٥٧/٢ک/٢٧دا، مۆڵەتێکی دوو هەفتەیی وەردەگرێت، تا زەمینە بۆ زەماوەندەکەی خۆش بکات و تەگبیری کارو باری پرۆژەی زەوجینەکەی بکات. نامەیەک بۆ میشێلی برای دەنووسێت و تکای لێدەکات هەندێ شتی زەرووری بۆ بنێرێت، وەکو: کراس، شەپقە، سەرپۆش، دەسماڵ. هەندێک دەستەسڕی کەتانی ناسک :نیو دەرزەن" ئەگەر کرا دوو کڵاوی نەوار و قەیتان شین. هەڵبەتە زۆر چاک دەیزانی کە هەردوو براکەی و هەردوو خوشکەکەی و میمکەکانی و پورەکانی تێکڕا، بەم زەماوەندە ڕازی نین، بەڵام گوێ بەمە نادات. بەر لە کاتی زەماوەندەکە خۆی پیشانی دکتۆریک دەدات و یارۆی دکتۆر دڵنیای دەکات کە ساغ و سەلامەتە و عەیب و عەلەمی نییە.

ئەنجام لە ١٨٥٧/٢/٦دا، لە کڵێسای ئەرتەدۆکسی ڕووسیادا، لە شاری کوسنیتسیک، ملازم دوستویفسکی و خاتوو ماری دیمیتریڤنا ئیساییف، لێکدی مارە دەکرێن. یەکسەر جووتە ژن و مێردی گەنج بەرەو سیمیپالاتینسک دەڕۆن و دوستویفسکی دەست بەکار دەبێتەوە. بەڵام ئەو بارگرژییە عەسەبیەی کە لەم دوا دواییانەدا، دەیگرێت، زۆر لەوانەی پێشوو توندتر دەبێت. ئەو گۆڕانە کوت و پڕەی بەسەری دێت و دەکەوێتە نێوان ئومێدەواری و نائومێدیەوە، دڵی تەنگ دەبێ، مجێزی تێکدەچێ، تووشی دەروون پەرێشییەکی ئەوتۆ دەبێت، کە بوونی نووسەر بەتەواوەتی دەهەژێنێ. کاتێ کە لە بارناڤال لادەدەن، فێی لێدێت. ماری تازە بووکی گەنج، بەچاوی خۆی ئەم حاڵەتە دەبینێ. دوستویفسکی، دەکەوێتە سەر ئەرزەکە، بەدەم ئازارەوە گینگڵ دەدات. هانکە هانکی پێدەکەوێ، وەکو شێتان بە مست بەردەبێتە هەواکە. کەفێکی زەرد لە دەم و زارییەوە دەپرژێ. لە ناکاوا گەرووی دەگیرێت. دەگاتە حاڵی خنکان، چیوای نامێنێ بە بەرچاوی ژنە گەنجەکەیەوە، چاو لە ژیان بپۆشێت و ژنەی داماو، خەریکە لە بێزا و لەترسا زیرە بکات و وشک ببێت.

چۆن دەتوانێ ئەم بوونەوەرە سەیر و غەریب و ئاڵۆزەی خۆش بوێ کە لە ناکاوا وەکو گیانەوەرێکی ترسناکی لێدێت؟ شووی یەکەم، خستیە باوەشی بابایەکی بادەنۆشی ئالودەی هەمیشە سەرخۆشەوە، کە هەمیشە بەسەری کۆت. قژی بژ، ئارەقەی لێدەچۆرا، بەلارە لار، لە کاتێکا بۆن بۆگەنی مەشرووب لە سەراپای دەهات، خۆی بەماڵدا دەکرد و بە دزییەوە، لە سوچێکدا دەڕشایەوە. شووی دووەم خستیە باوەشی پیاوێکی نەخۆشەوە

کە بە بەرچاوی ئەوەوە تل دەدات. لەسەر ئەرزەکە هەڵدەپلکێ، وەکو گیانەوەر دەزریکێنێ و وەکو شتێکی پەتەڕی و تووڕە لەم دەڕوانێ و مۆرەی لێدەکات. ئەم جارەش هەنگوینە مانگەکەی، بەم ناخۆشیە کۆتایی دێت. ئەمجارەش، کەمترین هیوای لە هەنبەر ئەم واقیعە تاڵەدا هەرەس دێنێت. بەپەلە دکتۆرێکی دێننە سەر، یارۆی دکتۆر بێهیچ پەردە پۆشیەک و ڕاستەوخۆ دەڵێت کە فێیەتی و پێویستی بە پشوو وئیسراحەتی دوورو درێژە. جووتە هاوسەر ناچار چوار دانە ڕۆژ لە بارناڤال، لە ماڵی دۆستێکی خۆش مەشرەبدا مانەوە. دۆستویفسکی بەهۆی ئەم کارەساتەوە تەواو پەرێشان بوو، دوستویفسکی، کە بەخەیاڵی خۆی ژنەکەی لە ژیانێکی دژوار و ناخۆش ڕزگار کرد بوو، نەک ڕزگاری نەکرد بوو، بەڵکو تووشی ژیانێکی سەختتری کرد بوو. ئیدی هیچ ئومێدێک نەبوو کە ژینگە و کەش و هەوایەکی عاشقانەیان لەنێواندا دروست ببێ و وەکو دوو هاوسەری بەختەوەر پێکەوە بژین. کەچی دەبوایە بەناچاری پێکەوە بژین. خۆیان فریو بدەن، یەکدی بخەڵەتێنن و وا بنوێنن کە یەکدییان خۆش دەوێ.
ماری دیمیتریفنا، کەسێکی زۆر مەغروور و بەکبریا بوو، نەیدەویست لەلای هیچ کەسێک دان بە هەڵەکەی خۆیدا بنێت لە نامەیەکیدا بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "نەک هەر مێردەکەم ، ئەو پیاوە باش و هۆشن و زیرەکە، خۆشی دەوێم و نازم دەکێشێت، بەڵکو دۆستان و کەسوکارەکەشی، زۆرم ڕێز و حورمەت دەگرن."
دوستویفسکی و ژنەکەی لە ۱۸۵۷/۲/۲۰دا بۆ سیمیپالاتینسک گەڕانەوە. دەبوا بکەونە تاقیبی ئەوەی خانوویەک پەیدا بکەن و پارەیەک پەیدا بکەن و ناو ماڵێک پێکەوە بنەن و ژیانی تازەی خۆیان ڕێک بخەن. ماری لەبەر هەوڵ و هەڵپەی خۆی و ماندوویەتی، نەخۆش دەکەوێت. جا بۆ نەگبەتی ڕادەگەیەنرێت، کە بە دەستەوەیە نمایشێکی سوپایی ساز بکرێت کە جەنەڕاڵ فەرماندەی فەوجەکە دێتە تەماشاکردنی نمایشەکە، ئیدی جم و جوڵ و قەرەباڵغی و جەنجاڵیەکی زۆر، بە بۆنەی ئامادەکردنی ڕێورەسمی نمایشەکەوە، دەکەوێتە شارەوە. بەڵام دوای ئەنجامدانی نمایشەکە، ئیدی بەرەبەرە شار ئارام بووەوە. ماری، ماڵەکەی دوستویفسکی دەڕازێنێتەوە. ئیدی ژینگە و کەش و هەوایەکی خۆشی ئەوتۆ بۆئەم پیاوە نەگبەت و کلۆڵە دروست دەکات، کە خەڵکی ئەم شارە چکۆلە بەغیلی پێدەبەن. خەڵکەکە بەجۆرێ ڕووی تێدەکەن، کە ماڵەکەی دەگۆڕێت بۆ دیوەخانێکی ئەدەبی چکۆلە و میوانەکان لەم دیوەخانەدا بە فەرەنسی قسان دەکەن.
فیدور میخائیلوفیچ، لە ئاخرو ئۆخری هەیڤی پێنجدا بەبۆنەی نەخۆشییەوە مۆڵەتێکی هەشت هەفتەیی وەردەگرێت کە لە گوندەکانی دەوروبەری سیمیپالاتینسکدا بەسەری دەبات.
لەو ماوەیەدا، پولی، کوری ژنەکەی دوستویفسکی لە تیپی پێشەنگی سوپایی نەجیمزادان وەردەگیرێت و خانەوادەکە ژیانێکی سادە دەگوزەرێنن.

موراسـیلەکەی دوسـتویفسـکی، کـە گـەنجێک بـوو بـەناوی ڤاسـیلی، وەکـو عـەرەبانچی و خـوڵام و چێشـتچی، خزمـەتیان دەکـات. ئیـدی دوسـتویفسـکی کەمێک وەخۆدێتەوە، کەمێک قەڵەو دەبێت و بیر لە هیچ شـتێک ناکاتـەوە، تـەنیا لە نووسـینی پرۆژە فیلیڤانیەکانی ئایندەی نەبێت.

**فەسڵی هەشتەم**
**نووسەری سەرباز**

لە سـاڵی یەکەمی خزمەتی سـەربازییدا لە سـیمیپالاتینسـک، ژیانی سـوپایی، دەرفەتی ئەوەی نەدەدا فریای نووسـین بکەوێ، پاشـتریش ئەشـق و خۆشـەویسـتی ماری، هەموو هۆش و گۆشـی داگیر کردبوو بەدەگمەن لای بەلای نووسـیندا دەکردەوە، خۆ ئەگەر ناو بەناو شـتێکی کەمی نووسـیبا، ئەوەشـی زۆر بە نەبەدڵی دەکرد. "هاوڕێم، من لەم سـاڵەی دواییدا، زۆر نیگەران، پەرێشـان بیر، و خەمبار بووم، لە عەزابێکی ڕوحی دەروونی ئەوتۆدا بووم کەدەسـتم نەدەچووە هیچ کارێک." هەڵبەتە جۆرە زیدەڕۆییەک بەم قسـەیەی ئەوەوە دیارە، چونکە لەو سـەرو بەندەدا، خەریکی ئامادەکردن و تۆمارکردنی کەرەسـتەو بابەت بوو بۆ ڕۆمانی یادگارییەکانی خانەی مردووان. ئەمە جگە لەوەی کە بەخۆی دەڵێت: "پێوەم ڕۆمانێکی کۆمیکی بنووسـم، بەڵام تا نها، تەنیا هەندێ بەشـی پەراگەندەم لێنوسـیوە."

دوسـتویفسـکی لە سـاڵی ١٨٥٥دا، قەسـیدەیەکی پڕ جۆش و خرۆش بە بۆنەی مردنی نیکولای یەکەمەوە دەنووسێت، هەڵبەتە نیکولای یەکەم هەمان شـاو تزار بوو کە حوکمی بێگارە زندان و دوورخسـتنەوەی بۆ ئەم بڕییەوە. قەسـیدەکە بۆ شـابانۆ ئەلکسـاندرا فیدورفنا دەنێرن:

**"هەموو شتێک بڕایەوە**
**ئەو لەژیاندا نەما**
**چەندم خۆش دەویست، ڕێزم لێدەگرت**
**من زاتی ئەوە ناکەم**
**بەم لێوە تاوانکارانەی خۆم ناوی بەرم**
**کارە نەمرەکانی گەواهی**
**دەورانی حوکڕانی ئەون.**

* * *

**لەتازیەی ئەودا**

**ڕووسیا، وەکو خاک و وڵاتێکی هەتیوو**
**فرمێسک دەڕێژێ**
**لە ترس دا وەکو پارچە سەهۆڵێک**
**جەمەدیوە.**
**بەڵام تۆ، تەنیا تۆ**
**لە هەموو کەس زیاتر**
**لە دەستت داوە.**
**لە هەموو کەس زیاتر**
**لە تۆ چوو.."**

ئیدی ئەو قەسیدەیە بەهەمان تۆن و نەفەس بەردەوام دەبێت و دەگاتە نزیکەی سەد بەیت. بێگومان قەسیدەیەکی دەستکرد و موبالەغە ئامێزە. دوای ئەمە و لەساڵی ١٨٥٦دا، قەسیدەیەکی دی بەبۆنەی تاجگوزاری ئەلکساندەری دووەمەوە دادەنێ کە ئەمە کۆپلەیەکیەتی:

**بەرەو تۆ ئەی سەرچاوەی ڕەحمەتی خودا**
**ئەی کانگای خشوعی پیرۆز**
**دوعاو نزا و سەڵاواتی میللەتی ڕووس**
**بەرز دەبێتەوە.**

دوای ماوەیەک ئاقیبەت و ئاکامی ئەم پاڕانەوە و مەراییە پەنهانەی نووسەر لەڕای ئازادیدا دەبینین.

دوستویفسکی، بەدەم چاوەڕوانی لوتفی تزارەوە، کاتی خۆی بەدەم کۆمەڵێک پرۆژەی جیاوازەوە دەقەتێنێ: وتارێک دەربارەی هونەر دەنووسێت و پێشکەش بە شازادەخانم ماری نیکولایوڤنای دەکات. کە سەرۆکی ئەکادیمیای هونەر دەبێت. دیارە خاوەنی ئەو پلە وپۆستە بەرزە دەیتوانی دەورێکی زۆر گرینگ لە هەموارکردن و کەمکردنەوەی سانسۆر ببینێ.

دوستویفسکی دەنووسێت: "دەمەوێ، مۆڵەت وەربگرم کە کارەکەم پێشکەش بە پۆستی سەرۆکایەتی بکەم و بەبێ ناوی نووسەر بڵاوی بکەمەوە." هەمان بیرۆکە بۆ بەرهەمی دواتریشی پەیڕەو دەکات، کە ئەم بەرهەمە بریتیە لە کۆمەڵە وتارێک بەناوی "نامە گوندییەکان" و ڕەخنەیەکی ئەدەبی زۆر سادە و ساکارە لە هەندێ نووسەری هاوچەرخ. ئیدی دەکەوێتە پەیجۆری و پەیگیری ئەو کتێبانەی کە لە ڕووسیادا بڵاو دەبنەوە. لە نامەیەکیدا بۆ مایکوف، دەنووسێت: "تورگینیفم لە هەمووان خۆشتر دەوێ، لێ حەیفێ کە خاوەنی ئەم بەهرە گەورەیە بەمجۆرە فەرامۆش دەکرێت. هەروەها لیڤ تولستویم زۆر خۆشدەوێ، لێ مخابن کەم دەنووسێت (لەوەشە من هەڵەبم). ژنانی نووسەر و ئەدیبی ئێمە وەکو هەموو ژنانی ئەدیب، دەنووسن، یانی بەشێوەیەکی زیرەکانە و ناسک دەنووسن. زۆر بەپەلە هەرچیەکیان لەدڵدا بێ هەڵیدەڕێژنە سەرکاغەز، سۆزی دەروونی خۆیان ناشارنەوە. تکایە ئەوەم بۆ ڕوون بکەوە بۆچی ئەدیبێکی ژن، قەت نایێت بە هونەرمەندێکی جدی؟

دوستویفسکی، بەناچاری واز لە پرۆژەی کتێبی (نامە گوندییەکان) دێنێ. چونکە سەرچاوەی پێویستی بۆ ئامادەکردنی کتێبی ناڤبری چنگ ناکەوێت. ڕۆژنامەی لەلا نییە، کتێب کەمە. لە نامەیەکدا بۆ براکەی دەنووسێت: "هەموو شتێک لە ناخمدا ڕوو لە مردنە. بیرۆکە ئەدەبییەکانم، پیشەو بەهرە ئەدەبییەکەم ڕوو لەئاوا بوونە."

کەڵکەڵەی بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی ئەدەبی دەکەوێتە سەر. بیر لە نووسینی ڕۆمانێک، دەربارەی ساڵانی ژیانی لە سیبریا دەکاتەوە. بەڵام میشێل. ئەو چیرۆکەی بیر دەخاتەوە کە دوستویفسکی هەشت ساڵ لەوە پێش لە قەڵای ئەلیکسی نووسیبووی بەناونیشانی "قارەمانی بچووک."

دوستویفسکی لەم کارەی خۆی ڕازی نەبوو. لە یەکەمین نامەیدا، کە پاش ئازادبوونی لە زیندان بۆ براکەی نووسیبوی داوای لێکرد بوو کە دەستنووسی ئەو کارە نەدات بەهیچ کەسێک. بەڵام براکەی بەگوێی ناکات، لە دەرفەتێکی لەباردا، دەستنووسی "قارەمانی بچووک" دەدات بە بەڕێوەبەری گۆڤاری "ساڵنامەی نیشتمان". هەر زوو فیدور لەم سەرپێچییەی خۆی ئاگادار دەکاتەوە و چاوەڕوانی گلەیی و گازاندەی دوستویفسکی دەکات. بەڵام دۆستۆیفسکی هەرکە گوێی لە وشەی "بڵاوبوونەوە"دەبێ، بەجۆرێ دێتە جۆش و خرۆش کە هەموو بۆچوونە ڕەخنەییەکانی خۆی فەرامۆش دەکات و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: "ئایا شتی وا دەبێت، دوای هەشت دانە ساڵ، دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخسێت کە دەقەکەی خۆم بە چاپکراوی بخوێنمەوە بگەڕێمەوە بۆ دنیای ئەدەب، ڕابردووم بە ئێستامەوە گرێ بدەم." دنیایەک پرسیار بەسەر براکەی و فرانگیل دا هەڵدەڕێژێت:

"بۆچی تا ئێستا چیرۆکی منداڵانەکەیان بۆ بڵاو نەکردوومەتەوە. ئایا سانسۆر ڕێگەی نەدەدا؟ تکایە پێم بڵێن ئایا چاپی دەکەن؟ ئایا خوێندویانەتەوە؟ بۆچی نایخوێننەوە؟ ئاگادار بە کە چارەنووسی ئەم دەقە چکۆلەیەم (چیرۆکێک بۆ منداڵ زۆر بەلاوە گرینگ و مەبەستە."

ئیدی بێزار دەبێت، سەبری دەسوێ. هەڵچوونی شادی ئامێزی نووسەرێکی تازە کوورەی لە دڵ و دەروون دەگەڕێت. جارێکی دی خولیا و خەمە ئەدەبییەکانی دەبوژێنەوە. بڵاوبوونەوەی دەقی قارەمانە چکۆلەکە، ئەو ڕێگایەی لێدەکاتەوە کە لەمێژ بوو لێی گیرا بوو. مادامێکی ئەم هەوڵە ئەدەبییەی پەسەند کرا، ئیدی لە ئێستا بەدواوە ترسی لە ئایندەی نابێت. بە جورئەتەوە دەست بە نووسین دەکات. زۆری پێیە بۆ نووسین! ئیدی گەنجینەی بیرو خەیاڵ و ئەزموونەکانی ژیانی، بەبێ نازی نامێننەوە.

ئەنجام لە مانگی ئابی ١٨٥٧دا، چیرۆکی قارەمانە چکۆلەکە لە گۆڤاری ساڵنامەی نیشتماندا، بەناوی خوازراوی: "م. ی" بڵاو دەبێتەوە.

میشیل، داوا لە فیدور میخائیلوفیچی برای دەکات، کە بەلەز ئەو ڕۆمانەی بۆ بنێرێت کە لەنامەکانی پێشوویدا، باسی کردبوو. چونکە نیازی وایە بیدات بە ڕۆژنامەیەک، کە خەریکە تازە بەنێوی "پەیڤی ڕووسی"یەوە دادەمەزرێت. ئیدی بەوپەڕی متمانەوە داوای سلفەیەکی پێنج سەد ڕۆبڵی لە بەڕێوەبەری

ڕۆژنامەکە کردووە بۆ فیدور میخائیلوفیچی برای و، بەڵێنی پێداوە کە بەر لە کۆتایی ساڵی ١٨٥٨، دەستنووسی ڕۆمانەکەی بداتێ. بەڵام فیدور میخائیلوفیچ، لەو ماوەیەدا پەیوەندی دەگەڵ یەکێک لە ئەندامانی پیلانەکەی سان پتروسبۆرگدا، بەناوی پیلیشییف دەگرێت، کە لەمەینەتی زندان و دوورخستنەوە بۆ سیبریا ڕزگار بوو بوو، ئیدی وەکو سەربازێکی سادە و بەناوی سزاوە، هەواڵەی ئوردوگای ئورانبورگ کرابوو.

پیلیشییف، لە سەرەتای ساڵی ١٨٥٦وە، ڕازی بوو بوو، کە هاوکاری دەگەڵ ڕۆژنامەی پەیکی ڕووسیادا، بە سەرنووسەریی کاتکۆڤ، بکات. ئیدی دوستویفسکی، لەسەر داوای ئەم کۆنە دۆستە، بەڵێنی نووسینی ڕۆمانێکی داو، پێنج سەد ڕۆبڵی وەکو پێشەکی، وەرگرت.

بەڵام ئەم دوو سلفەیە، واتە پێشەکیەکەی هەردوو ڕۆژنامەی پەیکی ڕووسیا و پەیڤی ڕووسیا، دۆستویفسکییان تەواو نیگەران و شپرزە کرد. چونکە دەیویست، بە ڕۆمانێک دەست پێبکات کە بەدڵی خۆی بێت، بەڵام نووسینی بەرهەمێکی لەو جۆرە، بەپەلە و لەکات و ماوەیەکی دیاری کراودا، کاریک نەبوو بە ئاسانی بێتە دەستەوە. لە نامەیەکیدا بۆ براکەی دەڵێت: "سەبارەت بە ڕۆمانەکەی من، بۆ هەردووکمان شتیکی ناخۆش هاتووەتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە کە من بڕیارم داوە و لە دڵی خۆمدا سوێندم خواردووە، کە لە ئێستا بەدواوە هیچ شتێکی ناپوختە و جەڵەبی بڵاونەکەمەوە، تا باش بیری لێنەکەمەوە و بەوردی پێیدا نەچمەوە و تەواو لێی دڵنیا نەبم، یانی ناتوانم بەڵێنی ئەوە بدەم، لە ماوەیەکی دیاریکراودا، کارێک تەواو بکەم، چونکە سلفەیەکی پێشوەختەم لە سەری وەرگرتووە. مخابن جاران ئەو جۆرە کارانەم دەکرد. ئەم ڕۆمانەی بەدەستمەوەیە، لق و پۆپ زۆری لێدەبێتەوە، بەڵام مخابن، ناچارم بەهۆی (ئەو پێشەکییەوە کە وەرمگرتووە) ناچارم زوو تەواوی بکەم و بە نێوەچڵی هەڵی کزێنم. ئەمە زۆری نیگەران کردووم، خۆیشم نازانم چ بکەم. من سێ دانە ساڵە، کەرەستەی بۆ کۆدەکەمەوە، بیری لێدەکەمەوە، لەگەڵیا دەژیم. جا وەرە بەناچاری و بەنیوەچڵی بیدەم بەدەستەوە.(کەرەستەو بابەتەکان ئەوەندە زۆرن، بە تەنیا بۆم ڕێک ناخرێن.) هەندێ بە شیم نووسیوە. گەلێک لە دیمەن و بەشەکانیم تۆمار کردووە و ڕێک خستووە. ڕەشنووسی پتر لە نیوەی ڕۆمانەکەم تەواو کردووە. بەڵام دڵنیام نیوەکەی دیکەیم، تا ئەوکاتەی کە پێویستم بە پارە دەبێت، بۆ تەواو ناکرێت. بۆیە حاڵی حازر ڕۆمانەکە و هەموو ئەو باری سەرنج و تێبینیانەی کە نووسیومن و ئەو کەرەستە و بەڵگەنامانەی کۆم کردوونەتەوە، حازر و ئامادە لە چاوی مێزەکەمدا هەڵم گرتووە.

دوستویفکی دوای ئەوەی بیرو خەیاڵی تەواوکردنی ڕۆمانەکەی لە مێشکی خۆی وەدەردەنێ، بیر لە نووسینی دوو چیرۆکی کەمبایەخ تر لە ڕۆمانەکە دەکاتەوە کە بریتین لە چیرۆکی: "خەونی هاپۆ گیان، گوندی ستیپان چیکوڤو" هەڵبەتە لەم کارەی خۆی ڕازی نییە، دەربارەی چیرۆکی "خەونی هاپوگیان" بۆ براکەی دەنووسێت: "من چیرۆکی خەونی هەپۆم بەدڵ نییە، هەڵبەتە پێم

ناخۆشـە، بـەم وەزع و ڕەوشـە خراپـەوە، بیـرو بۆچـوونی خـۆم لـە چوارچێـوەی چیرۆکێکدا پێشکەش بە جەماوەر بکەم. مەحاڵە پیاو بتوانێ لە وەزع و حـاڵێکی وا نالەباردا، ئەوەی دەیەوێ بیڵێت. ئەگەر کەسـیک بێ پارەیی ناچـاری نـەکات، هەق نییە شتی کاڵو کرچ و ناپوختـە بڵاوبکاتـەوە. مـن دەبـێ لـەپێناوی پـارەدا، چیرۆکان هەڵبکورزێنم، کە کارێکی زەحمەت و ناخۆشـە!"

چیرۆکی خەونی هاپو، چیرۆکێکی ساتیری زۆر کۆمیدییـە. بابـەتی سـەرەکی چیرۆکەکـە، زەماوەنـدی پیرەمێردێکـە بەشـێوەیەکـی ناچـاری و دەسـتکرد. لـە چیرۆکـی گونـدی سـتیپان چیکوڤـۆدا، دوستویفسـکی وێنـەی کاراکتـەرێکی ڕیسـککار دەگرێـت بـەنێوی ئوپیسـکین، کـە بابایـەکی لیبراڵـی، ئـازادیخوازی بێبەخت و یەغباڵە. ناچارە لایەنگرەکانی خۆی بەقسەی زل و قەبە و قەڵـەوی، بێناوەڕۆک و پوچ فریو بـدات. و بـە ئـاخ و ئـۆف و ناڵـەو گریـە و فرمێسـک ڕشـتن ختووکەی سۆزیان بـدات. هەنـدێ لـە ڕەخنـەگرەکان گوتویانـە کـە ئوپیسـکین، وێنەیـەکی کاریکـاتێری بیلینسـکییە، بـەڵام لـەوە دەچێـت بەڕاسـتی وابـێ. بەهەرحاڵ ئەم کابرا لەزەتخواز و بێ حەیایە، ئەم تەرتوفە بـەناو سوسـیالیسـتە ڕیاکارە، ئەم گەندەڵـە بـێ سـەروبەرە، ئـەم شـەیتانە ڕیاکـارە بـە ڕواڵـەت پـاک وبێگەردە، خۆی لە خۆیدا پێشـەکییەکە بۆ خولڵقاندنی شـەیتانە گـەورەکانی نـاو ڕۆمانی "ئەهریمەنان" کە هەموویان جۆرە خوویەکی شەیتانانەیان تێدایە.

دوستویفسکی لەسـاڵی ١٨٧٣دا، دەڵێـت: "مـن ئـەم چیرۆکـە لـە سـیبریادا، دوای ئەوەی ماوەیەکم لە زیندانی بێگارە زنداندا بەسـەر بـرد، نووسـیوە. تـەنیا بەو مەبەستەم نووسی، کە دووبارە بگەڕێمەوە بـۆ دنیـای ئـەدەبیات، هەڵبەتـە ترسـی زۆریشـم لـە سانسـۆر هـەبوو، بۆیـە بـەناچاری چیرۆکێکـی ناسـک و چکۆلەم، بەو پەڕی سادەیی، بەهەمان بێگـەردی ئاسـمانی شـین، بـە جـۆرێ نووسی کە مایەی سەرنج بێت."

خەونی هاپۆ، لەساڵی ١٨٥٩دا، لە ڕۆژنامەی پەیقی ڕووسیادا بڵاوبووەوە. بەڵام چیرۆکی گوندی ستیپان چیکوڤۆ، بەهۆی بەدحاڵی بوونێکەوە کە دەگەڵ ڕۆژنامەی پەیکی ڕووسیادا چێبوو، لە گۆڤاری ساڵنامەی نیشتمان، بڵاوبووەوە. هەڵبەتە پێتقیە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کە ئەم چیرۆکە ئەو سەرکەوتنەی بەدەست نەهێنا کە شایستەی پێگە ئەدەبییەکەی خۆی بوو. خوێنەران و ڕەخنەگران ئەم نووسەرەیان "دوستویفسکی" فەرامۆش کردبوو. ناوی لە لیستی نووسەرانی چالاک و چەلەنگ ڕەشکرابووەوە. لەوە دەچوو سەر بەقۆناغ و سەردەم و دنیایەکی دیکە بێت. ئیدی مەسەلەکە لەوە دەرچوو بوو کە پێگەیەکی کۆن و لێک داپڕاو نۆژەن بکاتەوە، بەڵکو ئەمە بوو دەبوایە سەر لە نوێ لە هەڵەوە خۆی بناسێنێ. لە سفرەوە دەست پێبکاتەوە. دەبوایە بەوپەڕی سەبر و پشوو درێژی، بەو پەڕی زەحمەتەوە، خوینەران و هەوادارانی خۆی یەک بەیەک ئاشت بکاتەوە. دۆستایەتی، ئەو دۆست و برادەرانە بەدەست بێنێتەوە، کە لێی تۆرا بوون.

وێڕای ئەو هەموو قەرزەی بەسەرییەوە بوو، سەرباری ئەو داوایانەی لێی دەکرا و پەیوەندییان بە چارەنووسییەوە هەبوو، زۆر پیاوانە و جوامێرانە، بە ورەیەکی زۆر بەرزەوە دەستی بە خەبات کردەوە.
دەبوایە پێش هەموو شتێک خۆی لە تاراوگە و خزمەتی ئیجباری عەسکەری ڕزگار بکات. قۆناغەکانی ئەم ڕێڕەوە بەرەو ئازادی، هەرچەندە دیار و قابیلی پێشبینی نەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی ئاسایی و سەیر تەی کراو بڕایەوە.
دوستویفسکی، لەسەرەتای ساڵی ١٨٥٥دا، قەسیدەیەکی نووسی، هەمان ئەو قەسیدەیەی کە پێشتریش ئاماژەمان کردێ. ئەم قەسیدەیەی پێشکەش بە شابانۆی ڕووسیا کرد. جەنەڕاڵ گاستفورد بەمە دەزانێت و، داوا دەکات کە لەبری ئەوە پلەی دوستویفسکی بەرز بکرێتەوە، پلەی ملازمی بدرێتێ، هەڵبەتە لەگەڵ ئەم ڕوونکردنەوەیەدا: "وەکو هاندانێک بۆ ئەو ڕەفتارە شایستەیەی کە نواندوویەتی. وەکو ڕێزێک بۆ ئەو پەشیمانیە ڕاستەقینەیەی کە سەبارەت بە هەڵە گەورەکانی سەردەمی لاوی خۆی، دەربڕیوە."
لە مانگی نۆڤەمبری ١٨٥٥دا، دۆستویفسکی پلەی ملازمی پێ درا.
فیدور میخائیلوفیچ، لەساڵی ١٨٥٦دا قەسیدەیەکی دیکەی نووسی، ئەمجارەیان لەمەدح و ستایشی تزار ئەلکساندەری دووەمدا بوو. ئیدی قەسیدەکەی دایە دەست جەنەڕاڵ گاستفور، کە دەچوو بۆ ڕێوڕەسم و ئاهەنگی تاجگوزاری. هەروەها کۆپیەکی هەمان قەسیدەی بۆ بارۆن ڤیرانگیل نارد و تکای لێکرد کە لەڕێگای خۆیەوە بیگەیەنێتە خاوەنشکۆ گاستفور، قسەیدە و داخوازییەکەی دۆستویفسکی دەدات بە جەنەڕاڵ سوخوزانیت و، سوخوزانیت ئەمر دەکات کە بەرواری وەرگرتنەکەی لای خۆی تۆمار بکات و پێی بڵێ چاوەڕوان بکات. بەڵام دۆستویفسکی بێئەوەی چاوەڕوان بکات، لە مانگی ئازاری ساڵی ١٨٥٦دا پەنا وەبەر جەنەڕاڵ توتلوبینی فەرماندەی فیرقەی ئەندازە دەبات. برایانی توتلوبین، کاتی خۆی لە قوتابخانەی ئەندازیاراندا، دۆست و هاودەورەی بوون. بەڵام توتلوبین، بەدرێژا شۆرەت و ناوبانگێکی پەیدا کرد بوو. ئەم قوتابییەی جارانی قوتابخانەی ئەندازیاران، لە گەمارۆی سباستوپولدا، عەگیدی و دلاوەییەکی شایستەی نواند بوو و سەرنجی تزاری ڕاکێشا بوو و نازناوی کۆنتی پێبەخشی بوو.
دوستویفسکی، نامەیەک بۆ ڤرانگیلی دۆستی دەنووسێت و دەڵێت: "من جاران ئەم پیاوەم زۆر باش دەناسی. براکەی هاوڕێی منداڵیەتیم بوو. چەند ڕۆژێک بەر لە گرتنەکەم، تووشی بووم، چاک و خۆشی و تەوقەیەکی گەرم و گوڕمان کرد، باوەڕ ناکەم منی لە بیر کردبێت!"
ئیدی نامەیەکی دورو درێژ، بەشێوازێکی زۆر نەرم و پڕ موجامەلەو خاکەساری بۆ توتلوبین دەنووسێت: "دەترسم، کاتێ کە چاوت بە نێو و ئیمزاکەم بکەوێت، نەمناسیتەوە، هەرچەندە کاتی خۆی (دەمێکە) شانازی دۆستایەتی تۆم پێ بڕابوو. هەروەها دەترسم هەرکە نامەکەی منت پێبگات، بەر لەوەی بیخوێنیتەوە تووری بدەیت و لەم پڕکێشیەی من، تووڕە ببیت کە مدارای ئەم فاسیلە زۆرەی نێوان خۆمانم، تۆ و من نەکردووە. من لەژیانمدا زۆر

ئەزموونی تاڵم دیتووە، هەمیشەش بە هۆی ئەمەوە بووە کە ئەم فاسیلانەم ڕەچاو نەکردووە؟ ئیدی درێژە بە گێڕانەوەی سەربهووردی گرتنکەی خۆی، درێژە بە نامەکەی دەدات و دەربارەی ناردنی بۆ تاراوگەی بێگارە زندان، دەڵێت: "من دەزانم، لەسەر بیرو بۆچوون و باوەڕەکانم دەستگیر کرام. بەڵام بیرو باوەڕان دەگۆڕێن، بەشەر بەخۆیشی بەدەم تێپەڕبوونی ڕۆژگارەوە دەگۆڕێت. جا ئێستا بۆچی لەبەر خاتری شتێک کە تەواو بووە و پراوەتەوە، عەزاب بکێشم. لە پێناوی شتێکدا کە زەرەیەک باوەڕم پێی نەماوە، لە ڕای کۆمەڵێک هەڵەی ڕابردوودا، لەسەر بیرو باوەڕێک، کە پوچی و ناپایەدارییم بە تەواوەتی بۆ ساغ بووتەوە، عەزاب و ئازار بکێشم؟... جا بەش بەحاڵی خۆم حەزدەکەم کەسێکی بەسوود بم. چەند ناخۆشە پیاو توانایەکی باشی ڕوحی و دەروونی هەبێ، سەری بەسەر شانو ملیا خواربێتەوەو لە بێکاریدا نەزانێ چ بکات. هەموو هۆش و گۆشم لای ئەمەیە کە لە عەسکەری ڕزگار بم و کارێکی مەدەنی بگرمە ئەستۆ، ئیدی گرینگ نییە ئەو کارە لە هەر شوێنێک بێت. لە هەر شوێنێکی ڕووسیادا بێ، تەنانەت ئامادەم لێرەش بم. تەنیا ئەوەندەم دەوێ کە مافی چاپکردنی بەرهەمەکانم هەبێت. دڵنیام دەتوانم لەم ڕێگایەوە، خزمەتێک بکەم. من دەزانم کە بەم نامەیە، لە ڕووی قانوونیەوە، هەڵەیەکی تازەم کردووە، بەڵام تۆ کەسێکی لێبوردە و میهرەبانیت، دڵنیام بە میهرەبانی خۆتم دەبەخشیت." بەڵام توتلوبین، زۆر لە میهرەبان زیاتر بوو، زۆر بەپەلە، توانی بەڵێن لە گراندۆک نیکولا وەربگرێت کە بەخۆی (واتە گراندوک نیکولا) لەلای وەزیری بەرگری، بۆ دوستویفسکی تێبکەوێت.

ئەوە بوو لە ١٨٥٦/١٠/٢٠دا، دۆستویفسکی بەرز کرایەوە بۆ پلەی ملازمی دووەم. دوای شەش مانگ، سەرلەنوێ مافی نەجیمزادەیی بۆ گێڕدرایەوە. لەو بارەیەوە دەڵێت: "بە فەرمانی تزار (پاشای ڕووس) دووبارە مافی نەجیمزادەیی خۆم بەدەست هێنایەوە. ئەمەش مانای وایە لە هەموو خەتایەکانم بەخشراوم."

ئەنجام لە ١٨٥٨/٢ک/١٦دا، دوستویفسکی داوا دەکات کە بەهۆی نەخۆشییەوە خانەنشین بکرێت. مامەڵەی خانەنشینیەکەی یەک ساڵی تەواو دەخایەنێت. لە١٨٥٩:٣:١٨ دا، بە فەرمانی تزار ڕێگە دەدرێ لە خزمەتی سوپا دەربچێت و بگەڕێتەوە بۆ ڕووسیا. بەڵام نابێ لە سان پتروسبۆرگ یا موسکۆ ئاکنجی و نیشتەجێ ببێ. شاری چکۆڵەی تفیر بۆ ئاکنجی بوونی دیاری دەکرێت و لەژێر چاودێریدا دەبێت. بەگوێرەی نووسراوێکی ١٨٥٩/٥/٧، داوا لە فەرماندەی ئەم شارە دەکرێت، کە بە نهێنی و ژێراو ژێر چاودێری هەڵس و کەوت و جم و جووڵ و ڕەفتاری ئەم کۆنە زندانییە بکەن.

ئەم هەواڵە تازەو گرینگە بەچوار مانگان، دوای ئەوەی تزار ئیمزای دەکات، ئەوجا بە فەرمی بە دوستویفسکی ڕادەگەیەنرێت. بەدەم چاوەڕوانیەوە بێزار و بێتاقەت دەبێت. جۆرەها پرۆژەی لە مێشکدایە. تیا دەمێنێ، چیرۆکەکانی لە یەک دوو بەرگدا کۆبکاتەوە، یا ڕۆمانێکی گەورە بنووسێت. نامەیەک بۆ براکەی دەنووسێت: "تۆ هەمیشە ئەوەم بەگوێدا دەدەیتەوە کە بۆ نموونە گونچاروف،

بۆ فلان کتێبی خۆی حەوت هەزار ڕۆبڵی وەرگرتووە. یا تورگینیف بۆ ڕۆمانی: "خانەدانان" (لەو دواییانەدا خوێندمەوە، ڕۆمانێکی زۆر باشە) چوار هەزار ڕۆبڵی لە کاتکوف وەرگرتووە. یانی بۆ هەر لاپەڕەیەکی چوارسەد ڕۆبڵی وەرگرتووە، کەچی من بۆ هەر لاپەڕەیەک داوای سەد ڕۆبڵی لێدەکەم. هاوڕێم، من چاک دەزانم، کە لە ئاستی نووسینی تورگینیفدا نیم، بەڵام زۆر لەو خراتر نیم. هیوادارم ڕۆژێک بێ بتوانم بگەمە ئاستی نووسینی ئەو. کەواتە بۆچی دەبێ من، وێڕای بێ پارەییش، تەنیا بەسەد ڕۆبڵ قاییل ببم. لەکاتێکا تورکینیف، وێڕای ئەوەی مولکدارەو دوو هەزار ڕەعیەتی هەیە، چوار سەد ڕۆبڵ وەربگرێت. من هەژاری ناچارم دەکات کە لەپێناوی پارەدا بنووسم، بەپەلە بنووسم و، دیارە ئەمە کارێکی نەرێنی لەقەرەبوو نەهاتگ لە بەرهەمەکانم دەکات."

لەم سەروبەندەدا، لە هەموو کاتێک پتر پێویستی بە پارە بوو. نەیدەزانی چۆن ئەم پارەیە بەدەست بێنێ. مەسرەفی ئەم سەفەر و بارکردنەی یەجگار زۆر بوو، ئەدی کە گەیینە تفیر، لەوێندەر چۆن تەگبیری حاڵ و ژیانی خۆ بکەن. داوای سلفەیەک لە کوچلوفی وەشانکار دەکات. ئەم وەشانکارە هەزار ڕۆبڵی بۆ دەنێرێت، کە دۆستویفسکی گوتەنی "وەکو مۆم دەتوێتەوە." یانی پاش ئەوەی هەموو قەرزەکانی لەوێندەر دەداتەوە، بەزەحمەت ئەوەندەی پێ دەمێنێ، کە بیگەیەنێتە قازان. تکا لە میشێل دەکات کە دوو سەد ڕۆبڵی بە حەواڵە بۆ ئەم شارە بۆ بنێرێت، دەڵێت: ئەمجارەش فریام بکەوە و ڕزگارم بکە!"

سەرەنجام لە ٣٠/حوزەیران دا، بلیتی ژمارە (٢٠٣٠) بەدەست دێنێ و دەتوانێت سیمیپالاتینسک بەجێ بێڵێت. لە ١/تەموزدا، نامەیەک بۆ میشێلی برای دەنووسێت: "من سبەینێ، سەعات پێنجی بەیانی دەکەومەڕێ." خواحافیزی لە هاوڕێکانی دەکات. هەندیک وێنە و کتێبان، قاپ و ئامان و کورسی، مێزێکی چکۆلە، جلە فەرمیەکانی، شمشێرەکەی و کەتافیە و نەجمەکانی دەدات بە کۆنە فەرماندەکەی. بەو جۆرە باری خۆی سووک دەکات و لە ٢/تەمووزی/١٨٥٩دا شاری سیمیپالاتینسک، کە پێنج دانە ساڵی تیادا بەسەر بردبوو، بارسووک و سەر سەلامەت بەجێدێڵێت.

سەفەرێکی دوور و درێژ و پڕ زەحمەت دەکات. خانەوادەی دوستویفسکی بەدەم سەفەرەکەیانەوە لە شاری ئومسک لادەدەن، تاکو کوڕەکەی ماری، کە لەوێ لە قوتابخانەی سوپایی تیپی پێشەنگی نەجیمزادانی شەوانە ڕۆژانە دەیخوێند، لەگەڵ خۆدا ببەن. سێ چوار ڕۆژێک لەم شارەدا دەبەنە سەر.

دوستویفسکی، ئەم لادانە بە هەلدەزانێ، تا سەردانی ئەو دۆستانەی بکات، کە لەکاتی زندانی بوونیا لەم شارە، یارمەتیان دابوو. بگرە سەردانی زندانەکەشی کرد. بۆ چەند سائێک لەبەردەم دەرگا گەورە و داخراوەکەی زندانەکە دەوەستێت و بەقووڵی دەبیرەوە دەچێت و لە فکران ڕادەچێت. سەرەنجام، دوای ئەوەی بەدەم ڕێوە، دوو ڕۆژی دی لە شاری تیومن لادەدەن. دەگەنە لێرەوارەکانی ئۆراڵ. ڕێگا زۆر خراپە، دنیا زۆر گەرمە. ئەسپەکان بەزەحمەت ڕێدەکەن، مێشی دنیا، وەکو پەڵە هەور، دەوری داون. جیڕە جیڕی

عەرەبانەکە سەعاتە ڕێیەک دەڕوات. لە ناکاوا، لە پێچێکدا، دۆستویفسکی چاوی بە عامودێکی دارین دەکەوێت کە نیشانەی هەڵۆیەکی دوو سەری بەسەرەوەیە. ئەمە نیشانەی سنووری ئاسیایی – ئەوروپایی ڕووسیایە. عەرەبانچیەکە ئەسپەکانی ڕادەگرێت، ڕێبوارەکان لە عەرەبانەکە دادەبەزن.

بەڕاستی ساتێکی پڕ شکۆیە. ئەم هێڵە بۆ دۆستویفسکی مانایەکی تایبەتی هەیە. دە ساڵ لەوەپێش بەهەمان هێڵدا تێپەڕی بوو و بۆ تاراوگە و بێگارە زندان ڕۆیی بوو. کەچی ئەوەتا وا جارێکی دی خۆی لە هەنبەر هەمان هێڵدا بینییەوە. ئەوسا کە بەم هێڵەدا تێپەڕی بوو، پێ بەکۆت و زنجیر، نەخۆش و دەغەزار بەرەو زندان و تاراوگە دەڕۆیی. بە درێژایی ماوەی زیندانەکەی، بەو ئومێدە ژیا بوو، کە جارێکی دی بە ئازادی پێ بنێتە خاکی ڕووسیا و هەنووکە ئەو ئاوات و ئومێدەی هاتبووە دی. فیدور میخائیلوفیچ، شەپقەکەی دادەکەنێ، نیشانەی خاج دەکێشێت، بەسادەیی دەڵێت: "سەرەنجام خودا، تەمەنی دام، کە جارێکی دی ئەم خاکە بدینمەوە."

لە نزیکی عامورودەکەوە، کوختەیەکی بچووکی پاسەوانێکی سنوور هەبوو، کە کابرایەکی نەخۆش بوو. دوستویفسکی بانگی دەکات. لەنێو پریاسکە و بوخچەکانی خۆیەوە قاپێک مەشرووب دێنێتە دەرێ. هەنگێ ئەوانەی کە لە دنیایەکەوە بۆ دنیایەکی دی دەڕۆن، دەگەڵ ئەو کەسەدا کە لەو خاڵە مەرزییە جێگیرە دەمایەوە، پیاڵە پێکدا دەدەن.

هەنگێ دۆستویفسکی دەگەڵ ژنەکەی و کوڕی ژنەکەیدا، دەچن بۆ نێو لێرەوارەکە و دەکەونە توتڕک چنینەوە.

## فەسڵی نۆیەم

### تفیر.

کاتێ خانەوادەی دوستویفسکی دەگەنە قازان تەنیا سەدو بیست ڕۆبڵیان پێ دەبێت. ئەو دووسەد ڕۆبڵەی کە میشێل بەڵێنی دابوو بۆیان بنێرێت، هێشتا نەگەیی بووە دەستیان. دوستویفسکی دوای دە دانە ڕۆژ ئەوجا لە دەلاقەی پۆستەخانەکەوە وەری گرت. ماڵباتی دوستویفسکی کە لە ١٨٥٩/٧/٢دا لە سیمیپالاتینسکەوە بەڕێکەوتبوون لە نۆزدەی ئابی/١٨٥٩دا

گەیینە تڤیر. دۆستویفسکی ئەم شارەی پێ خۆش نەبوو، ئەو شوێنە نەبوو کە ئەو خەوی پێوە دەبینی. شارێکی خەمناک، تەنگ و تار، ناشیرین و ناحەز، هێندە پاشکەوتوو بوو لە گوند دەچوو. دوستویفسکی لەنامەیەکیدا بۆ ڤرانگیل دەنووسێت: "بەڕاستی ئێرە شوێنێکی ناخۆشە، دڵم دەگوشرێت، یانی لە "سیمیپالاتینسک"ش ناخۆشترە، کەش و هەواکەی سارد و ناخۆش، سەرو دڵی پیاو دەگرێت. بیناکانی هەمووی لەبەردە، کەمترین جوڵە و چالاکی تیا بەدی ناکرێت، تەنانەت کتێبخانەیەکیشی تیا نییە. زندانێکە بۆ خۆی." لەهەمان بینادا، کە کاتی خۆی پوشکین لەم شارەدا، تیایدا ئاکنجی بوو بوو، شوقەیەکی مۆبێلەدار بەکرێ دەگرن. میشێلی برا گەورەی دێتە دیدەنیان و چەند ڕۆژێک لێرە پێکەوە دەبەنە سەر، ئیدی دۆستویفسکی کەمێک دبوژێتەوە و هیوا و ئومێدێک پەیدا دەکاتەوە، بەڵام دوای گەڕانەوەی میشێل، دیسانەوە خەم و پەژارە و بێزاری و ڕەشبینی دایدەگرێتەوە. بۆی دەنوسێت: "ڕۆیشتیتەوە، بەڵام وەکو پێویست لە دیداری یەکدی تێر نەبووین، گرێی دڵمان بۆ یەکدی نەکردەوە، دەردە دڵمان نەکرد، وەکو پێویست حاڵ و ئەحواڵی یەکمان نەزانی..."

تەنیایە، هەست بە بێزاری دەکات. هەست دەکات وەختێکی گرانبەها لەدەست دەدات. فەرمانڕەوای شار، کۆنت بارانوف، دەعوەتی دەکات بۆ ماڵەوە. هاوسەرەکەی بارانوف، دۆتمامی میر سولوگوپە. دۆستویفسکی، پێشتر لە ساڵۆن و دیوەخانە ئەدەبییەکانی سان پتروسبورگدا بینی بووی و ئاشنایەتی دەگەڵ پەیدا کرد بوو. ئەم بیرەوەرییە کۆنە هێندەی دی دوستویفسکی دەهاڕوژێنێ. وای لێدێت ئۆقرەی لێدەبڕێت، لە هیچ شوێنێک ناحەوێتەوە. خەریکە باڵ بۆ سان پتروسبورگ بگرێت، هەستدەکات شوێنی ئەو سان پتروسبۆرگە نەک ئێرە. ئەو نامە زۆرانەی بۆ ڤرانگیلی دەنێرێت، هەر هەمووی بە دەوری ئەو خەم و خولیایەدا دەسورێنەوە. ڕوو لە کێ بنێ کە فریای بکەوێ و لەم تەنگانەیەی ڕزگار بکات: پەنا وەبەر میر دولگوروکی یا کۆنت توتلوبین، یا کۆنت بارانۆف یا تیماچۆف بەرێت کە مۆڵەتی لە تزار بۆ وەربگرن تا لە سان پتروسبۆرگ، لە پایتەخت ئاکنجی ببێت؟

ڤیرانگیل لە مانگی ئەیلولی هەمان ساڵدا، دێتە دیداری دۆستویفسکی بەڵام، زۆر بەداخە کە ناتوانێ هیچ کارێکی جدی بۆ بکات. کۆنت بارانوف، لە مانگی ئەیلولدا، بە دوستویفسکی دەڵێت کە داوایەک بۆ تزار بنووسێت و بەڵێنی دەداتێ کە بەخۆی لە ڕێگای کۆنت "ئەدلیربێرک" ەوە داوانامەکە بگەیەنێتە خزمەتی تزار. دۆستویفسکی دوای ماوەیەک دو دڵی. دوو عەرز و حاڵ دەنووسێت، یەکێکیان بۆ توتلوبین و ئەویتریان بۆ ئەلکساندەری دووەم. لە بەرواری ١٠/٤دا نامەیەک بۆ توتلوبین دەنووسێت و دەڵێت: "یەک مانگ و نیوە لێرەم و نازانم ئەم کێشانەم تا کەی بەردەوام دەبن و کەی لە کۆڵم دەبنەوە. ئەوەی ڕاستی بێ وام لێهاتووە مەحاڵە بتوانم لە دووری سان پتروسبۆرگ بژیم و هەڵبکەم. بەخۆت دەزانی من تووشی فێداری بووم و دەبێ ئاگام لە حاڵی خۆم بێت و لە دکتۆر و نەخۆشخانانەوە نزیک بم. کوڕیکی ژنەکەشم

لەگەڵە، دەبێ بەخێوی بکەم و پەروەردە و فێرکردنی لەسەر منە، دەبێ ژیان و پێویستیەکانی ژنەکەم دابین بکەم... ئەمجارەش فریام بکەوە و ڕزگارم بکە. تکایە قسە لەگەڵ میر دولگوروف دا بکە، ڕەنگە بتوانێ شتێکم بۆ بکات، هەموو هیواو ئومێدێکم بەتۆیە."

کۆنت بارانوف، لە ١٠/١٩دا، عەرز و حاڵەکەی دۆستویفسکی نارد بۆ سکرتاریەتی تزار:

"خاوەنشکۆ. چارەنووسی من تەنیا لە دەستی تۆدایە. سەلامەتی من، ژیانی من، بەندە بە خاوەنشکۆتانەوە، تکایە مۆڵەتم بدەن بۆ سان پتروسبۆرگ بگەڕێمەوە، تا بتوانم لەوێ خۆم پیشانی پزیشکان بدەم. تکایە ئازادم بکەن، ڕێگای گەڕانەوەم بدەن، تا سەلامەتی خۆ بەدەست بێنمەوەو بتوانم خزمەتی خێزانەکەم بکەم. تا بتوانم بەگوێرەی توانای خۆم بەهەر شێوەیەک بووە خزمەتی وڵاتەکەم بکەم..." "خاوەن شکۆی، پڕ سۆز و بە بەزەیی، تکایە ئاوڕێکی بەخێر لەم داوای دووەمەم بدەنەوە، بێزەحمەت فەرمان بفەرموون کە زڕکوڕەکەم، پول ئیساییف، کە تەمەنی دوازدە ساڵانە، لەسەر حیسابی دەوڵەت بە خەرجی دەوڵەت، لە قوتابخانەیەکی ناوەندی سان پتروسبۆرگدا، وەربگیرێت. بەمە دایکی خۆشحاڵ دەکەیت، ئەو دایکەی کە هەموو ڕۆژێک، کوڕەکەی فێر دەکات کە دوعای خێر بۆ خاوەنشکۆ تزار و خانەوادە بەرێز و حورمەتەکەی بکات. خاوەنشکۆ، تۆ وەکو هەتاو وایت، بەسەر چاکان و خراپاندا هەڵدێی. تۆ کە تا ئێستا ملیۆنانت لە پەیڕەوان و ڕەعیەتی خۆت خۆشبەخت کردووە، ئێستاش، وەکو ڕەحمەتی خوایی ئاوڕێکی بەخێر لە منداڵێکی سێوی بێنەوا، لەدایکی و لە نەخۆشێکی بەلەنگازی وەکو من بدەوە کە هێشتا ماوەی ڕەهەنەییەکەی خۆی تەواو نەکردووە و هەموو کاتێک ئامادەیە ژیانی خۆی لەپێناوی بەختەوەری تزار و میللەتدا بەخت بکات. ئەو پەڕی ڕێز و حورمەتم بۆ ئێوە هەیە، ئامادەی هەموو فیداکارییەکم لەپێناوی ئێوەدا هەیە. وەفادارترین و منەتبارترین بەندەی تزارم. ف. م. دوستویفسکی."

ئەم نامەیە، کە ڕەنگە لە نۆرینی کەسێکی ڕۆژئاواییەوە، مۆرکێکی ملکەچانە و کۆیلانەی لە خۆگرتبێ نیشانە و ڕەنگدانەوەی باوەڕ و هەستی ئاسایی دوستویفسکییە سەبارەت بە تزار. لە هەنبەر تزاردا وەکو چۆن منداڵێکی بەدبەخت سکاڵا بۆ بابی دەبات، بەو ئاوایە لەتزار دەپاڕێتەوە هەر تاکێکی ڕووس بگریت، لەم حاڵەتە تێدەگات. کاتێ لە مانگی ئایاری/١٨٤٩دا باکۆنینی شۆڕشگێر دەستگیر کراو لە قەڵای پیروپل زندانی کرا، ئیمپراتۆر نیکولای دووەم کۆنت ئورلوفی بەم پەیامەوە بۆ لای نارد: "تزار منی بۆ لای تۆ ناردووە ئەم فەرمانەی پێکردووم کە: "پێی بڵێ وەکو چۆن کورێک نامەیەک بۆ بابی ڕوحانی خۆی دەنووسێت، نامەیەکی ئاوام بۆ بنووسێت." و باکونین، ئەم نەهلیستە پیشەییە (نەهلیست کەسێکە کە هەموو شتێک ڕەفز دەکات. نەهلیستان کەسانێک بوون کە داب و نەریت و خوو خدە کۆمەڵایەتیەکانیان ڕەفز دەکردەوە. ئەم وشەیە یەکەمجار بەم مانایە لە ڕۆمانی باوکان و کورانی تورگینیفدا، بەکار براوە و سیفەتی بازاروفی قارەمانی ئەم ڕۆمانەیە) کە

هەموو داب و نەریتێکی ڕەت دەکردەوە، لایەنگری یاخیبوون و ئاشوبی جیهانی بوو، مل بۆ ویستەکەی شا دەدات و ئیعتراف نامەیەک بەم نێوەڕۆکە پڕ دەکاتەوە: "بەڵێ، گەورەم من لەبەردەم تۆدا ئیعتراف دەکەم، وەکو چۆن خەڵکی لە بەردەم باوکێکی ڕوحانیدا ئیعتراف دەکەن و چاوەڕوانی بەرەکەتی دوعای خێر و عەفوی ئەو نەک هەر لەم دنیادا، بەڵکو لەو دنیاش دەکەن. لەخودا دەپارێمەوە، کە ئیلهامی وشەێن سادە و ڕوون و ڕەوانم پێببەخشێت، وشەێن ڕاستگۆ و دور لە هەر ڕووبینیەک، وشەگەلێک شایستەی ئەوە بن، بگەنە دڵی خاوەنشکۆتان."

بەو جۆرە هیچ جۆرە شەرم و شەرمەزارییەک لەنێوان تزار و ڕەعیەتەکانیدا نەبووە. میر دولگوروکی، بەخەتی خۆی لە پەراوێزی عەرزو حاڵەکەی دوستویفسکیدا، ئەم ڕستەیە دەنووسێت: "تزار، سەبارەت بە پول ئیسایيف دەستوری داوە، کە بە لایەنانی پەیوەندیدار بسپێردرێت، سەبارەت بە دوستویفسکیش داواکەی قەبووڵ کراوە."

لە بەرواری ٢٥/ت١٨٥٩/٢دا، فەرمانداری تڤیر، بە فەرمی لە بڕیارەکەی تزار، ئاگادار دەکرێتەوە. چەند درەنگ!.. چاوەڕوانی لەبەر دەرگای بەهەشتدا، ناخۆشترە لەوەی پیاو لە ناوجەرگەی دۆزەخدا بژی. دوستویفسکی نامەیەک بۆ ڤیرانگیل دەنووسێت: "دوایی باسی ڕابردوو دەکەین، باسی ئەو ڕۆژانەی کە ژیانێکی خۆشمان هەبوو، باسی سەردەمی سیبیریا دەکەین، کە ئێستا زۆر لام شیرین بووە." هەڵبەتە بۆ تەحەمولی ئەم ڕەنجی دووریە، یا بە گوتەیەکی دی تەحەمولی تاسەی گەیشتن بە شادی، پێویست بوو کە هاوسەرەکەی مدارای بکات، هاوبەشی خۆشی بکات. بەڵام ماری نەخۆش بوو، ئەم نەخۆشییە، مجێزی تەواو تێکدا بوو، زوو توورە دەبوو، بیانووی دەگرت. غیرەی دەکرد. هەرگیز دۆستویفسکی خۆش نەدەویست. لەژێر باندۆر و کاریگەریی سۆز و گودازێکی ڕۆمانسیانەدا شووی پێکرد بوو. هەرگیز دۆستویفسکی نەدەبەخشی، چونکە بە کۆمەڵێک حیساباتی درۆینە فریوی دابوو. هەژارە، ناشیرینە، لەڕو لاوازە، لە لێبۆک دەچێت. تەنانەت دڵپاکیەکەشی ئاسایی نییە و تەحەمول ناکرێت. سەیر ئەوەیە کاتێ کە خەڵکانێکی دیار و خانەدان، ڕوویان دەدایە دۆستویفسکی، دەعوەتیان بۆ دەکرد، ڕێزیان دەگرت و ستایش و مدارایان دەکرد، ماری پێی ناخۆش بوو.

بەینی ئەم ژن و مێردە زۆر ناخۆش بوو، هەمیشە لە قەرقەشەو دەمەقاڵێدا بوون، قسەی ناشیرین و بازاڕیان بەیەکدی دەگوت. ئیمی دوستویفسکی دەڵێت گوایە بابی ئەو ڕازەی لای ئەو درکاندووە کە ماری دوای شووکردنی خیانەتی لە دۆستویفسکی کردووە و، پەیوەندی ئاشقێنی دەگەڵ ڤیرگونوفی فێرکاردا هەبووە. هەڵبەتە ئەم قسەیە ڕێی تێدەچێت، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نییە کە بیسەلمێنێت.

دوستویفسکی، سەبارەت بە ژیانی خێزانداری خۆی یەکجار بێدەنگ و ڕازدارە. لە نامەیەکیدا بۆ ڤیرانگیل (٩/٢٢) دەڵێت: "سەبارەت بە خۆم چ بڵێم؟ من مەسئولیەتی خانەوادەیەکم لە ئەستۆ گرتووە، هێشتا هەر بە ملمەوەیە."

هەروەها لە نامەیەکی دیدا، کە لەساڵی ١٨٦٥دا نووسراوە، کە پاشان دێینە سەری، دەڵێت: "ئێمە پێکەوە بەختەوەر نەبووین."
هەروەها کاری نووسین، ئەو سوکنایییەی بەدڵ و دەروونی نەدەبەخشی کە بەتەمای بوو: "بەهۆی هاتو چۆ و میوان و میواندارییەوە، هیچ کارێکم پێناکرێت." قەیرانی بورانەوە و فێ لێهاتنەکەی بەرە بەرە زیاد دەکات، مایەسیریەکەی ئەزیەتی دەدات. وێرای ئەمەش زۆر بەجدی هەڵەچنی تایپی یەکەمی چیرۆکی گوندی ستیپان چیکوفو دەکات، بە یادگارییەکانی خانەی مردوواندا دەچێتەوە. هەروەها لێدەپرێت، بەهەموو ئەو بەرهەمانەیدا بچێتەوە کە لەگەنجیدا نووسیبوونی، تا ئامادەیان بکات و چاپی تازەیان بکاتەوە. "ئەنجام دەبینن کە چیرۆکی هاوشێوە (دوبل) چیە. ئەگەر ئێستا دەستکاری و هەڵچنی نەکەم، ئەدی کەی بیکەم؟ بۆچی ئەم بیرۆکە بەرز و نایابە، ئەم کەسایەتیە کە لەڕووی جڤاکییەوە کاراکتەرێکی هەڵبژاردەیە و یەکەمجار من کەشفم کردووە و بە خەڵکم ناساندووە، لە کیس خۆ بدەم؟" "بەڵام سەبارەت بە یادگارییەکانی خانەی مردووان، دڵنیام خەڵکی کاتێ، کاتێ وتارەکەی من لە لاپەڕەکانی هەوەڵی ڕۆژنامەدا بخوێننەوە، هەنگێ پەی بە گرینگی و بایەخی بابەتەکە دەبەن. وا تەسەور نەکەیت، فشە دەکەم یا خۆ هەڵدەکێشم. من خۆم گرینگی و بایەخ و باندۆرو کاریگەریی بابەتەکەی خۆم دەزانم و دەمەوێ هەقی خۆم وەربگرم".
ئەو قسەیەی کە خودی نووسەر، لە وتارەکەیدا دەربارەی یادگارییەکانی خانەی مردووان، دەیکات، ئەوە بەدیار دەخات کە ئەم ڕۆمانە لە سەرەتاوە، وەکو بابەتێکی چکۆلە لەلایەن نووسەرەوە تەمەشا کراوە، ئیدی بەدەم نووسین و کارکردنەوە، نەشونمای کردووە و پەرەی سەندووە و بووە بەم ڕۆمانە گەورەییەی ئێستا. لەو بارەیەوە دەنوسێت: "من لە پازدەی ئۆکتۆبەر بەدواوە، دەست بە نووسینی یادگارییەکانی خانەی مردووان دەکەم. چاوانم دێشن. هەرگیز ناتوانم لە بەر ڕوناکی مۆمدا کار بکەم."
میشێل کە پیاوێکی ئاقڵ بوو، لە ساڵی ١٨٥٠دا، کارگەیەکی جگەرەسازی دادەمەزرێنێ، ئەم جگەرانەی لە پاکەتی جوان دەناو هەر جارەی بەشێوەیەک دەیخستە بازاڕەوە و دیاری بەگەڵ دەخستن، لە هەوەڵەوە بازاڕێکی گەرم و باشی بەدەست هێنا، بەڵام وردە وردە، بازاڕی دایە کزی، ئیدی شاعیر و ئەندازیاری جاران، کەوتە بیری ئەوەی چۆن کاروباری کارگەکەی یەکلایی بکاتەوە و لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. ئەوە بوو لەساڵی ١٨٦١دا، حیسابی خۆی پاک کردەوە.
ئەزموونی بازرگانی میشێل، ڕێگەی ئەوەی دەدا، کە کاروباری ئیدارەی دارایی کارەکانی فیدور میخائیلوفیچ بگرێتە ئەستۆ و بەڕێوەی ببات. بەڵام فیدور لە ڕادەبەدەر چیکڵدانە تەنگ و کەم حەوسەڵە بوو. وەڵامەکانی میشێلش بۆ ئەو زۆر توند و ناڕەزایی ئامێز بوو. دەنووسێت: "براکەم، نازانم تۆ بۆچی ئەوەندە نیگەران و تووڕەیت؟ تۆ ڕۆمانێکت نووسیوەو داوتە بە من. ئەگەر متمانەت بە من هەیە، ئارامبە و چاوەڕوان بکە، ئەوە خەمی منە" (پڕوانە نامەی

١٨٥٩/١٠/٢) هــەروەها دەنووســێت: "ئــەمڕۆش بۆمبایــەکی تــۆم وەرگــرت، هاوڕێی ئازیزم". (ڕوانە نامەی ١٨٥٩/١٠/٣)
ئەنجام دوستویفسکی لە ٢/ت١٨٥٩/٢دا نامەیەکی توتلوبینی پێدەگات، دڵنیای دەکات کە میر دلگوروکی، قاییلە ئەو بۆ پایتەخت بگەڕێتەوە.
لە ٢٥/ت١٨٥٩/٢دا، نووسراوێکی فەرمی هۆبەی سێ دەگات بە فەرمانداری تڤیر، کە دەڵێت: "تزار، بەلوتف و کەرەمی خۆی ڕەزامەندی لەسەر داواکەی دۆستویفسکی داوە، بەو مەرجەی بەدرێژایی ماوەی مانەوەی لە سان پتروسبۆرگدا، ژێراو ژێر چاودێری بکرێت."
ئیدی دۆست و ئاشنایانی دوستویفسکی، لە پایتەختدا، شوقەیەکی موبێلەداری بۆ دابین دەکەن و ژنێکی ئاشچی بۆ بەکرێ دەگرن.
دوستویفسکی، بە قیتار لە تڤیرەوە دێت بۆ پایتەخت (پترو سـبۆرگ) میشـێل و نیکۆلای بـرای، هـەروەها میلیکـوفی نووسـەر و هەنـدێ دۆسـتی دیکـە، لـە وێسـتگاکەدا چـاوەڕوانی دەکـەن. هەرکـە قیتارەکـە دەگاتـە جـێ، هـەموو بـە هورای شادی و خۆشـییەوە، دەسـتی بـۆ تـەکان دەدەن و پێشـوازی دەکـەن . قیتارەکە دەوەستێ، دوستویفسکی لە پلەکانەوە دادەبەزێ.
-ئەوەتا.
هەنگێ، شادی، هوراو پێکەنین، دەست لە ملانێ و تەوقە دەست پێدەکات. دە دانەساڵ، دە دانە ساڵی پێ چوو بوو.
میلیکوف، پاشان دەنووسـێت: "لـە ڕووی جەسـتەییەوە نـەگۆڕا بـوو. نیگـای لـە جـارانیش گـەرمتر و گەشـتر بـوو. پێـدەچوو هـیچ توانایـەکی خـۆی لەدەسـت نەدابێت."

## بەشی سێیەم

### فەسڵی یەکەم

### لە ڕۆژنامەوە بۆ یادگارییەکانی خانەی مردووان.

کە دۆستویفسکی دەگەڕێتەوە بۆ سان پتروسبورگ، ڕوو بەڕووی دنیایەکی تازە و خەڵکانێکی دی دەبێتەوە. ئەم ڕووسیایەی سەردەمی ئەلکساندەری دووەم، پەیوەندییەکی زۆر کەمی بە ڕووسیایەکەی سەردەمی نیکولای یەکەمەوە هەبوو. تزار بە پیاو ماقوڵان و نوێنەرانی چینی ئەرستوکراتی موسکۆیی ڕاگەیاند بوو: "باشتر وایە سیستەمی کۆیلایەتی و بەندایەتی لەسەرێ ڕا، هەڵبوەشێنرێتەوە نەک چاوەڕوانی ئەوە بکرێت، لە خوارەوە، خۆی، خۆی هەڵبوەشێنێتەوە."

لەساڵی ١٨٦٠دا، مەسەلەی ئازادی کۆیلە و مسکێنان، لە ئان و ساتدا بوو، هاتبووە سەر مانگ و چەند مانگ. لیژنەیەکی ناوەندی بەسەرۆکایەتی وسەرپەرشتی خودی تزار، کەوتە تاوتوێکردنی لایەنە جۆرا و جۆرەکانی ئازادی کۆیلەکان و دۆزینەوەی میکانیزمێکی لەبار بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەکە: ئازادکردنی کۆیلەکان، بێئەوەی هیچ قەرەبوویەک بە موڵکدارەکان بدرێت و ئەوەش ڕەچاوبکرێت کە ئو زەویانەی کویلەکان کاریان لەسەر کرد بوو، بدرێت بە کۆیلەکان، کە بۆ خۆیان ڕەعەمەلی بێنن.

زۆر ڕیفۆرمی گەورەی ئازادیخوازانەی دیکەش لە واری تاوتویکردن و لێکۆڵینەوە دابوو. ڕۆژنامەوانی و چاپەمەنی سووکە ئازادییەک بە دەست دێنێت. گوشاری مەنگەنەی سانسۆر کەم دەکرێتەوە. ئەشکەنجە و سزای بەدەنی بەرەو هەڵوەشانەوە و دەڕوات. خەڵکی باسی ئازادی داکۆکی لەخۆ، لە دادگاکاندا دەکەن.   ئەم گۆڕانکارییە خێرایانە، دوای چەندین سەدە لە بێدەنگی و تەپە سەری، خەڵکی دەخاتە جۆش و خرۆش. هەڵبەتە چینی نەجیمزادە و ئەرستوکرات کە لە هەموو ئیمتیازاتەکانیان مەحرووم کرا بووون، دەکەونە دژایەتی پرۆژە و دەست پێشکەرییە ڕیفورمیستیەکانی حکومەت، هەڵبەتە ناوەندە پێشکەوتووخوازەکانیش، پێشوازییەکی ئەوتۆ لەم هەنگاوە دڵخۆشکەرانەی حکومەت ناکەن. ئەم هەنگاوە پچڕ پچڕ و خاوانە، ئاواتە زۆر و زەبەندەکانی ئەوانی بەدی نەدەهێنا، تینویەتی نەدەشکاندن، بۆیە سیاسەتی قۆناغ بە قۆناغ و هەنگاو بە هەنگاو، زیاتر بێزار و تووڕەی دەکردن.

هەڵبەتە جەماوەری خەڵک زۆر لە مێژبوو، سەدان ساڵ بوو، تینووی پێشکەوتنی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی بون، جا تزار کە بەخۆی ئەم مەسەلەیەی وروژاند بوو، ئێستا نەیدەتوانی بەبێ ئەوەی چاوپۆشی لە هەندێ ئیمتیازاتی شەخسی خۆی بکات، تینویەتی ئەو خەڵکە بشکێنێ. داواکاری ڕادیکالەکان مانگ بە مانگ زیاتر دەبوو و لە سنووری تەسەوری دەسەڵاتی ناوەندی هێوەتر دەڕۆیی. وایان وێنا دەکرد کە بینای کۆنی تزاران

هاتووەتـە لـەرزین، تـەواو لـەق بـووەو، پێویسـتە، پـاڵێکی پێـوە بنرێـت، تـا بەتەواوەتی و بە یەکجارەکی هەرەس بێنێ.
هەرکەسێکی ئاسایی، وای وێنا دەکرد، لەسەرێتی تێکەڵاوی مەسەلە سیاسییەکان ببێت و تێکڕای کێشەکانی کۆمەڵگا بەڕاستەو پڕگاڵی نۆرین و بۆچوونەکانی خۆی چارەسەر بکات. هەر هەمووان خوازیاری زانیاری زیاتر و تازەتر بوون. کەس کاتی هزرین و بیرکردنەوەی نەبوو. خەڵکی بە تامەزرۆییەوە، لە دووی هەواڵێن ڕۆژ بوون، هەواڵەکانیان بە کاڵی و کرچی وەردەگرت، لێنەدەگەڕان، پێبگات، وەکو برسییان هەر بەکاڵی قووتیان دەدان.
جا لەو کەش و هەوا هەستیار و پڕ جۆش و خرۆشەدا، ڕۆژنامەوانی ڕۆڵێکی یەجگار کارا و گاریگەریی دەبینی، جاپەمەنی و بڵاقۆکان، ئیدی لەوە دەرچوو بوو کە ئەوزاری کات بەسەربردن بێ، بەڵکو بوو بوو بە ئەوزاری هاندانی خەڵکی و بڵاوکردنەوەی زانیاریان، بەرنامەی کاری بۆ بژاردەی چینی ڕۆشنبیر دادەنا. هەندێ لە بڵاوکراوەو ڕۆژنامانی پێشکەوتووخوازی وەک: سەردەم، پەیقی ڕووسی، و هرتزن لە لەندەن، عەیب و عاری ڕژێمی دەسەڵاتداریان دەخستەڕوو، گەندەڵی و پێشێلکاریەکانیان لە قاودەدا و بە ئاشکرا داوای شۆڕشێکی سیاسی سەرانسەریان دەکرد. بەو جۆرە، ڕیفۆرمەکانی ئەلکساندری دووەم، لە جیاتی ئەوەی ڕای گشتی بە قازانجی کڵێساو دەسەڵاتی تزاری گەلاڵە بکات وئاگری توورەیی و ڕقیان دابمرکێنێتەوە وسوکناییەک بەدڵی جەماوەری خەڵک ببەخشێت، بەپێچەوانەوە، زیاتر هاڕوژاندنی وجۆش و خرۆشێکی گۆنگ و سەیری پێبەخشین.
ئیدی دۆستویفسکی، بە هەموو خۆشەویستییەکی خۆیەوە بۆ تزار و بۆ ڕووسیا، لە ناکاوا، وەکو ئەوەی لەسەر دەمێکی دیکەوە، لە خاک و وڵاتێکی دیکەوە هاتبێت، خۆی بەم دنیا جەنجاڵە و بەناو ئەم کۆمەڵگە هاڕوژاوەدا دەکات. لە دڵی خۆیدا ستایشی ئەو ڕیفورمە کۆمەڵایەتیانەی دەکرد کە لەو دواییانەدا جێبەجێ کرابوون. بە ئایندەی وڵات گەشبین بوو. دڵی خۆش بوو. بەڵام سەیری کرد کە لەو وارەدا تەنیایە. بۆیە بە جورئەتەوە خۆی بەناو جەرگەی ڕووداوەکاندا دەکات.
لە هەنبەر هاوعەسرەکانی خۆیـدا، هـەمان هەڵوێسـتی سـاڵانی چلـەکانی (١٨٤٠) خـۆی دووبـارە کـردەوە. تاراوگـە و زنـدان نـەیگۆڕی بـوو. نـەبوو بـوو بـە محافەزەکارێکی ڕەهـا، بـەڵکو محافـەزەکارێکی ڕووسـی بـوو. لیبڕاڵێکـی ڕەهـا نەبوو، بەڵکو لیبڕاڵێکی ڕووسـی بـوو. ئـەم سـیفەتی محافـەزەکاری، لیبڕاڵـی، ڕووسـییە، لـە بنەڕەتـدا، خوازیـاری کۆمـەڵێک ڕیفـۆرم بـوو بـۆ ڕووسـیا، کـە لـە کەلـەپوور و کـەلتووری ڕووسـییەوە، هـەڵێنجرابێت، نـەک کـۆپی و چاولێکـەری بزوتنەوەی ڕیفۆرمی ڕۆژئاوا.
میللەتی سلاڤ، خاوەنی کۆمەڵێک داب و نەریت و ڕەسەنایەتی و تایبەتمەندی خۆی بوو. کە پاراستنیان زۆر پێویست بوو. سلاڤدۆستەکۆنە پەرستەکان زیاتر مۆسکۆیی بوون تا ڕووس. لیبڕاڵە پێشکەوتوخوازەکان زیاتر ئەوروپی مەشرەب بوون تا ڕووس. جا لە نێوان ئەم دوو گروپە توند ڕەوەدا،

دەستەیەکی میانڕەو هەبوو، کە دۆستویفسکی زیاتر بەلای ئەمانەدا دایدەکێشا. بەڵام ئەوانە، لێی تێناگەن و کەسیش نایەوێ لێی تێبگات. ئەو بەلای خوێندکارانەوە هەمان کۆنە زندانی جاران، شەهیدی ئازادیە. پاشان کاتێ کە خوێندکارەکان داوای لێدەکەن، کە لە هەندێ ئێوارە کۆڕی ئەدەبیدا، چەند کۆپلە و بەرپەڕێک لە ڕۆمانی "یادگارییەکانی خانەی مردووان"یان بۆ بخوێنێتەوە. چەپڵە لێدەدەن، بەڵام ئەم چەپڵەیە بۆ نووسەری ڕۆمانەکە نییە، بەڵکو بۆ پارتیزانەکەی ناو ڕۆمانەکەیە. ئەو شۆڕەتەی کە نووسەر بەدەستی دێنێ ئەنجامی جۆرە بەدحاڵی بوونێکە. یانی ئەم شۆرەتە لە ڕاستیدا هی نووسەرەکە نییە، دۆستویفسکی زۆری پێناخۆش دەبێت، کە لەبەر خاتری هەندێ بیرو باوەڕان خۆشیان ویستووە کە هەرگیز بە بیریا نەهاتووە. لە بەرخاتری ئایدیالێک، خۆشویستراوە، کە هەرگیز حەزی لێنەبووە و داکۆکی لێنەکردووە.

دۆستویفسکی دواتر لە نامەیەکدا بۆ ستراخوف دەڵێت: "کاتێ کە بەدەنگی بەرز، هەندێک پەرەگرافم لە ڕۆمانی یادگارییەکانی خانەی مردووان دەخوێندەوە، زۆرم خەفەت دەخوارد... دەتگوت لە خەڵکی دەپاڕێمەوە.. دەتگوت هەمیشە لە حاڵی زاری و لالانەوە و گلەییدام! کە بەڕاستی شتێکی ناخۆشە."

ئەم ڕەوشە نابەجێیە، لە تەحەمولدا نەبوو. دەبوا بەرنامە و نەخشەیەک دابنرێت. ئیدی دوستویفسکی و براکەی لێدەپرێن ڕۆژنامەیەک دەربکەن. هەڵبەتە بیرۆکەی دەرکردنی ئەم ڕۆژنامەیە دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٨٥٨ و لە ١٠/٣١ی هەمان ساڵدا سانسۆر مۆڵەتی کارکردنی پێدابوو. بەڵام برایانی دوستویفسکی لە ساڵانی ١٨٦٠ -١٨٦١ دا بەهۆی گوشاری کۆمەڵایەتیەوە، دەگەڕێنەوە سەر پرۆژەکەیان و جێ بەجێی دەکەن. ئیدی ناوی بڵاوکراوەکە، یا گۆڤارە مانگانەکە دەنەن (ڤریمیا –زەمان).

میشێل، بەڕێوەبەرایەتی گۆڤارەکە لە ئەستۆ دەگرێت. یانی هەموو کاروباری کارگێڕی و دارایی گۆڤارەکە لە ئەستۆ دەگرێت. بەڵام دۆستویفسکی، بەڕێوەبەرایەتی هونەری، ئەدەبی و سیاسی ئەم ئۆرگانە تازەیە لە ئەستۆ دەگرێت. دۆستویفسکی سەروتاری ژمارە،یەک دەنووسێت، کە لەم وتارەدا، داکۆکیەکی تەواو لە ڕەوش و ڕێبازی لیبراڵیەتی ڕووسی دەکات: "سەرەنجام بۆمان بەدیار کەوت، کە ئێمەش میللەتێکی ڕەسەن و سەربەخۆین، تایبەتمەندی خۆمان هەیە، ئیدی لەسەرمانە شێوەیەکی تازەی ئەوتۆ بۆ ژیان هەڵبژێرین کە تایبەت بێ بە خۆمانەوە، دەگەڵ ژیانی خۆماندا تێکبکاتەوە، لەخاکی خۆمانەوە هەڵێنجرابێ، لە ڕوحی خۆمانەوە و لە داب و نەریتی جفاکی خۆمانەوە هەڵقوڵا بێت."

ئەم مانیڤێستە، لە ژەمارە، یەکی گۆڤارەکەدا لە کانونی دووەمی ١٨٦١دا بڵاودەبێتەوە. نووسەر، لەم ژمارەیەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە گۆڤارەکە نابێ، نە لە ڕۆژنامان و چاپەمەنی ڕۆژ ئاواییان بچێت و نە لە ڕۆژنامانی سلاڤدۆستەکان بچێت، لەو بارەیەوە دەنووسێت: "میللەت لەوە حاڵی بوون

که لاسایی کردنەوەی ئاواییەکان وەکو ئەوەیە بێین جلێکی کۆنەی دەڵبی لە هەموو لایەکەوە دڕاو لەبەر بکەین. لاسایی کردنەوەی سلاڤدۆستەکانیش، دەکاتە ئەوەی دوای خەیاڵی شاعیرانەی ئەوان بکەوین و ڕوسیایەک بەگوێرەی داب و نەریت و خوو خدە ئایدیالیەکانی ڕابردوو دروست بکەین."

هەڵبەتە گۆڤاری زەمان بەو ڕونکردنەوەیە، خۆی دەخاتە نێوان دوو ئاگرەوە. ئیدی سلاڤدۆستەکان و غەرەبگەراکان بە دوو قۆڵی دەکەونە هێرش بۆ سەر گۆڤارەکە. بەڵام وێڕای ئەوەش، تیراژی گۆڤارەکە و ژمارەی خوێنەرانی ڕۆژ بە ڕۆژ دەداتە زیادی و ئەمە خۆی لەخۆیدا دڵخۆشکەرە دەبێت. بەهەرحاڵ دوستویفسکی دکارێت، نووسەرانی هەڵبژاردەی زەمانی خۆی، وەکو: تورگینیف، ئورستروفسکی، نیکراسوف، ڕەخنەگری بەنێوبانگ، ئەپولون گریگوریف و فەیلەسووفی گەنج ستراخۆف، بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. جا دۆستویفسکی بە مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی جەماوەری خوێنەران، بێ دو دڵی کەوتە بڵاوکردنەوەی ڕۆمانی "تاوانەکانی لاسنیر" و هەندێ بەشی "بیرەوەرییەکانی کازانوڤا". بەخۆیشی بەردەوام خەریکی نووسین بوو، چیرۆکی خەیاڵی و وتارێن ڕەخنەی ئەدەبی دەنووسی. ڕۆمانی ئەم و ئەوی بە زنجیرە بڵاو دەکردەوە و بەخۆی ڕاستی دەکردنەوە و هەڵەچنی دەکردن.

زیاتر بە شەوان کاری نووسینی دەکرد. لە دەوروبەری سەعات یازدەی شەودا، لە ماڵە کڕو کپەکەیدا، بەرانبەر بە سەماوەرەکە دادەنیشت. کاغەزەکانی بڵاودەکردنەوە. بەدەم خواردنەوەی چای غەلیز و ساردەوە، دەکەوتە نووسین. دەوروبەری سەعات پێنجی بەرەبەیان، دەچووە ناو جیگاوەو تا سەعات دوی پاش نیوەڕۆ دەخەوت.

ئەم سیستەم و بەرنامەی کارە زۆری ماندوو دەکات، لەسەرووی توانای بەدەنی ئەوەوە بوو. سێ مانگ دوای دەرچوونی ژمارە یەکی گۆڤاری زەمان، نەخۆش دەکەوێ. دوای ماوەیەکی کەم چاک دەبێتەوە. بەڵام زوو زوو فێی لێدێت. یانی هەفتەی یەک دوو جار فێی لێدەهات. هەموو جارێکیش، پێشوەختە و بە شێوەیەکی کۆنگ، هەستی بە نزیکی ڕوودانی فێیەکە دەکرد. ئیدی هەرچی هەڵچوونێکی دەروونی و نیگەرانییەکی هزری و شپرزەییەکی ڕوحی هەبوو، لە هەستیکی باڵادا، دەڕەوییەوەو دەتوایەوە. ئیدی ئارام، هێور، بێخەم و خەیاڵ، خۆی بۆ لەزەتی شادی و خۆشیەکانی ژیانی ئەو دنیایە ئامادە دەکرد. لە ڕۆمانی گەمژەدا دەڵێت: "بەڵام ئەو ساتە ڕەخشان و پرشنگدارە، تەنیا پێشەکییەک بوو، بۆ گەیشتن بە دوا سات ئەو ساتەی کە یەکسەر نۆرە فێیەکەی بەدوودا دەهات. ئەو ساتەی کە نەدەهاتە شرۆڤە کردن... چی تیایە ئەگەر ئەوەی لەو ساتەدا ڕووی دەدا، لە نەخۆشییەک بێت. لەو ساتەدا هەستێکی چاوەڕوان نەکراو دەیگرتم، هەستێکی پڕ لە ئارامی، هەستێکی توانەوە لە دوعا و نزایەکدا، فەنابوون لە باڵاترین دیاردەی ژیان." هەروەها فیدور میخائیلوفیچ، بە دۆست و برادەرەکانی خۆی دەگوت: "لە چەند ساتێکدا. هەست بەلەزەت و شادییەکی ئەوتۆ دەکەم کە لە کاتی ئاساییدا. هەرگیز نایەتە وێناکردن، لەزەتێک کە خەڵکانی دی بە

خەیاڵیش نایگەنێ و تەسەوری ناکەن. لەو ساتانەدا، هەست بە سازان و گونجانێکی تەواو لەگەڵ خۆم و هەموو دنیادا دەکەم. جا ئەم هەستە ئەوەندە خۆش و بەلەزەتە، ئامادەم لە بری دە چرکەی ئەو لەزەت و خۆشیە، دەساڵی تەمەنم، بگرە هەموو تەمەنی خۆم بدەم."

دۆستویفسکی کە دەگەییە دوا پلەی ئەم نەشە سۆفیانەیە، هەنگێ ئازای گرژ دەبوو. نۆرە فێیەکەی لێدەهات، بەدەم کەڤ پرژاندن و ناڵە ناڵەوە، دەکەوتە سەر عاردی.

ستراخۆف، کە جارێک دۆستویفسکی بەو حاڵەوە دەبینێ، بەمجۆرەی دەگێڕێتەوە: "بۆ ساتێک وەستا، لەتۆ وایە بۆ وشەیەک دەگەڕێت کە هزر و بیرەکەی خۆی پێدەربڕێت. ئەوجا دەمی کردەوە. من بەوردی تەمەشام دەکرد. دڵنیا بووم کە دەیەوێ قسەیەک بکات. لەناکاوا، دەنگێکی غەریب و سەیر، درێژ و ئاڵۆز، لە بەینی لێوە بە ئاستەم کراوەکانیەوە هاتەدەرێ و بێئەوەی ئاگای لە خۆ بمێنێ، لە ناوەندی ژوورەکەدا کەوتە سەر ئەرزەکە."

هەندێجار، بەدەم بەربوونەوەوە، برینـدار دەبـوو، گۆنا و ڕوخسـاری یەکپارچـە پەڵـەی سـوور بـوو، وەکـو بـەردی مـەڕ مـەڕی لێهـاتبوو، کـە وەخـۆ دەهاتـەوە، ماسولکەکانی بـە هـۆی گرژبوونـەوە، مانـدوو دیـار بـوون، هەسـتی دەکـرد مێشـکی بـۆش و بەتاڵـە. بەگوتـەی خـۆی، وای هەسـت دەکـرد، تـاوانێکی گەورەی کردووە و هێز نییە بتوانێ لەو تاوانەی خۆش بێ و تـەبرێی بکـات. ئایـا ئەو هەستی تاوانباریەی کە لـە دڵ و دەروونـی دەگـەڕا، بـەرۆکی هـزر و بیـری دەگرت و ئازاری ڕوحی دەدا، زادەی مردنەکەی بابی یـان مـەرگی ئیسـاییفی، ئـالوودە و هەمیشـە مەسـت نـەبوو؟ ئـەم هەسـتی درێغـی و تینویـەتی خـۆ سزادانە، باڵی بەسەر، سەراپای ژیانی دۆستویفسکیدا، کێشا بوو.

زۆرجار، دوای هەر نـۆرە فێیـەک، وا ڕێدەکـەوت کـە دۆستویفسـکی بـۆ چەنـد ڕۆژێک یادگەی خـۆی لـە دەسـت دەدا. پەسـت دەبـوو، خـەمۆکی دادیـدەگرت، بەزەحمـەت کـاری نووسـینی پێـدەکرا. ئـەم ڕسـتە کـورت و بروسـکەییانەی خوارەوە، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا، دەربـارەی ڕووداوەکـانی سـاڵانی ١٨٦٣ -١٨٦٤دا، تۆمار کراون:

"نۆرە فێیەکانم:

١/٤: زۆر توند بوو.

١/٨: سووک بوو.

ت٢/٧: مامناوەندی بوو.

ک٢/٧: زۆر توند بوو.

٢/٣: مامناوەندی بوو."

لەو هەول و مەرجە نالەبارەدا بوو، کە نووسەر، پاش ئەوەی لە تاراوگە گەڕایەوە، یەکەمین ڕۆمانی مەزنی خۆی (مدلون مهانون) نووسی، هەروەها "یادگارییەکانی خانەی مردوان"یشی تەواو کرد.

لەسەرەتای کانوونی دووەمی ١٨٦١دا، لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری زەمانـدا، دەستی بە بڵاوکردنەوەی ڕۆمانی "مدلون مهانون" کرد. ئـەم ڕۆمانـە، تێکەڵـە و

ئاوێتەیەکی سەیرە لە حیکایەتێن ئەفسانەیی و بابەتێن دەستکردی خەیاڵی نووسەر، بە شێواز و ستایلی ئوجین سوو. (ئوجین سوو ١٨٠٤ -١٨٥٧) ڕۆماننوسێکی فەرەنسییە، بە ڕۆمانە زنجیرەییەکانی بەناوبانگە کە بەوەسفی ژیان لە گەڕەکە هەژارنشینەکانی پاریس دەست پێدەکات و بە کۆمەڵێک، داخوازی جڤاکی کۆتایی دێنێت. لەوانە ڕۆمانی ڕاز و نهێنییەکانی پاریس (١٨٤٢) و جولەکەی سەرگەردان (١٨٤٤ -١٨٤٥). ئەم ڕۆمانە زیاتر لە ئیعترافنامەیەکی پەنهانی شەخسی نووسەر دەچێت، کە لەشێوەی ڕۆمانێکی زنجیرەیی، کۆمەڵگا پەسندا، داڕێژراوە. ئیڤان پیتروفیچ (ڤانیا) عاشقی ناتاشایە، بەڵام ناتاشا، پیاوێکی دیکەی، بەناوی ئالیوشا، خۆشدەوێ، کە کوڕی میر ڤالکورسکی یە. بەڵام قەرقەشە و شەڕێکی بێمانا و گەوجانە ئەم دوو خانەوادەیە لێکدی دوور دەخاتەوە. جا ئەوە کەی کێشەیە؟ ناتاشا، بڕیار دەدات کە لەماڵی بابی هەڵێت و ڕەدووی ئالیوشای گەنج و سەرکێش و خۆسەر بکەوێت و دەگەڵ ئەودا بژی. تا ئێرە بابەتی ڕۆمانەکە و گەشەکردنی زیاتر لەو کورتە چیرۆکە عاتیفیانە دەچێت، کە لە ڕۆژنامەدا بڵاودەبوونەوە. بەڵام ئەوەندە بەسە کە دوسویفسکی سووکە دەسکارییەکی بابەتەکە بکات، تا ببێت بە چیرۆکێکی دڵگیر و سەرنجڕاکێش. ڤانیای کڵۆڵ و بەدبەخت، ئاشق و شەیدای ناتاشا، نووسەرێکی گەنجی تازەکارە کە یەکەمین کتێبی لە ڕووی فرۆشەوە سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دێنێ و ئەم یەکەمین کتێبەی ڤانیا، بە ڕادەیەک لە یەکەمین ڕۆمانی دوستویفسکی، هەژاران دەچێت کەپیاو بە ئاسانی لێکدیان جیاناکاتەوە. ڤانیا لە ڕۆمانی (مدلون مهانون)دا دەڵێت: "من فەرمانبەرێکی سادە و بچووکی، زەحمەتکێشم، نواندووە کە هەندێک گێل و گەوجیشە." ئایا ئەمە هەمان وێنەی "ماکاردیڤوشکین"ی قارەمانی ڕۆمانی هەژاران نییە؟

نیلی کچۆلە، دەپرسێت: "باشە ئەم کورە گەنجە بۆچی بەنەخۆشی سیل مردووە؟" ئایا لێرەدا مەبەست لەو کورە گەنجە، هەمان خوێندکاری (پوکرۆفسکی) ناو ڕۆمانی هەژاران نییە؟

ئەنجام، دەست نووسەکەی ڤانیا دەکەوێتە بەردەستی ڕەخنەگرێک بەناوی کورتکراوەی (ب) کە زۆری کەیف پێدێت (وەکو چۆن منداڵێک دڵی بە گەمەیەکی جوان خۆش دەبێت." وەکو چۆن بیلینسکی کاتی خۆی کە ڕۆمانی هەژاران دەخوێنێتەوە، زۆر دڵی پێخۆش دەبێ و کەیفی پێدێت. لێکچوونی نێوان ڤانیا و دۆستویفسکی لە هەوەڵێن لاپەڕەکانی ڕۆمانەکەوە، بە ڕوونی بەدیار دەکەوێت.

بەڵام مەسەلەکە هەر لەو ئاستەدا ناوەستێ بەڵکو ئاڵۆزتر دەبێت. کاتێ ڤانیا، دەزانێ ناتاشا، حەزی لە ئالیوشایەو ئەوی خۆش دەوێ، یارمەتی دڵبەرەکەی خۆی دەدات، کە ڕەدووی ئەو گەنجە، میرزادەیە بکەوێ و بەجدی بەرگری و داکۆکی لە ڤیان و ئەڤینداری وان دەکات. هەواڵی ناتاشا دەگەیەنێتە کەس و کارەکەی. بەڵێن بە جووتە هاوسەری گەنج دەدات کە لەهەر تەنگانەیەکدا فریایان بکەوێت و یارمەتیان بدات. بەبێ هیچ تەماحێک،

دەبـێ بـە فریشـتەی نیگابـانی ئـەوان. جـا ئـەم لێبـوردەیی و چاکەیـەی کـە هـەڤرکێکی ئەڤینـداری شکسـت خـواردە، سـەبارەت بـە حەریفەکـەی خـۆی دەینـوێنێ، هـەمان هەڵوێسـت و ڕەفتـاری دۆستویفسـکیمان، سـەبارەت بـە ماری دیمیترڤنا و فێرکارە گەنجەکە، ڤیرگونوف، وەبیر دێنێتەوە. "من دان بـەوەدا دەنەم کـە هـەرگیز ئـەو بەرێزانـەم خـۆش نـاون، کـە ئاشـقانی دەزگیرانـەکانی خۆیان دەلاوێنن و بە باوەشـی واڵاوە پێشـوازیان دەکـەن و وەکـو یـاوەر و خـوڵام خزمـەتیان دەکـەن، تـا لـەو ڕێگەیـەوە گـەورەیی ڕوحـی خـۆ بنـوێنن، هـەرگیز ئەوانەم خۆش ناون. ئەوانە یا لە بنەڕەتدا ئاشق نەبوون، یا بە ئەقڵ ئاشـقێنیان کـردووە. ئـەو جـۆرە ئاشـقانە دەسـتکرد و خەڵقەنـدەی دەسـتی نووسـەرانن. نووسەرانێک کە زیاتر شـارەزای ئەشـقی ئـەقڵانی بـوون، تـا ئەشـقێک کـە لـە کانگای دڵـەوە هـەڵقوڵابێ." ئەمـە ڕەئـی و بۆچـوونی ڕەخنـەگری سـەختگیر و جـدی دوبرلیوبـوف دەربـارەی دڵپـاکی و هەڵوێسـتی ڤانیـا. بـە بۆچـوونی ئـەم ڕەخنــەگرە، ئــەم ڕووداوە، ناواقیعیــە، تــەنیا داهێنــانێکی ئــەدەبی خــەیاڵی نووســەرە. ڤانیـا دەڵێـت: "مـن هـەموو شـتێکتان بـۆ تـەرتیب دەکـەم، هـەموو شتێک: دیدار و ژوانەکانتان، نامەکانتان بۆ دەگەیەنم. بۆچی ئەم کارە نەکەم"؟
ناتاشا وەڵامی دەداتەوە:
"مـن خیانـەتم لـەتـۆ کـردووە، کـەچی تـۆ لـە هـەموو شـتێکم بوردوویـت، وات لێهاتووە، تەنیا بیر لە بەختـەوەری مـن دەکەیتـەوە!... دەشـیا مـن لەگـەڵ تـۆدا بەختەوەربام هاورێی ئازیزم! بەڵام من شـێتانە ئالیوشـام خۆشـدەوێـت، بـەڵام هەسـت دەکەم هێشتاش تۆم زۆر خۆشدەوێ، بەڵام وەکو هاوڕێیەک. مـن بـێ تـۆ نـاژیم، تـۆ بـۆ مـن پێویسـتی، مـن پێویسـتم بەدڵـە زێرینەکـەی تۆیـە..." وا هەســت دەکرێــت ئەمــە مارییــە کــە سوپاســی لێبــوردەیی و فیــداکاری دوستویفسکی دەکات. تکای لێدەکات کە فەرامۆشـی نـەکات و دەسـتبەرداری نـەبێت، بـەڵام بـەخۆی ناتوانێـت دەسـتبەرداری فیرگونـوف ببێـت، لـەکاتێکا لـە ماڵەکەی خۆیدا لە شـاری کوزنتسـک، کـە مـاڵێکی زۆر پـەرپووت و هەژارانەیـە بەدەم ئاهو ناڵەوە دێت و دەچێت و وەکو شێت، بەدەم فرمێسـک ڕشتنەوە ئـەم ژوور و ئەو ژوور دەکات.
هەرچۆنیک داوەری بکەی. ئەم ڕۆمانە، پاشەکشەیەکی ئاشکرای کاری ئەدەبی دوستویفسکییە. بابەتی ڕۆمانەکە، لەنێوان دوو گرێی نایەکگرتوودا، جۆڵانە دەکات: گرێی ناتاشا و گرێی نیلی. هەڵوێستەکان نائاسایی و دەستکردن. قارەمانانی ڕۆمانەکە زندوو نین بێ نموودن. ڤانیا کە چیرۆکی مزلون مهانون دەگێڕێتەوە، بەخۆی کەسایەتیەکی بێنموودە. کەسێکی بێموبالات و ناجدییە، وەکو کاراکتەر زۆر لاوازە و زیاتر لە سینفی "خەتیب و واعیزان" دەچێت.
ناتاشا، ئافرەتێکی ئاشقە، بەڵام ئاشق بە هەمان ستایل و شـێوازی ئاشـقە دەسـتکردەکانی دۆستویفسـکی. ناتاشـا، ئالیوشـای خۆشـدەوێ، بـەڵام ئالیوشـا، وەکـو پێویسـت ئـەوی خۆشـناوێ. ناتاشـا، ڤانیاشـی خـۆش دەوێ، ناتاشا، پێی ناخۆشـە کە ڤانیا ئەزیەت دەدات، بەڵام کە ڤانیا ئەزیـەت دەدات لـە

ناخی خۆیدا هەست بە جۆرە شادییەکی پەنهانی دەکات و ناتوانێ دەستبەرداری ئەم شادیە پەنهانە ببێت. ناتاشا، دەڵێی خوشکی ڕوحانی ڤارنکایە لە ڕۆمانی هەژاراندا. دەڵێی خوشکی ناستنکایە لە چیرۆکی گوندی ستیپان چیکوڤۆ. ئەمانە هەر هەموویان کیژانی گەنج و فامیدە و زیرەک و نەجیب و هەستیارن، لە هەر ڕەنگ و ڕەونەق و تایبەتمەندییەکی شەخسی بەدوورن.
بابی ئالیوشا، میر ڤالکورسکی لەم میلودرامایەدا. ڕۆڵی خیانەتکاری هەیە کە تاڕادەی گەوجایەتی لە خیانەتتدا ڕۆدەچێ و ئەلیوشا، جیلوەیەکی زیاتری هەیە. ئەم کاراکتەرە گەوجە، هەمیشە هەڵە و خەتا دەکات و دەبەخشرێت، هەندێجار دەبێتە مایەی سەرنج و دڵبەندیی خوێنەر و هەندیجار دەبێتە مایەی تورەیی و بێزاری خوێنەر. ئەلیوشا، نوێنەر و نموونەی خەڵکی بازاڕی وشەقاوە و بەرەڵڵایە. بەڵام بە تەربێتە.. بەهەڵە و خەتاکانی خۆی دەزانێ. لە هەڵەکانی ژێوان دەبێتەوە. بەڵام ژێوان بوونەوە دادی نادات و چاکی ناکاتەوە. کەسێکی بێئیرادە و ڕاڕا و لاوازە. لە ڕووی جڤاکی و کۆمەڵایەتیەوە زۆر سووک و چرووکە. لە کاتێکا لەباسی کیژێکی گەنجی دیدا بۆ ناتاشا دەڵێت: "تۆ چیت دەوێ؟ کاتێ کە لەگەڵ تۆدام، حەز دەکەم باسی ئەو کچە بکەم و، کە لەگەڵ ئەودا دەبم حەز دەکەم باسی تۆ بکەم." کە دەبینێ خەڵکی ڕاز و نهێنی ئەم ڕەفتارە سەیر و ساویلکانەیەی ئەو دەرک ناکەن، بەشێوەیەکی سەیر و پڕ هەڵچوونەوە خەمگین دەبێت. ئایا ئەم کاراکتەرە، هەمان فێرکار، ڤیرگوتوفی ڕەقیبی دۆستویفسکی نییە کە لەشاری کوزنتسکدا ناسی بووی، کە نووسەر لێرەدا بەناوی ئالیوشاوە بە ئێمەی دەناسێنێ؟ ڕەنگە وابێ. بەڵام ئەم پیاوە فریوکارە لەم ڕۆمانەدا، بە خۆشەویستی و هاوخەمییەکی سەیر و تایبەتیەوە، وینە گیراوە. پێدەچێ دوستویفسکی لە هەڵە و خەتاکانی خۆش بووبێ.
هەڵبەتە، وێنەی دڵگیری نیلی لە تێکڕای ئەم کاراکتەرانە، دیاترترو سەرنج ڕاکێشترە. دەکاتە ڕوحی ڕۆمانەکە و کاکڵەی بەتام و لەزەتی کتێبەکە. ئەگەر ڕاستت دەوێ ڕیسکی ئەم کیژە سیلاویە کە ڤانیا دەیباتە لای خۆی و لە ماڵی خۆیدا جێی دەکاتەوەو پاشان دەردەکەوێت کە کیژی ئاسایی میر ڤالکورسکی یە، هەر هەموو ئەم ڕووداو و دیمەنانە، ئەو ڕۆمانە عاتیفیانەمان بیر دەخەنەوە کە بە زنجیرە لە ڕۆژناماندا بڵاو دەبنەوە و لە کۆتاییدا دەنووسرێ "پاشماوەکەی لە ژمارەی داهاتوودا بخوێنەوە." بەڵام هەندێجار تەبع و تەبیعەتی نیلی چکۆلە، دەگاتە لوتکەی جوانی و بێگەردی و پاکی، نیلی کیژێکی سێویە، لە ژینگەیەکی خراپی پڕ لە جەنجاڵ و کوتەککاری و هات و هاواردا، لە ماڵی ژنێکی سەڵیتەی زمان درێژی بێحەیادا گەورە دەبێت. بەڵام ئەم کیژۆڵەیە، خۆی بە منەتباری ئەم ژنە دەزانێ. ژنەی تاین چونکە ئەم کچۆڵەیەی هەڵگرتووەتەوە و بەخێوی کردووە، هەمیشە بۆڵە بۆڵە بەسەردا دەکات و ئازاری دەدات. بەڵام نیلی ئامادەیە بەهەر نرخێ بووە چاکەی ئەو ژنە بداتەوە. بە بوونی خۆی، بە ڕەنجی خۆی، بە خۆشەویستی خۆی،

چاکەی بداتەوە. کاتێ ڤانیا. ئـەم کیـژە دەباتـە لای خـۆی و لـە کـۆنتڕۆڵی ئـەم پیرەژنەی (بوبنوف) دەرباز دەکات، چاودێری وسـەرپەرشـتی و دڵنەوایی دەکـات. نیلـی بەڕاســتی و لـە دڵـەوە ڕێـزی دەگرێـت و خۆشــی دەوێـت، بـەڵام بـە غرووریکـی تایبەتیـەوە، خـۆی لـەوە دەبـوێرێ کـە بـە ڕاشـکاوی ئەشــق و خۆشەویستی خۆی بۆ دەربـبڕێت. نیلـی مـەغروور و سـەرکێش وەکـو ئاسـکی کێوی سرک و ڕەوەکە. کلۆڵی و بەدبەختی قاڵبیان کردبووەوە. پیـرەژن، بوبنـوف، هاوار دەکات: "کە شـەیتانێکی سـەرسـەختە، لێی بدەی یا لێی نەدەی فـەرقی نییە. زار هەڵنایەنێ. لەتۆ وایە زاری پڕە لە ئاو."

نیلی بە خۆیشی دەڵێت: "چەندم خوتەو بۆڵە بەسەردا بکەن، من بە ئانقەست وەڵام نادەمەوە. دارکاریم بکەن، قسە ناکەم. بە هیچ شێوەیەک ناگریم. ئەوان، لەوە تووڕە دەبن کە ناتوانن بمخەنە گریان." نیلی، ڕقی لە ناشا دەبێتەوە، تەنیا لەبەر ئەوەی ڤانیا بەئاشکرا ئەو ژنە دەلاوێنێ. وێڕای ئەمەش کاتێ "فریا ڕەسـەکەی" کە باسـی کلۆڵی و نەگبەتی و بەدبەختی ئەم ژنەی بۆ دەکات، نیلی، ئەم کچۆڵە سیلاویە، بە هەموو توانایەکی خۆیەوە هەوڵدەدات، هەندێ بە ختەوەری بۆ ناتاشـا، بۆ ئەو کچەی کە زۆری دەردو مەینەتی چەشتووە، فەراهەم بکات. پاشـان، دوای ئەوەی هەموو هەوڵ و کۆشـشێکی خۆی بەکار دەبات، زۆر لاواز دەبێت، لە پەلو پۆ دەکەوێت، بەدەم سـووتانەوە لە ئاگری ئەشـقی خۆیدا دەمرێت.

دیارە ڕۆمانی (مدلون مهانون) ڕەخنە و ئیرادێکی توندو جدی لەسـەر هەبوو. دوبرلیوبوف، دەڵێت: "ئەگەر بڵێم ڕۆمانەکەی ئاغای دوستویفسکی، لەو ئاستەدا نییە. کە شایستەی ڕەخنەی ئەدەبی بێ، هەق نییە لێم زیز بێت."

هەروەها ڕەخنەگر "کوچولو –بیزبورودکو" دەڵێت: "ئەو دیاردە و ڕووداوانەی کە دوورن لە حەقیقەتەوە، قەناعەت بەخش نەبن، هونەرییەت بەهیچ کارێکی هونەر نابەخشن. هەموو ئەم دیاردە و ڕووداوانە لە ڕادەبەدەر دەستکردن.. گەورەترین کێماسـی ئەم ڕۆمانە، ئەمەیە کە نووسـەر، تاقە یەک سیمای زندوو. یان تاقە یەک کەسایەتی ڕاستەقینە و ڕەسـەنی وێنە نەگرتووە."

ڕازیـن دەڵێـت: "دژوارتـرین شـتی ئـەم ڕۆمانـە، ئەمەیـە کـە تاقـە بابـەت و تیمەیەکی ئەو تۆی تیا نییە، کە بشێت، پشتی پـێ ببەسـتی. ئـەوەی دیـارە، ئەمەیە کە هەندێ کەس لەم ڕۆمانەدا هەن، بەردەوام گلەیی و زاری دەکـەن، بـەڵام کەسـایەتی ئـەم کەسـانە خۆیـا نیـەو هـۆی گلـەیی و گازنـدە و ئاهوناڵەکەیان ڕوون و دیار نییە.

ئەپولون گریگورییف، کە ڕەخنەگری گۆڤاری زەمان بوو، دەڵێت "کاراکتەرانی ڕۆمانی (مدلون مهانون) بریتین لەو پەیکەرانەی کە لەدوکان و موغازاندا جلیان بۆ نمایش لەبەر دەکرێت و ڕۆمانەکە بێ سـەروبەرە."

دۆستویفسکی، پێکـەنینی بـەم ئێرانـەدا دێـت. دەنووسـێت: "چونکـە بـۆ ئـەم گۆڤارە تازەیە، کە سـەرکەوتنم زۆر بەلاوە مەبەسـت بوو، پێویسـتم بـە ڕۆمانێـک بوو، پێشـنیازم کرد کارێکی چواربەشـی تیا بلاوبکرێتەوە. برایەکم دڵنیـا کـرد کـە ماوەیەکی زۆرە پرۆژەیەکی وام ئامادە کردووە، بەڵام ئەمـە ڕاسـت نـەبوو.. مـن

دان بەوەدا دەنەم کە لە ڕۆمانەکەمدا، کۆمەڵێک پەیکەر هەن، دێن، دەجوڵێن، بەڵام کاراکتەری زندوو و ڕاستەقینە نین. کتێبێکە، کاراکتەرەکانی ناوی، گیانی هونەرییان بە بەردا نەکراوە. (دەبوایە بۆ ئەم کارە، وەختی تەواوم هەبوایە، چاوەڕوانم بکردایە، بیرەکانم لە زەینمدا، تەواو گەڵاڵە بووایە و بخەملایە." ئیدی ئەنجامی ئەو پەلە پەلە کارێکی کێوی و نە بەکامی لێکەوتەوە. بەڵام ویڕای ئەوەش، پەنجا لاپەڕەیەکی تێدا هەیە کە دەتوانم بڵێم شانازی پێوە دەکەم."

بەهەرحاڵ سەرکەوتنی بروسکەئاسای یادگارییەکانی خانەی مردووان زوو بە زوو، شکست و ناکامی ڕۆمانی (مزلون مهانون) قەرەبوو دەکاتەوە. ئەمجارەیان ڕەخنەگران هەموو کەوتنە ئەوەی کە بەهرەو تونای مەزنی ئەم نووسەرە، بخەنە ڕوو. میلیکوف دەڵێت: "ماوەیەکی زۆرە کە لە ئەدەبیاتی خۆماندا، بەرهەمێکی وامان نەبووە کە وەکو یادگارییەکانی خانەی مردووان، خوێنەر ڕابکێشێت و بەمجۆرە کاری تێبکات." ئیدی ڕەخنەگران لە باس و ستایشی ئەم ڕۆمانەدا زیادە ڕۆیی دەکەن. هەندێکیان دوستویفسکی بە دانتی دەشوبهێنن. زۆر ستایشی دیمەنی گەرماوەکە دەکەن، کە ئەو هەموو خەڵکەی بەڕووت و قووتی تێ ڕژاوە و شوێنەواری برینی ئەشکەنجە بە جەستەیانەوە و لەناو تاریکی هەڵمێکی بۆگەندا، کە دڵی لێی تێکهەڵدێت دێن و دەچن، ئەو شانۆگەرییە کۆمیدیەی کە زندانییەکان، پێ بەکۆت و زنجیر، بەسەری سفرەوە، لەبەرانبەر دۆستەکانی خۆیاندا، دەیان نواند، ئەوەندە دڵگیر بوو، کە بوو بوو بە وێردی سەر زمان و خەڵکی بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە. هەروەها دیمەنی نەخۆشخانەکە، دیمەنی تورە بوون و سەرزەنشتی مێجەر، دیمەنی ڕۆیشتن لە تاراوگەکە و... هەموو ئەوانە کاریگەرو سەرنج ڕاکێش بوون.

فەرمانبەرێکی سانسۆر، لە سەرەتاوە پێی وابوو کە دەبێ هەندێ دەسکاری دەقی کتێبەکە بکرێت. ئەم فەرمانبەرە گومناوە دەنووسێت: "ئایا هەندێ لە خوێنەرانی کەم سیوات، ئەم کارە مرۆڤانیەی کە حکومەت لە گرتووخانان و بێگارە زنداندا، دەیکات، بە جۆرە یارمەتیەکی دەوڵەت سەبارەت بە تاوانبارانی گەورە لێک نادەنەوە؟" دوستویفسکی، دەیەوێ ئەوە نیشان بدات کە مەحرووم بون لە ئازادی، دەکاتە کارێک کە زندانیان، تەنانەت، بێزیان لە نانی چاودارش کە زۆر لەسەرانسەری وڵاتدا بەناوبانگ بوو، ببێتەوە، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی سانسۆری ناوەندی، چاوپۆشی لە تێبینییەکانی لیژنەی سانسۆر دەکات و لە ١٢/ت٢/١٨٦٠دا مۆڵەتی چاپکردنی یادگارییەکانی خانەی مردووان دەدات "بەو مەرجەی هەندێ وشە و زاراوەی کرێت و ناشیرینی دوور لە ئەدەبی، لێ لابرێت." بڵاوکردنەوەی هەردوو ڕۆمانی (مدلون مهانون) و (یادگارییەکانی خانەی مردووان) لە گۆڤاری زەماندا، زۆر خوێنەری تازەی بۆ گۆڤارەکە پەیدا کرد. لەساڵی ١٨٦١ ژمارەی بەشدارانی گۆڤارەکە گەییە دوو هەزار و سێ سەد کەس، لەساڵی ١٨٦٢دا ئەم ژمارەیە گەییە چوار هەزار و سێ سەدو دووکەس. میشێل، وازی لە پرۆژەی کارگەی

جگەرەکەی هێنا، بۆ ئەوەی کاتی خۆی بۆ کار کردن لە گۆڤارەکەدا تەرخان بکات. هاوکارانی گۆڤارەکە. بۆ نووسینی وتارەکانیان، ڕێنماییان لەو ولە فیدور میخائیلوفیچی برایەوە وەردەگرت. ئەو نووسەر و ڕەخنەگرانەی کە لەم گۆڤارەدا کاریان دەکرد، بەجۆش و خرۆش و دڵسۆزییەکی کەم وێنە کاریان دەکرد. ئەمانە لەپێناوی ڕووسیادا و بگرە لە پێناوی هەمو جیهاندا کاریان دەکرد.

لەم سەرو بەندەدا، ڕووداوە سیاسیەکانی دەوروبەریان زۆر بەخێرایی ڕویان دەدا. لە ١٨٦١/٢/١٩دا، ئەلکساندری دووەم بە قەرارێک بە یەکجارەکی هەموو کۆیلەکانی سەرانسەری ڕووسیای ئازاد کرد. بەڵام ئەم ڕیفۆرمە زۆر بە درەنگەوە ئەنجام درا، ئەم مەسەلەیە زۆر باسکرا بوو، بۆیە ئیدی هیچ سوکناییەکی بەڕای گشتی نەدەبەخشی. چیگونوف لەو بارەیەوە دەڵێت: "کاتێ کە کاری دەرکردنی قەراری نۆزدەی شوبات بوو بە ئەمری واقیع، ئیدی خەڵکی دەرفەتیان بۆ ڕەخسا کە بیر لەمەسەلەێن دی بکەنەوە."

ئیدی ڕادیکالەکان بەلەز کەوتنە چالاکی خۆ. هیرتزنی، شۆڕشگێری ئاوارە، لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا (زەنگ) کە لە لەندەن دەردەچوو، دەڵێت: "کاتێ کە جەنەڕاڵەکان و فەرمانبەران کەوتنە جێ بەجێکردنی یاسا تازەکە،میلەت هەستی کرد، تەنیا بەقسان ئازادی پێدراوە، نەک بە کردەوە... جۆرە بەندایەتیەکی تازەیان بۆ میللەت دروستکردووە." (بڕوانە ژمارەی ١/تەمووز/١٨٦١).

هەروەها لە لە١/ت٢ هەمان ساڵدا دەنووسێت: "باش گوێ بگرن، لە هەر چوار نکالی نیشتمانی ئازیزمانەوە لە دۆنەوە تا ئورال، لە ڤۆلگاوە تا دنیپەر، دەنگی ئاهو ناڵە دێت. بانگی شۆڕش بەرزبووەتەوە. ئەمە یەکەمین هاڕەو هاژەی ئەو شەپۆل و تۆفانەیە کە هەستاوە، دوای ئارامییەکی کەم، تۆفانی زۆر و گەورەی دی بەدوودا دێت."

ڕۆژنامەی هیرتزن، لەلایەن حکومەتی ڕووسیاوە قەدەغە کرابوو کە بێتە ناو وڵاتەوە، بەڵام بەقاچاغ دەهات و دەستاو دەستی دەکرد، خوێندکارانی لاوی زانستگەکان، چالاکانە کاریان دەکرد، دەیانویست ڕژێمێکی نوێ دابمەزرێنن. بەڵام چ ڕژێمێک؟ بە خۆیشیان نەیاندەزانی چ ڕژێمێکیان گەرەکە، ئەمە گرینگ نەبوو، گرینگ ئەوە بوو کە جم و جوڵێک هەبوو.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٦١دا، ڕووداوێک، تەقییەوە کە بە ڕووداوی خوێندکاران ناوی دەرکرد. هزر و بیرێن ئازادیخوازانە و لیبراڵی، لە کەللەی خوێندکارانی دابوو. خوێندکاران ڕۆژنامەو بڵاوکراوانی شۆڕشگێرانەیان دەخوێندەوە. کۆڕ و کۆبوونەوەی جەماوەرییان دەبەست، هاتوچووی ئەو کتێبخانانەیان دەکرد کە کتێبێن قەدەغەیان تیا بوو، سەندوقی کۆکردنەوەی پیتاک و باربووی کۆمەڵایەتیان دادەمەزراند. بەیاننامە و بڵاوکراوەی شۆڕشگێرانەیان چاپ و بڵاو دەکردەوە. کار گەییە ئەوەی کە بەخۆیان دادگای نهێنی بۆ دادگایی کردنی دژمنانی گەل و فیوداڵان دابمەزرێنن، بێگومان ئەم چالاکییە لاوەکیانە لە پەراوێزی سیاسەتی فەرمی حکومەتدا، لە خوێندنی

دور دەخستنەوە، ئیدی پۆلەکان و هۆڵی خوێندن بوو بە مەڵبەندی گەنگەشە و موناقەشە، نەک زانست و فێر بوون.
ئیدی بەرپرسانی زانستگەکان داوایان لە تزار کرد، کە فەرمانێک دەربکات، کە کۆبوونەوە و خۆپیشاندان و هەڵبژاردن و دامەزراندنی یەکێتی خوێندکاران قەدەغە بکات. خوێندکاران ئەم هەنگاوەیان بە کارێکی کۆنەپەرستانە لەقەڵەم داو بەتوندی دژی وەستانەوە. کارەکە تەشەنەی کرد، هێزەکانی دەسەڵات ناچار بوون، لە کوچە و کۆڵان و جادە و بانەکاندا، ڕێگە بە خوێندکارانی شۆرشگێر بگرن. ڕۆژی دوو سێ جار دەیانگرتن و ئازادیان دەکردن.
سەرەنجام، بەرپرسانی حکومەت ناچار بوون، پێشەنگ و پێشەوایانی خوێندکاران دەستگیربکەن و لە قەڵای (پیترو پول) یان توند بکەن. خوێندکارەکان ئەمەیان پێخۆش بوو، چونکە بەهۆی ئەم کارەوە لە ناکاوا شۆرەت و نێوبانگیان پەیدا کردبوو. ئیدی لەسەرانسەری شاردا، باس هەر باسی بوێری و بێباکی خوێندکاران بوو. لەکاتی مۆڵەتی دیدەنی زیندانیان و دەستگیراواندا، خەڵکی پۆل پۆل ڕوویان دەکردە زیندانەکان.
میشێل دوستویفسکی بەناوی گۆڤاری زندانەوە، قاپێک کۆنیاک و قاپێ شەراب و دنیایەک گۆشتی برژاوی بۆ خوێندکارەکان نارد. کاتێ خوێندکارەکان بە حەپسی شاریان بەجێدەهێشت و بەرەو تاراوگە دەبران، خەڵکێکی زۆر لە دەرێی شاردا، بەهاوار و هورای ستایشەو بەڕێیان دەکردن، پاشان زانستگەکەیان بەبیانووی "هەندێ چاکسازییەوە" داخست، بەڵام ڕێگە بە مامۆستاکان درا، کە لە هۆڵەکانی دۆمادا (ئەنجوومەنی نیشتمانی) محازەرەکانی خۆ بڵێنەوە. خوێندکارەکان، زەمانەتی پاراستنی نیزامی محازەرەکانیان دەکرد. بەڵام ئەم زانستگە کاتیەش ڕۆژی دوای ئەو کۆرە ئەدەبی و موزیکالیەی کە لە ١٨٦٢/٣/٢دا بەرپاکرا، داخرا. لەم کۆرەدا پروفیسۆر پاڤلوڤ، وتارێکی خوێندەوە کە وەکو هەر بەندێکی بەرنامەکە، پێشوەختە لەلایەن سانسۆرەوە بینرا بوو و ڕێگەی درا بوو، بەڵام پروفیسۆر، بەجۆرێ خوێندییەوە و دانی بە وشەکاندا دەناو هەڵوەستەی لەسەریان دەکرد، کە مەعناکەی تەواو گۆری. کاتێ گەییە ئەم ڕستەیەی کە "تزار، کە حاڵی حازر بەم باشیە، حوکمڕانیمان دەکات، کە دەسەڵاتی گرتە دەست سەیری کرد جامەکە پڕ بووەو لێی دەڕژێ.." ئیدی هاوار و هورا قسەکەیان پێ بڕی، دەرفەتی ئەوەیان نەدا، قسەکەی تەواو بکات و ئەوە ڕوون بکاتەوە کە ئەلکساندری دووەم چەند "دڵۆپەیەکی تاڵ و ژەهراوی کە بەهۆی مانەوەی بەردەوامی کۆیلایەتیەوە مابووەوە" ڕشتبووە دەرێی جامەکە.
بۆ سبەینێ خەڵکی خەبەریان زانی کە مامۆستای ناڤبری لە پایتەخت دوور خراوەتەوە. ئیدی هاوکارەکانی بەمەبەستی هاودەردی دەگەڵ ئەودا، مانیان لە دەرس گوتنەوە گرت. جا حکومەت بەمەبەستی دامرکاندنەوەی هەڵچوون و توورەیی خەڵکی، دەرس گوتنەوەی گشتیشی قەدەغە کرد. دوستویفسکی کە لە کۆرەکەی ٢/ئازاردا، وەکو گوێگر بەشداری کرد بوو، لە ڕۆمانی شەیتانەکاندا، باسی کۆبوونەوەیەکی وتار خوێندنەوە دەکات، کە لەڕاستیدا،

ئەمـە شــەرح و شــرۆڤەی هــەمان کۆبوونەوەیــە: "هــورا و هــاواری ئاپۆڕاکــە، نەیدەهێشــت، دوا وتــەکانی وتـار بێـژ بگاتـە گـوێ، هاواریـان دەکـرد، چەپڵـەیان لێدەدا. هەنـدێ لـە خانمـەکان هاواریـان دەکـرد: "بەسـە! بەسـە، باشـتر وایـە قسـە دەکەن!" (ڕوانە شـەیتانەکان. لەژێر سـەرناوی: ئاهـەنگ." هەرچەنـدە، زانســتگەکەی شـار داخـرا بـوو، بـەڵام شۆڕشـگێڕان بەجـدی خـەریکی کـاری خۆیـان بـوون. کۆمەڵـەی نهێنـی زۆر بـوون. چرنیشـفسـکی و ئـوتین کـە لـە نووسـەران و هاوکـارانی ڕۆژنامـەی سـەردەم بـوون. لەگـەڵ کەسـانی وەکـو لاڤـروڤ، کۆڵـۆنێکی تۆپخانــەدا کۆمەڵــەی زەوی و ئــازادی)یــان دامەزرانــد. بڵاوکـراوەێن شۆرشــگێری، بــە مەبەســتی هانــدانی خــەڵک بــۆ دژایــەتی "حکومەتی تزاری کە خراترین دژمنـی گەلـە" بـە نهێنـی دەخرایـە ژێـر دەرگـای ماڵانەوە. ئەم بڵاوکراونە پڕ بوون لە دروشـمی وەک: "بـژی کۆمـاری سوسـیال دیموکراتێکی ڕووسـیا!" یا "هەموو بەیەک دەنگ هاوار دەکـەین، دەسـت بدەنـە تەور!" هەروەها لەو بڵاوکراوانەدا دروشـمی مردن بۆ ئەنـدامانی حیزبـی تـزاری کـە بـەزەییان بـە ئێمـەدا نایەتـەوە بـەرز کرابـووەوە و ئـەم دروشـمانە دەبینـران: "ئەگەر ئەم نامەردانە، زاتیان کرد و لە مەیدانەکاندا دەرکـەوتن لێیـان بـدەن، لـە ماڵـەکانی خۆیانـدا بچنـە سـەریان، لـە کوچـەو کـۆڵانی شـاروچکەکاندا، لـە شـەقامە گەورەکانی شارە مەزنەکاندا لە گوند و ئاواییەکاندا، لـە هـەر کوێیـەک تووشیان بوون، لییان بـدەن." هـەروەها لـەو بەیاننامـەو بـڵاو کراوانـەدا هـاتبوو: "لەسـەرانســەری ڕووســیادا، ســەد هــەزار کەســێک دژی خۆشــگوزەرانی گشـتین، شــەامی شـارەکان پـڕ دەکـەین لـە خـوێن، بـەرد بەسـەر بـەردەوە نایـەڵین!" ڕۆژێـک دوسـتویفسـکی، یـەکێک لـەو بانگەوازانـە، کـە ئاڕاسـتەی ڕووسیای جەوان بوو، بە دەسکی دەرگای ماڵەکـەیەوە دەبینـێ. زۆر پەسـت و توورە دەبێت. لە ڕۆژانە یاداشـتەکانی نووسـەرێکدا دەڵێـت: "مـن، کـە زۆر لـەمێژ بـوو، بـەدڵ و بـە فیکـر، پیچەوانـەی ئـەو خەڵکـە بـووم و دەگـەڵ جەوهـەری بزوتنەوەکەیاندا نەبووم، ئێستا شەرمم لە کارە ناشیانەو مندڵانـەکانیان دەکـرد، ئازارم دەچەشت. ئەوەی لەم بانگەواز و بەیاننامانەوە بەدی دەکرا ئەوە بـوو کـە ئاستی پەروەردە و ئەقڵی ئەمانە زۆر نزم بوو."

دەچێت بۆ ماڵی چیرنیشفسکی، کە هاوکاری ڕۆژنامەی سەردەم و ئەندامی کۆمەڵەی (زەوی و ئازادی) بوو، تا تکای لێبکات کە قسە دەگەڵ نووسەرانی ئەو بانگەواز و بەیاننامانەدا بکات و ئامۆژگارییان بکات کە وەخۆبێنەوە و دەستبەرداری ئەو هەڵایە ببن. چرنیشفسکی زۆر بەساردی وەڵامی دەداتەوە کە: "باوەڕ ناکات ئەو شتانە کار لە ڕەوشـی گشتی جەماوەرەکە بکات. ئەم جۆرە دیاردانە، لەم جۆرە ڕووداوانەدا، هەر دەبێت و نابێ ئەوەندەش بەهەند بگیرێ."

لە ١٦/ئایاردا، لە سان پتروسبۆرگدا ئاگری گەورە و نادیار دەکەوێتەوە، وێڕای هەوڵ و کۆششـی بێ وچانی پۆلیس و دام و دەزگای ئاگر کوژانەوە، گەڕەکی وا هەبوو بە تەواوەتی و بەدرێژایی دووهەفتەی تەواو، لە سووتانی بێوچاندا بوو.

ستراخوف لەو بارەیەوە دەنووسێت: "لەبیرمە کە دوستویفسکی و من، بۆ پیاسە و گەڕان چووبووینە دەرێی شار. لە دوورەوە، لەسەر بەلەمەکەوە، دووکەڵ، لەسێ چوار شوێنی شارەوە، وەکو شەپۆل دەچوو بە ئاسماندا. لە بەخچەیەکدا لامان دا، کە تیپێکی موزیک، موسیقای لێدەدا و هەندێک کور و کچی گەنجی قەرەجی گۆرانیان دەچڕی."

حکومەت نەیتوانی، ئەو کەسانە بدۆزێتەوە کە ئاگرەکەیان لەشار بەردا بوو. بەڵام گومان لەسەر نەهلیستیەکان، ئەندامان و لایەنگرانی کۆمەڵەی (زەوی و ئازادی) بوو. ڕۆژنامەی سەردەم بۆماوەی هەشت مانگ داخرا و قەدەغە کرا. دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم چیرنیشفسکی شۆرشگێر، دەستگیرکراو خرایە زندانی قەڵای پیترو پولەوە.

بەڵام دۆستویفسکی کە لە ڕووداوە سیاسیەکان بێزار و لە کاری سەرنووسەری گۆڤارەکە، ماندو بوو بوو، بڕیاری دا کە سەفەرێکی هەندەران بکات. لە مێژ بوو، پزیشکان ئامۆژگاریان دەکرد کە سەفەرێکی هەندەران بکات و بۆ چەند مانگێک پشوو بدات. بەڵام لەبەر بێپارەیی و دەستکورتی نەیدەتوانی ماری دیمیتریڤنای خێزانی دەگەڵ خۆیدا ببات. ئەمە جگە لەوەی کە (ماری)ش حەزی نەدەکرد (پولی) کوڕی بەتەنیا لە سان پتروسبۆرگ بەتەنیا بەجێ بێڵێ. لە کاتێکا پول خۆی بۆ تاقیکردنەوەی دوا قۆناغی خوێندنی سەرەتایی ئامادە دەکرد تا بچێتە قۆناغی خوێندنی ناوەندی و پێویستی بە کەسێک بوو چاودێری بکات. ئەوە بوو دۆستویفسکی لە ١٨٦٢/٦/٧دا بەتەنیا سەفەری ئەوروپای کرد.

## فەسڵی دووەم
## یەکەمین سەفەری ئەوروپا، مەسەلەی پۆلۆنیا

دوستویفسکی لە دەوروبەری نیوەی مانگی حوزەیراندا، دەگاتە پاریس، بەڵام لەم پایتەختەدا نەکەس ئەوی دەناسی و نە ئەو کەسی دەناسی. نە هۆگۆی، کە لەو ڕۆژگارەدا سەرقاڵی نوسین و بڵاوکردنەوەی بێنەوایان بوو، نە فلوبیری، کە خەریکی بڵاوکردنەوەی سلامبو بوو، بینی... نە تیوفیل گوتیەی، کە تازە لە نووسینی کاپتین فرکاس بوو بووەوە بینی و نە بە دیداری ڕینان، سانت بیف و تین، شاد بوو ئیدی ماوەیەک بە تەنیا مایەوە، هەستی بە غوربەتێکی ترسناک دەکرد و پەشیمان بوو لەوەی ڕووسیای بەجێهێشتبوو. نامەیەک بۆ ستراخۆف دەنووسێت و دەڵێت: "پاریس، یەجگار خەمناکە، خۆ ئەگەر ژمارەیەک بینای مێژووی و دەگمەنی تیا نەبوایە، لە بێتاقەتیدا دەمردم."

تەنیا دە ڕۆژێک لە فەرەنسا مایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ دەرکەوت کە "فەرەنسا وڵاتێکی ئارامە، نەجیب و شارستانیە، بەڵام بەڕێی هەڵەدا دەڕوات و جگە لەپارە هیچ شتێکی دیکەی بەلاوە گرینگ نییە."

بەلەز فەرەنسا، بەرەو ئینگلتەرا بەجێدێڵێت. لە لەندەن هرتزنی نەهلیست دەدۆزێتەوە. هەرچەندە لە ڕووی ڕاو بۆچوونی سیاسییەوە، زۆر لێکدی جیاواز بوون، بەڵام جۆرە ئولفەتێکیان لەنێواندا چێدەبێت. هرتزن، لە نامەیەکدا بۆ ئوگاروف دەنووسێت: "دوێنێ دوستویفسکی لەلای من بوو. کەسێکی ساویلکە و هەندێک کۆنگ و پرێک شپرزە و نیگەرانە، بەڵام یەجگار بەئەدەبە، باوەڕ و متمانەیەکی یەجگار گەرم و گوری بە میللەتی ڕووسیا هەیە." دوستویفسکی کاتێ سەردانی هرتزن دەکات. نەرمیەکی یەجگار زۆری بەرانبەر دەنوێنێ، بەڵام پاشان، دوای چەند ساڵێک بەتوندی سەرزەنشتی هرتزن دەکات کە خیانەتی لە ڕووسیا کردووە. لە ڕۆژانە یاداشتێن نووسەرێکدا دەنووسێت: "هرتزن، هیجرەتی نەکردوووە، ئەو بەموهاجیری لەدایک بووە. ئەمانە کە لە میللەتی خۆ جیابوونەتەوە و داپڕاون، بە تەبیعەت خودای خۆیان لەدەست داوە. ئاساییە کە هرتزن، لەژێر باندۆر و کاریگەریی نۆرین و بیروباوەڕی تایبەتی خۆیدا و نەبوونی هیچ جۆرە هەستێکی سۆزداری سەبارەت بە نیشتمانی خۆی کەسێکی سوسیالیست بێ. ئەو باوەڕی بە پەیوەندی خێزانداری نییە، هەرچەندە پێدەچێ باوکێکی باش و مێردێکی باش بێت. ئەو موڵکایەتی ڕەت دەکاتەوە، بەڵام زۆر چاک دەزانێ، کە کاروباری خۆی بەڕێوە ببات، خۆشحاڵە کە لە هەندەران، دووچاری هەژاری و دەستکورتی نەبووە و حاڵی باشە. خەڵکی بۆ شۆڕش هاندەدات، کەچی لە ماڵی خۆیدا هەموو هەوڵێکی لە پێناوی خۆشگوزەرانی و ئارامیدایە."

بەهۆی لوتف و ڕێنوێنیەکانی هرتزنەوە، لەندەن بۆ فیدور میخائیلوفیچ، کەمتر لە پاریس مایەی بێزاری بوو. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "شەقامەکانی بەهۆی گڵۆپی گازەوە، کە ئێمە تا ئێستا بە خەویش نەمان دیتووە وبیرمان لێنەکردووەتەوە، ڕوناکن. هەر چەند هەنگاوێک دەڕۆیت، کافێ و گازینۆی ڕازاوەو دڵگیرت دێتە ڕێ. خەڵکی دەچن بۆ ئەو گازینۆ و کافانە، لەوێ، کۆدەبنەوە و قسان دەکەن."

بەهەرحاڵ، لە ٧/٨ دا بۆ پاریس دەگەڕێتەوە. لەوێوە کاغەزێک بۆ ستراخوف دەنووسێت، کە بێت بۆ هەندەران و لە سویسرا و ئیتاڵیادا یەکبگرنەوە. ستراخۆف، بەگوێی دەکات، قەول و قەراریان وادەبێ کە لەجنیف یەکدی بگرنەوە. دۆستویفسکی لەڕێگای کولونیاوە بۆ ئەوێ دەڕوات: کولونیا، دوسلدروف، ماینس، و بال. لە ٧/٢٢دا، لە جنیف، ستراخوف دەدۆزێتەوە. جووتە هاوڕێ، زۆر بە بێتاقەتی ئەم شارە دەگەڕێن. فیدورمیخائیلوفیچ، ئەو شارە، بەشارێکی "تاریک و خەمناک" وەسف دەکات. ئیدی لە جنێفەوە، بۆ لوسیرن، تورن و جێنس دەڕۆن، لە شاری (جێنس)ەوە بەسواری کەشتی بەرەو لیڤۆرن دەڕۆن و لەوێندەرەوە بەسواری قیتار بۆ فلورەنسا دەڕۆن. بەڵام دۆستویفسکی ئوسوڵی سەفەر نازانێت. بەو دیارو دەڤەرو وڵاتانەدا، دەڕۆیی و دەگەڕا وەکو ئەوەی بەدەم خەوەوە پێیاندا تێپەڕێت. لە خەون و خەیاڵەکانی دەروونی خۆی بێدار نەدەبووەوە، مەگەر کاتێ بیویستایە تەمەشایەکی پڕ قێز و بێزی بابایەکی بوژرواى ورگنی، دانیشتووی ناو کافەیەک بکات. یان بیویستایە تەمەشای ژنێکی خاوەن خانووی بەکرێ، کە بەدەنگی بەرز بپژمایە و لووتی بسڕیبا، بکات. ئیدی زۆر بەخێرایی وەزعی نالەباری ژیانیان، شادیە بە باچووەکانیانی، وێنا دەکرد و وەکو کەروێشک کەوڵ بکات، بەو ئاوایە کەوڵی دەکردن و توێکاری دەکردن. بەڵام دیکۆر و ڕواڵەتەکانی بەشتی ڕەوتەنی دەزانی. دوستویفسکی جگە لە ئینسان هیچی دیکەی نەدەبینی، دیدی ئەو لە سنووری ئینساندا دەسوڕایەوە، دیمەن و ڕواڵەتی بەلاوە گرینگ نەبوو. کە باسی جادەکانی شاری "تورین"ی دەکرد و سەرنجی دەدان، تەنیا بەو مەبەستە بوو کە بەشەقام و جادەکانی سان پتروسبۆرگیان بەراورد بکات. دیمەنی ڕوباری ئارنۆ، ڕوباری فۆنتانکای بیردەخستەوە. ستراخوف دەنووسێت: "نەسروشت، نە کۆشک و تەلارێن مێژوویی و نە شوێنەوار و کارێن هونەری سەرنجیان ڕانەدەکێشا، هەموو هۆش و گۆشی بەلای خەڵک و ژیانی خەڵکیەوە بوو."

سەرەنجام، دوای ئەوەی یەک هەفتە لە فلورەنسا مانەوە، ستراخوف لێدەبرێت بۆ پاریس بگەڕێتەوە و دۆستویفسکی بۆ ڕووسیا دەگەڕێتەوە. دۆستویفسکی هەرکە دەگاتەوە سان پتروسبۆرگ، بیرەوەرییەکانی ئەم سەفەرەی خۆی دەنوسێتەوەو لە گۆڤاری زەماندا بڵاوی دەکاتەوە، ئەم بیرەوەریانە لەژێر سەرناڤی "بیرەوەریانی زستانی دەربارەی هەستێن هاوینە" بڵاودەبنەوە. لەم یاداشتانەدا بە تەوس و توانج و زمانێکی پڕ تەنز و تەوسەوە باسی ئەو وڵاتانە دەکات کە دیتبوونی. بۆ نموونە دەنووسێت: "تۆ هەرگیز

ناتوانی ئەم بیرە لە مێشکی فەرەنساییەک، یانی پاریسـیەک (چونکـە هـەموو فەرەنسییەک خۆی بە پاریسـی دەزانێ) دەربێنی و بیسپڕیتەوە کە ئـەو یەکـەم پیاوی سـەر ڕووی زەوییە، هەرچەند جگە لـە پـاریس، هـیچ شـوێنێکی دیکـەی جیهان ناناسێت، بەلاشیەوە گرینگ نییە کە بیناسێت. ئەمە لـە نـۆڕین و دیـدی ئەوانەوە دەکاتە نیشتمانپەروەری.
"هــەمو ســالێک، لــە کــاتی گونجــاو و دیــاریکراودا، گرینگتــرین مەســەلەێن سـیاسـی، لـە ئەنجوومـەنی نوێنـەران، دەخەنـە بـەر بـاس و گفتوگـۆ. پاریسـی سـەبارەت بـەم گفتوگۆیانـە حەساسـیەتی تایبـەتی هەیـە. لـەم گفتوگۆیانـەدا زیاتر لەدووی بەلاغەت و فەساحەتی قسـە کردندایە، بـە بۆچـوونی ئـەوان ئێـرە جێگای بەلاغەتە. کاریکی قـانوونی دیکـە کـە بورژواکـان ڕمـوودەین، بەتایبـەتی بورژاوایانی پاریسـی و تا ڕادەیەک کارێکی جوانـە، ئەوەیـە کـە بەسـەرگیادا تـل بخۆن و گوایە ئەمە نیشانەی سروشـت دۆسـتی ئەوانە. سـەبارەت بـە ئەشـق و ڤیان؟ وەختێ بابـای بـورژوا دەیـەوێ هەسـتی خـۆی دەرببڕێـت، یـا ژنەکـەی فریو بدات هەمیشە بانگی دەکات: "ئاسکەکەم!" ژنەکـەش، بەوپـەڕی شـادی و ڕووخۆشــییەوە بــورژوا ئازیزەکــەی بــە "بەرخەکــەم" بانــگ دەکــات. بــەلای پاریســییەوە، زۆرجــار ئەشــقێکی دەســتکردی بــاش، هاوتــای ئەشــقێکی ڕاستەقینە دەکاتەوە."   دوستویفسکی هـەر هـەموو ئەمانـەی لـەو یەکـەمین کورتـە سـەفەرەدا بـۆ پـاریس کەشـف کـرد. بـەڵام سـەبارەت بـە لەنـدەن، بـە شـارێکی قـەرەباڵغی جـەنجاڵ و پڕ جـم و جـوڵی وەسـف دەکـات: ئـەو هێڵـی ئاسـنانەی بەسـەر ماڵەکانەوە دەڕوات (بەو زووانـە بـەژێر ماڵەکانیشـدا دەبـرێن) ئەم دەست پێشـکەری و داهێنانە گەورانـە، ئـەم پەشـێویە ئاشـکرایەی کـە لـە بنەڕەتدا، لە قوڵایی سیسـتەمی بورژواییـدا هەیـە، لـە لوتکـەی خۆیدایـە، ئـەو ڕوبارە، مەبەستم تایمزە، کـە ژەهـراوی بـووە، ئـەم هەوایـە کـە ئاوێتـەی تـۆز و غوباری خەڵوزی بەرد بووە، ئـەو مەیـدان و پارکـە گشـتییە جوانانـە، گـەڕەکانی پەرپوت و بێ سـەروبەی وەکو وایت چاپل و خەڵکە هـەزار و نیـوە ڕووتەکانیـەوە، کە هەموو نیمچە کێوی و برسین. ئـەم مەملەکەتـە بـە ملیۆنـان خەڵکـەوە، بـە هاتوچۆی بازرگـانی نێودەوڵەتییـەوە.." وای وێنـا دەکـرد کەوتووەتـە پەرسـتگەی بەعلــەوە. (بــەعل: نــاوی خــوا و پەرســتگەی بابلــە، ڕەمــزی گەندەڵیــە) وای هەســـت دەکــرد کەهــەموو ئــەوروپا، گشـــت ڕۆژئــاوا بــەهۆی پێشـــکەوتنی شارسـتانیەتـی تـازەوە گەنـدەڵ بـووە، شـێواوە و تیـا چـووە. ئـەم وڵاتـە بـێ خودایانە، ئەم وڵاتانەی ژێر دەسـەڵاتی ئینسان. ژێر دەسـەڵاتی پـارەو دارایـی، زانسـت و حیسـاب، بـەرە بـەرە لـەژێر ئـەم سـەروەت و سـامانەدا، لـەژێر ئـەم کێشـە و گرفتانـەدا کـە خۆیـان دروسـتیان کـردووە، حەفـە دەبـن، ڕزگـاری لـە شوێنێکی دیکەدایە، ڕزگاری بەشـەر لە ئەستۆی میللەتێکی تـازەدایە، ئـەویش میللەتی ڕووسـە، کە پەروەردەو تەربێتی ئاسایی خۆی پاراسـتووە و نەلـەوتاوە، کە تاکو ئێسـتا بـاوەڕ و ئیمـانی سـادەی دەورانـی منداڵیـەتی بەسـەریدا زاڵـە. میللەتی ڕووس لە ئاستانەی دەرگای مێژوودا، چاوەڕوانی هاتنـە ژوورەوەیـە بـۆ ئەوەی دەوری خۆی بدینێ. ڕووسیا ئەوروپا ڕزگار دەکات.

وێڕای ئەم جۆرە هزرینەش، دەبینێ کە لەسەرەتاکانی ساڵی ١٨٦٣ وە هەر هەموو ئەوروپا دژی ڕووسیا وەستاوە. کاتێ لەساڵی ١٨٥٦دا تزار دێت بۆ وارشۆ، داوا لە هاووڵاتیانی پۆڵاندی دەکات کە ڕابردوو فەرامۆش بکەن. پێی گووتبوون: "دەبێ دەست لە خەیاڵ پڵاوان هەڵگرن، من لەو باوەڕەدام کە ئێوە هەرگیز ناتوانن بەختەوەر بن، تا پۆڵۆنیا، وەکو فنلەندا، پەیوەندی نەکەن بەو ماڵباتە مەزنەوە کە ئیمپراتۆریەتی ڕووسیای دامەزراندووە."

لەساڵی ١٨٦١دا، قەرارێکی پاشایی دەرچوو، کە بەگوێرەی قەراری ناڤبری پۆڵنیا هەقی ئەوەی هەیە ئەنجوومەنێکی دەوڵتی لە ئەندامانی پۆڵاندی دابمەزرێنێ و بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆ، ئەنجوومەن پێک بهێنن و بە هەڵبژاردن نوێنەری خۆ هەڵبژێرن. هەروەها بەگوێرەی ئەو قەرارە مافی ئەوەیان درایە کە دادگاکان، قوتابخانەکان، کاروباری کڵێسایی وئاینی بخرێتە ئیختیاری لیژنە و ئەنجوومەنی تایبەتی پۆڵۆنیەوە. ئیدی پۆڵاندییەک بەناوی فیلیوپولسکییەوە، کرا بە سەرۆکی دەزگای کارگێڕی وڵات و دۆقی گەورە کونستانتین نیکولایوفیچ کە بە کەسایەتیەکی لایەنگری ئازادی و ڕیفۆرم بەناوبانگ بوو، بەجێگری پاشای پۆڵاندا، دانرا.

فیلیوپولسکی، پیاوێکی میانڕەو بوو، بەڵام لە پولونیاشدا وەکو ڕووسیا، نەرمکێشی و میانڕەوی ڕژێم، ئاگری تووڕەیی خەڵکانی ناڕازی، نەک دانەدەمرکانەوە، بەڵکو بڵێسەی پێدەدا. ئەو چاکسازی و مافانەی لەلایەن تزارەوە کران و دران بە پۆڵاندییەکان، بە نیشانەی لاوازی حکومەت لەقەڵەم دران و لێکدرانەوە. ئەوە بوو، پیلانێک لە دژی کونستانتین نیکولایوفیچ، لە پۆڵاندادا، گێردرا. ئەنجام لە ١٦/ک٢/١٨٦٣، بە ئاشکرا، ئاگری ڕاپەڕین بڵێسەی بەرزبووەوە. کۆمەڵێک لە شۆڕشگێڕان، لە شوێنانی جیاوازەوە، چ لە پۆڵاندا و چ لە لیتوانیادا، پەلاماری سوپاییانی ڕووسیان دا. ئەوە بوو زۆر بەتوندی، بەرپەرچی یاخیەکان درایەوە و سەرکوت کران. لە لیتوانیادا، موراڤیف، کە بەخاوەنی سێدارە بەناوبانگ بوو. ڕای گەیاند بوو، کە دەستگیر کردنی شۆڕشگێڕان کارێکی بێهودەیە و جەنەڕاڵ بیرگ لە پۆڵۆنیا، بە قەتڵ و عامەکەی فیشاو، ناوبانگی دەرکرد و ناوی کەوتە سەر زاران.

فەرەنسا و ئینگیستان و نەمسا، ئەم تۆڵە ئەستێنییە خوێناویانەیان پێناخۆش بوو، بەڵام ڕووسیا، گوێی خۆی لە ئاستی هەڕشە و گورەشە و ناڕەزاییەکانی ئەواندا خەواند و گوێی نەدانێ.

هیرتزنی شۆڕشگێر، لە لەندەنەوە، داشداری لە پۆڵۆنیەکان دەکرد: "بۆ ڕاگرتنی حکومەتێک کە سەبەبکاری نەگبەتی ئێمە و خەڵکی پۆڵاندایە، ئێوە ناچارن، پەناوەبەر چەک و تاوان و خەتای ئاشکرا و زەق ببەن. ئێوەش، بێهیچ سڵکردنەوەیەک ڕوو بەڕووی جەلادان ببنەوە. زەبت و ڕەبتێک کە ئینسان ناچار بکات، کە تاوان بکات، ئیدی ڕەچاو کردنی زەبت و ڕەبت مانایەکی نامێنێ."
هەڵبەتە ئەم هەڵوێستە بۆ ڕۆژنامەکەی هیرتزن (زەنگ) هەڵەیەکی قورس بوو. چونکە ئازادی و سەربەخۆیی پۆڵاندا دەیکردە جیابوونەوە لە ئیمپراتوریەتی ڕووسیا. بەلای ئازادیخوازانی ڕووسەوە، پەیرەوی کردن لە ڕێبازەکەی هیرتزن ،

بـەجۆرە خیانـەتێک لـە وڵات دەژمێـردرا. زۆربـەی هـەرە زۆری ئـەم ئـازادیخواز و لیبڕاڵانە، نەگەیی بوونە ئەو ئاستە فیکرییەی کە بەرژەوەندی مرۆڤانی، بخەنـە سـەرووی بەرژەوەنـدی نیشـتمانی ونەتەوەییـەوە. پۆڵاندییـەکان پـەلاماری ڕووسـەکانیان دەدا. ڕووسـەکان دەجـەنگین. خـوێنی ڕووسـەکان لـە پۆڵانـدادا دەڕژا. هەندێ لە هێز و دەسەڵاتە دەرەکیەکان دەیانویست، خـۆ لەمەسـەلەکە هـەڵقورتێنن و نـاوبژیوانی خۆیـان بەسـەر ڕووسـەکاندا بسـەپێنن. غـروور و کبریـانی نیشـتمانپەروەری تـەواو جـولا بـوو، بەڕادەیـەک کـە لیبڕاڵـەکان و سلاڤدوسـتەکان خۆیـان لەیـەک سـەنگەردا دەبینییـەوە. ئاسـتی فـرۆش و بڵاوبوونـەوەی ڕۆژنامـەی زەنـگ زۆر بـەخێرایی دابـەزی و دایـە کـەمی. هیرتـزن ناچار بوو، دەستبەرداری کاری پروپاگەندەیی ببێت.

لەجەرگـەی ئـەم کـەش و هـەوا تونـد و گـەرم و گـوڕەدا بـوو کـە سـتراخوف وتارێکی گرینگ و دوورودرێژی دەربارەی پرسـی پۆڵانـدا بـە ناونیشـانی "پرسـە شـوومەکە" نووسـی. لـەم وتـارەدا، کـە پڕێـک شـەقڵی تیـۆری لـەخۆ گرتبـوو و هەندێک کۆنگ و ئاڵۆز بوو، نووسـەر، پۆڵاندییەکان لەو ڕووەوە مـەحکووم دەکـات کە بەشداری فەرهەنگی ڕۆژئاواییان کردبوو. هەروەها کاتولیـک بـوونی گـەرم و گوڕی پۆڵاندییەکان، غروور و خۆبـەزلزانی پۆڵاندییـەکان بەرانبـەر بـە میللـەتانی دەرودراوسـێ، بە دوور و درێـژی لـەم وتـارەدا خرابوونـە ڕوو و تـاوتوێ کرابـوون و مەحکووم کرابـوون. جـا نووسـەر بـۆ ئـەوەی بەشـێوەیەکی ڕوونتـر و ئاشـکراتر، بێهودەیی و بێ مانایی داخوازییەکانی پۆڵاندییەکان، ڕوون بکاتـەوەو دەرببڕێـت، وای نواند بوو کە بەناوی پۆڵاندییەکی دژمنـی ڕووسـیاوە قسـان دەکـات. ئەمـە بیرکردنـەوەی جـەماوەری خەڵکەکـەی پەشـۆکاند. سلاڤدۆسـتەکان، وایـان لێکدایـەوە کـە ئـەم پرسـە شـوومە، بـەرەنجامی خیانـەت و پـەیمان شـکێنی، بەڕێوەبـەران و نووسـەرانی گۆڤارەکەیـە بەرانبـەر بـە دۆز و میللـەتی ڕووسـیا. ڕۆژنامەی "گازت دوستویفسکی" بەتوندی هێرشـی کردە سـەر گۆڤاری زەمان، بەهۆی ئەو وتارەوە کە بەقازانجی پۆڵاندییەکان بڵاوی کردبـووەوە. پۆڵاندییـەکان و لایـەنگرەکانیان، سـتراخوفیان بـە یـەکێک لـە لایـەنگر و داشـدارەکانی خۆیـان زانـی. لـە فەرەنسـادا گۆڤـاری دوو جیهـان، کـە دژمنـی ڕووس بـوو، وتارەکـەی ستراخوفی دووبارە بڵاوکردەوەو دووپاتی کردەوە کە وتارەکە تـەواو دەگـەڵ ڕای گشتی دنیای شارستانیەتدا تێکدەکاتەوە.

ئەنجام، لە ١٨٦٣/٥/٢٤دا بەفەرمانی وەزیری ناوخۆ گۆڤاری زەمان، بە تۆمەتی، پیلان و دژایەتی ڕەوت و ڕێباز و خەتی کارکردنی حکومەت و دژایەتی نیشتمانپەروەری داخرا.

ئیـدی هەر هـەوڵ و کۆششـێکی میشـێل و ناڕەزاییـەکی دۆسـتەکانی، بـۆ ئـازادکردنی گۆڤارەکـە بێئەنجـام بـوو. سـتراخوف، بـە خۆیشـی سـەری لەمـە سووڕما بوو. دۆستویفسکی کـە بـەهۆی ئـەم هـەراو هەنگامـە گەوجانەیـەوە، لـەکاتێکا گۆڤارەکـەی خـەریک بـوو سـەرکەوتوانە جێـی خـۆی دەکـردەوە، زۆر بێتاقـەت و نیگـەران بـوو، هـەموو هـزر و بیرێکـی هـاتبووە سـەر ئـەوەی کـە سـەفەرێکی هەنـدەران بکـات و کـەمێک ماندوویـەتی خـۆی دەربکـات و بـای

باڵێکی خۆی بدات. ئیدی بڕی هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵی لەسەندووقی ئەدەبی قەرزکرد، بە زەمانەتی هەموو بەرهەمەکانی و بەو مەرجەی پێش مانگی شوباتی ١٨٦٤ قەرزەکانی بداتەوە. بەڵام ئەمجارەیان بەتەما نەبوو بە تەنیا سەفەر بکات.

## فەسڵی سێیەم
## دووەم سەفەر بۆ ئەوروپا
## پولین سوسلوڤا.

دوستویفسکی لەوەتای لە تفیر هاتبووەوەو لە تاراوگە گەڕابووەوەو لەسان پتروسبۆرگدا ئاکنجی بوو بوو، ژیانێکی پڕ جم و جوڵ و چالاکی ڕۆشنبیریی دەگوزەراند. کاری ئەو لە بوارێن ڕۆماننووسی و ڕۆژنامەوانی و وتارێن جۆرا و جۆر لە بوارە جیاوازەکاندا، بەتەواوەتی سەرقاڵی کردبوو. هەمیشە نیگەران و ماندوو بوو، بە عەزرەتی ئەوەوە بوو دوور لەکارو چالاکی ئەدەبی، تاوێ لەپاڵ ژنەکەیدا بحەسێتەوە. بەڵام ماری دیمیتریڤنا نەخۆش بوو. گۆناکانی بەجۆرێ قوپابوون و چاوانی بەچەشنێ بە قووڵا چووبوون، لەتۆ وایە دەمامک و ماسکی مردووانی لەسەر کردووە. لووتی گیرا بوو، لێوەکانی بە جۆرێ سست و زەرد بوو بوون، لەتۆ وایە لە گیانەڵلاندایە. ئەمە جگە لەوەی کە دوستویفسکی خۆشنەدەویست و ئەمەی ڕووبەڕوو و بەدەنگی بەرز پێ گوتبوو. لە هەموو بۆنەیەکدا، لە بچووکترین دەمبۆڵەو قەرقەشەدا، گلەییە کۆنەکەی خۆی دووبارە دەکردەوە: "من نەدەبوو شوو بە تۆ بکەم. ئەگەر شووم بەتۆ نەکردبا، بەختەوەرتر دەبووم، من هەست دەکەم بارم بە سەرتۆوە، من تەنیا بەحوکمی وەزیفە لەگەڵ تۆ دەژیم. دڵنیام لەمە." هەر یەکێک لەو قسانە کاریان لەناخی دڵی دوستویفسکی دەکرد. لەنامەیەکیدا بۆ بێوەژنەکەی

بیلینسکی، بەخەمبارییەوە دەنووسێت: "من هاوسەرم هەیە و نەخۆشم ،کاری ئەدەبی دەکەم و، ڕۆژنامەیەک بەڕێوە دەبەم."
هەڵبەتە زۆری پێویست بە ئیسراحەت و پشوو هەبوو. دەبوایە لەم ژووره تەنگە. لەو ژنە لەشبەبار و نەخۆش و پەژمردەیە کە بەردەوام گلەیی لە بەختی خۆی دەکرد، باسی ڕابردووی خۆی دەکرد، هەڵێت، دوور بکەوێتەوە. ئەم ژنەی کە هەندێجار ئەوی تاوانبار دەکرد و هەندێجار خۆی و وەکو کەسێک تووشی هیستریا بووبێ، لە هۆڕژنی گریانی دەدا. بەڵام دوستویفسکی بە عەزرەتی ئەشقێکی بێگەردەوە بوو، بەخەیاڵ، خەوی بە ژنێکی گەنج، ڕوح سوک، خەنۆڵ و بەکەشم و نەشم، پڕ نازو عیشوەو، ئاشق و دەم تەڕو شیرین بەیانەوە دەبینی، بە عەزرەتی ئەشق و قیانێکی پڕ جۆش و گەرم وگوڕەوە بوو. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٦٠وە دۆستویفسکی ئاشق و دڵبەندی (شوبیرت)ی ئەکتەر دەبێت. ئەمە ژنێک بوو بزێو، بەجۆش و خرۆش و کراوە ڕوو خۆش و ڕوودار، بەڵام دوستویفسکی بۆ ئەو جگە لە دوست و هاوڕێ و خولام، نەیدەکردە هیچی دی. بۆ خزمەتی خۆی بەکاری دێنا. دوستویفسکی بە خۆیشی ئەم دەورەی قەبووڵ دەکرد. لەسەر ئەو جۆرە دەورانە ڕاهاتبوو. بە مەمنوونی و شادییەکی نائاساییەوە. ناوبژی نێوان ئەم ژنە و مێردەکەی، یانوفسکی دەکرد، هەڵبەتە بێئەوەی ئەشقی خۆی دەربڕێت، ئاشقی ئەم ژنە بوو، خۆی فیدای ژنێک دەکرد کە ئامادە نەبوو ئاوڕی لێبداتەوە. وەکو چۆن هەمان ڕێبازی دەگەڵ مەدام پانایف و (ماری)شدا گرتبووە بەر. جا لەم پەیوەندی و بەرخوردە شیرینانەدا، تەنیا لەزەتی هاورێیاتی پێ دەبڕاو هیچی دی. زۆری لەزەت و خۆشی لەمە دەبینی بەخۆی دەڵێت ئەگەر کەمترین تواناو بەهرەی شاعیریم تیا بوایە، دەیان قەسیدەم بۆ ئەم ژنە گەنجە دادەنا.
لە ١٨٦٠/٦/١٢دا نامەیەکی بۆ دەنووسێت: "من بەدڵ و گیان تۆم خۆش دەوێ. من پێمگوتیت تەنیا لەبەرئەوە خۆشم ناوێی کە متمانەت پێم هەبێت، خودایا! چەندم پێناخۆش بوو کە هەستم کرد، وەکو جاران متمانەم پێناکەیت. بەڵام نامەکەت، هەموو شتێکی چاک کردەوە. هاوڕێ ئازیزەکەم، لەخوا دەپاڕێمەوە، هەموو جۆرە خۆشی و شادییەکت بەسەرا داباریێنێ! من زۆر خۆشحاڵم کە دڵنیا بووم تۆم خۆش ناوێ! ئێستا دەتوانم لەجاران دڵسۆزترت بم، بێئەوەی لەوە بترسم هەستم بریندار ببێت. بە ئومێدی دیدار، کۆترە چکۆلەکەم. بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە، دەستە چکۆلەو ناسک و سرکەکانت ماچ دەکەم و بەدڵ و بەگیان لەنێو دەستانی خۆمدا دەیانگوشم."
هیچ کەسێک نازانێت دۆستویفسکی، چ مودەتێک دیل و گرفتاری ئەم وەزع و حاڵە بووە و بەم زمانە لووسە شوبیرتی بەدەمەوە گرتووە.
بەڵام دوای ماوەیەکی کەم دەرفەتێکی تازەی بۆ ڕەخسا. زۆرجار دوستویفسکی دەعوەت دەکرا تا لەو ئێوارە کۆڕانەدا کە بۆ باربوو و یارمەتی خوێندکارانی هەژار دەگیران، هەندێ بەرهەمی خۆی بخوێنێتەوە. پولین سوسلوڤای جوان و نازەنین، لە هەر هەموو ئەم کۆڕ و ئاهەنگانەدا ئامادە

دەبوو، کۆڕ بێری نەدەکرد. ئەم ژنە ڕوخسارێکی دێهاتیانەی ڕەنگ کاڵی هەبوو، نیگای زۆر جدی و پڕ لە غروور و کبریا بوو، زۆر بە هێمنی و هێواشی قسانی دەکرد، ڕەفتار و هەڵسوکەوتی زۆر سەنگین و سەلارانە بوو. رۆزانوف، کە پاشان خواستی، لە بارەیەوە دەنووسێت: "لە کاترین دومدیسی دەچێت. دەتوانێت، بە دڵی پاک و سادەی، بێ ئەوەی خۆی شلوێ بکات پیاو بکوژێت. دەیتوانی لە شەوی سانت بارتیلمی دا، لەپەنجەرەی ماڵەکەیەوە، پروتستانەکان بەر گوللە بدات. بەشێوەیەکی گشتی بولین سوسلوڤا، ژنێکی یەجگار جوان و بەهیبەتە، من خەڵکانێک دەناسم کە تەواو دڵبەندی ئەون، لەژێر کاریگەری ئەودان." (کاترین دومدیسی: ١٥١٩ -١٥٨٩ شابانۆی فەرەنسا، ژنی هنری دووەم، دایکی فرانسوای دووەم، شارلی چوارەم، هنری سێیەمە، لەساڵی ١٥٦٠دا بوو بە سەرەوەسێتی عەرەشی پاشایەتی و گرینگترین کەسایەتی سیاسی فەرەنسا). (سانت بارتیلمیی: ناوێکە لە قەتڵ و عامی پروستانەکان نرا، ئەو قەتڵ و عامەی لە شەوی ١٥٧٢/٨/٢٤/٢٣دا بە هاندانی ماری دی مدیسی و بە ئەمری شارلی نۆیەم، پاشای فەرەنسا لە پاریس ئەنجام درا، کە سێ هەزار کەس بوون بە قوربانی.)

بابی، کاتی خۆی بابایەکی موجیکی نەخوێنەوار بوو، بەڵام توانی بووی بەزیرەکی و پرکاری خۆی. ببێ بە پێشکار و سەرپەرشتیاری مۆڵکەکانی ئاغاکەی خۆی. ئیدی بە ڕەنجی شانی خۆی بەڕادەیەک دەوڵەمەند بوو بوو و توانی بووی کارخانەیەک بۆ خۆی دابمەزرێنێ. یەکێک لە دوو کیژەکەی بەنێوی نادیجدا، بوو بەیەکەمین پزیشک لە ڕووسیادا. بەڵام دووەمیان، بولین، هەموو، هیوایەکی ئەوە بوو، خوێندکارێکی هەمیشەیی بێ. بولین، نموونەی ئەو قەیرە کچە بزێوانە بوو، کە بەردەوام و لە جۆرەها کولیچ خۆیان ناونووس دەکەن و لە دە موحازەرەدا، موحازەرەیەک ئامادە دەبن. هەندی تێبینی و باری سەرنجان و سەرە قەڵەمان تۆمار دەکەن و هەرگیز ناچنەوە سەری و نایخوێننەوە. خۆ بۆ تاقیکردنەوە ئامادە دەکەن، بەڵام ناچنە تاقیکردنەوەکان. ورد و سەختگیرن، سەریان لە سیاسەت دەخورێت و لە هەر هەموو باس و خواس و گەنگەشە سیاسیەکاندا بەشداری دەکەن و دەگەڵ لاوانی خوێندکارێن زانکۆدا، موناقەشەی دوورودرێژ و بۆش و بەتاڵ و بێهودە دەکەن. دوای خەیاڵ پەلاو دەکەون، پشتیوانی لە شۆڕش دەکەن، لە هەر جۆرە خۆپیشاندانێکدا بەشداری دەکەن. بڵاوکراوە بڵاو دەکەنەوە و لەهەر بزاف و جم و جوڵێکی کۆمەڵایەتیدا بەشداری دەکەن. بولین لەو جۆرە کەسانە بوو، لە هەموو ئەم بزوتنەوە و چالاکیانەدا دەوری ژنانەی خۆی، چالاکانە دەبینی. لە هەوادارانی یەکسانی پیاو و ژن و ئەشقی ئازاد بوو، باوەڕی بەخوا نەبوو، لە ڕاپۆری بەڕێوەبەری قوتابخانەی فلادیمیرا، دەربارەی کچە هاتووە: "سوسلوڤا، کەسێکە هەرگیز متمانەی پێ ناکرێت. یەکەم، هەمیشە عەینەکی ڕەش لەچاو دەکات. دووەم، قژی زۆر کورت دەکاتەوە. هەروەها لەڕاو بۆچوون و قەزاوەتەکانیدا زۆر بێباکە، هەرگیز هاتوچۆی کڵێسا ناکات."

ئەم نەهلیستە گەنجە، بەتەواوەتی دەکەوێتە ژێر باندۆر و کاریگەریی، شۆرەتی ڕوو لەزیادی دۆستویفسکی یەوە. واوێنا دەکات کە تەنیا ئەم پیاوە دەتوانێ لەو بگات، چونکە ڕەنجی زۆر کێشاوە و ئاشقێنییەکی زۆری کردووەو شارەزای خولیا و سۆز و کەڵکەڵە مرۆڤانیەکانە. ئەم پیاوە، ئە کەسەیە کە دەتوانێ ئەو لەو گومان و دوو دڵیانە ڕزگار بکات کە گیرۆدەیان بووە. ئەگەر لەگەڵ ئەم پیاوە مەزنەدا بێ، نیگەرانییەکانی وەکو کیژێکی گەنج بەئاسانی دەڕەونەوە. ڕێنوێنی و ئامۆژگارییەکانی ئەو، مانایەک بە ژیانی بێسەروبەری دەبەخشێ و سەرەنجام دەبێت بە ژنێکی ماقوول و بەسوود. کەواتە پێویستی بەم پیاوە هەیە. لەبەر ڕۆشنایی ئەم بیر و هزرنیە، هەر هەموو داب و نەریتێک وەژێر پێوە دەنێت، هەر جۆرە شەرمێک وەلاوە دەنێت، نامەیەکی سەیرو باوەڕنەکردەنی بۆ دوستویفسکی دەنووسێت، لێی دەپاڕێتەوە کە لە ماڵەکەی خۆیدا پێشوازی بکات. سەرەنجام دەستنووسی چیرۆکێکی خۆی دەدات بە دۆستویفسکی و تکای لێدەکات، شەرەفی ئەوەی بداتێ کە لە گۆڤاری زەماندا کاربکات و شت بڵاوبکاتەوە.

چیرۆکەکەی بولین. لە ئەیلولی ١٨٦١ دا بڵاودەبێتەوە. بەڵام دوستویفسکی تا کانوونی یەکەمی ١٨٦٢، خۆی لەم ئەشقە تازەو گەنجانە و بێپەروایە دوور دەگرێت.

دوستویفسکی لەو بەتەمەنترە، ڕەزاقورسێکی، دەموچاو خڕی سمێڵ زەرد، نێوچەوان پانی، گرژو مۆن، نیگاتیژی، چاوانی شووشە ئاسا. لەهەنبەردا، ئەو کیژێکە جوان، تۆکمە و بەداروبار، فڕناخ و لووتبەرز. دۆستویفسکی ژنی هەیە، خەمی خەرجی ژیان و، باری قەرز و کێشەو گرفتی ڕۆژانە، لە پەلو پۆیان خستووە. لە کاتێکا سوسلوڤا، کچێکی ئازادە، ئازاد و سادە، زۆر زیتەڵ و زندوو، چالاک و چەلەنگ، بزێو، خوێن گەرم، گەنج. دیارە ئەم جۆرە پەیوەندییە، جگە لە نەگبەتی و بەدبەختی هیچ شتێکی دیکەی لێ چاوەڕوان نەدەکرا. بەڵام وێڕای ئەوەش دوستویفسکی دەیەوێ بەهەر نرخێ بووە لە دەست ژنەکەی ڕزگار بێت، ژنێکی نەخۆش، بەخوتەو بۆڵە، دەمەوەر و شەڕەنگێز، کە بەردەوام دەکۆکێت و بەڵغەم فڕێ دەدات و هیچ دیار نییە کەی دنیای فانی بەجێدێڵێت و لە کۆڵ ئەم دەبێتەوە! دوستویفسکی دەیویست بەهەر شێوەیەک بێ، خۆی لە کەشم و نەشم و عیشوەو نازی شوبیرتی ئەکتەری کومیدیش دوور بخاتەوە و لە بیری خۆی بەرێتەوە. دەیویست بەدڵ و بەجەستە خۆشیان بوێ. دەیویست، دەیویست، دەیویست ژیانێکی نوێ دەگەڵ بولیندا دەست پێبکات. بەتەواوەتی دەکەوێتە ژێر کاریگەری جەستەی جوان و نەرم و شل و ڕوحی زیتەڵ و زەینی کراوەی بولین و وێڕای ئەوەی کە دەزانێت ئەم کارەی ئەو کارێکی نەشیاو و تەقریبەن جۆرە تاوانێکە، بەرگە ناگرێت و بە ناچاری مل دەدات و تەسلیم دەبێت. بەڵام ئەوەی کە لەم گەمەیەدا لە دەستی دەدات، ژنە نەخۆشەکەی خۆی نییە، بەڵکو خودی خۆیەتی. بولین، لە هەوەڵی ئەم پەیوەندییەوە، بەڕقەوە مامەڵە لەتەک ئەم ئاشقە فریبۆک و چل ساڵەیەدا دەکات و دەیکورهێنێ. پولین چاوەڕوانی ئەوە

بــوو ،كە دوستویفســكی كــارێكی وەهــا بكــات، كە ئەم لەم نیگەرانــی و شــپرزەیی و دوو دڵــی و دەروون پەرێشــی یەی كە بەســەریا زاڵ بــوو دەربــاز بكات. بیكات بە كەسێكی هەڵبژاردە و دیـارو بەرز، و چارەنووســی بە باشـترین شێوە بگۆڕێت. كەچی دەبینی، ئەم پیاوە لەجیـاتی ئەم بـۆ ئاسـتی خـۆی بەرز بكـاتەوە، خـۆی لە حـاڵی داخـزین و كەوتـن و هـاتنە خـوارەوەیە. پـولین حەزی دەكرد كە دوستویفسـكی لە بـاری ڕوحـی و ئەقڵـی یەوە بەسـەریدا زاڵ بـێ، كەچی بەپێچەوانەوە ئەم، ئەو پیاوەی شێت و شەیدا كـردووە. دوسـتویفسـكی یەک جۆرە شادی بۆ دابین كردبوو، كە هیچ ژنێـک نـاتوانێ چاوپۆشـی لێبكـات، بەڵام لەوەش بێزار بوو. ژنەی تاین هەستی بە شەرمەزاری و بچووكی و پـیس بوونی خۆی دەكات. نایەوێ ئەم ڕوخسـارە نمـووس وسـمێڵە تەڕو چـاوە پڕ لە پاڕانەوە و زاریانە لەبەردەم خۆیدا بدینێ. وێڕای ئەوەش تەنیـا بـۆ ئەوە دەژیـا كە لەم پیاوە نزیک بێ. بەزەیی بەم پیاوەدا دێـتەوە، دەی بـوغزێنێ و لێـی بێـزارە، ئەو بە دژمنی زەروری خۆی دەزانێت. پاشـان لە یادەوەرییە تایبەتیەكـانی خۆیـدا دەنووســێت: "شــەو خەبەرم دەبــووەوە، بەترســەوە هەڵدەســتام، ئەوەی بە ڕۆژەوە ڕووی دابــوو، هەمــوویم وەبیــر دێنــایەوە، بەدەم فرمێســک ڕشــتن و گریـانەوە، بە ژوورەكەدا، غـارم دەدا." كـاتێ كە گۆڤـاری زەمـان قەدەغە كـراو داخرا، دوستویفسكی لێیرا خاكی ڕووسیا بەجێ بێڵێ و سەفەر بكات. پـولین، یەكسەر قاییل بوو كە لەگەڵیدا بڕوات. بەڵام حیساب و كیتـابی گۆڤـارەكە لەوە ئـاڵۆزتر و دژوارتـر بـوو كە لە هەوەڵەوە وێنـا دەكـرا. دوستویفسـكی ناچـار بـوو سـەفەرەكەی دوا بخـات. تەسـەوری ئەوەی دەكـرد پـولین شـتەكە ئاسـایی وەربگرێـت و بە حەوسـەڵەوە چـاوەڕوانی ئەوە بكـات، تـا مەسـەلەی گۆڤـارەكە یەک لایی بكرێتەوە و ئەوسـا لە هەوەڵـێن ڕۆژانـی مـانگی ئابـدا، بە دوو قـۆڵی بچنە سەفەرەكەیان. بەڵام پولین، ئەم هەلە لەدەسـت نـادات، باشـترین هەل بوو بۆ ئەوەی هەڵێت، بە تاقی تەنیا سەفەر بكات و خـۆی بگەیەنێـتە شـارێكی گەورە، كە كەس لەوێـدا نەیدەناسـی. جانتاكـانی دەپێچێـتەوە، تـا بە خەیـاڵی خـۆی لەم وڵاتـی نەنـگ و نەفـرەتە هەڵێـت. ئاشـقەكەی بەجێـدێڵێت و بەرەو پـاریس وەڕێــدەكەوێت و بەڵـێن بە دوستویفســكی دەدات كە لەوێ یەكــدی ببینن.

دوای چەنــد مانگێــک، لە ١٨٦٣/٨/١٩دا، پـولین نـامەیەكی دوسـتویفسـكی پێــدەگات، خەبەری دەداتــێ كە بەو زوانە دەگــاتە پــاریس و ســەری دەدات. بەشەمەندەفەر سـەفەر دەكـات، دوای چەنـد ڕۆژێكـی دی دەگـاتە لای پـولین. بەڵام لە ویســبادن هەڵوەســتەیەک دەكــات، هەرچەنــدە زۆر تاســەمەندی دیـداری پـولین دەبێـت، بەڵام هەرچــی دەكـات نـاتوانێ بەر بەرەكـانی ئەو ئـارەزووەی خـۆی بكـات، كە بـۆ جارێـک بەختـی خـۆی لە گەمەی ڕۆڵێـت دا تاقیبكاتەوە. لە وێستگاكەوە یەكسەر بـۆ قومارخـانەكە دەڕوات. خـۆی بە چەنـد هـۆڵێكی گەورەدا دەكـات كە چلچـرا و ئـاوێزەی درەخشـانی بـن میچەكـان و ئاوێنانی قەیمـی قەد دیوارەكـان، ئـاوی چاویـان دەبـرد و فرمێسـكیان دەزایانـدە چـاو. مـاهوت و مەخمەلـی سـەوزباوی سـەر مێزێكـی ناوەڕاسـتی هـۆڵەكە،

سـەراپای هـۆڵەکەی بەتیشـک و پرشـنگی خـۆی پڕ کردبـوو. کۆمەڵێـک ڕووو و ڕووخساری ماندو و حایرمـاو و تـاڵانکرا و لە دەوری ئەم مێـزەدا، کە ڕونـاکیەکی کز لەسـەرێ ڕا، بەسـەریا دەڕژا، ئەڵقەیـان بەسـتبوو. هەر هەمـوو ئەم چـاوانە دەیانڕوانیە حەوزی پرشنگداری ڕولێـتەکە. ئیـدی ئومێـد، پاڕانەوە، نەفـرەت لەو چـاوانەوە هەڵـدەقولا، زۆر بەگەرمـی مژوولـی حیسـابکردن بـوو. ئەم دیـمەنە هێندەی دی دۆستویفسکی هان دەدات، خۆی پێناگیرێت، بـڕە پـارەیەکی کەم دەخـاتە سـەر مێـزی ڕولێـتەکە و دەیبـاتەوە. بـرە پـارەیەکی دیـکەش دادەنـێ، ئەمجارەش براوە دەبێت. ئەمجارەیان ڕیسک دەکـات و هەرچـی پـارەیەکی پـێ دەبێت دەیخاتە سەر مێزەکە و دیسان بـراوە دەبێـت. هەرچـی لەسـەر مێـزەکە دەبێـــت هەڵیـــدەگرێت، دە هەزار فرانـــک دەبـــاتەوە. ئیـــدی دەوڵەمەنـــد، زۆر دەوڵەمەنـد دەبێـت. بە هەشـتاو لە قومارخـانەکە دێـتە دەرێ. لە وێسـتگاکەدا بلیتێک دەکڕێت، وەکو شێت بۆ ئوتێلەکەی خۆی دەگەڕێتەوە.

تازە جانتاکانی پێچابووەوە و ئامادەی سەفەر بوو، کە لەپڕ وەسوەسەیەکی شێتانە و بێمانا لە کەللەی دەدات. دێت بەخەیاڵیا کە بەختی خۆی لە قومارێکی گەورەی سەد هەزار فرانکیشدا تاقیبکاتەوە. دەگەڕێتەوە بۆ قومارخانەکە. هەرچییەکی پێ دەبێ، دەیدۆڕێنێ. هەر پرە پارەیەک دەخاتە سەر مێزەکە دەڕوات. دواجار تەنیا پێنج هەزار فرانکی پێ دەمێنێ، شەکەت و ماندوو و لە قومارخانەکە وەدەردەکەوێت، هەرچەندە دۆڕاوە، بەڵام دڵی خۆشە. لێدەپرێت ویسبادن بەجێ بێڵێ و پروات بۆ پاریس. نامەیەک بۆ ژن خوشکەکەی دەنووسێت: "ڤار ڤارا دیمیتریڤنای ئازیز، ئەم شتە بۆ کەس مەگێڕەوە. من خەمی پاشامە (مەبەست لە پول ئیسایيفە، کوڕی ژنەکەی) چونکە ئەو هێشتا منداڵە، لەوەیە وا تەسەور بکات کە دەشێت پیاو بەئاسانی لە ڕێگەی قومارەوە ژیانی خۆی دابین بکات. چ پێویست دەکات بەو بڵێی کە بابی هاتوچۆی قومارخانە دەکات."

دۆستویفسکی بەخەیاڵی خۆی ئیدی ڕاز و نهێنی قوماری بۆ دەرکەوتبوو. شتێکی زۆر سادە بوو: پیاو دەبێ بەسەر خۆیدا زاڵ بێ، ئەعسابی سارد بێ، بەشێوەیەکی ئاسایی ئەنجامەکان هەرچییەک بن، قەبووڵ بکات، خۆی لە هەر هەڵچوونێک دوور بگرێت.

دۆستویفسکی پاشان لە رۆمانی قومارباز‌دا دەڵێت: "لە دوێنێوە کە لە ماهوتە سەوزەکە نزیک بوومەوە و دەستم بە دانان و هەڵگرتنی سەفتە پارە کرد، ئیدی مەسەلەی ئەشق و خۆشەویستی دایە پاشێ و بوو بە دەرەجە دوو.. دەترسم بووبم بە کابرایەکی قومارباز."

ئەنجام دۆستویفسکی لە ٨/٢٦دا دەگاتە پاریس. نامەیەک بۆ پولین دەنووسێت تا یەکدی بدینن. پولین لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا، لە ٦/٢٧دا واتە لە ڕۆژی پاش گەیشتنی دۆستویفسکی بۆ پاریس، دەنووسێت: "نامەیەکم لە دۆستویفسکییەوە پێگەیی کە ئەمجارە لە پاریسەوە ناردوویەتی. چەند خۆشحاڵە کە بەو زوانە بە دیداری من شاد دەبێت. من

نامەیەکی کورتم، کە پێشوەختە ئامادەم کرد بوو، بۆ نارد، زۆر بەزەییم پێیدا دێتەوە.. بەداخەوەم بۆی.."

دۆستویفسکی هەمان شەو، پولین، لەو پانسیونە چکۆلەیەدا، کە کەوتبووە شەقامی سوفلوتەوە، دەبینێ. پولین، بەچاوان و نیگای وشک و سارد و ڕەنگی زۆر زەردەوە، بە پیریەوە دەچێ. دۆستویفسکی دیمەنی ئەم دیدار و بەرخوردەی لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەمجۆرە وەسف کردووە.

پولین، بەدەنگێکی لەرزۆک دەڵێت: "ڕۆژ باش" دۆستویفسکی بە پەشۆکاوی و شپرزەیی پولین لە هەمێز دەگرێت و بە خۆوەی دەگوشێت. پولین، لەبن لێوانەوە دەڵێت:

-وامدەزانی نایەی نامەیەکم بۆ ناردیت.

-نامەی چی؟

-بۆم نووسی بووی کەنەیەی بۆلام.

-بۆچی؟

-چونکە زۆر درەنگ بوو بوو.

دوستویفسکی دەڕەنجێت. پولین بەر دەدات و دێتە دواوە، بەجۆرێ سەری دادەخات کە تەنیا قژی و نێوچەوانە پانەکەی لە پولینەوە دیار دەبێت. لە ناکاوا بە دەنگێکی گڕ و گیراو هاوار دەکات: "گوێ بگرە پولین. من دەبێ هۆی ئەمە بزانم. با بڕۆین بۆ شوێنێک و قسان بکەین، دەبێ هەموو شتێکم بۆ بگێڕیتەوە، دەنا لەداخا دەمرم."

پولین، بەوپەڕی هێمنی و ئارامی پێشنیاز دەکات کە پێکەوە بڕۆن، بۆ شوێنی دابەزینی دۆستویفسکی ئەمەی لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیوە: "بەدرێژایی ڕێگا بێدەنگ بووین. من تەمەشای ئەوم نەدەکرد. بەڵام ئەو ناو بەناو، بەدەنگێکی پڕ نائومێدی و پەستیەوە، بە عەرەبانچیەکەی دەگوت: "خێراکە، خێراکە." عەرەبانچیەکەش، بەسەرسامی ئاوڕی پاشی دەدایەوەو تەمەشای ئێمەی دەکرد... هەندێجار فیدور، بە توورەیی دەستی توند دەگوشیم، من پێم دەگوت: "هێور بەوە من لەگەڵتدام."

ئەنجام دەگەنە مەزڵ، خۆ بەژووردا دەکەن. فیدور میخائیلوفیچ بەلەز دەرگاکە دادەخات، دەکەوێت بەسەر دەست و پێی پولیندا. پولین لەو بارەیەوە دەڵێت: "لەکاتێکا باوەشی بە ئەژنۆکانمدا کرد بوو و بەخۆوەی دەگوشین، بە دەنگی بەرز دەگریا و هاواری دەکرد، من تۆم ،لەدەست داوە، دەمزانی"! پولین، کە خەیاڵی جیابوونەوەی لەمێشکا بوو، هەرگیز ئەوی وەکو ئەم ساتە بە شایستەی خۆشەویستی نەزانی بوو. بە باڵای بەرزەوە و ڕەق بەرانبەر ئەم پیاوە وەستا بوو، جلی دەڵبی ئاڵ و واڵای ئاوریشم جوانی لەش و لاری لە چاوانی ئەو دەشاردەوە. بەڵام دۆستویفسکی بە خەیاڵی تیژی خۆی ئەم بەدەنە پڕ و بەجۆش و خرۆشەی دێنێتە بەرچاوی خۆی. بەدەم ئاهو ناڵەوە دەڵێت: "ڕەنگە ئەوەی تۆ بەتەمایت، گەنج و ماقوول بێت، خۆشک بەرخورد بێ، بەڵام هەرگیز و لە هیچ شوێنێکدا دڵێکی وەکو دڵی من نادۆزیتەوە."

پولین، بە دلۆڤانی و میهرەبانی هێوری دەکاتەوە، دڵخۆشــی دەداتەوە. کـاتێ دۆستویفسکی وەخۆ دێتەوە و ئـارام دەگرێـت، پـولین، بەکـاوەخۆ سـەربهوردی خـۆی بـۆ دەگێـڕێتەوە. لەو چەنـد مـانگەدا کە بەوپەڕی ئـازادی لە پاریســدا گوزەراند بووی، حەز لە گەنجێکی قۆزی ئەسپانیایی دەکات بەنێـوی سـلڤادۆر، کە دەم و لێــوێکی جـوان و ئـاڵ، ڕەنــگ و ڕوویەکــی گەش و خــۆش، پــاک و حەیـوانی دەبێـت، تـازە خەتـی داوە و گەنە مـویەکی نەرم، لێـوی سـەرەوەی داپۆشیوە. لە ڕەفتاریـدا دیـارە کە متمـانەیەکی زۆری بەخـۆی هەیە. ئەم پیـاوە کاتێ کە تەمەشای پولین دەکات، پۆلین لەخۆشیدا لە پێستی خۆی نـاهێورێ. پولین، بێهـیچ بیرکـردنەوە و حیسـابێک خـۆی ڕادەسـتی کـردووە، بـۆ ئەوەی لە دوستویفســکی هەڵێـت و دووربکەوێـتەوە. خۆشەویســتی ســادە و ســاکاری سلڤادور، پولین لەو گۆنگی و ئاڵۆزییە فیکـری و ڕۆشـنبیریانە ڕزگـار دەکـات، کە دوستویفسکی تیایدا دەژی و دڵی پێیان خۆشــە، بـۆ پـولین، کە خوێنـدکارێکی هەمیشـــەیی بـــوو، گەنجێکـــی ســـادە و بەتـــین و تـــاو پێویســـت بـــوو نەک نووسەرێکی بلـیمەت. پـولین، قسـە دەکـات، قسـە دەکـات و دوستویفسـکی بێدەنگ و خامۆش، ڕەنگـی مـردووی لێنیشـتووە، گـوێ دەگرێـت، ئەنجـام لێـی دەپرسێت:

-باشـە، ئێستا تۆ بەختەوەریت؟

-نەخێر.

-چۆن، ئاشقی ئەویت و بەختەوەر نیت؟ شتی وا دەبێت؟

-بەڵێ، شتی وا دەبێت. ئەو منی خۆش ناوێت.

دوستویفسکی، سەری لەنێو هەردوو دەستی دەنێت، بەنائومێدی و توورەیی هاوار دەکات:

-خۆشـی ناوێی؟! ،یانی تۆ وەکو کۆیلەیەک ئەوت خۆشـدەوێ؟ ئیعتراف بکە، حەزدەکەم ئەمە بزانم، یانی تا ئەوپەڕی دنیا دوای دەکەوی؟

پولین، بەدەم پەڵمە گریانەوەو لەبن لێوانەوە دەڵێت:

-نەخێر، لە گوندێکی دوورە دەست و تەریکدا کونجی قەناعەت دەگرم.

پـولین، دەســت بەگریـان دەکـات. دوستویفســکی بەواقـی ورەوەو بە جـۆرە شـادییەکەوە دەڕوانێـتە گریـان و فرمێســکەکانی، گریـانەکەی پـولین، بەوە لێـک دەداتەوە، کە هێشـتا هیـوایەک مـاوەو دەتـوانێ دڵنەوایـی بکـات و بیلاوێنـێ و دڵی بێنێتەوە جێ. هەسـت بە هاوسـۆزییەکی زۆر دەرهەق بە پـولین دەکـات، وەکـو منـداڵێکی چکـۆلە لەهەمێـزی دەگرێـت و بەخـۆوەی دەگوشـێت و پێـی دەڵێت: "ئاهـ پولین، تۆ بۆ ئەوەندە نەگبەتی؟ مـن دەمزانـی، تەسـەوری ئەوەم دەکرد کە ئاقیبەت کەسێکی دیکەت خۆشبوێ، لەوە دڵنیا بووم. تـۆ لەبنەڕەتـدا بە هەڵە منت خۆشویست!.."

دوستویفسکی کە دەزانێت کار لە کار ترازاوەو ناتوانێ لەوەی پتر ئاشقی بێ، دۆستانە خۆشـی دەوێت. دەیەوێ لەهەر بویەرو تەنگانەیەکی بپارێزێت. وەکو دۆست و هاوڕێیەکی دڵسۆز بەگەڵی دەکەوێت و خۆشی خزمەتی خۆی بۆ دەنوێنێ وەکو چۆن ئەمەی دەگەڵ مەدام پانایف، ماری دیمیتریڤنا و

مەدام شوبێرتدا، کردبوو. بە برسێتی لە هەنبەر مێزێکی ئاوەدان بە خواردن، وەکو ئەکتەرێکی بێدەنگ دەوەستێت. بە پولین دەڵێت: "دەی باشە با بڕۆین بۆ ئیتاڵیا، من وەکو برات دەبم."
پولین، پاشان لە یاداشتنامەکەی خۆیدا لەو بارەیەوە دەنووسێت: "بەڵێنم دایە کە سبەینێ پێکەوە سلفادور ببینین. دوای ئەوەی گریی دڵی خۆم بۆ کردەوە و ماوەیەک قسەم لەگەڵیدا کرد، هێوربوومەوە، زۆر بەباشی لێم حاڵی بوو."
پولین، دوو دڵ بوو کە دەگەڵ ئەمدا بچێتە دیداری ئەو پیاوەی خۆشی دەویست، هێشتا لە گەرمەی ئەم دوو دڵی و ڕاڕاییەدا بوو. کە لەبرادەرێکی سلفادورەوە نامەیەکی بەم نێوەڕۆکە پێدەگات: "سلڤادور، تووشی تیفۆ بووە و تکا لە پولین دەکات کە نەچێتە سەردانی." پولین، شپرزە دەبێ، ترسی لێدەنیشێت، لەزگ بوو شێت بێ. دوستویفسکی لەم هەواڵە خەمناکە ئاگادار دەکات، ئیدی دەکەوێتە دڵدانەوەو دڵنەوایی و دەڵێت: "پزیشکانی پاریس، پزیشکی زۆر بەتواناو لێهاتوون، لە هەموو دنیادا بەناوبانگن، کەش و هەوای ئێرەش زۆر خۆش و لەبارە. سلفادور بەو زووانە چاک دەبێتەوە. عەلەمی لێ نامێنێ." بەڵام ئەم ئاغای سلفادورە، زۆر زووتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا چاک دەبێتەوە، بەڕێکەوت پولین، ڕۆژی پاشتر، سلفادور لەسەر جادە دەبینێ، تەمەشا دەکات، هیچ شوێنەوارێکی نەخۆشی پێوە دیار نییە، چاوانی درەخشان و گەش، ڕەنگ و ڕووی تەڕو تازە، دوای گفتوگۆ و پرس و جۆیەکی کورت و توند، بڕیار دەدات پەیوەندی دەگەڵ ئەسپانیاییە قۆزەکە ببڕێت و دەگەڵ دۆستویفسکیدا بۆ ئیتاڵیا بڕوات.
دوستویفسکی پێی دەڵێت: "من خۆشحاڵم، بەڵام کێ دەتوانێ لەتۆ بگات؟"
هەنگێ، سەفەری غەریب و سەیری ئەم ژنە سوارچاکە، ئەمازۆنیە. بێباک و دلێرە و ئەو هاوڕێ ئاشق و بەربەتاو و شەهوەت پەرستە دەست پێدەکات. لەرێگادا لەبادن بادن دەوەستن. سوسلوڤا دەنووسێت: "فیدور زۆر خۆشحاڵە، سەرگەرمی ڕۆڵێت و قومارە." لە ژوورەکەی پولیندا چای دەخۆنەوە. پاشان پولین، لەسەر تەختە خەوەکەی خۆی ڕادەکشێت. دەستی فیدور لەنێو دەستی خۆی دەنێت. هاوڕێ باشەکەی (واتە دوستویفسکی) ئیعتراف دەکات کە "هێشتا ئومێدی بە مەحەبەتی ماشقەکەی لەدەست نەداوە." لەپڕ دەکشێتە دواوە، قامک دەخاتە سەر تەوێڵی، بە دەنگێکی غەریب هاوار دەکات: "دەزانی ئێستا چیم بەخەیاڵدا هات؟"
-نا، چیت بەخەیاڵدا هات؟
پولین دەنووسێت: "من دەمڕوانییە ڕوخساری کە تەواو شێوا بوو،
-"دەمویست لەم ساتەدا، خۆم باوێمە سەر لاقت، پێت ماچ بکەم" من بە شپرزەیی و بگرە بە ترسەوە، هەردوو لاقم لەژێر خۆمدا قانگڵە کرد و گوتم: نا، بۆچی شتی وا دەکەیت؟ ئەو گوتی: حەزم دەکرد، لاقت لە هەمێز بگرم، سوور بووم لەسەر ئەوەی ماچیان بکەم." ئەنجام دوستویفسکی بێدەنگ

دەبێت. بە ژوورە چکۆلەکەی ئوتێلەکەدا دەکەوێتە هاتوچۆ. خۆی بە شتومەکەکاندا دەدات. پولین تکای لێدەکات کە لە ژوورەکە وەدەربکەوێ: "بڕۆوە بۆ ژوورەکەی خۆت، من دەمەوێ بخەوم." لە ژوورەکە وەدەردەکەوێ، بەڵام بە هەنجەتی داخستنی پەنجەرەکەوە، یەکسەر دەگەڕێتەوە لە پولین نزیک دەبێتەوە. بە دەنگێکی نزم ئامۆژگاری دەکات کە جلەکانی داکەنێت و خۆی ڕووت بکاتەوە. پولین دەڕوانێتە ئەو دەموچاوە شێواو پڕ ئارەزووەی کە بەدیارییەوە وەستاوە، پەڕەی کەپووی پڕ با بووەو کونە لووتەکانی کراونەتەوە، چاوە نەوسن و برسییەکانی ئەبڵەق بوون. بەڵام پولین پێی دەڵێت: "تۆ بڕۆ، من تۆزێکی دی خۆم دادەکەنم." دۆستویفسکی وەکو سەگێک کە سەتڵی ئاوی پێدا کرابێ، بەو ئاوایە بۆ ژوورەکەی خۆی دەگەڕێتەوە. لەسەر جێگاکەی خۆی پاڵدەکەوێت. ئیدی بەخەیاڵ لەشی توند و تۆڵ و نەرم و ناسک و گەرم وگوڕی ئەو ژنەی دینایە بەرچاوی خۆی کە لەودیوی دیوارەکەی تەنیشتەوە هەناسەی دەدا. ئیدی لەو هاماجە پڕ بۆن و بەرامە سێکسییەدا کە بەخەیاڵ دروستی دەکرد غەرق دەبێت و لەژێر گوشاری خۆزیا و ئەشقی سەرکوتکراودا بەجۆرێ توورە دەبوو، دەگەییە حاڵەتی شێت بوون. ئیدی لە تاواو بۆ ئەوەی سوکناییەک بە دڵ و دەروونی هەڵچووی خۆببەخشێت، پەنای وەبەر قومار دەبرد. قومار بۆ ئەو ڕێک وەکو ئەو کردە سێکسییە وابوو کە لێی قەدەغەکرا بوو. ئیدی بە قومار قەرەبووی ئەو هەڵچوونە سیکسییە سەرکوتکراوەی دەکردەوە کە بە دیتنی پولین، دەگەییە لوتکە. ئیدی هەمیشە شپرزە و پەشێو، توورە و تڕۆ بوو، ئامادە بوو هەر تاوانێک بکات، یان بەلای کەمەوە شەڕیک بکات، شەڕی بە سێبەری خۆی دەفرۆشت، ئیدی زۆر ماندوو دیار بوو، وەکو ئەوەی سەرانسەری شەوی ڕابردوو، خەریکی ئەشقبازی و سێکس بووبێ. بۆ سبەینێ هێور دەبووەوە و برایانە دەگەڵ پولیندا ڕەفتاری دەکرد.

دوستویفسکی لە بادن – بادن دا سێ هەزار فرانک دەدۆڕێنێ. میشێل کە ئاگای لە پەیوەندی ئەو دەگەڵ پولیندا دەبێت، بۆی دەنوسێت: "باشە کاتێ کەسێک دەگەڵ ژنێکی خۆشەویستی خۆیدا بچێتە سەفەر، چۆن دەتوانێ، وەختی خۆی بە قومارەوە بەفیڕۆ بدات." فیدور بەرسڤی براکەی خۆی دەداتەوە و دەڵێت: "لێرەدا خەڵکی هەر بە کەیف و خۆشی دە هەزار فرانک دەباتەوە. منیش بۆ ئەمە هاتوومەتە سەفەر تا خۆم و تۆش لە هەژاری و دەسکورتی ڕزگار بکەم. ئەمە جگە لەوەی من لە قوماردا بەرە بەرە بۆی سەردەکەوم و پری پارەکە زیاد دەکەم. بۆ ئەوەی درێژە بە سەفەرەکەی بدات ناچار دەبێت کە سەعاتەکەی خۆی و موستیلەکەی پولین لە جنیف بخاتە بارمتەوە. بەڵام ئەو پارەیەی لە قەبڵی سەعاتەکەی و موستیلەکەدا وەری دەگرێت، هەر بەشی تا شاری "تورین" یان دەکات. ئیدی دەبوایە چاوەڕوانی گەیشتنی ئەو پارەیە بکەن کە قەرار بوو لە پتروسبۆرگەوە بۆی بێت. لە ڕۆمادا، پەیوەندی نێوان ئاشق و ماشوق تێکدەچێت. ئیدی دوستویفسکی،

سەبری دەسوێ، تاقەتی لەم ژنە دەچێت کە بە شەریکی ژیانی دەژمێردراو، خۆی بەدەستەوە نەدەداو هاوجێی دەگەڵدا نەدەکرد.
ڕۆژێک پێی دەڵێت: "دەزانی ئەوەی تۆ بەمنی دەکەی، هیچ ژنێک بە هیچ پیاوێکی نەکردووە. بەسە لەوەی زیاتر ڕووت لێنانەم." لە ڕۆمانی قوماربازدا، و لەو شوێنەدا کە دوستویفسکی، بەسەرهاتی ژیانی خۆی دەگەڵ پولیندا، وێنە دەگرێت، ئەم ڕستەیە بەرچاو دەکەوێت: "جاری وا هەبوو، ئامادە بووم، نیوەی ژیانی خۆم دابنەم، تا بتوانم بیخنکێنم. باوەڕ بکە، ئەگەر بۆم ڕێکەوتبا ئامادە بووم بە شێنەیی و بەوپەڕی خۆشیەوە، خەنجەرێک لە سینگیدا ختم بکەم. بەڵام وێڕای ئەمەش، بەشەرەفم قەسەم، ئەگەر لە شلانگبیرگدا، بەو سەرپۆشە تازەیەوە کە بەسەریادا بوو، داوای لێکردبام، لە بەرزترین لوتکەوە خۆم هەڵدێرم، بێ چەند و چۆن و بەخۆشحاڵییەوە خۆم هەڵدەدێرا.."
بەڵام پاشتر و لە شوێنێکی دیکەدا تووشی ئەم دەستەواژە گرینگە دەبین: "زۆرجار وەکو پیاو سەیری نەدەکردم."
هەڵبەتە ئەوەی زۆر لە بەرگران بوو کە وەکو پیاو سەیری نەدەکرد، بەپیاوی نەدەزانی و بەبێ ترس سەفەری لەگەڵیدا دەکرد. پولین، دەنووسێت: "سەعات یەکی بەیانی بوو، من لەسەر جێگاکەم بەڕووتی پاڵکەوتبووم. دوستویفسکی ڕوو لە من دەیگوت، شەرمە من تۆ بەتەنیا، بەجێ بێڵم، بەڕاستی شەرمە. چونکە ئەمە لە ڕووسان ناوەشێتەوە، ڕووس پاشگەز نابنەوە."
بەڵام دوستویفسکی پاشگەز دەبێتەوە. خۆی لە ئەسارەتی ئەم هەوەسە ڕزگار دەکات. ئیدی زەمان، عادەت و بیرکردنەوە، بەرە بەرە مەیل و ئارەزووەکانی دوستویفسکی دادەمرکێننەوە. هەست بە ماندوویەتی و بێتاقەتی دەکات. بیر لە کتێبەکەی دەکاتەوە، خواخوایەتی بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە. بەتایبەتی کە لەناکاوا باری تەندروستی ماری دیمیتریفنا، زۆر خراپ دەبێ.
فیدور میخائیلوفیچ، بەدرێژایی ئەم سەفەرە جەنجاڵە هاوسەرەکەی فەرامۆش نەکردبوو.
لە ١٨٦٣/٨/٢٨دا لە نامەیەکدا بۆ نیکولای برای دەڵێت: "من زۆرجار بیر لەماری دەکەمەوە، زۆربەی کات لەبیرمە، هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەم خەبەرێکی خۆش دەربارەی ئەو بژنەوم. حاڵی چۆنە؟"
لە ١٨٦٣/٨/٢٨دا لە نامەیەکدا بۆ پول ئیسایيف دەڵێت: "هەر کاتێ خەبەر و هەواڵێکی دایکت زانی، ئاگادارم بکەوە." هەروەها لە نامەیەکی ١٨٦٣/٩/٢٠دا بۆ ف. د. کونستان دەڵێت: "شتێکم دەربارەی ماری بۆ بنووسە."
دوستویفسکی و سوسلوڤنا لە ڕۆماوە دەڕۆن بۆ ناپولی. لە ناپولیەوە بۆ تورین دەگەڕێنەوە، ئەنجام لە نزیکی نیوەی مانگی ئوکتوبەردا دوستویفسکی و هاوسەفەرەکەی بەیەکجارەکی لێکدی جیادەبنەوە. پولین بۆ پاریس دەزڤڕێتەوەو دوستویفسکی بۆ ڕووسیا. بەڵام دوستویفسکی، لە ڕێگا، لە

هامبورگ لادەدات و هەرچی پارەیەکی بۆ خەرجی سەفەرەکەی پێدەبێت، هەر هەمووی دەدۆڕێنێ. ئیدی ترس و حیرەتێکی سامناک دەیگرێت، نامەیک بۆ سوسلوڤنا دەنووسێت. پولین، کە خۆیشی زۆر بێ پارە دەبێت، خێرا سەعاتەکەی و ملوانکەکەی لە بانکێکدا دەخاتە بارمتەوەو پڕێ پارەی کەم لە چەند دۆستێک قەرز دەکات و یەکەمین کۆمەکی خۆی بۆ فیدور میخائیلوفیچ دەنێرێت و لەو تەنگانەیەی ڕزگاردەکات کە پاشان لەو بارەیەوە دەنووسێت: "کاتێ کە بیرم دەکەوێتەوە دوو ساڵ لەوەپێش چۆن بووم، هەستدەکەم قێزم لە دۆستویفسکی دەبێتەوە. ئەو یەکەم کەس بوو کە ئیمانی لەدڵی مندا کوشت."

بەڵام پاشان، دوای ڕوودانی زنجیرە بویەرو گۆڕانێک پولین لە ساڵی ١٨٨٠دا شوو بە ڤاسیلی روزانوڤی شرۆڤەکاری بلیمەت و ڕەخنەوانی بەرهەمەکانی دوستویفسکی، دەکات. لەم سەروبەندەدا پۆلین تەمەنی چل ساڵ دەبێت و ڕوزانوف بیست و هەشت ساڵان دەبێ. ڕوزانوف، پولین دەپەرستێ و پولین بەروزانوف ڕادەبوێرێ. سەرەنجام پاش تێپەڕبوون و گوزەراندنی شەش ساڵی دۆزەخین، پولین، بەجێی دێڵێت و ڕوزانوف، دووچاری شکستێکی دەروونی، لەخۆشبوونەوە نەهانگ، دەبێت. لە پولین دەپاڕێتەوە کە بگەڕێتەوە بۆ لای. پولین وەڵامی دەداتەوە: "هەزاران مێرد لە هەمان وەزع و حاڵی تۆدان و هیچ گلەیی و گازاندەیەکیش ناکەن. خۆ پیاوان سەگ نین." ڕوزانوف، شێت ئاسا، پەنا وەبەر باوکی پولین دەبات، کە پولین بە "دژمنی تیرەی بەشەر" دەزانێت. پاشان پەناوەبەر دۆست و بناژۆکانی پولین دەبات، تەنانەت پەنا وەبەر پولیس و جەندرمەش دەبات. بەڵام هیچ کەسێک وەکو ئانا گریگوریڤنا، بێوەژنەکەی دوستویفسکی، ئاگاداری نهێنییەکانی ئەم ئەشقە ئاگرینە نابێت. مەسەلەی پەیوەندی دوستویفسکی بە پولینەوە، یەکێک بوو لەسەرچاوە کاریگەرەکانی بابەت و تیمەی بەرهەمەکانی دوستویفسکی. ئەم ژنە دەمدەمی مجێز، جارێ هێمن و هێدی و جارێ ئاگرین تەبیعەت بوو. ئەم ژنە هەمان دونیای خوشکی ڕاسکولینکوفە لە ڕۆمانی تاوان و سزادا، هەمان ئاگلایە لە ڕۆمانی گەمژەدا، لیزایە لە ڕۆمانی شەیتانەکاندا، کاترین ئیڤانوڤنایە لە برایانی کارامازوفدا، دەقاو دەق پولین ئەلکسندروڤنایە لە ڕۆمانی قوماربازدا.

دۆستویفسکی لە سەرەتای سەفەرەکەیەوە دەگەڵ پولیندا، بیر لە ڕۆمانی قوماریاز دەکاتەوە. لە ١٨٦٣/٩/٣٠دا لە نامەیەکیدا بۆ ستراخۆف دەنووسێت: "حاڵی حازر هیچ شتێکی ئامادەم نییە، بەڵام بیرۆکە و نەخشەی ڕۆمانێکم لە زەیندایە وا وێنا دەکەم شتێکی باش و سەرکەوتوو دەردەچێت. وێنەی پیاوێک دەگرم کە سەر لە هەموو کارێک دەردەکات، بەڵام لە هیچ کارێکدا سەرکەوتوو نییە. لە یەک کاتدا هەم شۆڕشگێڕ و دژە دەوڵەتە، هەم لە دەوڵەت و دەسەڵات دەترسێت.. بەهەرحاڵ، هەست دەکات کارێن خەتەر ئامێز و ڕیسککاری، سەنگ و قورساییەک بە کەسایەتی ئەو دەبەخشێت. چیرۆکەکە بە دەوری تەوەری ئەو سێ ساڵەدا دەسوڕێتەوە، کە ئەو خووی داوەتە ڕۆڵێت."

بەهەرحاڵ، وەختێ دۆستویفسکی بۆ ڕووسیا دەگەڕێتەوە، ئەو وەخت و کاتەی نایێت کە ئەم ڕۆمانە تەواو بکات. ماری یەجگار نەخۆشە، دەبێ یەکسەر بۆ مۆسکۆ ببرێت، چونکە کەش و هەواکەی لە پتروسبۆرگ لەبارتر بوو بۆ نەخۆشییەکەی ماری. "پول ئیسایف"ش لەگەڵیاندا دەڕوات. بەڵام ماری بەجۆرێ مجێزی خراپ بوو بوو، کە حەزی نەدەکرد کوڕەکەی خۆیشی بدینێ. دوستویفسکی پول، بۆ سان پتروسبۆرگ دەنێرێتەوە. دوستویفسکی بەخۆیشی دوای ماوەیەکی کەم بەناچاری بۆ پتروسبورگ دەگەڕێتەوە. چونکە میشێل، خەریکی ئەوە بوو کە گۆڤارێکی تازە بەنێوی سەردەم لەجیاتی گۆڤاری زەمان دەربکات.

دەستەی نووسەران، هەمان دەستەی نووسەرانی گۆڤاری زەمانن. بەڵام میشێل پارەی نەبوو. کاغەزی بە قەرز دەکڕی، گۆڤارەکەی بەقەرز چاپ دەکات، هەموو کاروبارەکانی گۆڤارەکە بە قەرزو قۆڵە ڕایی دەکات. پاداشتی وتارو نووسین بە نووسەران نادات. دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر، دەزگای سانسۆر ڕێگای دەرچوونی گۆڤارەکە دەدات "بەو مەرجەی بەڕێوەبەران و دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، بە تەواوەتی پابەندی ئەو خەت و مەرجانە بن کە بۆ گۆڤارەکە دانراوە..."

ئیدی لەوکاتە بەدواوە، دوستویفسکی وەختی خۆی لەنێوان گۆڤارەکە و ژنە نەخۆشەکەیدا، کە لەسەرەمەرگا بوو، دابەش دەکات. ئیدی هاتوچۆی پەیتا پەیتا و ناخۆشی دوستویفسکی لەنێوان نەخۆشەکە و گۆڤارەکەدا، لەنێوان مۆسکۆ و سان پتروسبۆرگدا، ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت. لە سان پترو سبۆرگ، هەواڵی ناخۆشی گۆڤارەکە چاوەڕوانی بوو، لە مۆسکۆ ژنەکەی، نیمچە شێت، لە ژوورێکی موبێلەدارا، بەدەم گیانەڵڵاوە چاوەڕوانیەتی. ئەم وەزع و حاڵە چەندین مانگی خایاند. هەندێجار ژنە نەخۆشەکەی هاواری دەکرد: "ئێرە جنۆکەی هەیە، جنۆکە هاتوونەتە ژوورەکەی منەوە." ناچار دەبێ پەنجەرەکە بکاتەوە. خاولیەک هەڵبگرێت و بە هەموولایەکدا بای بدات و وابنوێنێ کە جنۆکەکان دەردەکات، تا ژنەکەی ئارام و ئۆقرە بگرێت و هێور ببێتەوەو بێدەنگ ببێ.

دوستویفسکی هەستدەکات کەسەفەرەکەی بۆ هەندەران بەجۆرە هەڵاتن و خۆ دزینەوەیەک لە ڕوخساری زەردی مۆم ئاساو داچەکیوی هاوسەرە سیلاویەکەی لێک دەدرێتەوەو هەست بە عەزابی ویژدان دەکات. هەستدەکات کە پەیوەندی ئەو دەگەڵ پولیندا خەتایەکی زۆر گەورەیە و تەنیا خۆی پەی پێدەبات. بەدیار ژنەکەیەوە ئیعترافنامەیەکی ترسناک دەنووسێت، کە بەلوتکەیەکی هەرە بەرزی بەرهەکانی ئەو دێتە ژماردن: یاداشتە ژێر زەمینییەکان.

## فەسڵی چوارەم
## یاداشتە ژێرزەمینییەکان
## دوو مردوو

ئـەم پیـاوەی کـە لـەژێر زەمینێکـدا دەژی و دوسـتویفسـکی یادگارییـەکانی بـۆ ئێمە دەگێڕێتەوە، تـەواو لە دۆسـتۆیفسـکی خـۆی دەچێـت و لەڕاسـتیدا خـودی خۆیەتی. وەکو چۆن گولیادکین، کۆپیەکە لە هاوشێوەکەی خۆی، ئەم پیاوە ژێـر زەمینییە لە ژوورێکی پیسـی، تاریکی قێزەونـددا دەژی، کـە بـەقاوغ و قـەپێلکی ئەو دەژمێردرێت، بەتاقی تەنیا لەوێندەر دەژی. هیچ دۆسـت و بناژۆیـەکی نییـە. دەڵێت: "من نەخۆشـم، کەسێکی شـەڕەنگێز و شـەڕانیم. هیچ شـتێکی جـوان و دڵگیر لەمندا نییە.". بەڵام ئـەم خاڵـەی کـە هەسـت بـە بچـووکی و بودەڵـەیی خۆی دەکات، ژێراو ژێر جۆرە سـوکنایی و خۆشـیەکی دەروونـی پێدەبەخشـێت. ئەو پیاوە لە دنیایەکی پڕ گلەیی و گازاندە، لە کەرب و کـین، لـە سـووکایەتی و ڕیسوایی، لە ترس و لەرزدا، کە هەر هەمووی بـۆ ئـەو خۆشـە، قاڵ بووەتـەوە. زۆرجار حەزدەکات لە شـەوانی نەنگینی سـان پترسـبۆرگ هـەڵێت و بـۆ گۆشـە تەریکەکەی خۆی بگەڕێتەوە و لێرەدا، بیر لە هـەموو ئـەو کـارە چەپـەڵ و دزێـو و پڕ ڕیسـواییانە بکاتەوە، کە بە ڕۆژەوە تووشـی بوون، لێی سارد بوون، بەسـەری

هـاتوون. دەیـەوێ لـەم گۆشـەی تەنیاییـەدا، بیـر لـەو ڕیسـوایی و حەقارەتانـە بکاتـەوە کـە بـەڕۆژەوە تەحـەموولی کـردوون. لـەزەتێکی زۆر لـەوە دەبینـێ کـە بەخۆی دەڵێت، گەییوەتە ئەوپەڕی خوێڕیـەتی و بودەڵـەیی و هـەرگیز نـابێ بـە بەشەری ناو بەشـەران. سـەگ بنووسـێ بـە ئاسـمانەوە، ئـەو ناچەسـپێ بـە ئینسانەوە. کەسێکی زۆر تایبەتی و نائاسایی بوو. ئەو لە پەراوێزی کۆمەڵگـەدا و لەناو خەڵکیدا، خۆی بە گۆشەگیر و تەنیا دەزانێ. دەڵێت: "من تەنیام، ئـەوان هەموو پێکەوەن." ئەو لە گۆشـەی تەنیایی خۆیەوە، چـاودێری پیـاوانی ئـەهلی کار، یاخۆی گوتەنی پیاوانی نـاو پیـاوان و کۆمەڵگـە دەکـات. بـە بۆچـوونی ئـەو، ئەمانە ئەعسابیان زۆر قایمە و لەهەر بیرکردنەوەیەک دوورن. چونکە بـۆ ئـەوەی بتوانن کار بکـەن، دەبـێ کـەللەیان بـەتاڵ بێـت. ئـەوەی بیـر دەکاتـەوە، جوڵـەی نـامێنێ، چونکـە بیـر وەکـو ئەسـید وایـە، ئـەو قاڵبـە دەخواتـەوە، کـە پێویسـتە کارەکەی تیا بمەێت و قاڵب بگرێـت. تەنانـەت جەوهـەری کـار، خـۆی لەخۆیـدا، بەشکسـت و ناکامی بۆ ڕوح و دەروون دێتە ژماردن. کـار، پێویسـتی بەوەیـە بـە گوێرەی هەندێ یاساو ڕێسا ڕێنـوێنی بکرێـت. کـار تـەنیا لـە دنیایەکـدا قـابیلی جـێ بەجێکردنـە، کـە ڕێـک بـۆ کـار دروسـت کرابـێ. زانسـتە مرۆڤانیـەکان، ئەزموونانی مرۆڤیان تۆمار کردووە و یاساو ڕێسایان بـۆ دانـاون و دیـواری بـەرزی بـەردینیان دروسـت کـردووە، تـا ئاسـۆی دیـدی بەشـەری سـنووردار بکـەن و جەماوەری خەڵکی، لە هەنبەر ئـەم دیـوارەدا سـەری ڕێـز دادەنـەوێنن: "ئـەمە دیـوارێکی زۆر پتـەو و قایمـە. دیوارێکـە دەشـێت پشـتی پێـوە بـدرێت، ئەمـە حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە." ئەو گاگـەل و ڕانـە گەوجانـەی لـە چوارچێـوەی ئەم دیوارانەدا دەژین، ئەو مەیدانە بە مەیدانێکی فراوانی بێسـنوور و کەوشـەن دەزانن و غافڵن لەوەی کە زانست لە زیندانی نـاون و ئـەو مەیدانـەی لێکـردوون بە زیندان. دیارە ئەو مێگەلە تەنیا بیر لە کارە بچووکەکانی خۆیان دەکەنـەوە، کـە بەو شێوەیە پارێزراوە. ئەوانە دەسـتی خـۆ هەڵـدەگلۆفن و سـەرگەرمی کـارن. خـۆ ئەگـەر فەیلەسـوفێک یـا هـەر پیـاوێکی ژێـر زەمینـی، بڵێـت کـە دیوارەکـان لابەرن، هاوار دەکەن: "ببورن، یاخی بوون مەحاڵە. دوو جاران دوو دەکاتـە چـوار و تەواو. تەبیعەت پێچەوانەی بۆچوونی ئێوەیە. تەبیعەت بەدڵی ئێوە ناچـەرخێ. ئیدی گرینگ نییە، ئێوە یاساکانی تەبیعەتتان بەدڵ بێ یا بـەدڵتان نـەبێت. ئێـوە چارتان ناچارە، بتانەوێ و نەتانەوێ، دەبـێ ئـەو یاسـایانە وەکـو خۆیـان قـەبووڵ بکەن و هەموو ئاکام و دەرهایشتەکانیشـی قەبووڵ بکەن. ئیدی دیـوار دیـوارە.. هتد."

ئیـدی کـابرای ژێـر زەمـین نشـین (یـا دوستویفسـکی) بـەم ڕسـتە سـەیرە وەڵامیان دەداتەوە: "ئەی خودایا. ئەگـەر ئـەم یاسـایانەی تەبیعـەت، ئـەم یاسـا ماتماتکیانە، لەبەر هەر هۆیەک بەدڵی من نەبن، من چ بکەم؟ هەڵبەتە ئەگـەر هێزی تەواوم بۆ ڕوخاندنی دیوارەکان نەبێت، خۆ ناتوانم تـەوێڵی پێـدا بکێشـم و بیان ڕوخێنم. بەڵام ئەمە بەو مانایـە نیـە کـە کـوڵ بـدەم و بـەوە قاییـل بـبم کـە مـادامێکی ئـەم دیـوارە لەسـەر بنـەما و ڕێسـای دوو جـاران دوو دەکاتـە چـوار، ڕونراوە، ئیدی دەبێ پێی قاییل بم و قەناعەت بەخش بێت."

بودلێر دەڵێت: "ئایا لە دنیای ماتماتیکشدا، شێتاتی هەیە؟ ئایا شێتانێک هەن، کە پێیان وابێ دوو جاران دوو دەکاتە سێ؟ کابرای ژێر زەمینی، عارفێکە، هەر هەموو بونیادە دەستکرد و ڕواڵەتیەکان ڕەتدەکاتەوە. هەموو بەدیهیاتەکان دەداتە لاوەو ڕەتیان دەکاتەوە. هەموو یاسا زانستیەکان ڕەتدەکاتەوە باوەڕو تەسەوری وایە کە هێوەی سنووری ژمارە و مادەکان، مانا و باوەڕێک هەن. ئەو لە مەحاڵدا دەژی. خوداش داوای مەحاڵ، لە خەلقەندەکانی خۆی دەکات. خودا دەبێ بە چ بتێک ئەگەر قاییل بێ بەوەی کە مرۆڤ لەم ژوورە بێ کلاوڕۆژنەیەدا، کە خۆی تێدا حەپس کردووە، شادبێ، ئەگەر قاییل بێ ئینسان لەم خۆشگوزەرانیەی ئێستای خۆیدا خەوی لێبکەوێت، ئەگەر قاییل بێ، ئینسان بەم ڕادەیە خۆی بچووک بکاتەوە و لە نرخ و بەهاو پایەی خۆی کەم بکاتەوە، کە پزیسکی خوایی بیرکردنەوە فەرامۆش بکات و ببێت بە شتێکی ئامێر ئاسای ڕووت.

دۆستویفسکی دەڵێت: "هەموو پرسێکی ئینسان ئەوەیە کە بۆ خۆی بسەلمێنێ کە ئینسانە، نەک بورغویەک لە ئامێرێکدا." دیارە ئەمە هەم بۆ دنیای مەعنەوی و ڕوحانی و هەم بۆ دنیای مەتریالی، دروستە. دیارە پرەنسیپە مەعنەوی و ڕوحانی و ئەخلاقییەکانیش، وەکو پرەنسیپە مەتریالیەکان بوونەوەران لە چوارچێوە و کەوشەنێکی سنوورداردا حەپس دەکەن. هەڵبەتە بەزاندنی هێڵی جێگیری ئەم پرەنسیپانە، دەکاتە گەیشتن بە حەقیقەتی باڵا.

کاتێ کە چوار چێوە ئەخلاقیەکە دەشکێ ئیدی نەچەمکی خێر دەمێنێ و نە چەمکی شەڕ. هەروەها کاتێ کە سنووری یاسا زانستیەکان دەبەزێنرێ و پێشێل دەکرێت، جگە لە پەشێوی و پاشاگەردانی هیچ شتیکی دیکە نامێنێ. جا یارۆی ژێر زەمینی، بۆ ئەو پەشێوی و پاشاگەردانیەمان بانگ دەکات.

کابرای ژێر زەمینی، مانای تەواوی ئازادی لەم ئاشوب و پاشاگەردانیەدا دەبینێ. ئازادی بەسەر خۆشگوزەرانی خۆیدا پەسەند دەدات. "ئینسان تەنیا پێویستی بە ویستی سەربەخۆ و ئازادە. ئیدی ئەمە چەند لەسەری بکەوێ و بۆ کوێی بەرێت گرینگ نییە.. من باوەڕم وایە کە مرۆڤ هەرگیز دەستبەرداری ڕەنج و ئازاری ڕاستەقینە، واتە گەیشتن بەو ئاشوب و پاشاگەردانی و پەشێویە نابێت."

لە سایەی بەرەکەتی ڕەنج و ئازارەوەیە کە مرۆڤ لەو نادیارانە نزیک دەبێتەوە کە نایەنە فامین و دەرک کردن، لە شتە پەڕجوو ئاساکان نزیک دەبێتەوە، لەسایەی بەرەکەتی ڕەنج و ئازار و کول و کۆڤانەوە، ئینسان تەجاوزی خۆی دەکات. لەڕاستیدا ڕێگای ڕەنج و ئازار، کول و کۆڤان، ڕێگاکانی ئازادی یا دەگەنە کەشف و دۆزینەوەی خودا یا دەگەنە بەخودا کردنی مرۆڤ. ئیدی خوا –مرۆڤ ومرۆڤ –خوا. نیتشە مرۆڤی ئاسایی لە مرۆڤی باڵادا دەتوێنێتەوە. بە نۆڕینی نیتشە، ئینسان بۆ ئەوەی بگاتە سوپەرمانی، دەبێ هەموو شتێکی ئینسانی لە ئینسان یان لە پیاودا بکوژێت. سوپەرمان هەر ئینسانێکی گەشە کردووی پەرەسەندوو نییە، بەڵکو بتە. خودایەکە، کە ئیدی هیچ ڕەگەزێکی

زەمینـی تیـا نـەماوە. بـەڵام لای دوسـتویفسـکی، لـەم قۆناغـەدا جەوهـەر و کرۆکـی مرۆڤـانی، دەگـەڵ گەوهـەرو کرۆکـی خوداییـدا تێـک دەکاتـەوە و هەماهـەنگی پەیـدا دەکـەن. نـەخودا مـەخلووقی خـۆی قـووت دەدات و نـە ئینسان لە خودادا دەتوێتەوە. هـەم خـودا هەیـە و هـەم ئینسـان هەیـە. ئیـدی نـاوبژیوان و میانچیـەکی چاکەخواز، واتـە مەسـیح لـە بـەینی ئـەم دوانەدایـە و پەیوەندییان دەپارێزێت. ئازادی ئینسـان ڕەنگـە هـەر کـول و کۆڤـان بـێ، ڕەنـج و ئازار بێ، بەڵام لـە کۆتـایی ئەزمـوونەکـەدا، مـرۆڤ چەنـد بچـوکیش بـێ، چەنـد شێواو برینداریش بـێ، هـەر دەکەوێتـە بازنـەی نـوری جاویـدانی مەسـیحەوەو دەدرەوشێتەوە.
ڕەنگـە، دۆسـتویفسـکی، لـەکاتی ئـەو نـۆرەفێیانـەدا کـە لێـی هـاتووە، بـۆی ڕێکەوتبێ کە بگاتە ترۆپک و سەرووی ئەو دیوارە و پانتایی قەدەغـەکانی بینـی بـێ، بـەڵام نـوور و ڕونـاکی، چـاوانی وەڕێشکەوپێشـکە خسـتبێ و نابینـای کردبێـت. وداخ و حەسـرەتی ئـەم دیمەنـە جـوان و پـەڕجوو ئاسـایەی لـە دڵـدا مابێ و لەو سـەرەوە کەوتبێتە خوارەوە، بەڵام دیتویەتی، بـەڵێ دیتویـەتی. ئـەو یەکێکـە لـەو کەسـە دەگمەنانـەی ئـەو دیـو دیوارەکـەی دیتـووە. لـە پیـاوە ژێـر زەمینییەکەدا ئەو خاڵە بەزەقی دیـارە. بۆیـە پیـاوە ژێـر زەمینییەکـە، بـە کلیـل و کـۆدی تێکـڕای بەرهەمـەکانی دوسـتویفسـکی دێتـە ژمـاردن، بۆیـە لـە تێکـڕای بەرهەکانیدا، لەنێوان هەردوو تەسـەوری تەبیعی و میتاتەبیعی ئەم دنیایـەدا لـە نەوەساندا بوو. یانی لە نێـوان ئـەرزو ئاسـماندا لـە مۆلەقـدا بـوو، جـارێ ئـەرز و جـارێ ئاسـمان ڕایدەکێشـا. لـەنێوان قـانوونی علییـەت و دنیـای مـەتریالی دوو جـاران دوو دەکاتـە سـێ. یـەکێکیان هـەڵنابژێرێت، بـەڵکو هەوڵـدەدات جـۆرە هاوسـەنگیەک لـەنێوان ئـەم دوو بونیـادەدا چێبکـات. بـەڵکو دەیـەوێ لـە ڕێگـای هەوڵ و کۆششێکی نەخۆشانەوە، چیرۆکێکی غـەریب و سـەیر لە حەقیقـەت و واقیعی سـەخت و بێدەنگ باربکات. لەم کتێبەدا، بەجۆرێ وردەکاری مـادی، لـە کابوسـێکی خەیاڵییـەوە دەئـاڵێنێ، کـە کەسـێکی وەکـو فلـوبیر بەهـەموو وردییەکی شیکاریانەی خۆیەوە، ناتوانێ نکوڵی لێبکات. وەختـێ دەڵێـت: "ئێـوە بەخۆ دەبینن، زۆر باش دەبینن، من شـێت نـەبووم و ئـەقڵم لەدەسـت نـەداوە، هـەموو شـتێک شـیاوە. هـەموو ئەمانـە حەقیقـەتن." وەکـو ئەوەیـە جـۆرە عوزرخواییەک بکات.
وێـڕای ئەمـەش، ئـەم کۆمەڵـە غـەریب و ناسـازە، لـە هـەموو لایەکـەوە دەتەقێتـەوە و دەشـکێ. لـەم دیمـەن و دیکـۆرەدا کـە بـەوردی ڕێکخـراوە، ڕووداوەکان، بە ڕیتم و ئاهەنگێک بەدووی یەکدا دێن، وەکـو ئـەوەی لـە خەونـدا ڕوو بـدەن. خەڵکـەکان گـەردەلوولێکی یـەجگار تونـد، کـە لـە مقاومـەت نایـەت، بەهەموو لایەکدا ڕایان دەماڵێت. ئەمانـە درێـژ داڕییـەکی زۆر دەکـەن، بـە پـازدە لاپەڕان قسان دەکـەن و بـە بـەرچاوی خەڵکەکـەوە و بەئاشـکرا، ئیعترافـی خـۆ دەخوێننەوە، کەی دەخەون؟ کەی دەخۆن؟ نووسـەر بەخۆیشـی نازانێـت هـیچ شـتێک پەیوەندی بە هیچ شـتێکی دیکـەوە نییـە. کـەس بەکـەس نییـە، کـەس ناتوانێ متمانە بەکـەس بکـات.چـاک و خـراپ تێکـەڵ دەبـن. دیوارەکـە کـەلێن و

کەلەبەری گەورەی تیایە، ئەکتەرەکان، بـە ڕوخسـاری پـیس و دزێـوی شـەیتان ئاسـاوە، لـە دەشـتێکی ڕەقـەن و بەردەڵانـدا دەوری خـۆ دەگێـڕن، لـەنێو ڕوناکییەکی سارد و سەهۆڵبەنداندا، لەنێو ڕوناکییەکی مردەڵەی میتافیزیقیـدا، وەکو ئەوەی کۆتایی جیهان بنوێنێ، ڕۆڵی خۆ دەبینن.

کارەسـات و تراجیـدیای ئەمانـە، کارەسـاتێک نییـە کـە بـە گـوێرەی یاسـای زانستی بێتە فامین و دەرک کردن. کارەساتی ئەمانە لە دەرێـی ئـەم یاسـایانە دێتـە دەرککـردن و فـامین. تـەنیا لـە دەروونـی ئێمـەدا هەیـە. قارەمانـانی دوستویفسـکی چ پیـاو چ ژن بـن، بـەگوێرەی نـۆرینی خـەڵکی بـۆ حەقیقـەت، بوونی حەقیقیان نییە. بەڵکو دەبێ وەکو حەقیقەتێکی لاوەکی قـەبووڵ بکـرێن. ئەمانە جۆرێکن، کـە ئەگـەر یاسـاو ڕێسـای جڤـاکی و کۆمەڵایـەتی و، جۆرەهـا قەدەغەی جەستەیی و مـەتریالی و داب و نـەریتان، ئێمـەیان لـە قاڵـب نـەدابا، ئێمـەش وەکـو ئـەوان دەبـووین. ئەمانـە بوونـەوەرانێکن وەکـو مـن و تـۆ، بـەڵام بێئەوەی کارێک بکەن، یـا قسـەیەک بکـەن، لەبـەر چـاو گیـراون. ئـەوەی ئـەوان دەیکەن هەمان ئەو شتەیە کـە لـەگین بـوو ئێمـەش بمانکردبـا،ئەگەر...ئەوەی ئەواندەیڵێن لەگین بوو ئێمەش بیڵێیین ئەگەر... دوستویفسکی ئەم ئەگەرانـەی سڕیونەوە و وەلای ناون. ئامرازی مەرج قەبووڵ ناکـات. بـەجۆرێ قارەمانـەکانی خۆی وادار بەکارکردن و پەیقین کردووە، کە لە بیرو خەیاڵی ڕووتـدا کـار بکـەن و بـاخفن. قارەمـانی ڕۆمانـەکانی ئـەو بیـری ڕووتـن کـە لـە چوارچێـوەی مـادەدا دەجوڵێن. پیاوی ژێر زەمینەکە، ڕاسکولینیکوف، ستاڤروگین، کیریلوف، شـاتوف، ڤیرخوفنسـکی و ئیڤـان کارامـازۆف، هـەر یـەکێک لـەم بوونەوەرانـە، بیرێکـی سـەربەخۆن بـۆ خۆیـان. هـەر یـەکێک لەوانـە بـە ئـاواتی ئایدیایەکـەوە دەژی و دەسـووتێ. پـارە و خۆشـگوزەرانی، پایـە و پێگـەی جڤـاکی و کۆمەڵایـەتی، بـۆ ئەوان و لای ئەوان ناکاتە هیچ و هـیچ ڕۆڵێـک نـابینێ. گاڵتـەیان بـەوە دێـت کـە لەژێر پێیانە، کە لـە ژێـر دەسـتیانە، کـە لـەژێر دانیانـە، کـە بـە بەرچاویانەوەیـە، گاڵتـەیان بـە هـەموو ئەوانـە دێـت. لای ئـەوان هـیچ مـەرزێـک لـەنێوان واقیـع و خەیاڵ و خەوندا نییە. لە نێوان ئەم دوانەدا دێن و دەچن، پەرە بە دنیا دەدەن.

هـەروەها ناکرێـت، بگـوترێ کـە قارەمانـەکانی دوسـتویفسـکی لـە بنەڕەتـدا ڕووس و ڕێسـک و ڕەفتـارو سـەربوردی ژیانیـان تـەنیا بـۆ ڕووسـیان و لـە وڵاتـی ڕووسـیادا قـابیلی دەرک و تەسـەورە، وەکـو هەنـدی کـەس وای بۆچـوون. هەڵبەتە ئەو بۆچوونە ڕاست نییە، کەوا تەسەور بکرێت کە ڕووسیای سـەدەی نۆزدەیەم پڕ بوو بێ لە خەڵکانی هیستریک، ڤێدار و سیلاوی و ئەمـە نموونـە و ڕەنگدانەوەی میللەتی ڕووسیا بووبێ لـە ڕۆمانـەکانی دوستویفسـکیدا، بـەڵکو بە پێچەوانـەوە کاردانـەوەی خوێنـەران و ڕەخنـەگران تێکـڕا، ئـەوە بـوو کـە "ئـەم خەڵکانە، خەڵکی وڵاتی ئێمە نین." بۆ نمونە کۆنت کوچولوف دەربارەی یـەکێک لـە قـارەمانـەکانی ڕۆمـانی (مـدلون مهـابون) دەنوسـێت: "ئـەم قـارەمانـە بـۆ هەندەران، بۆ وڵاتانی وەکو فەرەنسا و ئینگلتەرا و بـەلچیکا، واقیعـی تـرو بـاوەڕ کردەنی ترە، تـا ڕووسـیا..." ئـەوەی ڕاسـتی بـێ، خولیـای هـزر و بیـرێن بـەرز، جـۆش و خرۆشـی فیکـری و ڕۆشـنبیریی، ڕەفتـار و شـۆخ تەبعییـەکان، هـەر

هــەمووی لــە تایبەتمەندییــەکانی تــەبع و تەبیعــەتی ســـلاڤییانە. بێگومــان حەقیقەت لەلای سلاڤییان، لە قوڵاییەکی کەمتردا پەنهانە تا لە لای لاتینـەکان و ساکســـونەکان، بــەڵام جیاوازییەکــە لێــرەدا لــە ئاســـتەکاندایە نــەک لــە تەبیعەتەکاندا، قارەمانەکانی دوستویفسکی تەنها. ڕووس نین، چونکـە کێشـە جیهانییەکانیان بەسەردا زاڵە، ئەو بیرو هزرانـەی نیشـانی دەدەن، کەوشـەنی ئــەدەبیات و کــەلتووری نیشـــتمانی و نەتــەوەیی ڕووس دەبــەزێنن، باســـی نیگەرانی و خـەمی خـەڵکی دنیـا لەهەنبـەر خەلیقـە و خەلقـدا دەکـات. نـەک نیگەرانی و خەمی میللەتی ڕووس. پیاوە ژێر زەمینی یەکـەی دوستویفسـکی سنوورەکان دەبەزێنێ و وڵاتان لە تۆڕێکی پەنهانیدا پێکەوە گرێ دەدات.

بەهەرحاڵ، ئەم ڕۆمانە، یاداشتە ژێر زەمینییەکان کە هەوەڵجار لە گۆڤاری سەردەمدا بڵاوبووەوە، سەرنجی ڕەخنەگرە ناودارەکانی ڕانەکێشا. تەنیا ئاپولون گریگوریف بە دۆستویفسکی گوت: "پێویستە لەمەودوا، ئەمجۆرە ڕۆمانە و بەمجۆرە بنووسیت." دوستویفسکی، هەرگیز ئەو وشە سادانەی لەبیر نەکرد.

بەڵام گۆڤارەکە، بـەڕیک و پێکـی و بـە بـەردەوامی دەرنـەدەچوو. بەشـدارانی گۆڤارەکە، ناڕەزایی دەردەبڕن و نامە بۆ سەرنووسـەی گۆڤارەکـە دەنێـرن. ڕادە و ڕێژەی فرۆشـتنی گۆڤارەکـە، بەشـێوەیەکی ئەسـتوونی دادەبـەزێت. میشـێل، کەسـێکی نائیـداری بـوو، هیچـی لـە ژیـانی پراکتیکـی نـەدەزانی. ئەمـە جگـە لەوەی ماوەیەک بـوو، لـە ڕادەبـەدەر خـووی دابـووە بادەنۆشــی و، گۆڤارەکـەی پشت گوێ خستبوو و ڕۆژ بە ڕۆژ، پتر ئاستی دادەبەزی.

فیدور میخائیلوفیچ، لە مۆسکۆ گیری خوارد بوو. حاڵی ماری دیمیتریفنا ڕۆژ بە ڕۆژ خراتر دەبوو، وێڕای ئەمەش، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە کوڕەکەی خۆی نەبینێ.

دوستویفسکی، لە ١٨٦٤/٣/٢٦دا، نامەیەک بۆ میشێلی برای دەنووسێت، دەڵێت:"ماری دەڵێت کە هەستی بە نزیک بوونەوەی مەرگی خۆی کرد، لەدوی کوڕەکەی دەنێرێت. تا دوعای خێری بۆ بکات و ماڵاوایی لێبکات."

هەروەها لە نامەیەکی ١٨٦٤/٤/٢دا بۆ میشێل، دەڵێت: "هەموو ڕۆژێ چاوەڕوانی مردنی دەکەین، ئازارەکەی لە کێشدا نییە، من تەحەمولی ئەنجامەکانی دەکەم."

لە ١٨٦٤/٤/١٠ نامەیەک بۆ بول ئیسایيف دەنێرێت، دەڵێت: "نەخۆشیەکەی دایکت بەرە بەرە خراتر دەبێت، دکتۆر هیچ وەڵامێکمان ناداتەوە، لەوەدەچێ دەستی لێ شۆرد بێ، دوعای خێری بۆ بکە پاشا."

لە پازدەی ١٨٦٤/٤دا، ماری تووشی حاڵەتێکی ترسناک دەبێ: خوێنێکی زۆر هەڵدێنێت، هەناسەی تەنگ دەبێت. دوستویفسکی بروسکەیەک و نامەیەک بۆ براکەی دەنێرێت: "تکایە پاشا بۆ ئێرە بنێرە، ڕەنگە چاکەتی ڕەشی هەبێ، بەڵکو پانتۆڵێکی ڕەشیشی بۆ بکڕیت."

ماری، شەکەت و ماندوو، لەوپەڕی بێ حاڵیدا دەبێ. بەڵام هۆشی بەخۆیەوە دەبێت، گەردن ئازایی دەگەڵ هەموو ئەوانەی دەوروبەریدا دەکات و بەجورئەت و بوێرییەکی سەیرەوە خۆی بۆ مردن ئامادە دەکات.
ئازای دەکەوێتە لەرزین، هەناسەی خێراو سوار دەبێت، خنکە خنکی پێدەکەوێت. ئەوجا ڕوخساری زەردو ژاکاوی بە پشتا دەکەوێت. زاری دەکرێتەوە، لاقی گرژ دەبن، هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێت. دۆستویفسکی پاشان، حاڵەتی گیانەڵڵای کاترین ئیڤانوڤنای، کە نەخۆشی سیلی هەبوو، لە ڕۆمانی تاوان و سزادا، بەهەمان شێوە گێڕاوەتەوە.
ماری دیمیتریڤنا، سەعات حەوتی ئێوارە، دواهەناسە دەکێشێت. دوستویفسکی نامەیەک بۆ میشێلی برای دەنووسێت: "ئەمشەو، سەعات حەوت ماری مرد، دوای ئەوەی هیوای تەمەن درێژی بۆ هەمووتان خواست. لە نوێژ و نزاکانتاندا لەبیری مەکەن. بەڕاستی عەزابی کێشا، عەزابێکی وەها کە من لەخۆ دەپرسم، چۆن دەشێت لە ڕەحمەت و بەخشینی خودایی بێبەش بێت."
دۆستویفسکی، هەمان شەو، لەبەردەم جەنازەی ژنەکەیدا ئەم ڕستە سەیرە لە دەفتەری یاداشتەکانی خۆیدا دەنوسێت: "ماشا (ماری) لەسەر مێزەکە پاڵکەوتووە، ئایا، من ڕۆژێ لە ڕۆژان، ماری دەبینمەوە؟"
وێڕای ئەوەی کە ماری خیانەتی لێکردبوو، و زۆری عەزاب دابوو، ژیانی لێکرد بوو بە دۆزەخ، کەچی دۆستویفسکی ئەم جودابییەی زۆر لەبەرگران بوو وباوەڕی نەدەکرد، کە بەیەکجارەکی لێکدی جودا بوونەتەوە. ئەم ژنە بەشێکی گرینگ بوو لە ژیانی ڕابردووی ئەو. ئەم ژنەی کە هەنووکە بە چاوانی نوقاوو زاری لێک نراوەوە لەسەر مێزەکە بێجووڵە ڕاکشا بوو، دەیکردە، تێکڕای لاوی وگەنجایەتی ئەو. لەناکاوا هەستی بەتەنیاییەکی سەیر کرد. سەرگەردان و بێکەس، دەترسا بەمجۆرە درێژە بە ژیان بدات، دوای ساڵەها ژیانی هاوبەش، تازە پەی بەبایەخی ژنەکەی دەبرد.
لە ٣١/ئازار/١٨٦٥دا، نامەیەک بۆ ڤیرانگیل دەنووسێت: "ئاهـ هاوڕێ، ئەو خۆشەویستی من بوو. یەجگار خۆشی دەویستم. منیش لەڕادەبەدەر خۆشم دەویست، بەڵام لە ژیانی هاوبەشماندا بەختەوەر نەبووین... لە ژاینی خێزانداریماندا، کە بەهۆی تەبیعەتی غەریبی خۆیەوە، هەمیشە بە گومان بوو، بەختەوەر نەبووین. بەڵام وێڕای ئەوەش هەریەکدیمان خۆشدەویست، تا پتر بەدبەخت دەبووین، زیاتر لەیەکدی نزیک دەبووینەوە. ئەم ژنە، لە هەر هەموو ئەو ژنانەی کە لەژیانمدا ناسی بوومن، شەریفتر و ڕاستگۆتر و خانەدانتر بوو. هەرگیز تەسەورم نەدەکرد بە مردن و ناشتنی ئەو، بەم ڕادەیە تووشی عەزاب و ناڕەحەتی دەبم.."
دوای ئەنجامدانی، ڕێورەسمی پرسە و تازەیەداری، دوستویفسکی بۆ سان پتروسبۆرگ دەگەڕێتەوە، تا لەوێندەر بەکاروباری گۆڤارەکەی ڕابگات. بە هەموو توانایەکی خۆیەوە دەکەوێتە کارکردن. دەیەوێ لە ڕێگەی کارکردنەوە، خەم و پەژارەی خۆی لەبیربکات. بەڵام سێ مانگێک نابورێت، کە ماتەمێکی دیکە

بەرۆکی دەگرێت. لە ٦/٩دا نامەیەک بۆ پول ئیسایيف دەنووسێت: "پاشا گيان، براکەم لە حاڵی مردندایە، بەڵکو هەندێ جلم بۆ دەنێریت. ئەمە بۆ کەس مەگێڕەوە. نامەم بۆ نیکولا ناردووە. ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کەم بێم بۆ شار. بە هیوای خۆشیت. مامی دڵسۆزت: ف. دوستویفسکی."

میشێل لە ١٠/٧دا، سەعات حەوتی بەیانی. بەهۆی نەخۆشی و ئاوسانی جگەرەوە، دەمرێت. ئەم کۆستە هێندەی دی دوستویفسکی خەمبار و پەشێو دەکات. وای هەست دەکرد قەدەر ماوەی نادات پشوویەک بدات و چنگ لەسەر شان لەدووی ئەمە و بیرەحمانە تاقیبی دەکات و لێی نابێتەوە. کە ژنەکەی مرد، براکەی هەبوو کە دڵخۆشی دەدایەوە، بەڵام هەنووکە، کەسی نەماوەو بەتاقی تەنیا تەنیاتر لەوکاتەی کە لەزنداندا بوو. تەنیاتر لەوکاتەی کە لەتاراوگەی سیبریا بوو. نەیدەزانی لەپێناوی کێ و لەڕای چیدا دەژی:

"من بەتەنیا ماومەتەوە، دەترسم. ژیانم وێران بووە، بوو بە دووبەشەوە، بەشی یەکەمیان ڕۆیی، تەواو بوو، ئەوانە بوو کە لەپێناویاندا ژیام، بەشی دووەمیان کە هێشتا دیار نییە، هەمووشتێک تازە و نامۆیە، بێئەوەی دڵێک بتوانێ جێگای ئەو دوو دڵەم بۆ پڕبکاتەوە کە لەدەستم چوون. ئایا دەتوانم پەیوەندی و دۆستایەتی تازە، بۆ خۆ پەیدا بکەم، ژیانێکی تازە بۆ خۆم دروست بکەم؟ ئەم بیرانە، بێتاقەتم دەکەن، بۆ یەکەمجارە هەست دەکەم کە کەس نییە جێی ئەوانم بۆ پڕبکاتەوە و من لەم دنیایەدا تەنیا ئەوانم خۆش ویستووە. ئیدی ئەشق و خۆشەویستی تازە نەک هەر مەحاڵە، بەڵکو کوفریشە. هەست بە چۆڵەوانی و سەرما دەکەم..."

## فەسڵی پێنجەم
## بێوە پیاو

میشێل، تەنیا سێ سەد ڕۆبڵی لەپاش بەجێ مابوو. کە بە جڕە جڕ بەشی کفن و دفنەکەی کرد. بەڵام بیست و پێنج هەزار ڕۆبڵ قەرزدار بوو، کە پازدە هەزاری بەگوێرەی سەنەد و کومپیالە بوو، دەبوایە لەکاتی خۆیدا بدرێتەوە. گۆڤارەکە، بەقەرز و بە ئیحتوباری بەڕێوەبەرەکەی دەردەچوو، کە بەڕێوەبەرەکەی مرد، ئەویش وەستا. قاسەی گۆڤارەکە بەتاڵ بوو، شنقڕی تیا نەبوو. بەڵێنی شەش ژمارەی گۆڤاری سەردەم، بەو هاوبەشانەی کە پێشوەختە ئابوونەی خۆیان دابوو، درا بوو، ئەمانە داوای گۆڤارەکەیان دەکرد، چاپ کردنی ئەم شەش ژمارەیە هەژدە هەزار ڕۆبڵی تێدەچوو. خۆ ئەگەر ئەم هەژدە هەزار ڕۆبڵە بخرێتە سەر ئەو پازدە هەزارەی کە دەبوایە بەپەلە لەکاتی دیاریکراودا بدرێتەوە، ئەوا دەیکردە سی و سێ هەزار ڕۆبڵ، تا گۆڤارەکە بتوانێ دەربچێت و بەردەوام بێت. هەڵبەتە دوستویفسکی دەیتوانی خۆی لە دانەوەی ئەو هەموو قەرزە بدزێتەوە، چونکە بەناوی ئەوەوە نەبوو. هەروەها دەیتوانی گۆڤارەکە ڕابگرێت و دەری نەکات و کەلەپولەکانی بخاتە هەڕاجەوە و قەرزی، خاوەن قەرزەکان، واتە بەشدارانی گۆڤارەکە، بداتەوە. بەڵام ئەمەی بەجۆرە سووکایەتیەک بۆ براکەی دەزانی، بۆیە دەستبەرداری ئەم بیرۆکەیە بوو و بەکارێکی ناپەسەند و نابەجێی دەزانی، بۆیە چووە ژێر باری دانەوەی هەموو قەرزەکان، چ ئەوانەی قەرزی ڕاستەقینە و بەڵگەدار بوون و چ ئەوانەی گومانیان لەسەر بوو.

کارێکی لەوەش باشتری کرد کە ئەوە بوو بەکەماڵی جوامێری بێوەژنی براکەی و هەر چوار منداڵەکەی گرتە ژێر باڵی خۆی و مەسرەف و خەرجی دەکێشان.

دوستویفسکی، پاش ئەوەی ئەو بڕیارانەی دا. چوو بۆ مۆسکۆ. دە هەزار ڕۆبڵی لە پوورە "کومانین"ی کە پیرەژن بوو، قەرزکرد و بۆ سان پتروسبۆرگ گەڕایەوەو لێبڕا گۆڤاری سەردەم، بەهەر نرخێک بووە دەربکاتەوەو درێژەی پێبدات. بەڵام گرفتێکی قورس لەئارادا بوو. گۆڤارەکە دەعوای لەسەر بوو و داخرا بوو، دەبوایە مۆڵەتنامەی تازەی لە دەزگای سانسۆرەوە بۆ وەربگرێت. بۆیە ژمارە سی و یەکی گۆڤارەکە کە دەبوا لە مانگی کانوونی دووەمدا دەربچێت دواکەوت بۆ بیست و دووی مانگی سێ. ئەمە جگە لەوەی ناو و ئیمزای دوستویفسکی لەسەر وتار و نووسینەکانی چ وەکو نووسەر و چ وەکو وەشانکار قەدەغە بوو. دیارە بەشدارانیش لە دواکەوتنی گۆڤارەکە زۆر بە گلەیی بوون و بەنامە و بە زمانی زۆر توند، ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕی.

دوستویفسکی، لەم سەروبەندەدا، لەپڕ کاریدا، خەریک بوو بە هیلاک دەچوو. گۆڤارەکە، لەسێ دەزگای جیاواز چاپ دەبوو و پاشان کۆ دەکرایەوە. فیدور میخائیلوفیج کە سەرنووسەر و بەڕێوەبەری گۆڤارەکە بوو، بەتاقی تەنیا بابەت و پرۆڤەکانی ڕاست دەکردەوە و هەڵەچن دەکرد. پێشوازی ئەدیبان و نووسەرانی دەکرد. دەگەڵ کارمەندانی سانسۆردا گەنگەشە ومشت و مڕی دەکرد. دەستکاری وتارانی دەکرد و هەڵەچنی دەکردن، لە سەرانسەری شاردا لە دووی پارە پەیدا کردن بوو. بە بەردەوامی لە ئێوارەوە تا سەعات شەشی بەیانی کاری دەکرد. لە شەو ڕۆژیکدا تەنیا پێنج سەعات دەنووست.
جارێک نامەیەک بۆ ڤیرانگل دەنێرێت، دەڵێت: "ئاهـ! برادەری ئازیز، ئامادەم، بە خوایشتی خۆم، بە ئەندازەی ژمارەی هەمان ئەو ساڵانەی کە لەزنداندا بەسەرم بردن، بۆ جاری دووەم بچمەوە زندان، ئەگەر بەو کارە بتوانم قەرزەکانم بدەمەوەو دووبارە ئازاد ببمەوە... بە تەواوەتی وەڕەز بووم، لە پەلوپۆ کەوتووم، جگە لە هەستی نیگەرانی و پەشێوی هیچی ترم بۆ نەماوەتەوە، نائومێدی و بێهیوایی زۆری بۆ هێناوم.. ئیدی خەم و پەژارە، تاڵی و ناخۆشی بوون بە بەشێک لە ژیانم، ئەمە جگە لە تەنیایی.. وێڕای هەموو ئەمەش وام دێتە بەرچاو کە هەمیشە ئامادەم بۆ ژیان، کە ئەمە مایەی پێکەنینە، وانیە؟ ئەمە هەمان ژیاندۆستی و سەرسەختی پشیلەیە." ئیدی بەو جۆرە، بەناچاری لەخەم و پەژارەکانی هەڵدەهات و بەرەو پیری ژیان دەچوو. هەوڵدەدات پەیوەندی خۆی دەگەڵ خزم و کەسوکار و دۆستانیدا، تازەبکاتەوە و دۆست و ناسیاوی تازە پەیدا بکات. بەو جۆرە، بەرە بەرە دەست بە ژیانی ئاسایی خۆی دەکاتەوە. دەگەڵ ماڵباتی کورفین کروکوفسکیدا ئاشنایەتی پەیدا دەکات، کە ئاننای کچە گەورەیان، دوو چیرۆکی ناسک و جوانی بۆ گۆڤاری سەردەم نارد بوو.
ئاننا، کیژێکی بەژن زراڤی، خۆش خەت و خاڵ و ڕەزا سووک، قژ درێژی ، قژ زەردی چاو سەوزی، وەکو چاوانی پەری دەریا بوو. کچێکە زیرەک و سەربەست، مەغروور و متمانە بەخۆ، بەتەمایە لەپاڵ پیاوێکی دەگمەن و هەڵبژاردەدا، ڕۆڵێکی گەورە بدینێ.
دۆستویسفکی لە حوزوری ئاننای خشیک و خانەوادەکەیدا، هەستی بە خەمینی و شپرزەیی دەکرد: "هەمیشە پەست و بێحەواس دەهاتە بەرچاو. بەردەوام و بەتووڕەیی دەستی بە ڕدێنە تەنک و زەردەکەیدا دەگێڕا، بە ڕوخساری گرژەوە سمێڵی دەجوو."
ڕۆژێک وێڕای ئەوەی داک و بابی کچەکان پێیان ناخۆش دەبێ، دوستویفسکی لێدەپرێت، کە چیرۆکی "ئیعترافەکانی ستافروگین" کە بەشێک بوو لە ڕۆمانی ئایندەی ئەو، بۆ ئەم کیژانە بخوێنیتەوە. کچەکان، بەتەواوەتی دەکەونە ژێر باندۆر و کاریگەری ئەم چیرۆکەوە. ئاننا، زۆر بەخۆی دەنازێت کە پیاوێکی ئەوەندە فاماو خوێنەوار و پڕ بەهرە و بەهرەمەند، بەو ڕادەیە بایەخ بەم دەدات. بەڵام ئاننا، هەڵوێست و بۆچونی نەرینی

دوستویفسکی سەبارەت بە لاوان و هزر و بیرێن تازە، پەسەند ناکات و لەو ڕووەوە گلەیی لێدەکات.
دوستویفسکی دەڵێت: "گەنجانی ئەمڕۆ، هەموو گەوج و نەزانن، بەلای هەر یەکێک لەوانەوە، جووتێ پێڵاو زۆر بەنرخترە لە پوشکین." ئاننا وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "پوشکین بۆ نەوەی ئێمە پرێک کۆن بووە." دوستویفسکی دەئاڵۆزێت، هاوار دەکات، هەڕەشەی تۆران و ڕۆیشتن دەکات و ئەنجام لە ماڵەکە دەڕوات. بەڵام بۆ سبەینێ بە ژێوانی دەگەڕێتەوە. وێڕای ئەوەش، شەوێک کاتێ کە سونیا، خوشکە چکۆلەیان، سۆناتای پاتیتیکی، کە دوستویفسکی حەزی لێدەکرد و سونیا لەبەر خاتری ئەو فێری بوو بوو، لێدەدا، ئانناو دوستویفسکی لە هۆڵە چکۆلەکەدا ڕازو نیازی تایبەتیان دەکرد.
دوستویفسکی لەبن لێوانەوە دەڵێت: "من هەر لەیەکەم دیدارەوە خۆشم ویستی.. حەز دەکەم لێم تێبگەی و ئەوە بزانی کە ئەمە تەنیا دۆستایەتیەکی سادە نییە، بەڵکو ئەشق و ڤیانێکی جدیە و سەراپامی گرتووە."
بەڵام ئاننا، دەترسا، چارەنووسی خۆی بەم پیاوە بلیمەت و نەخۆشەوە گرێ بدات و خوازگاریەکەی ڕەتکردووە. ئەوان بە دەنگی نزم قسانیان دەکرد، بەڵام سونیا، دەستبەرداری پیانۆلێدانەکەی دەبێت و گوێ بۆ قسەکانی ئەوان هەڵدەخات.
ئەم کیژە چکۆلە چواردە ساڵانە، شێتانە دوستویفسکی خۆشدەوێت، ڕەفتار و مانۆڕەکانی خوشکە گەورەکەی خۆی بەدڵ نابێت. ئیدی دوستویفسکی داماو و بەلەنگاز، بەپشتی چەماوەوە، دەرگای ماڵەکە دەکاتەوە، تا بەرەو دنیای تەنیایی خۆی بڕوات. بەڵام دوستویفسکی کە لە ڕۆمانەکانیدا، توانی بووی بەو زەبەردەستیە پەی بە قوڵایی دەروون و ڕوحی کیژانی وەکو نیتوچکاو نیللی کورپە کچ بەرێت، ئێستا نەیدەتوانی ڕوخسار و ڕەفتاری سونیای کۆرپە کچ، کە بە نیگا، دوستویفسکی بەڕێ دەکرد، بخوێنێتەوە و بچێتە بنج و بناوانی.
قەدەری سونیا، وابوو کە ببێت بە زانایەکی زۆر بەناوبانگی ماتماتیک، بەنێوی سۆفیا کوفالیفسکی، بەڵام ئاننا، بیرو هزرەکانی خۆی، لەو بارەیەوە کە دەبێ ببێ بە شەریکی ژیانی پیاوێکی گەورە، بەمجۆرە هێنایەدی کە شووی بە پیلانگێڕێکی فەرنسایی بەنێوی جاکولار کرد کە مەحکووم بە ئیعدام بوو و لە قەڵایەکی نزیکی سنووری ئەڵمانیادا زندانی بوو. جاکولار توانی بەکۆمەک و یارمەتی خەزووری، کە بڕی بیست هەزار فرانکی بە بەرتیل دابوو بە قەرەوڵێک، لە زندان هەڵێت.
دوستویفسکی، جارێکی دی هەستی کرد کە لەلایەن ژنێکەوە سووکایەتی پێکراوە و زۆر بەگەرم و گوڕی گەڕایەوە سەر ئیش و کارەکەی خۆی، بەڵام تیراژی گۆڤارەکە ڕۆژ بە ڕۆژ دادەبەزی و لەکەمی دەدا. ژمارەی بەشداران دابەزی بۆ هەزار و سێسەد کەس. خاوەن قەرزان، کە دوستویفسکی بەڵێنی دابوونێ قەرزەکانیان بداتەوە، ج بەنامەو چ بەسەردان، تەنگیان پێهەڵچنی بوو.

لە ئـاخرو ئـۆخری هاوینـدا، ئینزارێکـی درایە کە ئەگەر فـڵان قەرز نەداتەوە، گرتن و زندان چـاوەڕوانی دەکـات. قەرزەکە بریتـی بـوو لە نـزیکەی سـێ هەزار ڕۆبـڵ. دوستویفسـکی هەوڵـدەدات بەهەر جـۆرێ بـووە، خـاوەن قەرزەکـان دڵنیابکـاتەوەو بـۆ مـاوەیەک سـەبری لێبگـرن. بەڵام خراپـی بـازاڕی گۆڤـارەکە لەوەدا نەبوو، بشێت قسە دەگەڵ خاوەن قەرزەکاندا بکرێ. ڕۆژنـامەی "دەنـگ" لە ٩/حوزەیراندا، هەواڵی ڕاگرتن و داخستنی گۆڤـاری سـەردەم ڕادەگەیەنێـت. هەنگێ وەشـانکارێک بەنێـوی ستیلوفسـکی دەڕوات بـۆلای دوسـتویفسـکی و پیشـنیازی ئەوە دەکـات کە ئیمتیـازی چـاپی هەمـوو بەرهەمەکـانی لەسـێ بەرگـدا، بە سـێ هەزار ڕۆبـڵ لـێ بکڕێـت. هەروەهـا ستیلوفسـکی، داوای لێـدەکات کە پـێش ١/١٠/١٨٦٦ ڕۆمـانێکی بڵاونەکـراوەی ڕادەسـت بکـات، بەو مەرجەی کە ئەگەر تـا ئەوکـاتە ڕۆمـانەکەی نەداتـێ، ئەوا دوسـتویفسـکی جەریمەیەکـی دارایـی بـدات. ئەگەر تـا ١/ک١ دەستووسـەکەی نەداتـێ، ئەوا دۆستویفسکی هیچ مافێکی بەسـەر ئەم بەرهەمـانەی ئێسـتاو ئایندەشـیەوە نامێنێ و دەبن بە موڵکی یارۆی وەشانکار.
دیارە ستیلوفسکی، حیسـابی خـۆی دەزانێـت و دڵنیـایە کە دوسـتویفسـکی ناتوانێ بەڵێنی خۆی بباتە سەر و لەکاتی دیاریکراودا نووسـینەکە بـدات بەم، و ئەنجام بەم فێڵە دەبێت بە خاوەن ئیمتیـازی هەمـوو بەرهەمەکـانی ئێسـتای و ئەوانەی لە ئایندەشدا دەیاننووسێت.
ستیلوفسکی، لەناوەندە ئەدەبی و هونەرییەکەی سەردەم و زەمانی خۆیدا بە پیاوێکی کەڵەکباز و دەستبڕ ناسرابوو. دەستی خەڵکانێکی زۆری وەکو پیسمسکی، کریستوفسکی، گلینکای پڕی بوو و فریوی دابوون. ئەم پیاوە نەفس نزم و بودەڵە و کڵاوچیە لەسەر حیسابی کڵۆڵی و داماوی خەڵک، خۆی دەوڵەمەند دەکرد. سەردانی هەرکەسێکی کردبا، کڵاوێکی لەسەر دەناو قوڵی لەبنەوە دەبڕی.
هەڵــبەتە دوستویفســـکی، بەو قەراردادەی دەگەڵ ئەودا کـــردی، بەرەو کارەساتێکی گەورە دەڕۆیی. بەڕێـکەوت، ئەو مـودەتی دوازدە ڕۆژەی کە یـارۆی وەشانکار دابووی بە دوستویفسکی تا بیر لە مەسەلەکە بکاتـەوە و دوا بڕیـاری خۆی بدات، ڕێـک بەرانبـەر بـەو مودەتـە بـوو کـە خـاوەن قـەرزان پێیـان دابـوو تـا قەرزەکانیان بداتەوە، دەنا دەستگیر دەکرێت و دەخرێتە زندانەوە.
دوستویفسکی قەراردادەکـەی دەگـەڵ یـارۆی وەشـانکاردا ئیمـزا کـرد. بـەڵام لەڕاسـتیدا ستیلوفسـکی هـەموو پارەکـەی نەدەدایـە، چونکـە هەنـدێ لـەو سـەنەدانەی کە دوستویفسکی ئیمزای کرد بـوون، بـە نرخێکـی هـەرزان کـڕی بووەوە. واتە ئەوەی وەکو وەشانکار بەم دەستە دەیدا بە دۆستویفسکی، وەکـو خاوەن قەرز بە دەستەکەی دی لێی وەردەگرتەوە.
ئیدی لە ماوەیەکی کەمدا، ئەوەی لەتێکڕای پارەی قەراردادەکە بۆ دۆستویفسکی دەمایەوە تەنیا سەدو هەفتا و پێنج ڕۆبڵی زیوو بوو. بەڵام گرینگ نەبوو! دوستویفسکی لێبڕا، سەفەری هەندەران بکات.

سێ مەبەستی لەم سەفەرەدا هەبوو. دەیویست جارێکی دی پولین بدینێتەوە، چونکە هێشتا لەبیری نەچوو بووەوە و هەر خۆشی دەویست. لە نامەیەکیدا بۆ خوشکەکەی دەڵێت: "من هێشتا هەر خۆشم دەوێ، زۆریش خۆشم دەوێ، چەند حەزم دەکرد چیتر خۆشم نەوێ. چونکە بەڕاستی شایستەی خۆشەویستی من نییە" هەروەها دەیویست جارێکی دیکەش بەختی خۆی لە واری ڕۆڵێتدا تاقی بکاتەوە. هەروەها بەتەمابوو، لە هەندەران، کاتی خۆی تەرخان بکات بۆ نووسین و تەواوکردنی ئەو ڕۆمانانەی کە داوایان لێکردبوو. دوستویفسکی لە ئاخرو ئۆخری مانگی تەمووزدا دەگاتە ویزبادن. قەرار بوو سوسلوڤا لە کۆتایی مانگی ئابدا بچێت بۆ ئەوێندەرو لەوێ یەکدی بدینن. دوستویفسکی لەو ماوەیەدا و بەدەم چاوەڕوانی گەیشتنی پولینەوە هاتوچۆی قومارخانە دەکات.

دیسان، هەمان ماهوتی سەوزی گەورە دراوە بەسەر مێزێکدا، پڕە لە لیرەی زێڕ و دراوی هەمە جۆری ئەڵمانی و هۆڵاندی. دیسان هەمان ڕوخسارێن جدی و پەست کە نیشانەی چاوچنۆکی و ئارەزووی بردنەوەیان لێدەبارێت، هەمان ئەو دەستە تووڕانەی کە قەراخی مێزەکەیان گرتووەو دەڵێی لەسەر هەڵدێرێکی ڕکدا خۆیان بەموحەجەرەکەیەوە گرتووە. دیسان گوێی بە هەمان ئەو وشە ئەفسووناویانە دەزرینگێتەوە:سی ویەک، سوور، تاک و بردنەوە... چوار، ڕەش، جووت و دۆڕان..."

لە ڕۆمانی قوماربازدا دەڵێت: "تام لێبوو، ئاگام لەخۆ نەبوو، بەیەک زەربە، ئەو خەرمانە زێڕەی سەر خانە سوورەکەم ڕاکێشاو لەپڕ وەخۆ هاتمەوە. تەنیا یەک سات بوو. بەدرێژایی ئەو شەوە تەنیا بۆ ئەو ساتە وەخۆهاتمەوە. تەزوویەکی سارد، وەکو بەفر بەسەراپامدا هات. وا پەشۆکابووم دەست و لاقم دەلەرزین. بەوپەڕی بێتوانایی لەوساتە هۆشیارییەدا، هەستم دەکرد و دەمزانی کە دۆڕان بۆ من چەند سەختەو دەکاتە چی..."

دۆستویفسکی لەماوەی پێنج دانە ڕۆژدا، ئەو سەدو هەفتا و پێنج ڕۆبڵەی کە بۆی مابووەوە، دەدۆڕێنێ. هێشتا پارەی ئوتێلی نەدابوو. سەعاتەکەشی دەخاتە بارمتەوە. ناچار غرورو کبریای خۆی وەژێر پێوە دەنێت و داوای یارمەتی لە تورگینیف دەکات، کە هێشتا ڕقی کۆنی لێی بوو. و نامەیەکی بۆ دەنێرێت و دەڵێت: "زۆر خەجاڵەتم کە ناچارم ئیزعاجت بکەم. بەڵام حاڵی حازر، جگە لە تۆ کەسی دی شک نابەم ڕووی لێبنەم. ئەمە جگە لەوەی کە تۆ لەخەڵکانی دی فامیدەتر و ڕۆشنبیرتری. هەر بۆیەش بێهیچ دوودڵیەک ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم. من وەکو پیاو قسە دەگەڵ پیاودا دەکەم و داوای سەد "تالیر"ت لێدەکەم.. کە پیاو کەوتە تەنگانەوە، چاری چیە؟"

تورگینیف پەنجا تالیر بۆ دوستویفسکی دەنێرێت.

دوستویفسکی بەنامەیەک وەڵامی دەداتەوە: "سوپاس، برادەری ئازیز ئیڤان سیرگییفیچ، پەنجا تالیرەکەم پێ گەیی، هەرچەندە بەتەواوەتی ڕزگاری نەکردم، بەڵام باش بوو، کەمێک وەزعی باش کردم."

قێزی لەخۆی دەکردەوە، هەستی بەسووکایەتی دەکرد. پەست و بێزار چاوەڕوانی گەیشتنی (بولین)ی دەکرد، ئێ بەڵکو شتێک پارەی پێ بێ. بەڵام کاتێ پولین دەگاتە ویسبادن پارەی کرێی ئوتێلیشی پێ نایێت.
دوستویفسکی، بیر لەوە دەکاتەوە بەلەز بۆ وڵات بگەڕێتەوە. ئەم هەڵاتنە ئاشقانەیە لە ڕووسیا، ئەم هەڵاتنە لەپێناوی حوب حوبێنە و ئاشقێنیدا، کە لەخەیاڵی ئەودا یەجگار خۆشبوو، بەوە شکایەوە، بۆ چەند ڕۆژێکی کەم لە ئوتێلێکی پەرپووتدا بگیرسێتەوە، کە خاوەن ئوتێلەکە پەلایا ڕەت دەبوو، ڕووی لێوەردەگێڕا، پێشخزمەتەکان، پێی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکرد. پولین، لەکۆتایی مانگی ئابدا ویسبادن بەجێدێڵێ و بەرەو پاریس دەگەڕێتەوە. دوای ڕۆیشتنی پولین، خاوەن ئوتێلەکە نان و خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارە نادات بە فیدور میخائیلوفیچ: "تۆ پێویستت بە خواردن نییە، چونکە ناتوانی بژێوی خۆت دابین بکەی. تەنیا چایت دەدەینێ و تەواو، پێویست بە گەنگەشە ناکات."
دوستویفسکی نامە بۆ پولین دەنووسێت: "ئیدی لە دوێنێوە خواردنم نییە، هەموو خواردنێکم هاتووەتە سەر چای، بەڵام ئەم چایەش ناخورێتەوە. چای ڕووت بەبێ پێخۆر ناخورێت. نە پێڵاوەکانم پاک دەکەنەوە و نە جلەکانم، کە بانگیان دەکەم بە دەنگمەوە نایەن. بۆی و خزمەتکارەکان، بەقێزو بێزەوە مامەڵەم لە تەکدا دەکەن. بەڕاستی ئەڵمانین. بەلای ئەڵمانیانەوە، هیچ تاوانێک لەوە گەورەتر نییە پیاو نەبووە بێ و نەتوانێ لەکاتی خۆیدا قەرزەکانی بداتەوە." دوستویفسکی، لەبەر عیزەتی نەفس، هەموو ڕۆژێک بەر لە وەختی نانخواردن، لە ئوتێلەکە وەدەردەکەوت و درەنگانی شەو، کە دنیا تاریک دەبوو، ئەوسا بۆ ئوتێل دەگەڕایەوە. بەڵام ئەم وەرزشە ڕۆژانەیە هێندەی دی ئیشتیای خواردنی دەکردەوە. بۆیە ناچار کونجی ژوورەکەی خۆی دەگرت. خەریکی خوێندنەوە و نووسین دەبوو. ئیدی کۆمەڵێک نامەی زۆر بۆ خەڵکانی جۆراو جۆر دەنووسێت و داوای پارە دەکات، بەڵام پارەی پولی نابێ کە نامەکان پۆست بکات.
'ئەمڕۆ سێ دانە ڕۆژە، بەیانی و ئێوارە، جگە لە چای هیچی دیکەم نەخواردووە. سەیر ئەوەیە زۆر هەست بە برسێتی ناکەم. ئەوەی مایەی نیگەرانییە، بە هەموو شێوەیەک بەربەرەکانیم دەکەن، هەندێ شەو، تەنانەت مۆمێکیشم پێڕەوا نابینن."
دوستویفسکی داوای یارمەتی لە پولین دەکات. نامە بۆ بارون ڤیرانگیل دەنێرێت کە لە کوپنهاک دەبێ. نامە بۆ هرتزن، کە لەجنیف دەبێت، دەنێرێت. نامە بۆ میلیوکوفی وەشانکار و کاتکۆف کە لەڕووسیا دەبن دەنێرێت. بەڵام ڤیرانگیل بە مادوونی ڕۆییوە. هرتزن، بە گەشتێکی وەرزشی چووەتە کوێستان. میلیوکوف، کە هەوڵدەدا، لەسەر داوای دۆستویفسکی یەکێک لە ڕۆمانەکانی ئایندەی بە پری سێ سەد ڕۆبڵ بە بڵاوکراوەی "کتێبخانەی خوێنەران" بفرۆشێت، هەوڵەکەی نەک هەر لەلایەن بڵاوکراوەی ناقبرییەوە، بەڵکو لەلایەن ڕۆژنامەی هاوچەرخ و لەلایەن وەرزنامەی نیشتمانیشەوە، ڕەفز دەکرێت و ڕەت دەکرێتەوە. ئەنجام ئاغای کاتکوف، کە قەرار بوو ڕۆمانێکی ئەو

بکڕێت و بەپێنج شەش بەش لە بڵاوکراوەی "پەیکی ڕووس"دا بـڵاوی بکاتـەوە، کـەم و زۆر، وەکـو ئـەوەی لەژیانـدا نـەمابێ، وەڵامـی ناداتـەوە.. وێـڕای هـەموو ئەمـەش بیرۆکـەی ڕۆمانەکـە زۆری مـژوول دەکـات، نامەیـەک لـەو بارەیـەوە بـۆ کاتکوف دەنووسێت: "ڕووداوەکان، هی ئەم ڕۆژانەیـە، لـەم سـاڵەدا ڕوو دەدەن. خوێندکارێکی گەنج لە زانکۆ دەردەکرێـت. لـە بنەڕەتـدا، لـە خێـزان و ماڵبـاتێکی وردە بورژاوایـە، کەوتووەتـە ئەوپـەڕی هـەژاری و نەبوونییـەوە. ئیـدی لـەژێر گوشـاری ئـەو وەزعـە نالـەبار و ناهـەموارەی خۆیـدا، لێـدەپرێت، ژیـانی خـۆی بەتەواوەتی بگۆڕێ و خۆی لەو هەژاری و نـەبوونی و دەسـتکورتیە ڕزگاربکـات. ئیـدی لـەژێر کاریگـەری و بانـدۆری هەنـدێ هـزر و بیـرێن ناپوختـە و نـامۆدا، لێدەپرێت، پیرەژنێکی سووتخۆر، بکوژێـت و پارەپوولەکـەی بـۆ خـۆی ببـات. ئـەم پیرەژنە، سـووتخۆرە، پارە بە بارمتـە و ڕەهـن و فـایز دەدات بـە خـەڵکی. ژنێکـی گەوج، کەڕ، نەخۆش و لەهەمان کاتدا زۆر ڕژدو پیسـکە و بـەدنیهادە، جوولەکـە ئاسا، فایز دەخاتە سەر ئەو قەرزانەی کە بەخـەڵکی دەدات. خراپتـرین مامەڵـە دەگەڵ خوشکە گەنجەکەیدا دەکات کە وەکو کارەکـەر خزمـەتی دەکـات. "ئـەم پیرەژنە بەکەڵکی هیچ نایەت، سوودی بۆ هیچ کەسـێک نییـە!... ئیـدی بـۆچی بژی؟" ئەم بیـرو خەیاڵاتـە مێشـکی کـوڕەی خوێنـدکار دەجـوڵێنێ. بڕیـار دەدات بیکوژێت و پارەو پوولەکەی بۆ خۆی بەرێت. بەو ئومێدەیـە بـەم پارەیـە یارمـەتی دایکی کە لەگوندیدا دەژی، بدات و لە بەدبەختی ڕزگاری بکـات، هـەروەها بـەو پارەیە ژیانی خوشـکەکەی بکرێتەوە کـە لەهـەژاری و ناچاریـدا، وەکـو کـەنیزەک لـەلای کابرایـەکی دەرەبـەگی موڵکـدار کـاری دەکـردو، بـاقی پارەکـە خـەرجی خوێندنەکەی خۆی بکات.
"بەڵام حەقیقەتی خوایی و قانونێن دنیایی یەکدەگرنەوە، سەرەنجام ناچار دەبێت، خۆی، تاوانەکەی خۆی ئاشکرا بکات. و تەنانەت ئامادەیە بچێتە زندان و لە زنداندا و بەدەم بێگارەوە بمرێت، ئامادەیە کە هەموو خەتەر و مەترسییەک تەحەموول بکات، تەنیا بەو ئومێدەی کە بتوانێ جارێکی دی لەناو کۆمەڵی خەڵکدا بژی و بەشداری ژیان بکات. هەر دوای ئەنجامدانی تاوانەکەی، هەست دەکات، کە خەڵکی دەی بوغزێنن، ڕووی لێوەردەگێڕن. ڕووی نادەنێ، ئەم هەستە زۆری ئەزیەت دەدات، قانوونی حەقیقەت و تەبیعەتی مرۆڤانی لەهەر شتێکی دی بەهێزترن. ئیدی یارۆی تاوانبار، بڕیار دەدات، تەحەموولی هەر ئازار و سزایەک بکات، تا قەرەبووی تاوانەکەی خۆی بکاتەوە و باری سەر ویژدانی سووک ببێت..."
 بەم چەند سەرقەڵەمە کورتەدا، زۆر بەئاسانی دیمەنە سەرەکییەکانی ڕۆمانی تاوان و سزامان، لەبەرچاو بەرجەستە دەبێت. بەڵێ دوستویفسکی لە ژوورێکی تەنگ و تاریکی ئوتێلێکدا، کە زیاتر لە عەمارێک دەچوو، برسی و بێ ڕوناکی، چڵکن و پڵکن، بە هەر چوار پەل، لە هەوڵی ئەوەدا بوو، پارەیەک بەدەست بێنێ، ڕووی لەهەر کەس و ناکەسێک دەنا، کە شتێکی بۆ بنێرێ یا بداتێ، تا بەلای کەمەوە بتوانێ بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە. کەرەستە و نەخشـەی سـەرەکی ئەم ڕۆمانە، گەڵاڵە دەکات کە پاشان دەبێت بەمایەی شۆرەت و

نێوبانگی ئەو. بەخۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "ڕەنگە ئەوەی کە ئێستا دەینووسم، لەتێکڕای ئەو نووسینانەم باشتر دەرچێت، کە تا ئێستا نووسیومن."
لەو ماوەیەدا، ڤیرانگیل، بۆ کوپنهاک دەگەڕێتەوە، هەردوو نامەکەی دوستویفسکی، کە نائومێدیان لێدەتکێ، دەخوێنێتەوە و یەکسەر، بەشی ئەوە پارەی بۆ دەنێرێت کە سەفەری پێبکات. هەروەها دەعوەتی دەکات کە پروات بۆ کوپنهاک و چەند ڕۆژێک لە نک وی بەسەر بەرێت. دۆستویفسکی بەوپەڕی خۆشحاڵی، دەعوەتەکەی قەبووڵ دەکات و دەڕوات بۆ کوپنهاک تا دیدەنی دۆستە دێرینەکەی خۆی بکات. لە ١/١٠/دا دەگاتە شارى کوپنهاک، دە ڕۆژ لەوێندەر بەسەر دەبات و لە دەی ئۆکتوبەردا. بەرەو سان پتروسبۆرگ دەکەوێتە ڕێ. کە دەگاتەوە پایتەخت، سێ چەلی دوا بەدوای یەک، فێی لێدێت. لە نامەیەکدا بۆ ڤیرانگیل دەڵێت: "وێڕای ئەوەش، دانیشتووم و مژوولی کارم."
ئەنجام ئەو سێسەد ڕۆبڵەی، کە لەکاتکوفی، داوا کرد بوو، دەگاتە دەستی، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەم پارەی بە ئەدرەسی ئەو دەگاتە ویسبادن و لەوێوە دەگەڕێتەوە. بەڵام ئیدی ئەو پارەیە بەشی پێویستیەکانی ئەوی نەدەکرد. نامەیەکی بۆ دەنووسێت: "من بۆ ڕۆژنامەکەی تۆ کار دەکەم، بۆیە ناتوانم. بچمە ژێر باری هیچ کارێکی دیکە و بەخۆ ڕابگەم و بژێوی خۆم دابین بکەم. باوەڕبکە حاڵی حازر تاقە کوپیکێکم پێ نییە، هەندێ لە کەل و پەل و جلەکانم خستوونەتە بارمتە و ڕەهنەوە، بۆیە تکات لێدەکەم سلفەیەکی هەزار ڕۆبڵیم بۆ بنێرە." ماڵ و منداڵەکەی میشێلی برای کە مرد بوو، لەو پەڕی هەژاری و نەبوونیدا دەژیان بەخۆیشی هەندێ لەو خاوەن قەرزانەی کە قەرزەکانی نەدابوونەوە، تەواو تەنگیان پێ هەڵچنی بوو. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "هەندێ لەو خاوەن قەرزانە، کە پرێک فامیدەتر و ماقووڵترن، ڕازی بوون کە قەرزەکانیان بە قیست و بەماوەی پێنج ساڵ بدەمەوە. بەڵام هەندێکی دیکەیان ئەو قسانە نەدەچوو بە گوێیاندا، بەڕاستی ئەوانە بێزاریان کردووم و دەماریان گرتووم. بەڵام وێڕای هەموو ئەمانە هیچ چارێکم نییە، ئەوە نەبێ دانیشم و مل بە نووسینەوە بنەم. کە ئەم کارەش هەندێجار مەحاڵە بێتە کردن."
ئیدی نۆرە فێش لەولاوە بوەستێ، کە کارەکەی دوا دەخست، بەڵام وەک دەڵێن نەگبەتی خۆشە، قۆرتەکانی ناخۆشە، سەرباری ئەو هەموو نەگبەتیە، سەرەنجام مایەسیریەکەی هەو دەکاتەوەو ناچار بۆ ماوەی دوو هەفتە لەجێگادا دەکەوێت. بەهەرحاڵ بەهۆی کارو چالاکی بێوچانی خۆیەوە، لە مانگی نۆڤەمبەردا بەشی هەرە زۆری ڕۆمانەکەی تەواو دەکات.
بەڵام لەکارەکەی ڕازی نایێت، دەست نووسەکانی دەسووتێنێ و دووبارە دەست بە نووسینەوە دەکاتەوە. لەو بارەیەوە دەڵێت: "تەکنیک و نەخشەیەکی تازەم بەخەیاڵدا هات." شەو و ڕۆژ کار دەکات. لەیەک کاتدا دوو بابەت پێکەوە مۆنتاج دەکات، یانی ئەو بابەتەی کە بۆ کرایفسکی باسکردبوو و

ناونیشانی مەیگوسارانی بێنەوای لێنابوو، دەگەڵ بابەتی ئەو خوێندکارەی بۆ کاتکوفی باسکردبوو، پێکەوە مۆنتاج دەکات و لە قاڵبی یەک ڕۆماندا دایان دەڕێژێت. شێواز و ستایلی نووسینەکەش دەگۆڕێت، واتە ئەوەی جاران دەیویست لەقاڵبی بیرەوەری ڕاسکولینکوفدا بینووسێت، ئێستا قاڵبی ڕۆمانی ڕووداوی دابوویە. ئیدی کارەکەی باش دەچووە پێشەوە. هەموو مانگێک بەدەم چاپی هەر بەشێکەوە، فەسڵەکەی دواتری دەنووسی و ئامادە دەکرد. یانی هەر هەفتەیەک، شەش لاپەڕەی تایپکراوی تەسلیم دەکرد. لە ١٨٦٦/٢/١٨دا نامەیەک بۆ ڤیرانگیل دەنووسێت: "ئەوە دوو هەفتەیە، بەشی یەکەمی ڕۆمانەکەم لە ڕۆژنامەی پەیکی ڕووسیدا بڵاو دەبێتەوە. ناوی ئەم ڕۆمانە تاوان وسزایە. تا ئێستا مەدح و ستایشێکی زۆرم دەربارەی ئەم ڕۆمانە بەر گوێ کەوتووە. ئەم ڕۆمانە زۆر شتی تازە و بوێرانەی لەخۆ گرتووە."

## فەسڵی شەشەم
## تاوان و سزا.

کێشەی ڕاسکولنیکوف، قارەمانی ڕۆمانی تاوان و سزا، هەمان کێشەی پیاوە ژێر زەمینییەکەیە، واتە کێشەی ئازادی ڕەهایە: خوێندکارێکی هەژار و مەغروور، بۆ دەروو دەرچەیەک دەگەڕێت تا لە کلۆڵی و هەژاری و داماوی ڕزگاربێت. ئەم کوڕە پیرەژنێکی سووتخۆر دەناسێت. لەدڵی خۆیدا دەڵێت، ئەم پیرەژنە چەپەڵ و نەگریسە بە کەڵکی چی دێت، ژیان و بوونی ئەو لە ئاستی

ژیان و بوونی خوێندکاریکدا، چ بایەخێکی هەیە؟ ئەگەر بیکوژێت، هەموو پارەو پولەکەی دەبێت بە هی ئەم، هەنگێ دەشێت کۆمەکی دایکی و یارمەتی خوشکەکەی کە لەگوندا دەژین، بکات و بدات و لە مەینەتی هەژاری ڕزگاریان بکات و دەتوانێ بەو پارەیە درێژە بە خوێندن بدات و خوێندن تەواو بکات، ئیدی دەبێت بە پیاوێکی شایستەو گەورە و یارمەتی هەموو ئەو کەسانە بدات کە لێوەی نزیکن: "لەهەنبەر ژیانی یەک کەسدا، ژیانی هەزاران کەس لە مەینەرتی و هەژاری و کەوتن و لەناوچوون ڕزگار دەبێت."، "مانی ئەم پیرەژنە سەر ئاسنین و جادو بازە، چ بایەخێکی هەیە و لە هاوکێشەی ژیاندا دەکاتە چی؟" نەخشەکەی لەلایەکەوە بەشێوەیەکی ترسناک لۆژیکی یەو لەلایەکی دیکەوە بەشێوەیەکی ترسناک فریوەندەیە "مغری" کورەی خوێندکار، وەکو یەکێک حوکمی ئیعدام درابێ، بەو ئاوایە بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە. ناتوانێ بیر لە هیچ شتێک بکاتەوە. ناتوانێ گومان لە بڕیارەکەی خۆی بکات. لەناکاوا بەهەموو بوونیەوە هەست دەکات، نە لە بڕیاردا و نە لە ویستدا، ئازاد نییە. ئیدی هەموو شتێک بەو شێوەیە هاتووەو بڕاوەتەوە. ئیدی ڕووداوەکان، زۆر ئاسایی و بەپەلە دەگەڵ نەخشە و نیاز و مەبەستەکانی ئەودا تێکدەکەنەوە و لەیەکدا جۆش دەخۆن. کارەکە ئاڵۆز دەبێت. "دەڵێی چمکێکی پاڵتۆکەی لە زنجیری ئامێرێکی بەهێز گیراوەو، ئێستا بە هەموو بوونیەوە، بەرەو مەداری خۆیی ڕادەکشێت." ئیدی ناتوانێ مقاومەت بکات، دەستی خۆی دەوەشێنێ، دەکوژێت، دەبڕێت، دەدزێت. هەل و مەرجەکە بە شێوەیەکی گشتی لە قازانجی ئەودایە و دادسێنانی دادگا کەمترین گومانی لێناکەن.

بەڵام کارەساتە ڕاستەقینەکە، واتە سزای دەروونی، لێرەوە دەست پێدەکات. ڕاسکولنیکوف، لەبەر خۆیەوە بیردەکاتەوە: "ئەگەر ئەم کارە بەگوێرەی نەخشە و بەمەبەست ئەنجام درابێ و تۆ لەم کارەی خۆتدا مەبەست و ئەنجامی خۆت هەبووە، بۆچی تا ئێستا تەمەشایەکی جانتای پارەکانت نەکردووە تا بزانی چی تیایە وچەندی تیایە، چۆن بەخەمی ئەوەوە نیت کە بزانی ئەم بویەر و ڕووداوە، چۆن بەسەرتا دەشکێتەوەو چی بەدووددا دێت. ئیدی ئەم عەزاب و سەریەشەیە چی بوو کە بۆ خۆتت دروست کرد؟"

بەرە بەرە، لە پرسیارێکەوە بۆ پرسیارێکی دیکە، لە نۆرە ترسێکەوە بۆ نۆرە ترسێکی دی، ئەنگێزە و پاڵنەری بنەڕەتی تاوانەکەی خۆی کەشف دەکات. لەلای سونیا ئیعتراف دەکات کە: "من بۆ ئەوەم نەکوشت تا یارمەتی دایکم بدەم، نەخێر. بۆ ئەوەشم نەکوشت پارەم هەبێ و وەکو چاکە کارێک، چاکە دەرهەق بە هەندێک لە هاوڕەگەزانی خۆم بکەم و بە چاکەکار ناوبانگ دەربکەم. زۆر ئاسایی کوشتم. لەپێناوی خۆمدا کوشتم. ئیدی بەلامەوە گرینگ نەبوو. ببم بە کەسێکی چاکەکار، یان وەکو ئەو جاڵجاڵۆکەیەم لێبێت، کە قوربانیەکی خۆی لە داوەکانیەوە دەئاڵێنێ و خوێنیان دەمژێت. بەتایبەتی لەو ساتەدا کە دەمکوشت، تەماحێکی ئەوتۆم لە پارەکەی نەبوو، کەمتر پێویستم بە پارە بوو تا شتی دی... دەبوایە هەندێ شتی دیکە بزانم. پاڵنەر و ئەنگێزەی دی بازوویان دەجوڵاندم، دەمویست، بەزووترین کات پەی بەوە بەرم

ئایا منیش مێرووییەکم وەکو خەڵکانی دی یان پیاوم. ئایا دەتوانم لەمپەرەکە ببڕم یان نا؟ ئەمە بۆ من پرسیار بوو، ئایا زات دەکەم دەسەڵات بەدەست بێنم یان جورئەتی کاری وام نییە؟ ئایا لەسەر هەقم یان کەسێکی بودەڵەو ترسنۆک و لەرزۆکم؟"

بەمجۆرە ڕاسکولنیکوف، وەکو کابرای ژێر زەمینی، لە ناو چوار دیواری ئەخلاقی فەرمی کۆمەڵگەدا هەست بە خنکان دەکات، لە ویژدان و دەروونی خۆیدا، وا هەست دەکات کە توانای ئەوەی هەیە لەم مێگەلەی کە تیایدا دەژی، بێتەدەرێ. خۆی بە جیاواز لە خەڵکی دی دەزانێ. هەستدەکات بەرەو قەدەر و چارەنووسێکی تایبەتی دەڕوات. ئەم چارەنووسەش بریتیە لەم ڕیسکە ترسناکە: ئازادی و سەربەخۆیی فیکر و ڕوح.

پێی وایە خەڵکانی وەکو ئەو بۆیان هەیە، هەموو یاسا و ڕێساکان ژێر پێ بنەن. بۆ ئەو جۆرە خەڵکانە یا ئەخلاق لە بنەڕەتدا بوونی نییە یا ئەخلاقێکی باڵاو ناوازە هەیە. یا بە زمانێکی دی بۆ ئەوانە ئازادی تەواو هەیە. بۆ ئەوانە ئیدی تاوان، بایەخی تاوانی ئاسایی نییەو، سزاش تەنیا وشەیەکی بۆش و بەتاڵە. بێگومان پیاوێکی وەکو ناپلیون، ئەگەر ویستبی پاکانە بۆ کارەکانی خۆی بکات و قەناعەت بە خۆی بکات، پەنای وەبەر ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە بردووە. ڕاسکولنیکوف وای بە زەینیدا دێ کە: "کە ئاغایەکی ڕاستەقینەیە، هەموو شتێک بۆ ئەو حەڵاڵ و ڕەوایە، شاری تولون بەر تۆپان دەدات، لە پاریسدا قەتڵ و عام بەرپا دەکات، سوپاکەی خۆی لە میسڕدا فەرامۆش دەکات، نیو ملیون پیاو، لە دەشتەکانی ڕووسیادا، دەکات بە قوربانی جەنگ و هێرشەکانی خۆی. لە "ڤیلنا" بەچەند قسەیەک خۆی لەهەر مەسئولیەتێک دەپەرێنێتەوە. کەچی بەو هەموو کوشتارەشەوە کە کردی، لەدوای مردنی پەیکەری بۆ دروست دەکەن. کەواتە هەموو کاریک حەڵاڵ و ڕەوایە..."

هەموو شتێک، هەموو کارێک بۆ هەندێ کەس ڕەوایە. هەموو کارێک بۆ ئەو کەسانە ڕەوایە، کە بتوانن ڕێگە بە خۆ بدەن هەر کارێک بکەن، ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڵگە و نیشانەی جیاوازییە. لەنۆرینی ڕاسکولینکوفەوە، پیرەژنەکە یەکەمین لەمپەر و کۆسپە. دیوارێکی گۆشتینە کە دەبێ لابرێ، بڕوخێنرێ بەسەریا بپەڕیتەوە و پاشان بەتەواوەتی فەرامۆشی بکەیت، بۆ ئەوەی بکەوێتە سەر ڕێگای ئازادی. دەڵێت: "ئەمەی من کوشتوومە بوونەوەرێکی بەشەری نییە، بەڵکو پرەنسیپێکی ئەخلاقییە." جا دوای کوشتنی ئەم پرەنسیپە، ڕاسکولنیکوف، دەیەوێ بەهرە و توانای، میتابەشەری خۆی بناسێت. باوەڕی خۆی دەربارەی خوا بزانێت و سەرەنجام ئازادی فەتح بکات و خۆی لەو هاماج و دنیایەدا ببینێ.

بەڵام لە ڕاستیدا، لەو ساتەوە کە لە هەلومەرجە مرۆڤانیەکە. دوورکەوتبووەوە، هەستی بە ئازادییەکی پتر نەدەکرد. بەتەواوەتی لە کۆت و بەندایە. بیرۆکەیەکی جێگیر و مکوم، هەموو شتێکی ئەو، تەنانەت هەستی ئازادیش لە بوونیا، وێران دەکات. ئەوێک کە ویستبووی، هەموو دیوارەکان پروخێنێ و گشت داب و نەریت و کۆت و بەندە ئەخلاقییەکان ژێر پێ بنێ،

ئێستا ناچارە کۆت و بەندێکی تازە بۆ خۆی دروست بکات. شەو و ڕۆژ، لە دڵی خۆیدا، خۆی دادگایی دەکات، لەسەر ئەو کارە دزێوەی کە قەرار بوو شانازی پێوە بکات. لێ پێچینەوە دەگەڵ خۆیدا دەکات. شەو و ڕۆژ، هەمان چەند و چوون، هەمان پرسیار و وەڵام دوبارە دەکاتەوە و عەزابی پێوە دەخوات. ئیدی ئەم مشتومڕە دەروونیە خەریکە، بەتەواوەتی زەیفی لێدەسەنێت و بێتاقەتی دەکات. هەست بە جۆرە دوالیزمییەک دەکات، جارێ داکۆکی لە خۆی و جارێ داکۆکی لە قوربانییەکەی دەکات. ئێستا یەک کەس نییە، بەڵکو بووە بە مەیدانێک بۆ باسی ئەو کارەی کردوویەتی.

تاوان، لە ڕوانگەی ویژدانی پاک و ڕەسەنەوە، لە ڕوانگەی هۆشمەندی قووڵەوە، پاکانەی بۆ نایەتە کردن. کەسایەتی تاوانباریش، دوای ئەنجامدانی تاوانەکە، وەکو جەنازە و جەستەی قوربانییەکە، دەپوکێتەوەو لەناو دەچێت. هەڵبەتە هیچ ئامانجێکی بەرز، هیچ بەهاو ئایدیالێکی باڵا، هیچ ئۆل و ئاینێک، بۆی نییە ڕێگەی تاوان بدات، هەرکەسێک دەست بخاتە ئایندەی خۆیەوە، دەست لەخۆی بدات، دەستی لەخوا بەرز کردووەتەوە، کاتێ ڕاسکولنیکوف، ڕێگەی بەخۆی دا، تەورەکەی بەسەری پیرەژنەکەدا بکێشێت، ئەوا هەر پیرەژنەکەی نەکوشت، بەڵکو خۆی کوشت، بەگوتەیەکی دی، ئەو نوری خواییەی کوشت و کوژاندەوە کە لەدوا دەژیا.

هاوار دەکات: "سونیا، من ئەسپێیەکم کوشتووە، ئەسپێیەکی پیس. جانەوەرێکی بەد عەمەلی، شڕندە و نەگریس و بێسوود." سونیا، بەرسفی دەداتەوە: "بەڵام ئەم ئەسپێیەی تۆ، بوونەوەرێکی بەشەری بوو." ژیانی بەشەرێک، لە باڵاترین فیکری ڕووتی هەرکەسێک، بەهادارترە. هیچ شتێک ئەوە نایەنێ ژیانی بەشەرێکی لەپێناودا بێتە سڕینەوە. چونکە ئینسان هەرچییەک بێ، نیشانەی وینەی خوایە. بەڵێ ئەم "ئەسپێ نەگریس و بەدعەمەل و بێسوودە" کە پیرەژنێکی سووتخۆر بوو، ئەم پیاوە خوێری و بودەڵە و بەد مەستە کە مارمیلادوفی ناوە، ئەو سۆزانییەی کە ناوی سونیایە، هەر هەموویان، بەڵێ هەموویان خۆشەویستی خودان و شێوەی خودان. دیارە ئەمە بیرێکی فرە مەزنە، وێنا کردن و دەرککردنی زۆر دژوارە، بەڵام هەر هەموویان لە ڕوانگەی خوداوە. هاوتای خودی ڕاسکولینکوفن.

بەمجۆرە ڕاسکولینکوف، لە یەکەم هەنگاودا، کە لەو دیوی دیوارەکەوە دەینێت، دووچاری دوو دڵی و پەشێوی دەبێت: هەستی گومڕایی لە دەشت و بیابانێکی بێ سنووردا، ئەو هێزە مرۆڤانیەی، کە هێنابوویە ناو ئەم بازنەیەوە، لێدەپڕێت و لاقی لەدووی نایەت. ئەوێک کە دەیویست بگاتە پایەی سوپەرمانیەت و میتا بەشەریەت، ئێستا کەوتووەتە لەرزین و وەکو منداڵێک کە لە ژوورێکی تارپکدا بێ، دەگری.

لە هەموو خەڵکی داپڕاوە. لە گشت خەڵکی و لەخۆی نامۆو بێگانەیە. بووە بەکەسێکی دی، ئەوانەی دەوروبەری بەشێتی دەزانن و ئیدی لەو خەڵکانە هەڵدێت کە هیچ خاڵێکی هاوبەشیان دەگەڵ ئەمدا نەماوە. ڕوودەکاتە خەڵکانی نەگبەت و بێنەوا، ئیدی خوو دەداتە مارمیلادوفی هەمیشە مەست

و بێوەژنە سیلاوییەکە، یانی کاترین ئیڤانوڤنا و سونیا، کە لەپێناوی بژێوی و تێرکردنی سکی خوشک و براکانی، دەست بە لەشفرۆشی دەکات. بەڵام ئەمانەش لەو ناچن. تاوانەکەی، لەڕێرەوی تیرەی بەشەری داپڕیوەو لەخودی خۆیدا گیرۆدە و گرفتار بووە. تەنیا ئیعترافێکی تەواو، تێرو تەسەل، تەنیا یەک سزای سەخت و دژوار، ئایدیالی دەتوانێ دووبارە ئەو بیگێڕێتەوە بۆ خۆی، بۆ ناو ئاپۆرای خەڵکی، بەڵام لەوە دەترسێت، تاوانەکەی ئاشکرا ببێت و دەستگیر بکرێ و بدرێتە دادگا. تێکەڵاوی پیاوانی پۆلیس دەبێت و دەگەڵیاندا باسی تاوانی ناوبراو، واتە کوشتنی پیرەژنەکە، قسانیان دەگەڵ دەکات. پورفیری دادسێن کە مارەیەکە گومانی لەو پەیدا کردووە، بەڕوحی ڕادەبوێرێ. بەکاوەخۆ، بەبێ موبالاتییەکی سەیرەوە، مامەڵەی لەتەکدا دەکات، سەرو دڵی دەگرێت، پاشان بەوپەڕی خوێنساردی دڵنیای دەکاتەوە و پێی دەڵێت: "تۆ بۆ هەر کوییەک بڕۆیت، ئەنجام هەر دێیتەوە، تۆ ناتوانیت بەبێ ئێمە هەڵبکەیت... من دڵنیام ڕۆژێ دێ، بەخۆت، ئامادە دەبیت، باری هەر ئازار و عەزابێک هەڵبگریت." ئەزمروونی گەیشتن بە ئازادی بۆ ڕاسکولنیکوف زۆر گران دەکەوێ. ئەو کە خەونی بە سوپەرمانیەتەوە دەبینی، دوای هەزار و یەک جەنگ و جیدال دەگەڵ ویژدانی ئاڵۆزی خۆیدا، بەجۆرێ کۆڵی داوە، کە بەسەر لاقی سۆنیای سۆزانیدا دەکەوێت و لەلای ئەم کیژە بەرەڵڵایە، دان بە تاوانەکەی خۆیدا دەنێت. سۆنیا، ئامۆژگاری دەکات، کە بڕوات خۆی ڕادەستی دام و دەزگای پەیوەندیدار بکات:

"یانی سۆنیا، تۆ دەتەوێ هەواڵەی زندان و تاراوگە بکریم؟"

سونیا بەرسڤی دەداتەوە:

-"چار نییە، دەبێ تەحەمولی ئەزاب بکەیت، تا قەرەبووی تاوانەکەت بکەیتەوە."

ڕاسکولنیکوف، بەگوێی دەکات. دەڕوات بۆ چوار ڕیانێکی قەرەباڵغی پڕ هاتوچۆ، لە بەرانبەر خەڵکیدا بە چۆکدا دێت و ئەو "ئەرزە ماچ دەکات کە لەوتاندوویەتی"و پاشان دەڕوات بۆ بنکەیەکی پولیس تا خۆی تەسلیم بکات. بەکاوە خۆ، بەشێنەیی و بێ خۆشلوێ کردن، زۆر بە ڕوونی و ڕاشکاوی ئیعتراف دەکات: "من بووم کە ئەو پیرەژنە سووتخۆرەم بە تەوران کوشت. ئیلیزابتی خوشکیشیم بە تەور کوشت و پارەکانی هەردووکیانم دزی."

ڕاسکولنیکوف، حوکمی بێگارە زندان دەدرێت، سونیا، سۆزانییە چکۆلەکە، بۆ سیبریا، بەگەڵی دەکەوێت. دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەنووسێت: "بەڵام، ڕاسکولنیکوف، لە تاوانەکەی خۆی ژێوان نییە." لە خۆی دەپرسێت: "چۆن دەشێت ئەم کارەی من بەلای ئەوانەوە، هێندە گەوجانە بێت؟ هەر لەبەرئەوەی ناوی تاوانە؟ وشەی تاوان دەکاتە چی، چی دەگەیەنێت؟ من ویژدانم ئاسوودە و ئارامە. ڕاستە من تاوانی کوشتنم ئەنجام داوە.. دەی باشە، بۆ ئەوەی ڕێز و حورمەتی قانوون بگرن، لە ملم بدەن و تەواو، ئیدی باسی ئەوە مەکەن." بیر لەوە دەکاتەوە گەلێک لە خێرخوازان و خزمەتگوزارانی کۆمەڵگە تەنیا، بەسەرسەختی خۆیان، بەکۆڵنەدان و باوەڕ

بوون بە ڕێگای خۆیان، لە ئەنجامدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. ئەوەی ئەو مەحکووم دەکات ئەمەیە کە کارەکەی لە سنوورێکی بەریندا ڕووی نەداوە و وەکو پێویست مقاوەمەت و خۆگری نەکردووە "بۆیە ئەوەی بەهەڵەو خەتا دێتە ژماردن، ئەمەیە کە نەیتوانیوە خۆی بگرێت و چووە خەبەری لەخۆی داوە و دانی بە تاوانەکەیدا ناوە."

جا لەم درۆ و لەم گومان و دوو دڵیانەوەیە کە لەناکاوا ئیمان و باوەڕ لەدایک دەبێت و سەرهەڵدەدات. بەڵێ لەناکاوا، وەکو چۆن لەناکاوا، پزیسکێک، بەر دەبێتە خەرمانێک پووش و هەڵدەگیرسێت. پێشتر سونیا، چیرۆکی ژیانەوەی لازاری، بەگێڕانەوەی ئینجیلی یوحەنا. بۆ خوێندبووەوە: "من ژیانەوە و ژیانم، ئەو کەسەی ئیمان بە من بێنێ. ئەگەر مردبێتش، زندوو دەبێتەوە. هەر کەسێک لەمندا بژی و ئیمانی بەمن هەبێ، هەرگیز بۆ هەتا هەتایە نامرێت."

"لازار، لە پەیرەوانی عیسا بوو، دەڵێن چوار ڕۆژ بوو مرد بوو، کە بە ئەمری حەزرەتی عیسا زندوو بووەوە." هەڵبەتە ئەوسا وەکو پێویست لەو قسەیە تێنەگەیشتبوو، تازە لێرە، لە سیبریا، وشەی ژیانەوەی بەزاردا دەهات. ئەمە چۆن ڕوویدا؟ ڕاسکولینکوف بەخۆیشی هەستی بەمە نەدەکرد، بەڵام لەناکاوا هێزێک لە ناخەوە، واداری کرد کە خۆی باوێتە بەر پێی سونیا... ویستیان قسان بکەن، نەیانتوانی. چاوانیان تەژی ڕوندک بوو، هەردووکیان ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا و تەواو پەشۆکا بوون. بەڵام ئێستا، ڕوناکی شەفەقی ئایندەیەکی نوێ، بە سیمای پەژموورده و ماندوویانەوە پرشنگی دەدا..."

بەمجۆرە، بەسایەی بوونی سونیاوە، سۆزانیە وردیلەکەوە، ڕاسکولنیکوف لە ئەنجامدا، پەی بە ئازادی ڕاستەقینە دەبات. ئەم ئازادیە، ئیدی ئازادیەکی مەغروورانە نییە. لەم ئازادییەدا، ئینسان داوای خوایەتی ناکات. ئینسان بە بوونی خواوە، بەهێزە. نکوڵی کردن لەخوا، نکۆڵی کردنە لە خودی ئینسان. کاتێ کە ئینسان بیەوێ ببێت بە خوا، مانای وایە دەیەوێت وەکو ئینسان بمرێت، دەیەوێ لە گەردووندا بتوێتەوە. مانای وایە دەیەوێ لە هەمان کاتدا هەم هەبێت و هەم نەبێت. بەشێویەکی گشتی، لەنێو دیوارانی ئەخلاقی فەرمیدا، ئازادی هەڵبژاردنی خێر و چاکە هەیە. ئەم سووکە ئازادیە ئەگەری ئەنجامدانی گوناح و هەڵە دەڕەخسێنێ. چونکە مانای ئازادی ئەمەیە کە ئختیارمان لەدەستە. ئینسان دەتوانێ هەڵە و گوناح بکات. بەڵام خۆی لەمە دوور دەگرێت چونکە "ئەم کارە قەدەغەیە" مەترسی "سزا" و "زندان" و "دۆزەخ"ی بەدواوەیە.

ئەوانەی کە پەندو وەعزی ئەم ڕێبەر و ڕێنوێنە گەوجانە پشتگوێ دەخەن و دڵیان لە ڕێنماییە ڕوحیەکانی ئەوان تێکهەڵدێ، هزرڤانان، دەسەڵاتداران، ئەوانە هەموو لە دیوارەکە تێدەپەڕن. ئەوان خۆیان لە قەڵمڕەوی ئازادی دووەمدا، ئازادی یەکجارەکیدا دەبیننەوە. ئیدی ئەمانە. لەبەر ئەوە چاکە ناکەن، کە لەمنداڵییەوە فێری بوون. لەترسی سزای زەمینی یا ئاسمانی لە خەراپە ناگەڕێنەوە. ئەوانە بە خوایشتی خۆیان، بەوپەڕی ئازادی کاری خراپ یا چاک دەکەن. هەندێ کەس خۆ بە سوپەرمان و پیاوی ئایدیالی و نموونەیی

دەزانن و لەوەڵین ئەزمووندا ڕووبەڕووی شکست دەبنەوە. هەندێکی دی دەگەنە ئەو قەناعەتەی کە کاری خێر، تەنیا لە پێناوی خێرو چاکەدا بکەن، لەزەت لەو کارەیان دەبینن. دیارە ئەم کاری خێرە ئازادە، ئەم خێرەی کە دوورە لە هەر مەبەستێک، کە تەنیا لەڕووی مەحەبەتی ڕووتەوە دەکرێت، ئەم کارە، بێئەوەی بەخۆ بزانن، دەیانخاتە سەر ڕێگا و ڕێڕەوی خودایی و هەوڵدەدەن چاو لەو بکەن و لە ئەنجامدا ڕزگاریان دەکات
ڕاسکولنیکوف، دوای ئەوەی لە تاوانەکەی ژێوان دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە، لە ڕێگای ئیمان بەخواوە دەگاتە ئارامی و ئۆقرە دەگرێت. ئەو کارێکی خراپی کردووە، لە ڕووی غروور و خۆبەزلزانیەوە تاوانی کردووە. بەشە ئازادی خۆی وێران کردووە. ویستوویەتی هەر غەریزەیەکی مرۆڤانی لەخۆیدا بسڕێتەوە. وای وێنا کردووە، کە کاتێ لە دیواری قەراران ئاودیو بوو، یەکەم شتیک کە لەدڵ و دەروون و ڕوحیدا دەمرێت، غەریزەی چاکەکاری و خێرخوازییە. بەڵام ئەم غەریزەی خێر خوازییە، نەک نامرێ، بەڵکو ڕووبەڕووی ئەو تاقیکردنەوە پراکتیکییە، دەوەستێتەوە، ڕاسکولنیکوف ئازار دەدات، ناچاری دەکات، لەپێناوی ڕزگاری خۆیدا بگەڕێتەوە بۆ واریقات و بەها زەمینییەکان.
پەشیمانی، قەرەبووی گوناح دەکاتەوە. گوناح و خەتا پاک دەکاتەوە، ئازادی دەگەڵ خۆیدا دێنێ. ڕاسکولنیکوف، کە ئازادی وەدەست دێنێتەوە، هەنگێ خۆی و خوا دەناسێت، خۆی لە خودا، لە خەڵکی و لە دنیادا دەبینێتەوەودەدۆزێتەوە. ئیدی پێگەی خۆی، ژیانی خۆی دەدۆزێتەوەو بەدەست دێنێتەوە. "ئەوەی ژیانی خۆی بپارێزێ لە دەستی دەدات، ئەوەی لە پێناوی مندا ژیانی خۆی لەدەست بدات، دەژێتەوە." (ماتیو =ئینجیلی مەتی) بەمجۆرە دوا ئەنجامگیری دوستویفسکی لەم چیرۆکەدا، دەگەڵ بۆچوونەکانی ئینجیلدا تێکدەکاتەوە.
هەڵبەتە، چارەنووسی گوناهکارانی دیکەش، بە دەوری ڕاسکولینکوفدا، کە هەوێنی سەرەکی و خاڵی پرشنگداری ڕۆمانەکەیە، دەسوڕێتەوە، دیارە هەر یەکەیان لە مەداری خۆیدا. ئەمانەش وەکو شا قارەمانی چیرۆکەکە، هەر یەکەیان بەجۆرێک، لە داب و نەریت و یاسا ئەخلاقییە گشتیەکان دەرچوون و وەکو ئەو (راسکولینکوف) دەبەخشرێن. ڕاسکولینکوف، لە سۆزانی خانەیەکی پەرپووتدا، تووشی مارمیلادوفی ئالودە بەمەی، مێردی کاترین ئیڤانوڤنا و باوکی سونیا دەبێت. مارمیلادوف، کابرایەکی خوێڕیلەی هەرزەگۆی چەنەبازە. وەزیفەو پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی لەدەست داوە، هەر پارەو پولێکی دەستدەکەوێ، سەرفی بادەگوساری و مەینۆشی دەکات. هەر چیەکی هەیە تاڵانفرۆشی دەکات تا مەی پێبکڕێت. تەنانەت جل و بەرگ و کەلوپەلی ژنەکەشی خستووەتە ڕەهن و بارمتەوە. قاییلە کچە گەورەکەی، لەپێناوی بەدەست هێنانی پارەدا، کە ئەم خۆی پێی پەیدا ناکرێت، لەشفرۆشی بکات. بەجۆرە لەزەتێکی نەنگینەوە، دەڕوانێتە قەڵایی کەوتنەکەی خۆی و پەی بەوە دەبات کە مەحاڵە جارێکی دی بتوانێ لەم دنیایە هەستێتەوە. دەڵێت: "بەڵام ئەوەی ڕەحم بە هەمووواندا دەکات، ڕەحم بە ئێمەشدا دەکات، هەموو شتێک

تێـدەگات. ئیـدی دەربـارەی هـەمووان قـەزاوەت دەکـات. هەڵیاندەسـەنگێنێ، چارەنووسیان دیاری دەکـات، کـە لـەوان بـووەوە، هـەنگێ ئێمـەش بانگـدەکات. دەڵێت: "دەی ئێوەش بێنە بەرەوە. ئەی تاوانباران، ئـەی مـەی گوسـاران، ئـەی فاسـقان ئێوەش وەرنە بـەرەوە." بـە بێهـیچ شـەرمێک دەچینـە بـەرەوە... پێمـان دەڵێت: "هەی بەرازینە، سەرو ڕوخسارتان، هی حەیوانـە، بـەڵام قەیـدی نییـە وەرنە پێشـەوە" هەنگێ زانایان و هۆشمەندانی قەوم هـاوار دەکـەن: "خودایـا، چۆن پێشوازی لە مانە دەکەیت؟" خودا وەڵامیان دەداتەوە: "ئەی زانایـان، ئـەی هۆشمەندان، کە پێشـوازی لەوانـە دەکـەم، لەبـەر ئەوەیـە کـە هـیچ یـەکێکیان خۆی بە شایستەی ژیانی ئەو دنیا نەزانیوە."

ئیدی بەمجۆرە، خاکەساری و ملکەچی، بۆ کەسێک کە مومارەسـەی بکـات، دەبێتە مایەی پاکبوونەوە لـە گوناحـان. سـونیا، سـۆزانیە وردیلەکـە، لـە هـەموو کەسـێک پتـر مومارەسـەی ئـەو ملکـەچی و خاکەسـاریەی دەکـرد. راسـکولنیکوف، پێـی دەڵێـت: "تـۆش، لـە سـنووری داب و نـەریت و یاسـاو ڕێساکان دەرچوویت. تۆ دەست لـەخۆت بـەرز کردووەتـەوە، ژاینـی خـۆت وێـران کردووە، بۆیە توانیوتە لە داب و نەریتی کۆمەڵایـەتی دەربچیـت، یاسـاو ڕێسـای کۆمەڵایەتی ژێر پێ بنەیت. تـۆ ژیـانی خـۆت وێـران کـردووە. ئەمـەش بـۆ خـۆی تاوانکاریە. باشتر وایە ئێمـە لێکـدی نزیـک ببینـەوە، چونکـە لـە کۆتاییـدا، ڕێمـان یەک ڕێیە."

بەڵام لەکاتیکا ڕاسکولینکوف، زۆر بەوەوە دەفشـێ کە سنووری داب و نـەریت و خووخدەی کۆمـەڵگای ژێـر پـێ نـاوە، سـونیای وردیلـە، پـەی بـە شکسـت و داڕوخـانی خـۆی دەبـات و وەکـو نەخۆشـیەکی بـێ دەواو دەرمـان، قـەبووڵی دەکات و وەکو ئەمری واقیـع ملـی بـۆ دەدات. ڕاسـتگۆیانە، چارەنووسـی خـۆی بەو تاقە پیاوەوە گرێ دەدات کە هەرگیز سـووکایەتی پـێ نـەکردوە. سـەبارەت بەم پیاوە، دۆستویفسکی گوتەنی هەست بە "سۆز و بەزەییـەکی بـێ پایـان" دەکـات. ئیـدی ڕاسـکولینکوف. لـە هەنبـەر ئـەم پـاکی و بێگەردییـەدا، ئـەم سادەیی و ئارامیەی کە لەهەڕەتی گوناح و گوناحکاریدا، لـە ویژدانـی سـۆنیادا ماوە، دێتە سەر چۆکـان و سـەری ڕێـز و نـەوازش دادەنـەوێنێ و دەڵێـت: "ئـەم سـوجدە بردنـە بـۆ تـۆ نیـە، بـەڵکو سـوجدە بردنـە بـۆ تێکـڕای ژان و ئـازارە بەشـەرییەکان." "ئەوەنـدەی بـەهۆی بەدبەختیـە گەورەکـەی تۆوەیـە، ئەوەنـدە بەهۆی ئەوەوە نیە کە تووشـی نەنگ و گوناح بوویت."

لە شوێنێکی دیکەدا، بەدەم جۆرە هەڵچوونێکی توندی عاتیفییەوە دەڵێت: "چۆن ئەم پوخڵەوات و ڕیسواییە، توانیویەتی دەگەڵ ئەم هەست و سۆزە پاک و پیرۆزەی تۆدا هەڵبکات و بژی؟" وەکو زانیمان ڕاسکولنیکوف، تاوانەکەی خۆی تەنیا بۆ سونیا دەگێڕێتەوە. سونیا وەڵامی دەداتەوە: "باشە تۆ چیت کردووە؟ چ شتێکت دژی خۆت کردووە؟.. نەخێر، نەخێر، ئێستا لە دنیادا کەس لەتۆ کلۆڵ ترو نەگبەت تر نییە..." پاشان سونیا، بەگەڵی دەکەوێت بۆ سیبریا، تا لە ژیانی دووبارەیدا، ئامادەگی و حوزووری هەبێت.

ئەم ڕوخسارە ناسک و بێگەردو گوناهکارە، ڕوخساری ژنێکە کە بە گوێرەی داب و نەریت و یاسا و ڕێسا زەمینییەکان، بە مەحکووم و ڕیسوا دەژمێردرێت، بەڵام لە ڕوانگەی ئاسمانەوە بەخشراوە. ئەمە یەکێکە لە قارەمانە هەرە جوان و ئەفسوناویەکانی دۆستویفسکی. حاڵەتی خاکەساری و ملکەچی، ئارامی و میهرەبانی ئەو بەڕادەیەکە سوێی لێدەخۆیت و هەر خوێنەرێک، لەناخی خۆیدا، خۆی بە سەبەبکاری قەرەبەختی ئەو دەزانێ. بەجۆرێکە لەتۆ وایە باری هەڵەو خەتا گەورەکانی هەموو تیرەی بەشەری بەکۆڵی خۆیدا داوە. لەتۆ وایە ئەم ژنە بە فەناکردنی خۆی ئێمە ڕزگارکردووە. بەڵام لەڕاستیدا هیچ یەکێک لەوانەی کە وا وێنا دەکەن لەنێو چوون، فەنا بوون، لەنێو ناچن و فەنا نابن، چونکە یا دەبێ بگوترێ کەس تاوانبار نییە یا هەموو هەر تاوانبارن..

لە پاڵ سۆنیادا، ئافرەتێکی دیکەش هەیە بەنێوی دونیا. ئەم دونیایە خوشکی ڕاسکولنیکوفە. ئافرەتێکە جوان و ناسک، گوێڕایەڵ و میهرەبان. ئەویش بەشی خۆی گوناهی هەیە. کە قەبووڵ دەکات خۆی بە لوجینی خوێڕی و خەمسارد بفرۆشێت، هەم گوناهکارەو هەم پیرۆزە. گوناهکارە، چونکە خۆی ڕادەستی کەسێک دەکات کە خۆشی ناوێت، پیرۆزە، چونکە تەنیا بەمەبەستی ڕزگارکردنی براکەی مل بۆ ئەو کارە دەدات.

ڕاسکولنیکوف، بەدونیا دەڵێت: "ئەم زەماوەندە کارێکی نەنگین و شەرماوەرە، من حەزدەکەم خۆم عەیبدار بم، بەڵام تۆ عەیبدار نەبیت.. تۆ..."

گوناهکارێکی گەورەی دیکەش واتە سڤیدرگایلوف هەیە، ئەو پیاوەیە کە خوشکەکەی ڕاسکولنیکوف وەکو هاودەم، کاری لەلا کردووە و ئەو ژنە گەنجە ئەسیری یارمەتی و کۆمەکەکانی خۆی دەکات. ئەم پیاوە، کەسێکی ڕەوشت نزمە، باوەڕی بەهیچ شتێک ، باکی بە هیچ کارێک نییە، لە هیچ کارێک ناپرینگێتەوە. لە هیچ شتێک ناترسێت. بەلای ئەوەوە ژیانی ئایندە و پەسلان بریتییە لە "ژوورێکی چکۆلەی وەکو حەمامێکی دێهاتی، پڕ لە دووکەڵ و تەنی، کە گۆشە و کەنارەکانی یەکپارچە جۆڵا تەنە بێ. ئەمە ئەبەدیەتە." لەزەت و خۆشی و ڕابواردن لەکوێ بی، ئەو لەوێیە و گوێ بە ئاکام و ئاقیبەتی عەیش و نۆش و ڕابواردنەکانی نادات. دەربارەی ژنە مردووەکەی دەڵێت: "تەسەور بکەن: تەنیا دوو قامچیم لێدا." کاتی خۆی کچۆڵەیەکی چواردەساڵانی کەڕو لاڵی فەسات کردبوو. دوای ئەوەی کە ڕۆیی بوو، کچەی داماو لەعەمارێکی دانەوێڵەدا خۆی هەڵواسی بوو. ئەم سڤیدریگالیوفە، لەسان پتروسبۆرگدا، دوای خوشکەکەی ڕاسکولنیکوف کەوتبوو. تا لە خشتەی بەرێت و لەگەڵیا ڕابوێرێت. سەرەنجام دونیا دەباتە ژوورێکەوەو پێشنیازی ئەوەی بۆ دەکات کە ئەگەر خۆی بە دەستەوە بدات و لەگەڵیدا ڕابوێرێت، براکەی ڕزگار دەکات، چونکە ئیعترافی براکەی دیتووە.

دونیا کە هەست دەکات کەوتوتە تەڵەوە، دەست دەداتە دەمانچە، تا کابرای حیلەباز بکوژێت، بەڵام بە قێزو بێزەوە دەمانچەکە دادەنێت. کابرا کە دەبینێ دونیا بەو ڕادەیە ئەوی خۆشناوێ کە بیکوژێت، وازی لێدێنێت تا بەخەم و پەژارەوە بڕوات.

ئەم ڕەفزکردنەی دونیا، ئەم سەلاری و سەنگینییەی دونیا، کابرا لە پەلوپۆ دەخات، بەنجی دەکات. کابرایەک کە لەهەموو تەمەنی خۆیدا نەکەسێکی خۆش ویستووە و نە ڕقی لەکەس بووە. سەبارەت بە دونیا، هەست بە جۆرە ئەشق و ڤیانێک دەکات. ئەوێک کە جگە لە هەستی ڕابواردنی جەستەیی، هیچ هەستێکی دیکەی لەلا نەبووە، ئێستا سۆز و هەستێکی سۆزداری لەخۆیدا دەبینی و لەم حاڵەتەش دەترسێت.

"ئەو شەوە تا سەعات دە، بە مەیخانە و قەحپەخانەکاندا دەسوڕێتەوە." پاشان بۆ لای سونیا دەگەڕێتەوە و پڕێک پارەی زۆری دەداتێ. دوای ئەوە دەڕوات بۆ لای دەزگیرانەکەی. دەزگیرانەکەی کیژێکی لەڕو لاوازە، دایک و باوک و کەسوکارەکەی بە پازدە هەزار ڕۆبڵ بەم ئاغایەیان فرۆشتووە. دوای ئەوە دەڕوات لە ئوتێلێکی ناوزڕاودا، ژوورێک بەکرێ دەگرێت و دەیەوێ بە کەماڵی ئیسراحەت بخەوێ و پشوویەک بدات.

بەڵام مۆتەکە وکابووسان، مەودای نادەن و بە جارێ وەڕەزی دەکەن. خەو دەبینێ، لەو خەوەدا کچۆڵەیەک لە تابووتێکدا دەبینێ، تەمەشا دەکات، هەمان کچۆڵەیە کە ئەو دەستدرێژی کردبووە سەرو لەترسی حەیای خۆی، خۆی کوشتبوو. هەروەها وای دێتە بەرچاو کە کچۆڵەیەکی پێنج ساڵان لە سوچێکی ڕاڕەوێکدا کەوتووە وفڕێدراوە، کچۆڵەکە دەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵەوە دەباتەوە. کچەکە ڕوخساری گڕگرتووی دەکاتە ئەو و باوەشی بۆ دەگرێتەوە. سڤیدریگایلوف، بە هەڕەشەوە دەستی لێبەرز دەکاتەوە و هاواری بەسەردا دەکات: "هەی مەلعون" و یەکسەر لەخەو ڕادەپەڕێت. دوای چەند سائێک سڤیدیگایلوف، بەدەم تایەکی گەرمەوە، بەخەم و پەژارەیەکی زۆرەوە خۆی دەگەیەنێتە سەر جادەکە و لە سووچێکدا خۆی دەکوژێت. مارمیلادوف، سونیا، دونیا، سڤیدریگایلوف، لوجین، هەر هەموو ئەم خەڵقەندانەی دوستویفسکی، خەڵکانێکی پووچ و بودەڵەو، ناکەس و بێشەرم و حەیان. کلۆڵ و بەلەنگازانێکن کە دەوری ڕاسکولنیکوفیان داوە و هەر هەموویان بیانوویان بۆ ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خۆیان هەیە. هەموویان بە کەوتنی خۆیان دەزانن. بە دیدو بۆچوونی دوستویفسکی تەنیا دادڤانان و قازیان، شایستەی دادگایی کردنن. هیچ شتێک لەسەر زەوی دزێو و ناشیرین نییە، تەنیا ئینسانی مەحرووم لە هیواو ئاوات و ئارەزوو نەبێ، تەنیا ڕوحی وشک و مردەڵە نەبێ، تەنیا ڕۆشنبیری مەغروور و لەخۆبایی نەبێت. هیچ تاوانێک نییە کە قابیلی بەخشین نەبێت. خۆشەویستی هەموو شتێک ڕزگار دەکات، خۆشەویستی تەوازوع ئامێز، چونکە خۆشەویستی مرۆڤانی دەبێت متەوازیعانە بێت.

ئیرادی ئەوە لە دوستویفسکی گیراوە کە لەبەرهەمەکانیدا جگە لە خەڵکانی شێواو ونا ئاسایی و نەخۆش هیچی تری وێنە نەگرتووە و بەرجەستە نەکردووە. دکتۆر چیجی دوستویفسکی ناسی گەورە، دەڵێت چواریەکی قارەمانانی نێو بەرهەمەکانی دوستویفسکی، خەڵکانێکن کە نەخۆشی دەرونی و عەسەبیان هەیە. لە ڕۆمانی تاوان و سزادا، شەش کەس، لە برایانی کارامازوفدا دوو کەس، لە شەیتانەکاندا شەش کەس و لە

ڕۆمانی گەمژەدا چوار کەس و لە ڕۆمانی هـەرزەکاردا چـوار کەسـی لـەو جـۆرە هەن.
ڕاسـکولنیکوف، لەڕاسـتیدا، بەردەوام لە حاڵی لەرزو تادایـە، یـان بـەدەم لـەرزو تـاوە وڕێنـە دەکـات. "سـفید ریگـایلوف"ش لـە ڕووی لـەزەت و ڕابواردنـەوە، لـە قـەیرانی شـەهوەتڕانی ترسـناکدایە. مـارمیلادوف، بابایـەکی بادەگوسـاری وڕێنـەکارە. کـاترین ئیڤانوڤنـا لـە دواقۆنـاغی نەخۆشـی سـیلدایە. یـانی سفیدریگایلوف گوتەنی سان پتروسبۆرگ "شاری نیمچە شێتانە"
خوێنەر، لەسەرەتاوە، هەست بە هیچ خاڵێکی هاوبەش دەگەڵ ئەم بوونەوەرە شێواو پەرێشانانەدا ناکات، کەچی خۆ بەخۆ بەرەو ئەوان دەکشێت. هەرچەندە ئێمە هەرگیز نەمان دیتوون، هیچ جۆرە بەرخورد و ئاشنایەتیەکمان لە گەڵیاندا نییە، کەچی جۆرە جازیبەیەکیان تێدایە کە بەرەو خۆیان ڕاماندەکێشن، وەکو ئەوەی بەرەو هەڵدێرێکی قووڵ شۆڕببینەوە. هەست بە جۆرە ئولفەت و ئاشنایەتیەکی نهێنی ئامێز دەکەین لە گەڵیاندا. لێیان دەگەین، خۆشمان دەوێن، سەرەنجام خۆمان لەواندا دەبینینەوە. خۆمان لەواندا دەناسین. چونکە لە ڕاستیدا، ئەوان لە ئێمە نائاساییی تر نین. خەڵکانێکن، حەزدەکەین وەکو ئەوان بین، بەڵام جورئەت ناکەین. ئەوەی ئەوان دەیڵێن و دەیکەن، ئێمە ناوێرین بیڵێین یا بیکەین. ئەوەی ئیمە لە پەناو پەسێر و تاریکی دەروون و ویژدانی خۆدا دەیشارینەوە، ئەوان بە ئاشکرا و بەڕاشکاوی دەری دەبڕن.
ئـەدی نەخۆشـییەکانیان؟ ئـەدی شـێتایەتیەکانیان؟ ئـەم دیاردانـە بیـانوو و دەسـتاوێزن بـۆ ئەنجامـدانی ئـەو کارانـەی کـە خۆیـان دەیانـەوێ، نووسـەر بـۆ ئەوەی کارێک بکـات، خوێنـەر ئـەم کاراکتەرانـە قـەبووڵ بکـات، لـۆژیکی گوتـار و کردارەکانیـان قـەبووڵ بکـات، ناچـاربووە لـە قـاڵبی شـێت، سـیلاوی، فێـدار و هیستریکدا بەرجەستەیان بکات.. باری ئەوانی قـوورس کـردووە تـا بـاری ئێمـە سووک بکات،.. ئیدی نەخۆشی و پەرێشانی ئەوان کراوە بە گوزەرنامەیـەک تـا بەئاسانی قـەبووڵ بکـرێن و مامەڵـەیان لەتەکـدا بکرێـت. بـۆ هـەر یـەکێک لـەم کاراکتەرانە، کە جگە لە ڕەمز و نوێنەری بیری گەڕۆک و پەرێشـان، هیچـی دی نین، دەفتەرچەیـەکی نـۆژداری دروسـت کـردووە: "ئـەوەی لێـرەدا دەیگێڕمـەوە، تەواو پەسـەند و بەجێیە، چونکە قسـەی خەڵکانێکی نا ئاساییە."
بـەڵام ڕەخنـەگران، لـە سـەرەتاوە، ئـەم بیانوانـە ڕەفـز دەکـەن، بـە تـەواوەتی ڕەتی دەکەنـەوە، بـەو چـاوە سـەیری بەرهەمـەکانی دوسـتویفسـکی دەکـەن، کەلێکۆڵینەوەی بواری نەخۆشـی دەروونـین. هـیچ هـەوڵی ئـەوەیان نـەداوە کـە دەمـامکی ڕووی ئـەم قارەمانانـە لابـدەن و، هـەنگێ تەمەشـای ڕوخسـاری ڕاستەقینە و سیمای مرۆڤانی ئەم دێو و درنج و کاراکتەرە شێواو و نائاسـاییانە بکەن، تا ڕوخسار و سیمای مرۆڤانیان، کە سیماو ڕوخساری تایبـەتی ئێمەیـە، تەماشا بکەن و بدینن.
ڕەخنـەگر "دی ڤوکـە" دەنووسـێت: "لێـرەدا پیـاو ئـەو پرسـیارە دەکـات ئایـا ئەدەبیات مافی ئەوەی هەیە بەو ڕادەیە بایەخ بە هەندێ حاڵـەتی نائاسـایی و

کەسانی نەخۆش بدات و مامەڵەیان لەتەکدا بکات؟" نائاساییەکەی لە کوێیە؟ ئەم نەخۆشانە کێن؟ بۆ ئەوەی کەسێکی نەخۆش لەئارادا بێ، دەبێ جەستەی هەبێ، بەڵام کاراکتەرەکانی دوستویفسکی جەستەیان نییە. تەنیا پردێکن، یا هۆیەکن بۆ گوێزانەوەی بیرو بۆچوونەکانی ئێمە، بەڵکو تەنیا خودی بیرو هزری ئێمەن. ئەگەر ئەو جیهانەی ئەوان تیایدا دێن و دەچن، دەجوڵێن، لە جیهانی ئێمە بچێت، تەنیا بەهۆی فەندو فێڵی زیرەکانەی نووسەرەوەیە. ئەم ژوورە سارد و سڕانە، کاباریەو سۆزانی خانەی پیس و بۆگەن، کوچەو کۆڵانانی تاریک و بە تەمتومان، فانۆسی پایەخوار و خێچ، ئەو دەرپێ وجلانەی ژێرەوە کە بە پەنجەرانەوە هەڵواسراون، چەرچەفی پیس و بەدەرگاو پەنجەرانەوە هەڵواسراو، هەر هەمووی دیکۆری خەیاڵین، نەک وێنەی واقیعی. هەر هەموو ئەو دیمەنانە زادەی وەهم و خەیاڵی نووسەرن، تەنانەت ئەو وردەکاریانەش، ئەو ماناو مەبەستانەش کە نووسەر، لە قوڵایی ئەم تاریکستانە پڕ پۆخڵەواتەوە هەڵیان دەهێنجێ و بە دوورو درێژی ڕوونیان دەکاتەوە، زیاتر وەکو شوێنەوار و نیشانەی جۆرە سادیزمێکی نائاسایی و میتا تەبیعی دێنە بەرچاو. ئەمانە مانای ژێراو ژێر و پەنهانیان هەیە: "ئەو تابلۆیانەی کە کیژانی ئەڵمانی دەنوێنن" لە ماڵی ژنە سووتخۆرەکە. "ئەو قوونە ئاروەە بۆگەنانە، ئەو پسکیتە ڕەشەوەبووانە، ئەو لەتە ماسیانە" لە کاباریەکەدا، "ئەو تەختەی کە چەرچەفێکی ئەستووری گوڵ گوڵی بەسەردا دراوە" لە ماڵی مارمیلادوفدا، و "ئەو سەگە ناحەزەی کە لەقوڕو چڵپاو هەڵکشاوە و کلکی لە گەڵۆزی ناوە" لەو ساتەدا کەسیفیدریگایلوف نیازی خۆکوژی هەیە، بەلایا دەڕوات... هەر یەکێک لەم دیمەن و وردەکاریانە، وەکو تەزووی کارەبا لێمان دەدەن و تووشی شۆکمان دەکەن. بەڵام بێدارمان ناکەنەوە، تەنیا ئەم سوودەیان هەیە کە ئەو ڕێگایەی لە واقیعەوە تا خەیاڵ تەی کراوە، بە دیقەت هەڵسەنگێنین. هەر یەکێک لەمانە بۆ خۆی یەکەیەکە کە نووسەر ناو بەناو دەیانخاتە ڕوو تا سۆز و بەزەییمان بۆ ماوەیەک بوروژێنێ و پاشان ملی ڕێی خۆ دەگرین، وەکو کەسێک بەدەم خەوەوە بڕوات.

دوستویفسکی بۆ ئەوەی لە بڵاوکردنەوەی کتێبەکانیدا سەرکەوتووبێ ناچارە بەگژ وەشانکارەکەیدا بچێتەوە کە داوای لێدەکرد، سووکە دەسکارییەکی دەقی ڕۆمانەکە بکات. (کاتکوف و لیونتییف)ی جێگری وا وێنا دەکەن کە فەسڵی خوێندنەوەی ئینجیل لە گینە "خراپ شرۆڤە بکرێت و لێک بدرێتەوە." و دەنگدانەوەیەکی باشی نەبێت، ئیدی جۆرە (شوێنەوارێکی نەهلیستی) لەو خەسڵەدا دەبینن. دوستویفسکی لەسەرەتاوە مل نادات، بەڵام ئەنجام چاری نامێنێ، دەبێ مل بدات، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ناچار دەستم بەگۆڕین و دەستکاری ئەم فەسڵە گەورەیە کرد، ئەم گۆڕین و دەستکاریە، بە ئەندازەی نووسینی سێ دانە فەسڵ، زەحمەتی دام و کاتی لێگرتم."

لەڕاستیدا، ئەم گۆڕین و دەستکاریەی دوستویفسکی نەیکردە کارێک کە خوێنەران و ڕەخنەگران ڕاسکولینکوف بە کەسێکی نەهلیست نەزانن، ستراخوف لەو بارەیەوە دەنووسێت: "بەمجۆرە، بۆ یەکەمجار کەسێکی

نەهلیستی لەهەنبەر خۆماندا دەبینین کە هەست و سۆزی هەیە، ئازار دەکێشێت، نەهلیستێک کە بەدەم کول و کۆڤان و ئازارێکی مرۆڤانیەوە دەتلێتەوە"و هەندێکەس ڕاسکولنیکوفیان بە بازاڕوفی شۆڕشگێڕی، قارەمانی یەکێک لە ڕۆمانەکانی تورگینیف شوبهاندووە. بەڵام، جیاوازیەیکی یەجگار زۆر لەنێوان بازاروف و ڕاسکولنیکوفدا هەیە. بازاروف، پیاوێکی تازەیە، قازەمانی زەمان و دەقاو دەق خەڵکی زەمانی خۆیەتی: بابایەکی نەهلیستە. بەڵام ڕاسکولنیکوف، قارەمانی هەموو زەمانەکانە. ئەوەی ئەو ئازار دەدات، پێوەی دەتلێتەوە، پرس و کێشەیەکی جڤاکی نییە، بەڵکو پرسیارێکی میتافیزکییە. ڕاسکولنیکوف، بەرەنجامی ڕەوش و ڕەوتێکی فیکری نییە، بەڵکو بەرەنجامی بەردەوامی و جاویدانیەتی تیرەی بەشەرە. بازاروف، تەنیا لە چوار چێوەی سەدەی نۆزدەدا هەیە و دێتە وێناکرن و تێگەیشتن، ڕاسکولنیکوف، دەشێت لە سەدەکانی ناڤین و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا بێتە تەسەور کردن و دەرککردن . بازارۆف، یەک پیاوە، یەک ئینسانە، بەڵام ڕاسکولنیوکف، هەموو پیاوانە، هەموو ئینسانە.

وێڕای ئەمەش، خوێندکارانی زانکۆ، بەچاولێکەری ڕاو بۆچوونی ڕەخنەگرەکان، ڕاسکولنیکوفیان بەو چاوە تەمەشا دەکرد، کە بڵندگۆیەکە بۆ هێرشی کوێرانە بۆ سەر گەنجانی زانکۆیی. بە ڕێکەوتێکی سەیر، لەدوای بڵاوبوونەوەی ڕۆمانەکە "تاوان و سزا" بەماوەیەکی کەم، خوێندکارێکی زانکۆیی خۆی دەکوژێت و ئەم ڕووداوە، هێندەی دی بۆچوونەکانیان ڕیشاژۆ دەکات و ئیدی ڕۆژ بەڕۆژ دوستویفسکییان لەبەرچاو دەکەوێ و لێی دەتورێن.

بەڵام جەماوەری بەرینی خەڵکی، بەڕاستگۆیی و گەرم و گوڕییەکی پڕ جۆشەوە پێشوازیان لە ڕۆمانی "تاوان وسزا" کرد. ئەم ڕۆمانە کە لەهەمان کاتدا بە ڕۆمانێکی پۆلیسی، چیرۆکێکی سۆزداری و حیکایەتێکی پەند ئامێز و فەلسەفی دەژمێردرا، خەڵکانێکی یەجگار زۆری ڕازی کرد. هەرچەندە هەموویان وەکو پێویست لە مەبەست و نێوەڕۆکی ڕۆمانەکەی حاڵی نەبوو بوون، بەڵام هەرکەسەو بەگوێرەی فام و تێگەیشتنی خۆی و بەدوور لە هزرینی قووڵ، ڕۆمانەکەی قەبووڵ بوو. ناوی نووسەرەکەی کەوتە سەر زاران. ناوی دوستویفسکی دەگەڵ ناوی تورگینیف و تولستویدا دەبراو کە ئەمە خۆی لەخۆیدا شانازییەکی گەورە بوو بۆ دوستویفسکی.

بەڵام ئەم شۆرەت و ناوبانگە کوت وپرە. گرفتە داراییەکانی نووسەری چارەسەر نەکرد. ئیدی بەرواری ١/ت٢ دووەم، کە قەراربوو دوستویفسکی لەو بەروارەدا، ڕۆمانێکی تازەی بڵاونەکراوە تەسلیم بە ستیلوفسکیی وەشانکار بکات، بەرە بەرە نزیک دەبووەوە. لە کاتیکا هێشتا تاقە دێڕێکی لەو ڕۆمانە نەنووسی بوو. میلیوکوف کە لە ١٠/١دا سەردانی دوستویفسکی دەکات، لەو بارەیەوە دەنووسێت: "بەدەم جگەر کێشانەوە، بە هەنگاوی هەڕاوەوە، بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. زۆر شپرزەو پەشێو بوو لێم پرسی:

-چیتە؟

بەدەم ڕێکردنەوە وەڵامی دایەوە:

-تەواو، تیاچووم.
-بۆ، چی بووە؟
دەزانی چ قەرار و گرێبەستێکم لەگەڵ ستیلوفسکیدا هەیە؟
- باسی ئەوەت بۆ کردم کە قەراردادێکت لەگەڵیا هەیە، بەڵام باسی ناوەڕۆک و مەرجەکانیت بۆ نەکردووم.
-کەواتە، گوێ بگرە.
دوستویفسکی، لەمێزی نووسینەکەی نزیک بووەوە، کاغەزێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و دایە دەستم و دووبارە بە ژوورەکەدا کەوتەوە هاتووچۆ، کە قەراردادەکەم خویندەوە، ترس لەسەراپام نیشت، دوستویفسکی بەگوێرەی گرێبەست و قەراردادەکە نەک تەنیا پڕێ پارەی کەمی لە بری بەرهەمەکانی پێشووی وەردەگرت، بەڵکو دەبوایە لە هەوەڵی مانگی تشرینی دووەمدا، واتە دوای پێنج مانگ لە ئیمزاکردنی گرێبەستەکە "ڕۆمانێکی تازەی بڵاو نەکراوە، بەلای کەمەوە بە قەبارەی دە مەلزەمەی تایپکراوی لاپەڕە گەورە، ڕادەستی یارۆی وەشانکار بکات و ئەگەر قەول و قەرارەکەی نەبردە سەر، ئەوا ستیلوفسکی هەقی ئەوەی دەبێت، هەموو بەرهەمەکانی ئایندەی ئەو، بەخۆڕایی، بێهیچ پاداشتێک بۆ خۆی چاپ بکات."
لێم پرسی: "باشە زۆرت لەم ڕۆمانە نووسیوە؟"
-هێشتا تاقە دێڕێکم لێی نەنووسیوە."
میلیوکوف، بە نیگەرانی و لەڕووی خەمخۆرییەوە پێشنیاز دەکات کە چەند دۆست و برادەرێکی خۆیان کۆبکاتەوەو نووسینی هەر فەسڵێکی ڕۆمانی ناڤبری بە یەکێکیان بسپێرێت و بە شەریکی ڕۆمانەکە تەواو بکەن.
دوستویفسکی بەرسڤی دەداتەوە: "نەخێر، من هەرگیز کاری کەسانی دی بەناوی خۆمەوە بڵاو ناکەمەوە." هەنگێ میلیکوف، پیشنیازی بۆ دەکات، کە توند نووسێک بەکرێ بگرێت و ئەم ڕۆمانەکە بڵێت و ئەو خێرا بینووسێتەوە. دوستویفسکی. دوو دڵ دەبێت، ئایا دەتوانێ لەواری نووسیندا، ئەو شێوازە بەکار بینێ، ئایا دەرەقەت دێ؟ ئەدی ئەم توند نووسە لەکوێ پەیدا بکات؟
میلیکوف پڕ بەزار هاوار دەکات: ئەو کارە دانە بۆ من، من یەکێک دەناسم و ڕووی لێدەنەم.
بۆ سبەینێ، واتە دووی ئۆکتۆبەر، میلیوکوف، دەچێت بۆ لای ئولچین، کە بەڕێوەبەری فێرگەیەکی توندنووسی ژنان دەبێت و حاڵ و حیکایەتەکەی لە سیری تا پیاز بۆ دەگێڕتەوە. ڕۆژی سێی/ئۆکتۆبەر، سەعات دەی شەوێ ئولچین، لە یەکێک لە فێرخوازەکانی خۆی نزیک دەبێتەوەو پێی دەڵێت: "ئانا گریگوریڤنا، دەتەوێ کارێکی بچکۆلەی توندنووسی بکەیت؟ داوای توندنووسێکیان لە من کردووەو، منیش تۆم بەپەسەند زانی و بیرم لە تۆ کردەوە."

# فەسڵی حەوتەم
## ئانا گریگوریڤنا

ئانا گریگوریڤنا، ڕۆژی ١٨٦٦/١٠/٤، بەیانی زوو لە ماڵی داک و بابی خۆی، لە سنیتکین، وەدەر دەکەوێت و لە فرۆشگایەکی سەر شەقامی گاستینی دڤۆر، چەند قەڵەمێک و جانتایەکی چکۆلە دەکڕێت و بە کوچە و کۆڵانی "ستالارینی"دا بەرەو ماڵی دوستویفسکی دەڕوات.

ئانا گریگوریڤنا، کیژێکی گەنجی بیست ساڵانی، ڕەنگ و ڕووکاڵی، چاوگەشە. جووتێ چاوی کەوەیی گەشی هەن، کە شادی و ڕاستگۆییان لێدەبارێت. کیژی ماڵێکی خانەدان و سەلار و سەنگینە. قۆناغی دواناوەندی ماری، بەسرکەوتوویی تەواوکردووە و میداڵێکی زێڕیان بەو بۆنەیەوە داوەتێ. دایکی بۆیە قاییل بوو کە ئانا وەکو سکرتێر و توندنووس لەلای کابرایەکی نووسەر کار بکات، چونکە بابی ئانا، کە لەژیاندا بوو، بە تاسەوە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرەی دەخوێندەوەو ستایشی دەکرد. ئەم دوستویفسکییە کێیە؟ دەبێ هاوچەرخی بابی بێت. ئایا پیاوێکی قەڵەوی سەر ڕووتاوەیە، یا کەسێکی باریک و بنێس و درێژ داهۆڵی، زۆر سەختگیر وجدیە؟ ئانا لەبیری ئەمەدایە: هاوکاری دەگەڵ نووسەرێکی بەناوبانگی وەکو دوستویفسکی کارێکی سەیرە! بە کیژێکی گەوج و گێلوکەی نەزانێ. ئایا دەتوانێ باسی کتێبەکانی خۆی "دوستویفسکی" لەگەڵدا بکات؟ ناوی هەندێ لە قارەمانانی هەژارانی لەبیر ماوە، ناوی هەندێکی دیکەیانی لەبیرچوون. باشە ئەگەر دوستویفسکی ،ناوی ئەو قارەمانانەی لێبپرسێت، چی بڵێت؟ بڵێ لەبیری چوون یا خۆی لەگێلی بدات؟

سەعات یازدەی دانی بەیانی ئانا، دەگاتە بەردەم ئەپارتمانی ئالونکین، ئەمە بینایەکی یەجگار گەورەیە، دەیان شوقە و ماڵی چکۆلەی لەخۆ گرتووە. تا ڕادەیەکی زۆر دەشوبهێتە ئەو بینایەی کە ڕاسکولنیکوف، لە ڕۆمانی تاوان و سزادا، تیایدا نیشتەجێیە. دەپرسێت: "شوقەی ژمارە ١٣؟ دەرگاوانەکە بەرسڤی دەداتەوە: "قاتی دووەم، لەژێر گومەزەکەدایە."

کارەکەرێک، کە تەمەنی دیار نییە، دەیباتە ژوورێکی گەورە، کە موبیلمانێکی سادەکراوە. تەختێک و چەند کورسییەک و مێزێکی کارکردنی تێدایە. ئانا تازە دانیشتبوو کە دەرگای ژوورەکە کرایەوەو دوستویفسکی وەژوورکەوت. عوزر خوایی بۆ هێنایەوە، کە کەسێک بەقسەوە گرتبووی و، دواکەت.

ئانا، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا ئەمەی نووسیوە: "پیاوێک بوو دەستە باڵا، قژ قاوەیی، هەندێک کاڵ و، بگرە ئامال زەرد. ڕۆنی لێدا بوو و جوان شانەی کردبوو. بەڵام ئەوەی لەم ڕوخسارەدا زیاتر سەرنجی ڕاکێشام چاوەکانی بوو. چاکەتێکی ماهووتی شینی لەبەر بوو، کە تەقریبەن کۆن و سواو بوو. بەڵام یەخە و سەردەستی کراسەکەی وەکو بەفر سپی بوون."

دوستویفسکی، شەکەت و ماندوو، نیگەران و خەمین، لە ئانا دەچێتە پێشەوە. شەوێ نۆرە فێیەکی لێهاتبوو و هێشتا بەتەواوەتی وەخۆ نەهاتبووەوە. بە دەنگێکی نزم و خەمناک داوا لە ئانا دەکات دانیشێت و چەند ڕستە و دەستەواژەیەکی ڕۆژنامەی "پەیکی ڕووس"ی بۆ دەخوێنێتەوە کە بینووسێت. دوستویفسکی ڕستە دەستەواژەکان زۆر بەلەز دەخوێنێتەوە و ئانا، بە ناڕەزایی دەڵێت: "کەس، بەم خێراییە قسە ناکات." پاشان کاتێ کە ئانا دەقە توندنووسەکە، بۆ نووسینی ئاسایی تەرجەمە دەکات، دوستویفسکی بەبێ حەوسەڵەیی بە ژوورەکەدا دێت و دەچێت و دەڵێت: "چەند درێژەی کێشا، نووسینەوەی ئەم شتە، ئەم هەموو وەختە دەبات؟" دوای ئەوەی تەمەشای نووسینەکە دەکات، دەبینێ کە سکرتێرەکەی خاڵێکی فەرامۆش کردووە و، نیشانەیەکی خاڵبەندی وەکو پێویست دانەناوە. دەڵێت:"شتی وا نابێت! نەخێر هەرگیز نابێت. بەهەرحاڵ ئەمڕۆ، مەحاڵە بتوانم هیچ شتێکی دیکەت بۆ بخوێنمەوە، سبەینێ وەرەوە."

کاتێ ئانا، بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، بە دایکی دەڵێت: "دایکە، ئیدی بەهیچ جۆرێ باسی ئەم ئاغای دوستویفسکییە بۆ من مەکە."

ئانا، بۆ سبەینێ دیسان دێتەوە و ئەمجارەیان کارەکە باشتر دەچێتە پێشێ. دوستویفسکی مجێز و کەیفی قنچترە. فەسڵەکانی هەوەڵینی ڕۆمانی قوماربازی پێ ئیملا دەکات. ناو بەناو لە ناوەندی کارەکەدا دەوەستا، تا هەندێ لە بیرەوەرییەکانی خۆی بۆ کیژێ بگێڕێتەوە: ئیدی سەردەمی منداڵیەتی، گرتنەکەی، سێدارە، سیبریا... ئانا بە دڵ و بە گیان گوێی لێدەگرێت، هەم بە قسەکانی خۆشحاڵ دەبێت و هەم خەفەتی بۆ دەخوات، بیر لەم پیاوە دەکاتەوە کە ئەو هەموو دەرد و مەینەتیەی دیتووە و بەو هەموو هۆشمەندی و زیرەکیەی خۆیەوە، بایەخ بەم دەدات. دوستویفسکی دەپرسێت: "دوێنێ چەند لاپەڕەمان نووسییەوە؟ ئایا لەکاتی دیاریکراودا لێدەبینەوە؟"

کاری ڕۆمانەکە، باش دەڕۆیی و دوستویفسکی بەرە بەرە دڵنیا دەبێت. کە دەگەڵ ئەم کیژە ناسک و تەڕو پرەدا کاری دەکرد، هەستی بە خۆشی و لەزەتێکی سەیر دەکرد. کیژێکی جوان و لەبەردڵانە، خوێندنەوەی ڕۆمانێکی ئاشقانەی ڕۆمانسی بۆ ئەم کیژە، جۆرە جۆش و خرۆشێکی بەدڵی دەبەخشی. ناوی پولین، کۆنە دەنکەکەی خۆی، لە قارەمانی ڕۆمانەکە دەنێت. دوستویفسکی چارەو ڕوخساری پڕ غرووری ماشقەکەی وەبیر دێنێتەوە و دەگەڵ نیگای جوان و ڕەفتاری دڵگیری ئەم کچە کۆشیارەیدا، بەراورد دەکات.

ئەلیکسی ئیڤانوفیچ، کە چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە، لەم چیرۆکەدا مامۆستایە. شێتانە حەزی لە پولین، کیژە جوانەکەی جەنەڕاڵ زاگوریانسکی کردووە. پولین، ئاگاداری ئەوەیە کە ئەم کوڕە گەنجە خۆشی دەوێ و ڕێگەی دەدات کە باسی ئەشقی دەگەڵ بکات، بەڵام بەکردەوە دەیبوغزێنێ. ئەلیکسی پێی دەڵێت: "زۆر چاکە! من دان بەوەدا دەنەم، کە خوڵامیەتی تۆم زۆر پێخۆشە.

نزمترین پلەی حەقارەت و سوکایەتیش لەزەتی خۆی هەیە... جا تۆ سوود لە کۆیلایەتی من ببینە! دەزانی، ئاقیبەت ڕۆژێ دێ کە بتکوژم؟"
وەختێ پولین، ئاگاداری دەکاتەوە کە پێویستی بەپارەیە، ئەلیکسی دەڕوات بۆ گازینۆ و بەو حەوت سەد فلورانەی کە پولین پێی داوە، دەست بە ڕۆڵێت دەکات. لەناکاوا سەراپای گەرم دادێت، تای لێدێت. دەڵێت: "لەوساتەدا هەستم دەکرد کە دەمەوێ گاڵتە بە قەدەر و چارەنووس بکەم، سووکایەتی پێبکەم، زمانی لێ دەربێنم." هەموو پارەکە دەدۆڕێنێ و دەست لە گونان شۆڕتر، لە هۆڵی گەمەکە دێتە دەرەوە. هایم و حەیران سەری گێژ دەخوات. بەڵام پولین، بەخۆرتی بۆ گازینۆکەی دەنێرتەوە، ئەمجارەیان بەخت بەڕوویا دەگرژێتەوە: "لاجانگەکانم لە ئارەقەدا هەڵکشابوون، دەستەکانم دەلەرزین. هەندێ پۆڵاندی دەیانویست ئامۆژگاریم بکەن و خزمەتم بکەن و پیاوەتی و چاکەم دەگەڵدا بکەن، بەڵام من گوێم لە قسەی کەس نەدەگرت. بەختم کرابووەوە و گوێم لەهیچ نەبوو. لەناکاوا، دەنگی هەراو هەنگامە، هەراو زەناو، پێکەنین بەرزبووەوە. هەندێ کەس هاواریان دەکرد: "براڤۆ، براڤۆ!" هەندێکیان چەپڵەیان لێدەدا، تا ئەو کاتە سی هەزار "فلوران"م بردبووەوە و بانک تا ڕۆژی دواتر داخرا بوو." ئیدی بەهەشتاو بەرەو ئوتێلەکەی دەگەڕێتەوە، خۆی بە ژوورەکەی خۆیدا دەکات. پولین، لەوێندەر چاوەڕوانی دەکات و پێی دەڵێت: "من ئەم پارەیەیت لێ وەرناگرم، تا شتێکی لێنەدەم بە تۆ." ئیدی پولین، خۆی لە ئامێزی داوێ، نەوازشی دەکات و خۆی ڕادەستی دەکات و پەیتا پەیتا پێی دەڵێت: "تۆ چەند باشی، بەڕاستی پیاوی، ماقووڵی.. ئێ، ئێستا پارەکەی خۆم، پەنجا هەزار فرانکەکەی خۆمم دەدەیتێ؟" کاتێ کە پەنجا هەزار فرانکەکە وەردەگرێت، هەر هەمووی دەدات بە سەروچاویدا و هەڵدێت. ئەلیکسی دوای ڕۆیشتنی پولین، دەڕوات بۆ پاریس و لەوێ پارەکانی خەرجی ژنێکی ڕیسکباز دەکات. پاشان، بەمەبەستی دابینکردنی بژێوی خۆی خوو دەداتە قومار. دەدۆڕێ، دەباتەوە، دووبارە دەدۆڕێ... "لەڕاستیدا کاتێ کەسێک، بەتاقی تەنیا، لە وڵاتێکی بێگانەدا، دوور لە وڵات و دۆستان، بێئەوەی بزانێت ئایا خواردنی ئەمڕۆی دەست دەکەوێت یا نا، دوا فلورانی خۆی بخاتە قومارەوە، هەست بە غەریبییەکی سەیر دەکات." و ڕۆمانەکە بەم ڕستە خەمناکە کۆتایی دێت: "سبەینێ، سبەینێ هەموو شتێک کۆتایی دێت."
ڕۆمانی قومارباز، جگە لە دوو کاراکتەرە سەرەکیەکەی، واتە پولین و ئەلیسکی، کە تەوەری سەرەکی هەموو ڕووداوەکانن، کاراکتەرێکی سەرەکی زۆر گرینگی دیکەشی تیایە، کە شایستەی باسکردن و ئاماژەیە. ئەم کاراکتەرە، پورە پیرو زۆر دەوڵەمەندەکەی جەنەڕاڵە. لەڕووی خۆشەویستیەوە، بەبابولنکا بانگی دەکەن. "بابولنکا، وشەیەکی رووسییە، لە ڕووی خۆشەویستیەوە، بۆ پیرەژنی بەتەمەن بەکاردەبرێ." هەموو خانەوادەکە، بەتاسەوە چاوەڕاوانی مردنی ئەون. ئەم پیرەژنە لە ڕۆژێکی هەتاویندا، لەشاری قوماردا دادەبەزێ، تاقمێک دەستوپێوەند و خزمەتکاری

دەگەڵـدا دەبـن، بـە گـوێرەی فـەرمانی پـورێ، دەیخەنـە سـەر کورسـییەکی چەرخدار و بۆ گازینۆکەی دەبەن، ئیدی لەوێ، بەپەرۆشـەوە دەسـت بـەیاری دەکـات؛ دوستویفسـکی دەنووسـێت: "داپیـرە لـە هـیچ شـوێنێک ئـۆقرەی نەدەگرت. چاوە گەرمەکانی پڕی بوونە ئەو تۆپەی کە بەزیکزاک، لەنێو سـینییە بزۆزەکـەدا، دەجـوڵا و کـاتێ کـە سەرپەرشـتیاری گەمەکـە، ژمـارە سـی و شەشی لە جیاتی ژمارە سـفر، کـە ئـەم چاوەڕوانی بـوو، ڕاگەیانـد، تـا تـوانی مشتێکی بەمێزەکـەدا کێشـا." بابولنکـا، دەسـتێکی زۆر باشـی بـردەوە، بـەڵام یەکسـەر دۆڕانێکـی گـەورەی بـەدوودا هـات، هەرچییـەکی بردبـووەوە، هـەر هـەمووی بـەجارێ دۆڕانـد، بـە تـەواوەتی لات بـوو و بـە نائومێـدی شـاری بەجێهێشت.

لەم ڕۆمانـە، سـەرقە سـەرقە و بەپەلـە نووسـراو و پڕ ڕووداوەدا خوێنـەر، کـە دەیخوێنێتـەوە، یەکسـەر هەسـتدەکات بەپەلـە نووسـراوە و زانیـاری تـەواوی لەمەڕ عەشق و قیانی تایبەتی دۆستویفسکی سـەبارەت بـە قومـار و پـولین، بەدەستدەکەوێت. کاتێ خوێنەر لاپـەڕەکانی قوماربـاز هەڵدەداتـەوە، لـەتۆ وایـە وەڵامـی نووسـینەکانی پـولین لـە بیرەوەریەکانیـدا، دەخوێنێتـەوە. هـەمان هاماجی پڕ جۆشی ڕۆمانتیکیانـە و ئاشـقانەی لـە دامرکانـەوە نـەهانگ و پاراو نەبوو، هەمان گۆڕانی سات بەساتی گـەرم و گـوڕ، بـەدی دەکرێـت. قارەمـانی ڕۆمانەکە بە ماشوقەکەی دەڵێت: "من لە حزووری تۆدا، هـەرچـی کەرامـەت و عیزەتی نەفسم هەیە لە دەستی دەدەم." هەڵبەتە دۆستویفسـکی چەنـدین جار هەمان ڕستەی بۆ پولین دووبارە کربووەوە.

دوستویفسکی، لە ڕۆمـانی قوماربـازدا دەڵێـت: "مـن ئـەوم لـە هـەمێز گـرت. دەسـت و لاقـیم مـاچ کـرد، لەبەردەمیـدا کەوتمـە سـەر چـۆک." پـولین، لەیادەوەرییـەکانی خۆیـدا دەڵێـت: "خـۆی بەسـەر پێمـدا دا، لـەکاتێکا باوەشـی بەلاقمـدا کردبـوو و دەیگوشـی، بـەدەنگی بـەرز دەگریـا، هـاواری دەکـرد: تـۆم لەدەست دا، بەڵێ پێشبینی و وێنای ئەوەم دەکرد."

زۆرشتی دیکـەی لـەو بابەتـە هـەن کـە دەشـێت بـە نموونـە بـۆ بـەراوردکردن بهێنرێنەوە. بەڵام حەزی دوستویفسکی لە ڕۆڵێت، بـە شـێوازێکی زۆر سـەرنج ڕاکێش باس و شرۆڤە کراوە: "دەتگـوت، دەمـەوێ بـەگژ چارەنووسـدا بچمـەوە، سووکایەتی پێبکەم، گاڵتەی پێبکەم، زمانی لێ دەربێنم." ڕۆڵێـت، ڕێگـەی دەدا بە گژ قەدەردا بچێت و ڕیسک بکات، وەکو چۆن قەدەر گەمەی بە چارەنووسـی ئەو دەکرد. بەهۆی ڕوڵێتەوە، لە دیوارەکە ئـاودیو دەبێـت و دەچێتـە قەڵـەمڕەوی دەرێی لوژیکەوە. قەڵمڕەوێک کە ئەگەری ڕوودانی هـەر بۆیـەرێکی تێـدا هەیـە. ئەگەری هەر ڕێکەوتێکی تێدا هەیـە. ئیـدی لێـرەدا هاوکێشـەی "دووجـاران دوو دەکاتە چوار" هیچ مانایەکی نامێنێ. لێرەدا هـەموو شـتێک بەنـدە بـە بـەخت و یەغباڵەوە، لە قوماردا، هیچ ئەگـەرێکی لـوژیکی، مانـای نـامێنێ، لـە قومـاردا، هیچ شتێک پەیوەسـت نییـە بـە شـتێکی دیکـەوە. لـە دنیـای فیزیاییـدا، قومـار یەکەمین جەڕباندنی ئازادیە.

سەرەنجام لە ١٨٦٦/١٠/٣٠دا، دوای بیست و پێنج ڕۆژ کارو کۆششی جدی و سەرکەوتوو، ڕۆمانی قومارباز، ئامادەبوو بۆ چاپ. دوستویفسکی ڕۆژی ١/نۆڤەمبەر دەچێت بۆ لای ستیلوفسکی، تا دەستنووسی ڕۆمانەکەی وێبدات. بەڵام وەشانکاری حیلەباز، پێشبینی هەموو شتێکی کردبوو، بە سەفەر چوو بوو بۆ لادێ، دەست وپێوەند و ئاشناکانی نەیاندەزانی کەی دەگەڕێتەوە. لەوەشانخانەکە، سەرۆکی بەشی خزمەتگوزاری چاپخانەکە، بەو بیانووەی کە هیچ دەستوورێکی لەو بارەیەوە پێنەدراوە، دەستنووسەکە لە دوستویفسکی وەرناگرێت. ئیدی دوستویفسکی بیر لەوە دەکاتەوە کە بڕوات بۆ پولیسخانەی ناوچەکە و، ڕۆمانەکەی بە فەرمی لەوێندەر دابنێت و وەسڵێکی مۆرکراو و بەرواردار وەربگرێت. ئیدی فێڵ و نێرەنگەکەی کابرای وەشانکار سەری نەگرت. دەستەکەی کەوتەڕوو. کارەکە لە کات و وەختدا تەواو بوو، بەڵام وێڕای ئەوەش دوستویفسکی وەکو پێویست ئاسوودە و ڕازی نەبوو. خووی بەم کیژەوە گرتبوو کە هەموو ڕۆژێ دەهات بۆ ماڵەکەی، بە جۆش و خرۆشێکی گەنجانەوە باسی قارەمانانی ڕۆمانەکەی خۆی بۆ دەکرد. کارکردنی دەگەڵ ئەم کیژەدا بەلاوە ئاسان و خۆش بوو. نووسەر، دەیتوانی لە نزیکی ئەم کیژە، باش بیربکاتەوە، باش قسە بکات، باش بژی. ئێستا کە کتێبەکە تەواو بوو و دەبوایە کیژێ چیتر هاتوچۆی نەکات، ئەمەی زۆر لەبەرگران بوو. دوستویفسکی چوو بۆ لای دایکی کیژێ و پێشنیازی کرد کە کچەکەی ئیزن بدات، تا لە نووسینەوەی دوا فەسڵەکانی ڕۆمانی "تاوان و سزا"شدا یارمەتی بدات و هاوکاری بکات. ئانا، بێچەند و چوون قایل بوو، ئیدی لە ٨/نۆڤەمبەرەوە، دووبارە دەستی بە کار کردن دەگەڵ نووسەردا کردەوە. دۆستویفسکی بە حەماس و هەڵچوونێکی نائاساییەوە پێشوازی کرد. ڕەنگی تەواو هەڵبزڕکا بوو، زۆر شپرزە بوو، چمکێکی تەنوورەکەی ئانای گرت و بردی، قەنەفەیەکی نیشاندا و خولکی کرد کە دانیشێت. کیژێ دانیشت. نووسەر کەوتە تەمەشاکردنی ئەو ڕوخسارە ناسک و بێگەردەی، کە هێشتا چەرخی ڕۆژگار کاری تێنەکرد بوو، ئەو ڕوخسارەی، شادی و سەرکەوتنی لێدەباری. چەند ناسک و گەنجە، چەندی خۆشدەوێ، بەڵام چۆن بتوانێ ئەشق و ڤیانی خۆی بۆ دەرببڕێت. تەمەنی ئەم دوو هێندەی تەمەنی کیژێیە. کابرایەکە نەخۆش، هەژار و دەستکورت، تا بیناقاقای لە قەرزدایە. هەمان ئەو دوو دڵی و وازوازییەی کە لەهەنبەر "ئانا کورڤین – کروفسکایا" تووشی بوو بوو، لە هەنبەر ئەم ئانایەش تووشی بوو. دەترسا، کیژێ وەڵامی نەرێنی بداتەوە، داواکەی قەبووڵ نەکات، پێی دەڵێت: "گوێ بگرە، من بیرم لە ڕۆمانێکی تازە کردووەتەوە. بەڵام کۆتاییەکەی زۆر زەحمەتە، چونکە پەیوەندی بە باری دەروونی و سایکولوژی کیژێکی گەنجەوە هەیە. ئەگەر لە مۆسکۆ بام، پەنام دەبردە بەر سۆنیای برازام و لەو بارەیەوە هەندێ پرسیارم لێدەکرد، بەڵام ئەمڕۆ ناچارم، تکا لەتۆ بکەم کە لەو بارەیەوە یارمەتیم بدەیت و ڕاوبۆچوونانی خۆتم پێ بڵێی..."

هەنگێ نووسەر، چیرۆک و سەربووری کابرایەکی نیگارکێش بەمجۆرە بۆ کیژێ دەگێڕێتەوە: "کابرایەکی نیکارکێش، گەنج نییە، بەکورتیەکەی پیاوێکە لە تەمەنی مندا.. ئەم نیگارکێشە ژیانێکی دژوار و ناخۆشی هەیە، بابی نەماوە، ژنەکەی مردووە، لە کەس و کار دابڕاوە. خوشکەکەی، کە زۆری خۆش دەویست، مردووە، ئیدی هەر خۆیەتی، کلۆڵ و خەمبار بەتاقی تەنیایە. بەڵام وێڕای هەموو ئەمەش، تینوی ژیانێکی تازە و پڕ شادیە. ڕێک لەم کات و ساتەی ژیانیدا، تووشی کیژێکی گەنجی جوان و ناسک، زیرەک و هۆشمەند و هەستیار دەبێت: "تۆ پێت وایە ئەم کیژە دەتوانێ ڕاستگۆیانە و لە دڵەوە ئەم پیاوەی خۆش بوێت؟... تۆ خۆت لە جێگای ئەو کیژە دابنە و بۆ یەک دەقیقە وا وێنا بکە کە ئەم نیگارکێشە منم، ئەشق و ڤیانی خۆمت بۆ دەردەبڕم. داوات لێدەکەم مێردم پێبکەیت، چ وەڵامێک دەدەیتەوە؟" دوای ئەو قسانە، لەکاتێکا لەو پرکێشیەی خۆی بێزار و پەست بوو، لەجێی خۆیدا وەستا. دەبیرەوە چوو. ئایا بەو قسانە، دۆستایەتیەکی تازە و شیرین و خۆشی لەکیس خۆی نەداوە؟ ئایا بەو قسانەی خۆی ئەم کیژە گەنجە سادەیەی، کە ئاگای لەهیچ نەبووە، زویر نەکردووە؟ بەڵام ئانا گریگوریڤنا، کە بە ئارامییەکی شادی ئامێزەوە، تەمەشای ئەوی دەکرد، بەوپەڕی سادەیی دەڵێت: "وەڵامم ئەمە دەبێ، کە خۆشم دەوێی و تا بمێنم و لە ژیاندابم هەر خۆشم دەوێی."...

خانەوادەکەی میشێل کە دوستویفسکی مەسرەفی دەکێشان و، پول ئیسسراییف، کوری ژنە مردووەکەی، هەست دەکەن، ژن هێنانی دوستویفسکی، بەرژەوەندییان دەخاتە مەترسییەوە. هەوڵدەدەن لەو بڕیارەی، ژێوان بکەنەوە، دەیانگوت بۆ پیاوێکی بەتەمەنی وەکو ئەو نەک هەر ناشیرینە، بگرە شەرم و شورەییشە، زەماوەند دەگەڵ کیژێکی وا گەنجدا بکات. دیارە ئەم قسە و گازاندانە، نووسەریان ئەزیەت دەدا، چونکە دەقاو دەق، دەگەڵ ئەو گومان و ترس و دوودڵیانەدا یەکی دەگرتەوە، کە بەویژدانی ئەودا دەهاتن. ئانا، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا لەو بارەیەوە دەنووسێت: "گەنجیەتی و منداڵکاری من مایەی نیگەرانی و دوو دڵی ئاشکرای ئەو بوو." پاشان دوستویفسکی بۆ پولین سوسلوڤا دەنووسێت: "بۆم دەرکەوت کە سکرتێرەکەم، ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە خۆشی دەوێم، ئەگەرچی هەرگیز ئەمەی دەرنەبڕی بوو. ڕۆژ بە ڕۆژ لەبەرچاو خۆشەویست تر دەبوو. جا چونکە لە مردنی براکەم بەدواوە، ژیانم زۆر قورس و دژوار بوو بوو، هەستم بە بێتاقەتی دەکرد، پێشنیازم کرد کە مێردم پێبکات و ئەویش قاپیل بوو... بەڵام جیاوازی و فەرقی تەمەنمان زۆرە، ئەو تەمەنی بیست ساڵانە و من چل و چوار، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ، پتر ئەو قەناعەتەم لا دروست دەبێ کە بەختەوەر دەبێت، چونکە خاوەنی دڵێکی باش و سۆزێکی گەرم و گورە و خۆشەویستی دەفامێ."

ئەم نامەیە بۆ ئەو "دۆستە هەمیشەییە" خۆی لەخۆیدا نیشانەی شەرم و دوو دڵی و نیگەرانیەکی ئاشکرایە. ئیدی ئەم ژیانە ئاسان و خۆشە، ئەم ئارامییەو، تەمەنی بچووکی ئەم کۆرپە کیژە... هەر هەمووی دوستویفسکییان

نیگەران و بێتاقەت دەکرد، وەکو یەکێک بیەوێ کارێکی دزێو بکات و شەرمی بەخۆی بێت. پاشان، دوای ئەوەی بەلەمەکە لەنگەری گرت و لەنگەرگاکە دواخرا، ئاخۆ لەوە ژێوان نابێتەوە کە بۆچی خۆی دایە دەم دەریاو گەرداوانەوە؟ ئەدی چی بەو خەڵک و خوایەی دەوروبەری بڵێت، کە لە پاش ملە، گاڵتەی پێدەکەن، پێی پێدەکەنن، بە پیری ئاخر شەڕو شێتی ناو دەبەن، بە کابرایەکی سادی لەقەڵەم دەدەن. بەهەرحاڵ گوێ بەهیچ نادات! لە بەرواری ١٨٦٧/٢/١٥دا، سەعات حەوتی ئێوارێ، لە کڵێسای ترینیتەدا، ئانا گریگوریڤنا لە فیدور میخائیلوفیچ دوستویفسکی مارە دەبڕدرێ. فیدور میخائیلوفیچ، لە یەکەمین نامەیدا، بە بۆنەی ساڵیادی لەدایکبوونی ئاناوە، دەڵێت: "تۆ هەموو شتێکی منی لە ئایندەدا، تۆ ئومێد و ئیمانی منی. تۆ بەختەوەری و هەموو شتێکی منی." دەزگیرانە گەنجەکەی، بەو قسانە نیگەران دەبێت، ئایا دەتوانێ لە ئاستی بەرپرسیاریەتیدا بێت و ئاواتەکانی ئەم پیاوە بێنێتەدی؟ ئایا، لەو ئاستەدایە، باری ئەم مەسئولیەتە بیات کە لەناکاوا شانی دایە بەری؟ ئافرەتێکی بەئەمەک و دڵسۆز و ئاقڵ، بووە قوربانی، هەڵبەتە بەحوسن و ڕەزای خۆی. ئەم کچە لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە، لەلای خۆیەوە بڕیاری دابوو، بە ڕێزەوە مامەڵە دەگەڵ مێردی ئایندەیدا بکات و بەچاوی ڕێز و حورمەتەوە تەمەشای بکات ئێستاش، بەهەمان نەفەسەوە بەرخوردی دەگەڵ مێردەکەیدا دەکرد، ئەوپەڕی هەوڵیدەدا کە بەختەوەری بکات، هەڵبەتە بێئەوەی وەکو پێویست لێی تێبگات.

ئانا، وێنەیەکی سادە و دڵگیری سەبارەت بە دوستویفسکی لەبەرچاوی خۆی بەرجەستە کردبوو. کچی ماڵباتێکی وردە بورژوا بوو و بەهەمان چاوەوە دەیڕوانیە دوستویفسکی. کچێک بوو، سادە و ساکار، نەک هەر محافەزەکار، بگرە هەندێ ساویلکە و پاشکەوتووش بوو. وەکو سەرگەڤارێکی بوێر و بە شەهامەتی خانەوادە، بەدەر لە هەر عەیب و عارو کەموکورییەک، دوور لەهەر غەریزەیەکی نزم، وەکو کەسێکی بەڕێز و شایستەی هەر قەدرزانی و خۆشەویستیەک تەمەشای دوستویفسکی دەکرد. پیاوێکی سادە و باش، لەنێو ئەم هەموو خەڵکە شەڕانی و حیلە بازانە. نیگارێکی دەسکاری رامبرانتی هێنابوو و بۆ خۆی بەکەیفی دڵی خۆی ڕازاندبوویەوە، بوونەوەرێکی سەرکێش و ئاڵۆزی هێنابوو و کردبووی بە قارەمانی کومیدیایەکی منداڵانە، بۆ منداڵانی چەتوون.

نەخێر، ئانا، هەرچەندە لە قوتابخانە خەڵاتی میداڵی زێڕی وەرگرتبوو، بەڵام زیرەک و ئەهلی کتێب و خوینەواری نەبوو. بەڵام لەڕووی ماڵداری و کاروباری ژیانی پراکتیکییەوە، کارامە بوو. دەتگوت بە سکرتێری لەدایک بووە، خوا بۆ ئەو کارەی دانا بوو. یەکێک لە دۆستەکانی دەربارەی ئەو دەیگوت: "ئەگەر شووی بە دەستویفسکی نەکردبا، سەڕافخانەیەکی بەهەمان ڕێباز و شێوازی نیوسکای دەکردەوە."

ئانا، لەو دلبەرە، بەناز و، بەکەشم ونەشمانە نەبوو، کە قەیران و کێشەی ئاشقێنی بۆ دوستویفسکی دروست بکات. لەو ژنە بەڵایانە نەبوو، کە ئەم

نووسەرە بێنێتە گیراودارو لە زەواقی بنات، بەکورتییەکەی ئەم کیژە زەخیرەو دەسکەوتێکی هونەری دەوڵەمەند نەبوو. بە هاندەر وپاڵنەری هونەری نەدەهاتە حیسابکردن، گەنجینەی یاداشتەکانی نووسەری دەوڵەمەندتر نەدەکرد، بەڵام خانمێکی ماڵداری کەری ئایدیالی و سکرتێرێکی کارامە و لێهاتوو بوو.

ئانا خانمێك بوو، ورد، بەقەناعەت، ئاپرومەند، هەموو شتێکی بە حیساب و کیتاب بوو. لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا تەنانەت نرخی فینجانە قاوەیەک، یا شیرینییەکیشی دەنووسی. بەگرێبەستەکانی مێردەکەیدا دەگەڵ وەشانکارەکاندا دەچووەوەو سەرپەرشتی دەکردن. چاودێری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری مێردەکەی دەکرد، نەیدەهێشت، خاوەن قەرزان زەفەری لێبێنن، قەرزەکانی دەدانەوە. دەستنووسەکانی مێردەکەی پاکنووس دەکردەوە، ڕێکی دەخستن. وەکو چۆن کەیبانۆیەک، ناو مووبەقەکەی خۆی ڕێکدەخات و پێی ڕادەگات، بەو ئاوایە بەهەر پێویستیەکی مێردە بلیمەتەکەی ڕادەگەیی. لەو ژنانە بوو کە "دەبێ هەر شتێکی سنووری دەسەڵاتی خۆ بەجوانی ڕیک بخەن و کۆنتڕۆڵ بکەن."

دەشێت بگوترێ، ئانا، ژیانی دوستویفسکی لە هەر گەردو تۆزێک پاک کردەوە. ئانا لەپاڵ ئەم پیاوە مەزنەدا فریشتەی ئیلهام و سەرۆ نەبوو، بەڵکو بەخوشکێکی ئازیز و چاکەکار دەژمێردرا، ڕەبەنتیتەیەکی دڵسۆز و میهرەبان بوو. "دوستویفسکی"ش پێویستی بە ڕەبەنیتەیەکی دڵسۆز و میهرەبان بوو تا بە فریشتەیەکی ئیلهام بەخش. بەڵام ئانا، لە سەرەتاکانی شووکردنەکەیەوە، تووشی گێرەو کێشەی زۆر بوو. خوشک و براژن و براو برازاکانی دۆستویفسکی، بەتایبەتی زڕکوڕەکەی، پول ئیساییف، کە گەنجێکی بەدنیهاد و تەمەڵ و تەوەزەل و چەقاوەسوو بوو، هەموو ئەمانە کە بەهۆی ژن هێنانەوەی دوستویفسکی یەوە خۆیان بە زەرەرمەند دەزانی، بەتوندی هێرشیان دەکردە سەر ئەم ژنە تازەیەو بە غەوارە و بێگانەیان دەزانی و زۆر بەساردی ڕەفتاریان دەگەڵ دەکرد. پول ئیساییف، کە لە ماڵی دوستویفسکیدا دەژیا، خزمەتکارەکانی هاندەدا کە بەگوێی ئانا نەکەن و تەنانەت خزمەتکارەکانی هاندەدا کە شەکر و قەندی لێ بدزن، ئەو کرێمەی کە بۆ قاوە دانرا بوو، بەدزییەوە بخۆن. هەنگێ شانەکانی هەڵدەتەکاند و دەیگوت: "دەبینی باوکە، کاتێ کە من کارەکانم بەڕێوە دەبرد، ماڵەکە وەکو سەعاتی میقاتکراو بەڕێوە دەچوو." ئەم کوڕە هەمیشە لای دوستویفسکی بە درۆوە گلەیی لە ئانا دەکرد کە گوایە سووکایەتی پێدەکات و حیسابی ئەوەی بۆ ناکات کە کوڕی دوستویفسکییە. دوستویفسکی، بەڕێزەوە، گلەیی لە ئانا گریگوریفنا دەکرد و دەیگوت: "ئانیت، ئەوەندە سەر مەکە سەر پول، سووکایەتی پێمەکە، پول کوڕیکی باشە."

شەڕو ئاژاوەی ناوخۆیان ڕۆژ بەڕۆژ زیاد دەکات، دوستویفسکی ئەمەی لەبەر گران دەبێ، تەندروستی تێکدەچێ، ئیدی ناو بەناو نۆرە فێی زۆر توندی لێدەهات. ئانا، لەو بارەیەوە دەنوسێت: "من شانی فیدۆرم گرت، بە هەموو

هێز و توانای خۆمەوە، ئەوسا توانیم لەسەر تەختەکە دای بنەم، بەڵام زۆرم پێ سەیر بوو، کاتێ کە من توانای ئەوەم نەما بیگرم، جەستەی بێ هەست و سارد و سڕی ئەو کەوتە سەر ئەرزەکە، ناچار بووم ئەو مێزەی کە چرایەکی داگیرساوی بەسەرەوە بوو، پاڵبنەم، بیدەمە لاوەو جێگا بۆ فیدور بکەمەوە بە ئیسراحەت لەسەر ئەرزە تەختە پۆشەکە ڕابکشێت. هەنگێ لە لایەوە دانیشتم و بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە دەلەرزی و هەڵدەپلا، سەریم نایە سەر ڕانم.. لی مخابن، دوای ماوەیەکی زۆر کەم. خەمێکی تازە بەرۆکی گرتم، نۆرە فێیەکی توندتر لەهی یەکەم، گرتی، دوو دانە سەعاتی پێوە بوو تا بەدەم هاوارەوە بەئاستەم وەخۆهاتەوەو منی ناسییەوە. بەڕاستی دیمەنێکی ترسناک بوو، زۆرم خەفەت بۆ خوارد!"

دوستویفسکی، لەو بارەیەوە، بۆ مایيکوف دەنووسێت: "هیچ شتێک لەوە ناخۆشتر نییە، کە ئینسان هەست بە لەرزین و شڵەقانی ئەعساب و مێشکی خۆی بکات، بەڕاستی تەحەموول ناکرێت. خەریکە ئەقڵ و هۆشی خۆم لەدەست دەدەم، توانای بیرکردنەوەم نامێنێ."

پزیشکان، ئامۆژگاریان کرد کە سەفەرێکی هەندەران بکات، ئانا، ئەم بیرۆکەیەی بەدڵ بوو، هەر نەبێ ماوەیەک لەم ژینگە نالەبارە خانەوادەییە دوور دەکەوێتەوە. "دوستویفسکی"ش ئەم بیرۆکەیەی بەدڵ بوو. جۆرە هەڵاتنێکی ماقووڵ بوو لەم ژینگە جەنجاڵ و پڕ ئاژاوەیە، بەتایبەتی کە خاوەن قەرزان، تەنگیان پێ هەڵچنی بوو و داوای قەرزەکانیان دەکردەوە.

بەڵام هەرکە بڕیاری سەفەرەکەی بە خانەوادەکە ڕاگەیاند، هەر هەموویان ناڕازی بوون. باشە قەراری نەدابوو کە ڤێلایەک بەکرێ بگرێت و هاوین هەموو خانەوادەکە، بۆ ئیسراحەت و پشوو، بۆ ئەوێندەر بەرێت. ئەگەر لەم قەرارە ژێوان بېێتەوە ئەوا دەبێ قەرەبوویان بکاتەوە وئەوەندەیان پارە بداتێ، کە لەماوەی سەفەرەکەی ئەودا پێی بژین. ئیدی هەر کەسەو بڕی پێویستیەکانی خۆی دیاری دەکات، تێکڕای پارەکە دەکاتە هەزار و سەد ڕۆبڵ.

بەڵام، ئایەو مایەی دوستویفسکی تەنیا هەزار ڕۆبڵ دەبێ. بە ژنەکەی دەڵێت: "ئانێتی ئازیز، دەبینی چارەنووس چ دژایەتیەکمان دەکات. ئەگەر هاوین بچینە سەفەری هەندەران، بەلای کەمەوە دوو هەزار ڕۆبڵمان دەوێ، حاڵی حازر تەنیا نیوەی ئەو بڕە پارەیەمان هەیە. خۆ ئەگەر لە ڕووسیادا بمێنینەوە، ئەوا دەتوانین، بەشێنەیی و بە دڵنیاییەوە، ماوەی دوو مانگێک بەو پارەیە بژین."

لەم سەروبەندەدا، هەندێجار خودان قەرزان دەهاتنە سەری و هەڕەشەی زندانی کردنیان لێدەکرد. بەخۆی لەمبارەیەوە دەنووسێت: "ڕەنگە زندانی کردنی من لەسەر قەرزان، لە هەندێ ڕووەوە زۆر باش بوایە. چونکە دەمتوانی لە زنداندا کەرەستەو بابەتی پێویست، لە ڕووداوە واقیعییەکانی ژیانەوە بۆ نووسینی ڕۆمانێکی وەکو یادگارییەکانی خانەی مردووان هەڵێنجم و فەراهەم بکەم. دەرامەتی ئەو کتێبە بەلای کەمەوە دەگەییە چوار پێنج هەزار ڕۆبڵ.

بەڵام من تازە ژنم هێنا بوو، ئاخۆ دەمتوانی لە خانەی تاراسوف دا (زندانی قەرزاران) تەحەموولی گەرمای هاوین بکەم."

ئیدی ئانا، بەڕێنوێنی دایکی، پێشنیاز بۆ دوستویفسکی دەکات، هەرچی کەل و پەل و جیازی خۆی هەیە، بۆ دابینکردنی خەرجی سەفەرەکەیان بخەنە بارمتەو ڕەهنەوە. ئانا حەز دەکات هەرچی کەل و پەل و جیازی خۆی هەیە لەناوی ببات و، لەم شەڕە خانەوادەییە بێئاکامە ڕزگار بێت. ئەمە جگە لەوەی، ئەگەری ئەوە هەبوو، خاوەن قەرزان، لە هەر ئان و ساتێکدا بەگرتنی بدەن و بیخەنە زندانەوە. ئیدی هیچ چارێکیان نەبوو. دوستویفسکی بە نەبەدڵی، یەکەمین فیداکاری ژنەکەی قەبووڵ دەکات و مل بۆ ئەو واقیعە دەدات.

لە ١٢/٤دا، دەڵاڵان دێن بۆ ماڵیان، نرخی کەلوپەل و جیازیەکەی ئانا دەقەبڵێنن و لە ١٤/٤دا، سەعات پێنجی دوانیوەڕۆ، ژن و مێرد، لەشار وەدەردەکەون و دوای چوار دانە ساڵ، ئەوسا بۆ ئەم شارە دەگەڕێنەوە.

## فەسڵی هەشتەم
## دۆستویفسکی و گەمەی ڕۆڵێت.

دوستویفسکی دەڵێت: "بەتەنیا بووم، بێ پارەو پول، ئافرەتێکی گەنجم لەگەڵدا بوو، کە شادو دڵخۆش، بەخوایشتی خۆی، بەگەڵم کەوتبوو تا سەفەری هەندەران بکات. بەڵام هەستم دەکرد ئەم خۆشی و شادیەی زادەی سادە دڵی و بێ ئەزموونی بوو، ئەمەم زۆر لەبەر گران و ناخۆش بوو، ئەزیەتی دەدام، زۆر نیگەران بووم، خەمی ئەوەم بوو نەبا ئەم ژنە گەنجە لەگەڵ مندا هەست بە بێتاقەتی و بێزاری بکات."

جووتە ژن و مێرد، لە سا پتروسبۆرگەوە بەرەو بەرلین بە ڕێکەوتن. بەشاری ڤیلنادا بورین. بەڵام بەرلین، وەکو شارێکی چۆڵ و هۆڵ، ساردوسڕ، تاقەتبەر هاتە بەر چاو دوستویفسکی. تەنیا چل و هەشت سەعاتێک لەم شارەدا مانەوە و بەلەز بەرەو شاری دریسدن ڕۆیشتن. دەنووسێت: "ئەم ئەڵمانیە خەمبارو گرژ و مۆن و پەستانە، بەتەواوەتی بێزاریان کردم." هەرکە گەیینە دریسد، دوستویفسکی شوقەیەکی سێ ژووری بەکرێ گرت و بەلەز شەپقەیەکی حەسیری سپی ئیتاڵی بۆ ژنەکەی کڕی، شەپقەکە بە نەواری ڕەش و لە شێوەی نەخشدا لێی نووسرا بوو "دوای من بکەوە." ئانا، لەو بارەیەوە، لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی: "ئەوەی بەلامەوە سەیربوو، مێردەکەم لە مامەڵە و کڕینی ئەو جۆرە شتانە بێتاقەت و بێزار نەدەبوو." دوستویفسکی، هەر زوو، بەرنامەیەکی جێگیری بۆ گوزەراندنی کاتەکەیان دانا. ئیدی بەگوێرەی ئەم بەرنامەیە بەشەوان کاری نووسینی دەکرد. بە ڕۆژەوە سەعات یازدە لەخەو ڕادەبوو، شتێکی سووکی دەخوارد. لە سەعات دوی دوانیوەڕۆدا دەگەڵ ژنەکەیدا دەچوون بۆ گالێری تابلۆیانی هونەری. ئیدی لەوێ تابلۆی "مادونای" ڕوفائیل و تابلۆی "مەسیح و پارچە دراو"ی تیتان، و تابلۆی "شکار"ی هونەرمەند ڕویسدائیلی بۆ ژنەکەی شەرح و شرۆڤە دەکرد.

سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، ژن و مێرد، پێکەوە لە خوارنگەیەکدا فراڤینیان دەخوارد و پاشماوەی ڕۆژەکەیان لە پارکێکی گەورەدا دەقەتاند و لەوێندەر گوێیان لە ئاواز و موزیکی سوکی، یەکێک لە تیپە موزیکیەکان دەگرت.

ئانا، دەنووسێت: "فیدور، ڕۆشنبیرییەکی موزیکی باشی هەبوو، بتهوڤن، مندیلیسون و ڕوسینی زۆر خۆش دەویستن و زۆری حورمەت دەگرتن، بەڵام حەزی لە موزارت نەدەکرد."

سەعات نۆی شەو، دوستویفسکی و ژنەکەی بۆ چا خواردنەوە، دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکەی خۆیان دۆستویفسکی بەرلەوەی دەست بەکاری نووسین بکات، عادەتی وابوو تاوێک کتێبی دەخوێندەوە. ئاناش، دەفتەرێکی چکۆلەی دەردێنا و تێبینی و سەرنجە ڕۆژانەکانی خۆی بەهێماو ڕەمزێن ئیختیزالی دەنووسییەوە. ئەم دەفتەرە هەموو شتێکی تیا بوو: یاداشتی سادە و جوان و عاتیفیانەی کیژێکی گەنج، جۆری ژەمە خواردنەکان، پارەی هێلکە و، خواردنی دی، دەقی گوت و بێژو دەمەتەقێیەکانی خۆیان، تووڕەبوونەکانی فیدیای ئازیز، باسی سەرو ڕوخساری هەندێ لە میوانانی خوارنگەکە و چۆنیەتی دانیشتن

و خواردن و خواردنەوەیان ئەوەی سەیر بوو، لەو ماوەیەدا کە دوستویفسکی خەریکی نووسینی ڕۆمانی گەمژە بوو، ژنەکەی، هاوڕێکەی، هاو دەمەکەی، مەحرەمی ڕازەکانی، ئەم جۆرە سەرنجانەی لە دەفتەرە چکۆلەکەیدا تۆمار دەکرد: "زوو لە خەو ڕابووم، هەستام، دەستم بە خۆشۆردن کرد، تەقو هۆڕی من، فیدیای لەخەو هەستاند، بەڵام لێم زویر نەبوو." یا دەینووسی: "دوێنێش، کە فیدیا شانەکەی خۆی دامێ، داوای لێکردم ئاگام لێی بێ.. بەڵام قژی من زۆر پڕ بوو و ئاڵۆزکابوو، ئیدی سێ دانی شانەکە شکا. دەستم بەگریان کرد، ئیدی لێبڕام پڕۆمە دەرێ، شانەکە لەگەڵ خۆمدا بەرم و تا شەوێ لە بازاڕا بسوڕێمەوە..." دیارە لەم یاداشتانەی ئانادا، هیچ ئاماژەیەک بۆ لەدایکبوونی بەرهەمێکی تازە، نییە.

ئانا، لە دەرێی، تاقیگەکەی دوستویفسکی، حەسارێکی لە دەوری خۆی کێشاوە و بۆ خۆی لەو حەسارەدا دەژی. ئانا دوستویفسکی خۆش دەویست، بێئەوەی لە هونەری نووسینی ئەو تێبگات. باشە ئەمە ژنی بابایەکی بەقاڵە، کە لەیاداشتەکانیدا هیچ قسەیەک یا ئاماژەیەک دەربارەی کارە ئەدەبییەکانی نییە؟ هەندێجار دوستویفسکی بە ئانای دەگوت: "ئانیتی ئازیز، من ئامادەم دیارییەکی جوانت بۆ بکڕم، بەو مەرجەی پێم بڵێی بەو خەتە خوار و خێچە، چیت لەو دەفتەری بیرەوەریانەدا نووسیوە؟" ژارۆ، ئەگەر دەیزانێ مێردەکەی چی نووسیوە!

دەوروبەری نیوەشەو، فیدرو میخائیلوفیچ دەهات، بەر لەوەی بچێتە سەر کاری نووسین، ژنەکەی لە هەمێز دەگرت، ڕایدەمووسی، لەکەنار تەختەکەیدا ڕۆدەنیشت، ئەم شەو دیدارانە پاداشتی ژنە گەنجەکەی بوو، ئانا، لەم بارەیەوە دەنووسێت: "ئەم دیدارانە بریتی بوون لە دەردە دڵی تایبەتی دوورو درێژ، هەندێ قسەی خۆشی ئاشقانە و دەست لەملانێ و ڕامووسان و نەوازشان و پێکەنین." سەرەنجام کیژەی میهرەبان و سادە دڵی بەتەنیا جێدەهێڵا و دەچو بۆ ژووری کارەکەی خۆی، کە دەستنووسی ڕۆمانەکەی ئایندەی لەوێندەر چاوەڕوانی دەکرد.

دوستویفسکی بۆیە لە ڕووسیا هەڵاتبوو تا بتوانێ کار بکات، بەڵام کارەکەی وەکو پێویست نەدەچووە پیشێ. ئەم تاراوگە دڵخوازە، کە لەسەرەتاوە لە گیانی خۆش بوو، هەنووکە ئازاری دەدا. لەمبارەیەوە، لە نامەیەکدا بۆ مایکوف دەنووسێت: "ڕووسیا، بۆ من زۆر پێویستە. ناتوانم دەستبەرداری بم، بۆ کارێن ئەدەبی من زۆر پێویستە... لە دووری ڕووسیا، وەکو ماسییەک لە ئاوی دەرێنن، هێز و شنگم لەبەر دەپڕێت، لەپەلو پۆ دەکەوم و هیچ ئیشێکم لەبەر ناڕوات..."

بۆچی هاتووە بۆ دریسد؟ پارە لەکوێ بێنێ تا بۆ سانپتروسبۆرگ بگەڕێتەوە؟ تەنیا یەک ئومێدی هەیە: ئەویش یاری ڕۆڵێتە. بەڵام زات ناکات ئەم بابەتە لای ژنەکەی باس بکات. بەڵام مجێزی تێک دەچێت، ئیدی شەڕ دەفرۆشێت، توورە دەبێ. نەفرەت لە خۆی و لە ژن هێنان دەکات، نەفرەت لە ئەڵمانیا دەکات.

هەموو شتێکی لەبەرچاو دەکەوێت. نەفرەت لە دیمەنی چیاو چۆڵ و ئەرز و ئاسمان دەکات.
ئانا گریگوریفنا، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئیرادی لە هەموو شتێک دەگرت، بۆچی ڕاڕەو و باخچەکانی شار، شوستە و شەقامەکان هەر هەمووی ڕاستەو ڕاست دروستکراون، بۆچی لێرە حەوز و فوارەیان دروستکردووە، بۆچی ئەمە واو ئەوە وایە؟"
ئەنجام، دوای ئەم هەنجەت وبیانوانە، لێدەپڕێت گریێی دڵی بۆ ئانا بکاتەوە، ئانا بە نەبەدڵی قاییل دەبێت، چونکە دەترسا ئەگەر قاییل نەبێ دەگەڵیدا بەشەڕ بێت یا فێی لێبێت. ژنەی تاین بە نەبەدڵی، بە پێچەوانەی مەیلی دڵ و ئەقڵی خۆی، پێشنیازی مێردەکەی قەبووڵ دەکات. دوستویفسکی بەجۆرێ خولیا و کەڵکەڵەی قوماری دەکەوێتە سەر، کە ژنە گەنجەکەی بە تاقی تەنیا لەو شارە بێگانەیەدا، لە دریسدا بەتاقی تەنیا بەجێدێڵێت و بەخۆی دەڕوات بۆ هامبۆرگ. ئانا، دەنووسێت: "قەرارە ئەگەر براوە بوو، بێت بە دووما تا پێکەوە بڕۆین بۆ هامبورگ و لەوێندەر بژین، خۆزگە وا دەبوو، چەند خۆش دەبووا کێ دەزانێ، ڕەنگە نەچوونی بۆ ئەوێ زۆر باشتر بێ."
ئەنجام لە ٥/١٦دا، سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، لەکاتێکا ژنەکەی بە چاوانی پڕ گریانەوە، تا وێستگا بەڕێی دەکات، بەرەو هامبۆرگ، دەکەوێتەڕێ. لە ڕۆژی ٥/١٧ دا، هەرکە دەگاتە هامبۆرگ، لەوێندەرەوە نامەیەک بۆ ئانا دەنێرێت: "بۆچی ئانیتی ئازیزم بەجێهێشت. من دەزانم کە شایستەی فریشتەیەکی وا میهرەبان نیم. فریشتەیەک وێڕای هەموو جوانی و، پاکیزەیی و، بێگەردی و دڵپاکی خۆی، ئەوپەڕی متمانە و باوەڕی بە من هەیە، خۆیشم نازانم چۆن دڵم هات، چۆن توانیم تۆ بەتەنیا بەجێبێڵم؟ ئاخر بۆ کوێ هاتووم؟ بۆچی هاتووم؟ خودا تۆی بە من داوە، تا لەڕێگەی تۆی بەرزو باڵاوە، تۆی پاک و پاکیزەو، گوناهە گەورەکانم پاک بکەمەوە... کەچی من بە ڕەفتاڕی گەوجانەی خۆم، ڕەفتاری وەکو ئەم سەفەرەم، دڵی تۆ دەڕەنجێنم، ژیانت لێتاڵ دەکەم."
لە ٥/١٨دا لە نامەیەکی دیدا بۆ ئانا دەڵێت: "لە بەیانی ئەمڕۆوە دەستم بەیاری کردووە. لای نیوەڕۆ شازدە لێرم دۆراند بوو. دوای فراڤین گەڕامەوە سەر یاری، بەو ئومێدەی کە تا دەتوانم ئارامتر و ئاقڵانەتر یاری بکەم و ئیدی لە خوا بەزیاد بێ، چەندم دۆراند بوو هەموویم بەدەست هێنایەوە و سەد فلورنی (دراوێکی زیوی هوڵاندییە) زیادەشم بردەوە. دەمتوانی سێ سەد فلورنی زیادەم هەبێ، چونکە زۆرم بردبووەوە، بەڵام تەماح گرتمی و یاریم کردەوە و پێکم لەو سەد فلورنە دۆراند. جا ئانێت گیان، هەنووکە گوێ لە من بگرە بزانە گەییومەتە چ قەناعەت و ئەنجامگیرییەک: ئەگەر ئینسان ئاقڵ بیت، خاوەنی دڵێکی ڕەق، ساردو سڕبێ، لە توانای بەشەر ویارتر و بەحەوسەڵەتر بێ، بێگومان دەتوانێ هەرچییەکی بوێ، بەدەستی بێنێ. بیباتەوە. جا من بە هێزێکی باڵاتر لە تواناو هێزی بەشەر. دەمەوێ، ئاقڵانە بژیم."
بەڵام، بێگومان، ئەم هێزە میتابەشەرییە، پشتی تێدەکات، چونکە بۆ ڕۆژی دوایی نامەیەک بۆ ئانیتی ئازیزی دەنووسێت و دەڵێت: "دوێنێ بۆ من

بەشێوەیەکی گشتی شووم بوو. لە ئیمکاناتی خۆم زیاترم دۆڕاند. فریشـەکەم کەسێک کە ئەعسابێکی وەکو منی هەبێت، نابێت یاری قومار بکات. نزیکەی دە سـەعاتی ڕەبەق یاریم کردووە، کە تەواوە دۆڕابووم، وازم لەیاری هێنا... ئەمڕۆ، دەمەوێ، بەدوا پارەیەک کە پێم ماوە، دوا هەوڵی خۆ بدەم: دوا دڵۆپی ئاو.. وەزعی ئێمە بەڕاستی غەریب و سـەیرە. ئایا هیچ خزم و کەسوکارێکی ئێمە لە سان پترو سبۆرگ، تەسەور دەکات، کە ئێمە حاڵی حازر لە یەکدی دوورین، بەجودایی دەژین و بۆچی جیابووینەتەوە؟

جا بۆ ئەوەی کەمێک هێـور بێتـەوە و هەڵچوونەکـەی دابمرکێتـەوە، دەڕوات بـۆ باخێکی گشتی، خۆی دەکات بە هۆڵێکی گشـتیدا، گـوێ لـە موزیـک دەگرێـت "زۆر لـە مـوزیکی دریسـد باشـتر بـوو" عەزابـی ویـژدان نەخۆشــی خســتبوو، هەوڵیدەدا، قەناعـەت بـەخۆی بێنـێ کـە بۆیـە قومـار دەکـات تـا ئـانیتی ئـازیز و هەموو خانەوادەکەی لە پتروسبۆرگ، لە هـەژاری و دەسـتکورتی ڕزگـار بکـات. بەڵام ناتوانێ لەوەی پتر درۆ دەگەڵ خۆیدا بکات. خـۆی بخەڵـەتێنێ: بەڕاسـتی ئالودەی قومـار بـوو بـوو، حـەزی لێـدەکرد، قومـاری لـە پێنـاوی قومـاردا دەکـرد، لەپێناوی ئەو ساتە پڕ نیگەرانی و تاسـەیەدا دەژیا، کـە تۆپـەکان دەرچـوو بـوون، بـە پێچـا و پـێچ دەخولانـەوە، سـەرنجی خـەڵکیان بـۆ خـۆ ڕادەکێشـا و جۆرەهـا ڕەنگیان دەنواند: ڕەش، سوور، جووت، تاک، برانەوە، دۆڕان... هەموو بوونی بـە سورانەوەو چەرخەلەی ئـەم تۆپانـەوە بەنـد بـوو. خۆشـی و ئـازار، دەچـوون بـە یەکداو بەوپەڕی گوشـارەوە ئاوێتـە دەبـوون. هەسـتێکی زۆر تونـد گوشـاری بـۆ دێنـێ، سـەراپای لـە ئارەقـەدا هەڵدەکێشـت، دەلـەرزێ. بیـر لـە هـیچ شـتێک ناکاتــەوە. لــەچیرۆکی پیــاوی ژێــر زەمینەکــەدا دەنوســێت: "مــن لــە هــەموو شوێنێکدا، بەدرێژایی تەمەنم، سنوورانم بەزاندووە."

بەزاندنی سنوور، ڕیسککاری و، ڕوو بەڕووبوونەوەی مەترسیان، ڕیسک کردن بە هەموو شتێک لەپێناوی هەموو شتێکدا، ئایا ئەمە تاقە ڕەوت و ڕێبازی ژیان نییە؟ وایە، بەڵام لەوێ، لە دریسدن، ژنێکی گەنج چاوەڕوان و نیگەرانی ئەوە، فرمێسکان دەڕێژێت و لە یاداشتنامە تایبەتیەکەی خۆیدا دەنووسێت: "دیسان دۆڕاوە! ئاخر چ شتیکی لەم کارە دەستدەکەوێ؟"

دوستویفسکی، لەناکاوا، بەشێوەیەکی پەنهانی و سەیر وەخۆ دێتەوە، سەرزەنشتی بێ موبالاتیەکەی خۆی دەکات. لەدڵی خۆیدا بڕیار دەدات هەرکە شتێکی بردەوە، یەکسەر بگەڕێتەوە بۆلای ئانا. لێ مخابن، لە ٥/٢٠دا دەنووسێت: ئەفسووس! من هێشتا، لە هەمان شوێنی خۆمدام، بە دەوری خۆمدا دەسوڕێمەوە و هیچ ئەنجامێکم بەدەست نەهێناوە، تاقە یەک هەنگاو پێش ناکەوم. نازانم سبەینێ، چی بۆ من پێیە؟" سبەینێ هیچ شتێکی ئەوتۆی بۆ ئەو پێ نەبوو. لەوبارەیەوە دەنوسێت: "فریشتە ئازیزەکەم، دوێنێ هەستم بە ئازارێکی سەیر کرد، هەر کە لە نووسینی ئەم نامەیە بۆ تۆ بومەوە یەکسەر چووم بۆ پۆستەخانە، لەوێ پێیان گوتم کە هیچ نامەیەکی تۆم بۆ نەهاتووە. ئەژنۆکانم کەوتنە لەرزین. وام هەست کرد کە تۆ زۆر نەخۆشیت، لەحاڵی مردندایت. نزیکەی یەک دانە سەعات لە باخێکدا پیاسەم

کرد، ئازام دەلەرزی. ئەنجام چووم بۆ قومارخانەکە و هەرچیم پێبوو، هەر هەموویم بەڕۆڵێت دۆڕاند. ئیدی گەڕامەوە و ناچار سەعاتەکەم خستە بارمتەو ڕەهنەوە. گوێ بگرە، تەواو، قومار تەواو، بەزووترین کات دەگەڕێمەوە، هەرکە ئەم نامەیەت پێگەیی، بیست ئەمپیریالێکم بۆ بنێرە تا پێی بگەڕێمەوە.

دوستویفسکی پاش ئەوەی ئەم نامە پاڕانەوە ئامێزە دەنووسێت دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵێت، بیست گوڵدنی (گوڵدن: پارەیەکی هۆڵاندیە) پێدەبێت، دە گوڵدنیان دەخاتە قومارەوە، ئەمجارەیان بەخت ئاوڕی لێدەداتەوە و سی فردریکی زێڕ (دەکاتە سێسەد گوڵدن) دەباتەوە و بەڵام لەجیاتی ئەوەی دەستبەردار بێ و هۆڵەکە بەجێ بێڵێ، عینادی دەکات و یاری دەکاتەوەو، چی بردبووەوە، هەمووی دەدۆڕێنێ. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "من دەزانم، تۆ هیچ شتێکت لەدەست نایەت تەنیا ئەوە نەبێ کە تەحەموولی دووری من بکەیت. دەزانم زۆر نیگەرانی منی... ئازیزەکەم، کەمێک دان بەخۆتا بگرە، ئاقڵانە بیربکەوە، ڕوحی من ئاسوودە نییە. خەم و پەژارەی دووری و جودایی تۆ نایەڵێت، کە دوای بردنەوەیەکی مامناوەندی هەستم و واز لەم گەمە نەعلەتیە بێنم و بۆ لای تۆ بگەڕێمەوە. تا ئێستا بیست کەڕەت گەییوومەتە ئەم قەناعەتەی کە ئەگەر بەخوێنساردی، بە هێوری و ئاقڵانە یاری بکرێت، دۆڕان مەحاڵە."

ئانـا گریگوریفنـا، بیسـت ئـەمپریالی بـۆ دەنێریـت، لـە ٥/٢٥دا دەچێـت بـۆ وێستگەی قیتار، تا پێشوازی مێردە دەست بڵاوەکـەی بکـات. بـەڵام فیـدیا، لـە قیتارەکەدا نایێـت، ژنـەی گـەنج، وەکـو شـێت بـۆ شـوێنی خـۆی دەگەڕێتـەوە و لـەوێ نامەیـەکی دەدەنـێ کـە بـەرواری ٥/٢٤ی پێوەیـە: "ئانـا، دۆسـتەکەم، هاوسـەرەکەم، بمبـورە، وا تەسـەور نەکـەی کـە پیـاوێکی خـوێریم، بـەرەڵڵام. بەڵام بەهـەرحاڵ تـاوانێکم کـردووە، ئـەویش ئەوەیـە هـەر هـەموو ئـەو پارەیـەم دۆڕانـدووە کـە تـۆ بـۆت نـاردبووم. هـەر هـەمووی تـا دوا "فنیـگ" (دراوێکـی ئەڵمانیە)یم دۆڕانـدووە. دوێنـێ ئـەو پارەیـەی تـۆم پێگـەیی و هـەر دوێنـێش دوا قرۆشیم دۆڕاند. ئانێت، نازانم بە چ ڕوویەکەوە تەمەشـای تـۆ بکـەم؟ تـۆ ڕەئیـت بەرانبەر بە من چیە.؟ بەڕاستی نیگەرانی ئەوەم کە تـۆ چـۆن تەمەشـای مـن دەکەی و چ بیرێکت دەربارەی من هەیە؟ ئاهـ ئازیزەکەم وا وێنا نەکەی کە ئـەم گەندەڵیەی من چـارە ناپـەزێـزە. مـن لـە قومـار بێـزارم، نـەک لـە مـڕۆوە، بـەڵکو دوێنێ و پێرێش هەر لە قومار بێزار بووم، هەر کە ئـەم نامەیـەی منـت پێگـەیی دە ئەمپریالم بۆ بنێرە."

ئەنجام دوستویفسکی لە ٥/٢٧دا دەگاتەوە دریسدن هاوسـەرەکەی لەسـەر شۆستەی وێستگاکەدا، چاوەڕوانی دەکات. دوستویفسکی بە ڕەنگی زەرد و چاوانی بەقوڵاچوو و ڕوخساری داتەکیوەوە لە فارگۆنەکە دادەبەزێت. ئانا خۆی لە ئامێزی داوێت و لە یەکەم نیگاوە تێی دەگەیەنێ کە لە هەموو کەم و کوڕی و کێماسیەکانی خۆش بووە.

هەر هەمان ڕۆژ، ئانا، ئەو نامەیـەی کـە لـەغیابی مێردەکەیـدا، وەری گرتبـوو، دەدات بە دۆستویفسکی. بـەڵام ئانـا، کـە دەسـت خەتەکـەی پولینی ناسـی بـووەوە، نامەکـەی کردبـووەوە و خوێندبوویـەوە، بـەڵام وەسـتایانە سـەری

نامەکەی نابووەوە. ئانا،لە ڕۆژانە یاداشتەکانی خۆیدا لەو بارەیەوە دەنووسێت: "ئەم نامەیە زۆر گەوجانە و زبر نووسرا بوو، بە زەقی بچووکی و بێ ئەقڵی ئەم ژنەی نیشاندەدا."

دوستویفسکی نامەکە دەخوێنێتەوە، دەپەشۆکێ، ئانا کە غیرە گرتبوی، بەتۆبزی خۆی کۆنتڕۆڵ دەکرد و وای دەنواند کە ئاگای لە هیچ نییە.

دوستویفسکی لە نامەیەکدا بۆ مایکوف دەڵێت: "ئانا، سەلماندی کە زۆر لەوە مەندتر و، ڕەسەنترە کە من وێنام دەکرد."

لەم ماوەیەدا، خەم و خولیا، پەشیمانی و بێزاری سەریان ژەنی بووە ناخی دۆستویفسکی و مجێز و حەواسیان شێواند بوو. بیری لەو پارانە دەکردەوە کە بەخوت و خۆڕایی دۆڕاندبوونی، گوناحی دۆڕاندنەکانی دەخستە ئەستۆی خۆی، هۆی دۆڕاندنەکانی دەگێڕایەوە بۆ پەلە پەلە و شپرزەیی و نیگەرانی خۆی. هەندێجار بیری لەوە دەکردەوە، کە ئەو هەمووی دوو سێ ڕۆژێک یاری کردووە، ئەویش بە دەستمایەکی کەمەوە، خۆزی دەخواست بیتوانیبا، بۆ ماوەی دوو هەفتەیەک لە شاریکدا لابدات کە قومارخانەی تیا بێت و هەنگێ بە کەماڵی ئیسراحەت و ئارامی، بەختی خۆی تاقیبکاتەوە. کەواتە باشترین شت ئەوەیە بڕوات بۆ سویسرا و لە ڕێگا لە بادن بادن لابدات، بەئەقڵی خۆی ئەمە باشترین نەخشە بوو. نەخشەکە بە ژنەکەی دەڵێت و ژنەکەی قاییل دەبێت. ئیدی دیار نییە ئەم قاییل بوونەی لە قەناعەتەوە دەبێت یا لە بێزارییەوە.

دوستویفسکی، هەرکە ڕەزامەندی ئانای وەرگرت کە لەبادن بادن لابدەن، ئاسوودە دەبێت و دەست بە نووسین دەکاتەوە. وتارێک دەربارەی بیلینسکی دەنووسێت: "بەدەم نووسینی ئەم وتارەوە ئارەقەم دەردەدا، هەناەم تەنگ دەبوو... باوەڕبکەن نووسینی دە لاپەڕەی ڕۆمانێکم، لە نووسینی ئەم وتارە دوولاپەڕەییە، پی ئاسانتر بوو."

لە ڕاستیدا، دۆستویفسکی، هێشتا ڕاو بۆچوونێکی ڕوون و دیاری سەبارەت بەم پیاوە نەبوو، کە هەندێجار زۆری خۆشدەویست و ستایشی دەکرد و هەندێجار زۆری ڕق لێبوو. لەلایەکەوە دەیویست منەتباری خۆی سەبارەت بەم ڕەخنەگرە دەرببڕێت، کە لەسەرەتاوە، ئەمی زۆر هاندا بوو، بەڵام جۆرە کۆنە قینێکی هەر لەدڵا مابوو و نەیدەهێشت، قەدرزانی خۆی سەبارەت بەو ڕەخنەگرە دەرببڕێت. بەناچاری پێنج کەڕەت ئەو وتارە دەگۆڕێت و سەرلەنوێ دەینووسێتەوە.

دوستویفسکی هەرکە دەگاتەوە دریسد، نامەیەک بۆ کاتکوف دەنووسێت و داوای لێدەکات کە بۆ سەفەری سویسرا و ئیتاڵیا پێنج سەد ڕۆبڵی بۆ بنێرێت. پارەکەی پێدەگات و لە ٧/٣دا ژن و مێرد، دریسد بەجی دێڵن و بەرەو بادن بادن دەکەونە ڕێ.

دوستویفسکی، لە بادن بادن هاوسەرەکەی دەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ هۆڵی قومارخانەکان و چۆنیەتی یاری ڕۆڵێتی بۆ شرۆڤە دەکات. ئیدی هەردووکیان یاری دەکەن، زوو زوو دەبەنەوە و دەدۆڕێن. دوستویفسکی لە ڕۆژی دووەمی

گەیشتنیدا بۆ بادن بادن، دە دۆکا (پارەیەکی زێڕی کۆنە) دەگەڵ خۆیدا دەبات و هاوسەرەکەی بە تەنێ لە ژووری ئوتێلدا بەجێدێڵێ. سەعات چواری عەسر دەڕوات، سەعات حەوت، هێشتا ئانا لەسەر تەختەکە ڕاکشاوە و دوستویفسکی نەگەڕاوەتەوە. لە داخ و کەسەردا وەکو نەخۆش وایە... بەرە بەرە دنیا تاریک دەبێت و تاریکی چواردەوری دەگرێت. چاوەڕوان دەکات. ئەنجام دوستویفسکی سەعات یازدەی شەو دەگەڕێتەوە. شپرزە و پەرێشان، سەرو قژ ئاڵۆزکاو، بوینباخ خوار و خێچ و شل و شێواو، جل و بەرگ ناڕێکو وپێک، پیس دۆڕاوە، بڕیار دەدات جزدانەکەی بە یەکجارەکی توور بدات، چونکە پێی وایە ئەم جزدانە شوومە و پێوەی نایەت.
ڕۆژی دووەم، هەمان تاس و حەمام، هەمان بەرنامە دووبارە دەبێتەوە. بە پێنج دۆکاوە دەڕوات بۆ گازینۆ. ئانا چاوەڕوانی دەکات. مێردەکەی دەگەڕێتەوە؛ ئانا لە یاداشتنامەکەیدا دەنووسێت: "لێم پرسی دۆڕاوی؟ بە نیگەرانی و پەشۆکاوی وەڵامی دایەوە: بەڵێ دۆڕام." لە ماوەی ئەو دە ڕۆژەی کە لەم شارەدا مانەوە، دوستویفسکی، جگە لە پارەی گیرفانی خۆی، هەرچیەکی دیکەی ژنەکەشی هەبوو، هەر هەمووی دۆڕاند و بەفیڕۆدا. ئیدی ژیانێکی بێسەر و بەرو شێتانە دەبەنە سەر، ئەم ژیانە بێ سەروبەرو پەشێوە نزیکەی مانگێکی ڕەبەق بەردەوام دەبێ. فیدیا، ئەڵقەی زەماوەندەکەی لە بانکی ئیسعافا دەخاتە بارمتەوە. یاری دەکات، دەدۆڕێ ، دەباتەوە، ئەڵقەکە لە ڕەهن دەردێنێ، دووبارە دەیخاتە بارمتەوە. بۆ ئوتێل دەگەڕێتەوە، ڕەنگ زەرد و لێو بەبار، پەشێو و پەرێشانە. ئانا کە بەو حاڵەوە دەی بینێ، وا وێنا دەکات، هەرچی پێ بووە دۆڕاندوویەتی. بەڵام چل و شەش سکەی زێڕ دەردێنێ، بە شادییەکی پڕ هەڵچونەوە، هەمو قۆناغەکانی گەمەکە بۆ ژنە گەنجەکەی شرۆڤە دەکات: "شانس و بەختێکی سەیر، باوەڕنەکردەنی ڕووی تێکرد بووم، دەستم دەخستە سەر هەر خانەیەک، براوە دەبوو، هەموو ئەوانەی کە لەوێ بوون، سەیریان لەم شانسەی من سوور مابوو." ئانا، بەوردی گوێی لێدەگرت، ستایشی دەکات. لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: "چەند خۆشە! ئیدی ژیانمان بۆ ماوەیەک دابین دەبێت." بەڵام دەمە و ئێوارە، مێردەکەی، بە پەریشانی لەسەر کورسی پارکێکدا دەبینێ، توورە و پەست، بیتاقەت و داهێزراو. دۆڕاوە، قوماربازان دەوریان داوە. ئەمجارەیان توورەیی و بیانووەکەی ئەمەیە کە دراوسێ مێزەکەی کابرایەکی ئینگلیز بووە و بۆنێکی تیژی لەخۆی دابوو و بۆنی عەترەکە نەی هێشتبوو، کە دوستویفسکی ئەعسابی خۆی کۆنترۆڵ بکات و بە دروستی بیر بکاتەوە و خانەی دروست هەڵبژێرێت. بەڵام جارێکی دی بەخت بەدەمیەوە پێدەکەنێت و دەباتەوە و بەو بۆنەیەوە میوەو گوڵ و شیرینی دەکڕێت و دەبەخشێتەوە.
دوستویفسکی لە ١٥/٧دا خاوەنی چوار هەزار فرانک دەبێت. بەڵام دوای سێ دانە ڕۆژ،واتە لە١٨/٧دا،جانتا چەرمەکەی خانەوادەکە، کە تایبەت بوو بەپارەی قومار و گەمە، تەنیا بیست و چوار سکەی زێڕی تیا دەمێنێ. دوستویفسکی لە ماوەی چەند سەعاتێکدا ئەم تۆزە پارەیەش بە فیڕۆ دەدا.

دەچێت بۆ لای ژنەکەی، لێی دەپاڕێتەوە کە شتێکی بەهاداری بداتێ تا لە بانکی ئیسعافدا بیخاتە بارمتەوە. ئانا، گوارەکانی لەگوێی دا دەکەنێ، بۆ ساتێک تەمەشایان دەکات، ڕوندک لە چاوانی قەتیس دەمێنێ، بە کەسەرەوە، دەیخاتە ناو دەستی مێردەکەیەوە، کە دەستی بۆ ڕاگرتبوو. ئانا لەو بارەیەوە دەنووسێت: "دوستویفسکی، لەبەردەممدا بەچۆکا هات، دەستەکانی ڕاموسیم و گوتی لە ژیانیا کەسی لەمن باشتر، ڕوح سووکتر، ئازیزتری نەدیتووە."
دوستویفسکی، ژنەکەی بەجێدێڵێ، لەکاتێکا ژنەی داماو لەسەر کورسییەک دانیشتبوو و وەکو منداڵ بەدەم هەنسک هەڵدانەوە دەگریا، دەرگاکەی لەسەر دادەخات و دەڕوات. فیدور، لەناخی خۆیدا هەست بەعەزابی ویژدان دەکات، گلەیی لەخۆی دەکات، خۆی سەرکۆنە دەکات: کەسێکی بەدکارو دزو خوێڕییە، بەخۆی ئەمە دەزانێ. کەچی ژێراو ژێر و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و گۆنگ، لەزەت لەم دزێوکاریانەی خۆی دەبینێ. بەهەشتاو بەرەو بانکی ئیسعاف دەڕوات و لەوێندەرەوە بەرەو هۆڵی قومار. وەکو تاوانبارێک دەلەرزێت. تا وەزعی دارایی خراتر دەبێت، ماهووتە سەوزەکەی سەرمێزی قومارەکە، زیاتر بەرەو خۆی ڕایدەکێشێت. ئیدی لەم ساتانەدایە، کە قومار دەبێ بەشەڕ و پێکدادانی تەن بە تەن و دەستەو یەخە دەگەڵ بەخت و یەغباڵدا. ئەگەر بردتەوە لە هەموو شتێک عەفوو دەکرێی، ئەگەر دۆڕایت، هەنگێ دەبی بە بکوژ و تاوانکار. ئەمە هەمان پرەنسیپ و بۆچوونی ڕاسکولنیکوف بوو، پێش ئەوەی هەواڵەی زندان و تاراوگە بکرێت. ئانا، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیویەتی: "دوستویفسکی پاش دوو سەعات گەڕایەوە. پارەی بەڕەهن دانی گوارەکانی دۆڕاند بوو. خۆی بەسەر کورسییەکدا داو ویستی من لەسەر ئەژنۆکانی دابنێ، بەڵام من داخزیم و کەوتمە بەر پێیەکانی، ویستم هێوری خۆ بپارێزم و ئەویش ئارام بکەمەوە. سوێندی بۆ خواردم کە ئەمە دوا گەمەی دەبێت و لە ئێستا بەدواوە ناچێ بەلای قوماردا و تەرکی دەکات. ڕوخساری لەنێو هەردوو دەستی ناو دەستی بەگریان و زاری کرد. بەڵێ، گریا، پێی گوتم: "من دوا پارچە خشڵم لێت سەند، لێتم دزی، دۆڕاندم."
ئەم پیاوە زلە، بە چل و شەش ساڵ تەمەنەوە، ئەم نووسەرە مەنشور و بەنێوبانگە، لە هەنبەر ئەو کچە چکۆلەیەدا کە شووی پێکرد بوو، وەکو منداڵێک، بە خەتایەکی ناشیرینەوە گیرابێ، وەکو قوتابییەک بە قۆپییەوە گیرابێ، دەگریا ئەمما گریان! بەڵام بۆ سبەینێ دیسان پێنج فرانکی لە ژنەکەی سواڵ کردو، ئەڵقەی زەماوەندەکەی خۆی و ئەڵقەی ژنەکەی و حەمایلێکی ئەوی بردو خستنیە بارمتەوە. ئێوارەی ٧/١٩، ئەوەندەی پارە بردەوە کە ئەڵقەکان لە ڕەهن و بارمتە دەربێنێتەوە، بەڵام ڕۆژی دوایی، واتە ٧//٢٠ دیسان هەر چەندی پێبوو هەر هەمووی دۆڕاندەوە. ناچار ئەڵقەکانی خستەوە بارمتە. لەم ماوەیەدا، ئانا، نامەیەکی دایکی پێدەگات کە دەڵێت: "ئەگەر، پارەکە بۆ ئاغای ک نەنێرینەوە، ئەو کەلوپەلانەمان کە لەڕەهنی

ئـەودان، بـۆ خـۆی دەبـات و لـە کیسـمان دەچـن." دەنووسـێت: "حەیفـە، ئـەو کەلوپەل و جیازیانەی کە داک و باوکی من، بە هەزار زەحمـەت پێکیانـەوە نـابوو و دابوویان بە من، بەو ئاسانییە لە دەستیان بدەین؟!..." تـازە لـە خوێندنـەوەی نامەکـە بـوو بـووەوە کـە دوسـتویفسـکی خـۆی وەژووردا دەکـات. ڕەنگـی زەرد، ڕوخسار گرژ، چاو سـوور. "هەموو شتێک تەواو ئایەو مایەی دۆرانـد بـوو، هێنـدە خەمبار بوو، دەترسام تووشـی فێیەکە ببێتەوە."

نامەیان بۆ کاتکوف و دایکی ئانا نارد. سیٚ سکەی زێڕیان لە گونجاروفی نووسـەر قەرز کرد بوو کە بەمەبەستی ئیسراحەت و پشوودان بۆ بادن بادن هاتبوو، کەسێکیان دۆزییەوە کە لەهەنبەر پاڵتۆو جل و بەرگاندا قەرزی دەدا. بابایەکی "جوولەکەی چکۆلەیان" بانگ کرد کە لەهەنبەر پاڵتۆکەی نووسـەر حەوت فلورن، لە هەنبەر تەنوورەیەکی ئانادا، شەش فلورن و لە هەنبەر، پارچە جلێکی کۆنەدا دوو فلورن قەرزی دانی، هەڵبەتە ناچار بوون، بەدزی ژنەی خاوەن ماڵەوە، ئەو جلکانە بەرنە دەرەوە. ئانا دەنووسێت: "ئەوەندەی لە توانامدا بوو جلەکانم لە بوخچەی بچووک دەنان و دوستویفسکی لە بن پاڵتۆکەی خۆی دەنان و دەیبردنە دەرەوە." دیسانەوە قومار، دۆڕان و بردنەوەی بچووک: "فیدیای بەلەنگاز مات و خەمین هاتەوە، گوتی یا شێت دەبێت، یا گوللەیەک بەخۆوە دەنێت و خۆی دەکوژێت."

پارەی ژنەی خاوەن ماڵیـان نـەدابوو، خواردنیـان نـەما بـوو، تەنانـەت چایـانیش نـەبوو. ژوورەکـەیان ڕووت و ڕەجـاڵ، سـاردە. کۆمـەڵێک منـداڵی هاروهـاج لـە مەیدانەکەی تەنیشتیاندا، کردبوویان بە هەراو زەنایەک ئەوسەری دیـار نـەبێت. کابرایەکی بەیتاڵ و ناڵبەند لەژێر پەنجەرەی ژوورەکەی ئەواندا کـاری دەکـرد و ئیدی بەردەوام تەقو هۆڕی چەکوش و سندان، گوێی کاس دەکـردن. ئەم تەقـو هۆڕە بەردەوامە، گەرمای ناو دوکانی ناڵبەنـدەکە، کـاغەزی بـۆگەن و نمسـاری قەد دیوارەکە، کەمـێش و مەگەزی دنیـای لێنیشـتبوو، هێنـدەی دی ژیانیـان لە ئانا کرد بوو بە دۆزەخ. لەهەر سووچێکی ژوورەکەیاندا، جلێکی ژێـرەوەی چڵکـن کەوتبـوو. ئانـا هەڵدەسـتێت و بەڕوخسـاری شـەکەت و مانـدوو و، سـیمای مردەڵەوە، ئەو جلانە کۆدەکاتەوە دەکەوێتە شتنیان دوای چەند ڕۆژێـک، فیـدیا بـایی ئەوە دەبـاتەوە کە هەمـوو ئەو شـتانەی کە خسـتبوویانە بـارمتەوە، دەربێنێتەوە. ئانیت سـەدو پەنجا ڕۆبڵـی لە دایکیەوە پێدەگات. دوسـتویفسـکی پاش نانی شێوان دەڕوات تا گوارە و تەوقە و ئەڵقەکانیان لە ڕەهن دەربینێتەوە.

ئانا دەڵێت: "فیدیا سـەعات هەشـت گەڕایەوە، نائومێد و چاو بەگریان بەرەو ڕووی من هات و گوتی هەموو ئەو پارانەی، کە دابوومیٚ تا شتەکان لە بارمتە دەربێنێتەوە، دۆڕاندووە. دیسان داوای پارەی لێکردم کە شتەکان لە ڕەهن دەربێنیٚ، بەڵام چونکە باوەڕم پێی نەدەکرد، بەخۆم لەگەڵیدا ڕۆیشتم. بەدرێژایی ڕێگا دەستەکانی ماچ دەکردم و داوای بوردنی لێدەکردم، وەکو ئەوەی بەڕاستی تاوان و خەتایەکی گەورەی کردبیٚ

دوسـتویفسـکی نـامەیەک بـۆ مـایکوف دەنێرێـت: "ئانـا، هەرچیەکـی هەیە لە خشـڵ و جـل و بەرگ، هەر هەمـووی خسـتووەتە ڕەهـنەوە، تەحـا لەو

فریشەتەیە. چەند دڵخۆشی من دەداتەوە، کە لەم شارە نەعلەتیە، لەم بادن –بادنە بێتاقەت بوو، مەگەر خوا بزانێ لەو دوو ژوورە چکۆلەیەدا کە لەسەر دوکانێکی ئاسنگەری بەکرێمان گرتبوون، چەند بێزار و بێتاقەت بووا!"

دوستویفسکی لە بادن بادن دا، جگە لە گونجاروف، تاقە ڕووسێکی بینیبێ، تورگینیف بوو. دوستویفسکی لەمێژ بوو پەنجا تالیر بە تورگینیف قەرزدار بوو. " تا ئێستا ئەو قەرزەم پێ نەداوەتەوە." ئانا، مێردەکەی ئامۆژگاری دەکات کە پړوات سەرێکی لێبدات و بۆی بسەلمێنێ کە قەرزەکەی ئەوی فەرامۆش نەکردووە.

دوستویفسکی بە نەبەدڵی، بەگوێی ژنەکەی کرد. دوستویفسکی تورگینیفی خۆشنەدەویست، بەجۆرێ ڕەفتاری دەکرد وەکو ئەوەی میرزادەیەکی زۆر گەورە بێت، لە چاک و خۆشی و دەست و موچدا، خۆی زۆر بە گەورە دەزانی و گەورەنمایی دەکرد، کە دوستویفسکی ئەمەی بەدڵ نەبوو. دوستویفسکی لەم ڕستەیەی دوا بەرهەمی تورگینیف، واتە دووکەڵ: "ئەگەر ڕووسیا لە سەر گۆی زەوی بسڕدرێتەوە، هیچ زیانێک بەهیچ شوێنێک ناکەوێ و تیرەی بەشەر بەر تۆفان و لافاوی ناکەوێ." زۆر توورە و پەست بوو، هەرچی دەکرد لەدڵی دەرنەدەچوو.

لەسەرەتای دیدارەکەیانەوە، مشت و مڕ گەنگەشەیەکی توند دەکەوێتە نێوانیانەوە. دوستویفسکی دەڵێت: "پێی گوتم کە بەهیچ جۆرێک باوەڕی بەخودا نییە، بەڵام خودایا، ئەمە خوداناسییە کە مەسیحی بە ئێمەداوە، کە دەکاتە نموونەی هەرە باڵا و نەمری تیرەی بەشەر، خۆ ئەگەر ڕێزی نەگرین، ناتوانین دەرکی بکەین و بێگومان ئەو ئایدیالی ئەبەدی تیرەی بەشەرە. باشە تورگینیف، هرتزن، ئوتین، چرنیشفسکی و هەموو ئەمانە چییان بە ئێمە بەخشیوە؟ هەر هەموو ئەمانە کۆمەڵگەیان شڵەقاندووە، هەر هەموویان خەڵکی لووت بەرز و خۆبەزل زان و خۆپەرست و گەوجن. وەکو ئەوەن، پیاو لەخەوندا بیان بینێ. ئەمانە دڵیان بەچی خۆشە؟ ئاخر کێ دوایان دەکەوێ؟

ئەوەی کە مایەی ڕەفز و قەبووڵ نەکردن بوو لای دۆستویفسکی، ئەوە بوو کە هەرچەندە تورگینیف بەدەمی ڕووسیای خۆشدەویست، بەڵام بەدڵ ڕقی لێی بوو: "تورگینیف، لە قسەکانیا بە منی گوت، ئێمە دەبێ لە هەنبەر ئەڵمانەکاندا سەردابنەوێنین. گوتی دنیا تەنیا یەک ڕێگای لەبەر دەمە، ئەویش ڕێگای شارستانیەتە. بۆیە هەر جۆرە هەوڵێکی جیاو سەربەخۆ و کە تایبەت بێ بە میللەتی ڕووس، سەرەتایی و گەوجانەیە. گوتی، خەریکی نووسینی وتارێکی درێژە دەربارەی سلافدۆستەکان، پێمگوت، بۆ ئەوەی کارەکەی بەئاسانی بچێتە پێشەوە، بنێرێت لە پاریسەوە عەینەکێکی دووربینی بۆ بێت. پرسی: "بۆچی؟" وەڵامم دایەوە: "چونکە لەم شوێنەتەوە زۆر دووریت لە ئێمەوە. دەبێ ڕووی عەینەکەکەت بکەیتە ڕووسیاو بەوردی تەماشای ئێمە بکەیت، دەنا ناتوانی ئێمە بەباشی بدینی."

تورگینیف بەو قسانە، سوور دەبێتەوە، لێوی خۆی دەگەزێت تا وەڵامی من نەداتەوە. بەڵام دوستویفسکی کە بیری دەکەوێتەوە، دنیای ڕۆژنامەوانی، بە

باشــی پێشــوازیان لــە ڕۆمــانی دووکــەڵ نــەکرد بــوو، زۆر گەوجانــە و بەوپــەڕی ســـادەیی لەســـەری دەڕوات: "مــن تەســـەورم نــەدەکرد کــە ســـەرنەکەوتنی دووکەڵ و ئەو وتارە نەرێنیانەی کە لەسـەری نووسـراون، بـەم ڕادەیـە تـوورەت بکەن. من دڵنیات دەکەم کـە ئەمـە گرینـگ نییـە و هـیچ بایـەخێکی نییـە. هـەر بیریشی لێمەکەوە. توورە مەبە."

تورگینیف، هاوار دەکات: "ئەوە تۆ چیتە، من هەرگیز توورە نیم و توورەش نابم."

کاتێ کە دوستویفسکی دەیەوێ بابەتەکە بگۆڕێت و دەکەوێتە ئیراد گرتن لە ئەڵمانەکان، تۆرگینیف بە دەنگێک کە لەتوورەییدا دەلەرزێت هاوار دەکات: "دەزانی تۆ بەم قسە و بۆچوونانەت سووکایەتی بە من دەکەیت. ئەوە بزانە کە من بە یەکجارەکی ئاکنجی ئێرە بووم و حاڵی حازر خۆم بە ئەڵمانی دەزانم، نەک ڕووس. بەڕاستی شانازی بەم هەڵوێستەی خۆشمەوە دەکەم."

دوستویفسکی، بۆ ماڵەکەی دەگەڕێتەوە. زۆر خۆشحاڵ دەبێت بەوەی کە ئەو ئەشراف زادەیەی توورە کرد بوو کە لە کونی خۆی هەڵگەڕابووەوە و حاشای لە نیشتمانی خۆی کردبوو.

لەسەرەتای مانگی ئابدا، کاتکوف، لەسەر داوای دوستویفسکی، سلفەیەکی ٥٠٠ ڕۆبڵی بۆ فیدور میخائیلوفیچ دەنێرێت. ئیدی ژن و مێرد کەمێک دەبوژێنەوەو دەتوانن سەفەر بۆ جنێف بکەن، دوای دانەوەی قەرزەکانیان، تەنیا سەدو چل فرانکیان بۆ دەمێنێتەوە. خەرجی سەفەرەکەیان سەد فرانکە. دوای ئەوەی فیدور سەرێکی خێرای هۆڵی ڕۆلێت دەدات، پارەکەیان دێتە سەر سەد فرانک.

ئانا لەو بارەیەوە دەڵێت: "کـە ئـەو خەبـەرەم زانـی، زۆر پەسـت بـووم. باشـە دەشـــێت، ئینســـان بـــەم ڕادەیـــە خەمســـارد و بێموبـــالات بـــێ؟ ویســـتم سەرزەنشتی بکەم، بەڵام کەوتە خاک و پام و داوای بوردنی لێکردم."

بۆ دواجار، هەردوو گوارەکەی بە پری سەدو بیست فرانک خستە بارمتەوەو هەردوو ئەڵقەکەی بە بیست فرانک وەرگرتەوە. ئانا دەڵێت: "هەنگێ فیدیا ڕۆیی بۆ هۆڵی ڕۆلێت، تکام لێکرد کە دوا نەکەوێ و زوو بگەڕێتەوە. دوای بیست دەقیقەیەک گەڕایەوە، پێی گوتم پارەکانی بە تالیر گۆڕیوەتەوە و هەر هەمووی دۆڕاندووە. پێمگوت گوێی نەداتێ و بێ یارمەتیم بدات، تا جانتاکان بپێچینەوە."

## فەسڵی نۆیەم
## تاراوگە

کاتێ ژن و مێرد گەیینە جنیف، تەنیا سی فرانکیان پێ مابوو. لە سیلەی هەردوو شەقامی گیوم تیل و بارتیلەدا، لەماڵی دوو قەیرە کچدا ژوورێکی موبیلەداریان بەکرێ گرت. دوای چوار دانە ڕۆژ، لە دارای دنیادا تەنیا هەژدە فرانکیان پێ مابوو. ئومێدی ئەوەیان نەبوو لە هیچ شوێنێکەوە پارەیان بۆ بێت، تەنیا ئەو پەنجا ڕۆبڵە نەبێت کە داکی ئانا، بەڵێنی دابوو بۆیان بنێرێت. ئیدی دوستویفسکی لێدەبڕێت داوای کۆمەک و یارمەتی لە مایکوفی دوستی بکات.

"ئاپولونی ئازیز، من دەزانم کە تۆش پارەی کاشت لەبەردەستدا نییە. هەق نەبوو ڕووت لێبنەم، بەڵام چی بکەم لە حاڵی غەرق بووندام، فریام نەکەوی، حاڵم شڕە." مایکوف بەپەلە سەدو بیست و پێنج ڕۆبڵی بۆ دەنێرێت، کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، وەکو هەڵم دەچێت بە ئاسماندا و نامێنێ.

دوستویفسکی هەرکە دەگاتە جنیف. خێرا دەست بە کاری نووسین دەکاتەوە. ئەو گوتارەی کە دەربارەی بیلینسکی، بناغەی دانابوو، تەواو دەکات. هەڵبەتە ئەو وتارە هەرگیز بڵاو نەبووەوە، کەوتە خوێندنەوەی ڕۆژنامانی ڕووسی، هەندێ بەرهەمی بالزاک و، جورج ساند دەخوێنێتەوە. هەروەها لە کۆنگرەی ئاشتیدا بەشداری دەکات. کە بەشەقامی مون بلادن دا دەڕوات، گاریبالدی دەبینێ. جادەکە بە جۆرەها لافیتە ڕازێنرا بووەوە، قارەمانی ئیتالیایی (گاریبالدی) لەنێو گالیسکەیەکی سەر واڵادا بەپێوە وەستا بوو، کڵاوە چکۆلە عەنتیکەکەی بەدەستەوە گرتبوو، تەکانی دەدا و وەڵامی سڵاو و هورای جەماوەری خەڵکەکەی دەدایەوە. پاشان دوستویفسکی، لە هۆڵی کۆنگرەکەدا، گوێی لە کۆمەڵێک وتار دەبێت کە زۆریان پێ پەست و تووڕە دەبێت: "هەرگیز تەسەور ناکرێ، کە چۆن ئەم ئاغایانە، ئەم سوسیالیست و شۆڕشگێڕانە، کە من بۆ یەکەمجار لە نزیکەوە و بەچاوی خۆم لە واقیعدا دەمدیتن نەک لەناو کتێباندا، چۆن توانیان، لەپشت تریبونەوە، ئەو هەموو درۆیە بۆ جەماوەرێکی پێنج هەزار کەسی هەڵڕێژن. قسە قۆڕ و بێ مانا و، هەقدژ گۆییەکانیان، سەریان لەپیاو دەشێواند، وێڕای ئەوەش، ئەم قسە بێ مانایانە، خەڵکانی زەحمەتکێشیان دەوروژاند. دیارە ئەمە مایەی داخ و کەسەران بوو. بەوە دەستیان پێکرد، کە پێویستە بۆ بەرقەراری تەناهی و ئاشتی لە دنیادا، بیرو باوەڕی مەسیحیەت لەنێو ببرێت، نەتەوە گەورەکان لەنێو ببرێن و نەتەوەێن بچووک بێنە ئاراوە. دەبێ سیستەمی سەرمایەداری لەنێو ببرێت و سیستەمی سوسیالیستی جێگای بگرێتەوە، هەڵبەتە ئەم قسانەیان دەکرد بێئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان پێبێ کە پشتی پێ ببەستن."

زستان، نزیک دەبووەوە. هەور بەری ئاسمانی دەگرت، با هەڵی دەکرد، خەڵکی بەلەز بەکوچەو کۆڵاناندا تێدەپەڕن. دوستویفسکی ئەم کەش و هەوا ناخۆشەی لەبەرگران بوو. نۆرەفێی لێدەردەکەوتەوە، نەفرەتی لە هەموو شوێنیک، جگە لە وڵاتەکەی خۆی، دەکرد. "لێرەدا، هەموو شتێک پووچە. نەفرەت ئەنگێزە. هەموو مەست و سەرخۆش، تەنانەت لە لەندەنیشدا، ئەم هەموو مەست و ئالوودە و عەربەدەچیانە، نییە. لێرەدا هەر تاوێرە بەردێکیان بەلاوە جوان و مەزن و بایەخدارە. کە لێرە لە کەسێک دەپرسیت فلان شەقام لە کوێیە، وەڵامت دەدەنەوە، تەماشا بەڕێز، ڕاست دەڕۆی کاتێ لەو سەرچاوە جوانە نزیک دەبیتەوە پێچ دەکەیتەوە... ئەو سەرچاوە جوان و مەزنەش بریتی بوو لە حەوز و فوارەیەکی بچووک کە بەستایل و شێوازی ڕوکوکۆ دروست کرابوو. هیچ جۆرە ناسکیەکی هونەریی تێدا نەبوو. بەڵام ئەوەی کە قسەی بۆ دەکردیت، ئەو دەفەتەی لە کیس نەدەداو بە شانازییەوە بۆی باس دەکردیت. لەکاتێکا داوات دەکرد شەقامێکت پێ نیشان بدات و تەواو. باخەکانی

ئینگلیزش، لە مەیدان و یارێگا بەڕواڵەت پەرپووتەکانی مۆسکۆ باشتر نەبوون. بەشێوەیەکی گشتی ئەم شارە "پەرستگەی بێزاری" و بێتاقەتییە. کە دۆستویفسکی بەو شێوەیە مجێزی تێک دەچێت، ژنەکەی پێشنیاز دەکات کە بڕوات بۆ شاری ئاوی مەعدەنی : "ساکسون –کی –بان" کە نزیکەی سەد کیلۆمەترێک لە جنێفەوە دوور دەبێت و هۆڵی قومارخانەکانی لەدنیادا بەنێوبانگ بوون. ئانا، دەزانێت، کە پێویستە مێردەکەی پرێک پارە بدۆڕێنێ و تووشی عەزابی ویژدان ببێت، بۆ ئەوەی دووبارە بگەڕێتەوە سەر کاری نووسین. یاری ڕۆڵێت و دۆڕاندنی پەیتا پەیتا، بەشێوەیەکی سەیر ئارامی دەکردەوە. دووبارە متمانەی بەخۆی پەیدا دەکرد. بیری لەوە دەکردەوە، بەکارێکی هونەری خێراو جدی، قەرەبووی ناکامیەکانی خۆی بکاتەوە.

کاتێ ژنەکەی پێشنیازی دەکرد، کە جارێکی دیکە بەختی خۆی لەگەمەدا تاقیبکاتەوە، بەخۆشحاڵییەوە بەگوێی دەکرد. لە ١٠/٥دا دەگاتە ساکسون –لی –بان، هەڵبەتە بەرنامەی وا دەبێت، ڕۆژی دوایی، دوای یەک گێم یاری ڕۆڵێت، بگەڕێتەوە. بەڵام لە ١٨٦٧/١٠/٦دا نامەیەک بۆ ژنەکەی دەنێرێت: "ئانێت گیان، بەڕاستی من کابرایەکی گەوج و غەشیمم. دوێشەو سەعآت دە، هەزار و سێسەد فرانکی کاشم بردبووەوە، ئەمڕۆکە تاقە یەک کوپیکم پێ نییە. هەر هەموویم دۆڕاند. هۆیەکەشی ئەمە بوو کە ئەم گارسۆنە خوێڕییەی ئوتێلی ساکسن –لی – بان بەیانی لەوەختا بێداری نەکردبوومەوە تا بتوانم بە شەمەندەفەری سەعات یازدە بۆ جنیف بێمەوە. ئیدی تا سەعات یازدەو نیو لەخەو مام. کە لەخەو ڕابووم، سەیرم کرد، هیچ چارێکم نییە دەبێ چاوەڕوانی قیتاری سەعات پێنج بکەم. ئیدی بۆ بێتاقەتی سەعات دووی پاش نیوەڕۆ، چووم بۆ هۆڵی یاری و هەرچیم پێ بوو دۆڕاندم و هەستامە سەر پێیان."

پێشبینییەکانی ئانا دروست بوون، دوستویفسکی، هەرکە گەڕایەوە، بە گوڕو تاوێکی زۆر جدی دەستی بەکاری نووسین کرد. هەوەڵجار دەستی بە نووسینی چیرۆکێکی سادە کرد، چیرۆکێکی دوور لە هەر ماناو تیمەیەکی فەلسەفی و لایەنی ئەخلاقی، "چیرۆکێک دەربارەی چەند ڕووداوێک و کۆمەڵێک کاراکتەر کە خۆ بەخۆ بجوڵێن و بەگوێرەی هیچ بیرو فەلسەفەیەکی دیاریکراو وتایبەتی، ئاڕاستە نەکرێن."

هەڵبەتە دەیویست، لە نووسینەکەی خۆیدا سوود لە مەسەلەو ڕووداوەکەی ئومیتزکی ببینێ کە لە ڕۆژنامەی بانگدا خوێندبوویەوە. مەسەلەکەش ئەمە بوو کە کیژێک لەلایەن داک و بابیەوە، سووکایەتی پێدەکرێت و ئەویش چوارجار هەوڵدەدات، ماڵەکەی خۆیان بسووتێنێ. بەڵام ئەمە تەنیا خاڵی دەستپێکە و هیچی دی. بەڵام دوستویفسکی لەوە بێتاقەت دەبێ کە ناتوانێ، هیچ ئیزافەیەک بۆ ئەم بابەتە واقیعییە بکات.

دوستویفسکی لە ١٧/ت٢/دا، دوای ئەوەی کارو نەخۆشی تەواو ماندووی دەکەن، دەگەڕێتەوە بۆ ساکسون –لی –بان. "ئاهـ گیانەکەم، نەدەبوا ڕێگەم بدەیت بچمە ڕۆڵێت! چونکە هەرکە لە مێزی یاریەکە نزیک دەبمەوە، ئیدی دڵم

لە لێدان دەوەستێ، قەڵەمی دەست و پێم دەشکێ. ئەژنۆم دەلەرزێ. ئازام وەکو بەفر سارد ددادێ، من سەعات چوار کەم چارەک گەییمەوە ئێرە، یەکسەر زانیم کە ڕۆڵێت سەعات پێنج دادەخرێ. هەوەڵجار وامدەزانی سەعات چوار دادەخرێت. کەواتە یەک سەعاتی ڕەبەق وەختم بەدەستەوە بوو. ئیدی بە هەشتاو خۆم گەیاندە ئەوێندەر. لە گێمی یەکەما و لەڕێوە پەنجا فرانکم دۆراند، پاشان، نەک هەر زوو بەزوو پەنجا فرانکەکەم بردەوە، بەڵکو شتێک زیادەشم بردەوە، نەمزانی چەندی زیادەم بردەوە، چونکە پارەکەم نەژمارد. دوای ئەوە دۆران دەستی پێکرد، جا دۆران نەک گاڵتە، هەرچیم پێبوو، دۆراندم بەڵام لەناکاوا لە دواگێمدا جگە لە سەدو بیست و پێنج فرانکەکەی خۆم، سەدو دە فرانکی زیادەشم بردەوە. یانی حاڵی حازر من خاوەنی دووسەد و سی و پێنج فرانکم. ئانیتی ئازیزم. لە دڵی خۆدا گوتم هەق نییە سەد فرانکێک بۆ تۆ بنێرم؟بەڵام ئەمە کەمە،پێویستە بەلای کەمەوە دوو سەد فرانکت بۆ بنێرم. بەڵام لەلایەکی دیکەوە بەڵێنم بەخۆداوە، ئەمشەو لە سەعات هەشتەوە تا یازدە ببم بە جولەکەی ڕاستەقینە. زۆر ئاقڵانە قوماربکەم. سوێندت بۆ دەخۆم. بەهیوای دیداری ئەسەح لە ڕۆژی سێ شەممەدا. بەڵام لە ڕۆژی دووشەممەوە، ئیدی تۆنی دەم و دووی دەگۆڕێ. دەنووسێت: "ئانێت گیان، هاوسەرە بێ هاوتاکەم، هەرچیم هەبوو دۆراندم. ئاهـ فریشتەکەم. لێم زویر مەبە، خەمت نەبێ، دڵنیابە بەم زووانە ئەو ڕۆژە دێت کە شایستەی تۆبم، ئەویش ئەوکاتەیە کە وەکو دزێکی چەپەڵ، وەکو پیاوێکی ناکەس تۆ تاڵان نەکەم. جا حاڵی حازر مەگەر زەمان، تەنیا زەمان فریامان بکەوێت."

ئیدی ئەڵقەکەی و پاڵتۆ زستانیەکەی دەخاتە بارمتەوە و تەنیا پەنجا فرانکێکی دەوێ تا بتوانێ خۆی بگەیەنێتەوە جنیف. سەبارەت بە ئایندە، هەرچۆنێ بێ تەگبیرێکی حاڵی خۆی دەکات: داوای یارمەتی لە کاتکوف و لە ئۆگارێفی شاعیر دەکات کە لە جنیف دەیبینێ، ئەگەر پێویست بکات خشڵەکانی ئانا دەخاتە بارمتەوە.

نامە بۆ هاوسەرەکەی دەنووسێت:"خەمت نەبێ، هەموو شتەکان چاک دەکەم، قەرەبوویان دەکەمەوە، کەڕەتی پێشووش بەتەواوەتی نابووت بووین، بەڵام ئێستا جۆرە ئومێدێک لەدڵما دەدرەوشێتەوە... بیکە بەخاتری مەسیح وا تەسەور نەکەی ئەو پەنجا فرانکەی کە بۆمی دەنێریت، دەکەم بە قومار."

ئەمجارەیان کە گەڕایەوە بۆ لای ئانا، ئەو گەرم و گوڕییەی جارانی بۆ کاری نووسین نەبوو، بەڵکو هەموو پێشەکی و دەستپێکی ئەو ڕۆمانەشی، کە نووسیبووی، هەڵوەشاندەوە. دوای ئەوەی ڕۆمانەکەی خوێندەوە، بەدڵی نەبوو، ئەوەندەی بەلاوە خراپ بوو، دەستنووسەکەی سووتاند.

ئیدی نامەیەکی بۆ کاتکوف نووسی کە مانگانە پڕی سەد ڕۆبڵی بە سلفە و پێشەکی لەجیاتی بەرهەمەکانی بۆ بنێرێت و بۆ مانگی دیسامبەر دووسەد ڕۆبڵی بۆ بنێرێت. کاتکوف کە پیاوێکی باش بوو، داواکەی جێبەجێ دەکات، بەو مەرجەی فیدور تا ١٨٦٩/١/١، بەشی یەکەمی دەستنووسی ڕۆمانەکەی

بداتێ. کات، ئاخرو ئۆخری مانگی کانوونی یەکەمە، هێشتا هیچ شتێک ئامادە نییە. بەڵام بیرۆکەیەکی سەیر بە بیرو خەیاڵی دوستویفسکیدا هاتووە. لەو بارەیەوە نامەیەک بۆ کاتکوف دەنووسێت: "دەیەوێ باسی پیاوێک بکات کە لە هەموو ڕوویەکەوە، مایەی سەرنج و پەسەندی هەمووان بێ" بەڵام لە ڕۆژگاری ئێمەدا، دۆزینەوەی پیاوی واهی زۆر ئەستەم و دژوارە. هەڵبەتە تۆش هەمان ڕەئیت هەیە. ئەم بیرۆکەیە لە ڕووی شێوەی هونەرییەوە لەلای من گەڵاڵە بوو، بەڵام بەشێوەیەکی سادە، دەبوایە لق و پۆی لێبنرێ. بەڵام نەگبەتی لەمەدایە، کە دەمەوێ دەست بەنووسینی ئەم بابەتە بکەم کە هێشتا بە دروستی نەخەملیوە و ئامادە نەبووە. من لە ڕۆڵێتدا ڕیسکم کرد، دەمەوێ لەم کارەشدا ڕیسک بکەم. "ڕەنگە بەدەم نووسینەوە، بەرە بەرە بخەملێت و پێبگات، دەنا ئەوە دەرناچێت کە دەمەوێ."

ئیدی بەرە بەرە نەخشە و سکێچی ڕۆمانی ناوبراو ڕوون دەبێتەوە و قاڵبی خۆی وەردەگرێت و دەکەوێتە بەرچاوان: لەپاڵ قارەمانە پیاوەکەدا، قارەمانێکی ژن و کۆمەڵێک کاراکتەرێن دی دەردەکەون و لەناو چیرۆکەکەدا ڕەگ و ڕیشە دادەکوتن و گەشە دەکەن.

"بەشی یەکەمیم بەلاوە لاوازە، بەهەرحاڵ، زەرەرێکمان نەکردووە... بەشی یەکەم تەنیا دەستپێک و پێشەکییە.. ئەم ڕۆمانە ناو دەنەم گەمژە..."

دوستویفسکی لە نامەیەکی دیدا، ئەو کێشەو گرفتانە ڕوون دەکاتەوە کە لەوێنەگرتنی ئەم قارەمان یا شا قارەمانەدا دێنە ڕێی و بەرۆکی دەگرن:

"لە هەموو دنیادا، تەنیا یەک سیما و ڕوخسار هەیە کە بەتەواوەتی ئەرێنی بێ، ئەویش ڕوخساری حەزرەتی مەسیحە.. لە ئەدەبیاتی مەسیحیدا، سەرکەوتووترین و پەسەندترین قارەمان، دۆنکیشۆتە. بەڵام بۆیە سەرکەوتوو و مایەی پەسەندە، چونکە لە هەمان کاتدا کاراکتەرێکی کۆمیدییە. بۆ نموونە "پیکویک"ی قارەمانی یەکێک لە ڕۆمانەکانی دیکنزش، هەرچەندە لە ڕووی هونەرییەوە زۆر لەخوار ئاستی دونکیشۆتەوەیە، مایەی پەسەندە، چونکە ئەویش کەسایەتیەکی کۆمیدیە. "جان ڤالجان"ش کارێکی جوان و سەرنجڕاکێشە، بەڵام ئەم قارەمانە، هاوخەمی و هاودەردی خوێنەر لە ڕێگای بێنەوایی خۆی و وبێدادی جڤاکی و کۆمەڵایەتیەوە، دەهاڕوژێنێ. بەڵام لای من، لە کارەکەی مندا، هیچ شتێک نییە کە لەو ڕۆمانانە بچێت، بۆیە دەترسم تووشی شکستێکی وەهابیم، بەهیچ جۆرێ پاکانەی بۆ نەکرێت. ڕەنگە هەندێ هونەرکاری و جوانکاری لە کارەکەی مندا هەبێ کە لای خەڵکانێک پەسەند بن، بەڵام ترسی ئەوەم هەیە بە شێوەیەکی گشتی، بێزارکەر بێت."

وای دێتە بەرچاو کە غەریبی، تاراوگە، هەژاری، نەخۆشی و هەرچی بەڵای دنیا هەیە، یەکیان گرتووە و پەلاماری ئەو دەدەن و بەسەریدا دادەبارن. ئەمە خۆی لەخۆیدا دەبێت بەهاندەری تا بەجدی شان بداتە بەر کارەکەی و بیگەیەنێتە ئەنجامێک. کەش و هەوا ساردە، تەنیا یەک موغەیری خراپ لە ژوورەکەدا هەیە، کە ژوورەکە گەرم ناکاتەوە. پەنجەرەکانیش دەبڵ جام نین وەکو لە ڕووسیادا باوە. هەرچەندە دوستویفسکی بەشی هەرە زۆری

پارەکـەی خـەرجی کڕینـی دارو سـووتەمەنی دەکـات، بـەڵام پلـەی گـەرمای ژوورەکە قەت لە پێنج نمرە بەرزتر نایێتەوە. بەردەوام پاڵتۆ زستانیە قورسـەکەی لەبەردایـە. ئـەو پارەیـەی کـەکاتکوف بـۆی دەنـارد، لـە هـەوەڵین چەنـد ڕۆژی سـەرەتای مانگـدا تـەواو دەبـوو. ئیـدی دیسـان ڕێگـای بـانکی ئیسـعافی دەگرتەوەبەر. لە گەرمەی ئـەم قەیرانـە دەروونـی و شـەکەتیە جەسـتەییەدایە کە خەبەرێکی خۆش دەگاتە گوێی دوستویفسکی، کە ئانا سکی هەیە.

نووسـەر، لە خۆشـی ئەوەی کە بەو زووانە دەبێ بە باوک، لە پێسـتی خۆیدا ناهێورێ. دەنووسێت: "منداڵەکە هێشتا لەدایک نەبوو بوو، کە خۆشـمان دەویست." بڕیار دەدەن ئەگەر کیژ بێ بەیادی سونیا مارمیلادوفی قارەمانی (تاوان و سزا)وە ناوی بنەن سونیا و ئەگەر کوڕ بوو بەیادی براکەی فیدورەوە ناوی بنەن میشیل.

دوستویفسکی، ناچار، لە خەرجی ڕۆژانە دەگرێتەوە و مامان و پەرستارێک بەکرێ بۆ ژنەکەی دەگرێت. بە چەند ڕۆژێک پێش لەدایکبوونی منداڵەکە، تووشـی حاڵەتێکی شێتی ڕاستەقینە دەبێت، شـەوێ تووشـی نۆرە فێیەکی توند دەبێ، دوای بەسـەرچوونی فێیەکە، خەوێکی قوڵی لێدەکەوێت. ژنەکەی کە ژان دەیگرێت، بێداری دەکاتەوە. دوستویفسکی دەڵێ: چەند بەزەییم پێتدا دێتەوە ئازیزەکەم. ئەوسا سـەردەنێتەوە سـەر سـەرینەکەی و خـەوی لێدەکەوێتەوە. بۆ بەیانی دەڕوات بەدوای ماماندا بەڵام مامانەکە هێشتا لەخەو ڕانەبوو بوو. بەتوندی لە زەنگ دەدات، دەیکات بە هەڕو گیڤێک کە ئەو سەری دیار نەبێت. دەیەوێت بەزووترین کات بیبات بۆ دیار ئانا.. مامانەکە دەیبینێ و دەڵێت: "هێشتا حەوت هەشـت سـەعاتی ماوە، دوایی دەگەڕێمەوە بۆ لای."

بەڵام مامانەکە نەگەڕایەوە. دوستویفسکی جـارێکی دی دەچێتـەوە بـەدووی مامانەکەدا، سـەیر دەکات لـەلای هەنـدێ لـە دۆسـتانی خـۆی خـەریکی شـێو خواردنـە. دەیهێنـێ بـۆلای ئانـا. مامانەکـە دیسـان دەڵێـت: "تـا نیوەشـەوێکی درەنـگ منداڵەکـەی نایێـت." دەڕوات بـەلای کـاری خۆیـەوە. دوستویفسـکی لەسـەعات نـۆی شـەودا، بـۆ جـاری سـێیەم دەڕوات بـەدوای پیـرە مامانـدا، تەمەشا دەکات خەریکی لوتۆبازیە. پیرەژن کە دەیبینـێ، هـاوار دەکـات: "ئـۆف، ئامان لەدەست ئەم ڕووسانە." وێڕای ئەوەش لەگەڵ دوستویفسـکیدا دەڕوات. بەڵام نایەڵێت دوستویفسکی بچێتە ئەو ژوورەوە کـە ژنەکـەی بـەدەم دوا ژان و ژاری منداڵ بوونەوە، دەتلایـەوە. دوستویفسـکی، لـە ژوورەکـەی تەنیشـتەوە خۆی مەڵاس دەدات. لەوێندەر دەکەوێتە سەرچۆکان، دەست بـە نـوێژ و نزایـان دەکات. لەناکاوا، لـەنێو هـاواری پڕ ژانـی ژنەکەیـەوە دەنگێکـی نزمـی بـەرگوێ دەکەوی، دەنگـی منداڵەکەیـە. دۆستویفسـکی بەهەشـتاو خـۆی دەگەیەنێتـە لای دەرگاکـە، بەشـان پـاڵێکی پێـوە دەنێـت و دەیکاتـەوە. بەسـەر تەختەکـەدا دادەنەوێتـەوە و دەکەوێتـە ڕامووسـانی دەسـتە ناسـکەکانی دایکـە گەنجەکـە. "کوڕە، وانا؟"

ژنەی پەرستار وەڵامی دەداتەوە: کچە، کچێکی جوان.

منداڵەکە بە قوماتکراوی دەدەنە دەست دۆستویفسکی، دوستویفسکی ماچی دەکات و هاوار دەکات:
-ئانیت، تەمەشا چەند جوانە.
مامانەکە، کە سەری لەم هەموو شادی و خۆشییەی دوستویفسکی دەسوڕمێ، هاوار دەکات: ئامان، لەم ڕووسانە!
دوستویفسکی پاشان، سود لە حاڵەتی ئەم منداڵ بوونە، بۆ وەسف و شڕۆڤەی، منداڵ بوونی ژنەکەی شاتوف لە ڕۆمانی شەیتانەکاندا دەبینێ. دەنووسێت: "شاتوف، لەبەر خۆیەوە، بەدەم هەڵچوونەوە. مەیلەو وڕێنە دەکات: دوو کەس هەبوون، کەچی لەناکاوا، کەسی سێیەم پەیدا بوو ، ڕۆحێکی تازە، تەواو، بێ کەم و کوڕی هاتە ئاراوە، شتێک کە هیچ دەستێکی بەشەری نەیتوانیوە شتی وەها بخوڵقێنێ، ئەمە فکرێکی تازە، ئەشقێکی تازەیە.. ڕووداوێکی سەیرە، هیچ ڕووداوێک لە دنیادا لەم ڕووداوە گەورەتر نییە."
دوستویفسکی، لە هەوەڵێن ڕۆژەکانەوە، زۆری خۆشویست، تا ڕادەی پەرستن خۆشی دەویست. دوستویفوسکی دەگاتە ئەو حاڵەتەی کە دەڵێت، کیژەکەی لە ئێستاوە ئەو دەناسێت، بۆی دەگرژێتەوە. لێی تێدەگات. لە شۆردنی کچەکەدا ئامادە دەبێت. بەخۆی قوماتی دەکات و بەدەستی خۆی سنجاق لە پەراوێزی قوماتەکە دەدات و توندی دەکات. لە باوەشی دەگرێت و لە هەمێزیا ڕایدەژەنێ و جۆلانەی پێدەکات. ئەگەر بگری، یەکسەر قەڵەمەکە دادەنێت و واز لەکاری نووسین دێنێ و شپرزە و نیگەران، بەهەشتاو بەرەو لای دەچێت.
لەنامەیەکدا بۆ مایکوف دەنووسێت: "ئەم شتە چکۆلە سێ مانگانە، وردیلەیە کە بەقەد بابۆڵە نانێک دەبێت، هەنوکە شێوەی تایبەتی خۆی هەیە، دەنگ و ڕەنگی تایبەتی خۆی هەیە.، ناگری،کە ماچی دەکەم چارەی خۆی گرژ ناکات، کە بەسەریدا دادەنەومەوە، لە گریان دەوەستێ."
ئەو پارەیەی کە کاتکوف بۆی نارد بوو، درا بە مامان و پەرستارەکە و کرێ خانووەکەیان و هەر زوو تەواو بوو. بۆیە دوستویفسکی لەبەر نالەباری وەزع و حاڵی خۆیان، لێبڕا، سەرێک لە ساکسون –لی –بان بدات و بۆ دواجار بەخت و شانسی خۆی تاقیبکاتەوە.
بەڵام ئەنجامەکە زوو دەردەکەوێت. دوستویفسکی لە ٤/١٦ دا نامەیەک بۆ ئانا دەنووسێت و دەڵێت: "ئانیت، فریشتەکەی من. هەرچیەکم پێ بوو دۆراندم. کە گەییمە ئێرە، چیم لەبەرکا بوو، لە ماوەی نیو سەعاتدا دۆراندم! ئیستا نازانم چی بەتۆی فریشتەی ئاسمانی من بڵێم، کە دەبێ ئەو هەموو ئازارە بەدەست منەوە بکێشیت. ئانێت بمبورە. من ژیانی تۆم تاڵ کردووە، ژارویم کردووە، بەڵام خوا بەوە ڕەحمی کردووە سونیات هەیە. من ئەڵقەکەم خستووەتە بارمتەوە. بەپەلە هەندێ پارەم بۆ بنێرە. بۆ قومار نا، دەمتوانی بەڵێنی ئەوەت بدەمێ، بەڵام هەرچی دەکەم و دەکۆشم، ناوێرم بەڵێنت بدەمێ، چونکە زۆرجار درۆم لەگەڵدا کردوویت.. ئێستا سەد فرانک بۆ من

بنێره، بۆ خۆت بیست فرانکێک یا کەمتر دەمێنێتەوە. گرینگ نییە دەتوانی شتێک بخەیتە سەر ڕەهنەوە. بەڵام من گەرەکمە بە زووترین کات بۆ لای تۆ بگەڕێمەوە."
بەدەم چاوەڕوانی گەیشتنی پارە لە جنێفەوە، ئەو پارەیەی، کە لە ڕەهنی ئەڵقەکەیدا وەری گرتبوو، دەدۆڕێنێ و تەنیا پەنجا سەنتی پێ دەمێنێ. هەر ئەو ئێوارەیە نامەیەک بۆ ژنەکەی دەنووسێت: "هاوڕێکەم، ئەمە دوا دەرس و عیبرەت دەبێت. عیبرەت و تۆبەی یەکجارەکی." و لە سەری دەڕوات : "فریشتەکەم، ئەوە بزانە کە ئەگەر ئەم ڕووداوە دزێو و ناخۆشە نەبا، ئەگەر ئەو دووسەد و بیست فرانکەم بەخوت و خۆڕایی نەدۆڕاندبا، مەحاڵ بوو بگەمە ئەم قەناعەتە دروستە، قەناعەتێک کە بەقازانجی هەموومان دەبێت و ڕزگارم دەبێ. بەڵێ گیانەکەم، پێموایە خوا بە ڕەحمەتی بەرینی خۆی، ئەم بویەرەی بۆ من پێشهێناوە. ئەم ڕوداوەی بۆیە بۆ ئەم قوماربازە بەدبەختە پێشهێناوە تا ڕێگای ڕاستی پێ نیشان بدات و لەو گیروفتانەی ڕزگار بکات و تۆ و سونیا و هەموومان ڕزگار بکات و یارمەتیمان بدات کە ئایندەی خۆمان دابین بکەین."
نامەیەک بۆ کاتکوف دەنووسێت و داوای بوردنی لێدەکات کە هێشتا دەستنووسی ڕۆمانی گەمژەی بۆ نەناردووە و پێشنیازی ئەوەی بۆ دەکات لەبری ئەو سلفە و پارانەی کە بۆ ئەمی ناردووە، ئەم مافی چاپی دووەمی ڕۆمانەکەی خۆی بەو بدات. داوای لێدەکات بەپەلە سێسەد ڕۆبڵی بۆ بنێرێت. ئەم پارەیەی کە بەر لە ٥/١ دەگاتە جنیف، یارمەتی دوستویفسکی و ژنەکەی دەدات کە بچنە ڤیڤی و لەوێندەر ئاکنجی ببن. کەش و هەوای ئەوێ لە جنیف خۆشتر دەبێ. دوستویفسکی بڕیار دەدات لەوێ کۆمەڵێک بەرهەمی باش و جدی بنووسێت و کە لە نووسینی ڕۆمانەکەی بووەوە، ئیدی بەخێزانی بڕۆن بۆ ئیتاڵیا.
ئیدی خۆشحاڵ بەم پڕۆژە تازەیەی، گەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی. بەڵام دوای چەند ڕۆژێک، سونیای ساوا، لە چوونە دەرەوەیەکیاندا سەرمای دەبێت و تووشی کۆکە دەبێت. دەچنە لای دکتۆر و دکتۆرەکە دەڵێت هیچ نییە و جێگەی نیگەرانی نییە. ئیدی دوستویفسکی زۆر نیگەران دەبێت، دەستی ناچێتە کاری نووسین. بەردەوام بەدیار کیژەکەیەوە دادەنیشێت و بە نیگەرانییەوە چاودێری دەکات، ئیدی ترسەکەی دێتە دی و سۆنیای ساوا لە ڕۆژی ٥/٢٤/دا، دەمرێت.
خەم و پەژارەی دۆستویفسکی لە ڕادەبەدەر دەبێت، بەدیار جەنازە بچکۆلەکەوە، دەست بە شین و شەپۆڕ و گریە و زاری دەکات، بەسەر دەموچاوە چکۆلەکەی و دەستە وردیلەکانیەوە دادەنەوێتەوە و ماچ بارانیان دەکات. ئیدی یارمەتی ژنەکەی دەدات و سونیای چکۆلە لە کفنێکی سپیەوە دەپێچن و ئیدی بەجوانی تەشریفاتی کفن و دفنەکەی ئەنجام دەدەن. کە یەکەم خاکەنازە گڵ دەخەنە گۆڕە چکۆلەکەوە وا هەست دەکات، جەزرەبەیەکی توند لە سینگ و بەرۆکی خۆی دەدرێ و بەڕاستی ئەو لە گۆڕ دەنەن.

هەموو خۆشی و ئاواتێکی ئایندەی ئەم کچە بوو. ئایندەی بەجۆرێ لەبەرچاوی خۆی بەرجەستە کرد بوو، کە دەبنە خانەوادەیەکی سێ. نەفەری ئیدی شەوان، بەدەم خوێندنەوە و بەجۆرەها خۆشی دیکەوە دەگەڵ سونیادا بەسەر دەبەن، بەڵام ئێستا هەموو ئەو خەیاڵ پڵاوەی کەڕووی هەڵهێنا بوو، ئەو چاوە ڕەشەی کاڵ بوو بووەوە. دوستیوفسکی، لە ژیانیدا، هیچ خۆشییەکی ئەوتۆی نەبینی بوو، تازە ئەم خۆشی و شادیەی هاتبووە ڕێ و زۆر دڵی بەم منداڵە خۆشبوو، ئەوەندە دڵی بەم منداڵە خۆشبوو، هەستی دەکرد ژیانی تەواو گۆڕاوەو باش بووە، کەچی زەمانە ئەوەشی پێ ڕەوانەبینی و کچەکەی مرد و ئیدی هەموو شتێک تەواو، لەمەودوا هەرگیز ئەو ڕوخسارە چکۆلە و جوانە نابینێتەوە، ئیدی برۆ تەنک و باریکەکانی نابینێتەوە، قامک بەملە فینکەکەیدا ناهێنێ، ئیدی نەیدەتوانی منداڵێک لەجادەدا بدینێ و منداڵەکەی خۆی وەبیر نەیاتەوە.

ئەم بیرانە ئازاریان دەدا، ناخیان دەهەژاند، باوەڕیان لەق دەکرد و بۆ یەکەمجار دەیەوێ، یاخی بێت و بەگژ قەدەرو چاوەنووسدا بچێتەوە. لە نامەیەکدا بۆ مایکوف، دەنووسێت: "ئاپولون نیکولایوفیچ، چی تیایە ئەگەر خۆشەویستی من بۆ منداڵە نۆبەرەکەم، بەلای خەڵکانێکەوە مایەی پێکەنین بووبێ، چی تیایە، لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە پیرۆزباییان لێکردبووم، وەڵامی پێکەنیناویم دابێتەوە. من تەنیا لای ئەوانە پێکەنیناوی هاتوومەتە بەرچاو. بەڵام بۆتۆ، هەرچیم بوێ دەینووسم، ترسم نییە. بۆ دڵخۆشی من پێم دەڵێن چ قەیدیە، منداڵی دیکەت دەبێت. بەڵام سونیا کوا؟ ئەو منداڵە چکۆلەیە کوا؟ کە ئامادەبووم لەپێناوی ئەودا لەخاچ بدرێم. من ئەم قسەیە لەناخی دڵمەوە دەکەم، ئەگەر بمزانیبا، بەو کارە دەتوانم زندووی بکەمەوە، بێ چەند و چوون دەمکرد. بەهەرحاڵ ژنەکەم لێرە کارو پیشەی بووە بەگریان، دوو سبەی ئەم گۆرە بچووکەمان بەجێدێڵین و لێرە دەڕۆین."

لە ئاخر و ئۆخری مانگی ئایاردا، دۆستویفسکی و ژنەکەی جنیف بەجێدێڵن، چونکە لێرەدا، هەموو شتێک سۆنیایان وەبیر دەخاتەوە. بە دەریادا دەڕۆن بۆ ڤیڤی. بەڵام لێرەش خەم و پەژارە بەرۆکی دوستویفسکی و ئانا بەرنادات، و ژیانیان لەبەرچاو دەکەوێ. ئانا، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێت: "هەرچی بیرو خەیاڵمان هەبوو، هەرچی قسەو باسمان هەبوو بە دەوری سونیادا دەسوڕایەوە. باسی ئەو ڕۆژە خۆشانەمان دەکرد، کە ئەو ژیانی ڕۆشن دەکردینەوە و ئێمە بەدیار بێشکەکەیەوە دادەنیشتین."

دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەنووسێت: "من هەرگیز ئەم ئازارەم لەبیرناچێتەوە، تەنانەت ئەگەر منداڵێکی دیکەشم ببێ، جێی ئەوم بۆ پڕناکاتەوە. نازانم چۆن دەتوانم منداڵی دووەمم خۆشبوێ. نازانم ئەو خۆشەویستیە لەکوێ بینم. من پێویستم بە سونیایە. هەرچی دەکەم و دەکۆشم، باوەڕناکەم کە ئیدی ڕۆیی، لەژیاندا نەماوە و جارێکی دی هەرگیز نایبینمەوە."

ئانا گریگوریڤنا، شــەوان بــەدەم خــەوی ناخۆشــەوە، دەگریــا، هــاواری دەکــرد، دایکــی لەســان پتروســبورگەوە هــاتبوو و دڵخۆشــی دەردی دەدایــەوە، بــەڵام بێفایده بوو. ڤیڤی شارێکی چکۆله بوو، شوێنی گەشــت و گــەڕانی تیــا نــەبوو. دیمــەنی دەریاچــە شــین و بەتەمتومانەکــەی، تێکــەڵ بــە کوێســتانە ســەر بــە بەفرەکان دەبوو، و بەئاســمانەوە دەدرەوشــانەوە. هــەموو ئــەم دیمەنــە جــوان و دڵگیرانــە، کــە بــۆ جیهانگــەڕان و گەشـــتیاران ئارامبــەخش و دڵگیــر بــوون، سوکناییان بەدڵەی خەمینی دوستویفسـکی نەدەبەخشـی. خـۆی و ژنەکـەی نـەخۆش کـەوتن. وای تەســەور دەکــرد، تــا ڕۆمانەکــەی تــەواو نــەکات، چــاک نابێتەوە و وەخۆنایەتەوە:" من زۆر لــە ڕۆمانەکــەم بێــزارم، دەســتم تێــی نــاچێ، بەڵام ناچارم کاربکەم، به نەبەدڵی کار دەکەم. ئەگــەر بتــوانم ڕۆمانەکــەم تــەواو بکەم، هەنگێ چاک دەبمەوە، وەخۆدێمەوە، دەنا تیادەچم، لێدەبمەوە."

لەم ماوەیــەدا، ئــەو نامانــەی کــە بــۆ ڕووســیای دەنــاردن، لــە لایــەن پــۆلیس و ئاسایشــی ســان پتروســبۆرگەوە، کــۆنتڕۆڵ دەکــران. سانســۆرو چاودێرییــەکی توندی خرابووە سەر، ئەمە زۆری نیگەران دەکرد. ئیـدی بـۆی دەردەکـەوێت کـە تەنانەت کەشیشە ئەرتەدوکسیەکەی "جنیف"ش، پیاوی ئاسایشــە و تــاقیبی دەکــات. دوســتویفســکی، نامەیــەکی بــێ نــاو و ئیمــزای پێــدەگات و ئاگــاداری دەکاتەوە، کە ئاگای لەخۆبی، هەرکە بگەڕێتەوە بۆ ڕووسیا، لــە ســنووردا، دەی پشــکنن. هــەر لــەو ماوەیــەدا کتێبێکــی قەدەغــە و یاســاغی بەناونیشــانی "نهێنییەکانی کۆشکی تزاری" لە لایەن کەسێکی نەناســەوە، بــە پۆســتەدا بــۆ دەنێردرێــت. لــەم کتێبــەدا نــاوی دوستویفســکی و ژنــی یەکــەمی وەکــو دوو قارەمانی دورخراوە لە وڵاتــی خــۆ، بــراوە. هــەروەها لــەم کتێبــەدا باســی ئــەوە کراوە کە دۆستویفسکی مردووە و ژنەکـەی پـەنای وەبـەر دێرێـک بـردووە. ئـەم نامیلکە ئاڵۆز و بێ ناونیشــانە دوستویفســکی زۆر پەســت دەکــات. داخۆیانێــک دەربارەی ئەم کتێبە دەنووسیت و بــەدرۆی دەخاتــەوە، بــەڵام بــۆ بڵاوکردنــەوەی نانێرێت. ئێستاش ڕەشنووسـی ئەم داخۆیانە ماوە کـە دەڵێـت: "تانـەو بوختانـان چەندیش ناماقوول و بێ مانا و درۆبێ، کاریگەریی خۆی هەر دەبێت."

دوستویفسکی و ژنەکەی لە هەوەڵی هــەیڤی ئەیلوولــدا لــە سویســراوە بــۆ ئیتاڵیا دەڕۆن. سەرەتا لــە میلانــۆ لادەدەن، بــەڵام چونکــە میلانــۆ، شــارێکی بــە باران و هەور و هەڵا دەبێت، دوستویفسکی هەست بە بێتاقەتی دەکـات و زوو بێزار دەبێ. لەوێ هیچ کتێبێکی ڕووسـی دەسـت ناکەوێت. دەنووسێت: "لێـرەدا هیچ بەرهەمێکی ڕووسـی نییــە، ئــەوە بــۆ شــەش مانــگ دەچێــت نــە کتێبێکــی ڕووسی نە ڕۆژنامەیەکی ڕووسیم بەچاو نەدیتووە. بیرۆکـەی ڕۆمـانی "گــەمژە" بەتەواوەتی ڕەویوەتەوە."

داوا لــە مــایکوفی هــاوڕێی دەکــات کــە لــە خەبــەر و بــاس و هەواڵــەکانی ڕووسیای ئاگـادار بکاتـەوە. مـایکوف هـەواڵی دەرچـوونی ڕۆژنامەیـەکی تـازەی بــەناوی "ئەلەنــد" پێرادەگەیــەنێ و ســتراخوف، کــە جــاران هاوکــاری دەگــەڵ هــەردوو ڕۆژنامــەی "زەمــان" و "ســـەردەم"دا دەکــرد، سەرنووســەری ئــەم ڕۆژنامەیەیــە. دۆستویفســکی، بــەم هەواڵــە هــەم خۆشــحاڵ دەبێــت و هــەم

پەست، چونکە هەردوو ڕۆژنامەی زەمان و سەردەم پەیوەندییان بەوەوە هەبوو. نامەیەک بۆ ستراخۆف دەنووسێت و دەڵێت: "کەواتە دەشێت بگوترێ کە کاری هاوبەشی نێوانمان بە فیڕۆ نەچووە.. مایەی شانازیە ئەم کارە تازەیە لەهەمان شوێنەوە، دەست پێبکا، کە ئێمە لێی داپڕاین."
دوستویفسکی و ژنەکەی لە میلانۆوە بۆ فلورانسا دەڕۆن و لەوێندەر لە نزیکی پاڵاس پیتی، ماڵێک بەکرێ دەگرن و ئاکنجی دەبن. دوستویفسکی و ژنەکەی هەردووکیان ئەم جێگۆڕکێیەیان پێخۆش دەبێت و بە دووقۆڵی سەری کڵێسا و مۆزەخانەکانی شار دەدەن.
دوستویفسکی، بەتاسەوە، دەچێتە تەمەشای بەرهەمەکانی ڕوفائیل، نیگارکێشی دڵخوازی خۆی و پڕ بە دڵ ستایشی بەرهەمەکانی دەکات. ئەنجام لەم شارەدا کتێبخانەیەک دەدۆزێتەوە، کە ڕۆژنامەی ڕووسی دەبێت. لەوە بەدواوە هەموو ڕۆژێک، دەچێت بۆ ئەوێندەر و پاش نیوەڕان، لە هۆڵی خوێندنەوەی ئەو کتێبخانەیەدا بەسەر دەبات.
کاتکوف، بە بەردەوامی و بەڕێک و پێکی مانگانەکەی بۆ دەنێرێت.. دوستویفسکی لەو ڕووەوە هیچ کێشەیەکی نایێت. نووسینی ڕۆمانەکە باش دەچێتە پێشێ. تەنانەت دۆستویفسکی لێدەبڕێت، زووتر لەکاتی قەراردادەکە، ڕۆمانەکە تەواو بکات و ڕادەستی کاتکوفی بکات: "ئەگەر خوێنەرانێک هەبن، پەیگیری گەمژە بکەن، کەمێک لە کۆتاییە چاوەڕوان نەکراوەکەی سەریان دەسوورمێ، بەڵام ئەگەر کەمێک باش لێی ورد ببنەوە، تێدەگەن کە جگە لەو کۆتاییە، هیچ کۆتاییەکی دیکەی هەڵنەدەگرت."

## فەسڵی دەیەم
## گەمژە

گۆڤاری پەیکی ڕووسیا، لە هەوەڵی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٦٨وە کەوتە بڵاوکردنەوەی ڕۆمانی گەمژە. دووستویفکی دەربارەی ئەم ڕۆمانەی خۆی دەیگوت هەرگیز، بابەتی لەمە دەوڵەمەندتر و گرینگتری لە هزر و بیری خۆیدا مالیجە وتاوتوێ نەکردووە، بەڵام نەیتوانیوە تەنانەت گوزارشت لە دە یەکی بیرو بۆچوونەکانی خۆی بکات. لە ڕاستیدا، ڕۆمانی گەمژە لەگەڵ شەیتانەکان و برایانی کارامازوفدا بەیەکێک لە ڕۆمانە هەرە گرینگ و سەرەکییەکانی دێتە ژماردن. کورتەی ڕۆمانەکە بریتیە لە:

میرزاده میشکین، کەسێکی فێدارە، لە نەخۆشخانەیەکی سویسرا، کە پرۆفیسۆرێکی بەناوبانگ لە چاکەی خۆی و لە ڕووی بەزەیی و مرۆڤدوستیەوە، مالیجە و دەرمانی کردووە، دێتە دەرێ. هەتیوە، هەموو موڵک وماڵەکەی بریتیە لە بوخچەیەکی چکۆلە کە جلک و بەرگەکانی تێخستووە. هیچ شتێک لەمەڕ ژیان و گوزەران نازانێ، فڕی بە دنیاوە نییە. دکتۆرەکەی پێی گوتووە: "من قەناعەتی تەواوم هەیە کە تۆ منداڵێکی ڕاستەقینەیت، یانی منداڵ، بەهەموو مانای وشەی منداڵ. تۆ تەنیا بەقەدو قەڵافاتدا، گەورەیت. تۆ لەڕووی گەشەکردنی ڕوحی و دەروونییەوە، لەڕووی تەبع و تەبیعەتەوەو بگرە لەڕووی گەشەکردنی ئەقڵیشەوە، پیاوی تەواو نیت، ئەگەر شەست دانە ساڵیش بژی، هەر بەم حاڵەوە دەمێنێ و گەورە نابیت."
ئەم منداڵە بیست و شەش ساڵانە، کوڕێک بوو بە ئەدەب، خاکەسار و بێ فیز و دەعیە، شەرمن، دڵپاک و سادە. دەتوانی بڵێی نەژیابوو. یانی بەپراکتیکی مومارەسەی ژیانی نەکرد بوو، هەموو ژیانی بەخەیاڵ و لەخەیاڵدا بردبووە سەر، یانی لەدەرێی دیوار و چوارچێوەکانی کۆمەڵگەدا دەژیا، لە دەرێی هاوکێشەی لۆژیکی "دووجاران دوو دەکاتە چوار" بوو. دوور بوو لەهەر تەماسێکی جڤاکی و کۆمەڵایەتی. کە ڕێگەی دەکەوتە یەکێک لە شارە گەورە و قەرەباڵغ و پڕ حەشیمەتەکان و تێکەڵی خەڵکانی حیلەباز و تەمەعکار و حەسوود و بەغیل و داوێنپیس و لیبۆک و هەمیشە مەست، دەبوو، وەکو غەوارەیەک یا میوانێکی ناوەخت دەهاتە بەرچاو.
کە دەگاتە شاری سان پترۆسبورگ، یەکەمجار دەچێتە دیدەنی جەنەڕاڵ ئیپانچین، کە دوورە خزمایەتیەکی دەگەڵیدا هەبوو. میرزادە میشکین بە ئومێدی ئەوە دەبێت کە جەنەڕاڵ هەندێک ئامۆژگاری و ڕێنوێنی بکات و بیخاتە سەر سکەی کارێک و بۆ خۆ بژی.
بەڵام میرزادە میشکین، هەرکە لەتەنیایی و گۆشەگیرییەکەی خۆی وەدەردەکەوێ و تەماس دەگەڵ خەڵکیدا پەیدا دەکات، شپرزەیی و دەستەپاچەیی و خەشیمییەکەی دەردەکەوێت. ئیدی ڕازی قسە دەگەڵ سکرتێرەکەی جەنەڕاڵدا دادەمەزرێنێ کە بەرپرسی پێشوازی میوانانە. ئیدی بەتانی قساندا دەچێت و نایبڕێتەوە. لە بەرچاوی سکرتێرەکەی جەنەڕاڵدا، کۆمەڵێک کاری ناشیانە ئەنجام دەدات. پاشان بەدەم خوتبەیەکی دوور و درێژەوە کە ئەزبەزی کردبوو، گوڵدانێکی چینی دەشکێنێ، ئەم گوڵدانە بۆ خۆی ڕەمز بوو، ڕەمزی دنیای مەتریال، کە میشکین گەرمی قسان دەبێت و دەکەوێتە ژێر باندۆرو کاریگەری قسەکانی خۆیەوە، خۆی پێدا دەکێشێت و دەشکێت.
وێڕای ئەمەش، ئەم کابرای گوڵدان شکێنە، کەسێکە ڕوح سووک و خۆشەویست. کەس بوغزی لێهەڵناگرێت، بەفرەوێژیە سادەکانی خۆی، دەوروبەر وەڕەزو بێزار ناکات. زۆر بەسادەیی بە نەرم و نیانی، بەدوور لە هەر بەدنیهادییەک، مامەڵە و بەرخورد دەگەڵ خەڵکیدا دەکات و بەمەش بەرانبەرەکەی لە هەر دژمنایەتیەک چەک دەکات. ڕاستە گاڵتەی پێدەکەن،

تەشــەری لێــدەدەن، ڕێــی ڕێدەکــەنن، بــەڵام هــیچ گــەوجاتی و هەڵەیــەکی لێناگرن، وەکو چۆن هەڵەی زمانەوانی لە بابایەکی بێگانە نـاگرن، بـەو ئاوایـەش هیچ هەڵە و کەموکورییەک لەو نـاگرن. وا هەسـت دەکـەن بابایـەکی غـەدیبی بیانییــەو خــەڵکی ئێــرە نییــە، مــاقووڵ نییــە، داوای لێبکــەن، وەکــو ئــەمان و بــەگوێرەی داب و نــەریتی ئــەمان ڕەفتــار و هەڵســوکەوت بکــات. بــەڵام ئــەم ڕێبــوارە، ئــەم غەوارەیــە، کــە لەیەکــەم بــەرخوردا، وا دەردەکــەوێت، هــیچ جــۆرە خوێنەواری و ڕۆشنبیرییەکی نییە، لەڕاسـتیدا خـاوەن خوێنـەواری و ڕۆشـنبیری تایبەتی خۆیەتی. ڕۆشـنبیریی و زانیاریـەکی ئـەوتۆی هەیـە کـە خـەڵکانی نـاو چوارچێوەو دیوارەکانی ئەم دنیایە، هەرگیز ناتوانن بگـەن بـە تـۆزی ڕێیـداو پـەی بەو فەرهەنگ و ڕۆشـنبیرییە بـەرن. ئـەو فـام و لـۆژیکی تایبـەتی خـۆی هەیـە. کیژەکەی جەنەڕاڵ پێی دەڵێت: "ئـەقڵ و فـامی سـەرەکی و بنـەڕەتی تـۆ، زۆر زیاتر لەهی خەڵکانی دی، نەشونما و گەشـەی کـردووە. ئـەقڵ و فـامی تـۆ لـە ئاستێکدایە کە خەڵکی لەخەویشـدا شـتی وابـەخۆوە نـابینن. جونکـە دوو جـۆرە ئـەقڵ و فـام هەیـە، ئـەقڵ و فـامی سـەرەکی و بنـەڕەتی و ئـەقڵ و فـامی لاوەکی، وانییە؟"

لەڕاسـتیدا، سـەرانسـەری ڕۆمانەکـە، تاکیـد لەسـەر ئـەم خاڵـە دەکاتـەوە کـە "ئەقڵی سەرەکی بە تۆبزی بخرێتە قەڵمڕەوی ئەقڵی لاوەکییـەوە." ئـەم ئـەقڵ و فامە سـەرەکییە، کـە لـە دەرێـی یاسـاو فرمـۆڵی هـۆ و ئـەنجام و نـاکۆکی و هەڤدژیە، لە دەرێی هاوکێشـەی ئەخلاقە، ئـەقڵ و فـامێکی نادیـار و عاتیفییـە، لە هەر شـوێنێکدا، تۆ و بدرێت، پەشـێوی و نیگـەرانی لێدەکەوێتـەوە. میشـکین وەکو هەوایەکی تازە خۆی بـەم هاماجـە سـنووردارەی کۆمەڵگـەدا دەکـات. لـە هەوەڵــەوە، بــە تــەوس و توانجــەوە، بــەڕیش خەنــەوە، وەکــو کەســێکی زبــر، پاشــکەوتوو و بگــرە گــەمژە پێشــوازی دەکرێــت. کــاتی خــۆی دایکیشــی بــەو نەفەسـە مامەڵەی لەتەکدا دەکرد کە گەمژەو گێلە. بـەڵام ئـەم گەمژەیـە، ئـەم پاشـکەوتووە، پرەنسـیپە هـەرە جێگیـر و سـەرەکیەکانی کۆمەڵگـە دەخاتـە بـەر پرسـیار. ئەم ئینسانە کە لەڕووی دەروونی و سـایکولۆژییەوە، لاواز و بـێ ئـەقڵ دەنوێنێ، خەڵکە ئاقڵەکە وادار دەکات کـە بیـر بکەنـەوە. کـار گەییوەتـە ئەمـەی کە بوونی ئەم کابرا غەوارەیە، ئەم میوانی ناوەختە، ببێ بـە زەرورى. خـوا ئـەو خوایەیە کە ئەم کابرا لاوازە، بێئەوەی بیەوێ، بـەهێزەکان کـەوی و ڕام دەکـات. دڵنیایـە کـە هـەموو ئـەو خەڵکـەی دەورەبـەری، خـەڵکانی بـاش و جـوامێرن. و هەموو ئەویان خۆش دەوێ. میشکین، بە هـەمان نەفەسـەوە مامەڵـە لەتـەک ناڕەسـەنان و پیاوخراپاندا دەکات کە دەگەڵ خـەڵکانی زۆر میهرەبـان و دلۆڤـان و پاک نیهاداندا دەیکات و، بەمجۆرە خـۆی لەشـەڕی پیـاو خراپـان دوور دەگرێـت و دۆست و یاران بۆ خۆی پەیدا دەکات.

ئیـدی خەڵکەکـە بـاش دەبـن، چونکـە ئـەم، ئـاوای دەوێـن. ئیـدی بـووە بـە مەڵبەندی گۆڕینی هێز، دەبێتە مایەی سـەرنج . خەڵکانی خۆپەسـند و لووتبـەرز و بەفیز و دەعیە، لە سایەی سـەری ئەوەوە، فێری خاکـە سـاری و خۆشـکێنی و ئەدەب دەبـن. خـەڵکانی خۆپەرسـت دەرگـای ڕوحـی خۆیـان بـەڕووی تۆبـە و

پەشیمانیدا دەکەنەوە. ئەو خەڵکە بێزار و ناڕازییانەی کە هەر خوتە و بۆڵەیانە سەرلەنوێ، بێگەردی و سەفاو سادەیی منداڵیەتی وەدەست دێننەوە. دیدار و بەرخورد دەگەڵ ئەودا دەکاتە کارێک، کە کینە و شەرم و شەرمەزاری بۆ ماوەیەک لەبەرچاوی ئینسان ڕەوێتەوە. ئیدی ژیانی هەر کەسێک مانایەک پەیدا دەکات کە زەمینی نییە. لە ڕوانگەی خەڵکیەوە، ئەو نموونەی بوونەوەری جیهانێکی دیکەیە. جیهانێکی دیکە کە دەشێت بۆ ئێمەش بێتە دی. ئەو کار لە هەموو ئەو کەسانە دەکات کە گوێ لە قسەکانی دەگرن یا دەیبینن. هەر کەسێک کە مامەڵەی لەتەکدا بکات و بیناسێت، ئیدی دەگۆڕێت، دەبێ بەکەسێکی دی. بەڵام ئەوانەی کە زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەری سیحر و ئەفسوونی ئەوەوە، زیاتر خەڵکانی بە زەبر و زەنگ و گومڕان، ئەوانەن کە لەداب و نەریتی کۆمەڵایەتی یاخی بوون، ئەوانەن کە سنوورانیان بەزاندووە. کێ بۆ یەکەمجار ئەوی ناسی و لێی تێگەیی؟ ڕوگوزین، ئەو فرۆشیارە دڵڕەقەی کە لەکۆتایی ڕۆمانەکەدا، ماشقەکەی خۆی دەکوژێت. هەروەها ناستاسیاش، ژنە بەدکارەکە دەیناسێت بۆچی؟ چونکە ئەوانە لەهەموو داب و نەریتێکی باوی کۆمەڵایەتی دەرچوو بوون. ئەوانە دیوارەکانیان پڕی بوو. ئەوانە بەڕاستی ڕێگایەکیان گرتبووە بەر، کە لەدەرێی ئەو حەسارە بوو، کە جاران دەوری دابوون و تیایا قەتیس مابوون. ئەوانەی کە کەوتبوونە سەر ئەم ڕێگایە، لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئازادی بەدەست بێنن. ئەوانەی کە گوناحیان کردبوو، خراپەیان کردبوو، لە حەقیقەتەوە نزیکترن، لەو کەسانە زیاتر شایستەی حەقیقەتن، کە هیچ هەوڵێکیان بۆ وەدەست هێنانی ئازادی نەداوە. ئەشق عوزرو هەنجەتی خۆی هەیە، ئەشق و هەڵچوون، ئەگەر تاوانکارانەش بێ، لە بێدەنگی و نەجوڵان، بایەخدارترە. هەڵبەتە لەنێو دۆستەکانی میشکیندا، جگە لەوانەی کە لە "دنیا –زندان" هەڵاتبوون، کە هێشتا نەهاتبوونە زندانی جیهانەوە: منداڵان. منداڵان ڕۆحێکی نەرمی ئەوتۆیان هەیە کە ناچاری و گوشار نافامن. سنوور ناناسن. هێشتا دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخساوە، کە حەسارێکی نەگۆڕ و جێگیر لە دەوری خۆ بکێشن، نۆرینێکی سنووردار دەربارەی جیهان بەسەرخۆدا بسەپێنن. بۆ ئەوانە، هەموو شتێک لە جوڵاندایە، وەستان لەئارادا نییە. هەموو شتێک هەر خۆشبەختیە. هیچ شتێک بەهیچ شتێکی دیکەوە پەیوەست نییە، هەرشتێک دەتوانێ شتێکی دیکەی لێببێت. جا ئەم خەڵقەندە تازانە، ئەم "چۆلەکانە" بە تەبیعەت، خۆڕسک ئەو جۆرەن، کە خەڵکانی دی دوای ئەزموونانی تاڵ و ترسناک، وەکو ئەوانیان لێبێت. ئەوان لە باوەشی سروشتدا دەژین، نزیک لەخودا دەژین. پاشان، باوەڕ بەیاساو ڕێسا و داب و نەریتە مرۆڤانیەکان دێنن و هەنگێ بۆ وەدەست هێنانی ئازادی، هەموو ڕێگایەک دەگرنە بەر، خۆ لە قەبەڵی ئازادی دەدەن. داک و بابی ئەوانە، مامۆستایانی ئەوان، هەر بە منداڵی پیریان دەکەن. دەکرێن بەزانا، بە هزرڤانی وشک و ساردو سڕ. بە بورژوایانی هەستیاری ئەوتۆ کە هەموو خەم و خولیایەکیان خۆشگوزەرانی بێ، دەکرێن بە دێو و دڕندە. بەڵام حاڵی حازر، چونکە هێشتا منداڵن، کەرەستەی خاون، بۆیە هاورێی میشکینن،

میشکینیش وەکو ئەوان بچووکێکی وێڵ و ونە لەسەرای گەوراندا. دەڵێت: "خەڵکانی گەورە نازانن کە هەندێجار منداڵێک دەتوانێ سەبارەت بە دژوارترین مەسەلە، ئامۆژگاری زۆر بەسوودی خەڵکی گەورە بکات. ئاهـ! خودایا! کاتێ ئەم باڵندە جوان و چکۆلەیە بەو هەموو شادی و متمانەیەوە تەمەشای تۆ دەکات، چەند شەرم و شورەییە، فریوی بدەی. من ناوم ناون باڵندەی بچووک، چۆلەکە، چونکە چۆلەکە، باشترین و جوانترین خەڵقەندەی سەر ڕووی زەویە... بەڵام سەبارەت بە تیبو (مامۆستای قوتابخانەکە) ڕق و کینەکەی، تەنیا حەسوودی و غیرە بوو: لە سەرەتاوە سەری دەلەقاند و سەری لەوە دەسوڕما کە من هەرچیەکم دەگوت، منداڵەکان یەکسەر تێی دەگەیشتن، کەچی خۆی نەیدەتوانی، مەبەستەکانی خۆی لێیان بگەیەنێ. پاشان، کاتێ من پێمگوت ئێمە، نە ئەو و نە من هیچ شتێکیان فێر ناکەین، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەوان ئیمە فێر دەکەن، گاڵتەی پێکردم."

هزرڤانان و زانایان بەرانبەر بە ئاسمان حەسارێکیان لە حەقیقەتی بەشەری دروستکردووە و قوت کردووەتەوە، کە لە نورو ڕوناکی باڵایان مەحرووم دەکات. خۆبینی و خۆپەسەندی تایبەتی ئەوان، لەمپەرێکی لەنێو ئەوان و حەقیقەتدا، چێکردووە. "خودا، ئەوەی بۆ منداڵانی نواندووە و ڕونکردووەتەوە، لە ئەقڵمەندان و فامایانی پەنهان کردووە."

(ئەو ڕستەیەی نێو کەوانەکە، ئایەتێکی ئینجیلە، ئینجیلی مەتی، بابی یازدە، ئایەتی ٥٢)

لەنێو هەر هەموو ئەو شۆرشگێڕ و ئەو یاخیانەدا، جۆرە برایەتیەکی پەنهان و سەیر هەیە. ئەمانە کە لەدنیای دوورە دەستی عاتیفە و سۆزدا وێڵ و سەرگەردان بوون، لە دنیای پاراسایکۆلیژیدا یەکدەگرنەوە. ئەمانە پیش هەر کردەوەیەک، نیاز و مەبەستی یەکدی دەخوێننەوە و پەی پێدەبەن. سەبارەت بە ئایندە. مەزەندە و ئیشراقی پێغەمبەرانەیان هەیە، توانای پێشبینی کردنیان هەیە. ئەم خەیاڵپەروەرانە کە دەگەنە لوتکەی نەشەی خەیاڵ، ئیدی هیچ شتێک سەرسام یا نائومێد و خەمباریان ناکات. بۆیە کاتێ لە گەمژە دەپرسن ئایا ئەگەری ئەوە هەیە کە ناستاسیا و ڕوگوژین زەماوەند بکەن، بەوپەڕی سادەیی وەڵام دەداتەوە: "بەڵێ، باوەڕم وایە کە لەمڕۆ زووتر نییە، زەماوەند دەکەن، بەڵام ڕوگوژین، دوای هەشت ڕۆژ، لەوەیە بیکوژێت." کاراکتەرێکی دیکەی ڕۆمانەکە دەڵێت: "من دەترسم، نازانم بۆ؟ لێ دەترسم. وا هەست دەکەم شتێک بەئاسمانەوەیە، بەڵایەک ،نەگبەتیەک وەکو شەمشەمە کوێرە، بە هەموو لایەکدا دەفڕێت. من دەترسم، زۆر دەترسم."

ناستاسیا، بەڕوونی پێشبینی مەرگی خۆی دەکات. دەربارەی ڕوگوژین دەڵێت: "من دەتوانم بیکوژم، چونکە زۆری لێدەترسم، بەڕادەیەک لێی دەترسم دەتوانم بیکوژم... بەڵام ئەو دەست پێشکەری دەکات و من دەکوژێت..." میرزادە میشکین، چەقۆیەک لەسەر مێزەکەی ڕوگوژین، دەبینێ، بەدیتنی ئەو چەقۆیە، تەنانەت ئەو چەکەشی دێتە بەر زەین و مەزەندە کە

تاوانبار پاشان بەکاری دەبات: "ئایا تۆ ئەم چەقۆیەت بۆ هەڵبڕینی لاپەڕەی کتێبە؟
-بەڵێ بۆ بڕینی لاپەڕانە.
-بەڵام چەقۆیەکی زۆر تازەیە.
کاتێ گەمژە، لەنک خانەخوێیەکەی وەدەر دەکەوێت، لەخۆی دەپرسێت: "باشە ڕوگوژین، بەنیازی کوشتنی کەسێکە؟"
پاشان، بەبێ ئەوەی پێشوەختە پیی بگوترێ، دەڕوات بۆ لای ڕوگوژین، تەنیا لەبەر ئەوە دەڕوات کە هەستێکی پیشوەختە لە دڵی چەقیوە، کە شتێکی خراپ، بەڵایەک ڕووی داوە. ڕووگوژین لەبەر ماڵەکەی خۆیدا چاوەڕوانی دەکات، چونکە پێشوەختە پێشبینی ئەو دیدارەی کردووە. پێی دەڵێت: "لیون نیکولایوفیچ دوای من بکەوە، دۆستی من پێویستە دوام بکەوی."
هەرچەندە، ئەم بوونەوەرانە، ئەو جۆرە ئاگادارییەیان دەربارەی چارەنووسی تایبەتی خۆ هەیە، بەڵام ناتوانن خۆ لەو مەترسیانە ببوێرن کە دێنە ڕێگایان. پێدەچێ نەزانن، نەتوانن، نەیانەوێ خۆ لەو هەڵدێرە دور بگرن، کە بەرەو ڕووی دەچن. ئەمانە کۆیلەی ڕۆشنبینی و دووربینی خۆیانن. ئەمانە بەسەر ژیانی خۆدا زاڵ نین، بەڵکو تەنیا هەست بەو ژیانە دەکەن. ئەمانە تاسەمەندی هەست و سۆزی توند و بەهێزن. نە عەوداڵی بەختەوەرین، نە کوێرەوەری و نائومێدی. تەنیا ئەوەیان گەرەکە هەست بە بوونی خۆ بکەن. هەموو دەردو ئازارێک قەبوڵ دەکەن، تا سنووری ئەم بوونەی خۆ دیاری بکەن. من ئازار دەچێژم کەواتە هەم. من تەحەمولی ئازار دەکەم، بەسەریا زاڵ دەبم کەواتە دەبێ هەبم. هەرکەسێک ڕێگە بدات، بویەر و ڕووداوان بیهەژێنن بەرەو خودا دەڕوات. هەر کەسێک خۆی لە ڕێڕەوی بویەران دوور بگرێت، لەخوا دوور دەکەوێتەوە.
"ئەوەی بیەوێ ژیانی خۆی بپارێزێت، لە دەستی دەدات، ئەوەی ژیانی لەبەر خاتری من لەدەست بدات." پیی دەگات." (پروانە ئینجیلی مەتی، بابی دە، ئایەتی سی و نۆ)
ڕۆمانەکە بریتیە لە زنجیرە ڕووداوێکی ناخۆش وکارەساتبار. دیارە هەموو ڕووداوەکان لەلایەن "کاراکتەرانی هەستیارەوە" پێشبینی کراون، بەڵام هیچ یەکێک لە ڕووداوەکان، بە ئیرادەوە پێشگیری لێنەکراوە. قارەمانەکانی دوستویفسکی هیچ ئارەزوویەکی دیکەیان نییە، تەنیا ئەوە نەبی بگەنە ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی ماڵوێرانی و سەرگەردانی و نابووتیان. میرزادە میشکین "نموونەی باشی ڕەها" تازە هاتووەتە ماڵی جەنەڕاڵ ئیپانچین. خۆی لە هەموو کێشە و ڕووداوەکان هەڵدەقورتێنێ. خۆی لە هەرکارێک کە پەیوەندی بەوەوە نییە، هەڵدەقورتێنێ و ئاسوودەیی ژیانی خۆی دەشێوێنێ. کاتێ کە سیما و ڕوخساری ناستاسیا لەوێنەیەکدا دەبینێ و جۆرە ئازارێکی سەیری تیا بەدی دەکات. لێدەبڕێت ناوی خۆی بەم ژنە، بەم ژنە گوناحکارە بدات. هەرچەندە دەزانێت ئەم کارو هەڵوێستەی ئەو، کارێکی بێهودە و بێفایدەیە. ئیدی لەسەر ئەم ژنە هەڤڕکی ڕوگوژینی شووم و کێوی دەکات و

دەیەوێ ئەم ژنەی لەدەست دەربێنێ. بەڵام کاتێ دەگەڵ ڕوگوژیندا پێک دێن، گەمژە زۆر چاک دەزانێت کە ئەم پیاوە ناستاسیا دەکوژێت. ناستاسیاش بەخۆی دووی ڕوگوژین دەکەوێ. چونکە ڕەدووکەوتنی ئەم پیاوە گەورەترین هەڵەیەکە کە بتوانێ بیکات "ڕوگوژین"ش ناستاسیا دەکوژێت و زۆر چاک دەزانێ کە لەم کارە ژێوان دەبێتەوە و بەدرێژایی ژیانی دووچاری کەسەر و پەشیمانی دەبێت. ئیدی بکوژەکە و پیاوە هەرە باشەکە. لەبەردەم جەنازەکەی ژنەی تایندا ئاشت دەبنەوە چونکە هەستدەکەن کە لە دوائەنجامدا کارێکیان کردووە، کە دەبوایە بکرێت. "ڕوگوژین، بەدەنگی بەرز هەندێ قسەی هەلەق و مەلەق و وڕێنە ئاسای دەکرد.. هەنگێ میرزادە دەستە لەرزۆکەکانی بەرەو لای وی درێژ کرد، بە هێمنی دەستی بەسەریدا هێنا، قژی و گۆناکانی نەوازش کرد... و لەوە زیاتر هیچی دیکەی لەدەست نەدەهات."

ئەم ڕۆمانە بەڕواڵەت دڵداریە، یەکەمین ڕۆمانی ئەڤینداریە کە دوستویفسکی نووسیویەتی. وێڕای ئەمەش، ئەو حاڵەتە ئاشقێنیانەی کە تان و پۆی ڕۆمانی گەمژەیان پێکهێناوە، بەها و بایەخی ئەشق و خۆشەویستی ڕاستەقینەیان نییە. ئەمانە تەنیا کۆسپ و لەمپەرانن و دەبێ بپردرێن، نەک وێستگەی ئیسراحەت و پشوودان، نەک وێستگەی ئومێد بەخش. ئەم ئەشقانە، تەنیا قۆناغن بەرەو حەقیقەت. خودی حەقیقەت نین. ئەشق لەنک دوستویفسکی هەرگیز نیشانەی ئاسوودەیی دەروون یا جەستە نییە. ئارەزوو لای ئەو هەرگیز پاراو نابێ و کۆتایی نایەت. هیچ کردەیەکی سێکی بەتەواوەتی نەهاتووەتەدی. ژن لەلای ئەو تەنیا وەکو میانچی، بوونی هەیە. ژن و شوێنی ژن لەنێوان پیاو و خوادا، بۆ ئەوەیە کە پیاو لەئازار ئاگادار بکاتەوە، تا پیاو ئازار بدات، تا سووکی بکات، تا دووبارە بەرزی بکاتەوە، تا لە مەرزی داب و نەریت و یاساو ڕێسای ئەخلاقی بیباتە دەرێ. بەدەم حیرەت و سەرسامیەوە بیخاتە جیهانێکی تازە و ئازادی ئەوتۆوە کە قابیلی شەرح و شرۆڤە نییە. ژن نیشانەی فیتنە و ئاشوبێکە، کە دەبێ دوا ئارامی و هێوری بەدوودا بێت و لێبکەوێتەوە.

زۆر زەحمەتە لە ڕۆمانەکانی دوستویفسکیدا ژنێکی وەکو ئانا کارنینا یا ناتاشای تولوستوی، یا تاتیانای پوشکین، یا مەدام بوڤاری یا ئوجینی گراندە بدۆزێتەوە و دەوری شا قارەمان ببینن. ڕۆمانە گەورە و سەرەکییەکانی دوستویفسکی، ڕۆمانی پیاوانەن ئینسانناسی دوستویفسکی، بیردیاییف گوتەنی ئینسانناسییەکی نێرانیە. ژن لەبەرهەمەکانی ئەودا بایەخێکی گەورە و تایبەتیان نییە. ژن لای ئەو وەسیلەیە، ئامانج نییە. زۆربەی کات ژن لەهەمان کاتدا دەگەڵ دوو پیاو دایە. هەر یەکێک لەم دوو پیاوە لەبەر هۆیەکی جیاواز مایەی ئەشقی ئەم ژنەن. وەکو چۆن هەر پیاوێکیش دەتوانێ لەهەمان کاتدا دوو ژنی خۆش بوێ. ژن زەمینە بۆ دووفاقی پیاو خۆش دەکات. یانی پیاو لەهەنبەر ژندا تووشی ئیزدیواجیەت دەبێت، دوو جۆر ئەشقی لا دروست دەبێت، یەکێکیان عەشقی سێکسیە و ئەویتریان ئەشقی بەزەیی ئامێزە.

میشکین هەم ناستاسیای خۆشدەوێ و هەم ئاگلایای شۆخ و شەنگ، کیژی جەنەڕاڵ ئیپانچین. جوانیەکەی ئاگلایا، ئاشق و شەیدای دەکات، بەڵام سەبارەت بە ڕوخسارو سیمای ئازارمەندی ناستاسیا فیلیبوفنا، هەست بە هاوسۆزی و هاوخەمیەکی بێ کۆتایی دەکات. دەڵێت: "من نەمدەتوانی تەمەشای دەموچاوی بکەم. لە ڕوخساری دەترسام. من لەڕووی ئەشقەوە خۆشم ناوێ، لە ڕووی بەزەییەوە خۆشم دەوێ. بەزەییم پێیدا دێتەوە." خۆ ئەگەر سەرپشک کراباو ناچار بوایە لەنێو ئاگلایا و ناستاسیادا یەکێکیان هەڵبژێرێت، بەلای ناستاسیادا دایدەکێشا: "ئەو تەنیا کیژێکی شێت لەبەردەم خۆیدا دەبینێ. کیژێکی نامراد و نائومێد دەبینێ، کە یادگارییەکی خەمناکی دەربارەی، لەزەیندا هەڵگرتووە. چەند کیژێکی کلۆڵ و بەلەنگازە."
بەڵام ناستاسیا فیلیپوفنا، لەنێوان میرزادەی نەخۆش و پاک و بێگەرد تا ڕادەی گەوجیەتی و ڕوگۆژینی دڵڕەق و سێکسباز و شەهوانیدا دوو دڵە. میشکین بەزەیی پێیدا دێتەوە و خۆشی دەوێ، بەڵام ڕوگۆژین، خۆشی بەلەش و لارو جەستەیدا چووە و لەڕووی سێکسییەوە بەدەوروخولیا دێت. واتە یەکەمیان دڵی دەوێ و دووەمیان جەستەی. واتە دڵی و جەستەی دەور لە چارەنووس و قەدەری ئەم دوو پیاوە دەبینن کە گیرۆدەی بوون و حەزیان لێکردووە. وێڕای ئەمەش کاتێ ناستاسیا دەمرێت، هەردوو ئاشقەکەی کە ئاشت دەبنەوە، تێدەگەن کە هەردووکیان بەهەمان نەفەسەوە، بەرەو یەک ئازادی هەنگاویان ناوە.
ئا بەو جۆرە، بەلای دوستویفسکییەوە، هەر ئەشق و خۆشەویستیەک بۆ یەک کەس تەرخان بکرێت، لە خواوەند نەدزراوە. ئەشقی زەمینی، چونکە نوقستانە، سست و بەعەزابە، سەخیف و مایەی پێکەنینە، ڕوح و دەروونی مرۆڤ دەهەژێنێ و ئامادەی دەکات بۆ ئەشقێک کە ئیدی فریوی نادات و هەڵی ناخەڵەتێنێ.
ئەوەی کە مایەی سەرنجە و پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە کە تاقە کۆمەک و یارمەتیەک کە کاراکتەرەکانی دوستویفسکی دەتوانن لەیەکدی چاوەڕوان بکەن، ئەشق بە ئایندەیە، میشکین، ئەم پیاوە پیرۆزە ناتوانێ هیچ کارێک بکات. چونکە جگە لە خۆشەویستی هیچ کارێکی دیکە نازانێ. خۆ ئەگەر جار جارێ هەوڵبدات کارێک بکات، ئەوا خۆی دەخەڵەتێنێ. نەک هەر ناتوانێ کۆمەک بەهیچ کەسێک بکات. بەڵکو بارودۆخ و هەڵوێستە دروست و ساغڵەمەکانیش دەشێوێنێ. تێپەڕبوونی ئەم پیاوە "هەرە باش و ئایدیالە" بە سەرانسەری ڕۆمانەکە، تاوانێکی کوشتن و سێ چوار کارەساتی دژواری خانەوادەیی بەدووا دێ. "ئەم پیاوە زۆر باشە" بەخۆیشی تووشی شێتی دەبێت، چونکە ناتوانێ لەم هاماج و کەش و هەوایەدا، کە لەبنەڕەتدا هی ئەو نییە، بژی. نەیتوانیوە خۆی دەگەڵ هەلومەرجە تایبەتیە ئینسانی و کۆمەڵایەتیەکاندا بگونجێنێ و بسازێنێ. نەی توانیوە ببێت بە پیاوو بەشەرێکی

ئاســـایی. بــۆیە ڕۆیشـــتنی ئەو، دەبێــتە بایســـی ڕزگــاری ئەو کەســـانەی دەوروبەری. هەر وەها حوزوری ئەو ،ژیانی چەندین کەس دەوڵەمەنـد دەکـات و ویژادانیــان ســەبارەت بە کۆمەڵیــک مەســەلە و کێشــەی ســەرەکی بیــدار دەکاتەوە.

بەمجــۆرە، وادیــارە ئەو ئەنجــامە پەنهــانەی کە لەڕۆمــانی گەمــژەوە دێــتە هەڵێنجــان، مانــای ئەم ئــایەتەی ئینجیــل دووپــات دەکــاتەوە:" جــا بــا ئەم حەقیقەتەتان پێ بڵـێم، ئەگەر ئەو دەنـکە گەنـمەی کە دەکەوێـتە ســەر زەوی، نەمرێــت، هەر بە تەنــێ دەمێنێــتەوە، بەڵام ئەگەر بمرێــت، بەرێکــی زۆر و فــرە دەدات." (ڕوانە ئینجیلی یوحەننا، بابی ٢٤ ئایەتی ١٢)

ڕەنـگە، کەســایەتی گەمـژە، لە هەر هەمـوو کاراکتەرەکـانی دوستویفسـکی کەمتـر بەشــەری بــێ. بـۆ نمـوونە ئالیوشــا کارامــازوف مرۆڤێکـی باشــە، بەڵام ئەقڵــی بەهەمــوو چــاکەو خراپەیەکــی تیــرەی بەشــەردا دەشــکێ. ئاگــای لە ئەلهــاو خولیــا و کەڵــکەڵە جەســـتەیی و دەروونـــیە بەشـــەرییەکان هەیە و بەسەریاندا زاڵ دەبێـت و کۆنترۆڵیـان دەکـات. ئالیوشــا کارامــازوف، ئینســانێکی تەواوە، بەڵام میرزادە میشـکین، سیما و ڕوخسارێکی زەمینــی نیــیە، پێـدەچێ لە هەسارەیەکی دیکەوە، لە دنیایەکی دیکەوە هـاتبێ. لەهەر ســۆز و غەریـزە و ئەڵهـایەکی جەســتەیی و سێکســی بەدەرە. بەخــۆی لەو بــارەیەوە دەڵێـت: "من ناتوانم لەگەڵ هیچ ژنێکدا زەماوەند بکەم، من نەخۆشم."

وێـڕای ئەوەش، ئەم بــوونەوەرە، میتــا تەبیعیــە، ئەم بــوونەوەرە نــا ئاســاییە، دەبــوایە لە چوارچێــوەی ئەم دنیــا هەســـت پێکــراوەدا، هەنــدێ ســـووکە پەیوەندیانی هەبــێ. دەبـوایە ئەم بیـرە ئەبسـتراکتە، لە قــاڵبی، جەســتەیەک، ڕوخسارێک، دەنگێک و ڕابردوویەک بدرێت. دوستویفسکی بۆ ئەوەی ســەنگ و ئیحتوبارێک بەم قارەمانە بێ ســەنگ و بــێ قەبـارە و بــێ نمـوودە ببەخشـێت، خۆی و ژیانی خۆی کـردووە بە هەوێـن و ئامیـانی ئەوەتـا میـرزادەی کـردووە بە کەسێکی فێدار، ڕێک وەکو خـودی دوستویفسـکی بەر لەوەی فێـیەکەی لێبـێ هەســـت بەخۆشـــی و شـــادی و چـــالاکییەکی نائاســـایی دەکــات. وەکــو دوستویفسـکی بەتاسـەوە چاوەڕوانی ئەو ساتە گرانبەها و خۆشــە دەکـات، کە هەماهەنگی باڵای دنیای لەچاو تروکانێکی بروسـکەییدا، بـۆ بەدیـار دەکەوێـت: "وام دێتە بەرچـاو لەو سـاتەدا، لە وشــەی یـارانی عیسـا لەو وشــە نائاسـاییە تێدەگەم: چیتر کات نایێت!" ئەم نەخۆشـی فێـیە، بـەردەوام لـە جۆلانـەی جـۆرە خەونێکی شادی بەخشدا، دەیهەژێنێ. دنیا بەلای ئـەوەوە لێـڵ و تاریـک نییـە، ئەو دیدی بوونەوەران دەبینێ. بەشێوەیەکی نادیـارو سـەیر لـە ئاینـدەدا دەژی. تەنانـەت بیرەوەریـەکانی میـرزادەش، لـە هـەمان بیرەوەرییـەکانی نووســەرەوە

هـەڵێنجراون. میـرزادە، چیرۆکـی پیاوێـک دەگێڕێتـەوە، کـە بـەتاوانی سیاســی دادگایی کـراوە و قـەراری ئیعـدام و گولـە بـارانی بـۆ دەرچـووەە: "دوای بیسـت دەقیقە فەرمانی بەخشینی کابرای بەدبەخت دەگات: قـەراری دادگـا سـووک دەکرێت و دەبێت بەحوکمی ئەبەدی و بێگارە زندان. بـەڵام بیسـت دەقیقەیـەک یـا بـەلای کەمـەوە چارەکـە سـەعاتێک دەکەوێتـە نێـوان خوێندنـەوەی قـەراری ئیعدامەکە و خوێندنەوەی قەراری سوککردنی ئیعدامەکە بۆ حوکمی ئەبـەدی. ئەم پیاوە کلۆڵ و بەلەنگازە، لەو ماوەیەدا دڵنیا دەبێت، کـە هەرسـاتێ بمرێـت، دەمرێت، بۆیە لە نیگەرانیەکی زۆر تایبەتیدا دەژی."

هەڵبەتە ئەم بابەتە. هەمان بابەت و سیناریۆی ئیعدامەکەی گروپەکەی پتروشـفسکییە. جگە لە لێکچوونی گشتی ڕووداوەکە، وردەکاری حاڵەتی کەسایەتیەکانیش، زۆر لێکدی دەچن. میشکین ناتوانێ ئەو تابلۆیە بدینێ کە بەدیواری ماڵەکەی ڕوگوژینەوە هەڵواسراوە، ئەم تابلۆیە کوپیەکی تابلۆی "کەوتنی خاچ"ە کەی نیگارکێش هولبینە. میرزادە، بەهەموو هێزی خۆیەوە هاوار دەکات: "هەر پیاوێک سەیری ئەم تابلۆیە بکات، لەوەیە ئیمانی خۆی لەدەست بدات." هەڵبەتە لە بیرەوەرییەکانی هاوسەرەکەی دوستویفسکیدا، "ئانا گریگوریفنا"دا ئەمە دەخوێنینەوە. "کە دەچووین بۆ جنیف، ڕۆژێک لەشاری بال لامان دا، تا سەردانی مۆزەخانەکان بکەین و ئەو تابلۆیە بدینین، کە یەکێک بۆ هاوسەرەکەمی باس کردبوو. ئەم تابلۆیە دەستکردی نیگارکێش هولبین بوو. بریتی بوو لە حەزرەتی مەسیح، کە پاش عەزاب و ئەشکەنجەیەکی بەترەف، لە تاقەت و توانای بەشەر بەدەر، لە خاچەکە بەر بووبووەوە و لەو گۆرە فڕێ درابوو تا بۆگەن بکات و شی ببێتەوە. من کە نەمدەتوانی ماوەیەکی زۆر تەمەشای بکەم، چووم بۆ هۆڵێکی دیکە... کاتێ کە گەڕامەوە سەیرم کرد هاوسەرەکەم هێشتا بەدیاریەوە وەستا بوو. دەتگوت لەوێدەر چەقیوە، غەرقی تەمەشا بوو، سیمای نیگەرانی و ترسێکی سەیری پێوە دیار بوو، لەو بابەتە ترسانە بوو، کە زۆرجار بەر لەوەی فێی لێ بێت، بەدەم و چاویەوە دەردەکەوت." دۆستویفسکی ئەو کاتی، ئەم ڕستەیەی بە ژنەکەی گوتبوو: "تابلۆیەکی وا، لەوەیە بکاتە کارێک کە ئینسان ئیمانی خۆی لەدەست بدات."

تەنانـەت هەڵوێسـتی میـرزادەش بەرانبـەر بـە ڕەقیـب و هەڤڕکەکـەی خـۆی "ڕوگوژین" هەمان هەڵوێستی دوستویفسکی بەرانبەر بە هەڤڕکەکـەی خـۆی ڤیرگونوف، لە سیبریا، وەبیر دێنێتەوە. کە پێی دەگوت: "من دژمنی تـۆ نـیم. بـە تەمانیم بەهیچ جۆرێک ڕکابەریت بکەم... ئەگەر ئێـوە دووبـارە ئاشـت بووبنـەوە، ئـەوا پیرۆزتـان بـێ، مـن جـارێکی دی لەبـەردەم ئـەودا (مـاری) دەرناکـەوم و هەرگیز سەردانتان ناکەم."

بـەدرێژایی ڕۆمانەکـە وا هەسـت دەکرێـت کـە دوستویفسـکی بـەردەوام لـە هـەوڵی ئەوەدایـە کـە مەسـەلە مـەتریالی و هەسـت پێکراوەکـان، مانـا و وردەکارییـە ئـەقڵانی و سـەرنجە شەخسـیەکان کۆبکاتـەوە و دەگـەڵ ڕووداوەکـانی نێـو ڕۆمانەکـەدا ئاوێتـەیان بکـات، تـا ئـەم ڕۆمانـە، لەبـەرچاوی خەڵکانی کەم زانیاریدا، ئاسایی بنوێنێ، هاتووە کاراکتەرێکی هێناوە لە دنیـای

ئەو کەسانەوە کە دەڵێن "دوو جاران دوو دەکاتە چوار" گواستووەتەوە بۆ دنیای ئەو کەسانەی کە دەڵێن: "دوو جاران دوو دەکاتە سێ" بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە خەڵکانی ناکۆک و نەیار، ئاشت بکاتەوە. وێڕای ئەمەش لەسەرانسەری ئەم ڕۆمانەدا یەک کەسێک نابینی کە ڕۆڵێکی لاوازی هەبێت و ڕوگوژین، ناستاسیا، هیپولیت، لیبیدوف، ئاگلایە، ئیفولگین، هەر یەکێک لەمانە دەوری خۆی لە ڕوونکردنەوە و بەرجەستە کردنی ئەم مێردەزمە ترسناکەدا هەیە.

میرزادە، لە خۆی دەپرسێت: "ئایا ڕوگوژین ناتوانێ تەحەمولی ڕوناکی بکات؟" دەیەوێت بەچاکی و بەدروستی ناخ و دەروونی، ڕەقیب و هەڤڕکەکەی خۆی بناسێت. ئایا ئەم پیاوە تەنیا دوای ئەشقێکی کوێرانە و ئاڵۆز کەوتوە؟ ئایا ناتوانێ تەحەمولی کول و کۆڤان بکات و دەگەڵ عەزاب و ئازاردا هەڵبکات و بسازێ؟ ناستاسیا دەڵێت: "ڕوگوژین، کەسێکی مەندە، بێدەنگیەکەی سامناک و ترسناکە. تەنیا چاوەکانی قسە دەکەن، بەچاو قسان دەکات." لەوە دەچێ ئەم پیاوە، پەیوەندی بەخۆیەوە نەبێت. لەسەرەتای ڕۆمانەکەوە، هەست دەکرێت کە ئەم پیاوە لە مۆلەقدایە، خۆی نییە، بەرەو ئەنجامدانی تاوان بکێش دەکرێت. ئەم کچە دەکوژێت کە ماوەیەکی زۆر بوو حەزی لێی بوو وتاوانەکە ڕێک لەو ساتەدا ئەنجام دەدرێت کە کیژێ بەتەواوەتی خۆی ڕادەستی ئەو دەکات. چونکە بەتەمایە لەوکاتەدا کە ئەوی توند لە هەمێز گرتووە، بیناسێت و دەرکی بکات. و ئەمە هەمان هەڤئامێزییە کە ئەوان بەتەواوەتی لێکدی جودا دەکاتەوە. ئەم جەستەیە و ئەم بۆنی جەستەیە، بوونەوەرێک دوور دەخەنەوە کە هێز نییە جارێکی دی بیهێنێتە ئاراوە. ڕوگوژین و ناستاسیا، هەر یەکەیان لە تەنیایی خۆیدا حەپس و زندانە. ڕەفتارو ئاماژە بەشەریەکان، بەشی ئەوە ناکەن لێکدییان نزیک بکەنەوە.

ڕوگوژین، لەکاتێکا کە بەسەر ئەو دەموچاوەدا دانەویوەتەوە، هەست بە هەناسەی دەکات وبەخۆوەی دەگوشێت، هەست دەکات ئەم بوونەوەرە، لەڕووی ڕووحییەوە زۆر لەم دوورەو، ئەم هەستە زۆری ئازار دەدات. ئەم ژنە هی ئەو نییە و بەوەوە پەیوەست نییە، ئیدی ئەمڕۆ بێ یا سبەی هەر بەجێی دێڵێت. کەواتە تەنیا مەرگ دەتوانێ، کە ئەوی بۆ بهێڵێتەوە و بپارێزێت. بۆیە تا دەستی دەگرێت خەنجەرێک بەدڵیدا دەکات و پاشان چاوەڕوانی هاتنی میرزادە دەکات. "چەرچەفێکی سپی درابوو بەسەر کەسە نووستووەکەدا، بەڵام ئازای بەدەنی، بەشێوەیەکی کۆنگ لەژێر چەرچەفەکەوە دیاربوو. بەشی سەرووی تەختەخەوەکە زۆر شپرزە و شەپرێو بوو: جل و بەرگ، بەسەر تەختە خەوەکەوە، بەسەر کورسییەکانەوە، بەناو ژوورەکەدا، بەهەموو شوێنێکدا بڵاو بوو بوونەوە. کراسێکی جوانی ئاوریشمی سپی، ڕازاوە بە نەخش و نیگار دیاربوو، نووکی پێیەکانی ڕووت لەژێر کۆمەڵێک دانتێلاوە دیار بوو، وەکو خاڵێکی سپی لە تاریکیەکەوە خۆی دەنواند. ئەو پێیە لەوە دەچوو، پێی پەیکەرێکی مەڕمەڕین بێ. بێ جوڵەییەکەی ترس و خۆفی دەخستە دڵەوە. میرزادە تا زیاتر دەیڕوانیە ناو ژوورەکە، بێدەنگی ژوورەکە، دڵی تەنگ

دەکرد و سامی دەخستە دڵییەوە. لە ناکاوا مێشێک هەڵفڕی و بەگیزە گیز بەسەر تەختە خەوەکەوە کەوتە سوڕانەوە و ئەنجام لە سەر سەرینەکە نیشتەوە. میرزادە کەوتە لەرزین." میرزادە، سەری لە ئیعترافەکەی ڕوگوژین ناسوڕمێ. کاتێ ڕوگوژین، بە میرزادە دەڵێت: "نابێ بێڵین ئەم ژنە ببەن." میرزادە وەڵامی دەداتەوە: "نا، نا، نابێ بەهیچ نرخێ ڕێگەیان بدرێ بیبەن، نا، نا، نا" بەرە بەرە هەردووکیان دەکەونە دنیای نائاگایی و بێهۆشییەوە. کاتێ پۆلیس دێن تا ڕوگوژین دەستگیر بکەن، دەبینن بەدیار جەنازەکەوە، شین و شەپۆڕ دەکات. میرزادە لەوکاتەدا بە میهرەبانی قژ و سەروچاوی ڕوگوژین نەوازش دەکات. بەڵام ناستاسیا، لەسەرەتای ڕووداوەکانەوە، پێشبینی مەرگی خۆی دەکات. بەرلەوەی بچن بۆ کڵێسا، بەدەم زەردەخەنەوە دەڵێت: "من ڕەنگی مردووم لێنیشتووە." لە ڕاستیدا، هیچ ڕێگەیەک بۆ ڕزگاری ئەم ڕوحە گوناحکارە نەبوو، جگە لە مردن. ناستاسیا، وەکو چۆن بۆن و غەریزە دوو حەیوان بۆلای یەکدی دەبات، بەو ئاوایە بەرەو لای ڕوگوژین دەڕوات. ڕوگوژینی خۆش دەوێت، بەڵام دەشزانێ کە ئەم پیاوە زبر و کێوییە شایستەی ئەو نییە. تەنیا میرزادە دەتوانێ لە خواری و نەنگی ڕزگاری بکات. بەڵام خۆشەویستی و ئەشقی میرزادە، زیاتر لە ڕووی بەزەییەوەیەو بۆ ڕازی کردنی دڵی ئەوە. لەکاتێکا ناستاسیا، کەسێکی فڕناخ و لەخۆبایی و مەغروورە. بەزەیی و خێر و سەدەقە قەبووڵ ناکات. بەڵام ئەو لە ڕووی کاردانەوە و پەرچەکردارەوە، مل بۆ بەدکاری و ڕیسوایی دەدات، ڕیسواییەک کە دەکاتە کارێک، کە بەدڵی خۆی، نەبێتە مایەی ئەشق و خۆشەویستی پیاوێک. ئاگلایا پێی دەڵێت: "تۆ تەنیا ئەو شتانەت خۆشدەوێ، کە دەبنە مایەی ڕیسواییتان. ئەوجاش وا هەست دەکەی کە خەڵکی غەدریان لیکردوویت، ژیانیان لێ تاڵ کردووی. خۆ ئەگەر کەمتر لەوتابای، یا هیچ ناو و ناتۆرەیەکت لە دوو نەباو، هیچ پەڵەیەکت پێوە نەبا، کلۆڵتر و داماوتر دەبووی." ئیدی ئەم مەیل و ئارەزووی ڕیسواییە، لە دڵ و دەروونی ناستاسیادا، بەشێوەیەکی سەیر و بێ سنوور ئاوێتە بە غروور و خۆهەڵکێشان دەبێت. ناستاسیا، لە ڕاستیدا دەیەوێ کەسێکی بێ فیز و دەعیە بێ، خۆشکینی بکات، بەڵام ئەمە لەخەڵکانی دی قەبووڵ ناکات. ئەمە سیفەت و خەسڵەتی تایبەتی تێکڕای کاراکتەرەکانی دوستویفسکی یە.

هەڵبەتە، کۆمەڵێک مشەخۆر و لاسار و لەخۆبایی و خەڵکانی ناکام، بەدەوری ئەم سێ قارەمانە سەرەکییەدا دەسوڕێنەوە. لیبیدیف،کارمەندی ئاڵچاخ و ڕووبین وریاکار، گەواد،سووتخۆر،چروک و شایەدی دەری بەدرۆ. بەڵام لەهەمان کاتدا کەسێکی شارەزایە لەڕاڤەو شرۆڤەی خەونان و کۆتایی دنیا، بەخەم و پەژارەوە سەربهوردی دوبارەی دەگیڕێتەوە. بە ڕوگوژین دەڵێت: "ئەگەر بەشەلاق تێم بەر ببیت، نیشانەی ئەمەیە کە دەرت نەکردووم. بەر شەلاقم بدە، شەلاق نیشانەی گێڕانەوەی موڵکایەتیە." هەروەها کاراکتەرێکی وەکو جەنەڕاڵ "ئیڤولگین"ش کە پیاوێکی بەدبەختە لە ڕۆمانەکەدا هاتووە. هەر بۆ فشە درۆیان دەکات، تەنیا لەبەر ئەوە درۆ دەکات، کە لەزەت لە خودی درۆیەکە دەبینێ، ئیدی کار دەگاتە ئەوەی کە ڕاست و

درۆ لێکدی جیا ناکاتەوە. هەموو درۆکانی خۆی لێدەبێت بەڕاست. یەکێک لە قارەمانە لاوەکیەکانی دیکە، جەنەڕاڵ ئیپانچینە، کە ئاشق و حەز لێکردەی شێت و شەیدای ناستاسیایە. یەکێک لە ئاشقەکانی دیکەی ناستاسیا، گانیایە. ئەمە تەنیا بەو نیازە بیر لەوە دەکاتەوە کە ناستاسیا بخوازێت و زەماوەندی دەگەڵ بکات تا لەو ڕێگایەوە، پێگەیەکی بەرز بۆ خۆی بەدەست بێنێ. لەدڵی خۆیدا دەڵێت: "باشە حەفتا و پێنج هەزار ڕۆبڵ، ئەم هەموو ئازار و عەزابە دێنێ؟"

هەروەها لە ڕۆمانەکەدا تووشی ئاگلایای شۆخ و شەنگ دەبین کە هەم دەسی دەسی بە میرازادە دەکات و پێی ڕادەبوێرێ و هەم تا ڕادەی پەرستن خۆشی دەوێت. هەروەها سیما و ڕوخساری غەریب و مایەی سەرنجی "هیپولیت"ش لە ڕۆمانەکەدا زۆر بەرجەستە ودیارە. ئەمە گەنجێکە تووشی نەخۆشی دیق و دەردەباریکە بووەو، دوا سەعاتەکانی تەمەنی نزیک بوونەتەوە. بۆیە هەستدەکات، پێویستە ئیعترافنامەکەی بە ئاشکرا و لە بەردەم جەماوەری خەڵکیدا بخوێنێتەوە. دوستویفسکی لە ڕێگەی ئەم گەنجەوە کە لەحاڵی مردندایە و کەوتووەتە ئاویلکە، دۆزی دوا چەمک و مانای ژیان دەخاتە ڕوو. هیپولیت، وەکو خودی نووسەری ڕۆمانەکە، کەوتووەتە نێوان بەرداشی فیکری ئەپستراکت و مادەوە. ئایا هیچ شتێک لە دەرێی دیوارانـدا هەیە؟ ئایا دەرێک هەیە لە دەرێی یاساو ڕێساکانی تەبیعەتدا؟ پەڕجوو هەیە، یان دەبێ هەموو شتێک بە گوێرەی هاوکێشەی "دووجاران دوو دەکاتە چوار" ئەنجام بدرێت؟ هیپولیت بەلای مەسیح دا دایدەکێشێ کە دەکاتە ڕەمز و نیشانەی فیکری سەرکەوتوو. هیپولیت بیر لەو تابلۆیە دەکاتەوە کە لەژووری چاوەڕوانی ماڵەکەی ڕوگوژینـدا دەیبینـێ: "سیمای مەسیح، بەهۆی ئەو جەزرەبانەوە کە وێی کەوتوون، تەواو گۆڕاوە و شێواوە. ئاوساوە، یەکپارچە زام و خوێناو و قەتماغەیە، چاوەکانی دەرپۆقیون، جۆرە خێلییەکیان پێوە دیارە، پرشنگێکی کزی خەمینیان لێدەبێتەوە. بەڵام سەیر ئەمەیە، وەختێک دەڕوانیتە ئەم پەیکەرە زامدارە، پرسیارێکی سەیر بەرۆکی زەینت دەگرێت: ئەگەر جەستەی مەسیح وەکو یاران و پەیڕەوان و شوێنکەوتوانی دیتویانە، وەکو ئەو ژنانەی کە دووی کەوتبوون و لەپای خاچەکەیدا وەستابوون، وەکو هەموو ئەو کەسانەی کە ئیمانیان پێی هەبووەو پەرستوویانە، دیتوویانە. بەڕاستی بەو جۆرە بووبێ کە لەتابلۆکەدا وێنە کێشراوە (هەڵبەتە دەبێ وابووبێ) چۆن دەتوانن باوەڕ بکەن کە ئەم جەستە عەزاب دیدەیە، جارێکی دی زندوو دەبێتەوە؟ پیاو لەدڵی خۆیدا دەپرسێت. ئەگەر مردن بەم ڕادەیە ترسناکە، ئەگەر یاساکانی تەبیعەت بەم ئەندازەیە بەهێزبن، چۆن دەشێت بەسەریدا زاڵ بیت، بەسەریا سەرکەویت؟ چۆن مەسیح کە گوتی "ئەی کچۆڵە ڕابە" کچۆڵەی تاین دووبارە زندوو بووەوە. کە بەلازاری گوت: "لە گۆڕ وەرە دەرێ، لازار لە گۆڕەکە هاتە دەرێ." لەکاتێکا خۆی تا لە ژیاندا بوو، جگە لە گوێڕایەڵی بۆ یاساکانی تەبیعەت هیچ کارێکی دیکەی نەکرد؟

کەواتە، یاسای سروشت، وەکو یاساو فرمۆلی دووجاران دوو دەکاتە چوار، لەبواری پراکتیکیدا، بەرانبەر بەڕازو پەرجووی حەزرەتی مەسیح هیچ پاشەکشەیەکی نەکردووە. ئەم یاسایانە دەگەڵ ئەو پیاوە پەڕ جووکارەشدا، بەهەمان شێوە مامەڵەی کردووە کە دەگەڵ خەڵکانی فانیدا کردوویەتی، و هەموو هێزی فیکری و مەعنەوی عیسا نەیتوانیوە ڕێگە لە مێخ و بزماران بگرێت کە ناولەپی کون کون بکەن، یا ڕێگە لەنێزە بگرێت ئەو تەوێڵە نورانیە دیواو دەر کون بکات، یا ڕێگە لەو تفانە بگرێت کە بەسەر ئەو تەوێڵە جوان و نورانیەدا دابچۆڕێت.

بەو جۆرە، لە دیدو نۆرینی هیپولیتەوە تەبیعەت "شێوەی ئامێرێکی مۆدێرن وەردەگرێت، کە کەڕو کوێرانە، ئەو بوونەوەرە ئازیز و پەرجووکارەی لەناو بردووە وقووتی داوە. ئەو بوونەوەرەی کە بەتەنیا لە هەموو تەبیعەت و یاساکانی بەنرختر بوو و ڕەنگە تەبیعەت لەبەر خاتری بەرهەمهێنانی ئەو دروست بووبێ."

ئۆل و ئاینان و، سیستەمێن فەلسەفی، لەهەنبەر مادە و ژمارەدا ناکەنە هیچ و بەرگە ناگرن. دەڵێن مەسیح زندوو دەبێتەوە، بەڵام ئاقیبەت و ئاکامی دڵتەزێن و کارەساتباری ئەو، بۆ باوەڕ و ئیمانی بەشەران، دەکاتە جۆرە شکست و ناکامییەک – مەرگ بەسەر دنیادا زاڵ و فەرمانڕەوایە.

زۆر چاکە، کەواتە مادامێکی داینەمۆیەک هەیە، یەک بزوێنەر هەیە کە بەدەر لە هەر هەست و سۆزێک کار دەکات، خەڵکی باش و خراپ، بێ جیاوازی دەهاڕێت، مندالان، پیرەمێران، بورژوایانی کەودەن و گەوج، بلیمەتانی دیار، بێهیچ جیاوازییەک دەهاڕێت. مانای وایە هیچ چارەیەک نییە جگە لە ملکەچ کردن و تەسلیم بوون. وەکو چۆن خودی مەسیح لە هەنبەر ئەم هێزەدا تەسلیم بوو و خۆی کرد بەسەر مەشق. بەڵام قەبووڵکردنی ئەم یەکەمین داینەمۆیەی گەردوونە، بەمانای پەرستنی نییە. هیپولیت هاوار دەکات: "باشە ناتوانن من لەنێو بەرن بمخۆن، بێئەوەی داوام لێبکەن ستایشی بخۆرەکەم ،دڕندەکەی خۆم بکەم."

جا ئەگەر ئەو هەڵە بکات و، ئەو جۆرە قسەیەی بە کوفر لەسەر بژمێردرێت، بەچ بەڵگەیەک بەرپرسی هەڵەی خۆیەتی؟ چونکە "ئەگەر فامینی ئەم بابەتە ئەوەندە دژوار و بگرە مەحاڵ بێ، کەواتە بۆی هەیە منیش دروست تێی نەگەم و هەڵە بکەم، چونکە من نەمتوانیوە لە شتێک بگەم کە لە سەرووی توانای فامینی منەوەیە، ئیدی گوناح چیە؟ کاتێ کە توانای ئەوەمان نەبێت لە مەشیەتی خوا بگەین و بێین بەگوێرەی هزر و بیری خۆمان ڕاڤە و شرۆڤەی بکەین، مانای وایە لەپایەی خوامان کەم کردووەتەوە."

جا ئەم لۆژیک و جەدەلیەتە. هەمان لۆژیکی نائومێدانەی کابرای ژێر زەمینییە: "بەدەمی نوقاو و ددانی چیرو لێکنراوەوە، کڕو کپ و بێجوڵە و تەمەڵ، بێئەوەی تەنانەت لە خەویشدا، بیر لەوە بکەینەوە، دەتوانرێت ناڕەزایی لە کەسێک دەربېڕێت."...

هەڵبەتە، ناشێت بە ئەقڵ و بیر بەرپەرچی ئەم هێرشە لوژیکیە بدرێتەوە. ئیمان وەکو مەسەلەیەکی ماتماتیکی بە پێوەر و ئەنجامگیری بەرە بەرە نایەتە دی، ئیمان لە ڕێگەی ئەقڵ و هزرینەوە بەدەست نایەت، بەڵکو لەڕێگای هەست و سۆزەوە بەدەست دێت. دوای چەند ڕۆژیک وەختێ کە هیپولیت، پرسیاری مانای ژیان لە میرزادە دەکات، میرزادە میشکین، بەرسڤی دەداتەوە: "تۆ بەڕێی خۆتا ڕۆ، بەختەوەری خۆمان پی ڕەوا ببینە." ئەوەی نەتوانێ بە دەر لە هەر ئەقڵ و ئەنجامگیرییەک، بەپێچەوانەی هەر لوژیک و هزرینێک هەست بەم شادمانیە بکات، پێتقیە بە ڕێگای خۆیدا بڕوات و هەقی بەسەر کەسانی دیکەوە نەبێ. لە کاتیکا کە ئیمان دژمنی هاوکێشەی "دوو جاران دوو دەکاتە چوار" بێ، کەواتە ناشێت لەڕێگای "دوو جاران دوو دەکاتە چوار" ڕێ ببرێتە ناو دڵی بابایەکی بێ ئیمان.
ئەمە ئەو پەندو عیبرەتەیە کە لە قسە ناڕازی و دڵگیرەکانی هیپولیتەوە، هەڵدەهێنجرێ.
ئەم باسە کە سەبارەت بە تێکڕای ڕۆمانەکە زۆر دوورو درێژ دێتە بەرچاو، لە هاماجێکی پڕ لە هزر و خەیاڵاتی جۆراو جۆر و پەشێودا بەردەوام دەبێت. لەهەر لاپەڕەیەکدا تووشی هزر و خەیاڵاتێک دەبی کە زۆر لە واقیعەوە دوورن و لە تەنیشت کۆمەڵێک مەسەلەی لاوەکی و هەست پێکراوی ژیانی ڕۆژانەوە ڕیز دەکرێن و تێدەپەڕن. لە هەر لاپەڕەیەکدا هەست بەوە دەکرێت کە نووسەر وەکو کەسێکی حەماسەتدار بۆ بیرێک، هەوڵیداوە، بتوانێ قسەی دڵی خۆی بکات، ئەوەی دەیەوێ بیڵێ، بیڵی.
دوستویفسکی لەنامەیەکیدا بۆ ستراخۆف، لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی بە خەیاڵی و بە وەهم و ڕیزپەڕ و ئاوارتەی دەزانن، بەلای منەوە، واقیع و حەقیقەتی ڕاستەقینەن. من ئەوەندەی ناوەڕۆکی فیکرەکەم بەلاوە گرینگ و مەبەستە، ڕۆمانەکەم ئەوەندە مەبەست نیە."
ئەم ڕۆمانە ئاڵۆزە، کە بەئاسانی نایەتە شەرح و شرۆڤە، کە بەئاسانی پۆلێن ناکرێت و ناخرێتە خانەی هیچ ژانرێکی ئەدەبییەوە، بەڕادەیەک ڕەخنەگرانی شپرزە کردوە، کە هەندێکیان نەک هەر ئاوریان لێنەداوەتەوە، بگرە هەر ناویشیان نەبردووە. هەندێکی دی تووڕە بوون و بە ئاشکرا ناڕەزایی و بێزاری خۆیان دەربارەی دەربڕیوە. بۆنیتی ڕەخنەگر، دەربارەی ئەم ڕۆمانە دەڵێت: "خودایا! ئاغای دوستویفسکی، لەم ڕۆمانەدا، کە لەڕاستیدا، خراترین بەرهەمی ئەوە، چ ورِاوەگۆییەکی نەکردووە. یەک دنیا بابەتی ئەدەبی ئاڵۆز و بێ سەرو بەرو نامەفهوومی بەسەریەکدا هەڵڕشتووە، کە یەک دنیا مجێز و تەبیعەتی بەشەری و، بویەر و ڕووداوانی ئاڵۆزکاوی، دوور لەهەر بایەخێکی هونەری تێترنجاندووە. ئەم کارەی ئاغای دۆستویفسکی چەندین لاپەڕەی ئاڵۆزی لەخۆ گرتووە کە کورم دەوێ لێیان تێبگات!"

## فەسڵی یازدەیەم
## مێردی هەمیشەیی
## پێداچوونەوەی شەیتانەکان، جەنگ

دوستویفسکی، لە نووسینێکیدا دەڵێت: "وا هەستدەکەم کە جەماوەری خەڵک. بەهەمان گەرم و گوڕی ڕۆمانی تاوان و سزاوە، پێشوازیان لە ڕۆمانی گەمژە نەکرد. دیارە ئەمە نیشانەیەکی نەرێنییەو پێگە و ناوبانگم لەق دەکات، بۆیە دەمەوێ جارێکی دیکەو سەرلەنوێ سەرنجی خەڵکی بۆلای خۆم ڕاکێشم."

بۆیە هەرکە لەنووسینی ڕۆمانی گەمژە دەبێتەوە، خێرا دەست بە نووسینی ڕۆمانێکی تازە، بەناونیشانی "مێردی هەمیشەیی" دەکات.

لەو حەوت هەزار ڕۆبڵەی لە قەرار بوو دوستویفسکی لەبری ڕۆمانی گەمژە وەریبگرێت، هێندەی سلفەی پێشوەختە بەسەری وەرگرتبوو، پرێکی زۆر کەمی بۆ مابووەوە. هەندێ لەو پارەیەی، لەبری ئەو شتانە کە لەسان پترۆسبورگدا خستبوویانە بارمتەوە، پرێکی لێدا بە (پولی) کوڕی ژنە مردووەکەی، هەندێکی لێدا بە خانەوادەکەی میشێلی برای و باقیەکەی کە پریکی ناچیز بوو، خەرجی ئاکنجی بوونی خۆی و ژنەکەی لە فلورانسا، کرد.

ئانا گریگوریڤنا، لە سەرەتای ساڵی ١٨٦٩دا، هەستیکرد، بۆ جاری دووەم، سکی هەیە. سەرباری دەست تەنگی و کێشەی دارایی، دوستویفسکی کە بەو هەواڵەی زانی خەریک بوو لە خۆشیاندا جەزمەی لێدەهات. بەجۆرێ خزمەت و مدارای ئانێتی دەکرد، کە ژنەی تاین پێکەنینی دەهاتێ. دوستویفسکی لەدڵی خۆیدا وای دانابوو کە منداڵەکە کیژ بێ و ناوی بنێت ئیمی (ئازیز). دوستویفسکی ڕۆمانی شەڕو ئاشتی تولستوی لەماڵدا دەبێت، ئەم ڕۆمانە لە ئانا دەشارێتەوە؛ چونکە تولستوی لەم ڕۆمانەدا باسی بە

ئاویلکەکـەوتن و مردنـی دۆتمیـر بولکوڤسـکی بـەدەم ژان و ژاری منداڵبوونـەوە کرد بوو.
نامەیەک بۆ ستراخوف دەنووسێت و دەڵێت: "من بە تاسەو بە پەرۆشەوە، بە نیگەرانی و ترسەوە، بە ئومێد و شەرمەوە چاوەڕوانی لە دایکبوونی ئەم منداڵەم."
ئـەنجام دوستویفسـکی لەترسـی ئـەوەی ژنەکـەی لـە وڵاتێکـی بیانیـدا، کـە نەکەس دەیناسێت و نە کەس دەناسێت و غەریب و بێکەس منداڵی ببێت، کـە دکتۆران وەکو پێویست تێی ناگەن، لێدەبڕێت کە فلورانسـا بـەجێ بـێڵن و بـڕۆن بۆ پراگ، کە شاری سلاڤیانە، شـاریکی جـوان و دڵگیـرە، هـەروەها لـە سـاڵی ١٨٦٧دا مەڵبەندی کۆنگرەی سلاڤیەکان بوو.
لـە ڕێگـای ڤینیسـیاوە سـەفەرەکەیان دەکـەن، دوستویفسـکی سـەردانی کڵێسـای سـان مـارک و کۆشـکی دوگـات دەکـات. کـە بەشـاری پولونیـادا تێدەپەرن، تابلۆ بەناوبانگەکەی سانت سیسیل، دەستکردی ڕوفائیل دەبینـێ و زۆری بەدڵ دەبێـت. بـە هـەردوو شـاری تریسـت و ڤێنـادا تێدەپـەڕن، بـەڵام کـە دەگەنـە پـراگ، لـەم شـارە گەورەیـەدا نـە شـوقەیەکیان چنـگ دەکـەوێت نـە ژوورێکی خاڵی. ناچار بۆ دریسد دەگەڕێنەوە کە لەوێ بـەلای کەمـەوە دەتـوانن بچنە کن ئاشنایەکیان.
لە هەیڤی ئابـدا دەگەنـە دریسـد و لـە مـانگی ئەیلولـدا، ئانـا کچێکـی دەبێـت. دوستویفسکی دەنووسێت: "سـێ ڕۆژە ئیمی کچمان هاتووەتە دنیاوە. هـەموو شـتەکانی بـەدڵی خۆمانـە، بـە باشـی بـەڕێوەچووە، منداڵەکـە سـەلامەت و تەندروستە،جوانە." هـەموو ئەمانـە بـەجێی خـۆی، بـەڵام کرێـی خانووەکـەیان ماوەو نەدراوە، دکتۆرەکە، مامانەکە و بەردەستەکان هـەموو چـاوەڕوانی ئـەوەن کرێـــی خـــۆ وەربگـــرن. دوای هـــەموو ئـــەو حیســـابانە، تـــەنیا دە تالیریـــان پێماوە.دوستویفسکی لەنامەیەکدا بـۆ بەڕێوەبـەری ڕۆژنامـەی "ئەلەنـد" داوای سـلفەیەک بـۆ ڕۆمـانی ئاینـدەی دەکـات، بـەڵام پارەکـە درەنـگ دەگـات. دوستویفسکی هەموو ڕۆژێ دەچێت بۆ بانک و فەرمانبەرەکان جـوابی دەکـەن. کـار گەییـە ئـەوەی کـە فەرمانبـەرەکان و کارمەنـدانی بانـک هەرکـە چاویـان پێدەکەوت، پێی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکرد. دەنووسـێت: "ئـاخر منێـک ئـەوە وەزع و حاڵم بێ چۆن دەستم قەڵەم بگرێت، چـۆن دەتـوانم بنووسـم؟ شـەوان خەو لە چاوانم ناکەوێ. بـە پـانی و درێـژی ژوورەکـەدا دێـم و دەچـم و دەسـت دەنێمە قژم و قژم دەڕنمـەوە. بیـر لـە کـوێرەوەری و بێنـەوایی خـۆم دەکەمـەوە، تـوورە دەبـم، ئـاخر تـا کـەی چـاوەڕوان بکـەم. ئـۆف خودایـا، قەسـەم بـەزات و جەلالی تۆ، مەحاڵە بتوانم بـە دوورو درێـژی باسـی کلـۆڵی و بەدبـەختی خـۆم

بکەم. شەرم دەکەم باسی بکەم... وێڕای ئەم هەموو گیروگرفتەش داوای کاری هونەریم لێدەکەن. کاری درەخشان و شیعری ڕوون و ڕەوان و بێ گرێ و گۆڵ. گونجاروف و تورگینیف، بۆ من بە نموونە دێننەوە! دیارە غافڵن لەوەی کە من لە چ وەزع و حاڵ و هەلومەرجێکدا کاری ئەدەبی دەکەم؟"
ئەنجام سەد ڕۆبڵێکی پێدەگات، بەڵام یەکسەر خەرجی دەکات. لە مانگی کانوونی یەکەمدا، تەنانەت پێنج دانە "تالیر"شی پێنابێ کە دەستنووسەکەی بە پۆستەدا بۆ ڕۆژنامەی ئەلەند ڤڕێبکات، "من پارەی ئەوەم پێ نییە کە دەستنووسەکەم بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بنێرم و بۆیشم پەیدا ناکرێت. دەستنووسەکە زۆر و قورسە و داوای پێنج تالیر دەکەن، ئەم پینج تالیرە بۆ ناردنی دەستنووسەکە پێویستە. بەڵام خۆ ئیمەش بەبای خوا ناژین، پێویستمان بە پارەیە، کە وەزعێکی زۆر ناخۆشە..." ئەنجام ڕۆژنامەی ئەلەند، ڕازی دەبێت سلفەیەکی دیکەی بۆ بنێرێت و ئیدی دەستنووسی ڕۆمانی (مێردی هەمیشەیی) دەپێچرێتەوە و بەستەبەندی دەکریت و لە دریسدەوە بەرەو ڕووسیا ڤڕێ دەکرێت.
ئەم ڕۆمانە چۆن سەیری دەکەیت، لەوەدەچێت، لاسایی کردنەوەیەک بێ، کە دوستویفسکی گەرەکی بێ لاسایی یەکێک لە ڕۆمانەکانی خۆی پێبکاتەوە. لە ژیانی هەر نووسەرێکدا ساتێکی وا هەیە کە نووسەر لەوەدەچێ بیەوێ لاسایی کارێکی خۆی بکاتەوە و خۆی تاقیبکاتەوە.
ڕۆژێک پیاوێکی قۆز و فریوکار بەناوی ڤیلچانینوف،لە ماڵی حۆن تووشی کابرایەک دەبێت کە قەراخی کڵاوەکەی خۆی بە پارچە کرێبێک پۆشیوە، کە پێدەچێ لە مێژبێ لەدووی ئەم بووبێ و لە تاقیب و سۆراخیدا بووبێ. فیلچانینوف کابرای گۆرین دەناسێتەوە. کابرا تروسوتسکییە، ژنەکەی ئاغای تروسوتسکی، نۆ ساڵ لەوەپێش ماشقەی ئەم ڤیلچانینوفە بووە. تروسوتسکی دەڵێت: "من نەمدەویست بێم بۆ ئێرە، تەنیا بەڕێکەوت ڕێم کەوتووەتە ئێرە."
-چۆن بەڕێکەوت، خۆ من لە پەنجەرەی ماڵەکەتەوە تۆم بینی کە لەسەر نووکی پێیان، بە ئەسپایی بە جادەکەدا دەهاتی.
ژنەکەی تروسوتسکی مرد بوو، کچێکی چکۆلەی لەپاش بەجێمابوو بە نێوی لیزا. ئەم کچە هەشت مانگ دوای ڕۆیشتنی ڤیلچانینۆف لەنک ژنەکەی تروسوتسکی، هاتبووە دنیاوە. بەڵام لیزاش زوو دەمرێت و تروسوتسکی هیچ پەژارەو خەمێکی بەهۆی مردنەکەی ئەوەوە، پێوە دیار نابێت.
ڤیلچانینوف، لەدڵی خۆیدا، وا وێنا دەکات کە تروسوتسکی نموونەی مێردانی هەمیشەییە، لەو سێبەرانەیە کە "لەدایک دەبن، گەورە دەبن، تەنیا بۆ ئەوەی

ژن بێنن و ببن به پاشکۆ و تەواوکەری ژنەکانیان." جۆرە  ئاشـنایەتیەکی سـەیر لەنێوان ئەم دوو پیاوەدا چێدەبێت، ئاشنایەتییەکی ئاوێتە لە بەزەیی و لە کینە.
لە ڕۆمانەکەدا، زۆر دیمەن و ڕووداوی نەفرەت ئەنگێز و دەم بۆڵەی پڕ لە گلـەیی و گازنــدە، تــۆران و قەرقەشــە و ئاشــتبوونەوەو عــوزر خــوایی دەبینــرێن کــە ڤیلچانینوف، ناتوانێ بەری گریە و زاری خـۆی بگرێـت، چونکـە بەڕاسـتی خـۆی بـە کەمتەرخـەم و خـەتابار دەزانـێ. تروسوتسـکی، بەڕادەیـەک لـە فسـق و فەسادا نوقوم دەبێت کە دۆستەکەی دەگەڵ خۆیدا بۆ لادێ بۆ میلان، بۆ مـاڵی دەزگیرانە تازەکەی دەبات. ئیدی ڤیلچانینوف، لـە هەنبـەر دەزگیرانەکـەی ئـەودا کــە نادیــای نــاوە، کچۆڵەیــەکی قۆنــاغی ئامادەییــە دەکەوێتــە چــاوپڕکێ و چاوچلێسـی و چاو باشقاڵی. ئیدی تروسوتسـکی، بـەجۆرە توورەییەکـەوە، بـە بێـدەنگی، هەســت بــە ســەرەتاو دەســتپێکی جــۆرە خیانـەتێک دەکـات، کـە پێشترش جۆرە خیانەتێکی لەو بابەتـەی لێکـراوە. تروسوتسـکی، دوای ئـەوەی بۆ سان پتروسبورگ دەگەڕێتەوە، کە دەبینـێ ڤیلچـانینوف تووشـی نەخۆشـی بووە، دەکەوێتە خزمەت وپەرستاریی: دەچێـت بـۆ مووبەقەکـە، ئـاگر دەکاتـەوە، دەرگاوانەکە بێدار دەکاتەوە.
ڤلیچانینوف، ئەمەی زۆر لەبەرگران دەبێت، لەبن لێوانەوە دەڵێت: "تۆ، تۆ لە من باشتریت.. من لە هەموو شتێک تێدەگەم. هەموو شتێک دەزانم. زۆر سوپاس."
بـەڵام تـازە پاڵکـەوتبوو تـا بخـەوێ، جـۆرە هەسـت و گومـان و مەزەندەیـەکی لاپەیـدابوو کـە شـتێک ڕوودەدات. بـەڵام هەرکـە باسـکی درێـژ دەکـات، دەمـی تیغێکـی سـارد چـزە لـە باسـکی چـەپی هەڵدەسـتێنێ. چـاو هەڵـدێنێ، تروسوتســـکی بـــەدیار خۆیـــەوە دەبینـــێ، کـــە گـــوێزانێکی سەرتاشـــی بەدەستەوەیە، بەڵام فیلچانینوف، فریا دەکـەوێ و بەسـەر حەریفەکـەی خۆیـدا زاڵ دەبێـت و دەیـدا بـە ئـەرزدا. پاشــان، لەســەر شۆســتەی وێســتگەیەکی ڤیتاردا، تووشـی ژنێکی تا ڕادەیەک جوان و خشـکۆک دەبێـت کـە ئەفسـەرێکی مەست بەدەم هاواری مەستیەوە دوای دەکەوێ. خەڵکانی فزوڵـی و کونجکـاو کە ئەو دیمەنە دەبینن بە قاقاو پێکەنینەوە لە دەوریان خڕدەبنـەوە. خـەریک بـوو قەرقەشە و شەڕ لەنێوان هەردوو لادا بەرپا ببێت. بـەڵام ڤیلچـانینوف دەکەوێتـە بەینیانــەوە و وەزعەکــە ئــارام دەکاتــەوە. ئیــدی ژنــەی گــەنج لــە ڕادەبــەدەر سوپاسـی ڤیلچانینوف دەکـات و منـەتباری خـۆی بـۆ دەردەبڕێـت  گلـەیی ئـەوە دەکات کە مێردەکـەی "لـە کاتێکـا کـە ئـەم پێویسـتی پێـی بـووە، دیارنـەماوە."
بــەڵام مێردەکــەی ســەرەنجام، لــەناکاوا پەیــدا دەبــێ و، دەردەکــەوێت کــە تروتوسکییە. ئیدی جووتە ڕەقیب یەک دوو قسەی ناشرین و بـازاڕی بەیەکـدی

دەڵـێن. پاشــان ڤیلچـانینوف، دەســت بـۆ یـارۆی "مێـردی هەمیشــەیی" درێـژ دەکات، بـەڵام ئـەو دەسـتی ڕەت دەکاتـەوە و بـەدەمە لاڵکێـوە دەڵێـت: "ئـەدی لیزا! لیزای چکۆلە!" هەنگیٚ لێوەکانی، گۆناکانی و، چەناگەی دەکەونە لـەرزین و ئەسرین بە چاوانیدا دێنە خوارێ. قیتارەکە دەجووڵێت. تروسوتسـکی خـۆی بـە فارگۆنێکـدا دەکـات. ڤیلچـانینوف، بـە تـاق و تـەنیا، هـایم و حـەیران لەسـەر شۆستەی قیتارەکـە بەجێـدەمێنیٚ. هەڵبەتـە بابـەتی ئـەم کتێبـە حیکایـەتێکی کورتە کە بە تەکنیک و بونیـادێکی هونـەری زۆر وردو زنـدوو هاتووتـە نووسـین و شێوازی نووسینەکەی زۆر جیاوازە لە شێوازی گۆنگ و ئاڵۆز و شێواوی ڕۆمـانی گـەمژە. وێـڕای ئـەوەش ڕۆمـانی "مێـردی هەمیشـەیی" زۆر بـە چـڕی هـەموو بابەتە دڵخواز و بیرە تایبەتی و گرینگەکانی دوستویفسکی لەخۆ گرتووە. بـەڵام زۆر بەتانی قساندا نـەچووەو، وردەکـاری و جوانکـاری تیمـەکانی نەخسـتووەتە بـەر وردەبینـی ڕاڤـە و شـرۆڤەوە. وا هەسـت دەکـەیت، ڕۆمانەکـە بریتییـە لـە زنجیـرە ڕووداو و مەسـەلەیەکی دوا بـەدوای یـەک بـیٚ هـیچ ڕوونکردنـەوە و ئەنجامگیرییـەکی ڕاسـتەوخۆ. نووسـەر لـە کتێبـی "مێـردی هەمیشـەیی"دا، تەنیا نیـوەی کـاری ئاسـایی خـۆی ئـەنجام داوە. تـەنیا ڕێگاکـانی بیرکردنـەوەی نیشـانداوە، نـەهاتووە بـەدرێژایی ئـەم ڕێگـا پـڕ ڕەمـز و ڕازانـە، بەگـەڵ خوێنـەر بکەوێت و ڕێنوێنی بکات. بۆیە ئەم ڕۆمانە دەکاتە نموونەیـەکی چـڕی هونـەریی و ئەفراندنـەوانی تایبـەتی دوستویفسـکی. هەڵبەتـە دیمـەنی ڕەشـکوژیە ناکامەکـەی ئـەم ڕۆمانـە، پێگەیـەکی یـەجگار بـەنرخ و تایبـەتی، لـەنێو ئـەو دیمەنانەدا هەیە کە نووسەر وەسفی کردوون.
چیرۆکی "مێردی هەمیشەیی" تەواو بوو، هەڵەچنکراو، پێداچوونەوەی بۆ کـرا و نێردرا، ئیـدی دوستویفسـکی کەوتـە بیرکردنـەوە و نەخشـە دانـان بـۆ پـرۆژەێن گرینگتـر و گـەورەتر. کەوتـە بیرکردنـەوە لـە هونەرانـدنی ژیـانی گوناحکـاریکی گەورە" لە ڕۆمانێکی پێنج بەشیدا کە تـەرخانی بکـات بـۆ سـەلماندنی "بـوونی خودا" وای دانا بوو کە شا قارەمانی ڕۆمانەکە، نموونەیەک بیٚ هاوتای "تیخـون زادونسـکی" قـەدیس. بـەڵام چونکـە بەشـێک لـە ڕووداوەکـان، لـە دێرێکـدا ڕوو دەدەن. فیدور میخائیلوفیچ دەیەوێت کاتیٚ دەست بـە نووسـینی بکـات کـە لـە ڕووسـیابیٚ. ئـەو تیبینـی و سـەرنج و یاداشـت و سـەرە قەڵەمانـەی کـە لـەو بارەیـەوە ئامـادە و تۆمـاری کـرد بـوون، پاشـان هەنـدێکیانی لـە بونیادنـانی زوسـیمی خواناسـی کاراکتـەری ڕۆمـانی "برایـانی کارامـازوف" و هەنـدیٚ لەکاراکتەرەکانی ڕۆمانی "هەرزەکار"دا بەکار دێنێت.
لەو بارەیەوە دەڵێـت: "ئـەم بیـرە، هـەموو ئـەو شـتەیە کـەتا ئێسـتا لـە پێناویـدا ژیاوم، بەڵام بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە دەبیٚ بۆ ڕووسیا بگەڕێمەوە... نـەک هـەر

دێرێک بدینم و تەواو، بەڵکو پێویستە ماوەیەک تیایدا بژیم." هەروەها دەڵێت: "بەڵام مەسەلەو کێشەی سەرەکی سەرانسەری ئەم ڕۆمانە، هەمان ئەو کێشەیەیە کە بەدرێژایی ژیان، لە حاڵی ئاگایی و نائاگاییدا، لەگەڵیا ژیاوم و لەگەڵمدا ژیاوە، ئەزیەتی داوم، واتە بوونی خودایە شا قارەمانی چیرۆکەکە، بەدرێژایی ژیانی خۆی جارێ خوا نەناسە و جارێ خواناسێکی سەختگیر، هەندێجار کافر و لەدین وەرگەڕاوە و ئەنجام دەبێت بە خوانەناس. قارەمانی بەشی دووەمی ڕۆمانەکە، تیخوف زادونسکی دەبێت، بەڵام بەناوێکی خوازراوەوە، نەک بەناوی خۆیەوە."
بەدەم چاوەڕوانی دەرفەتی گونجاو ولەبارەوە بۆ نووسینی ئەو ڕۆمانە، خوو دەداتە بابەتێکی دیکە دەربارەی شۆڕشی جڤاکی و کۆمەڵایەتی "سنیتکین" گەنج، برای ئاناگریگوریفنا لەکاتی پشووی هاوینەی قوتابخانە و خوێندگاکاندا، دێت بۆ دریسد، بۆ سەردانی خوشکەکەی و مێردەکەی. ئەم کوڕە خوێندکاری ئەنستیتۆی کشتوکاڵی پتروڤسکە، لە نزیکەوە ئاگاداری بزوتنەوە نەهلیستیەکانی ناو زانکۆکان دەبێت. ئەو شتانەی کە دەربارەی ئەم بزاڤانە دەیانگێڕێتەوە، دوستویفسکی دەهەژێنێ و ڕوحی تەواو خەمبار دەکات. سنیتکین، بەئاو و تاو وجۆش و خرۆش و ستایشەوە باسی خوێندکارێکی بۆ دەکات بەنێوی ئیڤانوڤ. ئەم سیمایە لە نەستی نووسەردا، بە پەنهانی نەخش دەبێت و دەچەسپێت. سیمایەکی لەبەر دڵان دەبێت. ئەم ئیڤانوڤە "پیاوێکی زیرەک و زیتەڵ، بوێر و ورە بەرز دەبێت، بە تەواوەتی لە بیروباوەڕی کۆنی خۆی ژێوان دەبێتەوە و نکوڵی لێدەکات." ئیدی تۆمەتی خیانەت بە شۆڕشی، دەدرێتە پاڵ و ئیدی لەلایەن نچایقی سەرۆکی "زانکۆی سیستەمی میللی" و چوار کەس لە یارەکانیەوە، ئیعدام دەکرێت. دوستویفسکی کە بەم تاوانە نامەردانەیە دەزانێ، زۆر خەفەت دەخوات، ڕۆژ بە ڕۆژ پتر ڕقی لە بیر و هزرێن تازە هەڵدەستێ. قسەی گەوجانە و نابەرپرسانەی لاوانی زانکۆیی دڵی دەگوشن، بێتاقەت دەبێ، لێدەپرێت، جەزرەبەیەکی گورچکبڕ لەم جۆرە هزر و بیرانە بدات. ئیدی بە ئیستیفادە لەو بەڵگەنامانەی کە چاپەمەنیان دەربارەی ئەم بابەتە بڵاویان دەکردەوە و بە سوود بینین لە گوتەکانی سنیتکین، لێدەپرێت، ئەو ڕەخنەنامە توند و ترسناکە، واتە "شەیتانەکان" بنووسێت. لە نامەیەکی ١٨٧٠/٤/٦دا دەنووسێت: "ئەوەی من نووسیومە، گوزارشتە لە مەبەستێکی پەنهانی خۆم، مەبەستی خۆم هەیە. من گەرەکمە، بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە، بە کەماڵی سۆز و گودازەوە، گوزارشت لە هزر و بیری خۆم بکەم. هەڵبەتە نەهلیست و ڕۆژاوا دۆستەکان، لێم دێنە دەست، هاوار دەکەن، پێم دەوەڕن،

بـه کۆنەپەرسـتم لـە قەڵـەم دەدەن! بـە جەهەنـەم. مـن بیـرو هـزری خـۆم دەردەبڕم."
لە نامەیەکی ١٨٧٠/١٠/٢٠دا دەنووسێت: "یەکێک لە ڕووداوە سەرەکییەکانی چیرۆکەکەی من، تاوانێکە کە لەسەرانسەری ڕووسیادا، زانراوە و لەکەس شاراوە نییە، واتە مەسەلەی کوشتنی ئیڤانوفە لەلایەن نجایقەوە. لە نامەیەکی ١٨٧٠/١٢/١٤دا دەنووسێت: "دەمەوێ بەڕاشکاوی و بێ پەردە بیروبۆچوونی خۆم بەنەوەی نوی نیشانبدەم." دیارە ئەم کارە، ئەوەندەش ئاسان نەبوو. نەخشەی کتێبەکە بە باشی نەدەهاتە دەستەوە، شا قارەمانانی ڕۆمانەکە، لەچاو قارەمانە لاوەکیەکانەوە، زۆر کاڵ و کرچ و بێنموود دەیاننواند. دەنووسێت:
"بەجۆرێ خۆشیم بە قارەمانی لاوەکی ڕۆمانەکەدا چوو کە هەرچیەکم نووسی بوو، لەنێوم برد و دووبارە دەستم بە نووسینی کردەوە." جۆرەها تێبینی و سەرنجی تێکەڵ و پێکەڵ، بە خەتی ناشیرین و پەیڤ و وشەێن گۆنگ و نامەفهوم، بە قەڵەمی جۆرا و جۆر لەناو دەفتەرچەی یاداشتەکانیدا بەسەر یەکدا ترنجابوون. بۆ نموونە: "پاشان نچایف دەڕوات، بەڵام دەگەڕێتەوە و شاتوف دەکوژێت." یان "ستافروگین، ئەگەر ئیمانی هەبێ خۆی باوەڕ ناکات ئیمانی هەبێ، ئەگەر ئیمانی نەبێ، خۆی باوەڕ ناکات کە ئیمانی نییە." هەندێجار، پێش ئەوەی تایبەتمەندی دیمەنێک ڕوون بکاتەوە یان دیاری بکات ئەم جۆرە وشانە بەدی دەکرێن: "ئێرە"، "سەرەکی"، "گرینگ"، "بایەخدار"، بکرێ بە گوزارشتێکی دیکە."، شایەنی سەرنجە." دوستویفسکی دەنووسێت: "باوەڕ دەکەن. ئەگەر بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە سێ چوار ساڵێکم بەدەستەوە بوایە، خەمی بژێوی و ژیانم نەبوایە، خۆم بۆ تەرخان کردبا، وەکو چۆن تورگینیف، گونجاروف یا تۆلستۆی بۆیان لواوە، ڕۆمانێکم دەنووسی، تا سەد ساڵی دیکەش خەڵکی باسیان بکردایە."
هەڵبەتە دوستویفسکی، لە هـەموو ڕۆمانـەکانی دیکـەی پتـر لـە خـەمی ئـەم ڕۆمانە ڕەخنـەئامێزەدا بـوو، زۆری بایـەخ پێـدەدا، چونکـە نووسـینی ئـەم ڕۆمانـە جـۆرە ڕیسـکێک بـوو، ئەگـەری ئـەوەی هـەبوو، بەشـێکی یـەجگار زۆری خوێنـەرەکانی خـۆی لەدەسـت بـدات. یـا شـۆرەت و نێوبـانگێکی جیهـانی پـێ پەیـدابکات. کـە هـەوەڵین بەشـی ڕۆمانەکـە بـۆ ڕۆژنامـەی "پـەیکی ڕووسـیا" دەنێرێ، قەرارە لـەوێ بڵاوببێتـەوە، چەنـد ئامۆژگـاری و داواکارییـەکی دەگەڵـدا دەنێرێ. بۆ نموونە دەنووسێت: "تکا لـە بەڕێوەبـەری بـەرێز دەکـەم، ئاگـای لـەو ڕسـتانەبێ کـە لـە دەقەکـەدا بـە فەرەنسـی نووسـراون. باوەڕناکـەم هەڵـەیان تیابێ، بەڵام دووریش نییە بـە سـەهو هەنـدێ هەڵـەی تێکـەوتبێ." هـەروەها

لەسەری دەڕوات: "لە شوێنێکدا، ئەم دەستەواژەیەم بەکار بردووە: ئێمە تاجی شانازیمان لەسەر سەرانی چەپەڵ و ئەسپێون داناوە." تکات لێدەکەم. توخودا وشەی ئەسپێون لامەبەن."

کەمێک دوای نیوەشەو، کاتێ کە هەموو ئەوانەی کە لە ماڵەکەدا بوون، دەخەوتن، دۆستویفسکی لەبەردەم کاغەزەکانیدا، دادەنیشت و کووپە چایە ساردەکەی لەبەردەم خۆی دادەناو هێور دەبووەوە، توورەییەکەی دەڕەوییەوە. دەست بە نووسین دەکات، وەکو ئەوەی بچێتە جەنگە هەرە گەورەکەی ژیانی پیشەیی خۆیەوە. بەڕاست و بە چەپدا دەست دەوەشێنێ، هێرش دەبات، دەچێتە پێشێ، بەڵام ئایا ئەو توانایەی هەیە کە تا دوا قۆناغ. لەم خەباتەدا بەردەوام بێ؟ دوای ماوەیەکی دوورودرێژی هێوری و ئارامی، دووبارە نۆرە فێیەکەی سەرهەڵدەداتەوە.

"توخوا ئەمە حاڵە؟ من لێرە، لەسەر کورسییەکەم دانیشتووم، هەستدەکەم سەرم گێژ و قورسە، چوار پەلم سست و خاوە. ناتوانم هیچ کارێکی جدی ئەنجام بدەم. منداڵە چکۆلەکەم، گریە و زاری دەکات، ئەوەندەم پارە پێ نییە، بڕۆم لە دەرمانخانەیەک، دەرمانی بۆ بکڕم." بەوردی ئەو نۆرە فێیانە تۆمار دەکات کە لێی دەیێن: "نۆرە فێیەکی توند..."، "نۆرەفێیەکی کەمێک توند."، "نۆرە فێیەکی توند لە سەعات شەشی بەیانیدا... شەوێ بەتایبەتی لەبەر ڕوناکی مۆمدا، جۆرە خەمینییەکی ناخۆش. جۆرە ڕەنگدانەوەیەکی ڕوناکییەکی سوور بەسەر هەموو شتەکانەوە..." "لە سەعات سێی شەودا، نۆرەفێیەکی زۆر توند و مەترسیدار، لە ڕاڕەوەکەدا... کەوتم، نێوچەوانم بریندار بوو، پێستەکەی لێ بووەوە. تەنیا ئەوەندەم لەبیرە کە مۆمە هەڵکراوەکەم، لە دەرێرا هێنایە ژوورەوە، بێئەوەی بەر هیچ بکەوم. پەنجەرەکەم داخست، ئەوجا هەستم کرد کە خەریکە فێم لێدێت. بەلەز ئانێتم لە خەو هەستاند و لە وەزعی خۆمم ئاگادار کرد. کە دەموچاوی بە بریندارێ دیتم، دەستی بەگریان کرد... ویستم ژیری بکەمەوە، لەناکاوا نۆرە فییەکی تازە لێی دام... کاتێ کە وەخۆهاتمەوە، سەرم زۆر دەیەشا، نەمدەتوانی بە دروستی قسان بکەم. ئانێت پاشماوەی شەوەکەی بەدیار منەوە بەسەر برد: (ترسێکی سۆفیانەی توند). دۆستویفسکی بۆ ئەوەی بای باڵێک بدات و پشوویەک بدات، دەڕوات بۆ هامبورگ. لەوێ چ پارەیەکی پێ دەبی، هەمووی دەدۆڕێنێ. لە ئوتێلدا، نۆرە فێیەکی توندی دیکەی لێدێت، دەکەوێت و پشت ملی بریندار دەبێت. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "دوای یەک هەفتەش، هێشتا جێ برینەکە خۆش نەبوو بووەوە و بەزەقی دیار بوو." جارێکی دیکەش، خەمبار و شەرمەزار و نائومێد، وەکو سەگی تڕۆکراو بۆ شاری دریسد دەگەڕێتەوە.

دوستویفسکی له ١٨٧٠/٧/١٧دا، له دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: "دەگەڵ بەشی یەکەمی ڕۆمانەکەمدا، له جەنگ و جیدالدام، کارەکەم زۆر به قورسی لەبەر دەڕوات، هەست به ناکامی و نائومێدی دەکەم. تازە شەڕەکە دەستی پێکردووە. ئانێت فره شەکەته. ئیمی زۆر گڕۆز و تووڕەیە، ئیدارەی لەگەڵدا ناکرێت." سوپای ئەڵمان، فەرەنسای داگیر کردووە، خەڵکی شاری دریسد لەخۆشیاندا، له پێستی خۆ ناهێورن هەرچی ئامێرێکی گواستنەوە و بار هەیە، لەلایەن هێزێن سوپاییەوە به سوخرەو بێگار گیراون، خزمەتگوزاری پۆسته و گەیاندن وەستاوە هیچ ڕۆژنامه و بڵاوکراوەیەک له بەرلینەوە نایەت "شەڕە! هیوادارم کەس کاری به کاری منەوە نەبێ و کارەکەم دوانەکەوێت!.." "لەمبەر و لەوبەری ڕوباری ڕایندا نزیکەی سێ سەد هەزار سەرباز کۆبوونەتەوە... نرخی پاره دابەزیوە، هەموو شتێک گران بووە. نه ئەمان و نەئەوان، شتاقیان بەرگەی شەڕی درێژخایەن ناگرن و کەچی خۆ بۆ شەڕی درێژخایەن ساز دەدەن. چ دەقەومێ، ئەم ڕەوشه بەکوێ دەگات؟ بێگومان، سبه و دووسبەی شەڕی ڕاستەقینه دەست پێدەکات."
له بەرواری ٨/٧ دا ئەم ڕستەو وشه چرانه دەنووسێت: "ڕۆمانەکەم بەتەواوەتی پشتگوێ خستووە (بەڕاستی ناخۆشە) دوێنێ ٨/٦، فەرەنسییەکان شکستیان هێنا، شکستێکی گەورە. حاڵی حازر له هەنبەر شاری میتزدا خەریکی خۆ سازدانەوەن. وا وێنادەکەم زۆر دوو دڵن. بەخۆشیان نازانن چ دەکەن، بۆ کوێ بڕۆن. وەخت بەفیڕۆ دەدەن."
بەڵام دەشێت لایەنگری ئەو له فەرەنسییەکان، لەم شەڕەدا، له نامەکانیدا بخوێنرێتەوە. دەنووسێت: "ئەو قوتابخانه ئەڵمانییه چەند جوانه. ئەمانه وەکو خێڵی هۆنەکان قەتڵ و عام دەکەن، تالان و بڕۆ دەکەن.. پروسییەکان ڕەفتاریان دەگەڵ یەکدیدا، لەبەربەرەکانیش خراپتره. ئەوانەی که ئەم هەراو هەنگامەیه دەنەنەوە، جەماوەری خەڵک نین، بەڵکو زیاتر پروفیسۆر، دکتۆر و خوێندکارانن.
من هەموو شەوێک ئەو خەڵکانه له هۆڵی خوێندنەوەدا دەبینم. پێرێ من زانایەکی زۆر گەورە و لەزبرم بینی، که داوی سپی کەوتبوونه سەری، به دەنگی بەرز یەک بەخۆی هاواری دەکرد "پێویسته پاریس تۆپ باران بکرێت. پێویسته." ئەمه ئەنجامی کەرێتی خۆیانه، ئەگەر نەڵێین ئەنجامی زانستی خۆیانه." دوا ماوەیەکی دی دەنووسێت: "نا، ئەوەی به زەبری شمشیر و بەهێز ڕۆبنرێت، مەحاڵه پایەدار و بەردەوام بێت. کەچی هێشتا هەر هاوار دەکەن: ئەڵمانیای لاوا! بەڵام ڕێک بەپێچەوانەوە، ئەم میللەته، خۆی وێران کردووە، شنگ و هێزی لەخۆی بڕیوە، چونکه باوەڕی به بیری خوێنڕێژی و توندوتیژی هەیە. ئەم میللەته کەمترین هۆشیاری دەربارەی سەرکەوتنی فیکری و ڕوحی نییه، به ئەقڵیەتێکی سوپاییەوە، بەو جۆرە قسانه پێدەکەنن. نەخێر ئەمه میللەتێکی مردووە، میللەتێکی بێ ئایندەیە..."!
هەڵبەته، دامەزراندنی کومونەی پاریس، لەم سەروبەندەدا، کردیه کارێک که دوستویفسکی هێندەی دی دژی سوسیالیستەکان بوەستێ. دەنووسێت:

"... پیاوانی ئەم تەڤگەرە، ئیش و کاریان نییە، تەنیا ئەوە نەبێ باس و ستایشی بەهەشتی زەمینی بکەن (بەهەشتێک کە لەڕێگەی کۆمەڵەی سوسیالستییەوە لە حاڵی دروست بووندایە) بەڵام هەرکە دەگەنە دەسەڵات ئیدی زمانیان دەچێتە کلیلە و تاقە یەک قسەی ئەرێنییان لە زار نایێتەوە... تەنیا بۆ ئەوە ئازان سەران بپەڕێنن، بۆچی؟ چونکە کاری لەمە ئاسانتر نییە. هەڵبەتە ئەنجامدانی کاری باش قورس و دژوارە... ئەو ئاگرەی لە پاریس بەردرا، بەڕاستی کارێکی نەنگین و ڕیسواییەکی گەورە بوو. "هێرشە کوت و پرەکەمان سەرکەوتوو نەبوو؟" دەی باشە! باشترا! با خەڵکی لەنێو بچن، دوایان ببڕێتەوە، چونکە کومونە (حکومەتی شۆڕشگێری پاریس، ساڵی ١٨٧١) باڵاترە لە بەختەوەری خەڵکی و شاری پاریس."
"ڕۆژئاوا (بەهۆی هەڵەی مەزەبی کاتولیکی)یەوە حەزرەتی مەسیحیان لەدەست دا، لەبەر ئەمە، تەنیا لەبەر ئەمە دەمرێت."
بەمجۆرە، ڕووداو و بویەرە سیاسییەکان، زۆری تووره دەکەن و دەکەنە کارێک بەتوندی دژی سوسیالیزمی فەرەنسی بوەستێتەوە. ئیدی ژیانی هەندەران، ژیانی لە دەرێی ڕووسیادا لێدەبێت بەزندان، زندانێک کە ناتوانێت خۆی لێدەرباز بکات و خۆی ڕزگاربکات. بۆیە مانەوەی بۆ یەک ساڵی دی لە ئەڵمانیادا، زۆر بەلاوە قورس و ئەستەم دەبێت. هەستدەکات کە وڵاتەکەی لەیادبردووە، ئیدی بابەتی نەتەوەیی و نیشتمانی، بەهرە و تواناکانی جۆش نادەن. لە سەرچاوەی نیشتمان پاراو نابێت. وەکو هەر کەسێک لە خاکی خۆی هەڵبڕابێ، بابایەکە وێڵ و سەرگەردان. لە فلورانساوە دەنووسێت: "تورگینیف، لە وڵاتی بێگاناندا دەپوکێتەوە، وشک دەکات و بەهرەی خۆی لەدەست دەدات، وەکو چۆن ڕۆژنامەی دەنگ پێشبینی ئەمەی کردووە. من ترسی ئەوەم نییە ببمە ئەڵمانی، چونکە من ڕقم لە هەموو ئەم ئەڵمانیانەیە، بەڵام من پێویستم بە ڕووسیایە. بەبێ ڕووسیا هەرچی توانا و بەهرەم هەیە دەپوکێتەوە، تیا دەچم، لیدەبمەوە. من هەست بەمە دەکەم، بە هەموو بوونمەوە هەست بەمە دەکەم."
لە "دریسد"شدا، گلەیی و گازاندەی دوستویفسکی بەردەوام دەبێت. دەنووسێت: "کاشکێ دەتانزانی چەند بێزارم، چەند دڵم تەنگە، چەند ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ڕووسیا دەکەم..." یا کە دەڵێت: "بەڕاستی من خەریکی دوورکەوتنەوەم نەک لە سەردەم و ڕۆژگار، نەک لە زانینی ڕووداوەکانی ڕووسیا، بەڵکو لە ڕەوت و شەپۆلی خێرای ژیان" یا دەنووسێت: "خێرا، خێرا دەبێ بۆ ڕووسیا بگەڕێمەوە، خۆم لە وڵاتی بێگانان، لە هەندەران و خەیاڵاتی پوچ و بۆش و بەتاڵی ئەوێ ڕزگار بکەم."
لێ پارەی خەرجی سەفەر لەکوێ بێنێ؟ ئیدی هەوڵدەدات داوای پارە لە ستیلوفسکی بکات، کە خەریک بوو ڕۆمانی تاوان و سزای بەکتێب چاپ و بڵاو دەکردەوە. بەڵام ئەم پیاوە فێڵباز و کەڵەکچیە، خۆی لە داواکەی دەدزێتەوە و ئەوسا ئەو پارەیەی ناداتێ. ئیدی مایکوف، ڕوو لە سەندوقی کۆمەڵەی ئەدیبان دەکات کە پڕی سەد ڕۆبڵ قەرزی بدەنێ تا دوستویفسکی بتوانێت بۆ

وڵاتی خۆی بزڤڕێتەوە. بەڵام لیژنەی سەندووقی نێوبراو بە کۆدەنگی ئەو داوایە ڕەتدەکەنەوە و ئەو قەرزەی نادەنێ. دوستویفسکی لەمبارەیەوە دەنووسێت: "ئەگەر بابایەکی نەهلیست داوای قەرزی لێکردبان، بەم شێوەیە وەڵامیان نەدەدایەوە." جا بۆ نەگبەتی، ئانا دیسان سکی دەبێت.
دوستویفسکی لە ٢٩/حوزەیراندا، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: "ئانا لاوازە، توورەیە، کەم دەنوێ. تۆ بڵێی حامیلە بێت؟... من دەترسم، بەڕاستی تیا ماوم، ئەگەر ئەم بایە لەم کونەوە بێت، ناتوانم ئەم کتێبە تەواو بکەم..." ئانا بۆ ئەوەی مێردەکەی هێور بکاتەوە، پێشنیازی بۆ دەکات کە بۆ ویسبادن بڕوات و بەختی خۆی لە گەمەی ڕۆڵێتدا تاقیبکاتەوە. دەچێت بۆ ویسبادن و کۆمیدیا هەمیشەییە کە دەست پێدەکاتەوە. دوستویفسکی خۆی بە هۆڵی ڕۆڵێتەکەدا دەکات. بەشداری گەمە دەکات، ئاقڵانە یاری دەکات، بە پارەیەکی کەم بەشداری دەکات، دەباتەوە، هەژدە تالیر دەباتەوە، بیر لەوە دەکاتەوە وازبێنێ و لە هۆڵەکە وەدەربکەوێ، بەڵام لەم ساتەدا، بیرێکی کوت و پڕی بەمێشکدا دێت، دەگەڕێتەوە سەر مێزە سەوزەکە، ئیدی دۆڕان دەست پێدەکات. دۆڕان لە دوای دۆڕان. ئیدی لە سەعات نۆی شەوا چی بردبووەوە هەمووی دۆڕاندەوە. ژێراو ژێر نیگایەکی حەسرەتباری سووچێکی ماهووتە سەوزەکەی سەر مێزەکە دەکات، تەمەشایەکی ئاوێزەو چڵ چراکان و سەروسیما نیمچە مردووەکانی دەوری مێزەکە دەکات وەکوشێت بە هەشتاو لە هۆڵەکە وەدەر دەکەوێ. بەهەڵاتن هەڵدێت، لە دڵی خۆیدا زۆر تەریق و شەرمەزار دەبێت، لە ناخا ئازار دەکێشێت، بیر لە ژنەکەی و کچۆڵەکەی دەکاتەوە کە چاوەڕوانی ئەون. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "هێندە پەست و خەمبار بووم یەکسەر چووم بۆ لای کەشیشێک. بەدەم ڕێگاوە، کاتێ کە بە جادە تاریک و کوتەکەکاندا، بێئەوەی جادەکان بناسم، ڕێم دەکرد، لە دڵی خۆدا دەمگوت: "ئەم کەشیشە پیاوی خودایە، خزمەتکاری خودایە، نابێ وەکو کەسێکی ئاسایی قسەی لەگەڵدا بکەم، بەڵکو دەبێ وەکو کەشیشێک قسەی لەگەڵدا بکەم کە ئیعترافم لێوەردەگرێت."
شار لە غوڕابی خەودا بوو، هەنگاوی کوێرانەی دەنا، سەری کوێت و قژی بژ، هێندە بەلەز ڕێی دەکرد، کە ئارەقە بەسەرو ڕوویدا دەهاتە خوارەوە، بەنێو کوچە و کۆڵانان کەوتبوو و بۆ ڕێگایەک دەگەڕا. سەرەنجام لەبەر پەرستگەیەک دەوەستێ. وا تەسەور دەکات ئەمە کڵێسایەکی ڕووسییە، دەیەوێ وەژوور بکەوێ. بەڵام ئەمە پەرستگەیەکی جوولەکە، کنێست بوو. لەمبارەیەوە دەنووسێت: "ئەمە بۆ من وەکو دوشێک ئاوی سارد ئارامبەخش بوو. بەپەلە چوومەوە بۆ ئوتێلەکەی خۆم. ئێستا کە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم، نیوەشەوە... تالیرم بۆ بنێرە، کارێکی وەها دەکەم بەشم بکات... ئانیتی ئازیزم. بەسەر دەست و لاقتدا دەکەوم، ماچت دەکەم. ئانێت وا زەن نەبەی کە من شێتم. بەرهەمێکی گەورە خەریکە لە زەینمدا دەخەملێ و گەڵاڵە دەبێت، لە هەنبەر ئەمەشدا بیرێکی گەوجانە و هیچ کە دەدانە ساڵە عەزابم دەدات، بەرۆکی بەرداوم. ئیدی تەواو، هەموو شتێک پڕایەوە، یانی ئەمە دوا

گەمە بوو کە کردم. جاران قومار دەستی گرتبووم، بەڵام ئێستا نەوو دەستەکانم ئازادن. لە ئێستا بەدواوە، جگە لە کارەکانم بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکەمەوە. ئیدی تەواو، شەو بە خەیاڵی قومارەوە ناخەوم، خەون بە قومارەوە نابینم، ئەوە ڕۆیی. بۆیە کارەکەم خێراتر و باشتر دەچێتە پێشێ و، خودا هیدایەتم دەدات." ئانا لەو بارەیەوە، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت:
"ئەم بەڵێنەی کە زۆرجار درابوو، ئەمجارەیان برایەسەر، بەڵێنی یەکجارەکی بوو، فیدور هەرچەندە لە ئیمس بوو، پارەشی پێ بوو، دەیتوانی بۆ موناکۆ بڕوات، کەچی نەڕۆیی. ئیدی گەمەی لەبەرچاو کەوت. نەک چیتر گەمەی نەکرد، بەڵکو هەر باسیشی نەدەکرد. لەوە دەچوو هەوەسی قومار جۆرە نەخۆشییەک بووبێ و بەری دابێ، لەو دە ساڵانەی دواییدا، جارێکی دی تووشی نەبووەوە."
هۆی ئەم گۆڕانە کوت و پڕەی دوستویفسکی چ بوو؟ نە لە نامەکانی خۆیدا، نە لە یاداشتەکانی ژنەکەیدا، نە لە نووسینی دۆستەکانیدا، شتێک بەدی ناکرێت، کە ڕۆشنایی بخاتە سەر هۆیەکانی ئەم گۆڕانەی دوستویفسکی. ئایا لە ڕێگەی ئەقڵ و بیرکردنەوەوە یا لە ڕێگەی دڵ و سۆزەوە گەییە ئەو قەناعەتە کوتوپڕەی کە واز لەو خووە خراپە بێنێ و ڕێڕەوی خۆی بگۆڕێت؟ بە بۆچوونی من وەکو پێویست ئاوڕ لە بویەری چوونی دوستویفسکی بۆ پەرستگە جولەکەکە نەدراوەتەوە. دوستویفسکی لە قومارا زۆر پیس دۆڕا بوو. لەباری ڕوحی و دەروونییەوە زۆر پەشێوو پەرێشان دەبێت، ئیدی بۆ پەناگایەک دەگەڕێت، ئەو پەناگایە لە کڵێسای ئەرتەدوکسدا دەبینێ. کە ئەوەشی بە نیسب نابێت: وا تەسەرو دەکات بەرەو پیری فریارەسێک دەڕوات، بەڵام خۆی لەبەردەم کەسانێکدا دەبینێتەوە کە ئەو فریارەسەیان لەخاچ داوە. هەڵبەتە بۆ کەسێکی نەخۆش و توورە و خورافاتی وەکو دوستویفسکی بیرەوەری ئەو بۆیەرە، ئەوەندەی کار تێدەکات کە بەسەر خۆیدا زاڵ بێت و جارێکی دی ڕوونەکاتە قومار، با زۆریشی حەز لێبی.
فیدور میخائیلوفیچ، دەگەڕێتەوە بۆ دریسد، دوای ئەم دوا ڕیسکی قومارە، هێورو ئارام بوو بووەوە، ئیدی دەست بە کارکردن دەکاتەوە. تەنیا یەک خولیاو خەیاڵی لە مێشکدا بوو: ئەویش ئەوە بوو کە پێش ئەوەی ژنەکەی منداڵی ببێت، بۆ ڕووسیا بگەڕێتەوە.
ئیدارەی ڕۆژنامەی پەیکی ڕووسیا، کە بەبۆنەی جەژنەکانەوە سلفەیەکی بۆ نارد بوو، بەڵێنی ئەوەی دەداتێ سلفەیەکی تازەی هەزار ڕۆبڵی لە مانگی حوزەیراندا بۆ ڤڕێبکات.
فیدور نامەیەک بۆ کارتکوف دەنووسێت و تکای لێدەکات کە بەپەلە ئەو هاوکاریەی بۆ ڤڕێبکات. نامەیەکیش بۆ مایکوف دەنووسێت و تکای لێدەکات، جارێکی دیکەش قسە دەگەڵ ستیلوفسکیدا بکات. دۆستویفسکی بەکارەکەی خۆی، خۆی و ماڵ و منالەکەی دەژێنێ. نووسەرانی دیکەی وەکو تورگینیف، تۆلستوی و گونجاروف، پاداشتی زۆر و فرە لەسەر نووسینەکانیان

وەردەگرن، بۆچی پاداشتی ئەو لەوان کەمتر بێ؟ چما توانا و بەهرەی نووسینی ئەم لەوان کەمترە؟
دەڵێت: "ئەو ئەدەبەی ئەوان پێشکەشی دەکەن، ئەدەبی مۆڵکدارانە، ئەم ئەدەبە هەرچییەکی پێبوو، گوتوویەتی. (ئەوەندەی من بزانم تۆلستوی زۆر بەباشی گوتوویەتی.) هەڵبەتە ئەمە دوا شت بووە کە بیڵێ."...
بەڵام دوستویفسکی، "قسەی تازەی پێیە" و بەم قسانە دنیا سەرسام دەکات! بەڵام بیکەن بە خاتری خوا، وازی لێبێنن تا بەهێمنی لە وڵاتی خۆیدا کاری خۆی بکات!
ئەو پارەیەی ڕۆژنامەی "پەیکی ڕووسیا" بۆی نارد بوو، لە ئاخر و ئۆخری مانگی حوزەیرانی ١٨٧١دا دەگاتە ئەو. بەپەلە کەلوپەلەکانیان لە بارمتە دەردێننەوە، قەرزەکانیان دەدەنەوە، خۆ بۆ سەفەرە گەورەکە ئامادە دەکەن. دستویفسکی، بە دوو ڕۆژان پێش سەفەرەکەیان، چەند لوولە کاغەزێکی گەورە دەداتە دەست ژنەکەی و داوا دەکات بیانسووتێنێ. چونکە لای عەیان بوو کە لە سنووری ڕووسیادا، دەیپشکن و نایەوێ ڕەشنووسی ڕۆمانەکانی بکەونە دەست دەسەڵات وەکو چۆن کاتی خۆی کە لەساڵی ١٨٤٩دا گیرا بوو، ئەمەی لێقەومابوو. ئانا، بەخەمینی موغەیریەکە پێدەکات و بەرەو گڕی سۆپا دیواریەکە دادەنەوێتەوە، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕەشنووس ودەستنووسی گەمژە، مێردی هەمیشەیی و یەکەمین ڕەشنووسی شەیتانەکان، دەبێت بە کۆمەڵێک خۆڵەمێش و تروسکەی ئاگر لەنێوانیانەوە دەدرەوشێتەوە.
شەوی ٧/١٧ دۆستویفسکی و ماڵ و منداڵەکەی لە دریسدەوە بەرەو سان پتروسبورگ دەکەونە ڕێ. لە سنووری ڕووسیادا جانتا و بوخچەکانیان زۆر بەوردی دەپشکنن. دوستویفسکی و هاوسەرەکەی، شەکەت و ماندوو بەدیار جانتاکراوەکانیانەوە دەوەستن، بەرپرسی بازگەکە، بە نەفرەتەوە تەمەشایان دەکات، بەئانقەست ماتەڵیان دەکات، ئەگەر یەک تۆزی دی دوابکەون، لەوەیە لە قیتارەکە بەجێ بمێنن. ئیمی، کیژە چکۆڵەکەیان، لەبن لێوانەوە دەڵێت: "دایکە لەتێ نانم بدەیە برسیمە." یارۆی بەرپرس شانێک هەڵدەتەکێنێ و ڕێگەیان دەدات سواری فارگۆنەکەی خۆیان ببنەوەو قیتارەکە دەکەوێتەڕێ.
لە پەنجەرەی ڤارگۆنەکەوە، کە یەکپارچە گەردوتۆز بوو، خاکی ڕووسیا دیاربوو کە لەتۆ وایە بەخێرایی بەرەو دواوە دەڕوات دیاربوو، ئاسمانی ڕووسیا یەکپارچە تەنکە هەور بوو، بایەکە دەگەڵ خۆیدا ڕایدەدا. باریکە ڕێگایەک بە کەنار خاکرێزی جادەکەدا، بەناو گیاجاڕ و سەوزەزارێکدا بەرەو کوختەیەکی پەرپووت دەڕۆیی کە سەرەکەی بە قامیش و هەژک و بژاڵان گیرا بوو. ژنە گوندییەک، لە قەراخ جادەکەدا وەستاوە و دەستەسڕێکی سووری بەدەستەوەیەو بۆ ڕێبوارەکانی تەکان دەدات. سەرپۆشێکی چکڵنی بەسەرەوەیە. تورەکەیەکی بەدەستەوەیە کە لە توێکڵی درەختی قان دروستکرا بوو، جووتێ پاتاوی لە توێکڵە دار دروست کراوی لەپێدایە، هاوار دەکات، بەدەم پێکەنینەوە لەنێو تەپوتۆزی قیتارەکەدا ون دەبێت. ڕووسیای ڕاستەقینە دەردەکەوت، نەک ڕووسیای ڕۆشنبیران و هزرڤانانی توورە و ناڕازی

و ئاشوبگەران، نەک ڕووسیای شەیتانەکان، بەڵکو ڕووسیای خاک، ڕووسیای کار، ڕووسیای باوەڕ، ئەو ڕووسیایەی کە خەڵکان ڕزگار دەکات.
دوستویفسکی، زۆر خەمبارە. تەمەشای ژن و کچەکەی دەکات. زۆر ماندوون، سەریان ناوە بەیەکەوە و وەنەوز دەدەن. گوندێک، بەکڵێسا سەوزەکەیەوە، بە بەرچاویاندا تێدەپەڕێت. دنیا گەرمە. بۆنی ناخۆشی ڕۆن، بۆنی ئارەقەی لەش و زوخاڵ و ڕەژوو لەنێو فارگۆنەکاندا پەنگی خواردووە. بەڵام فیدورمیخائیلوفیچ گوێی لەمانە نییە. ئێستا هەمان ئەو هەستەی لایە کە کاتی خۆی لە تاراوگەی سیبریا ئازاد بوو بوو. ئیدی وای هەستدەکرد، بۆ جاری دووەم لە دایک بووەتەوە. ئایا وەکو ئەوسای کە لەسیبریا گەڕابووەوە، ئەمجارەش وای هەست دەکرد، کە لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا خەوێکی قورسی لێکەوتووە و هەنووکە لە وڵاتێکا کە بۆ ئەم بێگانەیە، لەخەو ڕادەبێت؟ نا، نا، ئاگای لە کاروبارو هەواڵی وڵاتی خۆی هەبوو. هێشتا بابایەکە ڕووس، بەرهەمەکانی بەڵگە و نیشانەی ئەمەن. ئایا ڕۆمانی شەیتانەکان، خۆی لەخۆیدا داکۆکی نییە لەبەرانبەر ئەو شەیتانانەدا کە حەزرەتی لوقا باسیان دەکات؟
"لەوێ، لەسەر چیایەک، مێگەلە بەرازێک دەلەوەڕان، شەیتانان لە عیسا پاڕانەوە کە ڕێگەیان بدات، خۆ بەنێو بەرازەکاندا بکەن. عیسا ڕێگەی دان، شەیتانەکان لەم پیاوە ڕەت بوون، خۆیان بەنێو بەرازەکاندا کرد، مێگەلە بەرازەکە ڕەوییەوە، لەو هەڵدێرەوە بە هەشتاو بەرەو خوار داگەڕان و خۆیان بە دەریاچەیەکدا کرد و تیایدا نقووم بوون."* (پڕوانە ئینجیلی لوقا، ٨، ئایەتێن ٣٢، ٣٣).

## فەسڵی دوازدەیەم
## شەیتانەکان

ئەگەر ڕۆمانی "تاوان و سزا" سەرگوزشتەو چیرۆکی پیاوێکە کە بەدەم جسوجۆی ئازادییەوە، سنوور و مەرزە ئەخلاقییە باوەکانی بەزاندووەو ئەنجامی کارەکەی بە خۆسەری و پیاو کوژی و تاوان شکابێتەوە، ئەوا ڕۆمانی شەیتانەکان، بریتیە لە ڕیسکی میللەتێک کە لەیاسا و ڕێساو پرەنسیپە ئەخلاقیە کۆمەڵایەتیەکان لادەدات و لە جیاتی ئەوەی خۆی ڕزگار بکات، خۆی گومڕا و وێڵ و سەرگەردان دەکات.
تاوان لە ئاستی تاکە کەسیدا، هەمان شوێن و پێگەی هەیە کە شۆڕش لە ئاستی کۆمەڵگەدا هەیەتی. ڕاسکولینکوف، گەرەکیەتی ئەوە بۆ خۆی بسەلمێنێ کە مێژوویەکی بچووک، یا کەسێکی خوێڕی نییە. دەیەوێ لە ڕێگەی کارێکی نەنگینەوە کە شایستەی سزایە، مافی ئازادی تەواو بۆ خۆی

به دەست بێنێ، بەگوتەیەکی دی ببێ بە خودای خۆی. بەڵام، عەوامفریوانی یاخی و شۆڕشگێڕ، دەیانەوێ بەهاو کەرامەتێکی میتابەشەری بە میللەت ببەخشن. دەیانەوێ لە ڕێگای قەتڵ و عام و زەبر و زەنگەوە کارێکی وا بکەن کە شایستەی ئازادی بیت و لە جیاتی ئیمان بەخوا، ئیمان بە میللەت دابمەزرێنن، وەکو چۆن ڕاسکۆلنیکۆفی یاخی ومورتەد لە دین و دیانەت بۆ ڕۆژی دووەمی دوای ئەنجامدانی تاوانەکەی، هەموو ئازادییەکی خۆی لەدەست دەدات و دەبێت بە کۆیلەی فیکرێکی نەگۆڕ و جێگیر، میللەتیش کە ڕادەپەڕێت و شۆڕش دەکات، لە دوا ئەنجامدا و لە کۆتایی ئەزموونەکەیدا، جگە لە کۆیلایەتی و پەشێوی و پەرێشانی هیچی دیکە نادورێتەوە.
بەڵێ، وەسوەسەی هەمیشەیی ئەم جۆرە بیرکردنەوە و هزرینەی کە "هەموو شتێک حەڵاڵە و ڕەوایە" دەشێت لایەنی شەخسی یا کۆمەڵایەتی هەبێت. ئەم دوو ئەزموونە، لە بچووکترین شت و لە نهێنی ترین، نهێنیانی خۆیاندا شانبەشانی یەکتر دەڕۆن. هەردووکیان لەدوا ئەنجامدا. ڕوو بەڕووی هەمان شکست دەبنەوە. ئازادی بەبێ خوا بوونی نایێت. ئەوەی لە دەرێی خوادادا بۆ ئازادی دەگەڕێت، سەرەنجام نکوڵی لە بوونی خۆی دەکات. سوسیالیزم مەسەیەکی ئۆلی و مەزەبییە و دەبێ بەو پێوەرە و لەو ڕوانگەیەوە بخرێتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن و داوەرییەوە.
لەڕاستیدا سوسیالیزم، سویالیزمی ڕووسی، تەنیا لە خەمی ئەوەدا نەبوو کە بەختەوەری و خۆشگوزەرانی بۆ چینی کرێکار دابینبکات، بەڵکو ئیدیعای کۆنترۆڵ کردن و ڕێکخستنی ژیانی ئەم دنیای ئینسانی دەکرد. ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە هەموو خۆشی و شادییەکی ئێمە، بەندە بە ژیانی ئەمڕۆمانەوە. سوسیالیزم، لە چارەنووسی مرۆڤدا، قۆناغێک نییە، بەڵکو ئۆل و مەزەبی تێکڕای تیرەی بەشەرە، ئامانجی مرۆڤایەتیە. لەم قوتابخانەو ڕێبازەدا خودا بوونی نییە. ئەبەدیەت وەهم و خەیاڵە، ژیانەوە و پەسلان لەئارادا نییە. جگە لە خۆشی و سەعادەتی دنیایی و زەمینی هیچ شادییەکی دیکە لە ئارادا نییە. سەعادەت، هەر ئەم سەعادەتە مەترياليیەیە کە هەموو کەسێک دەتوانێ بیگاتێ:
"ئێمە، بەختەوەری خەڵکانی لاواز و بودەڵە بەوانە دەدەین." هەموو شتێک لێرەدا، لەم دنیایەدا دەست پێدەکات و لێرەدا تەواو دەبێت. دنیا دەبێت بەمێرووستان. بەها فەردیەکان، ژیانی تایبەتی، هێز و ئەڵهاو کەڵکەڵە ڕوحی و فیکریەکان، هیواو ئاواتە بەرز و باڵاکان، هەمووی لەم مرداوی پوچی و نەهلیستی و بێ ئاگاییەدا، نابووت دەبێت. ئیدی دام و دەزگای دەوڵەت مەسئولیەتی ئەوە دەگرێتە ئەستۆ کە خۆراک بۆ ئەم مێگەلە داماوە دابینبکات، پەنایەکیان بۆ پەیدا بکات، هەندێ شادی ڕۆژانەیان بۆ دابینبکات ئیدی ئینسان وا دەزانێ بەختەوەرە.
بەڵام مرۆڤ تەنیا پێویستی بە بەختەوەری نییە. نان و قووتی ڕۆژانە، تاقە خواردنێک نییە کە ئینسان ئارەزووی دەکات. ئینسان هەموو ساتێک تینوو و برسی شتێکی باڵایە، شتێکی بەلەزەت، ڕەها و بەدەر لە تەسەوری ئەو، کە

نە بەکار کردن دەیگاتێ و نە بە فێڵ و دەهۆیان، ئینسان تینوو و برسی مەزنایەتیەکە بەدەر لە هەر پێوەر و پێوانەیەک، برسی مانایەکە کە ئەستەمە بێتە فامین و دەرککردن، برسی بێ کۆتاییە، تینووی ڕەهاییە، تینووی باوەڕ، بەڵکو ئیمانە، تینووی خودایە.
ستیپان تروفیموفیچ، لە دوا فەسڵی ڕۆمانی شەیتانەکاندا دەڵێت: "هەموو یاسایەکی بوونی بەشەری و ژیانی مرۆڤانی بریتیە لەوەی کە ئینسان هەمیشە بتوانێ لەبەرانبەر شتێکی یەجگار گەورە وبەشکۆ سەر دابنەوێنێ. ئەگەر تیرەی بەشەر لەم شتە زۆر شکۆدارە مەحرووم بکرێت، ئیدی ئینسان مەیلی ژیانی نامێنێ و لە خەم و نائومێدیدا دەمرێت."
ئەفسووس، بویەرو واریقاتەکان، ئەوەیان سەلماند کە ستیپان بایەخێکی یەجگار گەورەی بۆ مرۆڤ لەبەرچاو گرتبوو. هەڵبەتە لەو سەروبەندەدا کە دوستویفسکی ڕۆمانی شەیتانەکانی دەنووسی، تەڤگەر و بزاڤی نەهلیستی هێشتا بایەخی پەیدا نەکردبوو و ئەو قاڵب و ئامانجە دیاریکراوەی نەبوو کە دوستویفسکی لە ڕۆمانەکەیدا بۆی داناب‌وو. بۆیە هاوعەسرانی ئەو لە ساڵانی هەفتایەکانی ئەو سەدەیەدا، خەڵکانی شۆڕشگێری تەواو عەیار و دوو ئاتەشەی وەکو ستافروگینەکان، کریلوفەکان، شاتوفەکانیان نەدەناسی، تەنانەت "نچایف"ش کە دوستویفسکی بۆ دروستکردنی سیمای شووم و دزێوی فرخوفنسکی، کردبووی بە مۆدێل، هەرگیز خودانی ئەو جۆرە کەسایەتی و دیدە کامیلە نەبوو. ئەم جۆرە یاخی و پیلانگێڕە شەیتان سیفەتانە، سوسیالیستانی توندڕەو، لە سەدەی بیستەمدا دەردەکەون. لەڕاستیدا دەبوایە لە سەدەی بیستەمدا، بابەتی ئەم ڕۆمانە بخرایەتە ڕوو و پێگەی دروستی خۆی وەربگرتایە:
شەیتانەکان،پێشگۆیی، پێشبینییەکی بلیمەتانە و غەیبگۆییەکی یەجگار هەستیارە کە لەکاتی بڵاوبوونەوەیدا هەموو لایەنە جیاواز و بەها جۆراو جۆرەکانی ڕوون و خویا نەبوو. لە سەردەمی بڵاوبوونەوەیدا خەڵکی تەنیا جۆرە کاریکاتۆرێکیان دەربارەی بارودۆخی ئەو زەمانە تێدا دەبینی و هەرگیز تەسەوری ئەوەیان نەدەکرد کە ئەم وێنە کۆمیدیە، بەو زووانە ببێت بە تابلۆیەکی واقیعی و تەواو لە کاریکاتۆرە ئەسڵیەکە بچێت. تراژیدیای شۆڕشی ڕووسیا (ئۆکتوبەر) هەمان سەرەنجامی شوومە کە ئەم ڕۆمانە گەورەیە پێشبینی کردبوو.
بەڵام لە هەنبەر ئەم هێرشە خوێناویەدا، پرسیارێک هەیە. کێ ئەوەی ویستبوو؟ کێ ئامادەی کردبوو..؟ زۆر چاکە،بێگومان پیاوانی ساڵانی چلەکان (١٨٤٠) ئەمەیان کرد، بیلینسکییەکان، تۆرگینیفەکان، ئازادیخوازانی نەعل لەپێ، کە بەچاوانی نزیکبینی خۆیانەوە بەرەو میلەت دەڕۆیشتن، بێئەوەی بە دروستی میللەت ببینن و لە میللەت بگەن. ئەوانەی کە نەیاندەزانی، بۆچوونە بەپەلە و کاڵوکرچەکانیان چ پێشهاتێکی گەوجانە و ناخۆشی لێدەکەوێتەوە.
هەر شۆڕشێک، دوو ڕووی یەک واقیع لەخۆ دەگرێت. لە زەمینەی ڕۆشنبیریدا، خەڵکانی پێشکەوتوو، فەیلەسووفانی توند و تیژ و هزرڤانانێک هەن کە خۆیان

بە بەرپرس نازانن و، لە زەمینەی پراکتیکیدا جەماوەرێکی سادە و سەرەتایی لەخۆ دەگرێ کە بەگوێرەی ئەو قسە کلێشەییانەی کە بەگوێیدا دەدرێت، داوەری دەکات. بیری گەیشتن بە ئازادی سەرمەستی دەکات و ڕێگە بە نزمترین غەریزەی پەنهانی خۆی دەدات کە بەبێ پەروا کاربکات. لێرەدا سیمای (هاوشێوە) واتە گلیادکینی تووڕەو تڕۆ دەبینم، کە بەشێوەیەکی نهێنی لە هەر یەکێکماندا هەیە، ئەو سیمایەی کە مایەی پەسەندی دۆستویفسکییە. ئەم هیچ و پوچ و خوێنڕێژانە، بەرهەمی کاری مامۆستاکانیانن، کاتێ کە دەڵێن: "باشە ئێوە نەتان دەگوت هەموو کارێک ڕەوایە؟" مامۆستایان و ڕۆشنبیران چ بەرسڤێک دەدەنەوە. ئینتلجنسیای ڕووس، ستیانەکان و ئیڤان کارامازوفەکانی ساڵی ١٩١٧، دوای شۆڕشی ڕووسیا چ بەرسڤێکی خەڵکیان دایەوە؟ ئەوانە ئێستا ڕۆیشتوون، لە کارو کردەوەکانی خۆ هەڵاتوون و چاوەڕوان دەکەن. چاوەڕوانی چی. ئێستا چاوەڕوانی ئەو ڕاپەڕینە میللی و جەماوەرییەن کە دوستویفسکی لە شەیتانەکاندا، بۆی دانابوون و پێشبینی کردبوو.
شەیتانان، بۆ هەمیشە لە جەستەی مەزنی ئەو قوربانیەدا کە چووبوونە کلێشەیەوە، نامێنن. خودا بێدارە و ڕۆژێ دێ کە ئەم گەلە شەیتانانە، هەڵێن وبچنە پێستی بەرازانەوەو بەرازان شێتانە هەڵێن و ئینجیل گوتەنی بکەونە دەریاوە. دوستویفسکی دەنووسێت: "نەخۆش، چاک دەبێتەوە، لەبەر پێی مەسیحدا دادەنیشێت و بەسەرسامی تەمەشای دەکەین. ئێوە پاشان تێدەگەن ئێستا ئەمە من نیگەران و پەرێشان دەکات. ئێوە پاشان تێدەگەن. هەموومان پێکەوە تێدەگەین..."
شەیتانەکان، وەکو ڕۆمانەکانی دیکەی دوستویفسکی، لە ڕووی ئانتریگی چیروکڤانییەوە، بایەخێکی کەمتری هەیە تا لەڕووی نێوەڕۆکی فیکرییەوە کە کاراکتەرەکانی ڕۆمانەکە لەوێوە خۆراک وەردەگرن و گەشە دەکەن. بیر، دەکاتە کاراکتەرانی ڕۆمانەکە، چونکە لێرەشدا هەر کاراکتەرێک نوێنەری فیکرێکە. وەکو چۆن ئەمە لە گەمژە و لە برایانی کارامازوفیشدا، دیار و بەرجەستەیە.
تاپۆی شێواوی فیرخوفنسکی، لە سەرانسەری ڕۆمانەکەدا زاڵە، دوستویفسکی، سیمای فیرخوفنسکی بەگوێرەی ئەو سەند و بەڵگەنامەیەی کە لەفایلەکەی نچایفەوە بەدەستی هێنابوو و، هەروەها بەگوێرەی ئەو شتانەی کە دەربارەی پیلانەکەی سپیچنیف لەبیری مابوون، وێنەکێشاوە. ئەمە هەمان ئەو کەسەیە کە جاران لەبارەیەوە دەیگوت: "ئایا دەزانن کە هەنووکە مفیستوفلسێکم لەگەڵدایە؟"
لەڕاستیدا، فیرخوفنسکی بۆ خۆی مفیستوفلسێکی ڕاستەقینەیە. نووسەر دەڵێت: "ئەو، لە هەوەڵەوە خۆشحاڵ دەبێت، پاشان، بەهۆی دەماوەری زۆر ڕوون و ڕەوانەوە، بەهۆی بەلاغەت و فەساحەتی قسە دەستکردەکانیەوە، کە پێشوەختە و بەردەوام ئامادەیان دەکات، بێزار و بیتاقەت دەبێت." هەندێجار زۆر بە ئەدەبە و هەندێجار بێ ئەدەب. ئەو هەرگیز پابەندی یەک قسە یان یەک ئامـاژە نابێت. نەخێر ئەو هەزار و یەک حیساب بۆ هەموو شتێک دەکات،

مەســـەلەکان لە هەمـــوو ڕوویەکەوە تـــاوتوێ دەکـــات و هەڵیاندەســـەنگێنێ، هەنگێ بەکاوەخۆ، زۆڵانە تۆڕەکانی خۆی بەهەموو لایەکـدا هەڵـدەدات. ئەو لە شـارێکی چکۆلەی گوند ئاسـادا، ئەڵقەیەکـی نەهلیسـتی لە دەوری خـۆی خڕ کــردووەتەوە بەڵام لەهەنــبەر کەســێکی شایســـتەی وەکـــو ســـتافروگیندا، بچووکی دەنوێنێ و کڕنۆش دەبـات. پیلانگێـڕان، بە پراکتیکـی گـوێڕایەڵ و گـوێ لەمستی ئەون (فیرخوفنسکی). لەنێـو گـروپ و دارودەسـتەی شـۆڕشـگێڕاندا، هەموو کەسـێک ڕقـی لێیەتـی و لێـی دەترسـێت. چـۆنیەتی بیرکـردنەوەی ئەو دەربارەی شـۆڕش فرە ترسناکە. دەڵێـت: "لایەنگرانـی ئـێمە تەنیـا ئەو کەسـانە نـین کە خەڵکـی دەکـوژن و دەبـڕن و دەسـوتێنن، یـا بەشـێوەیەکی کلاسـیکی هەڵدەکێشـنە دەمانچە و دەمانچە بەکاردێنن، یـا ئەوانەی کە گـاز لە ئەفســەرە لە ئەفســـەرە بەرپرســـەکانی خـۆ دەگـرن، ئەمـانە بێزارمـان دەکەن، بەڵکـو ئەو مامۆسـتای قوتابخانەیەیە، کە دەگەڵ قوتابییەکانیدا، گاڵتە بەخوای خـۆ دەکەن، ئەوانە لە هەوادارانی ئێمەن، هەروەهـا ئەو پـارێزەرەی کە داکـۆکی لە قەزیەی تاوانبـارێکی خـوێنەوار و ڕۆشـنبیر دەکـات، چـونکە ئەم بکـوژە، لە قوربـانیەکەی ڕۆشـنبیرتر بووە و بۆ وەدەسـتهێنانی پارە و پول، ناچـار بـووە قوربـانیەکەی خـۆی بکوژێت، ئەم پارێزەرەش یەکێکە لە ئـێمە. ئەو قوتـابی و خوێنـدکارانەی هەر بـۆ فشـە و بۆ تاقیکردنەوە جوتیارێکی کوێلە دەکوژن، ئەوانـیش لایەنگـری ئـێمەن و لەئێمەن."

"ئێمە شـۆڕشـێک بەرپا دەکەین کە هەموو شتێک لە بناغەوە هەرەس بێنێ و ئاوەژوو ببێتەوە." ئیدی دوای شـۆڕشـەکە چ دەبێت، هەنگێ فیرخوفنسـکی، بەگوێرەی ئەو پرۆگرام و سیستەمەی کە ئەندامێکی گروپەکە بەنێوی چیگالیڤ ئامادە و پێشـنیازی کردووە، کۆمەڵگەیەک لەسـەر بنەمای یەکسانی تەواو، دادەمەزرێنێ. دەڵێت: "لە سـەرەتاوە، ئاسـتی پەروەردە و فێرکردن و زانسـت و هونەر دێتە خوارەوە. تەنیا ئەقڵ و ئەقڵیەتی بەرز و ناوازە دەتوانێ بگاتە لوتکەی زانست و هونەر، لەم حاڵەتەدا کارو پیشـەی ئێمە دەبێتە ئەوەی ئەو ئەقڵ و بەها گەورانە پەروەردە بکەین، چمان داوە لەم سـەریەشـەیە؟ دەبی ئەو جۆرە خەڵکانە دوور بخرێنەوە، تڕۆ بکرێن، پەراوێز بخرێن، یا لەنێو ببرێن و بکوژرێن. دەبێ زمانی شیشرون ببڕین، چاوی کوپرنیک دەرپێنین، دەبێ شـەکسـپیر بەردە باران بکەین، ئەمەیە چیگالیفیزم"

ئیـدی بەمجـۆرە سانســـۆرە فیکـریە نەخشـــە بـۆ داڕێــژراوە، ئینســـان هەمـــوو کەرامەت و سـەنگ و شایستەییەکی مرۆڤانی خۆی لەدەست دەدات و گیـانی هەر جۆرە کەشـف و دۆزینەوە و داهێنـانێکی تێـدا دەمرێـت. دەبـێ بە داشـێکی نێو داشان، بەڵکو دەبێ بە گەوجێکی نێو گەوجـان. "گرینگتـرین هێـز، یـانی ئەو چیمەنتۆیەی کە ئەندامانی کـۆمەڵگە پـێکەوە گـرێ دەدات، ئەوەیە کە ئینســان شـەرم بکات لەوەی کە ڕاوبۆچوونی تایبەتی و سـەربەخۆی، خۆی هەبێت."

"ئینسانی سادەو، سـەرەتایی، حەز دەکـات وەکـو دراوسـێکەی بێـت، چـاو لەو بکات، دەترسێت، خاوەنی بیـرو بۆچـوونی تـایبەتی و سـەربەخۆی خـۆی بێـت، بەتەنیـــابێ، خـــۆی مەســـئولی خـــۆی بێـــت. کـــۆیلایەتی و ملکەچـــی ئەم

مەسـئولیەت و بەرپرسـیارێتییە ورد دەکـاتەوە، دابەشـی دەکـات، بەسـەر دنیایەک مێشکی چوون یەکیدا دابەشدەکات. ئیدی لە سـایەی ئەم پرۆسـەی هاوتەرازسـازییەدا، خەڵکـی نـاوازە و دیـار و سـەربەخۆ نـامێنێ. تەنـانەت ئەخلاقیش، دەبێت بەشتێکی ناشەخسـی، ئیـدی هەمـوو بـوون، ژیـان، بەدەر لە خێر و شـەڕ، بەڕێی خۆیدا دەڕوات.
"کەواتە بـۆ ئەوەی ئینسـان، بەو مەسـخییە، بەو کێـویەتی و هۆڤیـاتیە دەستکردەوە بمێنێتەوە، پێویسـتە لەهەر شـتێک کە لەگینە بێـداری بکـاتەوە و وەهۆشـی بێنێـتەوەو تـامەزرۆیی نیعمەتـی لەدەسـت چـووی بجـوڵێنێ، دوور بخـرێتەوە. دەبـێ لە خۆشـەویسـتی و پەیوەنـدی خـانەوادەیی دوور بخـرێتەوە.
"هەرکە خۆشـەویسـتی و خـانەوادە هـاتە ئـاراوە، ئیـدی مەیـل و ئـارەزووی موڵکایەتی سـەر هەڵدەدات و پەیدا دەبێت. کەواتە دەبێ ئەم مەیـل و ئـارەزووە بکـوژین، بەوەی ئـازادی تەواو بە بادەنۆشـی و مەیگوسـاری و بەدمەسـتی، بەتـۆمەت وئیفتـراو بوختـان و لە پاشـملەگۆیی بـدەین. ڕێـگە بە هەر بەرەڵلاییەکی هەوسار پچڕیو دەدەین. هەر جۆرە بلیمەتـی و بەهـرەیەک سـەر هەڵبـدات، لە هەوەڵەوە، لە بێشـکەدا خەفەی دەکەیـن، پێویسـتە هەمـوو شـتەکان لەیەک خاڵدا یەک بگرنەوە، ئەویش یەکسانی تەواوە..."
"ناو بەناو، بۆ ئەوەی نەبادا مێگەلەکە ماندوو و بیتاقەت بێ، ئاژاوە و ئاشـوبێکی چکـۆلەی نـاوچەیی ئەوتـۆ کە بە ئاسـانی بێـتە خەفەکـردن و دامرکانـدنەوە، بەرپـادەکەین. ئیـدی کەمینەیەکـی سـتەمکاری تاوانکـار، فەرمـانڕەوایی ئەم مـیللەت و جەمـاوەرە، بە کـۆیلەکراوە، دەکەن: "کـۆیلە، خێڵـی کـۆیلە، دەبـێ سـەرانیان هەبێـت." بەمجـۆرە، شـۆرش دژی حکـومەتێکی ستەمکاری،حکوومەتێکی ستەمکاری تاکڕەوانەی تازەی لێدەکەوێتەوە. "کـاتێ کە لەئـازادی بـێ مەرز و سـنوور دەردەچـم، دەگەمە دکتـاتوریەتی بـێ مەرزو سنوور"
تـاقە پرەنسـیپیک کە لەم ململانێـیەدا، تیـا دەچێـت، پرەنسـیپی ئـاین دەبێـت. خەڵکـی فەرمـانڕەوای زەمینـی خـۆ دەگـۆڕن و نکـۆڵی لە بـوونی فەرمـانڕەوای ئاسمانی خۆ دەکەن. بەڵام ئەم فەرمانڕەوا و ئەڕبابە تازەیە کێ دەبێ؟"
ڤیرخوفنسـکی بە سـتاڤروگین دەڵێـت: "شـەوێکی تاریـک بـاڵ بەسـەر سـەرانسـەری ڕووسیادا دەکێشـێ ، زەوی بـۆ خودایـانی پێشـوو دەگـری... لەم کاتەدا دەستی دوعا و نزا بەرزدەکەینەوەو داوای یـارمەتی دەکەیـن. لەکـێ، لە وەلیعاد، کـوڕە گەورەی تـزار، لە شـازادە ئیڤـان." مەبەسـت لە شـازادە ئیڤـان، هەمـان ئیڤـان سـتاڤروگینە. فیرخوفنسـکی ئەم دنیـایە بە ئیڤـان سـتاڤروگین پێشـکەش دەکـات. پێشـنیازی بـۆ دەکـات کە ئەفسـانەیەک لە دەوری کەسـایەتی خـۆی دروسـت بکـات، کە بەکەسـایەتی جـوان و بە هیـبەت و سامی خۆی جەماوەری خەڵک بـۆ خـۆی ڕابکێشـێت و فریویـان بـدات. دەڵێـت: "سـەرانسـەری جیهـان هەناسـەی ئـۆخەی هەڵدەکێشـێت، بەیەک ئـاواز دەخـوێنن: یاسـایەکی دادوەرانە بە فەرمـی ڕاگەیەنـرا. دەریـا تـا قـوڵایی خـۆی دەهاڕوژێ، کوختەدارینە کۆنەکە هەرەس دێنێ، هەنگێ بیـر لە دروسـتکردن و

بونیاتنانی خانوویەکی بەردین دەکەینەوە." ستاڤرۆگین وەڵامم دەداتەوە: ئەمە شێتایەتیە.
بەڵام، ئایا مێژووی ڕووسیا هەر هەمووی بریتی نییە لە یەک زنجیرە شێتایەتی؟ لەڕاستیدا، فیرخوفنسکی، جۆرە خۆشەویستییەکی شەیتانی و تەقوای ملکەچانەی بۆ ستاڤرۆگین هەیە. با ئەو دیمەنە بێنینە بەرچاوی خۆ کە بەهەڵەداوان دووی ستاڤرۆگین دەکەوێت و قۆڵی کراسەکەی ڕادەکێشێت. ئەویش بەئاستەم لەخۆی دەگرێ وەڵامی بداتەوە. فیرخوفنسکی پێی دەڵێت: "تۆ دامەزرێنەر و داینەمۆ و بزوێنەری. تۆ هەتاویت و من کرمی زەوی تۆم." لەناکاوا دەستی ستاڤرۆگین ڕادەمووسێت. ئیدی دەردەکەوێت کە ئەم لایەنگری یەکسانییە، هەستدەکات کە دەبێ باوەڕو ئیمانی بەکەسێکی لە خۆی باڵاتر هەبێت و ڕوپامایی بۆ بکات و لە هەنبەریدا بچووکی بنوێنێ. ئەم شۆڕشگێڕە یاخییە، لەوەوە دەست پێدەکات کە لە ئاغایەک بگەڕێت و گەورەیەک بۆ خۆی پەیدا بکات. ئەم بێ شەرم و ڕیسوایە، دەیەوێ کەسێک بپەرستێت، کە ئەو کەسە، ئەو دەبوغزێنێ و بە هیچی نازانێ. دەڵێت: "من دەزانم کە لێبۆکێکی چکۆلەم، بەڵام نامەوێ تۆش، کە باشترین بەشی بوونی منیت، بابایەکی لێبۆک بیت." هەروەها لەسەری دەڕوات: "من لە هەموو شوێنێک دوای تۆ دەکەوم. وەکو سەگێکی بەوەفا، لە دووتم." هیچ شتێک لەم مەیل و ئارەزووە پەنهانییە، بۆ ملکەچی و گوێڕایەڵی و خاکەساری و خۆشکێنی، لای بابایەکی خوا نەناس، سەیرتر و سەرنجڕاکێشتر نییە. هەڵبەتە خۆشەویستی یەکێکە لە پێداویستیە حەیاتیەکان، تەنانەت ئەمە لەلای کەسێکی وەکو "فیرخوفنسکی"ش هەیە. با ئەو سۆز و خۆشەویستیەی دەرهەق بە ستاڤرۆگین هەیەتی بگاتە ئاستی پەرستن و سەخافەت و مایەی پێکەنین و ڕیسوایش. گرینگ ئەوەیە فیرخوفنسکی، کڕنۆش بردن بۆ کەسێکی لەخۆی گەورەتر و بەپلە و پایەتر بەزەروری دەزانێت و ئەمەش بۆ مەحکوم کردنی تێکڕای سیستەمە کۆمەڵایەتیەکەی (یەکسانی) ئەو بەسە.
سەبارەت بە شازادە ئیڤان، خوایەکەی فیرخوفنسکی، لە سەرەتاوە زۆر ئاڵۆز و گۆنگ بوو، بە ئاسانی دەرک نەدەکرا، چونکە کاتکوفی وەشانکار، ڕەفزی کردبوو، فەسڵێکی تەواوی ڕۆمانی شەیتانەکان، لەژێر سەرناڤی: "ئیعترافی ستافروگین" بڵاوبکاتەوە. دەبوایە نیو سەدەیەک تێبپەڕێت تا ڕازی ڕاستەقینەی ئەم کاراکتەرە ئاشکرا ببێت و دەربکەوێت. ستاڤرۆگین، وەکو راسکولینکوف، یەکێکە لە "وێرانکارانی دیوار = قاڵب شکێنان" راسکولینکوف، پرەنسیپ و بنەما ئەخلاقیە کۆنەکانی هەژاند بوو. لەپێناوی گەیشتن بە ئازادیەکی خەیاڵی، تەواو خۆی ئەزیەت دابوو. هەم دژی خۆی و هەم دژی خودا، بەوپەڕی جۆش و خرۆش و جدی خەبتی بوو. ئەو بەخشرابوو، دووبارەو لەڕێگای مەسیحەوە خۆی دۆزی بووەوە. چونکە بێئەوەی بەخۆی بزانێت، لە حەزرەتی مەسیح گەڕابوو. بەڵام ستاڤرۆگین لە جستوجۆی هیچ شتێکدا نییە. راسکولینکوف، کاتێ باوەڕ دێنێ، بەڕاستی باوەڕ دێنێ، کاتێ کە

باوەڕی نیە، بەڕاستی باوەڕی نییە، واتە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ڕاستدەکات. بەڵام ستاڤروگین کە باوەڕ دێنێ، باوەڕی بەخۆی نیە کە باوەڕی هەیە، کە باوەڕ نایەنێ باوەڕی بەوە نییە کە باوەڕی نییە." راسکولنیکوف، کەسێکە حەزی لە نکۆڵی کردنە. بەڵام ستاڤروگین، ئالودەی ئەم کارەیە، واتە خووی بە نکوڵی کردنەوە گرتووە. نەک حەزی لێ بێ. باوەڕی خۆی خۆشناوێ، چونکە کول و کۆڤان و ئازاری پێویستی لە پێناوی گەیشتن بەو باوەڕەدا، نەکێشاوە. ئەم باوەڕ و قەناعەتە بەشێوەیەکی ئاڵۆز و سەرڤە سەرڤە چووەتە دڵیەوە. ئەمەی کە خودا بوونی نییە، ئەخلاق ناکاتە هیچ و هیچ مانایەکی نییە "هەموو شتێک حەڵاڵ و ڕەوایە" هیچ سزایەکی دەروونی و پەنهان لەئارادا نییە، هەموو ئەمانە بەلای ئەوەوەو لە نۆرینی ئەوەوە، ئاساییە.
جا ئەگەر ڕەفزی پرەنسیپی ڕوحی و مەعنەوی. هیچ کارێکمان تێنەکات، ئەگەر بەرامبەر بە هەڵگەڕانەوە لە ئیمان، بەپێویستی نەزانین داکۆکی لەخۆ بکەین، ئیدی چۆن دەتوانین مومارەسەی خۆشەویستی، ڕق و نەفرەت بکەین، هیوا و ئومێدمان هەبێ، هەبین و بژین؟ جا ئەگەر کار بۆ هاتنە دی نیازە باشەکانی خۆ نەکەین، مانای وایە ئەم خوانەناسە خوێنسارد وهێورە، بە خورتی، خۆی ناچارکردووە تا هەموو سەرچاوەکانی سوزە ئینسانیەکان لە بوونی خۆیدا وشک بکات. ئیدی مانای وایە نازانێ بۆچی هاتووەتە دنیاوە و بەلاشیەوە گرینگ نییە بیزانێ. ئیدی بەنامرادی و نائومێدی درێژە بە ژیانی ڕۆژانە دەدات، ئیدی بێزاری و بێتاقەتی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و هەست پێنەکراو باڵ بەسەریدا دەکێشێت. هەڵبەتە بێزاری و نائومێدی لەبێ ئیمانی و خوا نەناسییەوە سەرچاوە دەگرێت. ئیدی چ بکەین؟ چ شتێک بکەین و بڵێین کە شایستەی کردن و گوتن بێت. چونکە تەنیا بۆ خۆمانی دەکەین و بۆ خۆمانی دەڵێین؟ ستاڤروگین لە هەوڵ و خەمی ئەوەدایە نامرادی و بێزاری لەخۆی بڕەوێنێتەوە. هەموو جۆرە سەرگەرمییەک بەلای ئەوەوە بۆ ئەو کارە باشە، چونکە هیچ شتێک لای ئەو حورمەتی نییە. هەر شتێک ڕەوتی ئارامی ژیان بشڵەقێنێ، بەلای ئەوەوە پەسەندە. کە زللەیەکی لێدەدرێت، بیر لەوە ناکاتەوە بەرپەرچی بداتەوە، چونکە دەیەوێ لەم ڕێگایەوە هەستێکی تازەی سەر شۆڕی و بچووکی لەناخی ناخیا تاقیبکاتەوە. دەڵێت: "ئەگەر بتوانرێ بەم شێوەیە غەزەبی خۆت ڕام و جڵەوی بکەیت، خۆشی و شادیەکی لە تەسەور بەدەر، دێتە دی." بەوپەڕی بێشەرمی دزی دەکات و پێیوایە خۆشە. لە دوئێلدا خۆی بە دۆران دەدات، تا ئەوپەڕی تووڕەیی و شەرمەزاری بجەڕبێنێ. کچۆڵەیەکی داماو دەگرێتە بن قامچی بەو بیانووەی کە دزی کردووە و لەکاتێکا لە پەڕەی گوڵ پاکترە، پاشان دەستدرێژی دەکاتە سەر. هیچ هەوڵێک نادات کە نەیەڵێ ئەم کچۆڵەیە خۆی بکوژێت، دەبینێ کە خۆی بە کوختەیەکی تاریکی بەرپووتدا دەکات، تەمەشایەکی سەعاتەکەی دەکات، بیست دەقیقەیەک چاوەڕوان دەکات، ئەوسا لە درزی دەرگاکەوە دەڕوانێتە ژوورێ و دەبینێ کچەی داماو خۆی هەڵواسیوە. ئەوجا دەڵێت: "ئەنجام ئەوەم بینی کە دەبوایە بیدینم."

کچەی داماو خۆی خنکاند.
"هەنگێ، بەدەم چا خواردنەوەو گفتوگۆوە دەگەڵ هەندێ لە هاوڕێیانی خۆمدا، بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا، ئەو قەناعەتەم لا دروست بوو، کە من نەمزانیوە خێرو شەڕ چییە، نەک هەر هەستم پێنەکردووە، بەڵکو بەلای منەوە خێرو شەڕ هەر بوونی نەبووە..." لەسەری دەڕوات: "بەڕادەیەک لە ژیان بێزار بووم، هەستم بە بێتاقەتی دەکرد." ئەم بێزاری و بێتاقەتیە تەنگ بە ستاڤروگین هەڵدەچنێ. وەکو نەخۆشێک بیەوێ باشترین وەزع لەسەر جێگا وەربگرێت، تەنیشتا و تەنیشت دەکات.
جا بۆ ئەوەی خۆی لەم وەزعە تازەیە بدزێتەوە لە سەرەتادا بیر لەوە دەکاتەوە، قوربانی بە ژیانی عاتیفی ڤێزەونی خۆی بدات. ئیدی هەڵدەستێت ژنێکی شەلی، ناسیرینی ناحەزو دزێو دەخوازێ "بیرۆکەی زەماوەندی کەسێکی وەکو ستاڤروگین، دەگەڵ بوونەوەرێکی وا ڤێزەون و دزێودا، ئەعسابی تێک دەدات." زەماوەندەکەی ئەو ئەنجامی قەیرانێکی شێتانە یا ئەنجامی مەستی و بادەنۆشی نەبوو، نەخێر، زۆر بەشێنەیی و ئارامی، بەوپەڕی ڕوودارى و سەخافەتەوە دەیخوازێت. دەیەوێ بزانێ...
بەڵام ئەم زەماوەندە کۆمیدی و سەیرە، سوکنایی پێنابەخشێت. لەم سیناریۆ نەنگینەش زوو بێزار دەبێت. ئیدی بەدووی هەڵەو تاوانێکی تازەدا دەگەڕێت، تا لەو ڕێگایەوە ئارامی خۆی بشڵەقێنێ. ژنێکی دیکە بێنێ؟ بیکات بەدوان؟ بۆ ساتێک بیر لەوە دەکاتەوە، پاشان وازی لەو بیرەش هێنا. تاپۆ و تارمایی کچە چکۆلەکە، زۆرجار دەهاتە خەوی. بەهەرحاڵ ئەو نیگەرانیەی کە ئەو خەونانە بۆیان دروست دەکرد، خەم و پەژارەی ئەو ناڕەوێننەوەو دەردی دەرمان ناکەن، بەپێچەوانەوە خەم و پەژارەی زیاد دەکەن. ئیدی ناچار تێکەڵی خەباتی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەبێ، خوو دەداتە سیاسەت، لێ مخابن لەنێو شۆڕشگێڕان و یاخییانیشدا، ئارام و ئاسوودە نییە، چونکە ئیمانی پێیان نییە.
ئیدی فیرخوفنسکی هاوار دەکات: "ستاڤروگین، گەوجتربە گەوجتر!" ستاڤروگین نە باوەڕی بە ئۆلی مەسیح هەیە نە بەمەزەبی سوسیالیزمی ڕووسی. دیارە بیرۆکەی بەهەشتاندنی زەوی بە گوێرەی ڕێنمایی و ڕێبازی چیگالیف، بەهیچ شێوەیەک دڵی خۆشناکات، هەروەها بەڵێنی ئەوەی کە ڕۆژێک لەڕۆژان بێت بە شازادە ئیڤانی وەلیعادش، نەک دڵی خۆشناکات، بەڵکو گاڵتەشی پێیدێت. هەر هەموو ئەمانە پەشمن، بەچی دەچن؟ کوشت و بڕ، قەتڵ و عام، دامەزراندنی شانەێن کرێکاری لەسەر دارو پەردووی شارستانیەت، دانانی دکتاتۆریەتێکی تازە بەسەر ڕەش و ڕووتانی گێل و گەمژەوە، هیچ یەکێک لەمانە دادی نادەن و بێزارییەکەی لێ ناڕەوێننەوە.
تەنیا پەشیمانی و تۆبە دەتوانن باری سەرشانی سووک بکەن. پەشیمانی دەکاتە تۆبە و ملکەچی. بیر لەوە دەکاتەوە ئیعترافاتەکەی خۆی بڵاو بکاتەوە، تا ڕوو بەڕووی تەوس و توانج و جوێنی جەماوەری خەڵک ببێتەوە و لەم ڕێگایەوە خۆی ئازار بدات و هەست بە بچووکی خۆی بکات، هەنگێ دەگاتە سەرچاوەی ڕوناکی. ڕاسکولنیکوف کاتێ کە پەی بە هەڵەی خۆی بردو داوای

بوردنی کرد، تۆبەکەی لێ قەبووڵ کرا. دیارە ئەم ئارەزووی تۆبەکردنەش، خـۆی لەخۆیدا جۆرە پاداشتێکی ئاسمانییە.
بەڵام ستاڤرۆگین، لەکاتێکا کە دەیەوێ خۆی بداتە بەر ڕێژنەی سەرزەنشت و تەوس و توانجی خەڵکی و کەمێک پاک ببێتەوەو ویژدانی ئاسوودە ببێت، لەهەمان کاتدا دەگەڕێتەوە سەر خەمساردی و بێ موبالاتیە ترسناکەکانی خۆی.
فیرخوفنســکی، چەنـد شۆڕشــگێڕێکی بــێ ســەروبەرو نالەبـاری لە دەوری ســـتاڤرۆگین کــۆکردووەتەوە. پیلانگێڕەکــان دڵنیــابوون لەوەی کە ئەڵــقەکەی ئەوان، لە ڕووسیادا، یەکێکە لە سەدان ئەڵقەی دیکەی سەرانسەری ڕووسیا.
فیرخوفنسکی وای حاڵی کردوون کە لەلایەن کۆمیتەی ناوەنـدی ئەو شـانەو ئەڵقانەوە بۆلای ئەوان نێردراوە، بۆیە تەنیا باسی پەیوەندییانی نهێنـی، ئەمـری سەرکردایەتی و تەماس لەگەڵ فڵان و فیساردا دەکات. بەجۆرێ ڕەفتار دەکـات کە ئەندامانی پیلانەکە، لە یەکدی بکەونە گومانەوە. ترسی خیانەت لە دڵیانـدا دادەچێنێ. ئیـدی لەم ڕێگـایەوە. بەسـەریاندا زاڵ دەبێـت، چـونکە هـیچ یەکێـک لەوانەی دەوروبەری، متمـــانە بەیەکــدی نــاکەن. دوای شـــەڕوئاژاوەیەک کە فیرخوفنســـکی نـــایەوە، دوای ئـــاگر نـــانەوەیەک و دوای کوشـــتنێک، ئیـــدی ئەندامانی گروپەکە بەخۆیان تاقەتیان لەکارەکەی خۆیان دەچێت و بێـزار دەبـن: "ئەم کارانە بەرەو کوێمـان دەبەن؟" فیرخوفنسـکی بـۆ ئەوەی دووبـارە زاڵ بێـت بەســـەریاندا، یەکێــک لە گـــروپەکە بەنێــوی شـــاتوف بەوە تاوانبـــار دەکـــات کە دەیەوێ خەبەر لە هەموویـان بـدات و لەنێویـان بەرێـت، بـۆیە دەبـێ بکوژرێـت و لەنێو ببرێت.
هەڵبەتە فیرخوفنسکی، بیر لەوە دەکاتەوە کە تاوانێکی دەستەجەمی ڕێکبخات، تا لەو ڕێگایەوە، بەهۆی ترسەوە بیرو باوەڕیان پتەوبکات و یەکیان بخات. وا بیر دەکاتەوە کە ئەگەر ئەم تاوانە بێتە ئەنجامدان، هەموو ئەندامانی گروپەکە لەترسا و لەڕقا لێکدی نزیک دەبنەوە و یەکتر دەگرن.
ئەم شاتوفەی کە فیرخوفنسکی دایناوە بکرێتە قوربانی "یەکێکە لـەو تۆباویـە ئایدیالیستە ڕووسـانەی کـە دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەری و بانـدۆری هـەر بیرێکـی بـەهێزەوە و یەکســەر هەڵدەگەڕێتـەوە." جـاران لیبڕاڵێکـی بـاوەڕدار بـوو، بـەڵام هەنووکە کە لە بیر و باوەڕی سەردەمانی گەنجی ژێـوان بووبـووەوەو بەئاشـکرا دژی فیرخوفنسکی وەستا بوو بووەوە. ئەم بادانەوەیە لە بیـرو بـاوەڕدا بـەجۆرێ نیگەرانی کرد بوو و بیری شێواند بوو، نەیدەزانی متمانە و بـاوەڕ بـەچی بکـات. پشت بەکێ ببەستێ، باوەڕ بەکێ بکات، چـۆن ژیـانی بگـوزەرێنێ. ئێسـتا زۆر تەنیا و بێتاقەتە. وێڕای ئەوەی نەفرەت لـە گروپەکـەی فیرخوفنسـکی دەکـات و لێی بێزارە، بەڵام زاتی ئەوە ناکـات لێـی بێتـە دەرەوە. دەڵێـت: "مـن چ شـتێکم ڕەفـز کـردووە؟ دژمنـانی چـالاک و چەلـەنگی ژیـان، خـەڵکانی پاشـکەوتووی بەڕواڵـەت لیبـڕاڵ، ئـەوانـەی کـە لـە ئـازادی و سـەربەخۆیی خۆیـان دەترسـن، کۆیلەکانی فیکر، دژمنانی هـەر جـۆرە ئـازادی و هـەر چەشـنە مەسـئولیەتێک، مژدەدەرانـی لاواز و بودەڵـەو مـردەلـۆخ، باشــە ئەوانـە چیـان پێیـە؟ گەنـدەڵی و

کۆنە پارێزی، پیری و بێدەسەڵاتی ڕازاوە، کورت بینی بورژواییانە، یەکسانی حەسوودی ئەنگێز، یەکسانی بەدەر لە ڕەچاوکردنی بەهرەو توانای شەخسی، یەکسانی بەگوێرەی تێگەیشتنی خزمەتکارێک لە وشەی یەکسانی یا بەگوێرەی فامی فەرەنسییەکی ساڵی ١٧٩٣* ، بەڵام کارەسات ئەمەیە ڕوو دەکەیتە هەر شوێنێ، جگە لە خەڵکی فریوکار و خاپینۆک چ کەسێکی دیکەی لێنییە." (* - ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لەو ساڵەدا، لە کومونەی پاریسدا دەسەڵات کەوتە دەستی کۆمیتەی ئاسایشی گشتی و دادگای شۆڕشگێری.)

سەبارەت بە شاتوف سوسیالیزم، وەکو خودی دوستویفسکی دەڵێت بەبێ خوایی و خوانەناسی دەشکێتەوە. سوسیالیزم خوا نەناسییە، چونکە گەرەکیەتی بۆ خۆی جیهانێک لەسەر بنەمای یاسا زانستیەکان دابمەزرێنێ. لەحاڵێکدا گەلان بە گوێرەی یاسایێن پەنهان و گۆنگی دیکە پێکدێن و دەژین. مێژووی هەر میللەتێک بە جسوجۆی خودا، بە گوتەیەکی دی بە جسوجۆی خودای تایبەتی ئەو میللەتە دەشکێتەوە.

شاتوف دەڵێت: "ئامانجی هەر بزوتنەوەیەکی مەردومی (میللی) گەڕانە بەدوای خوای خۆیدا. خوای تایبەتی خۆیدا... هەر میللەتێک هەمیشە خودای تایبەتی خۆی هەبووە، کاتێ میللەتان بیر لەوە بکەنەوە کە خوایەکی هاوبەشیان هەبێت، ئەمە بەڵگە و نیشانەی داڕوخانیانە. میللەت تا بەهێزتربێ، تایبەتمەندی خواکەی بەرجەستەتر و دیارتر دەبێت. هەرکاتێ میللەت باوەڕیی بەوە نەما کە دەتوانێ لەڕێگای حەقیقەتەوە، دنیا بژێنێتەوە و ڕزگار بکات، مانای وایە دەستبەرداری ئەوە دەبێت کە میللەتێکی گەورە بێت و هەنگێ دەبێت بە مادە و کەرەستەیەک بۆ توێژینەوە سوسیولوجیەکان."

بە بۆچوونی شاتون، هەرمیللەتێک خودای تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا، تەنیا یەک خوای ڕاستەقینە هەیە. کەواتە هەموو میللەتان، جگە لەیەک میللەت، سەهون، بە هەڵەدا چوون. بەڵام کامە میللەتە کە خوای ڕاستەقینەی هەیە؟ شاتوف، بەرسڤ دەداتەوە: "ئەو میللەتە، میللەتی ڕووسە، چونکە میللەتی ڕووس تەنیا میللەتی مەسیحییە کە شارستانیەتی تازە نەی شێواندووە و گەندەڵی نەکردووە، چونکە تاقە میللەتی پاک و بێگەردە، سادە و دڵسافە، تاقە میللەتی ڕووی زەوییە کە بە مندالی ماوەتەوە.

بەمجۆرە شاتوف – دوستویفسکی پەیام و ئەرکێکی بەڕاستی پەیامبەرانە بە ملی میللەتی ڕووسدا دەدات. وەکو چۆن میللەتی عیبری خۆی بە میللەتی بژاردەی خودا دەزانێ، بەو ئاوایە لە نۆرین و ڕوانگەی دوستویفسکییەوە میللەتی ڕووسیش، دەبێ لەئایندەدا فریارەسی هەموو دنیا بێت. لەکاتێکا بەگوێرەی باوەڕێن مەسیحایی، دەرکەوتنی حەزرەتی مەسیح، هەر جۆرە بیرێکی پەیامبەری تایبەتی ڕەت دەکاتەوە و هەموو تیرەی بەشەر بە نەژادی هەڵبژاردە دەزانێت، کەچی دوستویفسکی سوورە لەسەر ئەوەی ئەم ئیمتیازە بدات بە میللەتی ڕووس، ئەم ئیمتیازەی کە میللەتی ڕووس تاقە

میللەتی خۆشەویست و پەسەندی خودایە. یانی بەم پێودانگە لە ڕوانگەی دوستویفسکییەوە، باوەڕ و ویژدانی پەیامبەرانەی مەسیحی، لەوە دەردەچێ پەیامێکی جیهانی بێت، بەڵکو دەبێت بە پەیامێکی نەتەوەیی و نیشتمانی.
هەڵبەتە هەندێ کەس ویستویانە ئەم هەڵوێستەی نووسەر بەوە لێکبدەنەوە کە "ئەم بۆچوونە جۆرە جوولەکاندنێکی تازەی ئۆل و ئاینی مەسیحیەتە." بەڵام ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی تەواو بەجێ و پەسەند نییە. چونکە دوستویفسکی نکۆڵی لەوە ناکات کە هەموو میللەتان گەییونەتە حەقیقەتی خودا. ئەو ئەم بۆچوون و ئیدیعایەی ئۆل و ئاینی یەهوودیەتی قەبووڵ نییە کە وەحی و سرووش تایبەت بەیەک میللەت بێ، بەڵام پێیوایە و لەو قەناعەتەدایە کە بەدرێژایی ڕۆژ و ڕۆژگاران، هیچ میللەتێک نەیتوانیوە دەوری خۆی ببینێ، نەیتوانیوە ئەرکی مەسیحییانەی خۆی بگێڕێت، تەنیا ڕووسیا بەڕێگای خوادا دەڕوات، چونکە شارستانیەتی تازە کاری تێنەکردووە و لە ڕێگای ڕاستی بەدەر نەبردووە. بەمجۆرە ڕووسیا نەک هەر ڕۆڵی پەیامبەرانەی گێڕاوە، بەڵکو تاقە میللەتێک بوو کە ڕۆڵ و ئەرکی خۆی پاراستووە. جا لێرەدا، سووکە جیاوازییەک لە لێکدانەوەی مەسەلەکەدا هەیە کە زۆربەی شرۆڤەکارەکان، ئاوڕیان لێنەداوەتەوە، کە هەڵبەتە ئەوە دێنێ ئێمە ئاوڕی لێبدەینەوە.
بەهەرحاڵ، ئەم بیرەی کە خودا هی یەک میللەت و بۆ یەک میللەت و لەناو یەک میللەتدا بێ، بیرێکی ترسناک و مەترسیدارە، چونکە لەدوا ئەنجامدا بە پەرستنی میللەت دەشکێتەوە و شاتۆف کەوتووەتە ئەو هەڵەیەوە. ستاڤروگین لێی دەپرسێت: "تۆ خۆت باوەڕت بەخودا هەیە؟" شاتۆف، بە پچڕ پچڕی بەرسڤ دەداتەوە: "من باوەڕم بە ڕووسیایە.. من باوەڕم بە مەزەبە ئەرتەدوکسییەکەی هەیە."
ستاڤروگین. لەسەری دەڕوات: "ئەدی بەخودا؟"
-"من... من... باوەڕم بەخودا دێنم.." (نووسەر دەڵێت خۆم هێڵم بەژێر ئەم دەستەواژەیەدا هێناوە) جا لێرەدا دوستویفسکیش وەکو شاتوف لەڕێگای میللەتەوە بەرەو خودا چووە، لەکاتێکا بۆ دوستویفسکی و بەلای دوستویفسکییەوە میللەت تەنیا قۆناغ بووە و هیچی دی، بەڵام بۆ شاتوف میللەت، ئامانجە.
لە بیرو بیرکردنەوەی شاتوفدا، فاکتەرو دابە مەردمی و ئاینییەکان، بەئەندازەیەک ئاوێتە دەبن، کە ئیدی لێکدی نایەنە جیاکردنەوە. شاتوف، ڕەسم و داب و نەریتی بت پەرستانەی جووتیاران دەگەڵ ڕێنمایی و خواپەرستی ئینجیلی مەسیحدا تێکەڵ دەکات و هەر هەمووی بە فیرقە و دەستەی مەزەبی ڕووس دەزانێت. شاتوف، نموونەی تەواوی مورتەدێکی بەجۆش و خرۆشە، کە باوەڕی ئەرتەدۆسکی، لە چوارچێوەی سنووری ڕووسیادا قەتیس دەکات، جۆرەها سرووت و ڕێنمایی سەیر و نامۆی لە دەرێی تەوراتەوە، لێباردەکەن و بە بیانووی پاراستنیەوە، خەفەو نابووتی دەکەن. دیارە نیگەرانی و پەرێشانی ئەو، دەقاو دەق زادەی ئەو جۆرە بیر و هزرینە بێسەرو

بەرەیە، کە لە میانەیانەوە نەک مەسیح نادۆزێتەوە بەڵکو گومی دەکات. هەڵبەتە باوەڕ و باوەڕهێنان، ئیمان و ئیمانداری زۆر لەو شتانە ئاسانترە کە ئەو تەسەوری دەکات. بەختەوەری زۆر لێوە نزیکە، بەڵام ئەو دەیەوێ وەکو کوێران بە لەپەکوتنێ، بەم دەرگا و بەو دیواردا، بەدەستی بێنێ و بیگاتێ.

کاتێ ژنەکەی، کە کاتی خۆی دەستی دەگەڵ ستافروگیندا تێکەڵ کردبوو وخیانەتی لێکرد بوو، دێتەوە بۆ لای ئەم تا منداڵەکەی ببێت، بەجۆرە نەشەو گەشەیەکی شەرمنانەوە پێشوازی دەکات و بایەخێکی زۆری پێدەدات و پاش لەدایکبوونی منداڵەکە، کاتێ کە ئەم بوونەوەرەی، کە لەناکاوا پێ دەنێتە دنیا، لەبەردەم خۆیدا دەبینێ، شادیەکی کۆنگ، سەراپای دەهەژێنێ. هاوار دەکات: "هاتنە سەر دنیای بوونەوەرێکی تازە، ڕازو نهێنییەکی گەورە و پەڕجوویەکی لە شرۆڤە نەهاتووە." مامانەکە، کە سەر بە ڕێباز و باوەڕی سوسیالیستیە دەڵێت: "ئەم وڕێنە گۆییەی لە چیە. ئەمە جگە لە نەشونمایەکی ئورگانی کە لە جەستەدا ڕوودەدات هیچی دیکە نییە." بەڵام شاتوف، گوێی لێناگرێت، ئیدی پەڕجوویەک لەبەرچاوی خۆیدا ڕوویداوە و ئێمانی هێناوە و تەواو و، لەئێستاش بەدواوە، هەر بە ئیمانداری دەمێنێ. ماوەیەکی زۆرە، ئەم جۆرە شادییەی بەخۆیەوە نەبینیوە، ئەمە یەکەمجارە هەست بە شادمانی خۆی دەکات. هەر هەمان شەو شاتوف، لەلایەن گروپە شۆڕشگێڕەکەوە بانگ دەکرێت و لەلایەن فیروخوفنسکی و موریدەکانیەوە دەکوژرێت. ستافروگین، لەم ماوەیەدا هەڵدێت. ئیدی فیرخوفنسکی بۆ ئەوەی گومانی تاوانەکە لە خۆی دوور بخاتەوە، لێدەپرێت، تاوانەکە بەملی یەکێک لە ئەندامانی گروپەکەدا بدات، کە ناوی کیریلوفە.

ئەم کیریلوفە، ئینسانێکە فێی لەگەڵدایە، ئەقڵی تەواو نییە. سوێندی خواردووە خۆی بکوژێت تا "بیسەلمێنێ کە پیاوێکی سەربەخۆیە" جا چونکە قەراری داوە خۆی بکوژێت و بمرێت، ئیدی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، تەنیا پێویستی بەوە بوو کە ئیعتراف بکات ئەو شاتوفی کوشتووە و ئیقرارنامەکە ئیمزا بکات. کیریلوف، ئەم تۆمەتە دەستکردە قەبووڵ دەکات. کیریلوف، یەکێکە لە کاراکتەرە هەرە سەیر و عەنتیکە و سەرنجڕاکێش و جوانەکانی دنیای دوستویفسکی. وەکو ستافروگین، پیاوێکی خوانەناسە، باوەڕی بە بوونی خودا نییە، بەڵام بەپێچەوانەی ستاڤروگینەوە، چەند خەڵکانی ئیماندار. بەجۆش و خرۆشەوە خۆ بە ئیمان و ئیمانداریەوە هەڵدەواسن، ئەویش بەهەمان جۆش و خرۆشەوە، خۆی بە بێباوەڕی و خوانەناسیەوە هەڵدەواسێت. بەڵام بەڵگە و بۆچوونە پووچ و نابەجییەکانی، تووشی سەرەگێژەی دەکەن، دەڵێت: "ئەگەر خودا هەبێ، ئیدی هەموو شتێک وەستاوەتە سەر ویست و مەشیەتی ئەو و من بەبێ ویستی ئەو ناتوانم هیچ شتێک بکەم. خۆ ئەگەر نەبێ، ئەوا هەموو شتێک دەوەستێتە سەر من. ناچارم ئازادی و سەربەخۆیی خۆم بسەلمێنم و مومارەسەی بکەم..."

بەم پێودانگە، لەڕوانگەی ئەوەوە بالاترین پلەی ئازادی و ڕەهایی و ملکەچ نەکردن بۆ هیچ کەسێک چیە؟ ئەوەیە کە ئینسان بتوانێ دەستبەرداری خۆی

بێت، نکوڵی لە بوونی خۆی بکات. جا ئەگەر ئینسان بە حوسن و ڕەزای خۆی، بە کەماڵی خوایشتی خۆی، کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێ، مانای وایە کە بەو پلە باڵایەی ڕەهایی گەییوە، یانی خۆی خوای خۆیەتی." "ئەگەر خوا نەبێ، من خوام." وکیریلوف ئەم ڕستە سەیر و چاوەڕوان نەکراوەش دەڵێت: "ئینسان بۆیە خوای دروستکردووە تا بتوانێ بەبێ خۆکوژی بژی."

ئیدی بەمجۆرە دەگەڕێینەوە سەر هەمان لۆژیک و جەدەلیەتی کابرای ژێر زەمینی، کە پێیوایە ئینسان بۆیە بتی بۆ خۆی دروستکردووە و حەساری ئۆل و ئاینی بەرز کردووەتەوە، تا بەربەستێک لە هەنبەر ئازادی دا، کە لێی دەترسێت دروست بکات. لەترسی ئازادی، خۆی حەپس کردووە. ئینسان لەو شتە دەترسێت کە خۆی دروستی کردووە. بەڵام کیریلوف لە گفتو گۆیەکەیدا سەر دەکەوێت. دووبارە دەگەڕێتەوە سەر هەمان بابەتە کۆنەکەی لە خاچدانی مەسیح، کە هیپولیت باسی دەکات: "ئەگەر خودی مەسیح لە حوکم و یاسای تەبیعەت مەعاف نەبێ، مانای وایە گۆی زەوی درۆیەکی گەورەیە و مەداری ئەم هەسارەیە بەدەوری تەوەری درۆدا دەسوڕێتەوە، وگەمەیەکی سەخیفە و هیچی دی." ئەگەر پرەنسیپی خوایەتی، لە شێوە کۆنەکەیدا ئاڵۆز و بێمانا و ناماقووڵ بێت و، ئینسان بێئەوەی خۆی بیەوێ خوابێ، دەبێت، نەزم و نیزامێکی حەقیقەتی بە جیهان ببەخشێت.

دیارە خۆکوژی کیریلوف، کە هیچ پاکانەیەکی دەرەکی بۆ نیە، نیشانە و بەڵگەی ئەو ئازادیە ڕەهایەیە کە دەیەوێ ئینسان بکات بە خواو خودانی دنیا: "پێشەوا دەبێ لە خۆکوژیدا دەست پێشکەر بێت، یەکەم کەس بێ کە خۆی بکوژێت، ئەگینا کێ دەست پێبکات؟ من تەنیا لەڕای دەستپێک و سەلماندندا خۆ دەکوژم."

"من دەست پێدەکەم. من دەرگاکە دەکەمەوە. ڕچە دەشکێنم "

دوای خۆکوژی و فیداکارییەکەی کیریلوف، خەڵکی تێدەگەن، دیوارە ئەخلاقیەکانی مەسیحیەت دەڕوخێنن و ئەوانیش بۆ خۆ دەبن بەخوا. "هەنگێ ئینسانێ دێتە ئاراوە بەختەوەر و متمانە بەخۆو مەغروور. کە بەلایەوە گرینگ نییە بژی یان نەژی." ئەوەی مایەی سەرنج و سەیرە لە خوا نەناسیەکەی کیریلوفدا ئەمەیە بزانین تا چەند بەو فەلسەفەیە ئالوودەیە کە خۆی ڕەتی دەکاتەوە. ئەو خۆی دەکوژێت تا تیرەی بەشەر ڕزگار بکات، وەکو چۆن کاتی خۆی مەسیح لە پێناوی ڕزگاری تیرەی بەشەردا، ملی بۆ کوشتن داو لە خاچ درا. لەڕاستیدا کیریلوف، ڕێک لاسایی حەزرەتی مەسیح دەکاتەوەو وێنەی ئەوی بە بەردەوامی لەبەرچاوە. ئەویش بەئاواتەوەیە سەربکەوێتە سەر خاچەکەو لەپێناوی خەڵکیدا خۆی فیدا بکات و ئازار بچێژێت. بەخوێنی خۆی شادمانی خەڵکی دابینبکات. ئەم خۆشەویستی و ئەشقە بێ سنوورە سەبارەت بە ئایندەی ئینسان، وا لەم مرۆڤە خوانەناس و بێ خوایە دەکات، وەکو نیمچە مەسیحێک بنوێنێ. کە دەڵێین نیمچە مەسیح، لەبەرئەوەیە کیریلوف، باوەڕی بە مەسیح هەیە، بێئەوەی باوەڕی بە خوا هەبێت. جا پێویستە لێرەدا، یادێکی ئەو نامە غەریبەی دوستویفسکی بکەینەوە کە لە

سیبریاوه، بۆ مەدام "فون ڤیزن"ی نووسی بوو، لەو نامەیەدا دەڵێت: "ئەگەر کەسێک بۆمی بسەلمێنێ کە مەسیح درۆیە و حەقیقەتی نییە و ئەمە بەڕاستی ساغ ببێتەوە، ئەوا من حەز دەکەم لەگەڵ مەسیحدابم تا لەگەڵ حەقیقەتدا."

بەمجۆرە دەبینین دوستویفسکی لە نێوان ئەرتەدوکسیەتی مەسیحیانەی شاتوف و مەسیحیەتی بێ خوایی و خوانەناسی کیریلوفدا وێڵ و سەرگەردانە. بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا، سیمای مەسیح، چ لەگەڵ خوداو چ بەبێ خوا، بەهەمان بێگەردی و پیرۆزی خۆیەوە دەمێنێتەوە. ئەم مەسەلەیە کە بە درێژایی تەمەن دوستویفسکی عەزاب دابوو، قارەمانانی چیرۆکەکانیشی ئەزیەت دەدات. کیریلوف "بۆ ئەوەی خۆی لەم کێشەیە ڕزگار بکات" گوللەیەک دەنێت بە تەپڵی سەری خۆیەوە.

خۆکوژییەکی دیکەش هەیە کە کۆتایی ژیانی یەکێک لە خوا نەناسەکان دەنوێنێ. واتە ستافروگینش پاش ئەوەی لە ڕزگاری وخەلسین نزیک دەبێتەوە، بەشێوەیەکی گەوجانە خۆی دەکوژێت و کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێت. لەنامەیەکدا دەنووسێت: "من ویستومە توانای خۆم لە هەر مەیدان و بوارێکدا تاقیبکەمەوە من بەچاوی کەرەب و کینەوە تەمەشای ئەو ئیماندارانەم کردووە کە دژی ئێمەن. چونکە بەغیلی بە ئومێدەواری و ئیمانی ئەوان دەبەم..."

کاراکتەرەکانی دیکە، لەچاو ئەم کاراکتەرە گرینگ و دیارانەدا، هیچ ڕەنگ و ڕوو و نموودێکیان نییە. بەڵام ویڕای ئەمەش پێتیقیە، ئاماژە بۆ بابی فیرخوفنسکی، "ستیڤان تروڤیبوفیچ" وەکو هزرڤانێکی ناکام و بێزار و گازاندۆک و خۆش گلەیی بکرێت. ئەمە بابەیەکی تۆباوی ئایدیالیست و قسە زل و دەماوەر و حازر گریانە، یانی کۆپییەکی تەواوی پروفیسور گرانوڤسکییە، کە دەکاتە یەکێک لە دامەزرێنەرانی لیبرالیزمی ڕووسی. لەپاڵ ئەم کاراکتەرەدا، سیماو کەسایەتی نووسەری گەورە کارمازینوف، دەردەکەوێت. دۆستویفسکی لە میانەی کارمازینوفەوە، وێنەیەکی کاریکاتۆری نەفرەتئەنگێزی تورگینیفی نیشانداوە. ئەم پیاوە وەکو تورگینیف بابایەکی "ڕووسی –ئەوروپاییە". دوستویفسکی هەمان قسەکانی تورگینیڤی خستوونەتە سەر زاری کارمازینوف و دەڵێت: "من بووم بە ئەڵمانی و شانازیش بەوەوە دەکەم." یا "ئەمساڵ سەری حەوتەمین ساڵە کە لە کارلسروهە دەژیم." یا "کاتێ، پار ئەنجوومەنی شارەوانی لێبڕا، ئاوی لوولەکێشی بۆ شار ڕابکێشێت، لە کانگای دڵەوە هەستم بەشادی کرد. بەڕاستی مەسەلەی لوولەکێشی کارلسروهە. بۆ من لەگەشت مەسەلەو کێشەی نیشتمانە ئازیزەکەم، ئازیزترە."

دوستویفسکی، هەوڵیداوە، هەمان ڕوخسارو سیمای ڕواڵەتی تورگینیف بەم قارەمانەی ببەخشێت لەمبارەیەوە دەڵێت: "قژە لوول و پڕو سپیەکەی، لەپشت هەردوو گوێچکە پاک و چکۆلە و سوورەکانییەوە و لەژێر شەپقەکەیەوە بەسەر شان و ملیدا دەڕژا." ئیدی دەنگێکی "شیرین و کەمێک

تیژ و زیقنی" دەداتێ. ئەنجام ئەم نووسەرە دوا بەرهەمی لەکۆڕێکدا بۆ خەڵکی دەخوێنێتەوە. ناونیشانی ئەم بەرهەمەی بریتیە لە "مێرسی" دەقی ئەم بەرهەمە لە نووسینێکەوە هەڵێنجراوە کە کاتی خۆی تۆرگینیف بۆ ڕۆژنامەکەی برایانی دوستویفسکی نارد بوو.
تورگینیف، خۆی لەم وێنە کۆمیدیەدا، دەناسێتەوە، پاشان لە چەند نامەیەکدا بۆ هەندێ لە دۆستەکانی خۆی گلەیی لێکردبوو ولەو بارەیەوە دەڵێت: "دوستویفسکی ڕێگەی بەخۆ داوە، کارێک بکات کە لەکاریکاتۆریش دزێوترە. هاتووە وێنەی منی لە سیمای "ک"دا نواندووە، کە ژێراو ژێر و بە نهێنی هەواداری لە حیزبەکەی نچایف کردووە، جا بۆ ئەوەی گاڵتە و تەوس بەو بکات، جا لەم تەوس و توانجەیدا هاتووە ئەو تاقە چیرۆکەی کە کاتی خۆی من بۆ ئەو ڕۆژنامەیەم نارد بوو کە ئەو سەرپەرشتی دەکرد، داوەتە پاڵ ئەو. لەکاتێکا دوستویفسکی بەخۆی سەبارەت بەو دەقە، نامەیەکی پیرۆزبایی و قەدرزانی بۆ ناردووم."   هەڵبەتە هیچ پێویست بەوە نەبوو. تورگینیف، تووڕە بێت و هەوادارانی ڕۆژاوا، لە دوستویفسکی هانبدات و بهاڕوژێنێ. چونکە بڵاوبوونەوەی شەیتانەکان، ڕوو بەڕووی پەرچەکرداری توندی چاپەمەنی و خوێنەرانی چەپگەرا بوەوە. ئەم هێرشە توندەی لەم ڕۆمانەدا کرابووە سەر هزرو بیرێن لیبرالی و ئازادیخواز، بەلای ئەوانەوە کارێکی گێلانە و کوفر ئامێز بوو و دەگەڵ یاساو ڕێساو داب و نەریتانی هونەریدا تێکی نەدەکردەوە. دەیانگوت بەڕاستی حەیفە کە بابەیەکی مەحکوم بە بێگارە زندان، بەو ئاسانییە هەڵگەڕێتەوەو پشتیوانی لە کەمپی دوژمن بکات. بەڕاستی شەرمە کەسێک خۆی شۆرشگێر بووبێت تا ئەم ڕادەیە دژی هەر کارێکی شۆرشگێری و کۆمەڵایەتی پێشکەوتوخواز بوەستێتەوە.
نیکیتین لەمبارەیەوە دەڵێت: "ڕۆمانی شەیتانەکانی ڕێزدار دوستویفسکی، بێ چەندو چوون، ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە لەیەکەمین بەرهەمیدا، واتە لە "هەژاراندا" بەدی دەکرا، کە بریتی بوو لەوەی کە نووسەر هیچ جۆرە خەیاڵێکی فیلیڤانی ئەفراندنەوانی نەبوو." و لەسەری دەڕوات: "لە ڕۆمانی شەیتانەکاندا، ئیفلاس و ناکامی ئەدەبیی نووسەری ڕۆمانی هەژاران، زۆر بەزەقی دیارە."
لە گۆڤاری "پڕتەودا" ئەم ڕستانە بەرچاو دەکەون: "ئەگەر، سەبرو حەوسەڵەت هەبێ، کە بەرهەمی یەکێک لە نووسەرەکانمان، کە جاران نووسەرێکی زۆر میللی بوو، تا کۆتایی بخوێنیتەوە، بێگومان، وێڕای تووڕە بوون و پەستی، هەست بە جۆرە بەزەییەک و ڕەنگە خەم و پەژارەش بکەیت. یانی کە دەبینی نووسەرێک دەکەوێ، هەڵبەتە نووسەرێکی بەهرەمەند، کە دەبینی ئینسانێک دەکەوێ، بمانەوێ و نەمانەوێ پێویستە دان بەوەدا بنەین کە دەگەڵ بڵاوبوونەوەی ڕۆمانی تاوان و سزادا، ئاغای دوستویفسکی جارانمان لەدەست داوە... ئێستاش ئەهلی ڕەخنەش تەنیا بە چاوی پێموبالاتی، و حەقارەت و تەنانەت بەزەییەوە تەمەشای دەکەن."

کاتێ بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی "دنیای ڕووسی" لە ستایشی ڕۆمانی شەیتانەکاندا نووسی: "شەیتانەکان، بەجوانترین و هونەری ترین کاری ئەدەبی ئەم ساڵانەی دوایی دێتە ژماردن، لەلایەن چاپەمەنی وەختەوە، بە تایبەتی چاپەمەنی لیبراڵەوە، هێرشی زۆر توندی کرایە سەرو بە درۆخرایەوە.
لێ ستراخۆف، سەبارەت بە شەیتانەکان، نامەیەکی یەجگار دڵگیر و ناسکی بۆ دوستویفسکی نووسی، کە ئەوە دێنێ، لێرەدا ئاماژەی بکەینێ و باسی بکەین. دەنووسێت: "سەبارەت بە هەمە جۆری و دەوڵەمەندی فیکری، بێگومان تۆ یەکەمین نووسەری ڕووسیایت. تەنانەت ئەگەر دەگەڵ "تولستوی"شدا بەراورد بکرێی، تۆ لەو لەپێشتری. بەڵام تۆ بە تۆبزی بەرهەکانی خۆت دەئاڵۆزێنی، ئەگەر ڕۆمانەکەی تۆ لەڕووی داڕشتن و گرێچن و پلۆت و بابەت و تیمەوە سادەتر بوایە، زۆر کاریگەرتر دەبوو بۆ نموونە ڕۆمانی قومارباز و مێردی هەمیشەیی، دەنگدانەوەیەکی باشیان هەبوو. بەڵام ئەو بیرەی لە گەمژەدا خستووتە ڕوو، بەشێوەیەکی گشتی ئاڵۆز و نامەفهوومە... ئەگەر نووسەرێکی فەرەنسی یا ئەڵمانی، بە دەیەکی بەهرەو توانای تۆوە، ئەو ڕۆمانەیان نووسیبا، لە هەموو دنیادا ناوبانگیان دەردەکرد و وەکو ئەستێرەیەکی گەش لە مێژوو وئەدەبیاتی جیهاندا دەردەکەوتن..."
دوستویفسکی، بەتەوازوعێکی جوانەوە، دان بە کەم و کوڕی و عەیبەکانی خۆیدا دەنێت. لەو بارەیەوە دەڵێت: "لەزەین و هزری مندا، چەندین ڕۆمانی جیاواز، لە یەک ڕۆماندا چڕدەبنەوە، بۆیە ڕۆمانەکانی من وا دێنە بەرچاو کە گونجاون و هاوئاهەنگی و ڕیتمی تایبەتی خۆ لەدەست دەدەن..." یا ئەمەی کە: "هێزی ئیلهام هەمیشە لە ئەوزارەکانی گوزارشت و دەربڕین بەهێزترە (بۆ نموونە فیکتۆر هۆگۆ، وابوو، ئەم حاڵەتە لە هەندێ بەرهەمی پوشکینشدا بەدی دەکرێت) بۆیە من لەکاتی نووسیندا ئاگام لەخۆ نامێنێ و لە خەت دەردەچم و وێڵ دەبم..."
لەڕاستیدا، شەیتانەکان، بەشێکە لە ڕۆمانی "ژياننامەی گوناحکارێکی گەورە" کە پێشتریش باسمان کردو ئاماژەمان پێکرد، ئەو ڕۆمانەی کە هەرگیز نەهاتە نووسین. لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی ئەو ڕۆژگار و قۆناغەی تەمەنی دوستویفسکی سەبارەت بەم ڕۆمانە ناوی کۆمەڵێک خەڵکی زندوو دەبینرێن کە ڕەنگە هەندێجار ڕۆڵێکی لاوەکیان لە ژیانی دوستویفسکیدا بینی بێت. هەندێجار ناونیشانی کتێبان، بیرەوەری و ڕووداوانی ڕۆژگاری گەنجی تۆمار کراون. ئەم یاداشتانەی کە وەکو پێشەکییەک بۆ نووسینی ژياننامەی گوناحکارێکی گەورە ئامادە کرابوون، هەندێ لە شرۆڤەکارەکانی خستەسەر کەڵکەڵەی ئەوە کە لە خودی دوستویفسکی بپرسن ئایا ئەم گوناحکارە، خودی دوستویفسکی نەبووە؟
دەگێڕنەوە دەڵێن گوایە دوستویفسکی ڕۆژێک چووە بۆ لای تورگینیف و تا لەنێو هەموو کارەکانی خۆیدا "کارێکی نەنگینی" بۆ بگێڕێتەوە. تورگینیف لێی دەپرسێت: بۆچی دەتەوێ ئەمە بۆ من بگێڕیتەوە؟
-بۆ ئەوەی بیسەلمێنم تا چ ڕادەیەک دەتبوغزێنم.

ستراخوف، کە بە بیوگرافیانووسێکی پڕ جۆش و خرۆشی هاوڕێکەی خۆی، دوستویفسکی ناوی دەرکرد بوو، لە ساڵی ١٨٨٣دا نامەیەک بۆ تولستوی دەنێرێت و بەمجۆرە باسی دوستویفسکی هاوڕێی دەکات: "کابرایەک بوو بەدخوا، شەڕەنگێز، بەغیل و گەندەڵ... دەزانی لە ڕووی سێکسی و سێکسبازییەوە، هیچ حیسابێکی بۆ جوانی و ئەفسوونی ژنانەی ژن نەدەکرد. قارەمانانی ڕۆمانی یادداشتە ژێر زەمینییەکان، سڤیدر یەگایلوف لەتاوان و سزادا و ستاڤروگین لە شەیتانەکاندا، لەو قارەمانانەن کە زیاتر لەخۆی دەچن."

ستراخۆف، لای زۆر کەس گێراویەتیەوە کە دوستویفسکی دەستدرێژی کردووەتە سەر کیژێکی چکۆلە. ئەم تۆمەتە لەلایەن ڤینگوروف و ڤیسکوڤاتوفیشەوە، دووپات کراوەتەوە. تورگینیف دەڵێت: "ڕۆژێ ڤیسکوڤاتوف بۆی گێراوەوە کە دوستویفسکی شانازی بەخۆی دەکرد کە خانمێکی بەڕێوەبەری قوتابخانە کچۆڵەیەکی بچووکی بۆ هێناوەتە حەمامەوە." بەڵام بوڵگاکوف، هەر ئەوەندەی لەو بارەیەوە گوتووە کە: "ڕەنگە ئەمە بوختان بێت و بۆی هەڵبەسترا بێ." هەڵبەتە بەڵگەی پێویست و بنجبڕ بۆ سەلماندنی ئەو قسانە لەئارادا نییە، بەڵام نەوسنی سێکسی دۆستویفسکی، مایەی هەر جۆرە گومانێکی لەو بابەتەیە. بەڵام لەدوای نووسینی ڕۆمانی نیتوچکاوە، ئیدی جۆرە ئەڵهایەکی سێکسی و لەزەتی جەستەیی منداڵانە بەسەر دوستویفسکی دا زاڵ دەبێت. سەبارەت بە دوو کچۆڵەی بچووک، کە تازە بالق بوو بوون دەنووسێت: "دەی ئێستا، بە ئارەزووی خۆتم لەگەڵ بکە. چیت گەرەکە وام لێبکە. ئازارم بدە، نوقورچم لێبگرە، تکات لێدەکەم، دەی نقورچم لێبگرە، دەی نقورچێکی دیکەم لێبگرە، دەی کچە ئازیزەکە نقوڕچم لێبگرە." یا دەنووسێت: "یەکدیمان لە ئامێز دەگرت، یەکدیمان ڕادەمووسی، دەگریاین، پێدەکەنین، دەم و لێومان لە ڕامووسانێدا ئاوسا بوون."

هەروەها لیزا لە ڕۆمانی برایانی کارموزوفدا، کە لەتەمەنی شازدە ساڵیدایە، وەکو ئەو دوو کیژەی دی تووشی هیستریا بووە. ئیڤان دەربارەی دەڵێت: "تەمەنی شازدە ساڵانەو کەچی ڕادەوەستێ، خۆی ڕادەنێ..." ئالیوشا دەڵێت:

-باشە چۆن ڕادەوەستێ؟

-وەکو ژنانی سووک و هەرزە ڕادەوەستێ و خۆی بەدەستەوە دەدات.

لە ڕۆمانی برایانی کارامازوفدا، سڤیدر یگایلوف، دەست درێژی دەکاتە سەر کچۆڵەیەکی کەڕولاڵی چوارده پازدە ساڵان "ڕۆژێک لە عەمارێکی دانەوێڵاندا بەهەڵواسراوی دەی بیننەوە" ئەو شەوەی کە سڤیدریگایلوف دەیەوێ خۆی بکوژێت، هەمان ئەو کچۆڵەیە لەخەودا دەبینێ کە دەستدرێژی کردبووە سەری. لە ڕۆمانی شەیتانەکانیشدا ستاڤروگین، هەمان خەون دەبینێ، چونکە ئەویش کچۆڵەیەکی خاپاندووەو قوربانیەکەی ئەویش، وەکو قوربانییەکەی سڤیدریگایلوف، خۆی حەلقاوێز کردووە.

ئایا ئەم بابەتە، کە لە فاسیلەی پێنج ساڵدا، لە دوو ڕۆماندا دووبارە دەبێتەوە، زادەی یەک بیری نهێنی و پەنهان نییە؟
دوستویفسکی، تەنانەت ئەم چیرۆکەی، لەو دیوەخانە ئەدەبیەشدا، کە مەدام کوژمین کروکفسکی بەڕێوەی دەبرد، خەڵکی سادە هاتوچۆیان دەکرد، بە بەرچاوی کۆمەڵێک کیژیشەوە، گێراوەتەوە.
کیژێکی چواردە ساڵان بەناوی سوفیا، ئەم ڕووداوەی لە یاداشتەکانی خۆیدا تۆمار کردووە. قارەمانی ڕۆمانەکە، لە خەوێکی خۆش خەبەری دەبێتەوە، ئیدی خەتایەکی کۆنی لە بەخشین نەهاتووی بیر دەکەوێتەوە و هەست بە مەسئوولیەتێکی پەنهان دەکات و بەخۆیشی تیا دەمێنێ و نازانێ چ بکات. سوفیا دەنووسێت: "ئەو (قارەمانی چیرۆکەکە) بیری دەکەوێتەوە، کە جارێک، دوای شەوێکی ڕابواردن و عەیش و نۆش، بە هۆی هاندانی هاوڕێ مەستەکانییەوە، دەستدرێژی دەکاتە سەر کچۆڵەیەکی دەساڵان و فەساتی دەکات..."
ئایا دۆستویفسکی، وەکو سڤیدر یگایلوف و ستافروگین، کەسێکی کەچ ڕەوشت بووە، یا شتەکە لای ئەو تەنیا جۆرە خەیاڵ و هەوەسبازییەکی چەپێنراو بووە؟ جید لە یاداشتەکانی خۆیدا دەڵێت: "ئەوەی من لەبەرهەمەکانی خۆدا وێنەی دەکەم، کوت و مت کاراکتەری خۆم نییە، بەڵام ئەو کەسەیە کە ئەگەر ئێستا وا نەبوایەم، لە گین بوو بەو جۆرە دەربچم."
بۆچی ئەو بیرۆکەیە بە هەند وەرنەگرین، کە دوستویفسکی لە خەیاڵی خۆیدا و بەخەیاڵ حەزی لە کچۆڵەیەک کردووە و بە خەیاڵ دەستدرێژی کردووەتە سەرو ئیدی ئەم دەستدرێژییە خەیاڵییە ژیانی لێ تاڵ کردووە؟ ئەو دەستدرێژییەی، کە توانیویەتی لە زەینی خۆیدا، لە ساتێکی زاڵی خەیاڵدا، مومارەسەی بکات، وەبیردێنێتەوەو بەجۆرە لەزەتێکی نەخۆشانەوە ئەو ڕووداوە بە ملی خۆیدا دەدات و خۆی بە ئەنجامدانی ئەو کارە ناجۆرە تۆمەتبار دەکات. ئیدی بەشێوەیەکی بێ شەرمانە خۆی لە هەنبەر خەڵکێکی دیدا سەرکۆنە دەکات و ئەم حاڵەتەی پێخۆشەو لەزەتی لێدەبینێ. خۆی لەهەنبەر چ خەڵکانێکدا سەرکۆنە دەکات؟ لەهەنبەر ئاغای تورگینیفدا، کە دوستویفسکی زۆری ڕق لێیەتی و لە هەموو کەس پتری دەبوغزێنێ. دوستویفسکی دەنووسێت: "من زۆر چاک تێدەگەم، لە گینە پیاو هەندێجار تەنیا بۆ خۆنواندن، مەسئولیەتی تاوانێک بەملی خۆیدا بدات، زۆر چاک دەزانم کە ئەم جۆرە خۆنواندن و خۆهەڵکێشانە ڕەگی لەکوێ و لەچیدایە."
وادیارە بۆ چوونە بنج و بناوانی مەسەلە سێکسییەکان لای دوستویفسکی، پێویستە ماناو چەمکی ئەو ڕستەیە شەن و کەو بکرێت.

# بەشی چوارەم
## فەسڵی یەکەم
### هەرزەکار

ئەنجام لە ١٨٧١/٧/٨ ماڵباتی دوستویفسکی گەیینەوە سان پیتروسبۆرگ. کاتێ کە بە بەر کڵێسای سانت ترینتیەدا، کە زەماوەند و مارەبڕینەکەیان لەوێندەر ئەنجام درابوو، تێپەڕین، فیدور ئاورێک لە ژنەکەی دەداتەوە و دەڵێت: "ئێ ئانێت، هەرچۆنێک بێ ئەم چوار ساڵەمان بەخۆشی بردە سەر... ئاخۆ سان پتروسبۆرگ، چ شتێکی بۆ ئایندەمان لەهەگبەدایە، من جگە لە تەمتومان و تەم و مژ چ شتێکی دیکە نابینم."

دوستویفسکی پاش ئەوەی کرێ سەفەرەکەیانی داو قەرزەکانی دایەوە، تەنیا چەند ڕۆبڵێکی لەبەڕکدا ما. ئەو هیربار وئامان و قاپ وقاچاخ و ئەوزاری مووبەقەی، کە لەکاتی سەفەرەکەیاندا بۆ هەندەران، بە پیرەژنێکیان سپاردبوو، بەهۆی مردنی پیرەژنەکەوە، هەمووی تیا چوو وو، ئەو جل و بەرگانەی کە بەڕەهن لای کابرایەکی سووتخۆر دایان نابوون، پاش ئەوەی ماوەکە بەسەر چوو بوو، کابرا بۆ خۆی فرۆشتبووی و پارەکەی نابووە تەنکەی باخەڵی، کتێبەکانی دوستویفسکی لەلایەن پولی، کوری ژنە مردووەکەیەوە، کە دووچاری بێ پارەیی بوو بوو، تالانفرۆش کرابوون.

دوای گەڕانەوەیان بۆ سان پتروسبۆرگ، بەچەند ڕۆژێک، خزمان بە کۆمەڵ هاتنە دیدەنییان. ئەم دیدارانە ماوەیەکی زۆر درێژەیان کێشا: هەواڵپرسین، دەست و مشتاخ، پرسیار و وەڵام بەردەوام دووبارە دەبووەوە. پول، زڕ کوڕەکەی دوستویفسکی ژنی هێنا بوو و ژنەکەی زۆر جوان و خشکۆک بوو.

کوڕە گەورەکەی (ئیمیلی فیدوروفنا)ی ژنی میشێلی برای، بووە بە پیانیستێکی بەناوبانگ و کوڕی دووەمیشی لە بانکێکدا فەرمانبەرە. کچەکەشیان کاری توندنووسی(اختزال) دەکات.
ئەم دیدارە یەک لەدووی یەکانە ئاناگریگوریفنا تەواو بێتاقەت وماندوو دەکەن، لەیاداشت و بیرەوەرییەکانیدا، لەو بارەیەوە دەڵێت: "دوێنێ کە نەخۆش بووم و یرێک ئازارم هەبوو، مێردەکەم بەردەوام لەخودا دەپاڕایەوە کە زوو نەخۆشیەکەم بپەڕێت وچاک ببمەوە.". سەرەنجام لە ٧/١٦دا، کوڕێکی بوو ناویان نا (فیدور) دوستویفسکی دەنووسێت: "حاڵی حازر خەریکن قۆنداخەی دەکەن و بە دەنگێکی بەرز و قایم دەقیژێنێ."
دوستیویفسکی لە ئاخڕو ئۆخڕی مانگی تەموزدا بۆ مسکۆ دەڕوات، تا پاداشتەکەی لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەی پەیکی ڕووسیا وەربگرێت. پاش ئەوەی بۆ پتروسبۆرگ دەگەڕێتەوە، لە جادەی سیرپوخوفسکایادا، خانوویەک بەکرێ دەگرێت و لەوێندەر ئاکنجی دەبن. دوستویفسکی ئومێدەوارە کە لەوێ یرێک ئۆقرە بگرێت و بتوانێ درێژە بەکاری خۆی بدات. لێ مخابن، لە هەیڤی ئەیلولدا، ڕۆژنامەیەک، هەواڵ بڵاو دەکاتەوە کە ڕۆمانووس ئاغای دوستویفسکی، دوای ماوەیەکی دوورو درێژ، لە هەندەرانەوە بۆ وڵات گەڕاوەتەوە. ئیدی هەرکە ئەم هەواڵە بڵاودەبێتەوە خاوەن قەرز لە هەموو لایەکەوە بەسەریدا دادەبارن. یەکێک لەو خودان قەرزانە کە "گینتەر ستاین"ی ناو دەبێت. هەڕەشەی لێدەکات، شکاتی لێدەکات و بەحەپس کردنی دەدات ئەم خاوەن قەرزە پێی دەڵێت: "بەخۆت دەزانی تۆ نووسەرێکی بەهرەدار و بەنێوبانگی ڕووسیت و من بابایەکی کاسب و بازرگانی بچووکی ئەڵمانیم. بەڵام دەمەوێ ئەوە بسەلمێنم کە دەتوانم لەسەر قەرزەکانی خۆم. ڕۆمانووسێکی بەنێوبانگ بخەمە زندانەوە، دڵنیابە کە ئەم کارە دەکەم."
ئانا، دەکەوێتە داکۆکی لە مێردەکەی. بە "گونتەرستاین"ی ترسناک دەڵێت مێردەکەی لە خودای دەوێ بچێتە زیندانەوە تا لەوێ، لە کونجێکی زنداندا، بێخەم خەریکی نووسینی خۆی بێت. پێی دەڵێت: "هەنگێ ئاغای بازرگان، ناچاردەبێت، لە ماوەی زندانییەکەیدا خەرج و مسرەفی بکێشیت." یارۆی بازرگانی ئەڵمانی دەترسێت و لەگەڵیان پێکدێت کە قەرزەکەی بە قیست بدەنەوە.
لەوە بەدواوە، هەمیشە ئانا پێشوازی خودان قەرزەکانی دوستیوفیسکی دەکات. ئانا، لەمبارەیەوە لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: "لەم ماوەیەدا، جۆرەها خەڵکی عەجیب و غەریب دەهاتن بۆ ماڵمان، بازرگان و دەڵاڵانی پیشەیی بەخۆ و کومپیالەو قەواڵانەوە، بێوەژنانی فەرمانبەران و کارمەندان، خاوەن قومارخانان و قەحپەخانان، ئەفسەرانی خانەنشین، ئیدی هەرکەس وناکەسێک. زۆربەی ئەمانە، ئەو کۆمپیالە و قەواڵەنامانایەن بۆ فشە قازانجێک، بە نرخی زۆر هەرزان کڕی بووەوە. ئێستا پێیان لە دوستویفسکی کردبووە کەوشەوەو داوای نرخەکانیان دەکردەوە. هەر هەموو ئەمانە هەڕەشەی زندان و حەپسیان لێدەکردین بەڵام من کەوتبوومە سەر فێڵەکەی و دەمزانی دەبێ

چۆن قسەیان لەگەڵدا بکەم و وەڵامیان بدەمەوە. هەمان وەڵامی ئامادەم دەدانەوە کە وەڵامی گونتەرستاینم دابووەوە."
ئەم ژنە گەنجە، لەپاڵ ئەم مێردە خەیاڵ پڵاوەیدا، بوو بوو بە مامەڵەچیەکی لێهاتوو. مێردەکەی بابایەکی نەخۆشی خۆشباوەڕ بوو. ئەم ژنە زۆر چالاکانە و بە هوشیارییەوە، وەکو هەر بەڕێوەبەرێکی کاری هاوچەرخ کاری خۆی ئەنجام دەدا. تووشی زۆر کێشە و گرفتی چکۆلەی ڕۆژانە دەبوو. ئیدی ئەو کاروباری ماڵی بەڕێوە دەبرد. بەبێ ئەو هیچ کارێک نەدەکرا. لە ساڵی ١٨٧٣دا لێدەپرێت کە ڕۆمانی گەمژە و شەیتانەکان، کە پێشتر لە ڕۆژنامەاندا بڵاوبووبوونەوە، بە کتێب چاپ وبڵاو بکاتەوە. بەخۆی کاغەز دەکڕێت و دەگەڵ چاپخانە و وەشانکاراندا دەکەوێتە سەواومامەڵە. پرۆڤەکان هەڵەچن دەکات. پێشوازی لە نوێنەری کتێبخانەکان دەکات، کە داوای داشکانی پتر لە ٢٠% دەکەن، داواکانیان ڕەت دەکاتەوە، دەڵێت: "نرخی دە نوسخە دەکاتە سی و پێنج ڕۆبڵ، بەڵام بە داشکانی لەسەدا بیست ٢٠% دەمێنێتەوە بیست و هەشت ڕۆبڵ."
نوێنەری کتێبفرۆشییەکە دەڵێت:
-خانم ناکرێت داشکانەکە بکەی بە لەسەدا سی ٣٠%؟
-مەحاڵە.
-بەلای کەمەوە بیکە بە لەسەدا ٢٥%
لێرەدا، بە نیگەرانییەوە دەڵێم:
•-باوەڕ بکە نابێت.
وا دەنوێنێ کە دەیەوێت بڕوات، منیش واز لەیەکەم کڕیار دێنم کە بڕوات. بەڵام نوینەری کتێبفرۆشییەکە هەڵوەستەیەک دەکات و دەڵێت:
-دەی ئەگەر نابێت، باشە قەیدی نییە.
هەنگێ پارەکەم دەداتێ. ئیدی بەڕادەیەک خۆشحاڵ دەبم، سی کۆپیکی پارەی ئەو گالیسکەیەی کە پێی دەڕواتەوە بۆ دوکان، بۆ دەگێڕمەوە." سەوداو مامەڵەکانی خانم زۆر سەرکەوتوو دەبێت. ئانا تا کۆتایی ساڵ سێ هەزار نوسخە دەفرۆشێت و تەنیا پێنج سەد نوسخە دەمێنێتەوە کە لە ساڵانی دواتردا دەفرۆشرێن.
لەو ماوەیەدا، لە ئاخرو ئۆخری ساڵی ١٨٧٢دا، میرمیچیرسکی خاوەنی ڕۆژنامەی هاوڵاتی. سەرنووسەری ڕۆژنامەکەی خۆی بە مووچەیەکی ساڵانەی سێ هەزار ڕۆبڵی بە دوستویفسکی دەسپێرێت. شکست و ناکامی ڕۆمانی شەیتانەکان، پەرچەکردارێکی ئەوتۆ لای دوستویفسکی دروست دەکات، کە تامردن دژایەتی بیری لیبڕالیزم بکات. ماوەیەک بوو لە بیری ئەوەدا بوو کە گۆڤارێک بەناونیشانی ڕۆژانە یاداشتی نووسەرێک، دەربکات، تا بتوانێ بیرو باوەڕ و نۆرینی خۆی دەربارەی دیاردە و ڕووداوە جڤاکیەکانی ئەو قۆناغە، لەو گۆڤارەدا دەرببڕێت. بەڵام ئەم پیشنیازەی میرمیچیرسکی کردیە کارێک، ئەم خەونەی خۆی بەشێوە و ریگەیەکی دی پراکتیزە بکات. لە جیاتی گۆڤارێکی سەربەخۆ، گۆشەیەکی گرینگی لە

ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی بەربڵاو وبەسەنگ و ئیحتوباری دەکەوێتە بەردەست. پێشنیازەکەی میر پەسەند دەکات، دام و دەزگای سانسۆریش ڕازی دەبن کە دوستویفسکی ببێت بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی هاوڵاتی. بەڵام "بەو مەرجەی بەوردی چاودێری هەڵوێست وچالاکیەکانی ئاییندەی ئەم پیاوە بکرێت..." ئەو گروپە ئەدەبییەی لەم ڕۆژنامەیەدا کاریان دەکرد، بریتی بوو لە کۆمەڵێک نووسەری ڕاستگەرای توندڕەوی وەکو مایکوف، فیلیپوف، ستراخوف، بیلوف... ڕەوت و ڕێبازی ئەم بڵاوکراوەیە بەشێوەیەکی گشتی محافەزەکارانە و دژە ئەوروپاییانە بوو. بە هاتنی دوستویفسکی، زۆر محافەزەکارانەتر بوو.

دوستویفسکی، لە ڕۆژانی هەوەڵەوە وای ویناەکرد کە ڕەنگە بەڕێوەبردنی ڕۆژنامەی هاوڵاتی، سووکە دەرفەتێکی ئەوتۆی بۆ پرەخسێنێ کە بتوانێ، پەیگیری نووسین و ڕۆمانەکانی خۆی بکات. بەڵام هەر زوو بۆی دەرکەوت کە ناچارە لە پێناوی کاروباری ڕۆژنامەوانیدا، قوربانی بە کاری ڕۆمانەوانی خۆی بدات. سەرنووسەری بڵاوکراوەکە، هەموو کاتەکەی لێدەگرت ونەیدەپەرژا سەری خۆی بخورێنێ: پێشوازی نووسەرانی دەکرد، وتارەکانی دەخوێندنەوە، پێیاندا دەچووەوە، هەڵەچنی دەکردن (بەتایبەتی نووسینەکانی خودی میرمیچیرسکی.) پرۆڤەکان چاپخانەی هەڵەچن دەکرد. وەڵامی نامەی دەدایەوە، پەیگیری ڕووداوە سیاسییەکانی دەکرد تا بزانێ دنیا لەچیدایە. ئەمە جگە لە نووسینی گۆشەکەی خۆی بەناونیشانی: رۆژانە یاداشتێن نووسەرێک.

پەیوەندی دوستویفسکی بە میرمیچیرسکی خاوەنی ڕۆژنامەکەوە، پەیوەندییەکی دیپلوماسیانەی تایبەتی ئەوتۆ بوو کە هیچ دەگەڵ مجێزو تەبیعەتی توندی دوستویفسکیدا تێکینەدەکردەوە. میرمیچیرسکی زۆری حەز لە نووسین بوو، بەڵام دوستویفسکی ناچار دەبوو بەو وتارانەیدا بچێتەوە کە بۆ ئەمی دەنارد. زۆرجار دووبارە دەینووسینەوەو دایدەڕشتنەوەو بۆ میری دەناردەوە، تا چاوێکی پێدا بگێڕێتەوە. بۆ نموونە بۆی دەنووسی: "میری ئازیز، وەڵامەکەت بۆ ڕۆژنامەی هەواڵی پتروسبورگ، زۆر ناسک و جوانە، بەڵام هەندێک وشک وتوندە، بۆنی شەڕی لێدێت، دەشێت بگوترێ بە شێوەیەکی گشتی زۆر پەسەند نییە... من ئەو وەڵامەت بۆ دەنێرم کە خۆم نووسیومەو چەند ڕستەیەکم لە نووسینەکەی تۆ تێهەڵکێش کردووە، بەڵام دوور نییە هەندێ هەڵەم تیاکردبێ. زۆر سوپاست دەکەم ئەگەر ئەو هەڵانەم بۆ ڕاست بکەیتەوە..." بەڵام وێڕای ئەوەش، جارێک لەسەر سووکە هەڵەیەک کە میری ڕۆژنامەوان لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیدا کردبووی، لێ پێچینەوە دەگەڵ دوستویفسکیدا کرا.

میرمیچیرسکی، وتارێکی بۆ دوستویفسکی ناردبوو، کە لەو وتارەدا هەندێ ڕستەی تزاری تێهەڵکێش کرد بوو، وتەکانی تزار ئاڕاستەی نوێنەرانی قیرغیزکرابوو. دوستویفسکی نەیزانی بوو کە بڵاوکردنەوەی وتەی تزار یا ئەندامانی ماڵباتی پاشایەتی بەبێ پرس و ڕەزامەندی وەزارەتی دەربار قەدەغەیە. ئیدی بەبێ پرس وتارەکەی بڵاوکردبووەوە. ئەم سەرپێچییە بە بڕی

بیست و پێنج ڕۆبڵ جەریمەو چل و هەشت سەعات زندانی شکایەوە. بەڵام ئەم ماوەیە لە چاو، ئەو چەند مانگەدا، کە لەساڵی ١٨٤٩دا لە زیندانی ئەلیکسی بەسەری بردبوو، هیچ نەبوو. بەخۆشحاڵیەوە ماوەی سزایەکەی خۆی لە گرتووخانەیەکی جادەی هالدا بەسەر برد: ژنەکەی خواردن و جل و بەرگی بۆ هێنابوو. بۆ ڕۆژی دووەم، گەلێک لە هاوڕێکانی هاتنە دیدەنی. ئەم ماوەیە بەهەل دەزانێت و بۆ جاری دووەم ڕۆمانی بێنەوایانی ڤیکتۆر هۆگۆ دەخوێنێتەوە. لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئەم گرتنەم بەخێر گەڕا، چونکە وانەبوایە هەرگیز دەرفەتی ئەوەم بۆ نەدەلوا، کە بۆ جاری دووەم ئەم شاکارە مەزنە، بەو تاسوقەوە بخوێنمەوە."

دوستویفسکی، بە نووسینی "ڕۆژانە یاداشتێن نووسەرێک" کە دوای سێ ساڵ، لەشێوەی کتێبی سەربەخۆدا بڵاوبووەوە، ژانرە ئەدەبێکی تازەی داهێناو خستەڕوو کە بریتی بوو لە ئاوێتەیەک لە دەردە دڵی تایبەتی و گەنگەشە و دیالۆگ دەربارەی بابەتی سیاسەتی دەرەکی و لەم یاداشتانەدا، بابەتی ڕۆژانە و خەم و خولیای ژیانی ڕۆژانە، ڕووداو و واریقاتی جۆرا و جۆر و خەیاڵاتی ڕۆمانسی تێکەڵ کردووە. هەندیجار ئەم نووسینانە شێوەی گفتوگۆی جۆراو جۆر دەگەڵ خوێنەراندا وەردەگرن.

دوستویفسکی، هەموو دەمێک بەتوندی بەگژ هەڤڕکەکەیدا دەچێتەوە، ئیرادی لێدەگرێت، بیرو نۆرینی ئەو کەشف دەکات و بە ڕەقی و توندی بەرسقی دەداتەوە. واریقاتەکان بەشێوازی زۆر سادەو باو، دێنە گێڕانەوە، هەندێ ناڕوون و ڕەوانن. بەڵام هەندێجار ئاستی داڕشتنەکە لە ڕووی بەلاغەت و فەساحەتەوە دەگەنە ئاستی داڕشتنی تەورات. نووسەر. لێرەدا، بە هزر وبیرو قسە زۆر و زەبەندەکانی خۆیەوە ڕوو بە ڕوومان دەبێتەوە، بەوپەڕی سەرسەختی، دەیەوێ بیرو بۆچوونەکانی خۆیمان بۆ بسەلمێنێ. هەندێجار، خۆی فریو دەدات، نووسینەکە، ئاوێتەیەکە لە تووڕە بوون، سوور بوون و پێداگری لەسەر هەڵەی خۆی، وەکو منداڵ، گڕو و دەگرێت.

دوستویفسکی ساڵێک بوو سەرنووسەر بوو، کە دیداری دەگەڵ نیکراسوفدا کرد. نیکراسوف شاعیری مەزنی جەماوەری ڕەش ورووتی خەلک بوو دۆستی نزیکو خۆشەویستی جەماوەری چەوساوەی خەڵکی دنیا بوو، هاوڕێی سەردەمی گەنجایەتی دوستویفسکی بوو، پاشان بوو بە دژمنی ئەدەبی ئەو. چەندین ساڵ بوو فیدوری نەبینی بوو، بەڵام چونکە ئێستا بۆ گۆڤاری وەرزانەی نیشتمان، پێویستی بە ڕۆمانی نووسەرێکی گەورە هەبوو، لێبڕا، ناکۆکی و ناتەبایی کۆن فەرامۆش بکات و داوای ڕۆمانیک لە دوستویفسکی بکات. نیکراسوف، قەولی دەداتێ، بۆ هەر ژمارەیەکی گۆڤارەکە دووسەد و پەنجا ڕۆبڵی بداتێ، بەڵام کاتکۆف بۆ هەر مەلزەمەیەک لە سەدو پەنجا ڕۆبڵ پتری نەدەدایە. دوستویفسکی ئەم پێشنیازەی پێ باش بوو، ڕاوێژ دەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەکات و لەسەر قسەی ئەو قاییل دەبی، کە بۆ ساڵی ئایندە ڕۆمانێک بداتە نیکراسوف ئەوەی لەم پرۆژەیەدا، مایەی نیگەرانی دوستویفسکی بوو، ئەمە بوو کە گۆڤاری وەرزنامەی نیشتمان، گۆڤارێکی

چەپ بوو. زۆربەی هەرە زۆری نووسەر و هاوکارەکانی، نەیارو هەڤرکی فیدۆر بوون، دوستویفسکی لەوە دەترسا، داوای لێبکەن وەکو ئەوان بیر بکاتەوە. نامەیەک بۆ ژنەکەی دەنووسێت و دەڵێت: "ئێستا ڕەنگە نیکراسوف، ئەگەر شتێک بە پێچەوانەی مەیلی ئەوەوە بنووسم، بە ئارەزووی خۆی ئازارم بدات، بەڵام ئەگەر قەرار بی کە درۆیان بنووسم، بکەوینە سواڵیش شتی وا ناکەم. مەحاڵە ملیان بۆ بدەم، یەک حەرف، لەوەی کە نووسیومە، نە زیاد دەکەم و نەکەم."

دوستویفسکی، بۆ ئەوەی بەتەواوەتی خۆی وەقفی ڕۆمانە تازەکە بکات، لێدەبرێت دەست بەرداری پۆستی سەرنووسەریی ڕۆژنامەی هاوڵاتی ببێت. لە "ستارایا ڕوسا"دا، کە وێستگەیەکی چکۆلەی ئاوی مەعدەنی بوو لە حاکمنشینی نوڤگورود و هاوینی ساڵی ١٨٧٢ی لەوێ بەسەر بردبوو، خانوویەکی هاوینە بە کرێ دەگرێت.

ئیمی دوستویفسکی لەمبارەیەوە دەنووسێت: "لەم خانووەدا هەموو شتێک بچووک بوو. ژوورەکان بچووک و تەنگ، میچەکانیان نزم بوو. موبیلەکانی مودێلی کۆن بوون، ئاوێنە سەوزەکان سیمای ئەو کەسانەیان، کە جورئەتیان دەکرد تەمەشایان بکەن، خوارو خێچ و شێواو دەنواند. کۆمەڵێک پارچە کاغەز، بە قوماشەوە چەسپێنرابوون و لەجیاتی تابلۆی هونەری بەدیوارەکانەوە هەڵواسرا بوون و لەبەرچاوی حەپەساوی ئێمەی منداڵدا، وەکو ژنانی دێو ئاسای چینی دەست و پەنجە درێژ و پێ لەپێڵاوی بچووکدا جەڕێنراو دەیان نواند. هۆڵێکی بچکۆلەی تیابوو، کە شووشەی پەنجەرەکانی ڕەنگین بوو، ئێمەی منداڵ زۆر دڵمان پێی خۆش بوو. بلیاردێکی چکۆلەی چینی، تیابوو، بەتۆپی شووشەیی و گوڵی کەندەکارییەوە، کە لە ڕۆژانی درێژ و بەبارانی هاوینانی باکووردا زۆر دڵی خۆش دەکردین. لەپشت ماڵەکەوە باخچەیەک هەبوو، پڕ بوو لە جۆگاو فوارە و جۆرەها گوڵی تیا ڕوێنرا بوو."...

دوستویفسکی، عادەتی وابوو شەوان کاری دەکرد. سەعات پێنجی بەرەبەیان دەچووە ناو جێگاوەو سەعات یازدە لەخەو ڕادەبوو. هەنگێ منداڵەکانی گازدەکرد، ئەوانیش بەهەشتاو دەچوون بۆ نک بابیان و ئەو وردە ڕووداوانەیان بۆ دەگێڕایەوە کە ئەو بەیانیە دیتبوویان و بەسەریان هاتبوو. دوای فراڤین، دەگەڵ ژنەکەیدا دەچووە ئۆفیسەکەی خۆی و، ئەوەی شەوێ نووسیبووی، بۆی دەخوێندەوە تا پاکنووسی بکاتەوە:

-ئێ ئانێت چۆنە؟

-بەڕای من زۆر جوانە!

تەنانەت هەندێجار وا ڕێدەکەوت کە ئەم ژنە گەنجە لە کاتی پاکنووس و بەدەم نووسینی هەندێ پەرەگرافی کاریگەر و ڕۆمانسیەوە دەگریا و ڕوندک لە چاوانی دەهاتنە خوارێ و دیتنی ئەم فرمێسکانە بۆ دوستویفسکی لە هەموو خەڵاتێک زیاتر بوو. بە ئانای دەگوت: "بەڕاستی ئەم پەرگرافە بەو ڕادەیە کاری تێکردیت، داوای بوردن دەکەم، بمبورە."

ئەو ڕۆمانەی کە دوستویفسکی لەو خانووە هاوینەو چەپەکەی ستارایا ڕوسادا، سەرقاڵی نووسینی بوو، ڕۆمانێکی گەورە و دورودرێژ بوو. بابەتی ئەم ڕۆمانە تێکەڵەیەک بوو لەو یاداشتانەی کە نووسەر بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر، لەسەرچاوەێن جیاوازەوە کۆی کردبوونەوەو لە چەکمەجەی مێزەکەیدا هەڵیگرتبوون. نووسەر هەموو ئەم بابەتە پەراگەندانەی بە نەفەسی ڕۆماننووسییەوە دەدایە دەم یەکەوەو دەی هونەراند.
دەتوانرێ بگوترێ ئەم چیرۆکە، کە بەباشی بنەماکانی هاوئاهەنگی و گونجانی ڕۆمانەوانی و چیرۆکڤانی تیا ڕەچاونەکرابوو، دە ڕۆمان بوو لە قاڵبی یەک ڕۆماندا. هەر کەسێک دەیخوێندەوە وای هەستدەکرد نووسەر هاتووە کۆمەڵێک چیرۆکی بڵاو نەکراوەو، چەند وتار و کەرەستەی لیکۆڵینەوەی پەراگەندەی مۆنتاج کردووە و بەپەلە پەل داونیەتە دەم یەکەوە و شپرزەیی پێوە دیارە، بەڵام وێڕای ئەوەش جۆرە بلیمەتیەیەکی هونەرمەندانەی لەخۆ گرتووە.
ئەم ڕۆمانە کە ناوی "هەرزەکار"ی لەخۆ گرتووە، وەکو باقی ڕۆمانە گەورەکانی دیکەی دوستویفسکی، چیرۆکی خەبات لە ڕای ئازادیدا، دەگێڕێتەوە: "ڕاسکولینکوف، قەتڵ دەکات تا ئەوە بۆ خۆی بسەلمێنێ کە کەسێکی ئازادە. گەمژە ئازادی خۆی لەشێتاتیدا دەبینێ. شەیتانەکان، لەڕێگەی شۆڕش و یاخیبوونەوە بۆ ئازادی دەچن، لێ قارەمانی ڕۆمانی هەرزەکار، لە هەوڵ و هۆڵی ئەمەدایە کە ئازادی خۆی بە پارە بکڕێت. بە نۆرینی ئەم قارەمانە سەروەت و سامانی کەسێکی وەکو روچیلد. سەلامەترین ڕێگاو زامنە بۆ گەیشتن بە دەسەلاتو سەربەخۆیی. (ڕوچیلد، بانکدارێکی جوولەکەی، بابە گەورەی خانەوادەیەکی دەوڵەمەند و بەهێزی بواری کاروباری بازرگانی بوو، لە فرانکفۆرت (١٧٤٢ -١٨١٢) لەدایکبووە و مردووە. پێنج کوڕی هەبوو کە درێژەیان بەهەمان کاری ئەو داوە، ١-ئەنسەلیم لە فەرەنسا ٢-سەلاموف، لە ڤێنا ٣-ناتان ماقەر، لە لەندەن، ٤-کارل، لە ناپولی و ٥-جاکوپ لەپاریس. وشەی روچیلد لە زمانی ئەوروپاییدا، ڕەمزی دەوڵەمەندییە.)
ئارکادی دولگوروکی، کوڕی ناشەرعی ڤیرسیلوف، لە ژنێکی کۆیلە دەڵێت: "من بەنیازم ببم بە روچیلد، بە ئەندازەی روچیلد دەوڵەمەند ببم، نەک هەر دەوڵەمەند ببم، بەڵکو دەقاو دەق، بێ کەم و زیاد بەقەد روچیلدم هەبێت."
ئارگادی دولگوروکی بەو جۆرە گوزارشت لە ئاوات و حەزی خۆی دەکات. ئەم کوڕە نە بابی خۆی دەناسێت و نە دایکی. وەکو منداڵێکی هەتیو دەخرێتە قوتابخانەیەکی شەوانە ڕۆژی تایبەتی کابرایەکی فەرەنسی دڵڕەوق و جاهیلەوە بەنێوی ڕێزادر توچارد. ئەم پانسیونە، بریتی بوو لە دەزگایەکی ئەرستوکراتی و تایبەت بوو بە میرزادە و کوڕە سیناتوران. جا ئەم توچاردە داوای پارەی زیادەی دەکرد تا منداڵێکی حەرامزادە قەبووڵ بکات، چونکە ئەم پارە زیادەیەی نادەنێ ئیدی تۆڵەی ئەم ناکامیەی خۆی بەوە دەکاتەوە کە ئازاری ئەو منداڵە دەدات. پێی دەڵێت: "ئێرە جێی تۆ نییە، جێی تۆ ئەوێیە." و

ژوورێکی تەنگ و تاریکی بۆ تـەرخان دەکـات، پێـی دەڵێـت: "تـۆ هـەقی ئـەوەت نییە لەگەڵ منداڵانی نـەجمیزادەدا دابنیشـیت، تـۆ کەسـێکی ناڕەسـەن و بـێ ئەسڵ و فەسڵی، هیچت لە هەر خۆڵام و نۆکەرێک زیـاتر نییـە." لێـی دەدات و دەیکات بە گەپچاڕ و گاڵتەچی هاوڕێکانی، بەڵام ئارکادی چکۆلە لەبڕی ئـەوەی پەرچـە کـرداری تونـد نیشـانبدات و تـووڕە ببێـت و هـەڵچێت، هەوڵـدەدات بـە گوێڕایـەڵی و ملکـەچی و نەرمکێشـی زۆر، توچـارد چـەک بکـات. دەڵێـت: "دوو دانە مانگی خشت ئەو کابرایە دارکـاری کـردم. مـن دەمویسـت بەهـەر جـۆرێ بووە ڕازی بکەم. ڕێزم دەگـرت، مـەراییم دەکـرد، خـۆم بەسـەر دەسـتیا دەدا تـا دەسـتی مـاچ بکـەم، بـەدەم هەنسـکی گریانـەوە دەسـتیم ڕادەمووسـی." منداڵەکـە، بەسـەر زەنشـت و سـەرکۆنە کردنـەکانی توچـارد ڕازی بـوو. پێـی دەڵێت: "تۆ مـن ڕەزیـل دەکـەیت. زۆر باشـە، خـۆم خـۆم سەرزەنشـت و ڕەزیـل دەکەم، لـە تـۆ زیـاتر خـۆم سـەرزەنشـت دەکـەم! فـەرموو، تەمەشـاکە. توچـارد دارکاری دەکردم، دەیویست بیسەلمێنێ کـە مـن خـوڵام و نۆکـەرم نـەک کـوڕە سـیناتۆر، ئیـدی منـیش یەکسـەر دەچوومـە کڵێشـەی بابایـەکی نۆکـەرەوە دەمگوت: باشـە تۆ ناتەوێ من بابایەکی نۆکەر بم، دەیسـا فـەرموو. ئـەوەتا مـن نۆکەرم، ناتـەوێ کەسـێکی خـوێڕی و بـەرەڵابم، دەیسـا خـوێڕی و بـەرەڵڵام و ئەولاتریش."

هەڵبەتە، حەقارەت کە دەگاتە دوا پلەی خۆی، جـۆرە کبریـا و غروورێـک لـەخۆ دەگرێت. قەبووڵکردنی حەقارەت و ئیهانە، یارۆی حەقارەتکار سـەرسام دەکـات. دیمـەنی حـەقارەتی تـەواو، ڕێـک وەکـو دیمـەنی ئازایـەتی و شایسـتەگی، دیمەنێکی ڕیزپـەڕە. هـەردوو هەڵوێسـتەکە لەیـەک سـەرچاوەوە هەڵـدەقوڵێن. بەدەگمەن کەسێک هەڵدەکەوێت خۆی بە خوێڕی یان بە مرغروور بزانێ.

دالگوروکی، ئیعتراف دەکات و دەڵێت: "هەرکە هۆشـم کردەوە، ڕقم لە بەشـەر هەستا. لەوە بەدواوە ئیدی هیچ متمانەیەکم بەکەس نەما. تەنانەت ناتوانم متمانە بە نزیکترین کەسـی خۆشـم بکەم. یا بەگوتەیەکی دی دەتوانم، بەڵام خۆم نامەوێ. خۆم لەو کارە دەدزمەوە.. من کەسێکی بەگومان و بەپارێزم، کەمدوو و گۆشـەگیر، بەسـەر خۆدا داخراوم... زۆر هەستدەکەم، حەزدەکەم جیاببمەوە، هەر پەیوەندییەک لەگەڵ کۆمەڵگەدا ببڕم... هیچ هۆ و پاکانەیەک نابینم کە چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بکەم. تیرەی بەشـەر ئەوە نایەنن ئاوڕیان لێبدەیتەوە و بایەخیان پێبدەیت."

ڕۆژێک لەژێر کاریگەرییەکی عاتیفی و سۆزداریدا، ستایشـی "ڤاسـین"ی هاوڕێی دەکات. دەڵێت: "هەر ئەو شـەوە هەسـتم کرد زۆر کەمتر لە جاران خۆشـم دەوێ. چونکە بەستایشکردنی ئەو، قەدر و حورمەتی خۆم لەهەنبەر ئەودا هێنابووە خوارەوە." هەروەها دەڵێت: "لە نزیکترین پۆلی قوتابخانەکەماندا، هەرکە هەستم بکردایە یەکێک لە هاوڕێکانم، لەمن زیرەکترە، یا لەڕووی هێزی جەستەییەوە لەمن بەهێزترە یەکسـەر لێی دوور دەکەوتمەوە و قسـەم لەگەڵی دادەبڕی..."

جا ئەم نۆکەرە، ئێستا دەیەوێت ببی بەئاغا یا بەگوتەیەکی دی، دەیەوێ لەهەمان کاتدا هەم ئاغاو هەم نۆکەر بێت، ئاغایەک بێ لە کڵێشەی نۆکەردا.
چەند بەڕۆژەوە زیاتر خەفەتی دەخوارد و ئازاری دەکێشا، بە تاسەیەکی زیاترەوە، تەسەور و وێنای ئایندەیەکی خۆشتری دەکرد. هەڵبەتە لەپێناوی ئازاردا تاقیبی ئازاری نەدەکرد، ئازار لەپێناوی ئازاردا نەبوو، بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە ئازارکێشانی ئەمڕۆی لەپێناوی ئایندەیەکی خۆش و گەشدا قەبووڵ دەکرد. ئازار بەلای ئەوەوە، وەکو هەموو کاراکتەرەکانی دیکەی دوستویفسکی، ئامانج نییە، بەڵکو ئەوزار و قۆناغە. بە ئازارو ڕەنج هەموو شتێک دەکڕێت، نرخەکەی دەدات. ئازار و ڕەنج، کول و کۆڤان، تاقە سکەیەکە کە دۆستویفسکی هەم لە ژیانی شەخسی خۆیدا و هەم لە ڕۆمانەکانیدا، مامەڵەی پێوە دەکات و قەبووڵی دەکات. کاتێ کە مەسەلە دێتە سەر ئەمەی کە لەڕێگای کول و کۆڤان و ئازارکێشانەوە، ئەوپەڕی شادی بۆ خۆی و بۆ قارەمانەکانی دابینبکات، زۆر بەباشی دەتوانێ، لەم سەودایەدا قسە بکات، گەنگەشە بکات، بەرگری و داکۆکی لەخۆی بکات و هەزار و یەک هەنجەت و بیانوو بێنێتەوە.
وەکو دەڵاڵانی ئەسپ کە لە چەنەلێدان بێزار و ماندوو نابن، دەڕۆن و دەگەڕێنەوە، جارێ دەگرین، جارێ تووڕە دەبن و سەرەنجام وا دەنوێنن مامەڵەیەکی باشیان کردووە و مامەڵەکە سەری گرتووە. ئەم "جەلادی پارە"یە، ئەم دەستبڵاوە بێپەروایەی کە لە چاکبوون نایەت، هەرکە باسی پارە لە ئارادا نەمێنێ و باس بێتە سەر باسی بەشەر دەیسەلمینێ کە مامەڵەچیەکی یەجگار کارامە و لیهاتووە، مامەڵەچیەکی نمرە یەکە.
ئارکادی چکۆلە، ئێستا دەزانێت کە سەروەت و سامان ئەو بایەخە عاتیفییەی نییە، کە ئەو هەموو ڕەنجەی لەپێناودا بدرێ. دەڵێت: "کە شەوانە دەچوومە ناو جێگاو خۆم لەژێر پاڵتۆکەم و نوێنەکاندا قانگڵە دەکرد، بە تاقی تەنیا، دوور لە هاتوچۆی بێگانان، بیرم لەمە دەکردەوە کە ژیانی خۆم لەسەر بنەماو بناغەیەکی دی ڕێک بخەمەوە." ئەو بۆ خۆی بیرێکی هەبوو. بەڵام بیری بابایەکی هەمیشە سەرکوتکراوی سووکایەتی پێکراو دەبێ چ بێ؟ بە چ دەچێت؟ ئەو دەیەوێ گوێ بەکەس نەدات، حیساب بۆ کەس نەکات، دیوارەکان پروخێنێت، ڕاو قەزاوەتی پێشوەختە دەرهەق بە مەسەلەکان تێکبشکێنێ و ڕەت بکاتەوە. دەیەوێت خەڵکی حیسابی بۆ بکەن، لێی بترسن، ڕێزی بگرن، گوێڕایەڵی بکەن. وەکو چۆن خۆی حاڵی حازر، دەترسێت و حورمەتی خەڵکی دەگرێت و بەگوێیان دەکات. بەڵام چۆن پرۆژەکەی جێبەجێ بکات؟ چاری ناچارە دەبێ چاو ژێر بکاتەوە، پروانێتە دەوروبەری بۆ ئەوەی ئەندازەی ئەو ڕۆڵ و دەورە گەورەیە بخەملێنێ کە دەوڵەمەنی و سەروەت و سامان لە کۆمەڵگەدا دەیگێڕێت. تەینا خەڵکی دەوڵەمەند دەتوانێ هەرچییەکی بوێ بیکات، دەتوانێ جەستەو ویژدانی خەڵکی، دین و دنیا بکڕێت. ئەخلاق و ڕەفتاری هەر کەسێک بەڕادەی سەروەتەکەیەوە بەندە، ئیدی لەدوای هەندێ ژمارەوە، شتێک نامێنێ بەنێوی ئەخلاق. ئەو پرەنسیپە

ئەخلاقیانـەی کـە راسـکولنیکوف دەیـەوێ لـەژێر جـەنازەی قوربانیەکەیـدا بیپلیشـێنێتەوە، ئارکـادی گەرەکیـەتی لـەژێر بـاری زێـڕدا بیپلیشـێنێتەوە. بـۆ یەکەمیان تاوان و بۆ دووەمیان پارە، هۆیە بۆ هەڵاتن لـە میگـەل و مێگەلایـەتی. هەوڵەکەی ڕاسکولنیکوف، هەوڵێکی تراژیدی کارەساتبارە، بـەڵام هەوڵەکـەی دالگـوروکی، سـەخیف و کۆمیدیـە. بـەڵام هـەردوو هـەوڵەکـە، بـەرەو یـەک مەبەسـت و ئامـانج دەڕۆن و هـەمان شکسـت و ناکـامی چاوەڕوانیانـە. هـەردووکیان لـە ڕوانگەیـەکی ڕیسـککارانەی ئایدیالیـەوە دەسـت پێدەکـەن و هەردووکیان لەڕێگادا، بەهۆی یادەوەری شـەخسـی خۆیـان و مەشـیەتی نادیـار و پەنهانی خواوەند، دەوەستن.
باگوی لە دالگوروکی بگرین: "دەزانن من سەروەت و سـامانەکەم لـەڕای چیـدا و چۆن خەرج دەکەم؟ چ بێ ئەخلاقیەک لەمەدا هەیە کە ئـەم ملیۆنـەها پوڵـە، لەدەسـتی کۆمـەڵێک جوولەکـەی نـەگریس و بـەدکردەوەوە بکەوێتـە دەسـتی کەسێکی ئاقـڵ و ژیـرو گۆشـەگیر، کـە چـاوە تیژەکـانی بەسـەر سـەرانسـەری خەڵکی ئەم دنیایەدا، بگێڕێت."؟
چ شتێک لە ڕۆمانی تاوان و سزادا دەخوێنینەوە؟
"لەنێو تێکڕای ئەسپێیانی دنیادا، من موزیرترینیانم هەڵبژاردووە، بەتەمام، بە کوشتنی ئەو. ئەو شتەی، کە بۆ یەکەمین هەنگاوانی من پێویستە، بەدەست بینم." هەروەها دەڵێت: "سەد، هەزار کاری خێر، یان هەوڵی بەسوود و چاکەکارانە، دەشێت بە پارەکانی ئەم پیرەژنە ئەنجام بدرێن. بیکوژەو سەروەت و سامانەکەی، زێر و پارەکەی ببە و پاشان تا دەتوانی خۆت بۆ خێرو چاکەی تیرەی بەشەر تەرخان بکە." ئایا ئەم دوو ئاوازە، لە یەک زەنگەوە، لە هەمان زەنگەوە بەرزنابنەوە؟ لەڕاستیدا نە ڕاسکولنیکوف و نە دالگوروکی، هیچیان لە خەمی بەرژەوەندی باڵای کۆمەڵگەی بەشەریدا نین. لە خەمی خۆشگوزەرانی خۆشیاندا نین، ئەمانە تەنیا ئاشق و تامەزرۆی دەسەڵاتن، بەدەر لەو ئیمتیازاتە مادیانەی کە ئەم دەسەڵاتە دەتوانێ بیانداتێ. واتە دەسەڵات لەپێناوی دەسەڵاتدایە. راسکولنیکوف دەڵێت: "من بۆ ئەوەم نەکوشت تا یارمەتی دایکم بدەم، لەبەرئەمەش نەبوو کە ئیمکاناتم بەدەست هینا، کار بۆ چاکەو خێری تیرەی بەشەر بکەم. من دەبوایە بمزانیبا، خۆم تاقیکردباوە و زۆر زوو زانیبام کە ئایا منیش وەکو خەڵکی کرمێکم یان بەشەرم؟" یارۆی "هەرزەکار"ش دەڵێت: "من پێویستم بە پارە نییە، یا بەگوتەیەکی دی ئەوەی پێویستم پێیەتی پارە نییە، تەنانەت پێویستم بە دەسەڵاتیش نییە، من تەنیا پێویستم بەو شتەیە کە لە ڕێگەی توانـاو دەسەڵاتەوە بەدەست دێت و، بەبێ دەسەڵات بە دەست نایەت: ئەمە پوختە و کورتەی لێکدانەوەی ئەوە بۆ دەسەڵات و توانا."
بەڵێ، باڵاترین پلەی لەزەت، ئەوەیە، زۆر سادە و خاکیانـە لەسـەر خـەرمانی سـەروەت و زێر و زیوەکـەت دانیشـیت، لـەزەت لـە گۆشـەگیری خـۆت بـدینی و ئەوپـەڕی خۆشـکێنی بکـەیت، لـە کاتێکـا هـەموو ئیمکانـاتێکی ڕابـواردن و خۆشـگوزەرانی و عـەیش و نۆشـت لـەبەردەسـتدا بێـت، قاسـەکانت پـڕبن لـە

ئەسـکەنـاس و خـۆت هـەژار و بێنـەوا بنـوێنی! ئـەم شـێوازی ڕازی کردنـی دەرونییە، کە شێوازێکی تا ڕادەیەک کرێت و چەپەڵ، هـەمان شـێوازە کـە لای کـابرای ژێـر زەمینیـدا بـەزەقی دیـارە. یـارۆی هـەرزەکار وا بیـر دەکاتـەوە: "هـەر دەسەڵاتم هەبوایە، ئیدی پێویستم بە دەسەڵات نەدەبوو، بێگومان بە کـەماڵی ئـارەزوو، لـە هـەر شـوێنێک بوایـەم، دواڕیـزم دەگـرت. ئەگـەر ڕوچیڵـدبام، بـە جبەیـەکی کـۆن و ڕزیـوەوە دەگـەڕام و چـەترێکم بـە دەسـتەوە دەگـرت، چ زەرەرێکم دەکرد ئەگەر لە ڕێگە وباندا شانیان لە شـانم بدایـە، یـان بـەنێو قـوڕ و چڵپاودا ڕامکردبا تا گالیسکان وەژێرەوەم نەکەن؟ هەر ئەوەندەم هەسـت کردبـا کـە ڕوچیلـدم، ئیـدی بـە سـم بـوو. بـۆ ئـەوەی لەوسـاتەدا هەسـت بەشـادی بکەم." هەروەها دەڵێـت: "ئـاه، ئـەم جەنەڕاڵـە بێئەدەبـەی کـە لەوێسـتگاکەی نێوان ڕێگادا، کە هەردووکمان چاوەڕوانی ئەسپ بووین و سـووکایەتی پێکـردم، ئەگـەر بیزانیبـا مـن کـێم، بـەڕاکردن دەهـات، ئەسـپەکانی بـۆ لـە گالیسـکەکە دەبەستم و یارمەتی دەدام تا سواری عەرەبانە سادەکەم ببم."
هـەرزەکار، بیـر لـەوە دەکاتـەوە، کـاتێ کـە لـە لەدەسـەڵات بێزاربـوو، هـەنگێ دەکەوێتە بەخشـینەوەو دابەشـکردنی پارەکـانی. لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: "تـەنیا بیری ئەوەی کـە خـاوەنی چەنـدین ملێـون بـووم و فـڕێم دایـە قـوڕاوەوە، خـۆی لەخۆیدا و ژێراو ژێر گەشـەو نەشـە بەڕوحم دەدات."
بەمجۆرە، وەکو چۆن ڕاسکولنیکوف، پێویستی بە پارە دزراوەکە نەبوو "دالگوروکی"ش، پێویستی بەو پارەیە نەبوو کە بەدەستی هێنابوو. هەردووکیان کاریان بۆ ئەوە دەکرد کە بەئارامی و ئاسوودەیی هەست بە دەسەڵات و توانا بکەن.
بـەڵام ڕاسـکولنیکوف، بـە غـروورەوە، بـۆ ئـەم ئیدارکـە دەروونـی و دەسـەڵاتە ئارامــە دەگــەڕێت و دالگــوروکی، وەکــو کەســێکی خــاکی وخۆشــکێن. راســکولنیکوف، دزی دەکــات، دەکوژێــت، خــۆی دەخاتــە بــەر مەترســی دوورخستنەوە بۆ سیبریا تـا توانـا و دەسـەڵات بکڕێـت، دالگـوروکی، ڕێگایـەکی ئاقڵانــە و دوور لەهــەر خۆهەڵکێشــان و بەخۆفشــینیک هەڵــدەبژێرێت: کۆکردنـەوەی پـارە و پـول. هـەرزەکار وا بیـر دەکاتـەوە: "پـارە، تاقـە ڕێگایـە کـە، ڕیسواترین و بێنرخ تـرین و نـەبووترین کـەس دەگەیەنێتـە بـاڵاترین پێگـەو پایـە."
بەڵام پیاو چۆن دەتوانێ دەوڵەمەند بێت – دەڕوانێتە دەوروبەری خۆی – هـەموو کەسـێک بـەئاواتی دەوڵەمەنـد بوونەوەیـە، هەرچییـەکی لـە دەسـت بـی، لەپێناوی پارەو بـۆ دەسـت هێنـانی پـارە دەیکـات. یـانی خۆیشـی لـەو پێنـاوەدا بفرۆشێت؟ ئانا ئاندریڤونا، بە خوایشتی خۆی، خۆفرۆشـی دەکات. یانی ئەگـەر پێویست بکات چەک و حەواڵەیەکیش لەو پێناوەدا تەزویر بکرێـت؟ سـتیبلیکوف، ئـەو کـارە دەکـات. ئەگـەر لـەپێناوی پـارەدا دزو سـاختەجیاتیش بکرێـت؟ لامبـرو تریچـاتوف، لەشـتی وا ناپرینگێنـەوە. بـەڵام هـەرزەکار، لـەو کەسـە بـێ پـەرواو دڵڕەقانــە نییــە. کەســێکی ســادەو خاکییــە، کەســێکی نەجیبــە، بــەڵام نەجابەتەکەی زادەی ترس و ترسنۆکییە. لەو کەسانە نییە کە لەڕێگای ڕیسـک و ڕیسـککاریەوە پـارەو پـول بەدەسـت دێـنن. ڕەزیلـی دەکـات، تـەنیا نـان و ئـاو

دەخـوات، عانـە بەعانـە کـۆی دەکاتـەوە لـەکۆتایی مانگـدا سـەیر دەکـات هەوڵەکەی سەرکەوتوو بووە، هەرچەندە بەهۆی ئەم ڕێجێمە توندەوە، گەدەی هەندێک خراپ بووە. ئەزموونی دووەمی ئارکادی چکۆلە ئەمەیـە کـە خـۆی لـە نیوەی ئـەو پارەیـەی بـۆ خـەرجی گیرفـانی خـۆی تـەرخان کـرد بـوو، مـەحرووم دەکات و بەم شێوەیە لەماوەی دوو ساڵدا پڕی هەفتا ڕۆبـڵ کۆدەکاتـەوە. ئیـدی ئەم کۆششـە بەردەوامە، کە لەکۆشـش و کۆڵنـەدانی میرولـە دەچێـت، وا لـەم منداڵە دەکات، دەستبەرداری منداڵی خۆی ببێت و بەئومێدی ئایندە بژی.

بەڵام، سەد حەیف ومخابن، ئینسان تەنیا ویست و ئیرادەیەکی ئاراسـتەکراو نییـە. وەکـو چـۆن ڕاسـکولنیکوف، بەخـەیاڵی ئـەوەی بگاتـە پلـەی ئینسـانی ئایدیالی و باڵاو، لـەناکاوا بـۆی دەردەکـەوێت ئـەویش کرمێکـە وەکـو کرمـەکانی دی." بەو ئاوایە ئیحساسات و کەڵکەڵە و ئـەڵهـا بچووکـە زەمینییـەکان دەکەنـە کارێک کە هەرزەکار بخزێت. ئەوەی بەسـەر هزر و بیـری مـەزنی ڕاسـکولنیکوف و هـەرزەکاردا زاڵ دەبێـت، فکـر نییـە، بـەڵکو ژیانـە. ئەمانـە لەهەنبـەر لۆژیـک و جەدەلیـەتی ڕەقیبـانی خـۆدا تەسـلیم نـابن، بـەڵکو بەرانبـەر بـەو حـەتمیەتـە کوشندەیە تەسـلیم دەبـن، کـە لەناخیانـدا هەیـە، بەرانبـەر بـەخۆیان تەسـلیم دەبن.

یەکەمین شکستی هەرزەکار کاتێ دەردەکەوێت، کە تووشـی ڕینوچکا دەبێت، لەبەر ماڵی نیکولای سیمینوفیچ، کە ئارکادی لە مۆسکۆ، لەوێ دەژیا، منداڵێکی فڕێدراو دەدۆزێتەوە. دەیانەوێ منداڵەکە بۆ خانەی "منداڵانی دۆزراوە" بنێرن، بەڵام دالگوروکی خۆی لێ بەخاوەن دەکات، دەچێتە ژێرباری ئەوەی کرێی دایەنی بۆ بدات و هەموو مەسرەف و خەرجێکی دیکەشـی بکێشێت. ئیدی نیوەی سەرمایەکەی لەم پرۆژەیەدا سەرف دەکات. بەڵام رینوچکا، زوو دەمرێت. دەڵێت: "ئەو ڕیسکەی کە لەگەڵ رینوچکادا کردم، بۆی سەلماندم کە هیچ پرەنسیپێک ناتوانێ تا ئەو شوێنەم ڕابکێشێت کە بەرانبەر بە هەندێ ڕووداوێن گرینگ هەڵوەستە نەکەم. هەموو ئەو شتانەی کە بەدرێژایی ئەو ساڵانە لەپێناوی گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەکانم دا بەدەستم هێنابوون، هەر هەموویم لەپێناوی ئەو منداڵەدا دانا."

ئەم یەکەمین پاشەکشەیە لەو ئامانج و بیرە، کۆمەڵێک وردە پاشەکشە بەدووی خۆیدا دێنێت. دەڵێت: "بۆچی منیش، بۆ خۆ ڕانەبوێرم، نەچمە گەشتو سەیران؟ ژیان دوورو درێژە، بیرو ئارەزووەکەم هەر لەدڵدا دەمێنێ. خۆ ناتوانم دەست بەرداری ژیان بم، ژیان تەرک ناکرێت. کەواتە چار هەر ئەوەیە بۆ ماوەیەکی کەم، ئەگەر بۆ چارەکە سەعاتێکیش بووە، ئەو ئامانجە فەرامۆش بکەم."

و"بیرو ئامانجەکە" هەرماوەو چاوەڕوانە

بەڵام هەرزەکار، ئەو پارەو پوولەی لە شاردا وەدەستی دێنێ، بـە شـتی بـێ ماناو نابەجێی وەکو گرەو، قومار، کڕینی جل و بەرگ، سواری گالیسکان خـەرج دەکـات. بـەجۆش و خرۆشـەوە بەشـداری هەنـدێ جـم و جـوڵ و دەسیسـەی گومـانلیکراو دەکـات. دەگـەڵ خـەڵکانی بـەرەڵڵاو بێسـەرو بـەردا تـەماس و

پەیوەنـدی پەیـدا دەکـات، سـەرەنجام دان بـە شـکسـتی ئـەو خـەون و ئـاوات و فیکرەدا دەنێت کـە جـاران، لـە تـەنیایی ژێـر زەمینەکـەی خۆیـدا، خـەیاڵی پێـوە لێـدەدا و سـەرمەسـتی دەکـرد. روچیلـدی ئاینـدە، ئیـدی دەسـتبەرداری ئـەوە دەبێت، ببێت بە ئینسانێکی ئایدیالی باڵا. هەڵبەتە دەسـتبەرداربوونەکەی ئـەو، بەقەد دەستبەردار بوونەکەی راسکولنیکوف، ناخۆش و تراجیدی ئامێز و مایـەی بـەزەیی نـەبوو، چونکـە بـەلای کەمـەوە ئـەو لـەم گۆڕانـەدا، بـە ئەنـدازەی راسکولنیکوف ئازاری نەچەشتبوو. بەڵام دەستبەرداربوونی ئەویش لە خـەون و خـەیاڵ و بیرۆکـەی بەشـەری ئایـدیالی، زادە و بـەرایی کێشماکێشـێکی ئەخلاقی لەو بابەتە بوو.
دوستویفسکی، لەپاڵ ئەم بوونەوەرە، داماو و تێکشکاوەدا، سیمای ترسناک و بێپەرواى فیرسیلوفی بابی "ئارکادی"شی قوت کردووەتەوە. فیرسیلوف، لە هەندی لایەنەوە، ئاوێتەیەکە لە هەر هەموو قارەمانەکانی دوستویفسکی. ئەم کاراکتەرە هەم بۆ نووسەر و هەم بۆ خوێنەر نموونەیەکی مەند و ڕاز ئامێزو سەیرە.
فیرسیلوف، وەکو زۆربەی قارەمانەکانی دوستویفسکی دووفاقی لە بواری ئاشقێنیدا جەڕباندووە و لەو مەیدانەدا کارامەیە، لە ڕووی هەوەس و شەهوەتڕانیەوە "کاترین نیکولایڤنا"ی خۆش دەوێ و لە ڕووی بەزەییەوە دایکی هەرزەکاری خۆشدەوێ. کابرایەکی حەشەری و داوێن تەڕو شەهوانییە. هەستیار و مێبازە، ئیدی بەلای ژنانەوە "پەیامبەرە". بەڵام ڤیان و خۆشەویستی ئەو بۆ هیچ ژنێک جێگەی ئومێد نییە. چونکە بۆ فیرسیلوف و لای ئەو بەجۆرێ لە یەکێک بچێتە پێشەوە، کە لەبەر خاتری ئەو خۆی لەبیر بکات. نە سێکس و غەیزە دوو کەس لێکدی نزیک دەکاتەوە نە بەزەیی، هیچ یەکێکیان ئەشق و ڤیانی ڕاستەقینە نین. هەرچەندە، هەر یەکێکیان بگریت، ڕەگێکی دەچێتەوە سەر ئەشق. ئەشق بەر لە هەرشتێک، خۆ فیداکردنە. بەڵام بەزەیی سەرکەوتنی کەسێکە بەسەر کەسێکی دیکەدا، غەریزەی سێکسی، ڕەگی لە خۆپەرستی ڕەهادایە بۆ کەسێکی هەرزەی داوێن پیس و داوێن تەڕ، خۆشەویستی و ویساڵ، بیانووە بۆ لەزەتخوازی، یارۆ تەنیا بیر لە خۆی و لەو لەزەتە دەکاتەوە. شەهوەتڕانی یەکێکە لەو گۆشەگیرییە هەرە دژوارانەی کە دەشێت ئینسانێک دووچاری ببێت.
جـا ئینسـان لـەم گۆشـەگیری و تەنیاییـەدا، خـۆی گـوم دەکـات و دووچـاری دووفاقی دەبێت. فیرسیلوف دەڵێت: "دڵم پڕە لە قسـە، بـەڵام نـاتوانم بیڵـێم. وا هەسـتدەکەم بـووم بـە دوو بەشـەوە، هەڵبەتـە، بەڕاسـتی و زۆر لـەم حاڵەتـە دەترسم. وەکو ئەوەی هاوزاو هاوشـێوەکەت لەگەڵتـدا بێـت. خـۆت فامـاو ئاقـڵ بیـت، بـەڵام هـاوزا و هاوشـێوەکەت بیـەوێ کـاری هەڵـە و گەوجانـە ئـەنجام بدات..." خۆسەری و هەوەسڕانی، داروخانی کەسێتی، پەیـدابوونی هـاوزاد و هاوشێوە، شەیتان و گولیادکینی مۆنی لێدەکەوێتەوە کـە حاڵـەتێکی نزیـک بـە شێتاتی هەیە

فیرسیلوف، دەماوەری، دەمدەمی مجێز، خۆی بۆ وتاربێژی دەربارەی ڕۆڵی ڕووسیا، خۆشگوزەرانی تێکڕای تیرەی بەشەرو، عەشقی بێ خوا تەرخان دەکات دەڵێت: "خەڵکی پەراگەندە و پەرتەوازە، بەو زووانە یەکدەگرنەوە،بە میهر و دلۆڤانیەکی زۆرەوە یەکدەگرن... ئیدی زەوی و ژیانیان، بەدڵ و بەگیان خۆشدەوێ و ئیدی بەرە بەرە ڕادێن کە سەرەتا و کۆتایی خۆیانی تێدا ببیننەوە."

ئەم پیاوە، زۆر دەڵێت، بێئەندازە قسە دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا باوەڕی بەهیچ نییە. هەرزەکار قەناعەتی وایە کە "فیرسیلوف، هیچ مەبەست و ئامانجێکی دیاری نییە. گەردەلوولێک لە هەستێن هەڤدژ، مێشکی لەکارخستووە." کەچی هەرزەکار بەخۆیشی ناگاتە "ئەنجامی یەکجارەکی". ناچار دەستبەرداری بیر و ئایدیاکانی خۆی دەبێت و بەمجۆرە ئیقرارنامەی خۆی تۆمار دەکات: "ژیانی کۆن و ڕابردوو تەواو بوو، ژیانی نوێش، لە سەرەتادایە و تازە دەستی پێکردووە." ئەو قسەیە، دوا پەرەگرافی ڕۆمانی تاوان و سزامان وەبیردێنێتەوە: "ئێستا، ئەلەندی ئایندەیەکی نوێ و ژیانەوەیەکی تەواو و گەڕانەوە بۆ ژیان، بە سیمای ژاکاو و چرچەڵەیانەوە دەدرەوشایەوە."

دنیای ڕەخنەی ئەدەبی، بەگەرمی وستایشەوە پێشوازی لە دوا بەرهەمی دوستویفسکی دەکات ڕەخنەگرێکی، واریقاتی ڕۆژ، دەڵێت: "کاتێ کە ئەم ڕۆمانە دەخوێنیتەوە، ناچار دەبێت کە: بیر بکەیتەوە، بیربکەیتەوە، زۆر بیربکەیتەوە." بەگوتەی دوستویفسکی، نیکراسوف، هەموو ڕۆمانەکەی بە شەوێک خوێندبووەوە و گوتبووی: "هەرچەندە تەمەن و تەندروستی من ئەو جۆرە کارە هەڵناگرن!... بەڕاستی کارەکەت کارێکی تەڕو بڕە. ئەم ناسکی و تازەییە لە کاری نووسیندا، بۆ کەسێکی لەتەمەنی تۆدا، زۆر دەگمەنە و لەلای هیچ نووسەرێکی هاوتەمەنی تۆدا، بەدی ناکرێت. تولستوی، لە دوا ڕۆمانیدا تەقریبەن، خۆی دووبارە دەکاتەوەو بگرە نووسینی پێشتری، لەمانەی ئەم دواییەی باشترن."

بەڵام دژمنە هەمیشەییەکەی دوستویفسکی، واتا تورگینیف، لە لای سالکیکوف دەڵێت: "چاوێکم بەو وڕێنەنامەیەدا گێڕا، خودایا چ چەنەبازی و هەڤدژگۆییەکی تیاکراوە، ئەم نەخۆشخانە بۆگەنە چیە، ئەم هەموو بێهودە گۆییەی لەکوێوە هێناوە، ئەو پیاوە چەند حەزی لە شەرح و شرۆڤەی سایکولوژیە!" بەڵام ئەو قسەیەی تورگینیف، نەیکردە کارێک کە دوو ساڵ دواتر، بەخودی دوستویفسکی نەڵێت: "گۆڤاری دوو جیهان، ڕووی لە ئاغای ئیمیل دوراند ناوە، کە لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی نووسەرانی بەسەنگ و ئیحتوباری ڕووس بنووسێت، هەڵبەتە تۆشی تیا دەبیت و لە ڕیزی پێشەوەی هاوڕێکانتدا دەبیت.."

بەدرێژایی ئەم ساڵانی کارکردنە، دوستویفسکی دەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانیدا، لە ستارایاروسادا دەژین. مەگەر بۆ دیداری وەشانکارانی بەرهەمەکانی سەفەری سان پترو سبورگ یا مۆسکۆی کردبایە. جارجاریش بۆ چارەسەری هەوی گەرو، سەفەرێکی "ئیمس"ی ئەڵمانیای دەکرد.

خۆشحاڵ بوو. بە تاو تاو باسی منداڵە چکۆلەکانی دەکرد: "منداڵەکان لە هۆڵەکەدان، کورسییەکانیان گرتووە و گەمان دەکەن. منداڵەکان گۆشتی گوێرەکە و پسکیتیان خواردووە، شیریان خواردووە و چوونە دەرەوە بۆ یاری. ئیدی بەناو بەفران کەوتوون، بەفر کۆدەکەنەوەو شەڕە تۆپەڵ دەکەن." هەروەها دەنووسێت: "خەونم دیتووە کە فیدیا لەسەر کورسییەک بەربووەتەوەو ئازاری پێگەییوە. بیکە بەخاتری خوا مەیەڵە بچێتە سەر کورسی، بەدایەنەکە بڵێ، زیاتر ئاگاداری بێ." وەکو ڕۆژانی هەوەڵ، ژنەکەی خۆشدەوێ، ئەو نامانەی کە بۆ ژنەکەی دەیان نێرێت، بە ئیمزای "مێردی هەمیشەییت" واتە بەناونیشانی ڕۆمانەکەیەوە "مێردی هەمیشەیی" دەنارد. بۆ ژنەکەی دەنووسی: "گیانەکەم، دەزانی چەندت بیر دەکەم، چەندم پێویست بەتۆیە، لێم تێدەگەی؟ ئایا بە ڕاستی لەخەوتا دەمبینی؟ ڕەنگە ئەوەی دەیبینی من نەبم. من پێیە بچووکەکانت و هەموو شوێنیکت ماچ دەکەم، زۆر بەتاسەوە لە هەمێزت دەگرم." یا: "ئانیت، ئەی بتە ئازیزەکەم... لەبیرم مەکە، تۆ بەڕاستی بتی خۆشەویستی منی، تۆ خودای منی، هەر زەڕەیەکی جەستە و ڕۆحی من، تۆ دەپەرستێت و سەراپات لە ئامێز دەگرم، سەراپات ماچ باران دەکەم، چونکە سەرپات هی منە من!"

زۆر بەجدی و بە بایەخەوە بۆ کراس و عەزیزی "ئاناگریگوریفنا" دەگەڕا: "ئەەی ڕاستی بێ، خانەوادەی "شتاکن شنایدر" پێیان گوتم کە ئێستا لە پاریسدا، قوماشی ئاوریشمی گوڵباتمان مۆدی نییەو ژنان زۆر کەم لەبەری دەکەن. دەڵێن ئەم قوماشە زوو تێکدەچێ و لۆچ دەبێ و دەسوێ. ئێستا قوماشێکی تازە داهاتووە و بووە بە مۆد کە پێی دەڵێن ماهووت: زۆربەی ژنان لەو قوماشە لەبەر دەکەن. نموونەیەکیان نیشاندام زۆر لە ئاوریشمی سادە و بریقەداری جاران دەچێت."

لە ساڵی١٨٧٥دا بەمەبەستی ڕاستکردنەوەو هەڵەچنی پرۆڤەی ڕۆمانەکەی، بۆ سان پتروسبۆرگ دەڕوات. لەوێ تووشی نیکراسوف دەبیت کە پیرۆزبایی و دەستخۆشی دوا بەرهەمی لێدەکات، هەروەها ستراخوف و "مایکوف"ش دەبینێ کە پێشوازی و بەرخوردێکی ساردی دەگەڵ دەکەن. دەربارەی ستراخوف نامەیەک بۆ ژنەکەی دەنووسێت، دەڵێت: "بەڵێ ئانێت، ئەمە قوتابیەکی تەمەڵە و هیچی دی. دوای ناکامی ڕۆژنامەی زەمان، وازی لێهێنام و ئێستاش دوای سەرکەوتنی ڕۆمانی تاوان و سزا، بایداتەوەو گەڕاوەتەوە بۆ لای من."

سەفەری دوستویفسکی بۆ شاری ئیمس(بەهۆی نەخۆشییەوە) کارێکی زۆر زەحمەت بوو. لە نامەیەکدا بۆ ژنەکەی دەنووسێت: "چەندم حەز دەکرد، تۆ لێرەبای، لە هەمێزم گرتبای، ماچم کردبای، بەڕاستی لێرە لە گیانی خۆم وەڕزم، هەست بە بێزارییەکی کوشندە دەکەم." ئاو، زۆر کەم دەخواتەوە. لە پارکدا گوێ لە موزیک دەگرێت، کتێب دەخوێنێتەوە: "کتێبی ئەیووب* (کتێبی ئەیوب: بەیتێکی فەلسەفی بەرزە، لە تەورات. لەم کتێبەدا ئەیووب، باسی ئەو خزمەتگوزاریانە بۆ دۆستێکی خۆی دەکات، کە پێشکەشی کردوون و

دەڵێت بەبێ سووچ و تاوان ئەو هەموو ئازار و ئەزیەتەی کێشاوە.) دەخوێنمەوە جۆش و خرۆشێکی نەخۆشانە و نائاسایی پێ بەخشیووم. واز لە خوێندنەوە دێنم، بۆ ماوەی سەعاتێک، بەدەم نیمچە گریانەوە بەژوورەکەدا دێم و دەچم..."

هەر لە هەمان ماوەدا، ڕۆژنامەی پەیکی ڕووسیا ئەم هەواڵە بڵاودەکاتەوە: "زانیومانە کە نووسەری بەنێوبانگی ئێمە، میخائیل فیدور دوستۆیفسکی، تووشی نەخۆشییەکی مەترسیدار بووە." ئانا، بەلەز بروسکەیەک بۆ ئیمس دەنێرێت، دوستویفسکی یەکسەر وەڵامی دەداتەوەو دڵنیای دەکاتەوە و دەڵێت: "بەڕاستی نەگبەتیە پیاو گەورە و نادار بێت." دوای ئەوە سەفەرەکەی قەت دەکات و بۆ "ستارایاروسا" دەگەڕێتەوە. بە شادی و خۆشحاڵییەوە، بۆ ئەم شارە چکۆلەیە، شاری ئاوی مەعدەنی، شاری ماڵێن دارین، بە باخە گەورە و گازینۆکەیەوە کە بۆ گەشتیاران و مەلەوانان دروستکرا بوو، دەگەڕێتەوە. ئیدی دەگەڵ منداڵەکاندا گەمە دەکات، دەگەڵ خۆیدا و بە ڕەخی ڕووبارەکەدا، بۆ پیاسەی دوورو درێژیان دەبات. غەشیمانە، چاودێری و پەرستاری ئانا دەکات کە دیسان دوو گیانە. دوای یەک هەیڤ، لە ١٨٧٥/٨/١٠دا کوڕێکی دەبێت، ناوی دەنەن ئەلیکسی. ئیمی خوشکی دەنووسێت: "سەلامەت و بەهێز دیارە. بەڵام نێوچەوانێکی قۆقزی، هێلکەیی عەنتیکەی هەیە."

دوای لەدایکبوونی ئەلیکسی، خانەوادەی دوستویفسکی لێدەبڕێن لە "ستارایاروسا"وە بۆ پایتەخت (سان پتروسبورگ) بگەڕێنەوە. ئیدی لێرە ڕۆمانی هەرزەکار تەواو دەکات. ئیدی بیر لەوە دەکاتەوە کە درێژە بە پرۆژە کۆنەکەی واتە ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک، بدات و لەشێوەی وەرز نامەیەکدا، بڵاوی بکاتەوە.

لەسەرەتاکانی مانگی ئوکتوبەرەوە، ژمارە، یەکی ئەم وەرزنامەیە کە بڕیاری دابوو، خۆی هەر هەمووی بنووسێت و پڕ بکاتەوە، ئامادە دەکات. لە ١ک/٣٢ دا داوای مۆڵەت لە "ئیدارەی باڵای چاپەمەنی" دەکات کە ڕێگەی چاپکردن و بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەیەکی مانگانەی بدەن لە عەرز وحاڵەکەیدا نووسیبووی: "بڵاو کراوەیەک کە من وەکو نووسەرێکی ڕووس، باری سەرنج و تێبینییەکانی خۆمی، دەربارەی ئەوەی دەیبینم و دەیبیستم و دەیخوێنمەوە، تیا بڵاو دەکەمەوە.".. مۆڵەتی دەدەنێ، بەو مەرجەی "وتارەکان، پێش ئەوەی بە سانسۆردا تێپەڕن بڵاو نەکرێنەوە."

ژمارە، یەک لە ١٨٧٦/٢ک/١ دا بڵاوبووەوە، بە دەرچوونی ئەم ژمارەیە، قۆناغێکی تازە لە ژیانی دوستویفسکی دەست پێدەکات.

## فەسڵی دووەم
## ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک

لەوە دەچوو ئەو وتارانەی لە ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێکدا، بڵاو دەبوونەوە، دەقاو دەق درێژەی هەمان ئەو وتارانەبن کە دوستویفسکی، لە ڕۆژنامەکەی میرمیچیرسکیدا، واتە لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیدا بڵاوی دەکردنەوە. بەگوتەی دوستویفسکی خۆی ئەم وتارانە زیاتر بریتی بوون لە: "بیرەوەری شەخسی، و گوزارشتکردن لەو بابەتانەی کە مایەی سەرنجی شەخسی خۆم بوون." بەڵام هێشتا ئەوتۆن و شێوازەی نەدۆزی بووەوە کە دەبوایە لەم نووسینانەدا بەکاری بەرێت. لەدوای بڵاوبوونەوەی ژمارە سێیەمەوە دەنووسێت: "باوەڕ بکەن، من هێشتا فۆرم و شێوازی بڵاوکراوەی "ڕۆژانە یاداشتەکانی..."م نەدۆزیوەتەوە و وتیامـاوم و نازانم ئاخۆ دەتوانم فۆرم و شێوازێکی تایبەتی بۆ بدۆزمەوە یا نا... کاتێ دادەنیشمە سەر نووسین، دە پازدە بابەتم بەمێشکدا دێت، کە هەر یەکێکیان لە ڕوویەکەوە، بەدڵمن. بەڵام زۆرجار ناچار دەبم چاوپۆشی لە هەندێ بابەتی دڵخواز و دڵپەسندی خۆم بکەم، چونکە جێگای زۆر دەگرن، دەبێ وەختێکی زۆر بەنووسینیانەوە بەسەر بەرم و ئەوجاش ناتوانم هەموو ئەوەی مەبەستمە، بنووسم. لەلایەکی دیکەشەوە من زۆر ساویلکانە وام تەسەور دەکرد مەسەلەکە بەڕاستی بریتیە لە نووسینی "ڕۆژنامەیەکی بیرەوەریانە" بەڵام نووسینی "ڕۆژنامەیەکی بیرەوەریانە"ی ڕاستەقینە کارێکی دژوار و مەحاڵە. ڕۆژنامەبۆ ئەوەی لەلایەن خەڵکیەوە بخوێنرێتەوە، دەبێ پڕ بێت لە نیرەنگ و مەردم فریو وعەوام خەڵەتێن بیت..."

وێڕای ئەوەش، ئەم یاداشتە پڕ نێرەنگ و عەوام خەڵەتێنە، لایەنی بنەڕەتی فیکری دوستویفسکی لەخۆ گرتبوو. فیدور لە ڕۆژنامەکەیدا جاریکی دی گەڕایەوە سەر فەلسەفەی "بەرگری لەخاک"، دژی لایەنگرانی ڕۆژئاوا بوو، چونکە ئەوانە هەوڵیاندەدا ڕووسیا بکەن بە پاشکۆی وڵاتانی ئەوروپا. هەروەها هێرشی دەکردە سەر سلاڤدۆستەکان، چونکە ئەوانە داوای ڕووسیایەکی پێش پتروسی گەورەیان دەکرد، ڕووسیایەکی ڕازاوە بە جۆرەها درۆی ئەفسانەیی. ئایا نەدەکرا، ڕووسیا، جۆرە پێشکەوتنێکی تایبەتی خۆی هەبێت، لاسایی کەرەوەی پێشکەوتنی ئەوروپایی نەبێت، ئایا نەدەکرا ڕووسیا لەنێوان چاولێکەریی ئەوروپایی و گەڕانەوە بۆ ڕابردووی خۆیدا، ڕێگایەکی دی هەڵبژێرێت؟ ئایا ڕێگایەکی تایبەتی نییە کە ڕووسیا بتوانێ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، بیگریتە بەر؟ بەڵێ ئەو ڕێگایە هەیە، میللەت ئەو ڕێگایە دیاری دەکات. میللەت ڕووسیا ڕزگار دەکات. چونکە جووتیارانی کۆیلە، موژیکان، بەرخوردیان لەگەڵ کەلتوور و شارستانیەتی ڕۆژئاواییدا نییە، هەمان سادەیی و ساکاری و نەزانی و ئیمانی خۆیان بە حەقیقەتی مەسیح پاراستووە و جا بۆ

خۆ پاراستن لە سیرایەتی فەرهەنگ وشارستانیەتی ئەوروپایی، پەنا وەبەر نەزانی و پاشکەوتووی خۆی دەبەن. دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەڵێت: "هەندێ کەس، دەڵێن کە میللەتی ڕووس ئینجیل ناناسن، تەنانەت ئاگایان لەو پرەنسیپ و بنەمایانەش نییە کە بناغەی ئاینەکەمان پێکدێنن. بەڵێ بەڕاستی ئەمە وایە، بەڵام حەزرەتی مەسیح دەناسن و بۆ هەمیشە لەدڵی خۆدا هەڵیانگرتووە." خەڵکی بۆ ئەوەی ئیمانی هەبێ، پێویستی بە فێربوون نییە. ئیمان زادەی ئەقڵ نییە، پەیوەندی بە هیچ بیرکردنەوەیەکی ئەقڵانییەوە نییە. ئیمان لەدڵەوە هەڵدەقوڵێت و سەرچاوە دەگرێت. دەتوانرێ بگوترێ لە زەمینەی ئامادەگی روحی و بەدەنییەوە هەڵدەقوڵێت و سەرچاوە دەگرێت. لەلای ئینسانی ڕووس جۆرە مەیلیکی خۆرسک سەبارەت بە تەحەمولی ڕەنج و ئازار هەیە کە لە حەزرەتی مەسیحی نزیک دەخاتەوەو حەزرەتی مەسیح لەم نزیک دەخاتەوە. دەنووسێت: "میللەتی ڕووس جۆرە لەزەتێک لە تەحەمولکردنی ئازار دەبینێ" هەروەها دەڵێت: "من قەناعەتم وایە ئەو پێویستییە ڕوحیەی کە لەناخی ئینسانی ڕووسدا ڕیشاژۆ بووەو ڕەگی داکوتاوە، پێویستیەکی ئازار خوازی لەبن نەهاتووە، بۆ هەموو دەمێک و لە هەموو شوێنێکدا." ڕووس هەمیشە لەخۆی ناڕازییە، لەخۆی بێزارە، خۆشکێنە. لای ئینسانی ڕووس ئەو "ڕەزامەندییە سادەیە" نابینرێ، کە سەرو سیما و ڕەنگ و ڕوو بەگەشی و بەجوانی دێڵێتەوە. ئیدی ئینسانی ڕووس، موژیکی ڕووس، چونکە گوێ بە خۆشگوزەرانی مەعنەوی و ئەخلاقی خۆی نادات و لە کارو کردەوەکانیا پابەندی هیچ پێوەر و پێوانەیەک نایێت، سادە و ساویلکەیە، چونکە پەشێو حاڵە، فەقیر حاڵە، لەم دنیایەدا وێڵ و سەرگەردانە، بۆیە خۆشەویستی خوایە.

تەنانەت خەسڵەتێن کرێت و دزێوی وەکو مەیگوساری و بەدمەستی و ئالوودە بوون، دزی، پێشێلکاری داب و نەریتان، نەگبەتی و کوێرەوەری، ناوزڕاوی و درۆزنی لای ئینسانی ڕووس، نابێ ببێتە مایەی ترس و نیگەرانی. ئەم خەسڵەتانە زادەی ئەوپەڕی سەبرو تەحەمولە. ئەم خەسڵەتانە وەکو هەلپلکان و لەقەفرتێ و حەولەوەلای حەیوانێکی برینداڕن. ئەمانە نیشانەو بەڵگەی دەرکەوتنی زوو بەزووی بەهرەو توانای ئەون. دوستویفسکی لەسەری دەڕوات و دەڵێت: "میللەت خۆی ڕزگار دەکات و ئێمەش لەگەڵ خۆیدا ڕزگار دەکات، چونکە، جارێکی دیکە، ڕوناکی، لە خوارەوە هەڵدێ." ئەم دەستەواژەیە کە شۆڕشگێڕەکان، لە ئاسمانەوە قۆستیانەوە، لەڕاستیدا دژی شۆڕشگێڕەکان گوترا بوو. نووسەر دەیەوێت بڵێت کە بەهای ڕاستەقینەی میللەتی ڕووس تەنیا لە ئەرتەدوکسیەت و تزاریسم دایە. نووسەر جگە لەمە هیچ ڕێگەیەکی ڕزگاری و هاوسەنگی دیکە بۆ میللەت نابینێ و وێنا ناکات. تزار سەرچاوەی میللەتە، ئومێدی هەموو هیواو ئاوات و کەڵکەڵەکانی میللەتە. مەزەبی ئەرتەدۆکسی، بە جۆرێ ئاوێتەی ڕوحی میللەت بووە، کە مەسیح لەلایەن خەڵکییەوە، وەکو جۆرە خوایەکی نیشتمانی تەمەشا

دەکرێت: "ئەوەی شارەزای مەزەبی ئەرتەدوکسی نەبێت یا نکۆڵی لێبکات، هەرگیز میللەتی ئێمە ناناسێت.
(ئەرتەدوکسی: لە سەدەی نۆیەمی زاینیدا قەشەیەک بەناوی فوتیوس دژی پاپا وەستایەوە و کڵێسای قەستەنتەنیەی لە مەڵبەندی ڕۆم جیا کردەوە. یاساو ڕێساو ڕێنماییەکانی ئەرتەدوکسی، جیاوازیان دەگەڵ کاتولیک و پروتستان دا هەیە.)
ئەمە هەمان مەسیحەکەی شاتوفە، کە پاش ڕۆمانی شەیتانەکان، لە ڕۆژنامەی "ڕۆژانە یاداشتەکاندا..." دووبارە بووەوە: "من باوەڕم بە ڕووسیایە، باوەڕم بە ئەرتەدوکسیەتی ڕووسیایە" ناکرێت ئیمان بە یەکێکیان بێنی و ئەویتریان فەرامۆش بکەی.
هەڵبەتە ڕۆڵی ڕزگاری بەخشی، میللەت، هەر لە چوارچێوەی سنووری ڕووسیادا قەتیس نامێنێ، میللەتی ڕووس تەنیا ڕووسیا ڕزگار ناکات، بەڵکو جیهانیش ڕزگار دەکات، چۆن؟ چوونکە تەنیا میللەتی ڕووس، لە نیعمەت و هاوسۆزی و هاوخەمی و هاودەردی جیهانی بەرخودارە، کە ئەمە فاکتەرێکی گرینگ و پێویستە بۆ هەر جۆرە کارو کردەوە و هەنگاونانێکی مەسیحایی "ڕەنگە ڕوحی ڕووسی، بلیمەتی میللەتی ڕووس، لەنێو هەموو میللەتانی دیدا، ئامدەتربێ بۆ پەروەردەکردنی بیری برایەتی و یەکێتی جیهانی" فەرەنسیان، ئەڵمانیان، ئینگلیزیان، ئامادەنین خۆیان بەهاوشان و هاوسانی وڵات و میللەتێکی دراوسێ خۆبزانن، بەڵام لای ڕووسەکان، جۆرە نەرمییەکی دەروونی و ڕوحی ئەوتۆ هەیە کە تەقریبەن دەگەڵ "مێجێز و تەبیعەتی میللەتانی بێگانەدا تێکبکاتەوە و بگونجێت."، بەلای "ڕووسێکی ڕاستەقینەوە، ئەوروپا وەکو مەڵبەند و نیشتمانی گەورەی خێڵی و تیرەی ئاریان، بەئەندازەی ڕووسیا ئازیز و خۆشەویستە." ڕووسی ڕاستەقینە، تەنیا لە خەمی بەختەوەرییەکی نەژادی زاگەوزێدی سنووورداری خۆیدا نییە، بەڵکو لە خەم و ئارەزووی بەختەوەری هەموو تیرەی بەشەردایە." مەبەست و ئامانجی بابایەکی ڕووس، بێ چەند و چوون، یەکێتی هەموو ئەوروپایە، بگرە یەکێتی هەموو دنیایە." هەڵبەتە ئەو سەعاتەی کە "مارئی" بە ئارامی دەچێتە مێژووی جیهانییەوە، تەواو نزیک بووەتەوە.
(مارئی: ناوی وەرزێرێکی ڕووسە، کە لە جووتیارە کۆیلەکانی دوستویفسکی بوو)
جا ئێستا، ڕووسیا، لەهەنبەر ئەوروپای بێهەست و بێموبالات و مەحرووم لەخودا، کە پێشکەوتن لەباری ڕوحییەوە کوشتوویەتی، خۆیوکاروباری خۆی ڕێکدەخاتەوە. سیستەمی کۆیلایەتی زەوی هەڵوەشێنراوەتەوە، لە دادگاکانی تاواندا، ئەنجوومەنی دادڤانی هەیە. ئەم دوو هەنگاوە نیشانەی بێداربوونەوەی ویژدانی کۆمەڵایەتین. بزاڤی ژنان لە گەشە کردن و پێشکەوتندایە و ئەمە خۆی لەخۆیدا نیشانەی تازەبوونەوە و تازەگەرییە. "یەکێک لە ئومێدە گەورەکانی ئێمە و زامنی رینیسانسی ئێمە ژنی ڕووسە.. کە ئومێد و داواکانیان ڕوون و دیار و ڕاستگۆیانە و بێباکانەیە." جەنگی

ڕۆژهەڵات "دەگەڵ عوسمانیدا" حەماسی نیشتمانپەروەری دوستویفسکی دەگەیەنێتە لوتکە. دەنووسێت: "بەڵێ، قۆچی زێڕین و قەستەنتەنیە هەمووی دەبێ بە هی ئیمە." جۆش و خرۆش و حەماسەتی دەگاتە ئاستێک کە خوێنڕێژی بە حەڵاڵ بزانێت: "جەنگ، ئەو هەوایەی، کە ئێمە هەڵیدەمژین و تەنگە نەفەسمان دەکات و تووشی نەخۆشی و سستی دەروونیمان دەکات، پاکدەکاتەوە." لەوەش هێوەتر دەڕوات و دەڵێت: "چ شتێک لەم جەنگەی کە ئەمڕۆ ڕووسیا دەستی پێکردووە، دروست تر و پیرۆزترە؟" "لە خەڵکی، لە میللەت، لەسەربازان بپرسن، بۆچی ڕاپەڕیوون، بۆچی و بۆ کوێ دەڕۆن. چاوەڕوانی چین لەم شەڕەی ئەمڕۆ. هەموو بەیەک دەنگ وەڵامتان دەدەنەوە: دەچن خزمەتی حەزرەتی مەسیح دەکەن، برایانی خۆ، لە ژێر ستەم و زوڵم دەرباز و ڕزگار دەکەن."

لەڕاستیدا، ئەم لەشکرکێشییە، بەجۆرە وەڵام و ڕەنگدانەوەیەکی تەرزی بیرکردنەوەی خۆی دەربارەی ئەرکی مەسیحایی میلەتی ڕووس دەزانێت. میللەتی ڕووس دەڕوات شەڕی دژمنانی مەسیح دەکات و ئەوانەی ڕوو بەڕووی دەوەستنەوە نازانن کە ئەم میللەتە لە دوا ئەنجامدا حەقیقەت و شادیان بەدیاری بۆ دێنێ. ئەدی ئەو کوشتارو خوێنڕێژیانەی لەم شەڕە دەکەونەوە؟ دوستویفسکی گوێ بەمە نادات. ئایا ئەو قسانەی بیرچووبوونەوە کە دەربارەی جەنگی ساڵی ١٨٧٠ کردبوونی: "ئەوەی بەزەبری شمشێر ڕۆنرابێ و ڕۆبنرێ، ناتوانێ پایەدار و بەردەوام بی." ئێستا دەتوانێ دەقا و دەق وەکو راسکولنیکوف بەرسڤ بداتەوە بڵێت: "ئەو هیچ خەڵقەندەیەکی بەشەری نەکوشتووە، بەڵکو سەرەتا و پرەنسیپانی کوشتووە." هەموو ڕێگایەک لەپێناوی بیری مەزنی یەکێتی جیهانی لە چوارچێوەی مەسیحیەتداو لە سایەی حەزرەتی مەسیحدا ڕەوایە. ئەدی چ پاساوێک بۆ ئەم کوشتار و قەتڵ و عامەی بەنێوی مەسیحییەتەوە دەکرێت، بهێنرێتەوە؟ حەزرەتی مەسیح خوێنی خۆی بەڕشتن دا، قوربانی بەخۆی دا تا ئیمە ڕزگاربکات، باشە ماقووڵە ئێمە خوێنی خەڵکی بڕێژین یا حەزرەتی مەسیح ڕزگاربکەین؟ خۆ هەر دۆستویفسکی خۆی گوتویەتی: "نەفرەت لەو شارستانیەت و فەرهەنگەی کە دەبێ لە پێناوی پایەداری و مانەوەیدا، پێستی خەڵکانێک بێتە گروون.

ئەدی ئەگەر، قەرار بێ لەپێناوی پایەداری و مانەوەی مەسیحیەتدا، ئەو جۆرە قەسابخانە و پێست گروونە بەرپا بکرێت. هەنگێ چ بڵێین؟ هەڵبەتە وەڵامی دۆستویفسکی بۆ ئەم پرسیارە کۆنگ و ئاڵۆزە، لە ڕاستیدا هەڵاتنە لە بەرخوردی ڕاستەوخۆ دەگەڵ واقیعدا. دەڵێت: "ئەگەر بەشێوەیەکی تیۆری ڕووت بیر لەمە بکەینەوە. ڕەنگە کارێکی نابەجێ و بێمانا بێ، بەڵام لە واری پراکتیکیدا وایە." دۆستویفسکی سەبارەت بە چارەسەری مەسەلە مەزەبی و میتافیزیکیەکان، زۆر دڵی بە میللەتی ڕووس خۆشەو هەموو ئومێدێکی بەوانە، دەڵێت: "لەوەیە دەنگدانەوەی فەتح و سەرکەوتنەکانی ئێمە لەسەرانسەری کیشوەری ئاسیادا دەنگبداتەوە، تا هندستان بڕوات، لەوەیە

لـەلای ئـەو ملیۆنـان خەڵکـەی ئاسـیادا، ئیمـانی خـوایی لـە چـارەی لەبـەزین نەهاتووی تزاری سپیدا، بەرجەستە ببێ و بەدیار بکەوێت."

لەڕوانگەی دوسـتویفسـکییەوە ئەمـە چـارەی ئاسـیایە ئـەدی چـارەی ئـەوروپا چیە؟ ئەوروپاش ڕزگار دەبیت "ئەوروپا، داڕزیوە، داوەشاوە، کـرم تێیـداوە، ڕەنگـە سبەی بەلادا بێ و بەتەواوەتی هەرەس بێنێ و بێئـەوەی هـیچ شـوێنەوارێکی بــۆ ســەدەکانی ئاینــدە لێبمێنێتــەوە، مــەحوو ببێتــەوە... ئــەدی ئــەڵمانیا: "میللەتێکی مـردووی بـێ ئایندەیـە." "فەرەنسـییەکان، خۆبـەخۆ لـەناو دەچـن، خۆیان، خۆیان لەناو دەبەن..." ئەدی جولەکە "خەڵکانێکی لەخۆبایی قێزەونن". ئینگلیـزان "دوکانـداری ئـەقڵانین." ئـەوروپا، تێکـڕا، گۆڕسـتانیکە کە "جـەنازەی ئـازیزانی تیـا نێـژراوە." هەڵبەتـە مەسـیحی ڕووسـی، ئـەو هـەموو لازارە زۆر و زەبەندەیە زندوو دەکاتەوە. بەڵام یـەوروپا ڕقـی لـە ڕووسـیایە: ئـەوروپا ئامادەیـە هەر هەموو سـلاڤیەکان، وەکـو شـارە مۆرانەیـەک لـە تەختـە خـەوێکی کـۆنی پیرەژنێکیـدا بـێ، لـە ئـاوی گـەرما بکـوڵێنێ و مـەحوویان بکاتـەوە. کەواتـە بـۆ سەپاندنی شادمانییەکی تازە بەسـەر ئـەوروپادا، چـار هـەر ئەوەیـە پـەنا وەبـەر هێز ببرێت. باشـە مەزەبی کاتولیک حاڵی حازر جۆرە یەکێتییـەکی لـە ئـەوروپادا ئیجــاد نــەکردووە؟ نــەخێر، کاتولیــک مەســیحی فەوتانــدووە. دام و دەزگــای پاپاویەت لە ڕۆما، داوای دەوڵەتداری و موڵکداری دنیایی دەکـات و پاشـان دێتـە سـەر ئاین. دیارە ئەمە هەڵوێستێکی نا ئاینییە، دەوڵەتداریە. هەر ئـەم ڕێبازەیـە کە "بەر قەراری دکتاتوریەتی ڕەهای ڕۆمای لێکەوتووەتەوە. دەبێ پاپا سـەرۆک و هەمـەکارەی ئـەم دام و دەزگایـە بیـت." بـەڵام لـە ئەرتـە دوکسـییەتدا بـە پێچەوانەوە، داوای یەکێتی ئاینی هەموو تیرەی بەشـەر لـە سـایەی مەسـیحدا دەکات، پاشـان دێتە سـەر یەکێتی ڕامیاری و جڤاکی کـە خۆبـەخۆ لـەو یەکێتیـە ڕۆحانییەوە دروسـت دەبێـت." بـە نـۆڕینی دوسـتویفسـکی ئـەم دوو قۆناغـە لـە سیسـتەمی کلێسـایی کاتولیکـدا ئـاوەژوو بوونەتـەوە. هەڵبەتـە ئەمـە خـۆی لەخۆیدا بیانوو هەنجـەتێکی بـاش بـوو، کـە لـەو سـەردەمەدا، دوسـتویفسـکی قەڵس و توورە بکات.

بەڵام لەوە غافڵ بوو کـە بانگەوازەکـەی خۆیشـی، واتـە بانگـەوازی مەسـیحی ڕووسـی، لە بانگەوازی کاتولیکەکان، کەبەلای ئەمەوە مـەحکووم بـوو، زیـاتر لـە فەلسـەفەی مەسـیحییەت دووری دەخسـتنەوە. لـەوە غافـڵ بـوو کـە بـەوەی مەسیح لـە قـاڵبی نـەژادو نەتـەوەی ڕووس دەدات، چەنـد پایـەی ئـەو بچـووک دەکاتەوە. دوسـتویفسکی لێرەدا، شـێتاتیەکەی شـاتوف دەکـات بـەهی خـۆی، هەمان بیانوو هەنجەتە بێ بنج و بناوانەکانی کاراکتـەرێکی ڕۆمانـەکانی خـۆی دووبارە دەکاتەوە. بیگومان لە ڕوانگەو دید و نۆڕینی مەسیحەوە، تێکڕای تیـرەی بەشـەر، گەلی هەڵبژاردەیە. بەڵام لەدیـدو نـۆڕینی نووسـەرەوە هـەموو تیـرەی بەشـەر، جگە لە میللەتی ڕووس، گوفتـاری خودایـان فـەرامۆش کـردووە. ئیـدی ئەرکی میللەتی ڕووسـە، کە گوفتارو کەلامی خودا وەبیر بەشــەر بێننـەوە. دنیـا لە ڕووی ڕوحانیەوە، دەبێ پشت بە میللەتی ڕووس ببەسـتن و چاویـان لـەوان بێت کە ئاڵای شکۆو نەمری خودا بەرز ڕابگرن، ئەمە سێیەم دەسـەڵات دەبێـت،

دەسەڵاتی بەرقەراری نەزم و نیزام و دادوەری، لە سایەی پان سلافیزمدا بە ڕابەری ڕووسیا.
بەمجۆرە لە نۆرینی دوستویفسکییەوە، سیاسەت و ئاین ئاوێتەی یەکدی دەبن و دەبنە تەواوکەری یەکدی جۆش و خرۆش و حەماسەت ڕێگەی نادەن، کە ئەم دوو مەسەلەیە، یا ئەم دوولایەنەی مەسەلەکە لێکدی جیا بکاتەوە. ڕاستەوخۆ وبەتوندی هێرش دەکاتە سەر ئەوروپا. بە بابلی تازەی (بابل: شاری گەندەڵی) ناو دەبات، هێرش دەکاتە سەر زانست، سەر دیموکراتیەت، سەر پرەنسیپی ئاشتەوایی و ئاشتیخوازی... لە جۆرە حاڵ و جەزمەیەکی سەیردا دەژی. دەبینێ، پێشبینی دەکات، خەیاڵ هەڵیدەگرێت، بۆ دووری دەبات، بۆ شوێنانێک کە لە سنوورو ئاقاری بیری تایبەتی ئەو دوورترە. خۆ ئەگەر ڕۆمانی شەیتانەکان، هەندێ لایەنی پێشگۆیی پێغەمبەرانەی لەخۆ گرتبێت، ئەوا ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک، بریتیە لە زنجیرە خەیاڵات و پێشگۆییانێک کە تا ئێستا کەمەکێکی زۆر کەمی هاتووەتە دی. پیاو کە ئەو گوتارانە دەخوێنێتەوە کە داوا لە تزاری سپی دەکات قەستەنتەنیە بگرێت، یا باسی ئەرک و پەیامی مەسیحایی میللەتی ڕووس دەکات، پێکەنین دەیگرێت. میللەتی ڕووس ئیدی مەسیحی نییە. شۆڕشی ئوکتۆبەر، زۆر زوو ئەم خاچ پەرستە تازانەی کرد بە کادیرێن مەتریالیزم. ئیدی لە ماوەی چەند مانگێکدا ئەم فاتیحانی ڕوحی ئینسانانە، دامرکانەوەو مەحوو بوونەوە. ئیدی سێیەم دەسەڵات، بوو بە دەسەڵاتی شارە مێرووڵەی ئینسانی.
ڕۆژنامەی ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەریک، تەنیا بڵاوکراوەیەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئاینی نییە. ئەم یاداشتانە، زۆر گوتاری لەخۆ گرتووە، کە دوستویفسکی لەو وتارانەدا هەست و باری سەرنجی خۆی، دەربارەی بۆ نموونە بابەتێکی تاوانکاری، یا سەردانێکی خانەی منداڵانی زۆڵ، یا قەسیدەیەکی نیکراسوف بەپەلە دەرپڕیوەو تۆمار کردووە. دوستویفسکی لەم یاداشتانەدا بیرەوەری منداڵی خۆی دەگێڕێتەوە. باسی ئەو نووسەرانە دەکات کە کاتی خۆی ناسیونی و ئێستا مردوون و ئەویان بە تەنیا بەجێهێشتووە. مەرگ دەگەڵ بیلینسکی و نیکراسوفدا ئاشتی دەکاتەوە. هەندێجار چیرۆک و بابەتی خەمناکیشی لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاودەکردەوە، بۆ نموونە چیرۆکی بوبوک کە بریتیە لە دیالۆگی نێوان مردوان لە گۆڕستانێکدا، یان هەندێ چیرۆکی جوان و سەیری وەکو: "خەون و خەیاڵی پیاوێکی کۆمیدی، یا نازەنین." ئەم پیاوە کۆمیدیە، خەو دەبینێ، لەو خەوەدا، خۆی لە هەسارەیەکی غەریب و سەیر دەبینێتەوەو وای دێتە بەر خەیاڵ کە ئێرە بەهەشتە. سروشتی ئێرە یەجگار دڵگیر و جوانە. خەڵکەکەی، هەموو دڵپاک، ئاسوودە، سادە ئاقڵ و تەبا. ئەم پیاوە غەوارەیە. لێدەبرێت هەر هەموو خەڵکەکە گەندەڵ بکات. فێری خەم و پەژارەیان دەکات، شەرم و شەرمەزاری، تاوان و تاوانکاری و زانستیان فێردەکات، هەنگێ بە هەشتەکە دەگۆڕێ، دەبێت بە دۆزەخ. کاتێ کە "کابرای کۆمیدی" دەیەوێ "فرزەندانی هەتاو" بگێڕێتەوە بۆ دۆخی شاد و ئارامی

جارانیان. خەڵکەکە "بە تەوسەوە پێی پێدەکەنن" و بە "دێوانەیەکی شێتی"لە قەڵەم دەدەن.
بەڵام چیرۆکی: "نازەنین" بریتییە لە چیرۆکی کابرایەکی سووتخۆری بارمتەگیر، ئەمە پیاوێکی مەندو بێدەنگ و دڕو خراپە کە کچێکی شازدەساڵانی خواستووە و، جا بۆ ئەوەی باڵا دەستی مەعنەوی و ئەخلاقی خۆی بنوێنێ، زۆر بەتوندی و سەختگیرانە مامەڵەی لەتەکدا دەکات. ژنەی گۆرین، کە لە ڕەفتاری مێردەکەی وەڕزو بێزار دەبێت، شەوێک بە پێدزکە لەو تەختە خەوە نزیک دەبێتەوە کە مێردەکەی لە سەری نووستووە. دەمانچەیەکی بەدەستەوەیە. مێردەکەی دەیبینێ، بەڵام وا دەنوێنێ کە لە غورابی خەودایە. ژنە لوولەی پیرە دەمانچە دەخاتە سەر لاجانگی مێردەکەی. مێردەکەی جوڵە ناکات، چاوەڕوان دەکات، هەست دەکات، ململانێیەکی دەروونی توند، باڵی بەسەر ژنەکەیدا، کە بە نیازی کوشتنی ئەو بوو، کێشاوە. دەڵێت: "بێگومان دەپرسن، بۆچی هەوڵم نەدا، لە تاوانێکی وا نەنگین و ترسناکی بگێڕمەوە؟ من خۆم سەرگەردان و گومڕا بووم، لەکوێ بتوانم کەسێکی دی لە تاوان بگێڕمەوە؟ ئەنجام پیاوەکە، چاوان دەکاتەوە، ژنەی تاین لەوێندەر نەما بوو، ڕۆیی بوو. هەنگێ پیاوەکە لە دڵی خۆیدا دەڵێت، ئێستا ژنەکەم دەزانێت کە من کەسێکی ترسنۆک نیم و بێگومان بە خوایشتی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ لای من. بەڵام ژنە، ورە بەردەدات و توانای بیرکردنەوەی نامێنێ. ئاهێک هەڵدەکێشێت و دەڵێت: "من وام وێنا دەکرد، دەشێت هەمیشە بەم جۆرە بژین، یانی بەجیا لێکدی بژین." بەڵام کاتێ کە مێردەکەی کە ئەشق و خۆشەویستی خۆی بەتەواوەتی بۆ دەردەبڕێت، نازەنین، دەڕەوێتەوە، پاشەکشە دەکات، چونکە ناتوانێ هەمان ئەشق و خۆشەویستی بۆ مێردەکەی بنوێنێ، ژنە لە بێزاری و ناموراديدا، ئەیکۆنەیەکی حەزرەتی مریەم لە باوەش دەگرێت و لە پەنجەرەی ژوورەکەوە خۆی هەڵدەدێرێت، دوستویفسکی، بەدەم ئەم هاوارەوە کۆتایی بەم چیرۆکە دێنێ: "ئەی چارەنووس، ئەی تەبیعەت، بەدبەختی و نەگبەتی ئینسان ئەمەیە، کە لەسەر ڕووی زەمین تەنیایە. لە ئەفسانانی ڕووسدا، قارەمان هاوار دەکات ئایا لێرەدا تاقە ئینسانێکی زندوو دەست دەکەوێت؟ منیش، کە کە قارەمانی ئەفسانان نیم هەمان هاوار دەکەم و هیچ کەسێک وەڵامم ناداتەوە."
ئەم دوو چیرۆکە، هەڵگری یەک ناوەڕۆک و تیمەن، زادەی یەک بیرۆکەن. لە هەردوو چیرۆکەکەدا "پیاوێکی خەڵکی سان پتروسبۆرگ" نیگەران، تووڕە، لووت بەرز، بەفیز و دەعیە، دەبێتە مایەی شێوانی شادی خۆی و ئەوانەی دەوروبەری خۆی، چونکە ژیانی وەکو خۆی، وەکو چۆن هەیە، بە سادەیی و ئاسانی قەبووڵ نییە، نایەوێ بەسادەیی وخۆشەویستی منداڵێکەوە بژی. ئەمانە ئەو پرەنسیپە ئەخلاقی و مەعنەویە زندووانەن کە دۆستویفسکی لە نووسینەکانیا کاریان لەسەر دەکات و دەیەوێ لە بنج و بناوانیان بکات، بە تانیاندا بچێت وشرۆڤەیان بکات. ئیدی خوێنەرانی بەرهەمەکانی، بەرەبەرە، لە نیازو مەبەست و پرەنسیپەکانی حاڵی دەبن. ژمارەی خوێنەرانی بڵاوکراوەی

ڕۆژانــە یاداشــتەکانی... دەداتــە زیــادی و زۆر لــەوە زۆرتــر دەبــن کــە خــۆی چاوەڕوانی دەکـرد. گۆڤارەکـە، لـە سـاڵی یەکەمـدا دوو هـەزار هاوبـەش پەیـدا دەکـات و نزیکـەی دوو هـەازر کـەسـی بـێ ئابوونمـانیش دەیکـڕن. لـە سـاڵی دووەمدا ژمارەی هاوبەشان دەگاتە سێ هەزار کەس و ژمـارەی کڕیـارانی بـێ ئابوونمان دەگاتە چـوار هـەزار کـەس. هەنـدی ژمـارە چـاپی دووەم و تـا چـاپی پێنجەم دەکرایـەوە. ئیـدی ژمـارە لـەدوای ژمـارە، سـەنگ و ئیحتوبـارو نێوبـانگی دوستویفسکی پتر دەردەکەوت و لەنێو گەنجانی ڕۆشـنبیردا حیسـابی گـەورەی بـۆ دەکـراو وەکـو پێغەمبـەر و جـەڕاحی ڕوحـان تەمەشـا دەکـرا. هـەموو ڕۆژێـک پۆستەیەکی بۆ دەهات پڕ لە نهێنـی تایبـەتی و ڕاسـتگۆیانە، پـڕ لـە بـەرخوردی عــاتیفی نێــوان خــەڵکی، تــەژی گومــان و دوودڵــی مــەزەبی، ســەدو یــەک کارەساتی نەنگین و شەرماوەر، پڕ لە نیگەرانی و نائومێدی و نامرادی.
دەنووسێت: "سـەدان نامەم لەهەر چوارنکـالی ڕووسـیاوە پێگـەییوە و زۆر شـت لەم نامانەوە فێر بووم کە تا ئێسـتا نەمـدەزانین. ئەمـە جگـە لـەوەی کـە جـاران هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کە لە کۆمەڵگەی ئێمـەدا ئـەمجۆرە خەڵکـە هـەبن، خەڵکانێک کە بەم ڕادەیە هاو ڕەئی و هاوبیری من بن."
دوستویفسکی، هەرچەندە کاتی زۆر کەم بوو، وەڵامی هەموو ئەو نامانەی دەدایەوە کە بۆی دەهات. هەموو ئەو داوایانەی جێبەجێ دەکرد کە خوێنەران داوایان لێدەکرد. ئەگەر کچۆڵەیەک نامەی بۆ نووسیبا کە دەزگیزانەکەی خۆشناوێ و حەزدەکات درێژە بە خوێندن بدات. یەکسەر وەڵامی کیژێی دەدایەوە کە دڵنیا بیت، پیاوێکی دەستڕۆ پارێزگاری لێدەکات: "تۆ بەو ئارەزوو ئاواتانەوە کە هەتە، مەحاڵە بتوانی شوو بە بابایەکی بازرگان بکەیت... نەکەی ژیانی خۆت بە خەسار بدەیت.. ئەگەر خۆشت ناوێ، نەکەی مێردی پێبکەیت. ئەگەر خۆت حەز دەکەی جوابم لێبگێڕەوە.."
لە وەڵامی نامەی ئافرەتێکی دیکەدا دەڵێت: "نابی بەبێ خۆشەویستی شوو بکەیت. بەڵام باش بیربکەوە، لە گینە ئەم پیاوە، لەو پیاوانە بێ کە بشێت دوایی خۆشت بوێ. ئامۆژگاری من ئەمەیە: داوا لە دایکت بکە، دەرفەتێکت بدات تا بیربکەیتەوە (بەڵام هیچ بەڵێنێکی مەدەیە) ئیدی ئەم پیاوە باش هەڵبسەنگێنە، هەوڵبدە زانیاری دروستت دەربارەی دەستبکەوێ."
کچێکی خوێندکاری زانکۆ، سکاڵای بۆ دەکات کە لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچووە، ئەویش یەکسەر دڵخۆشی دەردی دەداتەوە: "زۆر بەداخەوەم کە لەوانەی جوگرافیادا دەرنەچوویت، بەڵام زۆریش گوێی مەدەیە. ئەو هەموو خەمەی ناوێ. شت بەخەم پێکنایەت. نامەکەت زۆر خەمناک بوو.."
نامەی پیرۆزبایی بۆ کیژێکی گەنج دەنێرێت کە وەکو ڕەبەنیتەیەکی (ڕاهبە)خۆبەخش بۆ کاری خێرو چاکە بۆ سیبریا دەڕوات.
هەروەها، هاوبەشی خۆشی و شادی دایکێکی گەنج دەکات و دەڵێت: "بەڕاستی مایەی خۆشییە تۆ دایکی منداڵانیت! منداڵ شەقڵی مرۆڤانی بە ژیانی ئیمەمانان دەبەخشێت. هەڵبەتە پەروەردەکردنی منداڵ ئەرک و بارێکی قورسە. بەڵام بارێکی زەروریە و چاوپۆشی لێناکرێت." لە وەڵامی نامەی

جولەکەیەکدا دەڵێت: "ئێستا پێت دەڵێم کە من دژمنی قەومی جوولەکەنیم و هەرگیز نەبووم،بەڵام چل سەدەی بوونی ئەوان، وەکو تۆ دەڵێیت، ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم قەومە ژیان و ژینێکی نائاسایی هەیەو بەدرێژایی هەموو مێژووی خۆی، ناچار بووە، خۆی بەشێوەی جیاواز بنوێنێ و خۆی دەگەڵ واقیعدا بسازێنێ."

هەروەها پەیامێکی هاوسۆزی دوورو درێژ بۆ خوێندکارانی زانستگەی مۆسکۆ دەنێرێت: "بەڕێزینە، ئێوە لەمن دەپرسن ئێمەی خوێندکار تا چ ڕادەیەک کەمتەرخەم و تاوانبارین؟ وەڵامی من ئەمەیە، ئێوە لە هیچ ڕوویەکەوە کەمتەرخەم نین. بەڵام ئێوە ڕۆڵەی میللەتێکن، کە بریتیە لە زنجیرەیەک درۆ و، خۆتانی لێ دەبوێرن. بەڵام ئەوە بزانن بەم دوورکەوتنەوەو داپرانە لە کۆمەڵگە، خزمەتی میللەت ناکەن، بەڵکو پشت لە میلەت دەکەن و ڕوو لە بێگانە دەکەن، بەرەو ئەوروپاگەرێتی دەڕۆن، لەکاتێکا ڕزگاری و سەلامەتی و ئاساپشی ئێمە بە میللەتەوەیە، بەوەوەیە کە ڕوو لە میللەت بین."

هەڵبەتە توانای تازەی دوستویفسکی تەنیا لە زۆری نامەو نامەکارییەکانیدا دەرنەدەکوت. بازنەی پەیوەندییە جفاکی و کۆمەڵایەتیەکانی زۆر بەرین و فراوان دەبێت، بۆ هەموو شوێنێک دەعوەت و بانگهیشت دەکراو ئەویش بە دەنگ زۆربەی ئەو دەعوەت و دەعوەتکاریانەوە دەچوو. بەڵام ژنەکەی کە زۆر بەکاری ئیداری و ژمێریارییەوە شەکەت و ماندوو بوو و بڵاوکراوەکەی بۆ هەموو شوێنێک دەنارد، بۆ هیچ یەکێک لەو دەعوەتانە نەدەچوو. ئەم ژنە هەرچەندە هێشتا گەنج بوو، بەڵام لەم ساڵانەدا، بەتەواوەتی دابوویەوە کەندێ و بە دەگمەن بەخۆی ڕادەگەیی و دەستی بەخۆیدا دێنا. بەخۆی ئیعتراف دەکات کە تەنیا لەباری ڕوحییەوە بەمێردەکەی ڕادەگەیی و خۆشحاڵی دەکرد. بەخۆی ڕانەدەگەیی، خۆی نەدەڕازاندەوە، جلی جوانی لەبەر نەدەکرد، جلەکانی ژێرییەوە ئەستوور و زبربوون، فیدور، بێهودە هەوڵیدەدا زەوقی خۆ ئارایشدانی بۆ بگێڕێتەوە: "دەزانی ئانیت، فلان خانم، کراسێکی یەجگار جوانی لەبەر بوو، دوورینەکەی زۆر سادە بوو، کراسەکە بەجۆرێ بەلای ڕاستدا، داکشا بوو، خەریک بوو لە ئەرزی دەخشا، بەڵام نەدەگەییە سەر ئەرزەکە. ئا وابزانم لای چەپی کراسەکە هەندێک بەرزبوو بووەوە، بۆچی کراسێکی وا بۆ خۆت ناکەیت، هەنگێ دەبینی چەندت لێدێت!" هەروەها دەڵێت: "تۆ نازانی چاوەکانت چەند جوانن، زەردەخەنەکەت، جم و جوڵت بەدەم قسانەوە، یەجگار دڵگیرە. هەڵەی تۆ ئەمەیە کە وەکو پێویست تێکەڵاوی خەڵکی ناکەیت. ئەگەر بۆچوونە دەرەوە کەمێک دەست بەخۆتا بێنی و جلی جوان لەبەر بکەیت، خۆت سەرت لە خۆت سوردەمێنێ، کە چەند گەنج و خشکۆکیت!"

بەڵام ئانێت لە مەبەستی تێنەدەگەیی. بەجۆرێ بە کتێبەکانی مێردەکەیەوە ئالکابوو، نەیدەپەرژایە سەر هیچی دی. ئانێت، ئەو مرونەت و توانایەی دوستویفسکی نەبوو کە بتوانێت بەڵانسی نێوان دنیای واقیعی و دنیای خەیاڵات و میتافیزیکی ڕابگرێت و قوربانی بە هیچیان نەدات.

دوستویفسکی وەکو جاران لە کۆڕو کۆبوونەوەو دیوەخانەکاندا ئامادە دەبوو. هەندێجار ئارامە و گوێ لە قسەی خەڵکی دەگرێت، هەندێجار تووڕە و تڕۆیەو شەڕ بە سێبەری خۆی دەفرۆشێت و هەندێجار ڕەفتاری باوکانەیە.
مەدام شتاکن شنایدر، لەبارەیەوە دەنووسێت و دەڵێت: "من هەمیشە بە بێفیزی و بێهەواییە زۆرەکەی سەرسام بووم. هێندە،خاکی و بێفیز بوو، وام وێنا دەکرد کە بایەخی ڕاستەقینەی خۆی نازانێت. هەڵبەتە ئەم حاڵەتە نیشانەی هەستیاریە نائاساییەکەشی بوو. یا بەگوتەیەکی دی هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بوو کە هێرشی بکەنە سەر. هەندێ قسەی لەدڵ دەگرت و بەسووکایەتی دەزانی، کە هیچ کەسێکی متمانە بەخۆ، ئەوەی نەدەکرد. ناو بەناویش،وەکو ئەوەی ڕقێک لە سینگیدا پەنگی خواردبێتەوە، دەیویست خۆی لێ ڕزگار بکات. بەڵام من هەمیشە بە بچووکترین جولەی لێوی یا کەمترین سورانی نابەجێی چاوەکانی، بۆم دەردەکەوت کە دەیەوێت قسەیەکی توند بکات. هەندێجار تووڕەییەکەی خۆی دەخواردەوە و دەیتوانی بەسەرخۆیدا زاڵ بێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا بێدەنگ دەبوو و مجێزی دەترشا."
لەڕاستیدا، بلیمەتی دوستویفسکی کردبوویە کارێک کە جاوپۆشی لە ڕەفتارە نابەجێ و مجێزە نەخۆشەکەی بکەن. ئیدی خەڵکەکەو خوێنەرانی، نەک لەم بەدمجێزی و ڕەفتارە ناپەسندانەی زویر نەدەبوون، بەڵکو خزمەتیان دەکرد و لێشی نزیکتر دەبوونەوە.
بەمجۆرە لەساڵی ١٨٧٨دا، کۆنە زندانییەکەی تاراوگەکانی جارانی سیبریا، ئەم نامەیەی لەلایەن کۆڕی زانیاری ئیمپراتۆرییەوە بۆ دێت: "کۆڕی زانیاری، حەز دەکات وەکو ڕێز و تەقدیر بۆ بەرهەمە ئەدەبییەکانت، ئەوەت پێڕابگەیەنێت کە بەشانازییەوە بۆ ئەندامی کۆڕی زانیاری بەشی زمان و ئەدەبی ڕووسی هەڵی بژاردویت." پاشان لەلەو پەروەردەکەری هەردوو دۆقی مەزن، "سیرج و پول" دێت و بەناوی تزارەوە داوای لێدەکات کە دیدار و گفتوگۆیەک دەگەڵ ئەم جووتە قوتابییە پایە بەرزەی ئەودا بکات.
بەمجۆرە دوستویفسکی لە ژیانیا، تامی شانازی و ڕێز و قەدر دەچەژێت. دەتوانێت زۆربەی قەرزەکانی بداتەوە لەڕێگەی ژن براکەیەوە خانوویەکی هاوینە لە ستارایاڕوسا بکڕێت. ئیدی "ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک" بووە مایەی ئەوەی شۆرەت و کۆمەڵێک پەیوەندی باشی بۆ دروست بکات و دەرامەتێکی باشی بۆ دابین بکات، لەوەی زیاتر چی گەرەک بوو؟
ئیمی دوستویفسکی، لە یاداشتەکانی خۆیدا، وێنەیەکی جوانی ئەم قۆناغەی بابیمان بۆ وەسف دەکات: دوستویفسکی لە ژووری کارەکەی خۆی، لەسەر قەنەفەیەکی گەورە دەنووست، لەبەرانبەر ئەم قەنەفەیەدا، کۆپی تابلۆی "مارون دوسانت سیکست"ی بەرهەمی ڕافائیل بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، کە لەخەو هەڵدەستا، ڕێک نیگای لەسەر ئەم سیماو ڕوخسارە جوانە دەگیرسایەوە. هەڵدەستا، دەموچاوی دەشت "ئاو و سابوون و قوڵەنیایەکی زۆری مەسرەف دەکرد" پاشان بەتەواوەتی، سەراپا خۆی دەگۆڕی، چونکە لەبەر کردنی ڕۆب و نەعلی بۆ پیاو بەپەسەند نەدەزانی.

ئیدی "لە بەیانی زووەوە خۆی دەگۆڕی، پێڵاوی لەپی دەکرد، بوینباخی دەبەست و کراسێکی سپی جوانی یەخە سفتی لەبەر دەکرد" زۆری بایەخ بە پاڵتۆکانی دەدا، پاک و خاوێن ڕایدەگرتن. دەیگوت: "زۆر ڕقم لە پەڵەیە، پەڵە قەڵسم دەکات، ئەگەر پەڵەیەک بە جلەکانمەوە بێت، ناتوانم کار بکەم."فیدور میخائیلوفیچ، کە لە خۆگۆڕین دەبووەوە، ئیدی دەچوو بۆ هۆڵی نانخواردن. دوو پەرداخ چای دەخواردەوە، پەرداخی سێیەمی بۆ ژووری کارەکەی دەبرد. مێزی کارکردنەکەی زۆر بە تەرتیب بوو، شتەکانی سەری، وەکو چۆن ئەوزار و ئامێری نەشتەرگەری لە ژووری نەشتەرگەریدا بە ڕیز دادەنرێت، بەو ئاوایە بە دیقەت دانرا بوو: پاکەتی جگەرە، نامەکان، کتێبەکان، ڕۆژنامەکان، هەر یەکەو لە شوێنی تایبەتی خۆ دانرا بوون، ئاناگریگوریفنا، دەهات بۆ ژووری کاری، مێردەکەی، لە بەرانبەری دادەنیشت، دەفتەر، قەڵەم، لاستیکەکانی لەسەر تەپڵەکێکی خڕ دادەنا. دوستویفسکی ئەو لاپەڕانەی کە بەدرێژایی شەو نووسی بوونی، بۆ دەخویندنەوەو ئاناش یەکسەر توندنووسی دەکرد و پاشان کۆپی دەکرد و فیدور کوپیەکانی هەڵەچن و ڕاست دەکردەوە.
ئەوجا نۆرەی فراڤین دەهات، دوای فراڤین، چوونە گەشت و گەڕان. کڕینی شیرینی بۆ منداڵەکان، ئەوسا نۆرەی شێو دەهات و پاشتر دوستویفسکی دەچووەوە بۆ خەڵوەتخانەکەی خۆی و دەستی بەکار دەکرد. ئەم ژیانە ڕێک و پێک و بەرنامەدارە، بە بەرهەمەی پێخۆش بوو. هێندە خۆشحاڵ بوو، تەسەوری نەدەکرد هیچ شتێک بتوانێت، ئەم خۆشی و شادیەی لێ بشێوێنێ، بەڵام لەوە دەچوو، دوستویفسکی لە چارەی نووسرابێ کە قەدەر تا کۆتایی ژیان هەر دژایەتی بکات.
لە ١٨٧٨/٥/١٦دا، ئەلیوشای کوڕی کە تەمەنی نەگەیی بووە سێ ساڵ، تووشی نۆرە فێیەکی زۆر توند بوو، سێ سەعات و دە دەقیقەی خایاندو، منداڵەکە بێئەوەی وەخۆبێتەوە، تاساو مرد.. مردنی ئەم منداڵە، دوستویفسکی زۆر خەمبار کرد. خۆی بە خەتابارو کەمتەرخەم دەزانی، چونکە منداڵەکە تووشی نەخۆشییەکی بۆماوەیی بوو بوو. ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە، کردیە کارێک زۆر بەڕوونی هەست بەوە بکات کە تاک چەند بەرانبەر بە خەڵکانی دی بەرپرسە و بێتاوانی قسەی هیچ و نابەجێیە: "هەر یەکێک لە ئێمە بەرانبەر بەخەڵکانی دی کەمتەرخەمین، لەبەرانبەر هەموو کەس و هەموو شتێکدا، کەمتەرخەمین، بەرپرسین."
ڕۆژی ناشتنەکەی ئەلیوشا، ئەندامانی خێزانەکە، سواری عەرەبانەیەکی گەورە دەبن، تابووتێکی چکۆلە لە بەینی دایک و باوکیا دادەنەن. ئیمی دوستویفسکی لەو بارەیەوە، دەنووسێت: "لەڕێگادا، زۆر گریاین، تابووتە چکۆلە سپیەکەمان نەوازش کرد، لە گوڵا غەرقمان کرد، هەموو وتەکانی منداڵەکەمان دووبارە کردەوە. ئەو کاتانە گیا لەبەینی گۆڕەکاندا ڕوا بوو، درەختان شکۆفەیان کردبوو، تەیروتو بەسەر سەرچڵانەوە دەیانخوێند، ئەسر بە گۆناکانی بابمدا دەهاتە خوارێ. لەهەمان کاتدا ژنەکەی گرتبوو کە هۆن هۆن دەگریا، هەرچی دەکرد نەیدەتوانی چاو لەو سەندووقە چکۆلەیە بگوازێتەوە کە

بەرە بەرە دەکەوتە ژێر گڵەکەوەو ون دەبوو." دوستوپفسکی بەسەر ئەم دوا مەینەتەشدا، وەکو هەموو مەینەتیەکانی دیکەی، زاڵ دەبێت. بەهۆی کارەوە سوکنایی دێت و هێور دەبێتەوە. بەهۆی نووسینی ڕۆمانی برایانی کارامازوفەوە، خۆی و خانەوادەکەی ڕزگار دەکات.

## فەسڵی سێیەم
## لەدایکبوونی برایانی مازوف

دوستویفسکی لە ژمارەی کانوونی یەکەمی ١٨٧٧ی بڵاوکراوەی "ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێکدا" خوێنەرانی خۆی ئاگادر دەکاتەوە کە بڕیاری داوە "لەبەرخاتری کارێکی هونەری، کە خۆبەخۆ و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لە فاسیلەی ئەم دوو ساڵەی دەرچوونی بڵاوکراوەی ڕۆژانە یاداشتەکانی... کە لە مێشک و زەینی دا گەڵاڵە بووە" بۆ ماوەیەک بڵاوکراوەی ناوبراو ڕابگرێت." ئەم کتێبە تازەیەی کە لە لێرەدا ئاماژەی بۆ دەکات، وەکو ڕۆمانی "هەرزەکار" ئەڵقەیەک دەبێت لەو کارە گەورەیەی کە تەواوی نەکرد بوو و ناونیشانی: "ژیاننامەی گوناحکارێکی گەورە"لێنابوو. قەرار بوو لەم ڕۆمانەدا باسی خودا بکات و ئەو مەسەلەیە تاوتوێ بکات: "ئەم مەسەلەیەی کە بەدرێژایی ژیانم، لە ئاگایی و نائاگاییدا، عەزابی داوم و پێوەی تلاومەتەوە."

فیدور میخائیلوفیچ، هەست دەکات کە هێشتا کارە ئەدەبییەکانی تەواو نەبوون و هێشتا دوا ئیعترافی نەکردووە و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دەستی پیبکات کە بێگومان دوا قسەی ئەو دەبێت. ئیدی خۆی بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوەی ئەم مەترسییەئامادە دەکات. ئیدی کونجی قەناعەت دەگرێت، یاداشتان کۆدەکاتەوە کەرەستەو بابەت کۆدەکاتەوە، ئیدی تا ئەمانە دەکات سێ ساڵی پێدەچێت. لە ١٨٧٨/٣/١٦دا، لەو بارەیەوە دەنووسێت: "تەسەوری تەواوم دەربارەی ڕۆمانەکە لا پەیدا بووە. دەست بە نووسینی ڕۆمانێکی گەورە دەکەم. کە لە نێو قارەمانەکانیدا، ژمارەیەکی زۆر منداڵی تێدا دەبێت."

ئیدی بەم وشەو دەستەواژانە، یاداشتەکانی خۆی دەربارەی برایانی کارامازوف دەکاتەوە: "مەسەلە ئەمەیە چۆن بزانیت، ئایا دەتوانرێ کاتێ کە ڤیتارێک بەوپەڕی خێرایی بە سەرتاتێدەپەڕێ، تۆ لەنێوان دوو ڕێڵەکەدا پاڵکەوتبی.." یا "بزانی منداڵ چۆن لە کارگەدا کاردەکات، مەسەلەی قوتابخانە، چوون بۆ قوتابخانەیەک – سەردانی بنکەو سەنتەرێکی منداڵانی دۆزراوە."

ئیدی لەم کەین و بەینەدا، دوستویفسکی ناسیاوی و ئاشنایەتی دەگەڵ گەنجێکی خوێنەوار و ڕۆشنبیردا بەنێوی فلادیمیر سولوڤیڤ (کوڕی دیرۆکنووسە بەناوبانگەکەی ڕووسیا) پەیدا دەکات. دوستویفسکی، لەسان پتروسبۆرگ، دەچێتە موحازەرەکانی ئەم مامۆستا گەنجەو گوێی لێدەگرێت و بۆی دەردەکەوێت کە لەمەسەلە مەعنەوییەکاندا، نزیکایەتیەکی بێ چەند و چوونیان لەنێواندا هەیە. ئەدی سولوفیڤ، بابەتی قەیرانی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی، بۆ تێزەکەی خۆی هەڵنەبژارد بوو؟ ئەدی ئەو، زۆر بەتوندی ڕەخنەی لە فەلسەفەی وەزعی کۆنی ئەوروپایی ناگرێت؟ هەر ئەو نییە کە داوای فەلسەفە و ڕێبازێکی تازەی میتافیزیکی دەکات؟ ئەمە جگە لەوەی کە جدیەتی بابەتەکە بە سیمای ئەم گەنجەوە هاوار دەکات. قۆزی و جوانی سەروسیمای، قەناعەت بەسەر سەختترین نەیارانی دەکات. دوستویفسکی، قەناعەتی تەواوی هەیە، کە "سەری ئەو، تەواو لەسەری گەنجانەی مەسیح دەچێت." بەتایبەتی لەو تابلۆیەدا کە نیگارکێشی بەناوبانگی ئیتالی، ئانیبال کاراکچی،* کێشاویەتی. (ئانیبال کاراکچی: خانەوادەی کاراکچی کە لەئاخرو ئۆخری سەدەی شازدەیەمدا لە ئیتالیا دەژیان، هەموو هەر نیگارکێش بوون. ئانیبال، گەنجترین و بەنێوبانگترین سەرۆکی ئەکادیمیای پولونی بووە. لە ساڵی ١٥٦٠دا لە پۆلۆنیا لەدایک بووە و لەساڵی ١٦٠٩دا لە ڕۆما مردووە.) زۆری پێناچێت کە دۆستایەتیەکی خۆش لەنێوان فەیلەسوفی گەنج و نووسەری پیردا چێدەبێت. بەڵام لەم پێوەندییەدا، وا دەردەکەوێت، کە ئەم پیرە نووسەرە دەوری شاگردو قوتابی ببینێ.

هەڵبەتە، دۆستویفسکی بەهۆی گەنگەشەو مشت و مڕی فراوانییەوە دەگەڵ سولوڤیڤدا، دەتوانێ بیرو بۆچوونە تایبەتیەکانی خۆی فرمۆلەبەندی بکات و بەشێوەیەکی ڕوون، دەریان ببڕێت. هاوڕێ گەنجەکەی یارمەتی دەداو، بە زمانی سادەو ڕوون، ماناو چەمک و زاراوە فەلسەفییەکانی، کە دەمێ ساڵ بوو، پێیانەوە گیرۆدە بوو بوو، بۆ شەرح و شرۆڤە و ڕوون دەکردەوە.

دوستویفسکی، سەبارەت بەو ئیشکالیەتانەی لە واری فەلسەفەی ئاینی ئەرتەدۆکسییەوە هەی بوو، پەنا دەباتە بەر کەشیشێکی دێری سنت سینود، بەناوی کونستانتین پوبیەدونوستزیف. بەڵام سوود لە تیۆری کاری هاوبەشی "فیدوروف"ش وەردەگرێت. دەقە توباویەکانی مەرحوم "تیخون زادنسکی"ش کە قەشە باشیەکی سەدەی هەژدەیەم بوو، دەخوێنێتەوە. لە ساڵی ١٨٧٠دا، نامەیەک بۆ مایکوف دەنووسێت و دەڵێت: "دەمەوێ، شا قارەمانی ڕۆمانە تازەکەم، لە سەروسیمای تیخون زادونسکییەوە هەڵێنجم."

ئانای هاوسەری دوستویفسکی، دوای مردنی ئەلیکسی کورە چکۆلەیان، پێشنیاز بۆ مێردەکەی دەکات کە هاوڕێ دەگەڵ سولوڤیڤدا بڕوات بۆ ئوپتینا پوستین. بە ئومێدی ئەوە بوو کە ئەم سەفەر و جێگۆڕکێیە، کەمێک سێبوری دڵەی خەمناک و تازیەباری دوستویفسکی بدات، بە تایبەتی کە دوستویفسکی دەمێ بوو، حەزی دەکرد ئەم دێرە بدینێ. کاتی خۆی "گوگول، لیونتییف و تولستوی"ش پەنایان وەبەر ئەم دێرە بردبوو.

دوستویفسکی بە گوێی ژنەکەی دەکات و مل بۆ ئەو سەفەرە دەدات. ئیدی جووتە هاوڕێ، ماوەیەکی کەم لە مۆسکۆ دەمێننەوە و بە قیتار دەڕۆن بۆ "سیرگییفو"و لەوێندەرە تا دێرەکە کە ڕێگایەکی بەردەڵان و ناخۆش و ناهەموار و نزیکەی سەدو بیست کیلۆمەتر دەبێت، بە هەڵتەک هەڵتەکی گالیسکە دەڕۆن. دوای دوو ڕۆژ دەگەنە دێرەکە. کەشیشان و ڕەبەنانی ناوچەکە پێشوازییەکی گەرم و گوریان لێدەکەن. ئیدی ڕابەری ڕۆحی دێرەکە قاییل دەبێت دوو گفتوگۆی تایبەتی دەگەڵ دوستویفسکیدا بکات، ئیدی ئەمە کاری لە ڕوح و ناخی دوستویفسکی کرد و بووە ئیلهامبەخش و سیما و وێنەیەکی زۆر شایستەی "بابا زوسیم"ی لە هزر و زەینی دوستویفسکیدا چێکرد کە یەکێکە لە کاراکتەرە هەرە سەنگین و بەڕێزەکانی ڕۆمانی برایانی کارامازوف.

جێی خۆیەتی ئەوەش بیر بخەینەوە کە دوستویفسکی لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٧٧دا، واتە ساڵێک پێش سەفەرەکەی بۆ دێری "ئوبتینا پوستین" سەفەرێکی "دارڤوی" زاگەی خۆی و مەڵبەندی منداڵییەتی کرد، جارێکی دی لێرەوارەکە و دۆڵەکە و ماڵەکانی گوندە چکۆلەکەی چرماچنی بینی بوو. ئیدی گفتوگۆیەکی زۆری دەگەڵ ئەو پیرەمێردە چەپەڵ و ڕەنگ و ڕوو سسیەڵە و چرچەڵانەدا کرد بوو، کە جاران هەموو کوڕ و گەنجی بە ڕەنگ و ڕوو، کۆڵمە ئاڵ و، قژ زەردی نەرمی وەکو ئاوریشم بوون و قاقای پێکەنینیان سەعاتە ڕێیەک دەڕۆیی. ئیدی جوانترین یادگارییەکانی خۆی بیرکەوتبوونەوە، و تەواو بوژابووەوە و تەنانەت چوو بووە سەر هەمان کانی و سەرچاوە، ئاوی خواردبووەوەو، نەفەسی تازە کردبووەوە. نووسینی ڕۆمانی برایانی کارامازوف، سێ دانە ساڵان دەخایەنێت، پتر لە هەموو کارەکانی دیکەی نووسەر کار و کۆششی دەوێت، دوستویفسکی کە دەیەوێ ئەم ڕۆمانە ببێت بە شاکار و تاجی سەری هەموو بەرهەمەکانی دیکەی، هەوڵدەدات بێ عەیب دەربچێت. زۆر دەترسا. تەمەن و پیری توانا و بەهرەی فیلیڤانی سست کرد بێت و نەخۆشی، زەینی تەواو کز کردبێت. زۆر دەترسا، پێش ئەوەی بتوانێت، هەرچی لەدڵدایە، بیڵێ، مەرگی بێ بەزەیی بگاتە سەری و ئامانی نەدات. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "ماوەیەکی زۆرە، هەستدەکەم تا زیاتر دەچمە تەمەنەوە، کارم بەلاوە قورستر و دژوارتر دەبێت." بۆ ژنەکەی دەنووسێت: "من هەمیشە بیر لە مردنی خۆم دەکەمەوە، لەخۆ دەپرسم چی بۆ تۆ و بۆ منداڵەکان لەپاش خۆ بەجێ دەهێڵم." هەروەها دەڵێت: "من حاڵی حازر باری ماڵباتی کارامازوفم داوە بە کۆڵدا، کە دەبێ بەباشی بیگەیەنمە مەزڵ. زۆر زەروریە بیکەم بەکارێکی هونەری. ئەمە کارێکی زۆر قورسە، مەترسیدارە، غیرەتێکی دەوێ. ئەم ڕۆمانە دەبێ ناوی من بەرز بکاتەوە، بیچەسپێنێ، هەموو هیوا و ئومێدێکم هاتووەتە سەر ئەم ڕۆمانە، دەنا..."

## فەسڵی چوارەم
## برایانی کارامازوف

خانـەوادەی کارامـازوف، لـە شـارۆچکەیەکی چکۆلـەدا دەژیـن. کارامـازوف، پیرەمێردیکـی بودەڵـەی هـیچ و پـوچ و داوێـن پـیس و لێبـۆک سـیفەتە. هـەموو ژیـانی خـۆی لـە کـاری هـەرزەیی و فسـق و فوجـوور و داوێـن پیسـیدا وێـران کردووە. لە ژنـی یەکـەمی، کـە ئـەم ژنـە هـەموو جـار بـەدار تێـی بـەردەبوو بـە ئارەزووی خۆی دارکـاری دەکـرد، کـوڕێکی هەیـە بـەناوی دیمیتـری. ئـەم کـوڕە گەنجێکی، بێ ئەقڵ و چەتوونە، جارجار کەڵکەڵەی چاکە و پیاوەتی بە مێشـکا دێت. قسەی زل دەکات و لە مەسەلە میتافیزیکیەکاندا، خاوەن دیدو بۆچـوونی تایبەتیە. لە ژنی دووەمی کە ژنێکی سەڵیتەی زماندرێژی بێحـەیای پڕ خوتـە و بۆڵە بوو، کوڕێکی هەیە بـەناوی ئیڤـان. ئـەم کـوڕە، کـوڕێکی ڕۆشـنبیرە، بـەڵام توورە و تڕۆ، ئاشوبگەرا و وێرانکەر، لە هەمان کاتدا قارەمان و شەهیدی ڕێگـای سەلبیات گـۆیی و نکولیکاریـە. کـوڕێکی دیکەشـی هەیـە بـەناوی ئەلیکسـی، (نازناوەکـەی ئەلیوشـایە) لـەوە دەچـێ ئـەم کـوڕە، لـە نـەفرین و نەگبـەتی بۆمـاوەیی خانـەوادەیی کارامـازوف خەلەسـی بێـت. ئالیوشـا، ئامـادەگی هـەر جۆرە خێر و چاکەیەکی تێدایە، کە شایستەی پیاوی مەردانە بێت، خێر و چاکـە و پیاوەتی ئەلیوشا، جیاوازە لە چاکەی "نێرەمـوک ئاسـا"ی گـەمژە. ئـەلیوشـا، هەوێنـە هـەرە ئەرێنییەکـەی ڕۆمانەکەیـە، ئـەو کاراکتـەرە درەخشـانەیە، کـە هەموو کاراکتەرەکانی دیکە وەکو مێش بـە دەوریـدا دەسـوڕێنەوە. بـەڵام لـەپاڵ ئەم سێ برایەدا، دەبێ ناوی سەمردیاکوفی خوێڕی و بودەڵـەش ببـرێ. ئەمـە

کوڕی ناشەرعی کارامازوفە، کە شەوێک، شەوێکی تاریک دەست درێژی دەکاتە سەر کچێکی کەڕولاڵ و گێلۆکە و بە خورتی فەساتی دەکات، ئەم سەمردیاکوفە، زادەی ئەو حاڵەتەیە. ئەم کورە حەرامزادە پەرکەمدارە، لە ماڵی بابی خۆیدا وەکو خزمەتکار کار دەکات، کوڕێکی هێمن و لەسەرخۆ، فشەکەر و لەخۆبایی، فێڵباز و حیلەکەرە. ئەمە دڵبەندی ئیڤانی برایەتی و ستایشی دەکات. بەڵام ئیڤان حەزی لێناکات، چونکە کە وێنەی کاریکاتوری خۆی لەودا دەبینێتەوە، بێزار و قەڵس دەبێت.
ژنێک لەنێو ئەم باوک و چوار کوڕەدا هەیە بەنێوی گروشینکا، ئیدی هەموو لەسەر ئەم ژنە شەڕیانە، هەریەکەیان بە جۆرێ هەوڵی بۆ دەدات و دەیەوێ خۆی بگەیەنێتێ.
سەمردیاکوف، بەو خەیاڵەی کە ئارەزوویەکی دەروونی و پەنهانی ئیڤان وەدی دێنێ هەڵدەستێت کارامازوفی پیر دەکوژێت. بەڵام ئەم تاوانە (تاوانی کوشتنی باب) بە ملی دیمیتریدا دێت، حوکم دەدرێت و بەرەو تاراوگەی سیبریا ڤڕێدەکرێت. ئەمە چوارچێوەی گشتی چیرۆکەکەیە. دووبیر بەسەر سەرانسەری چیرۆکەکەدا زاڵە، مەسەلەی ژن و مەسەلەی خودا: گروشینکا و مەسیح. کاراکتەرە جۆراو جۆرەکانی ڕۆمانەکە لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا دێن و دەچن. هەندێکیان، وەکو کارامازوفی پیر،بە داوێن تەڕی و سێکسبازی و ڕابواردن و لەزەتی جەستەیی ناسراون و هەندێکیان وەکو زوسیمی خواناس، بە دینداری ناسراون. ئیدی لەنێوان ئەم دوو جەمسەرە هەڤدژەدا، بەرە بەرە ڕوحی کاراکتەرەکانی دیمان پیشان دەدرێ. دیمیتری، سەمردیاکوف، ئیڤان و ئەلیوشا، تێکڕا، دەکەونە قۆناغەکانی گۆڕانی یەک کەس. کەسێک کە بەرە بەرە لەباری ڕوحی و دەروونیەوە پاکدەبێتەوە، لە حەیوانیەت دەرباز دەبێت و گەشە دەکات و لە قاڵبی "ئینسانێکی تازەدا" دەردەکەوێت. یانی ئەم چوار برایە، هەموویان یەک کەسن و بەرە بەرە گۆڕاون. لە ڕاستیدا پۆلێنکردنی ئەمانە لە فەزادا، جگە لە پۆلێنکردنی زەمانی هیچی دیکە نییە. ئەلیوشا بە دیمیتری دەڵێت: "پەیژە و پێوەری عەیب و کێماسیان بۆ هەمووان، هەمان پێوەرە، وای دابنێ من لەسەر پلەی یەکەمم و تۆ بەرزتری، لەسەر پلەی سیازدەیەمی. بە مەزەندەی من ئەمە هەمان شتە و هیچ فەرقێکی نییە."
ژنێکیش لەسەر پلەی سیازدەیەمدا هەیە: گروشینکا، ئەم ژنە دەخزمەتی بازرگانێکی پیردایە کە ئەوی لە بەداری و بێنەوایی ڕزگارکردووە. یەکێک لە خزمەکانی ئەم ژنە، دەربارەی دەڵێت: "ئافرەتێکی هەرزەی قەحپەیە، حەزم بە خزمایەتی نییە و نامەوێ خزمی من بێت." کارامازوفی پیر دەڵێت: "قەحپەیە" و لەسەری دەڕوات: "بەڵام لەگینە، لە تێکڕای رەبەنانی دێران پاکتر و پیرۆزتر بێ." هەندێکی دی لە کاراکتەرەکانی ڕۆمانەکە دەڵێن: "ئەم ئافرەتە حەیوانە" هەندێکی دی بەرسڤ دەدەنەوە: "نەخێر ئەم ئافرەتە فریشتەیە." دیمیتری هاوار دەکات: "با من پێتان بڵێم چیە: بەورە. شابانۆی بێ شەرمیە، ژنێکی دۆزەخی تەواوە، سەرقافڵەی هەموو ژنانی دۆزەخی و بەرەڵلاو بێسەروبەری سەر ڕووی زەمینە." ئەدی دیدو بۆچوونی ئەلیوشا

چیە؟ ئەوەی کە بەتایبەتی سەرنجی ئەلیوشا ڕادەکێشێت: "سادەیی و بەرخوردی دڵگیری ئەم ژنەیە". جا لێرەدا باوەڕ بەکێ بکەین؟ بە هەمووان. چونکە گروشینکا هەموو جۆرە قەزاوەتێک هەڵدەگرێت: گروشینکا کیژێکی گەنجە، قەحبەیەکی پەتەڕییە، حەیوانە، فریشتەیە، تێکڕای هەڤدژییەکانی خێڵی ژنانی لەخۆیدا کۆکردووەتەوە. بە نۆڕینی پولین سوسلوڤا* (پولین سوسلوڤا: ژنێکی کۆنە دۆستی دوستویفسکی بوو) گروشینکا ژنە. ژن دنیایەکە لە شێتاتی کە لە گۆشت دروست بووە. ژنان تەمەنیان بەدەم چاوەڕوانیەوە دەبەنە سەر، هەمیشە پەشێو و پەرێشان لە بیری هاتنەدی ئارەزووەکانیاندان، لەم هەواو هەوەسەدا دەسووتێن کە خۆ تەسلیم بکەن، بەڵام کە زەفتیان دەکەیت، گلەییت لێدەکەن، سەرکۆنەت دەکەن. هەندێجار زۆر شڕو دڕ دەبن، تا دوایی کە هێور دەبنەوە لەزەت لەو حاڵەتەی خۆ بدینن، هەندێجار میهرەبان دەبن، تا دوایی شڕو دڕببن و لەزەت لەو حاڵەتە بدینن. ئیدی جۆرەها فەند و فێڵ و لادانیان هەیەو جۆرەها ڕابواردن و لەزەتی پاک و سادەیان هەیە. درۆ دەگەڵ پیاوان، دەگەڵ خوا، تەنانەت دەگەڵ خۆشیاندا دەکەن. ڕوو بە ڕووی ژیان نابنەوە، گەمە بە ژیان دەکەن، وەکون چۆن بەرانبەر بە ئاوێنە دەوەستن، بەو ئاوایە بەرانبەر بە ژیان دەوەستن. هەڵوێستی خۆ، ڕەفتاری خۆ دەگۆڕن، تا هەست بە بوونی خۆ بکەن. بۆ پیاو پایەداری و هەڵوێستداری، نیشانەی پیاوەتی و کەسایەتی تایبەتی ئەوە، بەڵام ژن، لەڕێگەی گۆڕانەوە، بوونی خۆی دەنوێنێ و دەسەلمێنێ. پیاو دەیەوێ خۆی بێت، یەک کەس بێت. بەڵام ژن دەیەوێ، چەندین کەس بێت. پیاو کاتێ هەست بە قوەتی خۆی دەکات، کە هەموو چاکە و عەیبەکانی خۆی بزانێت. ژن مەگەر لە نائاگایی تەواودا دەنا هەست بە قوەت ناکات و خۆی بە بەقوەت نازانێ، پیاو دنیایەکی سیستەماتیکە و ژن دنیایەکی بێسەروبەر و شێوەو شەکڵ. هەموو شتێکی لێدەوەشێتەوە، لە هیچ شتێکدا جێگەی باوەڕ و متمانە نییە یا دەبێ خۆی لێ لابدەیت و لێی هەڵبێیت یا دەبێ چاوپۆشی لەوە بکەیت کە بەسەریا زاڵ بیت و کۆنتڕۆڵی بکەیت.

جوانی گروشینکا، کارامازوفی پیری ئەفسوون کردووە. ئەم پیرەمێردە بەدمەست و مەی ئالوودەو ڕژدو چروک و درۆزن و پڕ عەیب و عارە، لەوە دەچێت وێنەیەکی کوت ومتی باوکی دوستویفسکی بێت. نووسەر دەربارەی ئەم کاراکتەرەی ڕۆمانەکەی دەڵێت: "کەسێکی بەسۆز و هەڵچوو بوو، بەڵێ بەسۆز و شەڕاشۆ بوو." ئیمی کیژی دوستویفسکی دەنووسێت: "من هەمیشە وام تەسەوەر دەکرد کاتێ بابم، خەریک بوو وێنەی کارامازوفی پیری دەکێشا، بیری لە باوکی خۆی دەکردەوە."

کارامازوفی پیر لە دید و نۆڕینی گروشینکای جوان و خشکۆکەوە، جگە لە پەیکەرێکی کۆمێدی، بە خوتەو بۆڵە، کە قسانی دەکرد، لیکاو بە لالغاوەیدا دەچۆڕایەوە، هیچی دیکە نەبوو. کارامازوف، ئەو بەشە میراتەی کە بە دیمیتری دەبڕا، بۆ گروشینکا دادەنێ. هەموو ڕۆژێک بەتەمای هاتنی ئەوە. چاوەڕوان دەکات، بێ تووتنی و ئارەزووی سێکسی ئۆقرەی لەبەر

هەڵـدەگرێت، بـەدەم چاوەڕوانیـەوە، ئـەم ژوور و ئـەو ژوور دەکـات. چـاوەڕوان دەکات، چاوەڕان دەکات. بەڵام گروشـینکا ملـی بـۆ نـادات و تەسـلیمی نایێـت. هەروەها تەسلیمی دیمیتـریش نایێـت کـە کەوتووەتـە داوی ئەشـقی ئـەوەوە. ئەم ژنە بە هەردوو باب و کوڕ ڕادەبوێرێ و قەشمەریان پێدەکات. ڕۆژ بـە ڕۆژ ڕق و کینەی نێوان باب و کـوڕ زیـاد دەکـات. دوستویفسـکی لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: "ئـەم دووە، لـەکاتێکا چـاودێری یـەکیان دەکـرد، سـەرو کێردیـان بـۆ یەکـدی بـە دزییەوە هەڵگرتبوو."

ئەگەر ڕاسـکولنیکوف، فریوخـۆری بیرێـک بـوو، کـە هـیچ سـەربەخۆییەکی بـۆ نەهێشتبووەوە، ئەوا دیتمیری و بابی بە جۆرێ فریوی ئـەم ژنـەیان خـوارد بـوو، کە هەردووکیان بوو بوون بە دیـل و ئەسـیری ئـارەزووە سێکسـیەکانی خۆیـان، دیتمیـری بـەڕاشـکاوی دەڵێـت: "جـوانی دیاردەیـەکی زۆر ترسـناکە!" چونکـە، دەسـەڵاتی جـوانی بەسـەر پیـاودا، هاوتـای کاریگـەری و دەسـەڵاتی فیکـرەو، بگرە هەندێجار زیاتریشە. شێتاتی سێکسـی کارامـازوف و کوڕەکـەی، هاوتـای شێتاتی سیاسـی و فیکری شـەیتانەکانە. لـە هـەردوو هەڵوێسـتەکەدا مـەیلی تێرکردنی ئارەزووە حەیاتیەکانی ئەم دنیایی، هەندێ بەشـەران، لـە بەشـەری دەخات و دەیانکاتەوە بە حەیوان. لە هـەردوو حاڵەتەکـەدا، بیرۆکـەی بەزانـدن و لابردنی هەر جۆرە لەمپەر و سنوورێکی ئەخلاقی، بە گەندەڵی و کـەچڕەوی و تەنانەت بە تاوان دەشکێتەوە.

ئـەوەتا کارامـازوفی پیـر، دەربـارەی دیتمیـری کـوڕی هـاوار دەکـات و دەڵێـت: "دیتمیری! وەکو سیسرکێک پان و پلیشـی دەکەمـەوە." و دیمیتـری دەربـارەی بابی دەڵێت: "نازانم، لەوەیە بیکوژم، لەوانەشـە نەیکوژم. دەترسـم لەم سـاتەدا نەتوانم تەمەشـای ڕوخسـاری بکـەم. چەنـد ڕقـم لـەو مـل و قورتمەیـەتی، لـە کـەپوو و چاوەکـانی و زەردەخەنـە ناشـیرینەکەیەتی. زۆری ڕق لـە منـە، لـێم بێزارە، بەڕاسـتی لەمـە دەترسـم." ئیـدی دیمیتـری، بـەردەوام چـاودێری بـابی دەکـات نـەبادا گروشـینکا، بـەپـارە بخەڵـەتێت و بێـت بـۆ لای بـاوکی. شـەوێک گریگـۆری، خزمـەتکاری ماڵەکـە، دیمیتـری، لەباخەکـەدا غـافڵگیر دەکـات، کـە چـاودێری ڕەفتـاری بابیـان دەکـات. دیمیتـری کوتـەکێک دەکێشـێت بەسـەریاو هەڵدێت. دیمیتری، جارێک گروشینکا لە ئوتێلێکدا دەبینـێ "ئیـدی شـەوبێری و زیافەت و ڕابواردن و ئاهەنگێکی ئەوتۆ ساز دەکەن کـە هـەر جـۆرە پەردەیـەکی شـەرمی تیا نامێنێ." شـەراب، موزیـک، سـەماو ڕەقسـین. گروشـینکا، بـەدەم هەڕەتی مەستیەوە بە دیمیتری دەڵێت خۆشـی دەوێ و حـەز دەکـات شـووی پێبکات: "هـەر چەنـدە دەزانـم تـۆ کـەسـێکی هـۆڤی و زبـری، بـەڵام نـەجیب و ئاپرومەندی. پێویسـتە لەئێسـتا بەدواوە، سـەر ڕاسـت و ئاپرومەندانە بژین، نـەک حەیوانانـە. ڕەدووم بخـە، بمبـە، بـۆ شـوێنێکی دوورم ببـە. گوێـت لێمـە، لـێم دەگەی؟ نامەوێ لێرە بمێنم، دەمەوێ ڕۆین، بۆ شوێنێکی دوور دوور ڕۆین..."

لە تۆ وایە هەسـت بـە نزیکـی ڕوودانـی کارەسـاتێک دەکـەن و ئـەم هەسـتە، ئـارەزوووە سێکسـیەکانی ورژانـدوون وگەیاندوویەتیـە لوتکـە. ئاگـادار بـوونی پێشوەختە لە چارەنووسێکی ترسـناک، وایـان لێـدەکات، هێنـدەی دی خـۆ لـەو

کەیف و شادیە هەنووکەییەدا نقوم بکەن. شادن چونکە وا هەست دەکەن، جارێکی دی و بەو زووانە، ئەو شادیە دووبارە نایێتەوە. دوستویفسکی بایەخ و گرینگیەکی زۆری بەم خاڵە داوە کە هەر شادییەک، شادی مەعنەوی نەبێت، وەکو شادی و کەیفی کۆتایی شەو یا کۆتایی ڕۆمانی بێت، ئەوا ناپایەدار دەبێت و زوو لە دڵ دەڕوات. تەنانەت لەو ساتانەشدا، کە شادمانی کاتی قارەمانەکان دەبینین، زۆرمان پێناخۆش دەبێت، چونکە دەزانین شادمانییەکی کاتیە و زوو ئاوا دەبێت. دوستویفسکی، بە هەمان کارامەیی و لێهاتووی جەلاد و ئەشکەنجەچییەکەوە، بەرلەوەی قوربانیەکانی خۆی سزا بدات، زەمینەی خۆشی و شادیان بۆ هەموار دەکات و دەرەخسێنێ. هەرگیز لە جەستەیەکی شەکەت و هیلاک و نەخۆش نادات، بەڵکو ڕۆژێک بۆ ئەو کارە هەڵدەبژێرێ کە قارەمانەکەی لەوپەڕی خۆشحاڵی و سەلامەتی و تەندروستیدا بێت. ڕۆژێک کە لە هەڕەتی خۆشی و ئومێدەواریدا بێت، بۆ ئەوەی لەو ڕۆژەدا، لە گەرمەی سەرمەستیدا، جەزرەبە کوشندەکەی لێبدات و دواتیری ڕەحمەتی پێوە بنێت. بۆیە دەبینین، وەختێ دیمیتری لەوپەڕی خۆشی و شادی ئاشقانەی خۆیدایە، کە پۆلیس دێنە سەری و بەتۆمەتی کوشتنی بابی خۆیەوە دەستگیری دەکەن. چەند لەبەردەم لیژنەی لیکۆڵینەوەدا داکۆکی لەخۆی دەکات، دادی نادات و هەموو بەڵگە و نیشانەکان دژی ئەون. لە ڕاستیدا بکوژی ڕاستەقینەی کارامازوفی باوک، هەمان سەرمدیاکوفی حەرامزادە، کوڕە ناشەرعیەکەی کارامازوفە. جا ئەم لێبۆکە خوێڕی و بودەڵەیە لە ڕۆمانەکەدا ڕۆڵێکی دۆزەخی قێزەون دەگێڕێت، ڕۆڵێک کە زۆر بەدڵی نووسەری ڕۆمانەکەیە، جا چ شتێک، چ ئەشکەنجە و عەزابێک بۆ پیاوێکی نەجیب و ئابڕومەند لەوە قورسترە، کە تووشی ببێ بە تووشی کەسێکەوە، هەڵگری هەموو ئەو دزێوی و پۆخڵەواتە بێت کە ئێستا لەودا نەماون و بیرچوونەتەوە، کۆمەڵێک گەوجایەتی و ترسنۆکی دووبارە بێتەوە بەرچاو کە لە دەروونیدا مردوون. تۆ دڵنیاو ئاسودەی، کەسایەتی خۆت بەدڵە، کەچی لەناکاوا کەسێکت لێ پەیدا دەبێت کە ڕۆح و دەروونی تەژی بێ لە هەموو ئەو شتانەی کە تۆ لەخۆتت دەرکردوون. کەسیک کە زبڵدانی پوخڵەواتەکانی تۆیە. ئەو، تۆیە، بەهەموو عەیب و کەموکوڕییەکانتەوە، دوورە لە هەموو ئەو مەعنەویاتەی کە لە تۆدا هەیە. باشترین قسەی تۆ لە دەمی ئەوەوە وەکو جنێو دێنە دەرێ، کە نیشانەی گەوجێیەتی و کەودەنیە. جوانترین بیری تۆ لە کەللەی پووتی ئەودا، دژی تۆ دەکەوێتەوە.

ئیدی بەو جۆرە، ئیڤان، گەورەترین برایانی کارامازوف. براکەی خۆی، کە وەکو مەیموون لاسایی دەکاتەوە، ڕستکردووە و وەکو مەیموون بە دووی خۆیدا دەیگێڕێت. ئیڤان دەیبێزرێنی، کەچی ئەو، واتە سەرمدیاکوف، ئەم بێزرانەی پێخۆشە، خۆی پێوە ڕادەنێ. ئیڤان حەقارەتی پێدەکات، ئەو پێی خۆشە. سەرمدیاکوف لەبەرخاتری ئیڤان، کە بەهۆی زەماوەندی بابیەوە، لە بەشە میرات بێبەش دەبێت، دەکوژێت. گوایە دەیەوێ بەم کارە خزمەتێکی ئیڤان بکات. پیرەمێرد دەکوژێت، بێئەوەی کە ئیڤان داوای شتی وای لێکردبێت. بۆیە

دەیکوژێت، چونکە وا تەسەور دەکات، بەمە ئاواتێکی پەنهانی ئاغاکەی خۆی (ئیڤان)ی هێناوەتە دی.
ئەوەی لە دڵی ئیڤاندا، تەنیا خەیاڵێکی گۆنگ و پەنهان بوو، لەناکاوا بوو بە ڕووداوێکی ڕاستەقینەی ترسناک، ڕووداوێکی دزێوی ئەوتۆ کە تەواو زەلیل و دەستەوستانی کرد. بەم کارەی سەمردیاکوف، کە گوایە ئارەزووە دەروونیەکەی ئاغای خۆی هێنابووە دی، ئیڤان کارامازوف، نەک هەر بەخەیاڵ و لەخەیاڵدا تاوانبار بوو، بەڵکو ڕووبەڕووی تاوانێکی پراکتیکی و واقیعی بووەوە. سەمردیاکوف، ڕەمزی ئەم ماناو چەمکەیە کە ئەو بیرە ئەپستراکتەی بە مێشک و خەیاڵی ئێمەدا دێت، لە مەسئولیەت خاڵی و بەدەر نییە. سەمردیاکوف، سزای هزرڤانی ئازادە. بە ئیڤان دەڵێت: "تۆ خۆت زۆرت حەز بە مردنی بابت بوو. بەڵام نەتدەتوانی بەخۆت بیکوژیت و خۆزیات دەخواست کەسێکی دی بیکوژێت." ئیڤان ئەم مەسەلەیە لە زەین و خەیاڵی خۆیدا تاوتوێ دەکات. بیر دەکاتەوە، شپرزە دەبێت: "بەڵێ، چاوەڕوانی ئەم کارە بووم و تەسەورم دەکرد. کەواتە ئەمە ڕاستە. دەمویست بیکوژم.".. پاشان دەڵێت: "ئایا من بەم ڕادەیە ئاواتەخوازی مەرگی باوکم بووم؟" تەنیا ئەم چاوەڕوانییە، ئەو هزرو خەیاڵەی لە مێشکی ئیڤان دابوو، هەستی تاوانباری لەلا دروست دەکات. نیازە گڵاوەکەی ئەو دەسەلمێنێ. سەمردیاکوف بۆی دووبارە دەکاتەوە: "تۆ کوشتت، تۆ بکوژی ڕاستەقینەی ئەویت، من تەنیا یارمەتی دەرێکی تۆ بووم..." ئیدی ئەم خزمەتکارە، چۆنیەتی بڕیارو کارەکەی خۆی بۆ ئاغای شەرح دەکات و دەگێڕێتەوە.
لە ڕاستیدا، ئەو بۆیە کوشتویەتی، چونکە هیچ لەمپەر و ڕێگرێکی لەبەردەمدا نەبووە. سەمردیاکوف، لە ژێر کاریگەری قسە ڕۆشنبیرییەکانی ئیڤاندا، گەیی بووە ئەو قەناعەتەی کە لەم دنیایەدا "هەموو کارێک ڕەوایە" هیچ خوایەک لە ئارادا نییە. هیچ دۆزەخێک لەئارادا نییە. سەمردیاکوف دەڵێت: "ئەگەر خودا نەبێت کەواتە هیچ چاکە و پیاوەتی و شتێکی دیکە نییەو ئەم چەمکانە جگە لە خەیالاتی بێهودە هیچی دیکە نییە. ئیدی سەمردیاکوف، بە بەزاندنی یاساو ڕێسا ئەخلاقیە گشتیەکان، بە بەزاندنی دیوارەکان، ئازادی و خۆسەری و دکتاتوریەت و ستەم تێکەڵ دەکات و جیاوازییان لەنێواندا ناکات. دەکوژێت و بەم کردەوەیەی خۆی ئیڤان کارامازوف، کە دووپاتی دەکردەوە "هەموو شتێک لەم دنیایەدا ڕەوا و حەڵاڵە" لەگەڵ دیمیتری کارامازوفدا کە هاواری دەکرد "ئینسانی وا بۆچی دەبێ بژی؟" گرفتار دەکات و لە شەڕیانەوە دەئاڵێنێ.
ئیڤان لە دیدی یاسایێن بەشەرییەوە، کەمتەرخەم و تاوانبار نییە بەڵام هێز نییە، بەرانبەر بە ویژدانی خۆی تەبرێی بکات. پاش ئەوەی نکوڵی وحاشا لە بوونی خودا دەکات، خۆی لەبەرانبەر سەمردیاکوفدا دەبینێتەوە. یانی لەجیاتی سوپەرمان و ئینسانی باڵا و ئایدیالی کەشف بکات و بدۆزێتەوە، مەیموون کەشف دەکات و دەدۆزێتەوە. لەجیاتی نەردەوان و پەیژەی درەخشان و ڕوناک، خۆی لە بەرانبەر هەڵدێرێکی قووڵ و سامناکدا دەبینێتەوە. لە جیاتی ئەقڵی

باڵا، شێتاتی کەشف دەکات. ئیدی ئەم پیاوە زیرەک و ڕۆشنبیر و خوێنەوارە، بەدەم خەیاڵات و وەهمەکانی خۆیەوە دەمێنێتەوە و عەزاب دەکێشێت. خۆی بەدوان دەبینێ، تووشی دووفاقی دەبێت. شەیتان دەبینێ. ئەم شەیتانە خودی خۆیەتی. دەڵێت: "تۆ خودی منیت، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە. تۆ گوزارشت لە بیرو بۆچوونە تایبەتیەکانی من دەکەیت. بەڵام گەوجانە ترین و سەخیفترین بیرو بۆچوونی من هەڵدەبژێرێت، تۆ گەوجیت، بازاڕیەکی هیچ و پووچیت."

ئیڤان کارامازوف، خودی دوستویفسکییە کە "بەدرێژایی تەمەنی خۆی، بیرۆکەی خودا عەزابی داوەو پێوەی تلاوەتەوە." نکوڵیکاری کوفر ئامێزانەی ئیڤان کارامازوف. هەمان نکوڵیکاری دوستویفسکییە لە کاتی گومان و دوودڵیەکانیدا. لەمبارەیەوە دەڵێت: "ئەو نەفامانە، ئەو گەوج و کەودەنانە، تەنانەت ناتوانن، بە خەون و خەیاڵیش قوەتی ئەو بیرە سەلبیانە بێننە بەرچاوی خۆیان، کە من بەسەریاندا زاڵ بووم." کاتێ کە ئیڤان کارامازوف هاوار دەکات: "ئایا، دەشێت لە ئاستی فرمێسکی منداڵێکی چکۆلەدا کە دەبێتە قوربانی و شەهید دەبێ، باوەڕ بە بوونی سیستەمێکی هاوئاهەنگ و گونجاوی جیهانی بێنین؟"ئایا ئەمە دوستویفسکی نییە کە لەجیاتی ئەو قسە دەکات؟

لەڕاستیدا، وادێتە بەرچاو کە ئیڤان کارامازوف، لە دیدی دوستویفسکییەوە هەمان ڕۆڵ دەبینێ کە سەمردیاکوف لە ڕوانگەی ئیڤانەوە دەیبینێ. بەلای دوستویفسکییەوە، ئیڤان نوێنەرایەتی ئەو لایەنەی دوستویفسکی دەکات کە خۆی بە گەوجانەو قێزەونی دەزانێت. ئیڤان هەمان لایەنی دوستویفسکییە کە دەیەوێ لەخۆیدا بیسڕێتەوە و دەری بکات. ئیڤان سزایەکی ئاقڵانەی، خوڵقێنەرەکەی خۆیەتی.

بەڵام سەربارى ئەم بوونەوەرە مەلعوونانەش، دوو کاراکتەری گەش و جوانیش خۆیان بۆ خوێنەران دەنوێنن: ئەلیکسی (ئەلیوشا) و زوسیمی خواناس. ئەلیوشا، بچووکترین برای کارامازوفەکانە. ئەمە ڕەبەنێکی تازەیە، لە دێرێکی ئارامدا، دیوارەکانی بەرز و سپین، دەژی. بەڵام وێڕای ئەمەش، بەهەموو مانای وشەوە دیندار و سوفی نییە.

دوستویفسکی لەبارەیەوە دەڵێت: "ئەلیوشا، هەرگیز بابایەکی توندڕەو نییە. ئەوەی کە من دەیبینم، تەنانەت وشکە سۆفی و عارفیش نییە. بە بۆچوونی من تەنیا پیاوێکی خێرئەندێشی، مرۆڤ دۆستە و بیرکردنەوەی پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتووە."

کەواتە ئەمە کوڕێکی سەنگین وهاوسەنگە، لە واقیعدا نەشونمای کردووە. کەسێکی هێمن و ئاسوودە بیرە. دڵنیاییەکی دەروونی و باوەڕێکی دروست و سەر ڕاستانە و ساغ و ساغڵەمی بەبوونی خوا هەیە. باوەڕی بە موجیزات و پەڕجوانیش هەیە. بەڵام ئەم موجیزاتانە، بیر وهزرینی ناشێوێنن. ناکەنە بناغە و بنەمای سەرەکی ئیمانی ئەو. بەڵکو بەتاجی زێڕین و مایەی شانازی ئیمانی ئەو دێنە ژماردن.

"بۆ کەسێکی واقیعبین و ڕیالیست، ئیمان لە پەرجووەوە لە دایک نابێت، بەڵکو پەڕجوو لە ئیمانەوە لەدایک دەبێت. بەمجۆرە ئەلیوشا، کەسێکی ڕیالیستە، واقیعبینە، ئینسانێکی تەواوە، چاکی لەلای ئەو لە جۆری چاکی پەری و فریشتەێن ئاسمان نییە، ئەو تەسەورەی کە ئەو دەربارەی چاکە و چاکی هەیەتی، ئەمە نییە کە تەواو لەشەڕ بیئاگا بێت و شتی وا کەم و زۆر لە ویژدانیا نەبێت، وەکو ئەمە لەلای میشکینی قارەمانی ڕۆمانی گەمژەدا بەدی دەکرێت. ئەلیوشا، شەڕو خراپە دەناسێت. لە عەیب و عارو خراپیەکانی براکانی و بابی تێدەگات. خەڵکی هەمان دنیای ئێمەیە، بەو گوناحکارانەی کە دەوریان داوە، نامۆو بێگانە نیە. بەڵام ناتوانێ ئەو فریوکاری و ساختەچیاتیانەی ژینگەکەی خۆی لەنێو بەرێت و نەیهێڵێت.
مەگەر بابە زوسیم، خواناس و پیاوی دێر، پێی نەگوتووە: "بۆچوونی من سەبارەت بەتۆ ئەمەیە کە تۆ چواردیواری ئەم دێرە بەجێدێڵی. ئیدی وەکو پیاوی ئاین، لەنێو خەڵکیدا دەژی. نەیارو ڕەقیبانێکی زۆرت دەبن، بەڵام نەیار و ناحەزەکانیشت، خۆشیان دەوێی. ژیان دەردەسەری زۆرت بۆ دروستدەکات، بەڵام تۆ لەزەت و خۆشی لەم بەدبەختی و دەردەسەریانە دەبینی. تۆ ژیان پیرۆز و بایەخدار دەکەیت، قەدری ژیان دەزانیت، خەڵکانی دیکەش وادارەدەکەیت کە بە ڕێزەوە پروانە ژیان و مامەڵەی لەتەکدا بکەن، گرینگ ئەمەیە."
ئایا ئەمە هەمان شیدولوفسکی هاوڕێی منداڵی خودی دوستویفسکی نییە، کە سیمای جوانی ئەلیوشای لەبەر گرتووەتەوە، یا سولوڤیڤ نییە کە سەروسیمای لە سەروسیمای مەسیح دەچوو، کە سیمای ئەلیوشیای لەبەر گرتووەتەوە. با، ئەلیوشا ئاوێتەیەکە لەهەردووکیان.
سیمای زوسیمی پارساش تێکەڵەیەکە لە تیخون زادونسکی خەیاڵ پڵاو و پاپا ئەمبروازی خەڵکی ئوپتینا پوستین. دوستویفسکی دەڵێت: "یارۆی خواناس، ڕوح و ئیرادەی تۆ، ئاوێتەی ڕوح و ئیرادەی خۆی دەکات." ئەو خاوەنی ویژدانێکی هێندە بەهێزە، کە تۆ پەنهانترین کەڵکەڵە و خەم و خولیای خۆتی بۆ هەڵدەڕێژیت و دڵی خۆتی بۆ دەکەیتەوە. هەموو ڕەبەن و کەشیشە کۆن و تازەکان، متمانەی پێدەکەن و لەبەردەمیا ئیعتراف دەکەن و لەو ڕووەوە قەرزاربارى ئەون و دەچنە ژێرباری حوکم و دەسەڵاتی ئەو. ئیدی بە ڕۆشبینی و حیکمەت و دووربینی خۆی و، لەرێگای ڕێنماییە ماقووڵ و ئارامبەخشەکانی خۆیەوە، خەڵکەکە بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت.
سەبارەت بە زوسیمی پیاو چاک و خواناس، زۆر کەس دەگێڕنەوە دەڵێن، بە حوکمی ئەوەی ساڵانێکی زۆر بوو، پێشوازی هەموو ئەو کەسانەی دەکرد کە دەهاتن گرێی دڵی خۆیان بۆ دەکردەوە و چاویان لە ئامۆژگاری و ڕێنوێنیەکی ئەو بوو، ئەزموون و بەسیرەت و کەرامەتێکی مەعنەوی ئەوتۆی بە دەست هێنا بوو، یەکەم نیگای هەر کەسێکی نەناسی کردبا، یەکسەر دەیزانی بۆچی هاتووە، چ پێویستیەکی ڕوحی و دەروونی بۆ لای ئەوی هێناوە،چ کێشەیەک ویژدانی عەزاب دەدا." بەڵام وێڕای ئەوەش زوسیمی پارسا، وەکو

ئەلیوشای گەنج، ئەلیوشای شاگردی، کە لەساو پەنای چاودێری و مدارای ئەودا بوو، زیاتر ئینسانێک بوو تا قەشە بێ. لە نێو خەڵکیدا ژیا بوو، خزمەتی عەسکەری کرد بوو، کە چوو بووە سلکی ڕەهبانیەت و خواناسییەوە، لەبەر نائومێدی یا نامورادی کۆمەڵایەتی نەبوو، ئەنجامی بیرکردنەوە نەبوو، بەڵکو ئەنگێزە و فاکتەری سەرەکی ئەم کارەی خۆشەویستی بوو، فەلسەفەی زوسیم، خۆشەویستی و شادیە.
دوستویفسکی لەو بارەیەوە دەنووسێت: "ئەوەی سەیرە، ئەم پیاوە خواناس و چاکە هەمیشە شاد و بەکەیف دیارە و کەمتر سەختگیری پێوە دیارە."
زوسیم، ئەم قسانەی برا گەورەکەی کرد بوون بەهی خۆی و دووبارەی دەکردنەوە: "ژیان بەهەشتە و هەموومانی تیاین، بەڵام نامانەوێ دان بەمەدا بنەین" و هەروەها: "هەر یەکێکمان بەرانبەر بە هەمووان، سەبارەت بە هەمووان و بەرانبەر بە هەموو شتێک کەمتەرخەم و تاوانبارین."
هاوسۆزییەکی جیهانی هەموو تیرەی بەشەر کۆدەکاتەوەو لە هەمان کاتدا دزێوی و کرێتی ڕەفتاری هەر کەسێکیش کار لەوانی دی دەکات: گوناح و خەتا لە سنووری تاوانکار و قوربانیەکەیدا ناوەستێ، بەڵکو وەکو پەڵە چەورییەک بڵاودەبێتەوە، ئەوانەی لە خەیاڵی خۆشیاندا ئارەزووی گوناحکاری بکەن، بێئەوەی گوناحەکەش بکەن، بەتاوانبار حیساب دەکرێن. ئەوانەش کە بەو ئارەزوو و نیازانە دەزانن و مەحکومی ناکەن، دووچاری ئازار و عەزاب دەبن. تەنانەت ئەوانەش کە کەم و زۆر ئاگایان لەم ڕووداوە نییە. ڕەنگە بەشێوەیەکی زۆر گۆنگ و نامەفوم، تیایدا شەریک بن.
ئێمە هەمووومان کەمتەرخەمین، بەپرسین. نەگبەت و کڵۆڵ و لەوتاوین. شەریکە دزی ئەم دزەین کە چارەیمان نەدیتووە. شەریکی ئەو بابکوژەین کە لەڕۆژنامەدا ناسیومانە. شەریکی ئەو داوێن پیسەین کە دەستدرێژی کردووەتە سەر ئافرەتان، بەهەمان نەفرەتی ئەو کوفرگۆیانە گرفتارین کە نەماننناسیوون. هەر هەمووومان لەژێر باری گوناحی سەدان ساڵەدا پشتمان چەمیوە. وێڕای هەموو ئەمەش. هەمووومان ڕزگار دەبین، ڕزگار دەکرێین.
زوسیم دەڵێت: "ئینسان ناتوانێ بە ئەنجامدانی گوناحێک کۆتایی بە لوتف و خۆشەویستی بێ پایانی خودا بێنێ، باوەڕ بکە، خودا خۆشی دەوێی، بەگوناحەکەشتەوە هەر خۆشی دەوێی.. بە جۆرێ خۆشی دەوێی کە ناتوانی تەسەور و وێنای بکەیت. بۆیە ئەگەر تۆ خۆشت بوێ، خۆشەویستیت لەدڵدا بێ، مانای وایە لەخواوە نزیکی. خۆشەویستی، هەموو شتێک قەرەبوو دەکاتەوە، هەموو شتێک ڕزگار دەکات."
بابە زوسیم، داوا لە ئیمانداران ناکات کە لەژیاندا ڕێبازێکی توند و قورس بگرنە بەر، بکەونە چلەکێشی، تۆبە و گریان، سەرکوتکردنی نەفسی خۆ. بەڵکو داوای کارێکی چکۆلەیان لێدەکات، ئەویش ئەوەیە کەدان بە خەتاو گوناحەکانی خۆیاندا بنەن، خۆشەویستییان لەدڵدا بی. گرینگ ئەنجام نییە، بەڵکو گرینگ ئەو ڕێگایەیە کە دەگیرێتە بەر. کاتێ کەسێکی لەخۆبایی و خۆپەرست، سەر فرۆدێنێ، لەو عەبد و کۆیلەیە پتر لەخوا نزیک دەبێتەوە، کە

بەچۆکا هاتووەو دەربەست تەسلیم بووە، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە یارۆی خۆپەرست و لەخۆبایی دەبێ بەگژ نەفسی خۆیدا بچێت، تا ملکەچی و گوێڕایەڵی نەفسی مرۆڤانی خۆی بۆ خودا بنوێنێ و بیسەلمێنێ، بەڵام کابرای کۆیلە، بەگوێرەی عادەت و ڕاهاتن، سەرفر و دێنێ، بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە ئەم ڕەفتارەی چ مانایەکی هەیە.

"هەرچیتان لەدەست دێ بیکەن، ڕۆژێ دێ خەڵکی پێی بزانن و هەقی خۆی بدەنێ. ئەوەی لەخۆتاندا بەخراپ دێتە بەرچاوتان، هەرکە هەستتان کرد خراپە، پەیتان بە خراپ بوونەکەی برد، بەخۆی پاک دەبێتەوە. لەو ساتەدا کە هەست بەترس دەکەن گوایە سەرباری هەموو هەوڵ و کۆششێک نەک نەگەییوونەتە ئامانج، بەڵکو لێی دوور کەوتوونەتەوە. من پێشوەختە دڵنیاتان دەکەم کە دەگەنە ئامانج. هێزێکی پەنهانی خوایی، بەبێ ئاگایی خۆتان، لە ڕێگەی خۆشەویستیەوە هیدایەتتان دەدات."

زوسیم و ئەلیوشا، لە هەمان جیهانی نورانیدا دەژین، خۆشەویستییان لە دڵدایە و ئەمە بۆخۆی بەسە کە خۆشەویستی منداڵان و خەڵکی بە دەست بێنن. (هەموو کتێبی دەیەم تەرخانە بۆ شەرح و شرۆڤەی میهر و مەحەبەتی ئەلیوشا سەبارەت بە منداڵانی سەرگەردانی وڵات."

بەڵام ڕۆشنبیران، زۆر بەتوندی هێرش دەکەنە سەر ئەم فەلسەفە مەند و ئارامبەخشەی ئەو. بەڵام ئیڤان کارامازوف، لە هەنبەر ئیمانی هێمنی ئەلیوشیای برای، کۆمەڵێک بیانوو و هەنجەتی ئەهرەیمەنانەی سەرۆکی دادگای تەفتیشی باوەڕان دێنێتە ئاراوە. هەڵبەتە چیرۆکی موفەتیش باشی، وەکو ئیڤان بۆ ئەلیوشا دەیگێڕێتەوە، دەکاتە ترۆپک و لوتکەی ڕۆمانی برایانی کارامازوف، ڕەنگە بتوانرێ بگوترێ کە دەکاتە لوتکەی تێکڕای بەرهەمەکانی دوستویفسکی و بێگومان دوا پەیقی دوستوفسکییە. لەشاری ئەشبیلیەدا، لە ئیسپانیا، لە سەردەمانی دادگایانی تەفتیشدا (ئینکیزیسیون)*
(ئینکیزیسیون لەباری زمانەوانیەوە مانای لێکۆڵینەوەی زۆرەکی دەگەیەنێ. وەکو ناوی گشتی، ناوی دادگایەکە کە لەسەدەکانی ناڤیندا بۆ تاقیبی مورتەدانی مەسیحی دانرابوو. یەکەمین دادگا لە ساڵی ١١٨٣دا لەشاری ڤیرن، لە فەرەنسا دامەزرا و پاشان لە سەرانسەری ئەوروپادا، جگە لە ئینگلستان، ئەمجۆرە دادگایانە دامەزران و لە سەدەی هەژدەیەمدا لەسەرانسەری ئەوروپا لابرا. دادگایانی تەفتیشی باوەڕان، لە ئەسپانیا لە ڕووی زەبرو زەنگ و زۆرداریەوە بەناوبانگن، ئەمانە ٣٤٠ هەزار کەسیان ئەشکەنجە داوەو ٣٢ هەزار کەسیان لە ئاگردا سووتاندووە و سەرەنجام بە دەستی ناپلیون بوناپارت لابراون. دوستویفسکی لێرەدا ئاماژە بۆ یەکێک لە دادگاکانی ئەسپانیا دەکات.) ڕۆژێک مەسیح لەنێو خەڵکیدا دەردەکەوێت، خەڵکەکە یەکسەر دەیناسنەوە، لە دەوری خڕ دەبنەوە و نکوڵی لە موجیزات و پەڕجووەکانی دەکەن و مەسیح بۆ سەلماندنی بانگەوازەکەی خۆی، ئەو پەڕجوانە دەنوێنێ و ئەنجام دەدات کە خەڵکەکە داوای لێدەکەن. بەڵام سەرۆکی دادگای تەفتیشی باوەڕان، کە پیرەمێرێکی نەوەد ساڵەی دەموچاو

لاوازی ڕەنگ و ڕووی سیسەڵە و چرچەڵەی چاو بە قوڵاچوو دەبێت، حوکمی دەستگیر کردنی مەسیحی فریاڕەس دەردەکات. شەوێ سەرۆکی دادگا (موفەتیش باشی) دەچێ بۆ ئەو زندانەی کە بەفەرمانی ئەو مەسیحیان تێپەستاوە و بە مەسیح دەڵێت: "ئاخر تۆ بۆچی بۆ ئێرە هاتوویت، بە ڕاستی تۆ کارمان لێتێکدەدەی." ئیدی تۆمەتنامەیەکی ترسناکی بۆ ڕێکدەخات و وەکو دەڵێن چێشتێکی بۆ لێدەنێت بستێ ڕۆنی لەسەر بێت. لەڕاستیدا سەرۆکی دادگا نە باوەڕی بەخودا هەیە نە بە ئینسان. باوەڕی بەخودا نییە، چونکە ئامادە نییە گوێ لە خودای – ئینسان ئاسا بگرێت. بە مەسیح دەڵێت: "ئەوەی تا ئێستا گوتووتە، گوتووتە، بۆت نییە تاقە وشەیەکی دیکەی بخەیتە سەر." باوەڕی بە ئینسان نییە، چونکە بە نوڕینی ئەو فەلسەفەی مەسیحییەت لەسەرووی توانای ئەخلاقی و مەعنەوی بەشەرەوەیە. هەڵبەتە جەنابی موفەتیش باشی باوەڕی بە یەکێتی ئازادانەی پرەنسیپی ئینسانی و خوداییش نییە. بەنوڕینی ئەو کاتێ مەسیح دەڵێت: "من دەمەوێ ئازادتان بکەم" بەم ئازادیە، ئینسان سەرپشک دەکات لەنێوان هەڵبژاردنی چاکە و خراپەدا، بەمەش ئینسان دووچاری عەزابی ویژدان دەکات. کەواتە مەسیح دەزگایەکی ئەشکەنجەی بۆ ئینسان داناوە کە بریتیە لەسەر زەنشت، عەزابی ویژدان، ئیغرا، هیوا و ئومێدان، کە هەموو ئەمانە ئاوێتە و تێکەڵ بوون و ئینسان ئازار دەدەن – ئازادی بەبێ تەحەمولی ئازار و زەحمەت نایەتە دەرک کردن. ئازادی بەبێ ئازار بەدەست نایەت، کەواتە لە دوا ئەنجامدا مەسیحیەت بە دەرەجەی یەکەم ئاینی ڕەنج و ئازارە.

بەمجۆرە، ئینسان خۆی لەهەنبەر تەنگژە و مەسەلەیەکی هەڤدژا دەبینێتەوە، لەلایەکەوە ئازادی بەجۆرەها عەزابی مەعنەوی و دەروونی و ئەخلاقیەوەو، لەلایەکی دیکەوە دڵنیایی و خۆشگوزەرانی بە ملکەچی و گوێڕایەڵی و کۆیلایەتییەوە. کامیان هەڵبژێرێت؟ سەرۆکی دادگا (موفەتیش باشی) خۆی یەکلایی کردووەتەوە، هەڵبژاردنی خۆی کردووە و پڕاوەتەوە. دەڵێت حەزرەتی مەسیح، بەم ئەزموونە دژوارەی کە لە ئینسانی بارکردووە، هاتووە بارێکی قورستر لە توانای ئینسانی، لە ئینسان بارکردووە. ئینسان لەوە لاوازترە، بەتەواوی لەو ئەرک و پەیامانە بگات کە مەسیح داوای لێدەکات. دەڵێت. "مەگەر تۆ لەبیرت چووە، کە ئینسان، ئاسایش و ئیسراحەتی، تەنانەت مەرگی خۆیشی پێ خۆشترە، لەوەی کە سەرپشک بکرێت لەنێوان چاکە و خراپەدا یەکێکیان هەڵبژێرێت؟" ئامانجی سەرەکی ئینسان بەختەوەریە و ئەرکی کلێسایە کە بەختەوەری ئینسان لەسەر ڕووی زەوی دابینبکات . کلێسا ئینسانی لە مەسیح خۆشتر گەرەکە. مەسیح بارێکی هێندە قورسی بەشانیاداوە، کە شانەکانی هەڵیناگرێت.

سەرۆکی دادگا دەڵێت: "تۆ پایەیەکی یەجگار بەرزت بە ئینسان داوە، بەرزتر لەوەی کە خۆی هەیەتی. تۆ غەدرت لێکردووە، داوایەکی لێدەکەی لەتوانای ئەودا نییە." جا ئەم بیرۆکەیە وەکو لە ئینجیلدا هاتووە، مەگەر تەنیا لەلایەن بژاردەیەکی خەڵکەوە بێتە فامین و جێبەجێکردن، ئەمە جۆرە فیکر و

فەلسەفەیەکی ئەرستوکراتیانەیە، لەکاتێکا دیانەتی ئەرستوکراتیانە مەحاڵە، دیانەت، جا هەردیانەتێک بێ دەبێ ڕووی دەمی لە جەماوەری خەڵک بێت، ڕەش و ڕووتی خەڵک بدوێنێ، کەواتە ئاین و ئۆل دەبێت ڕەوش و ڕێبازیک بۆ ژیان بخاتە ڕوو کە جەماوەری خەڵک تێیبگەن و بتوانن جێبەجێی بکەن، مومارەسەی بکەن. ئاین دەبێ هیواو ئومێد، بە خەڵکانی نەزانی کۆمەڵگە، بە خەڵکانی گێل و گەوج، ترسنۆک و گەندەڵ و نەخۆش، ببەخشێت. دەبی لەبەر دەستی چینەکانی هەرە خوارەوەی جەماوەری خەڵکدا بێت، یانی ئاین دەبێ جەماوەری و میللی بێ." یانی سەرۆکی دادگا، لەجیاتی ئەوەی ئازادی بە ئینسان بدات، گومان و دوودڵی و عەزابی دەرونی و ڕوحانی لەلا دروست بکات، دەیەوێ دام و دەزگایەکی ڕێک و پێکی ئەقلیدیسی لە دنیادا بەرپا بکرێ. جا لێرەدا دیدی موفەتیش باشی دەگەڵ دید و نۆرینی چیگالوف دا (چیگالوف: یەکێکە لە قارەمانەکانی ڕۆمانی شەیتانەکان) تێکدەکاتەوە. ئەو بایەخ و گرینگی بە ڕەمەکی مەردم دەدات، داکۆکی لە برسییان و هەژاران دەکات. بەڵێنی نەک نانی ئاسمانی، بەڵکو بەڵێنی نانی زەمینیان دەداتێ. جەنابی موفەتیش بە مەسیح دەڵێت: "تۆ بەڵێنی نانی ئاسمانیت داونەتێ، بەڵام ئایا نانی ئاسمانی لەلای تیرەی بەشەری لاواز، بێبار، سپڵە و پێنەزان و خوانەناس لە بنج و بناوانەوە، هاوتای نانی زەمینی دەکاتەوە؟ ئێمە خەڵکی هەژار و نەدارمان بەلاوە گرینگ و مەبەستە."

ئەم ئاینی نانی زەمینییە، هەمان سوسیالیزمی خوانەناسی، شەیتانەکانە. سەرۆکی دادگا، هەژموونی جۆرە لەزەت و شادی و خۆشییەکی چکۆلە، بەسەر خولیا و کەڵکەڵە و ئارەزووە دەروونیە گەورەکانی ڕوحی ئینساندا پەسەند دەدات. دەڵێت: "ئێمە شادییەکی کڕ و کپ، سادە و بچووک، شادیەک کە دەگەڵ بچووکی و لاوازی خودی ئینساندا بگونجێت، بەو خەڵکە دەدەین. بێگومان کاریان پێدەکەین، بەڵام لەکاتی دەستبەتاڵیاندا، ژیانیان لە شێوەی گەمەیەکی منداڵانەدا، بە گۆرانی منداڵانەوە، بە کۆرسی گۆرانی و سترانانەوە، بە ڕەقس و سەمای بێگەردەوە، بۆ ڕێک دەخەین و دەڕازێنینەوە! تەنانەت ڕێگەی گوناهکاریشیان دەدەین، چونکە دەزانین کە لاواز و بێدەسەڵاتن." حەزرەتی مەسیح، لە بیاباندا، بەناوی ئازادی زەین و ڕوحی بەشەرەوە، یەکەمین وەسوەسە یانی وەسوەسەی "نانی زەمینی" ڕەت دەکاتەوە، کە بەدیدی موفەتیشی گەورە ئەمە یەکەمین هەڵەی مەسیح بوو. (وەسوەسەی مەسیح لە بیاباندا، کە لێرەدا باسکراوە، ئاماژەیە بۆ فەسڵی چوارەمی ئینجیلی مەتی کە وەکو خۆی نەقڵی دەکەین: "هەنگێ ڕوحی خودا عیسای برد بۆ بیابان تا شەیتان ئەو لە بەرانبەر وەسوەساندا تاقیبکاتەوە. عیسا چل دانە ڕۆژ ڕۆژووی گرت و سەرەنجام برسی بوو. هەنگێ شەیتان لێی نزیک بووەوە و گوتی: "ئەگەر ڕاستە تۆ کوڕی خودایت، پێی بڵێ با ئەم بەردانەت بۆ بکات بەنان" عیسا وەڵامی دایەوە: "لە کتێبی پیرۆزدا دەفەرموێت: ژیانی بەشەر تەنیا بەنانەوە بەند نییە، بەڵکو بەندە بە هەر وشەیەکەوە کە خودا دەیفەرمووێ" هەنگێ شەیتان بۆ بە بەیتول مەقدسی

دەبات، لەسەر دیواری پەرستگە گەورەکەی دادەنێت و پێی دەڵێت: "ئەگەر ڕاستە تۆ کوڕی خودایت، خۆت لێرەوە هەڵبدە خوارەوە چونکە کتێبی پیرۆز دەفەرمووێ: ئەو فەرمان بە فریشتەکانی خۆی دەدات و ئەوانیش دەتخەنە سەر دەستی خۆیان و دەتبەن نەبا پێیەکانت بەر بەردێک بکەون." عیسا وەڵام دەداتەوە: "هەروەها کتێبی پیرۆز دەفەرمووێت: خواوەند، خوای خۆتان تاقی مەکەنەوە." ئەوجا شەیتان بردی بۆ سەر کێوێکی یەجگار بەرز و هەموو مەملەکەتانی جیهان و شکۆ و جەلالیانی نیشان داو گوتی: "ئەگەر کڕنۆش بۆ من بێنی و من بپەرستیت، هەر هەموو ئەمانەت پێدەبەخشم." عیسا لە وەڵامیا فەرمووی: "لاوەکە، هەی شەیتان، کتێبی پیرۆز دەفەرمووێ دەبێ خواوەند، خوای خۆت بپەرستیت، تەنیا خزمەتی ئەو بکەیت و بەس." هەنگێ شەیتان عیسای بەجێهێشت و فریشتان هاتن و خزمەتیان کرد."

هەڵەی دووەمی مەسیح ئەمە بوو کە دەیویست خەڵکی ئازادانە و بەخوایشتی خۆیان خۆشیان بوێ و باوەڕی پێ بێنن، نەک خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ. بەڵام خۆ ئینسان ناتوانێ خۆبەخۆ و بەخوایشتی خۆی باوەڕ بێنێ. ئینسان پێویستی بە یەقین و شتێکی بەرچاو هەیە. دەبێ بەڵێنەکانی خودا، بۆ ئایندەی بەلاوە قەناعەتبەخش بێت. ئەم وەعد و بەڵێنانە زۆر گرنگ و ئاڵۆز، بەڕەمز و کینایەن و دوورن لە فام و تێگەیشتنی ئینسانەوە. بە مەسیح دەڵێت: "تۆ شتانێکت هەڵبژاردووە، کە لە مەتەڵ دەچن، زۆر ئاڵۆز و بێ سەرو بەرن، ئەم مەسەلانە زۆر لە سەروی توانای بەشەرەوەن." بە دیدو بۆچوونی موفەتیش باشی، تەبیعەتی ئینسان خوازیاری ئەمەیە کە بیترسێنن، بیکەن بە کۆیلە، هەموو ساتێ بیری بخەنەوە کە عیبادەت زەروریە، پێویستە لەسەری ملکەچ بێت. حەزرەتی مەسیح یەجگار نەرم بوو. ڕێگەی دان وەکو دزێک لەخاچی بدەن، خوێنی بەسەر سێدارەوە پرێژن و بە بەرچاوی ژنانی چاو بەگریانەوە گیان بدات. مەسیح کە نەیویست لەڕێگەی پەڕجوو و موجیزاتەوە خۆشەویستی خۆی بخاتە دڵی ئینسانەوە، ئیدی هەموو لێی دوورکەوتنەوەو خۆشەویستی ئەوانی لەدەست دا. مەسیح بە خەڵکی دەگوت: "ئێوە پێویستتان بە خۆشەویستی ئازادانە هەیە، نەک بە کۆمەڵێک هەست و سۆزی کۆیلانەی بابایەکی کۆیلەی ترساو..."

کەواتە مەسیح تەسەورێکی بەرزی دەربارەی ئینسان هەبوو، بەرزتر لەوەی کە ئینسانەکە هەیە. بەڵام وەسوەسەی دووەم، واتە وەسوەسەی دەسەڵات، بەدەست هێنانی دەسەڵات بۆ ئینسان، دەبێ لەڕێگەی سێیەمەوە، واتە لەڕێگەی وەسوەسەی سێیەمەوە کە دەکاتە موجیزات و پەرجوو دێتە دی. واتە ئەم سێ وەسوەسەیەی کە حەزرەتی مەسیح ڕەتی کردبوونەوە، موفەتیشباشی هەرسێکیان قەبووڵ دەکات و بەمجۆرە، کارەکەی حەزرەتی مەسیح ڕاستدەکاتەوە و کارەکەی ئەو لەسەر سێکوچکەی پرەنسیپانی نانی زەمینی، دەسەڵات و موحجیزات و پەڕجوو ڕۆدەنێت. "و تیرەی بەشەر جارێکی دی بەوە دڵخۆش دەبنەوە، کە وەکو ڕان و مێگەلان

ڕابەری دەکرێن و لەبەڵای شوومی ئازادی کە ئەو هەموو ئازارو ڕەنجەی بە دواوەیە ڕزگار دەبن."

بەمجۆرە دیانەتی مەسیحیەت لەجیاتی دیانەتی گروپێکی هەڵبژاردە بیت، دەبێت بە دیانەتی هەموو خەڵکی. کڵێسا سەرپێچی و خیانەت لەخودا دەکات تا خۆشەویستی ئازادی خەڵکی بەدەست بینێ. کڵێسا، حەزرەتی مەسیح بۆ سەقامگیری سیستەمێک بەکار دەبات کە لەوە دەرچووە، سیستەمێکی ڕۆحانی بێت، بەڵکو سیستەمێکی کۆمەڵایەتی وجڤاکیە. کڵێسا "کۆمەڵگەی سوسیالیستی مەسیحی" دادەمەزرێنێ. کۆمەڵێک ئەرکی دیار و بنجبڕ بۆ ئینسان دیاری دەکات، کۆمەڵێک ڕێنمایی بە زمانی بورژازی پێشکەش دەکات و بۆ ئەوەی خەڵکی ڕەش و ڕووتی مەسیحی لەخۆی خڕبکاتەوە و متمانەیان بەدەست بێنێ، بەڵێنی بەخشینی گوناحەکانیان و ژیانی ئەبەدییان دەداتێ. کڵێسا، لە ڕێگای بەرپاکردنی سروود و ڕێورەسمی ئاینی، بەرپاکردنی ئاهەنگ و جەژنان، وەرگرتنی ئیعترافات و بەرپاکردنی سروودێن فەرمییەوە، حوزووری فەرمی خودا بە جەماوەری خەڵکی و ڕەمەکی مەردم ڕادەگەیەنێ. کەواتە دەشێت بگوترێ کە کڵێسا مەفهووم و چەمکێکی کۆنگ و پەنهانی میتافیزیکی بۆ هاودینانی خۆی لە شێوە و فۆڕمی وێنە و خەیاڵاتدا دەنوێنێ. ئەو شتانە لە زەنگان، لە بوخورد، لە تابلۆ و نەخش و نیگاراندا، لە دروستکردنی کۆتەڵ و پەیکەراندا دەیان نوێنێ و نیشانیان دەدات. کڵێسا بۆ ڕاکێشان و ئەفسوونکردنی جەماوەری خەڵک، پەنا وەبەر هەموو هونەرەکان دەبات. بەمە لەقەدری خودا کەم دەکاتەوە، وەکو هەر کاڵایەکی بازرگانی، دەیخاتە بازاڕی کڕین و فرۆشتنەوە. درۆسیانیەکەی و کوفرە سیانیەکەی، بەجۆرێ داڕشتووە و بردوویەتیە دڵی خەڵکیەوە کە هیچ کەسێک بیر لەوە ناکاتەوە نکۆڵی لێبکات. کڵێسا لەوکاتەدا کە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی مەسیح بەکاردەبات، خودی مەسیح ڕەتدەکاتەوە. کڵێسا "دوا بنکەی ئیلحادو خوا نەناسییە." خەڵکی ئامادەن لەجیاتی واز لەو بیر و باوەڕە ئاسانانە بێنن کە موفەتیشباشی بۆی داناون. خودی مەسیح بسوتێنن. موفەتیشباشی دەڵێت: "خەڵکی بەترس و لەرزەوە، وەکو چۆن ڕەوە جووجەڵەیەکی بێدەسەڵات خۆ وەبن باڵی دایکیان دەدەن، بەو ئاوایە پەنا بۆ ئێمە دێنن..." موفەتیشباشی ڕوو لە مەسیح دەڵێت: "ئەگەر کەسێک شایستەی ئەوە بێ بخرێتە ئاگرەوە، ئەو کەسە تۆیت، سبەینێ دەتسوتێنم."

مەسیح لەجیاتی هەر جۆرە بەرسڤ و پەرچەکردارێک، لە موفەتیشباشی نزیک دەبێتەوە و لێوە چرچەکانی ماچ دەکات. موفەتیشەکە، موچوڕکەیەکی پێدا دێت و دەرگاکە دەکاتەوە و دەڵێت: "دەی بڕۆ، جارێکی دی نەگەڕێیتەوە، بۆ ئێرە نەیەیتەوە... هەرگیز.." ئیدی یارۆی زندانی (مەسیح) دەڕوات.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئەمە دووپات بکەینەوە، کە ئەم تەڵاق و جودابیەی نێوان ئاین و کڵێسا، ئەم ناکۆکیە زەقەی نێوانیان، ئیڤانی خوانەناس بەناوی خۆیەوە دەیخاتە ڕوو. بەم پێیە ئەو هێرش ناکاتە سەر حەزرەتی مەسیح بەڵکو هێرش دەکاتە سەر کڵێسا. ئەو بەرگری و داکۆکی لە ئیلحاد و خودا نەناسی

ناکـات، بـەڵکو خۆبـەخۆ و بێئـەوەی بیـەوێت، داکـۆکی لـە ئیمـانی ڕاسـتەقینە دەکات. ئەو لە هەرکەسێکی دی باشتر، سەرنجمان بۆ بەها ئەخلاقیە جـوان و بەرزەکانی مەسیح ڕادەکیشێت. یانی لەم پرەنسیپەمان ئاگـادار دەکاتـەوە کـە خۆبەخۆ بچینە دڵی خەڵکەوە و خەڵکی بە خوایشتی خۆیـان خۆشـیان بـوێین، نەک ناچاریان بکەین خۆشیان بوێین.

بەگوتـەی دوستویفسـکی، تـەنیا تیوکراتیـەتی کاتولیـک کەمتەرخەمـە، (تیوکراتیـەتی: حکومـەت و دەسـەڵاتی دینـی، کـە لەلایـەن پیـاوانی ئاینیـەوە بەڕێوە ببرێـت.) چونکـە گوتـە و ڕێنماییـەکانی حـەزرەتی مەسـیحی دزیـوەو بـۆ نیـازو مەبەسـتێن ئیمپریالیسـتی و بـە قـازانجی خـۆی بـەکاری بـردووە. ئەرتەدوکسـیەتی بیـزانتیش، دەشـێت بەهـەمان تۆمـەت تاوانبـار بکرێـت. لـە ڕاسـتیدا هـەر هـەموو ڕێکخـراوە کڵێسـایی و ئاینیـەکان گازانـدەی ئـەوەیان لەسـەرە کـە پـەیڕەوی سیسـتەمێکی سـەرکوتکارانەی پاشـایەتیان کـردووە. کڵێسـا بـەدرێژایی مێـژووی خـۆی، دژی وەسوەسـەو کەڵکەڵـەی ئـازادی ڕوح وەستاوەتەوە، چونکە بە دیدونۆرینی کڵێسا ئازادی دەگەڵ تەبیعـەتی ئینسـاندا تێکناکاتەوە. وێرای ئەوەش ڕاز و پەرجووی ڕاستەقینەی مەسیح، ڕازی ئازادیـە. ڕەنـج و عـەزابی مەسـیح، تـەنیا لـەپێناوی ئەمـەدا بـووە، کـە ئینسـان ئـازادی هـەڵبژاردنی تـەواوی هـەبێت. ئەگـەر حەقیقـەتی خـودایی بـە تـۆبزی و زۆری سـەرکەوتبا، ئیـدی ڕوحـی ئینسـان، بـۆ دۆزینـەوەی خـواو چـوون بـەلای خـوادا پێویسـتی بـە خۆشـەویسـتی نـەدەبوو. بـەڵام کـاتێ ئـەم حەقیقەتـە خودایـە لەخاچ درا، زەلیل کرا، پارچە پارچە کرا، تفباران کـرا، ئیـدی هـیچ دەسـەڵاتێکی نـەبوو کـە خـۆی بسـەپێنێ. ئینسـان بـەهۆی ئـەوەوە، واتـە ئەشـکەنجەی مەسـیحەوە ئێمـان نایـەنێ، بەخوایشـتی خـۆی ئێمـان دێنـێ. قـەراری ئیمـان هێنـان لەبەرانبـەر ئـەم مەسـیحە مـردووەدا، کـە وەکـو هـەموو مردووەکـانی دیکەیە، کارێکی تەواو ئازادانەیە. دوستویفسکی، بـۆ جـۆرە ئیمـانێکی وا ئـازاد، ئیمـانێکی نـا مـەفهووم و لـەباری لۆژیکیـەوە ناپەسـەند هانمانـدەدات. بـابزانین هەڵوێستی دروستی ئیڤان کارامازورف، بەرانبەر بـە مەسـەلەی خـودا چییـە؟ ئیڤان تەفسیری غەیبانی بۆ دنیا ڕەفز دەکات. هـەموو ئـازار و ڕەنجێکـی تیـرەی بەشەر دێنێتە بەرچاوی خۆی. بـە بۆچـوونی ئـەو پاداشـتی کـردەوەی ئینسـان لەو دنیا، پاکانە نییە بۆ ڕەنج و عەزابی ژیانی ئەم دنیا. دەڵێت: "بۆ کەسێک کـە لەمنـداڵی ڕا تـا دەمرێـت عـەزاب بکێشـێت، چ سـوودێکی هەیـە کـە زاڵمـان و سـتەمکارانی لـەو دنیـا بـە ئـاگری دۆزەخ بسـووتێن یـان هـەر جـۆرە عـەزاب و ئەشکەنجەیەکی دی بدرێن." هەروەها دەڵێت: "جا ئەگـەر دۆزەخێـک هـەبێت، ئیدی میانڕەوی و هەماهەنگی لە سیستەمی خیلقەتـدا چ مانایـەکی هەیـە؟ من دەمەوێ هەموو کەسێک ببەخشـم، لێبوردەبم، ئاشـتیخوازبم. نامەوێ هیچ عەزاب و ئەشکەنجەیەک بۆ تیرەی بەشـەر هەبێ و بمێنێ.".

شـرۆڤەکەی کڵێسـا لەمبارەیـەوە زۆر سـادەیە، بریتیـە لـەم پرەنسـیپەی کـە "شتێک دەدەیـت و لەبەرانبـەردا شـتێک وەردەگریـت." بـەڵام ئـەم پرەنسـیپە و وەڵامە قەناعەتبەخش نییـە. پێویسـت بـە پرەنسـیپێکی دیکـە هەیـە. بـەڵام چ

پرەنسیپێک؟ دەڵێت: "من چۆن بتوانم خودایەک دەرک بکەم، کە زۆر لە ئاستی دەرککردنی من باڵاترە."

بەمجۆرە دەبینین، ئەم کەسە بێباوەڕە، نکۆڵی لە بوونی خودا ناکات، بەڵکو نکوڵی لە ئەگەر و توانای دەرککردنی خودا دەکات. جا ئەم نکوڵی کردنە پڕ جۆش و جدیەی ئیڤان، ناکاتە بێباوەڕی بە خودا – ئەو قسەو جنێوانە، خۆی لەخۆیدا نیشانە و بەڵگەی باوەڕ بوون بە خودایە. نکوڵییەکەی ئیڤان دژی خودای کڵێسایە، دژی خودای فەرمییە، دژی خودای ئیداری و خانەوادەییە، دژی خودا دەستکردەکەی موفەتیش باشیە. ئیڤان ئەوەی پێ قەبووڵ ناکرێت کە خوایەکی بەسەردا بسەپێنرێ. خوایەک کە بەگوێرەی لوژیک و پێوەرە ئینسانیەکان، بێتە سەلماندن – خوایەک کە بەهۆی ئینسانەوە هێنرابێتە ئاراوە. دەڵێت ئەو جۆرە خوایە، بۆ ڕوحی ئینسان قابیلی قبووڵ نییە. "خودا هیچ شتێکی ئەم دنیایی تێدا نییە." ناشێت جگە لە لەگەزێک، مەتەڵێک، چاوەڕوانی و پێشبینییەک یا هیواو ئومێدێک هیچی دیکە بێت – کەچی کڵێسا بە ڕوونکردنەوە و ڕاڤە و شرۆڤە سادە و ساکارەکانی خۆی ئەم ئومێد و لەگەزە دەشێوێنێ، دەیسڕێتەوە. بەڵام کاتێ کە ئیڤان بەم شێوەیە دەگاتە بەر ئاستانەی ئیمان و باوەڕی ڕاستەقینە، لەناکاوا پاشەکشە دەکات و بۆی دەردەکەوێت کە بیرۆکەی خودا، بەشێوەیەکی خۆڕسک لەزەین و ڕوحی سادەی ئینسانەوە چەکەرە دەکات. ئایا خودا ئینسانی دروستکردووە یا ئینسان خودای دروستکردووە؟ ئیڤان حەز ناکات بە ڕوونی وەڵامی ئەم پرسیارە بزانێت. ئیڤان لەبەرانبەر خەڵکی خەتاکار و نامراد و ناکامدا، لە بەرانبەر ئەم خوایەدا کە نایەوێ دروستبوونی خۆی بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، "کارتی چوونە ژوورەوەکەی خۆی ڕەتدەکاتەوە." دەڵێت: "من، ئەمەم پێ قبووڵ نییە. نامەوێ قبووڵی بکەم." بەهەمان شێوەی موفەتیش باشیە ئەفسانەییەکەی، لەپێناوی بەشەریەت دوستیدا، دەستبەرداری خودا دەبێت و چاوپۆشی لێدەکات.

ڕاستە ئیڤان، خودا ڕەفز دەکاتەوە، بەڵام ئەم کارەی بە پەرستنی شەیتان دەشکێتەوە. ئیدی ئیڤان کارامازوف خودی شەیتانە. ئیدی بەدەم حاڵەتێکی ورێنە گۆییەوە وەکو ئەوەیە شەیتان بدینێ و ئەم شەیتانە خودی ئیڤانە، چونکە شەیتانیش وەکو ئەو خودا دەناسێت و وێرای ئەوەش نکوڵی لێدەکات.

شەیتان بە ئیڤان دەڵێت: "کاتێ کە وشەی خوایی (عیسا) لە سەر خاچەکە دوا هەناسەی دا، من لەوێ بووم. لەکاتێکا ڕوحی "دزە باشەکە*"ی لە هەمێز گرتبوو بەرەو ئاسمان دەڕۆیی، من لەوێ بووم. "دزە باشەکە، دەگەڵ عیسادا دوو دزیش لەسێدارەدران. یەکێکیان بەر لە مردنەکەی ئیمانی بە مەسیح هێنا. ئەمەیان بە "دزە باشەکە" ناسراوە. لەوکاتەدا نەمدەویست بەگەڵ کۆرسی سروودخوانەکان بکەوم و دەگەڵ واندا ئاوازی فەتح و سەرکەوتن و شادی بخوێنم... بە حوکمی ئەو ئەرکانەی کە لە ئەستۆمدا بوون، ناچار بووم چاوپۆشی لەم کارە دڵگیرە بکەم. ناچار بووم لە قاڵبە نەنگین و پڕ شەرمەزاریەکەی خومدا بمێنمەوە."

ئیڤان، سەرەنجام لەسایەی بوونی شەیتانەوە، فاکتەر و ئەنگێزە و هۆکارە خوانەناسیەکانی خۆی کەشف دەکات. ئەویش بەهۆی بەراوردکردنی خۆی لەگەڵ خوادا، خۆی بە گەورەتر لە خودا دەزانێت، خۆی لەجێی خودا دادەنێت. بەمجۆرە برا گەورەکەی برایانی کارامازوف، ئەو باوەڕە ڕەتدەکاتەوە کە گوشار دەخاتە سەر ویژدانی. ئیدی لێرەوە، تیمەی مرۆڤی باڵا، سوپەرمان، کە بابەتی دڵخوازی دوستویفسکییە دێتە ئاراوە: "ڕوح و زەینی بەشەر گەورە دەبێت، تا ئاستی غروور و خۆپەسەندی ئەهریمەنانە بەرز دەبێتەوە، ئیدی ئەو سەردەم و زەمانە دەبێت بە زەمان و سەردەمی، بانگەوازی بەشەر خوایی."
وێڕای ئەمەش، ئیڤان لە هەڕەت و هەڕەمەی بێخوایی خۆیدا ئاسوودە و دڵنیا نییە. کاتێ کە شەیتان خۆی نیشاندەدات، ئیڤان، کوپێک چای بەسەردا دەڕێژێ و "وەکو ژنێک" دەری دەکات و تڕۆی دەکات. ئیڤان لە ڕاستیدا خۆی دەردەکات، ئەمەش لەبەر ئەمەیە کە ئینسان زەحمەتە، نکوڵی شتێک بکات، کە بوونی لە ویژدانی خۆیدا بە پێویست بزانێت، (بلیز پاسکال ١٦٢٣ -١٦٦٢، زانا، فەیلەسووف و نووسەرێکی فەرەنسیە، زۆر نووسینی لە وارێن ماتماتیک و فیزیا و فەلسەفە و دیانەتدا هەیە) دەڵێت: "هەندێک دەڵێن چاو بەرەو خودا هەڵێنن. ئەوە ببینن کە لەو دەچن، خوڵقاندوتانی تا بیپەرستن. ئێوەش دەتوانن خۆتان وەکو ئەو لێبکەن. ئەقڵ دەگەڵ ئەودا هاوتاتان دەکاتەوە، ئەگەر دوای ئەقڵ بکەون." و پاسکال بەخۆی دەپرسێت: "ئینسان دەبێت بەچی؟ دەگەڵ خوادا یەکسان دەبێت، یا دەگەڵ حەیواناتدا؟"
بابا زوسیم بەدەم ڕەوتی گشتی ڕۆمانەکەوە دەڵێت: "خەڵکانێک لە دۆزەخدا هەن، سەرباری ئەوەی هەموو حەقیقەتێکیان زانیوە، لە دنیادا زۆر بە غروور و لەخۆبایی بوونەوە ژیاون." ئیڤان یەکێکە لەو کەسانەی کە بەویست و حەزی خۆ بەرەو دۆزەخ دەڕوات. ئیڤان گرێ و نەخۆشی خوای هەیە. ئایا بەو نەخۆشیەوە دەمرێت؟" ئەلیوشا، بەچاوی بەزەیی و ترس و نیگەرانیەوە، سەیری براکەی دەکات. سەرەنجام بە کاوەخۆ، بەوپەڕی هێمنی لێوەکانی ماچ دەکات، وەکو چۆن حەزرەتی مەسیح، ئەمەی دەگەڵ موفەتیشباشیدا کرد بوو. ئەمە تاقە وەڵامێکە کە بابایەکی مەسیحی دەتوانێ بە کەسێکی خوانەناس و بێباوەڕی بداتەوە. چونکە تەینا بە خۆشەویستی، دەکرێت ڕوو بەڕووی لوژیک ببیتەوە. ئیمان شتێک نییە بەلوژیک، یا بە ئامۆژگاری و ئەم بێتە سەپاندن و قەبوڵاندن. گەمژە، بەهیپولیتی دەگوت: "بە بەردەمماندا تێپەڕن و ئەم شادیەمان پێ ڕەوا بدینن و گەردنمان ئازا بکەن."
بە نۆرین و باوەڕی ئەلیوشا، ئەنجام خودا سەردەکەوێت. ئیڤان یا جارێکی دی لەنێو نوری حەقیقەتدا دەژێتەوە، یان لە ژێر باری کوفر و تاریکیدا، دەمرێت و لێدەبێتەوە.
ئیدی ئەلیوشا، دوعاو نزا بۆ براکەی دەکات، چونکە لەم دنیایەدا جگە لە نزاو پاڕانەوە، هیچ ڕێگەیەکی دی بۆ ڕزگاری ئەو نییە.
ئەم ڕۆمانە گەورەیە (برایانی کارامازوف) نەک کورتەو پوختەی هەموو بیرەکانی دوستویفسکییە، بەڵکو میتود و بەرنامەی ڕێبازی بیر و هزرینی

ئەویشە. لە هیچ شوێن و بەرهەمێکی دیکەدا ئەم جۆلانێیەی نووسەر لەنێوان خەیاڵ و واقیعدا، بەم ڕوونیەی کە لەم ڕۆمانەدا ڕەنگیداوەتەوە بەدی ناکرێت. بەڵام نووسەر کەمتر بایەخی بە تەرزی دەربڕین و ڕازاندنەوەی داڕشتن داوە. ئەدی دەربارەی قارەمانانی چیرۆکەکە؟ لە شوێنێکی ڕۆمانەکەدا باسی ئەوە کراوە کە (کارامازوفی) پیر "ژێر چاوە چکۆلەکانی ئاوسا بوون، جۆرە بەدخواییەکیان بەسیمای دەبەخشی، قوورتم و ژێرگەردنی هێندە ئەستوور بوو، حاڵەتێکی شەهوەتپەرستانەی قێزەونی دەدایە." بەڵام ئەلیوشا "باڵایەکی بەرز، قژێکی زەرد، دەموچاوێکی جوان و کەمێ درێژی هەبوو. کوڵمەکانی ئاڵ و گەش، چاوەکانی قاوەییەکی درەخشان و گەش بوون. مەندی و ئارامیەکی زۆر بەسیمایەوە دیار بوو." ئەمە هەموو دیکۆری ڕۆمانەکەیە. بەڵام ئەم دیمەن و وێنانە کە بەکورتی و بەلەز وێنەگیراون، دوای خوێندنەوەی دە لاپەڕەی ڕۆمانەکە، لەبیر دەچنەوە. نووسەر، سیما و ڕوخساری کاراکتەرەکان، فیدای فیکریان دەکات. ئیدی جۆش و خرۆش و هەڵچوون و داچوون و خولیاو کەڵکەڵەی قارەمانەکان، بەجۆرێ زاڵ دەبن، کە سیما و ڕووخسار و باری بەدەنییان لەبیر دەچنەوە. ئێمە لەم ڕۆمانەدا،تەنیاململانێ ،کێشماکێشی فکران دەبینین۰لەم ڕۆمانەدا ، لە دنیایەکدا دەژین کە خەڵکەکەی نەدەخۆن، نە دەخۆنەوە، نە دەخەون. دنیایەک، کە بویەر و ڕووداوە زۆر و زەبەندەکانی، لەماوەی چەند سەعاتێکدا ڕوو دەدەن و بەسەر یەکدا کەڵەکە دەبن. جیهانێک کە خولیا و کەڵکەڵە و پێشبینییە ترسناکەکان، ئەقڵ و دڵی بەشەران فەتح دەکەن، شەو و ڕۆژ لەو دنیایەدا تێکەڵ دەبن، خەڵکی لەم جیهانەدا، بۆیە قسە دەکەن، تا پێش هەر کەسێکی دی قەناعەت بەخۆیان بکەن. ئاژاوە و بێسەروبەری لە هەموو شوێنێک فەرمانڕەوایە، کەس بەکەس نییە. نیگەرانی و دوو دڵی هەموو شوێنێکی گرتووەتەوە. ئەوەی مایەی عەزابی ئەم قارەمان و خەڵکانەیە، نەخۆشی یا ترس لە سبەینێ و ئایندە نییە، بەڵکو خودایە. ئەم بوونەوەرانە بەهۆی تەبیعەتی خۆرسک و داهێنەرانەی خۆیانەوە، لە سەریەشە و کێشە چکۆلە ڕۆژانەکان خەلەسیوون، دەربەست ڕوو بەڕووی "ڕازە سەیرەکەی بوون" بوونەتەوە. بۆیە ژیانی چالاکی وان، پەیوەندی و تەماس دەگەڵ ژیانی خامۆشی دەروونی ئێمەدا پەیدا دەکات. ئیدی ئەم بوونەوەرانە خودی ئێمەین کە لەناوەوە خراوینەتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوە، ئیدی لە ئەنجامی ئەم "جۆرە بینینە"وەیە کە ئەوەی زۆر لە نووسەرەوە نزیکە ناخ و شپرزەیی ناخود ئاگایی قارەمانەکانە و، ئەوەی زۆر لەو دوور دەکەوێتەوە، ڕواڵەت و نمای دەرەوەی ئەم قارەمانانەیە، گۆشت و جەستە و جل و بەرگەکانیانە. دیوی دەرەوەیان بەزۆری تەماوی و شێواو و خەون ئاسایە. کامێراکە لەسەر دیوی ناوەوەمان ڕێکخراوە و جیهانی دەرەوەمان وەکو خەونێک کۆنگ و ناڕوونە. کاتێ جامی وێنەکەمان پێ نیشاندەدەن، وەکو ئەوەی تەمەشای وێنەیەکی ئەشیعەیی بکەین بە ئاستەم خۆ دەناسینەوە.

ئەم وێنەیە یا ئەمجۆرە نۆرینە بۆ پیاوە ژێر زەمینییەکە یا بۆ ناخی ئینسان، تەنیا لەریگەی خۆشەویستی بەجۆشی نووسەرەوە بۆ قارەمانەکانی خۆی دێتە دەربڕین و شرۆڤە. لەتۆ وایە نووسەر بەدەم قەیرانێکی دەروونی یا نۆرە فێیەکەوە، ڕێی کەوتووەتە دنیایەکی دیکە و لەوێوە وێنەی حاڵەتی ئێمەی گرتووە. لەپڕێکداو ڕاستەوخۆ خۆی بە دنیای تاریکستانی بێ لۆژیکی دەروونی ئێمەدا دەکات. چاوەکانی زوو بەو تاریکستانە ڕادێن و هەرچیەک لەو دنیایەدا هەبێت دەیبینێ، تێی دەگات، دروست وەکو چۆن دەتوانرێ ژیانێکی تەواو لە میانەی چەند چرکەیەکدا لەم دنیای خەودا ببینی، کاری ئەم نووسەرەش جۆرە لایەنێکی دەروونی هەیە. واتە دەتوانێت زۆر شیکردنەوەی ورد دەربارەی هیوا و ئاوات و خەم و خولیا و شپرزەیی و پەشێویەکانی دەروونی ئێمە لەبەر پرتەو و تیشکی ڕوناکییەکدا، لەپیش چاوی خۆی بەرجەستە بکات. واتە وەکو نقوموانێک خۆی بەژێر ئاوێکدا دەکات، کاتێ کە بەدەستکەوتێکی فیکری زۆرەوە دووبارە دێتەوە سەرێ و دەیەوێ ئەو ڕووداو و سەربهوورد و چیرۆکەی، کە لە دەرێی شوێنکات و بەدەر لە پرەنسیپی عیلییەت و ناکۆکی، لە هزر و زەینی خۆیدا پەروەردەی کردووە و ڕێکی خستووە، بگێڕێتەوە و نیشان بدات، ناچارە، بۆ خوێنەرەکانی خۆی کە وەکو ئەو شارەزای ئەو ژیان و دنیای دووەمە نین، بەڕوونی و ڕەوانی، بەشێوەیەک کە قابیلی تێگەیشتن بێ، درامای ئەو ژیانی دووەمە بخاتە ڕوو و بەرجەستە بکات. دەبێ کارێک بکات کە ویژدانی نائاگا لەگەڵ ویژدانی خۆدئاگای خەڵکیدا تێکبکاتەوە، واتە ئەوەی لەلاشعورەوە هەڵیدەهێنجێ، لەڕووی شعورییەوە، بێتە قەبووڵکردن و پەسەند بێ، یانی واقیعەتێکی هونەری ئەوتۆ بە لاشعور بدات، لە باری شعورییەوە پەسەند بێ، بەکورتی لاشعور بگۆڕێت بۆ شعور. مەبەست ئەوەیە کە خەڵکی لە حەقیقەتی پەنهانی دەروون و ناخی خۆیان ئاگادار بن و بایەخی پێبدەن.

دوستویفسکی لەکاتێکا لەنێوان خەونە شەخسیەکانی خۆی و واقیعی ژیاندا گیرۆدەیە، هەوڵدەدات، دەستکەوتە فیکرییە بزۆز و سەرنجە وردەکانی خۆی، لە چوارچێوە و قاڵبێکی پتەوی لوژیکی قەناعەتبەخشدا، بخاتە ڕوو. ئەو ڕووداوە خەیاڵییانەی کە لە واقیعەوە دوورن و ئەگەری ڕووداویان لە واقیعدا یا نییە یا یەجگار کەمە، لە ڕۆمانەکانی ئەودا زۆرن. ئەو ڕووداوە زۆرانەی کە ڕۆمانی برایانی کارامازوفیان لێ پێکهاتووە، هەر هەمووی سخ و چڕ کراونەتەوە و لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ڕوو دەدەن. قارەمانانی ڕۆمانەکە، ڕووداوی دوورو درێژی دە لاپەڕەیی دەگێڕنەوە و بە "شێوازی ڕووسی" گفتوگۆ و گەنگەشە دەربارەی خودا دەکەن –سەمردیاسوف کە خزمەتکاری ماڵەکەیە، وەڵامی ناسک و دڵگیری دەداتەوە. دیمیتری زبرو کێوی هاوار دەکات و دەڵێت: "نا، ئینسان یەجگار فراوانە، لەوە فراوانترە کە تەسەور دەکرێت، بۆیە دەبوایە چڕی بکەمەوە." قارەمانەکان وەکو باوە، جۆرە زانیارییەکی پەیامبەرانەیان هەیە، بەهرەی پیشبینیان لەلایە. زوسیم بە ئەلیوشا دەڵێت کە دیمیتری دەبێ چاوەڕوانی چارەنووسێکی تراژیدی بیت. ئەلیوشا کاتێ کە دوعاخوازی

لـە بـابی دەکـات، شــانی مــاچ دەکـات، چونکـە پێشــبینی ڕووداوێکـی گـەورە دەکات. هەستێکی پێشوەختەی لایە.
ئیڤان بۆ چیرماچینی دەڕوات، چونکە هەست بە ڕوودانـی تاوانێـک دەکـات، کـە پێشوەختە زەمینەی بۆ فەراهەم و ساز دەکرێت.
لەم ڕۆمانەدا، خەون، وڕێنە، خـەیاڵات و تـاوان، یـەجگار زۆرو زاڵـە، دراوی هـەرە باو و بە ڕەواجە. نووسـەر بۆ ئەوەی پاکانە بۆ ڕەفتاری قارەمانـەکانی بکـات، زۆر بە وردی پەنا بۆ مەسـەلە بۆماوەییەکان یا نەخۆشـی دەبات. دەڵێت: "بـەڵام نـا، ئەوانە بوونەوەرانی ئاسایی وەکو من و تۆ نـین.. ئەمانـە بەڵانسـیان تێکچـووە!"
هەڵبەتـە نووسـەر، خوێنـەر سـەبارەت بـە ناسـنامەی ئـەو قارەمانانـەی کـە دروسـتی کـردوون فریـو دەدات. جـا بـۆ ئـەوەی وێنەیـەکی ڕاسـتەقینەی قەناعەتبەخش بـە قارەمانـە خەیاڵییـەکانی خـۆی بـدات، زۆر وردەکـاری مـادی بـەکار دەبـات. بـۆ نموونـە، کوشـتنەکەی کارامـازوفی پیرەمێـرد، بـە نەفـەس و وردی بابایەکی پشپۆڕ و شارەزای بواری تاوان، هاتووەتە گێڕانەوە و باسـکردن. پرس و جۆ، لێکۆڵینەوە، مورافەعە و داکۆکییەکان لەلایەن کەسێکەوە ڕێکخـراون کە شـارەزایی تەواوی لە کاری دادگایانی تاواندا هەیـە و زاراوەکـانی ئـەو بـوارە بە دروستی بەکار دەبات. دوستویفسکی دەڵێت: "بـاوەڕ ناکـەم لـە گێڕانـەوەی وردەکارییـەکانی چیرۆکەکەمـدا، دووچـاری هەڵـەی هونـەری بـووبم. مـن لـە سـەرەتاوە، بـۆ وەدەسـتهێنانی شـارەزایی لـەو وارەدا، چوومـە لای دوو قـازی دادگای سان پترسبۆرگ."
دوستویفسـکی وەکـو چـۆن نەیویسـتووە لـەنێوان شـۆڕش و تزارسـیمدا یەکێکیان هەڵبژێرێت، بەو ئاوایەش نایەوێ لە نێوان خـەیاڵ و واقیعـدا یـەکێکیان هەڵبژێرێت، یەکێکیان بکـات بـە مـاڵ بەسـەرخۆیەوە. ئـەو بەلـەمی خـۆی لـەم کـەنارەوە بـۆ ئـەو کـەنار دەڕانـی. خـەڵکی هـەردوو بـەرو هـەردوو کەنارەکەیـە. هـاودژان ئاشـت دەکاتـەوە. هەڵبەتـە ئـەم هونـەرە ئاویتەیـە، کـە مونتـاجێکی هونەریانـەی، جۆرەهـا بەشـی جـۆرا و جـۆرە، چـل دانـە سـاڵی دەویسـت تـا خەڵکی پەی بـە بایـەخی بـەرن و قـەبووڵی بکـەن. چ قەیدیـە؟ گرینـگ ئەوەیـە دوستویفسکی بە ڕۆمانی برایانی کارامازوف گرەوی خۆی بردەوە.

## فەسڵی پێنجەم
## ئاهەنگی ڕێز لێنانی پوشکین

دەرچـوون و بڵاوبوونـەوەی ڕۆمـانی برایـانی کارامـازوف، شـۆرەت و نێوبـانگی دوسـتویفسکی گەیاندە لوتکە. ئیدی لەلای خەڵکی دەگاتـە ئاسـتی تورگینیـف و تولسـتوی و بگـرە لـە تورگینیـف و تولسـتوی پتـر ڕوویـان تێـدەکرد و خۆشـیان دەویست و ستایشیان دەکرد.

لە گەنجێتیدا هیچ خێرو خۆشیەکی لەخۆ نەبینی. یا زیندان و تاراوگـە بـوو، یـا نەخۆشـی، یـا قومـار، قەرز، دەسـتکوتی و نـەبوونی یـا نووسـین بـە گـوێرەی ڕاستەو پرگـالی بڵاوکـراوەو ڕۆژنامـەکان بـوو. ئێسـتا هـەموو ئـەم ئەزموونـەنای تێپەڕاند بوو، وەکو ئەوە وابوو، لە دۆڵێکی پڕ قوڕاو وسییانەوە هاتبێـت و لـەناکاوا شـەکەت و ،مانـدوو، سـەراپا خـوێن، گەیبێتـە دەشـتێکی هـەموار و ڕزگـاری بووبێ بەڵام تەواو پیر بوو بوو، ئەم ئارامییە لـەناکاوە، بەڕاسـتی نزیکبوونـەوەی مەرگی ئەوی ڕادەگەیاند. نزیکەی حەوت دانە ساڵ بوو، بە دەسـت نەخۆشـی ئاوسـانی سـپەلاکەکانی و هـەوی بـۆری هەناسـەوە دەینالانـد، کـە لـە خەسـتەخانەکانی شـاری ئـیمس دا، نـەیانتوانی بـوو چارەسـەری بکـەن. لـە سەرەتاوە نەخۆشـیەکەی بـە هەنـد وەرناگرێـت و بـە نەخۆشـییەکی سـووکی دەزانێ. بەڵام وردە وردە نیگەرانی دەکات و لە نامەکانیـدا بەشـێوازێکی تونـد و تـووڕە باسـی دەکـات "بەشـێک لـە سـپەلاکم لـەجێی خـۆی خزیـوە. دڵیشـم ئاسـایی نییـە. هـەموو ئەمانـە بـەهۆی ئاوسـانی سـییەکانمەوەیە."... "مـن هەمیشـە بیر لە ئاینـدە دەکەمـەوە، بیـر لـەوە دەکەمـەوە چـۆن موڵکێـک بکـڕم. باوەڕ دەکـەی ئـەوە بـووە بـەخم و خولیـام؟ نیگـەرانی ئاینـدەی منداڵـەکانمم".

"هەموو خەڵکی بە دەوڵەمەندمان دەزانن، بەڵام باوەڕ بکە هیچمان نییە."

دۆستویفسکی لەم کارە گەورەیەدا هەر ئەوەندەی دەستکەوتبوو کـە قـەرزی ژمارەیـەکی زۆر لـە خـاوەن قـەرزان بداتـەوەو سـەر بەسـەر دەربچێـت. پـارەی پێویسـت بـوو، پارەیـەکی زوو بـە زوو. ئیـدی هاوسـەرەکەی خێـرا، کتێبفرۆشییەکی کردەوە، ئـەم دوکانـە لـە سـەرەتاوە خێـر و دەسـکەوتی بـاش بوو. بەڵام فیدور بیری لەوە دەکردەوە، کە درێژە بە بڵاوکراوەکەی خـۆی (ڕۆژانـە یاداشـتەکانی نووسـەرێک)بدات و لەنوێ دەری بکاتـەوە. هـەروەها لـە خـەیاڵی

ئەوەدا بوو بەشی دووەمی ڕۆمانی برایانی کارامازوف کە چیرۆکی ئەلیوشا و ڕەمزو نموونەی کەسێتی ڕووسیای تازە بوو، بنووسێت.
ئەلیوشا، کە ڕووسی گەنجە، دەگەڵ دیمیتریدا کە ڕووسی پیرە ناکۆکە، بەینی دەگەڵ ئیڤاندا، کە مایلە بەلای ئەوروپایی بووندا، خۆش نییە.
ئەم رووسە گەنجە، بەگوێرەی ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی زوسیمی پارسا، ئەمنیەت و سەلامەتی خۆی لەم دنیایەدا دابین دەکات و لەنێو خەڵکیدا بانگەوازی ڕزگاری دەدات.
دوستویفسکی لە گەنگەشە و گفتوگۆ و مشت و مڕێکی گەرمدا دەگەڵ کۆنت ملیکور دو ڤوگەدا ڕایدەگەیەنێت کە میللەتی ڕووس، لە هەمان کاتدا هەم بلیمەتی هەر گەلێکی دیکە و هەم بلیمەتی تایبەتی خۆی هەیە.(کۆنت ملیکور دو ڤوگە: مەبەستی نووسینی ڕۆمانێکی ڕووسیە بە شێواز و ستایلی کاندیدەکەی ڤولتیر.) بۆیە میللەتی ڕووس دەتوانێ لە هەموو میللەتان بگات، بێئەوەی هیچ میللەتێکی دی بتوانێت دەرکی بکات و لێی تێبگات.
دیارە ئەم غروور و کبریا نەتەوەییەی دوستویفسکی، لەلایەن دەسەڵاتداران و کاربەدەستانی باڵای وڵاتەوە زۆر جێگەی پەسەند و ڕەزامەندی بوو. دوای ماوەیەکی کەم، لەسەر داوای دوستویفسکی، وەزیری ناوخۆ، ئەو چاودێریە نهێنییەی، کە لەوەتای دوستویفسکی ئازاد بوو بوو و لە تاراوگە گەڕابووەوە، خرابووە سەری، لادەبات.
دوستویفسکی لە ٢٤/ک١/١٨٧٧دا، لە دەفتەری یاداشتەکانی خۆیدا ئەمانە تۆمار دەکات: ١-نووسینی کاندیدی ڕووس، ٢-نووسینی بیرەوەیەکانم. ٣-نووسینی کتێبێک دەربارەی مەسیح، ٤-نووسینی قەسیدەیەک بۆ سوروکوڤین. سەرنج: ئەنجامدانی ئەم کارانە بەلای کەمەوە دە ساڵی دەوێت و من ئێستا تەمەنم پەنجاو شەش ساڵە."
لە مانگی ئاياری ساڵی ١٨٨٠دا "کۆمەڵەی هاوڕێیانی ئەدەبیاتی ڕووسی" دەعوەتنامەیەک بۆ دوستویفسکی دەنێرێت و تکای لێدەکات. کە بە وتارێک بەشداری لە ئاهەنگی پەردە لەسەر لادانی پەیکەرێکی پوشکین بکات – ئاهەنگ و ڕێو ڕەسمەکە لە مۆسکۆ بەرپادەکرێت. بە نۆڕین و دیدی دوستویفسکی پوشکین و گۆگۆل، مامۆستای هەموو سەردەمەکان بوون و بە دوو مامۆستای بێچەند و چوونی خۆیی دەزانین. ئایا هەر "هیرمان"ی کاراکتەری ڕۆمانی "بی بی پیک"ی پوشکین نەبوو، کە ئیلهامی راسکولنیکوفی بەم بەخشی بوو؟ ئایا هەر شەیتانی پوشکین نەبوو کە بیرۆکەی گشتی و ناونیشانی ڕۆمانی شەیتانەکانی بە دوستویفسکی بەخشی بوو؟ ئایا هەر مەنەلۆگەکانی سوار چاکە پیسکەکەی پوشکین نەبوو، کە بوو بوو بە ئیلهامبەخشی دالگوروکی قارەمانی ڕۆمانی هەرزەکار کە بەو ڕادەیە ئاشقی پارەو دەسەڵاتی بێپایان بێت؟
دۆستویفسکی، جۆرە خۆشەویستی و سۆزێکی بەغیلی ئامێزی بەرانبەر بە پوشکین هەبوو. دەترسا، وتار خوێنەکان، هەقی خۆی نەدەنێ، غەربگەراکان، وەکو نموونەیەکی گەش و گەورەی ئەوروپایی باس و

ستایشــیان دەکــرد. سلاڤدۆســتەکان هەرچەنــدە حــەزیان دەکــرد وەکــو ڕووسیەکی مەزن لە قەڵەمی بدەن، بەڵام زاتیان نەدەکرد بەو ڕادەیە بچووکی بکەنەوە، لە قاڵبی ڕووسیای بدەن. هەموو چاوەڕوانی ئەوە بوون کەسێک بێت و ئـەم دوو گروپـە لێکـدی نزیـک بکاتـەوە و پێکیـان بێنـێ. دوستویفسـکی وای هەستدەکرد، کە ئەو بۆ ئەو ئەرک و بۆ ئەو وشەیە بانگهێشتکراوە.

بەڵام هاوسەرەکەی لەم سەفەرەی مێردەکەی لە ستارا یاروساوە بۆ مۆسکۆ نیگەران بوو. فیدور، زۆر شەکەت و ماندوو بوو، سییەکانی نەخۆش بوو. بەگوتەی پزیشکان نەخۆشیەکەی زیادی کردبوو هەڕەشەی لە ژیانی دەکرد.

ئانا گریگوریڤنا، لەمبارەیەوە دەڵێت: "سـنیتکین ی پـس مـامم بـۆی گێرامـەوە وگوتی: موو لولەکانی ئەوەندە لاواز و سست بوون، کە لەگینـە، بـەهۆی هـەر جووڵەیەکی بەدەنیەوە بپچڕێن." دوستویفسـکی زۆری حـەز دەکـرد، ژنەکـەی لەگەڵیا بۆ مۆسکۆ بڕوات. بەڵام خەرجی سەفەرەکە و مانـەوەیان لـە مۆسـکۆ، لە توانای دارایی ئەواندا نـەبوو. ئیـدی لەبـەر بێپـارەیی ئانـا لەگـەڵ مێردەکەیـدا ناڕوات، بەو مەرجەی فیدور، ڕۆژانە لەوەزع و حاڵی تەندروستی خۆی ئاگـاداری بکاتەوە و نامەی بۆ بنووسێت.

دوستویفســکی هەرکــە گەییــە مۆســکۆ، زۆر بەگــەرمی لەلایــەن گروپــی سلاڤدۆســتانەوە، پێشــوازی کــرا. ئاهــەنگێکی گــەورەیان بــۆ گێــڕا. ناوەنــدە ڕۆشنبیری و فیکریەکان، بـە پەرۆشـەوە چـاوەڕوانی هـاتنی ڕۆژی ٥/٢٦ بـوون، کە ڕێکەوتی ڕۆژی لەدایکبوونی پوشـکین بـوو و بـەگوێرەی قەراری نووسـەران، دەبوایە ئاهەنگ و کۆڕەکە لـەو ڕۆژەدا بگێردرێـت. بـەڵام شـابانۆ بەچەنـد ڕۆژێـک پێش ئەو مەوعیدە کۆچی دوایی کـرد، ئیـدی بـۆ مـاوەی دوو هەفتـە، ماتـەمی گشتی، بەفەرمی ڕاگەیەنرا. دوستویفسکی کە دڵی لـەلای کارەکـانی و مـاڵ و منداڵـەکانی بـوو، حـەزی دەکـرد بـۆ ستارایاروسـیا بگەڕێتـەوە. لەسـەرەتادا ویستی لەپایتەخت وەدەربکەوێ، بەڵام دۆستەکانی پێیان گوت ئەمـە کـارێکی نەنگینە و بە پاشـەکشـە و پاشگەزبوونەوە لە قەڵـەم دەدرێـت. ئیـدی نامەیـەک بۆ هاوسـەرەکەی دەنووسێت: "دەڵێن، ئەوەندەم شـەهامەت و جورئـەت نـەبوو کە چەند ڕۆژێک کارەکـانی خـۆی لەبـەرخاتری بۆنەیـەکی وەهـا گـەورە بـەجێ بێڵێ و فەرامۆش بکات." ئیدی مانەوەی لە مۆسـکۆ بۆیـە زەروری بـوو، چونکـە دەرفەت و دەلیڤەیەکی باش بوو بۆ ئەوەی بەرگری لـە بۆچـوونی (ڕووسـیای – ئەوروپایی) خۆی بکات، کـە سـی دانـە سـاڵ بـوو لـە پێناویـدا دەخـەبتی. لـەو بارەیـەوە دەنووسـێت: "گروپـی ڕەقیـب (تورگینیـف، کوڤالوڤسـکی و تەقریبـەن هـەموو زانسـتگا) لێبڕاوانـە گەرەکیانـە بـە نکـۆڵی کردنـی پرەنسـیپی نەتـەوە پەروەری، بایەخ و پایەی پوشکین وەکـو نموونەیـەکی نەتـەوە پـەروەری ڕووس، بێننەخوارەوە و ئێمە لە هەنبەر ئەوانـدا جگـە لـە ئاکسـاکوف کەسـی دیکـەمان نییە. بەڵام ئیڤان ئاکساکوف، پیرەو، مۆسکۆ بەشی خۆی لـەو پیرانـەی تێدایـە و بگـرە لێشـیان وەڕز بـووە. بـەڵام سـەبارەت بـە مـن، هێشـتا مۆسـکۆ گـوێی لەقسەی من نەبووە، منی نەبینیوە، حاڵی حازر هەموو چاویان لە منە."

ئیدی لەبەر ئەو هۆیانە لە مۆسکۆ دەمێنێتەوە. بەڵام ئایا پارەی ئوتێلی پێیە؟ لێ هاوڕێکانی دڵنیای دەکەن، کە شارەوانی هەموو مەسرەفێکی مانەوەی لە مۆسکۆدا، دەکێشێت. دوستویفسکی زۆر ماندوو و بێزارە. دەنووسێت: "من تا ئێستا دووجار لە قاوەکەم ناڕازی بووم و گیراومەتەوە تا بۆمی خەست بکەنەوە! دەبێ بەڕێستۆرانەکە بڵێن، پێویستە جۆری جیاوازی قاوەیان هەبێ و هەر جۆرەیان بە نرخی خۆی حیساب بکەن."

بەگویرەی دوا هەواڵی سان پترسبۆرگ، کردنەوەی ئاهەنگەکە بۆ سەرەتاکانی مانگی حوزەیران دوا دەخرێت. ئیدی نوینەرەکان، بەدەم چاوەڕوانی هاتنی هەیقی حوزەیرانەوە، ئەمە بە دەرفەت دەزانن و دەکەونە سەردان و دیدەنی دۆستانەی یەکدی و دەعوەت و دەعوەتکاری و دیالۆگ و بیروڕا گۆڕینەوە و چۆنیەتی بەڕێوە چوونی ئاهەنگەکە.. دوستویفسکی بۆ هەموو ئەو کۆڕ و مەجلیسانە دەعوەت دەکرێت و بەڕێز و حورمەتەوە پێشوازی دەکرێت. خۆیشی سەری لەم پێشوازیە گەرم و گورانە دەسوڕمێ. لەمبارەیەوە دەنووسێت: "زۆریان لەبارەی گەورەیی منەوە، گوت، جارێ وەکو هونەرمەند، جارێ وەکو هزرڤانێکی جیهانی، جارێ وەکو ڕۆژنامە نووس، جارێ وەکو ڕووسێکی بێغەل و غەش."

زۆر ساکارانە، ستایشی ئەو شوێنانە دەکات کە بۆی دەعوەت دەکرا، باسی زۆری و هەمە جۆەی ئەو خواردنانە دەکات کە بۆی داوا دەکرا و دەهێنرا. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "بەڕاستی شامێکی یەجگار فاخیر بوو. ئەم زیافەتە لە هۆڵێکی تایبەتیدا پێشکەش کرا. (بێگومان مەسرەفێکی زۆری تێچووە) دەعوەت و زیافەتێکی یەجگار بەئەتەکێت بوو، دوای نانخواردن، بەدەم قاوە و خواردنەوەوە، دووسەد جگەرەی یەجگار نایاب و گران قیمەتیشیان هێناو دابەشیان کرد. بەڵێ لێرەدا وەزعەکە جیاوازە، ئەوە نییە کە لەسان پتروسبۆرگدا هەیە. دە گوتارا بە بۆنەی پێشواز منەوە، خوێنراوەتەوە کە هەندێکیان زۆر درێژ بوو.) ئیدی تا کاتی دەست پێکردنی ئاهەنگەکە نزیکتر دەبووەوە، چالاکی و جۆش و خرۆشی گروپە ئەدەبییەکان زیاتر دەبوو. ڕۆژ بە ڕۆژ هەڤرکی و ڕکابەری نێوان هەوادارانی سلاڤیەت و هەوادارانی ڕۆژئاوایی، ئاشکراتر دەبوو. کاتکوف، سەرۆکی بزوتنەوەی ڕاستڕەوی، بەهۆی ئەوەوە کە لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا (هەواڵی مۆسکۆ) هەواڵی ئاهەنگەکەی بڵاو نەکردبووەوە، بۆ ڕێورەسم و ئاهەنگەکە دەعوەت ناکرێت. ئیدی لایەنگرانی تورگینیف، بە نیازی پروپاگەندە بۆ سەرۆکەکەی خۆیان، دەعوەتنامە بۆ خەڵکانێکی زۆر دەنێرن و جەماوەرێکی زۆر بەمەبەستی قەرەباڵغی و بانگەشە و چەپڵە لێدان کۆدەکەنەوە. دوستویفسکی لەمبارەیەوە دەنووسێت: "من لەوە دەترسم، لەماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا، بەهۆی هەڤدژی و ناکۆکی بیروباوەڕەوە کار بگاتە شەڕ و کوتەککاری."

لە ڕۆژی پێنجەمی حوزەیراندا ئاهەنگی ڕێز لێنانەکەی پوشکین، بەمۆزیکایەکی شکۆدارەوە دەکرێتەوە، دوای تەواوبوونی ڕێورەسمی موزیقا، دوستویفسکی دەچێت بۆلای مەدام سوڤورین و لێی دەپرسێت: "کاتێ کە

من مردم، لە ڕێورەسم و تازیەکەمدا بەشداری دەکەیت، نوێژ و نزام بۆ دەکەیت، وەکو ئەمەی کە بۆ پوشکینت کرد؟"
ڕۆژی پاشی، نوێنەرانی نووسەرانی ڕووس، تاجەگوڵینەکانیان لەپای پەیکەرەکەی شاعیر پۆشکین دادەنەن. پاشان کۆبوونەوەیەکی ئەکادیمی لە یەکێک لە کۆلیجەکانی زانستگەی مۆسکۆ دەکرێت و ڕاگری کۆلیجەکە ڕایدەگەیەنێ کە تورگینیف بە ئەندامی فەخری زانستگە وەردەگیرێت. ئیدی خوێندکارەکان دەکەونە هوراکێشان بۆ ڕۆمان نووسی پیرو، بەوەی دەزانن کە بەڕاستی "شایستەی ئەوەیە، جێگای پوشکین بگرێتەوە."
ستراخوف بەو بۆنەیەوە دەنووسێت: "چونکە تورگینیف لەم کۆڕ و ئاهەنگەدا، گرنگترین نوێنەری گروپی هەوادارانی رۆژئاوا بوو، تەسەوری ئەوە دەکرا ئەم بزوتنەوە ئەدەبییە، گرینگترین ڕۆڵ بگێڕێت و لەو ململانێ فیکریەدا کە تەسەور دەکرا لە ئان و ساتدا ڕوو بدات، سەرکەوتن بەدەست بێنێ."
دوای کۆبوونەوەکەی زانستگە، نوێنەرەکانی چوون بۆ ئەو زیافەتەی کە شارەوانی لە "یانەی خانەدانان"دا سازی دابوو. هەر هەموو، خواردنەوە و قسە و گفتوگۆیەکان بەیادی پوشکینەوە بوو، بەڵام کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد، باسی پێگەی ئەدەبی پوشکین بکات و باسی ئەوە بکات کە پوشکین بۆ میللەتی ڕووس دەکاتە چی. شەوێ دوستویفسکی لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا، دیمەنی (پیمن) کەشیش دەخوێنێتەوە و ئیدی دەنگی چەپڵەڕێزان و ستایشی ئامادەبوان بەسەر دەنگی ئەودا زاڵ دەبێت. لەو بارەیەوە دەنووسێت: "بەڵام تورگینیف کە زۆر خراپی خویندەوە، لە من زیاتر چەپڵەی بۆ لێدرا و داوایان لێدەکرد کە دووبارە بیخوێنێتەوە."
لە ماوەی پشووەکاندا، خانمان بەرەو لای فیدرو دەچوون و هاواریان دەکرد: "تۆ پێغەمبەری ئێمەیت. ئێمە لەدوای خوێندنەوەی ڕۆمانی برایانی کارامازوف، وەزعمان باشتر بووە." بۆ ڕۆژی دوایی ٦/٧، کۆڕی شکۆداری (کۆمەڵەی دوستانی ئەدەبیاتی ڕووسی) لەهەمان "یانەی خانەدانان" بەسترا.
تورگینیف، لە بەرانبەر جەماوەرێکی گەورەی گوێگراندا، کە ئامادە بوو، بەهەرە نرخێ بووە داشداری و پشتیوانی لێبکەن، کەوتە قسە کردن. چۆن دەکرا ئەو قەدو قەڵافاتە بڵندەیان بەو ڕدێنە چەرموو و ڕوخسارە میهرەبان و ماندووەوە خۆش نەوی. جم و جوڵ و ڕەفتاری سەنگین و بەویقار، قسەکانی ناسک و جوان و هەڵبژاردە، تامی مۆسیقایان دەدا، بەڵام خۆی لەو مەسەلە هەستیارانە دەبوارد کە کێشەیان لێدەکەوتەوە: "ئایا پوشکین شاعیرێکی نەتەوەییە، نوێنەری بلیمەتیی نەتەوەکەی خۆیەتی؟"
تورگینیف دەڵێت: "من ناتوانم شتی وا بسەلمێنم، بەڵام ڕێگەش بەخۆ نادەم نکوڵی لەوە بکەم." بەخوێندنەوەی چامەیەکی نیکراسوف، شاعیری شۆڕشگێڕان، کۆتایی بە وتارەکەی خۆی دێنێت.
دیارە ئەم مانۆڕ و تەکتیکە زیرەکانەیە، دوستویفسکی توورە دەکات. زۆر لەو هورا وچەپڵەڕێزانە پەست دەبێت کە پێشوازی قسەکانی ڕەقیبەکەی پێدەکرێت. چونکە تورگینیف لەو ڕۆژەشدا، وەکو جاری جاران هەر نەیاری بوو،

وەکو ئەوە بوو ئەم ئاهەنگ و ڕێزلێنانەی پوشکین بووبێ بە مەیدانی ململانێـی دوو پیاو، دوو جۆرە بیرکردنەوە، ئیدی لێـرەدا پوشـکین بـوو بـوو بە بیـانوو بـۆ ئەو ململانێیە. دوستویفسکی دەنووسێت: "تورگینیـف، نـایەوێ نازنـاوی شـاعیری نەتەوەیـی بە پوشـکین بـدرێت وئەمەش سـووکایەتی کـردنە بە پوشـکین." دەربـارەی لایەنگرانـی دژمـنەکەی دەڵێـت: "کۆمەڵێـک گەجەر و گـوجەری بەکرێگیراون و هیچی دی، بەڵام داشدارەکانی مـن، لایەنگرانـی ڕاسـتەقینەی بیروبـاوەڕی مـنن." شـەوێ، دوستویفسـکی کە ڕاوبۆچـوونی خـۆی دەربـارەی پوشکین دەردەبڕێت، زۆر بە گەرمی لەلایەن جەماوەرەوە پێشـوازی دەکرێـت و کەمێک سوکنایی دێـت. بەڵام بـۆ ڕۆژی پاشـی، وا هەسـتدەکات کە پێویسـتە تـۆڵەی ڕاسـتەقینەی خـۆی بکـاتەوە. بەهەرحـاڵ کـۆڕی دووەم دەخـرێتە ڕۆژی ٧/٨، قەرار بوو سکاکوف، لەپێش دوستیوفسـکیدا وتـارەکەی خـۆی پێشـکەش بکات. بەڵام دوای ئەوەی گۆڕانکارییەکی کوت و پڕ لە بەرنـامەی کـۆڕەکەدا ڕوو دەدات، دوسـتویفسـکی، یەکەم کەس وتـار پێشـکەش دەکـات. هـۆڵەکە لە ئامادەبووانـدا جـمەی دەهـات، دنیـا گەرم بـوو. هەرکە جـۆش و خرۆشـی ئامـادەبووان دامرکـایەوەو لە جۆشـکەوت. زۆربەی گوێگرەکـانی دوێنـێ، بۆیـان دەردەکەوێت کە تورگینیـف لە وتارەکەیـدا، سـەبارەت بە پوشـکین کەمێـک بـێ لـوتفی و کەمتەرخەمـی کـردووە. ئەدی دوستویفسـکی چ دەڵێـت؟ ئایـا دەتوانێـت، پـایەو پـێگەی ڕاسـتەقینەی پوشـکین دیـاری بکـات و هەقـی خـۆی بـداتێ؟ چەنـد دەقـیقەیەک تێـدەپەڕێ، تریبـوٚنەکە خـاڵییە، لەناکـاوا دوستویفسکی دەردەکەوێت، لەوێندەر، لەپشت تریبـۆنێکی گەورەوە، بەرانـبەر بە جەماوەرێـک کە هـورای بـۆ دەکێشـن، ڕاوەسـتاوە. سـەروسـیمای ڕەش داگەڕاوی، پڕ چرچ و لـۆچی، مانـدووی بـۆ جەمـاوەرە هـاڕوژاوەکە دادەنەوێنێـت. دەڵێی داهۆڵە و جلی لەبەرکراوە. کاغەزەکـانی بەدەسـتە گەورە و قـامکە لاواز و ڕەق و تەقەکـانی گرتبـوو. چـاوەڕوان بـوو، تـا غەڵـبە غەڵـب و دەنـگە دەنگـی جەمـاوەرەکە بنیشـێتەوە. بەشـەرمێکەوە داوای بێـدەنگی لە جەمـاوەرەکە دەکات. سڵاو لە جەماوەرەکە دەکات، دەسـتێ بە ڕیشـە سـوورەکەیدا دێنـێ. پاشـان، لە نامەیەکیـدا بـۆ هاوسـەرەکەی، لەمبـارەیەوە دەڵێـت: "سـەرکەوتنەکانی مـن لە سـان پترو سـبۆرگدا، لەچـاو ئەم سـەرکەوتنانەی ئێرەدا هیچ نین. سفرن."

سـەرەنجام ئامـادەبووان بێـدەنگ دەبـن، دوستویفسـکی دەسـت بە خوێندنەوەی وتارەکەی خۆی دەکات، سەرەتا بە دەنگێکی نزم و گیـراو دەسـت پێـدەکات و، بەرەبەرە دەنگـی بەرز دەبێـتەوە و بـاڵ بەسـەر هەمـوو هـۆڵەکەدا دەکێشـێت. ئەم پیـاوە نەخۆشـە، ئەم پیـاوە پیـر و ژاکـاوە، ئەو هێـز و تـاقەتەی لەکـوێ بـوو کە لەپشـت تریبـۆنەکەوە، بەو دەنـگە دلێـرەوە هـاوار بکـات؟ چ هێزێکی سـەیر، ئەم جەسـتە لاوازەی بەو ڕادەیە هێنـابووە جـۆش؟ نیگـای بەو ڕادەیە گەشاندبووەوەو، ئیلهامی ئەو قسانەی پێبەخشی بوو؟

دوستویفسـکی، وەکـو تورگینیـف، خـۆی لەباسـی کێشـە سـەرەکیەکەی پوشکین نەدەبوارد. پوشکین دەکاتە چـی؟ پوشـکین دەیکـردە نـوێنەری گیـانی

میللەتی خۆی، بە زەبری بەهرەداری خۆی، بە زەبری بلیمەتی خۆی، سنوری نەتەوەیــی بەزانــدبوو و  بــوو بــوو بەزمانحــاڵی هەمــوو نەتەوەیەک. پوشــکین دەیکردە ڕووسیا، بە ناسنامەی جیهانییەوە. ئیتاڵییەک بە هەمان شێوە باســی شەکسپیر دەکات کە ئینگلیزێک باسی دەکات. جا پوشکینیش شـتێکە ئاوها. ئایا پوشــکین لە "دون جـوان"کەیـدا بابـایەکی ئەسـپانی نیـیە؟ لە "زیافەتێـک لەکاتی تـاعوون"دا بابایەکی ئینگلیـز نیـیە؟ لە "بـوریس گودونـوف"دا بابـایەکی ڕووس نیـیە؟ لە فاوســتەکەی خۆیـدا بابــایەکی ئەڵمــانی نیـیە؟ لە لاســایی کـردنەوەی قورئانـدا کەسـێکی عەرەب نیـیە؟ بەڵـێ هەمـوو ئەمـانەیە، و بـۆیە دەتوانێ هەموو ئەمانە بێـت چـونکە ڕووســە. دوسـتویفسـکی بـۆ جـاری دەیەم هەمـــان بـــابەتی کـــۆنی، کە لە ڕۆژنامەکانیـــاو لە ڕۆژانە یاداشـــــتەکانی نووسەرێکدا، خستوبوویە ڕوو، دووپـات دەکـاتەوە: مانـاو مەدەلـوولی ئینسـانی ڕووس، زۆر بەڕوونــی و ڕاشــکاوی، ئەوروپــایی و جیهــانی بــوونە. یـانی هەر ڕووسێکی ڕاستەقینە بگریت (ئەم قسـەیەم بـکەنە گـوارە و لەگـوێی بـکەن تـا لەبیرتـان نەچێـت) دەکـاتە بـرای هەمـوو تیـرەی بەشــەر، یـا بە گـوتەیەکی دی دەکـاتە نـوێنەری هەمـوو تیـرەی بەشــەر، هەر هەموویـان لە شەخسـسـیەتی خۆیدا کۆدەکاتەوە. هەر هەموو میللەتـانی کـۆنی ڕۆژاوا لای میللەتـی گەنجـی ڕووس ئـازیزن و میللەتــی گەنجـی ڕووس ئەو مـیللەتە کۆنـانە ڕزگـار دەکـات. چــونکە میللەتــی ڕووس، بە بەرەکەتــی هــۆش و ئەقڵــی خــۆی، وەکــو دوا پەناگەی حەزرەتی مەسیح دەمێنێتەوە. "بۆچی ئێمە ئەو خەڵـکە نەبـین کە دوا پەیقی حەزرەتی مەسیح دەپارێزن؟"

بایەخی لۆژیکی وتـارەکە، کەمتـرە لە کـاریگەریی ئەو حەماسـەی کە نووســەر بەدەم خوێنــدنەوەیەوە دەی نوانــد.. دوسـتویفســکی بە جــۆش و خرۆشــێکی ســەیرەوە دەیخوێنــدەوە. هەرکە هەڵوەســتەیەکی دەکــرد، هــاوار و هــورای خەڵـکەکە وەکـو هەورە گـۆڵە لە هـۆڵەکەدا دەنگـی دەدایەوە. کـاتێ کە هـاتە سـەر باسـی تاتیانای پوشـکین، کە بـاڵاترین نمـوونەی کیـژی ڕووســە، ژنـان لە شادیدا، دەنگیان دەخسـتە پـاڵ دەنگـی پوشـکین و هـاواری شـادیان لـێ بەرز دەبووەوە:

"شـەرم لەخۆ بکە ئەی پیاوی مەغروور<br>جارێ، پێش هەموو شـتێک غرووری خۆت بشکێنە<br>حەیاو شـەرمت بەخۆبێ ئەی پیاوی سـووک<br>پێش هەموو شـتێک<br>کەمێک زەحمەت بەو ئەرزەوە بکێشـە<br>کە دای دەچێنی."

پیاوەکـان، بەخۆشــیەکی دەروونــی ئەوتــۆوە، وەکــو ئەوەی گــوێ لە گوتـاری خوتبەخـوێنێکی ئـاینی بگـرن، بەو ئـاوایە گوێیـان دەگـرت و سـەریان دادەنوانـد. دوسـتویفسکی، کە دیقەتی دا جەماوەری گوێـدێران لە مەبەسـتەکەی حـاڵی بوون، لێی تێگەیشـتن، هەر هەموو ئەم سیماو ڕوخسـارە نـیگەران و نەناسـانە پشــتیوانی دەکەن و قســەو بۆچوونەکـانی دەســەلمێنن هەســتی بە نەشــەو

گەشــەیەکی لەڕادەبەدەر دەرکــرد، هەســتی دەکــرد، بەســەریاندا زاڵ بــووە. لەنامەیەکیــدا بــۆ هاوســەرەکەی لەمبــارەیەوە دەڵێــت: "هەر هەمــوو ئەمە لە ســۆنگەی ڕۆمــانی کارامــازۆفەوەیە" ســەرەنجام بەم ڕســتەیە کۆتــایی بە وتارەکەی دێنێت: "پوشکین لە هەڕەتی گەنجیدا، لە تافی شکۆفایی خۆیدا مرد، بێگومان، نهێنییەکی مەزنی لەگەڵ خۆیدا بردووەتە گۆڕەوە. جا ئێستا لەسەر ئێمەیە کە هەوڵبدەین، لەدوای خۆی ئەو ڕازە کەشف بکەین و پەی پێبەرین."

هەنگــێ وەســتا، ڕوخســاری زەرد هەڵــگەڕا، ئــارەقە لە لۆچکەکــانی دەموچــاویەوە دەچــۆڕایەوە و چاوەکــانی هــاواری مانــدوویەتیان پێــوە دیــاربوو. هەمــوو خەڵــکەکە بەرانــبەر بەم پەیــکەرە تێکشــکاوە بەدەم هــاوارەوە خرۆشــابوون.. ژن و پیــاو، هەمــوو لەنــاو هــۆڵەکەدا هەســتابوونە ســەر پێیــان، چەپڵەیــان دەکوتــا، هاواریــان دەکــرد، هورایــان دەکێشــا، هەنــدێ لە دژمنــان و هەڤرکان، یەکیان لەئــامێز دەگــرت، بەڵێنیــان دەدا کە لەئێســتا بەدواوە خەڵکــی باش بن، ڕق و کینە و کۆنەقین وەلاوە بنەن. گەنجەکــان بە دەنگــی بەرز هــاوار دەکەن: "پێغەمبەر، پێغەمبەر"!

هەرچەندە سەرپەرشتارانی کۆڕەکە زۆریان هەوڵدا، ئارامی هۆڵەکە بپارێزن، بەڵام جەماوەرەکە سەرکەوتنە سەر سەکۆیەکەی بەردەم تریبونەکە. دوستویفسکی هایم وحەیران، لەکاتێکا کە لە هەموو لایەکەوە شانی بەرشانی خەڵکەکە دەکەوت، تەمەشا دەکات کە جەماوەرەکە بەدەم پاڵەپەستۆوە، بەباوەشی کراوەوە، وەکو شەپۆل بەرەو ئەو دێن. خۆ وەسەر پێیدا دەدەن، دەستی ماچ دەکەن و دەڵێن: "تۆ بلیمەتیت! بگرە لە بلیمەت و داهێنەر زیاتری!" بۆ ماوەی نزیکەی نیو دانە سەعات،هاواری مەدح و ستایش لە هۆڵەکەدا دەنگدەداتەوە.

ســەرەنجام کــۆمیتەی سەرپەرشــتیار ناچــار کــۆڕەکە ڕادەگرێــت بەڵام جەمــاوەرەکە، بەخــورتی و بەدەم پــاڵە پەســتۆوە، خــۆ بەڕاڕەوەکانــدا دەکەن. خوێنــدکارانی زانکــۆ، بەدەم هەراو هەنگــامەوە لێــرەوە بــۆ ئەوێ بە هەڵەداوان دەڕۆن. یەکێکیان دڵی پڕ دەبێت، دەلەرزێ و دەکەوێتە بەر پێی دوستویفســکی و لەهۆش دەچێت. تورگینیــف بە چــاوانی تەژی ڕونــدکەوە، خەنــیمەکەی خــۆی لەئــامێز دەگرێــت. ئاکســاکوف، لەخۆشــیا دەکەوێــتە وڕاوەو قســەی هەلەق و مەلەق. یورییف، بە دەنگێکی دلێر و زوڵاڵ ڕایدەگەیەنێ: "کــۆمەڵەی دۆســتانی ئەدەبیــاتی ڕووس، بەتێکــڕای دەنــگ دوستویفســکییان بەئەنــدامی فەخــری کۆمەڵە هەڵبژارد."

دوستویفسکی، کە هەڵچوون و ماندوویەتی پرزەیان لێ پری بــوو، فرمێســک و بــزەی تــێکەڵاو بــوو بــوو، تەوقەی دەگەڵ ئەو کەســانەدا دەکــرد کە دەوریــان دابــوو. لاقــی دەلەرزیــن، بە ئەســتەم خــۆی بە پێــوە دەگــرت. هەرچەنــدە بــۆنی جیاواز و گەرمای شــوێنەکە گێژیــان کردبــوو، بەڵام شــادی نــاخ و دەروون، ورەی بەرز کردبووەوەو بەپێوەی ڕادەگرت.

دوای نزیکەی، سەعاتێک کۆڕەکە دووبارە دەست پێدەکاتەوە. ئەکساکوف دێتە سەر شانۆ و ڕایدەگەیەنێت کە ئەو وتارەکەی خۆی ناخوێنێتەوە. دەڵێت: "دوای وتارەکەی دوستویفسکی ئیدی من هیچم پێ نییە تا بیڵێم. هەرچیەکم نووسیوە چەند قەترەیەکی کەمە لە گوتارە بلیمەتانەکەی دوستویفسکی."

دەنگی ئەکساکوف، لەنێو هاڕەی چەپڵەڕێزاندا ون دەبێت. دوای ئەوە لە سەری دەڕوات: "من دڵنیام کە وتارەکەی دوستویفسکی دەکاتە ڕووداوێکی گرینگ لە ئەدەبیاتی ئێمەدا. ئەنجام ماهیەتی ڕاستەقینەی پوشکین ڕوون بووەوە و ئەو مەسەلەیە یەکلایی بووەوە و بڕایەوە.." ئەکساکوف، دەیەوێ لەسەر شانۆکە بێتە خوارەوە، بەڵام جەماوەرەکە ئیعتراز دەگرن و ناچاری دەکەن کە وتارەکەی بخوێنێتەوە.

لەو ماوەیەدا، ئەو ژنانەی لە کۆڕەکەدا ئامادەبوون، بە دزییەوە، ڕاوێژ دەگەڵ یەکدیدا دەکەن، لەبەینی خۆیاندا پارە کۆدەکەنەوە و چەند کەسێک بە نوێنەرایەتی هەموویان دەنێرن بۆ نزیکترین دوکانی گوڵفرۆشی و لەکۆتایی کۆڕەکەدا، جەماوەرەکە داوا لە دوستویفسکی دەکەن بێتە سەر شانۆکە، کاتێ کە دێتە سەر شانۆکە، نزیکەی سەد ژن بەرەو پیری دەچن و تاجەگوڵینەیەکی گەورە بە دیار سەریەوە ڕادەگرن و لافیتەیەک لێی نووسراوە: "بەنێوی ژنانی ڕووسەوە کە تۆ ئەو هەموو قسە جوانانەت دەربارەیان کرد." تەمەشاڤانان هەڵدەستنە سەرپێیان و بەوپەڕی جۆش وخرۆشەوە دەکەونە چەپڵە ڕێزان، پیاوان کڵاوەکانیان تەکان دەدەن، فرمێسک دەزێتە چاوانیان، چاوانی دوستویفسکی تەژی ڕوندک دەبن.

بەمجۆرە، لە ساو پەنای ئامادەبوونی ئەودا، نەسلاڤدوستی و نە غەربگەرایی نەمان و جگە لە ڕووس هیچی دی لەئارادا نەما. ئیدی میللەتێک کەپێشتر دابەش بوو بوو، لە خۆشەویستیدا یەک دەگرنەوە و دەبن بە برا. میللەتێک بە بەرەکەتی قسەکانی ئەو، بە فەزڵی باوەڕی ئەو یەکی گرتەوەو ڕزگاری بوو لە دووبەرەکی و دەستەبەندی.

لەو بارەیەوە بۆ هاوسەرەکەی دەنووسێت: "ئانێت، دان بەوەدا بنە کە وەدەست هێنانی سەرکەوتنێکی ئاوها،ئەوە دێنێ بمێنمەوە. ئەم سەرکەوتنە زامنی ئایندەیە. زامنی هەموو شتێکە. بایەخی ئەوەی هەبوو ئەگەر بشمردبام، بمێنمەوە."

هەرچەندە دوستویفسکی یەجگار شەکەت و ماندوو بوو، بەڵام لەو کۆڕەدا کە هەمان شەو گیرا، بەشداری کرد. لەوێدا چامەی "پێغەمبەر"ی پوشکین دەخوێنێتەوە. سەرلەنوێ لەپشت تریبونەکەوە دەردەکەوێت. باریک و بنێس، لەڕو لاواز، تێکشکاو. بەڵام پەڕجووی ئیلهام فریای دەکەوێت، دەنگی دلێر دەبێتەوە، دەنگێکی زوڵاڵ، بەرز، کاریگەر و زندوو، لە سەرانسەری هۆڵەکەدا دەنگدەداتەوە. یەکێک لە تەمەشاڤانان لەو بارەیەوە دەنووسێت: "دەستی ڕاستی بۆ خوارەوە شۆڕ بوو بووەوە، دەتگوت گەرەکیە، هەڵچوونەکەی خۆی کەم بکاتەوە و ئارام بنوێنێ، تۆنی دەنگی تا ڕادەی هاوار بەرز بوو." کاتێ کە دوا کۆپلە شیعری (پێغەمبەری) پوشکینی دەخوێندەوە:

"ڕابە ئەی پێغەمبەر، تەمەشاکە، گوێ بگرە
ئیرادەی من تێر بکە
کاتێ بە زەمین و دەریایاندا دەبوری
بە ئیلهامی وشە پیرۆز و خواییەکانت
بسوتێنە، دڵی بەشەران."

هاوار و هورای جەماوەرەکە، هۆڵەکەی هێنایە لەرزە، دوستویفسکی لەڕاستیدا، بۆ ئەو خەڵکە نەناسەی کە گوێیان بۆ ڕادەدێرا پێغەمبەر بوو. بەوپەڕی شەکەتی، بەسەری کاس و چاوانی پڕ ئازارەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئوتێل. لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕادەکشێت. دەیەوێ بخەوێت، بەڵام هەستی شادی سەراپای دەگرێت و خەوی دەزڕێنێ و خەوی لێناکەوێت. هەڵدەسێت، جلەکانی لەبەر دەکات، ئەو تاجە گوڵینەیەی کە ئەو ڕۆژە پێشکەشی کرا بوو، هەڵدەگرێت، گالیسکەیەک بەکرێ دەگرێت و بۆ لای پەیکەرەکەی پوشکین دەڕوات.

شەوێکی گەرم بوو، ئاسمان شین و سایەقە بوو، سروەی بای نەدەهات. جادەکان چۆڵ و هۆڵ، کاتێ دوسویفسکی دەگاتە مەیدانی سپاسکایا، لە گالیسەکەکە دادەبەزێت. بەرەو پەیکەرەکە دەچێت. پەیکەرەکە ڕەش، بەرز، لەسەر پایە گرانیتەکەی ڕەق ڕاوەستاوە. دوستویفسکی بۆ ساتێک لە ڕوخساری برۆنزی و چاوانی بێڕوناکی پەیکەرەکە کە دەیڕوانییە ئەرزەکە، ڕادەمێنێ، ئەوسا بە ئەستەم تاجە گوڵینەکە بەرز دەکاتەوە و لەسەر پایەی پەیکەرەکەدا دایدەنێت.

بۆ ساتێک دەبیرەوە دەچێت، مات و حەپەساو لەهەنبەر مامۆستاکەیدا دەوەستێت. بەخەیاڵ هەموو ئەو ڕێگایەی کە پێیدا ڕۆییوەو پریویەتی دێنێتەوە بەرچاوی خۆی، لەو ڕۆژەوە کە منداڵ بوو و هەواڵی مەرگی شاعیری ژنەوت، تا ئەم ساتەی کە بەرانبەر بە پەیکەرەکەی پوشکین وەستاوە، هەمووی وەکو شریتی فیلم لێدەداتەوە. بەڵام ئێستا خۆشی زۆر ماندووە، پیر بووەو تەمەنی پەنجاو نۆساڵە، لە مەرگ نزیک بووەتەوە.

دووبـارە، بەخـەیاڵ، ژوورە بچکۆلـەکانی نەخۆشـخانەی مـاری، دیمـەنی درەختـانی زەیزەفـۆنی گونـدی داروفـوی، ڕاڕەو و داڵانـە دوورو درێژەکـانی قوتابخانـەی ئەنـدازەی عەسـکەری و ژوورە نهێنییەکـەی پیتراشیڤسـکی و ژێرزەمینە تەنگ و تاریکەکان و ئەو سێ سێدارەیەی کە لەنێو بەفرا و لەبەردەم ڕیزێک سەربازدا، چەقێنرا بوون، دێنێتـەوە بـەرچاوی خـۆی. بـا، سـەرما، شـەو، سیبریا... و سیمیپالاتنسک.. هەڵاتن بەرەو زیمیف بەگالیسـکەکەی ڤیرانگیـل. پێکەنین و قاقاکانی پولین، سورانەوەی ڕۆلێت و، ئانای هاوسەری کـە دەگـری. گۆڕێکی چکۆلە بۆ کچەکەی لە گۆڕستانێکی غەریبدا. شاران، دەنگـان، چـاوان، چرای سەرمێزی کارەکەی، چارەی قێزەونی ڕەهنچیـەک. دەنگـی تەقـە تـەقی قیتارێک، ئاسـمانی بـێ ڕەونـەقی ڕووسـیا، کـە نزیـک دەبێتـەوە و ئـەم بکـێش دەکات. دەنگە دەنگێکی نەرم و خـۆش، وەکـو دەنگـی هەڵکشـان و داکشـانی ئاوی دەریا، لە جەماوەرێکی نادیارەوە، دەگاتە گـوێ: "تـۆ کەسـێکی بلیمـەتی،

تۆ لە بلیمـەت زیـاتری." زۆری هەوڵـدا، ڕەنجـی دا، ئـازاری کێشـا. ئـەم شـادیە فراوانەی، کە گوایە خەڵکەکە پەیان بە مەبەستەکانی بـردووە، لـە پەیامەکـەی گـەییون، زۆر بــە درەنگــەوە بــە پیریــەوە هــات. ئایــا تەمــەن مــەودای دەدات، ئەوەندەی بە بەرەوە ماوە وەکو پێویست لەزەت و خۆشـی لەو شـادیە ببینێ؟

هەڵدەستێت، مانگە شـەو، بە تریفەی زیوینی خۆی سـەربانی ماڵەکان و شـەقام و سـەلبەندی کۆڵانەکانی ڕوناک کردووەتەوە. بێدەنگی و خامۆشـی دەوروبەر سکونایی بەدڵی ئینسان دەبەخشـێ. دوسـتویفسکی پشـت دەکاتە پەیکەرەکە و بەرەو لای گالیسکەکە کە لە گۆشـەیەکی مەیدانەکەدا چاوەڕوانی بوو، دەگەڕێتەوە.

## فەسڵی شەشەم
## کۆتایی

لـه ١٨٨٠/٦/١٠دا، فیـدور میخـائیلوفیچ، سـەرکەوتووانە مۆسـکۆ بەجێـدێڵی. هەرچەنـدە ئـەم مـاوە کورتـەی کـە لـەوێ مـابووەوە بـە ئەنـدازەی یـەک سـاڵ کـارکردن، شـەکەت و مانـدووی کردبـوو، بـەڵام متمانـەیـەکی تـەواوی بـەخۆی پەیدا کردبوو. تەواو لـەباری دەروونییـەوە، ئاسـوودە و شـادمان بـوو. بـەڵام ئـەو پەرجووەی کە گوایە نواندبووی و بـە دەسـتی هێنـابوو، لـە خشـتەی نـەبردبوو. هەرکە گەییەوە "ستارایا روسیا" نامەیەک بۆ دۆستی خۆی دۆتمیر تولسـتوی، پوری نووسـەری ناودار تولستوی، دەنوسێت: "دڵنیابـە، دوای ماوەیـەکی کـەم، خەڵکی بەر تانـەو تەشـەرانم دەدەن، بزانـە چـۆن گاڵتـەم پێدەکـەن. قـەت لـەو قسـانەم نـابورن کـە لـەدێر و پەرسـتگاکاندا، لـە کـۆڕە ئەدەبیـە داخراوەکانـدا کردوومن."بەڕاسـتیش وا دەرچـوو. دوای ماوەیـەک پـاش ئـەوەی حەماسـەتی خەڵکەکـە لـەجۆش کـەوت، نـەیارانی نووسـەر، سـەریان قـوت کـردەوە. لـەوە دەچـوو بیانـەوێ تۆڵـەی لـی بسـەننەوە، چونکـە، بـە قسـەکانی ئەفسـوون و گەوجی کردبوون. سـالتیکوف، لـە نامەیەکیـدا بـۆ ئوسـتروفسـکی دەڵێـت: "زۆر بەئاشـکرا دیـار بـوو کـە تـورگینیفی فێڵبـاز و دوستویفسـکی شـێت، کـە ئاهەنگەکەیان بە قازانجی خۆیان ئاڕاستە کرد."

ئیدی زۆر وتاری بەکینایە و تانەو تەشەران، لـە بڵاوکراوەکانـدا بڵاوکرانـەوە. بـۆ نموونـــە پـــەیامنێری ڕۆژنامـــەی "دۆز" دەڵێـــت: "وتارەکـــەی جـــەنابی دوستویفسکی... زیـاتر هەسـت و سـۆزی خـەڵکی دەدوێنـێ و دەجـوڵێنێ تـا زەین و ئەقڵ." هەروەها: "ئیدی قارەمانی ئەو گوتارە بێماناو گەوجانەیـە ئاغـای دوستویفسـکی بـوو. ئەمـە یەکـەمجار نییـە کـە ئـەو بـەو خەیاڵـەی کـە گوایـە ڕۆژنامەوان و ئەهلی ڕاگەیاندنە، خۆی فریو دەدات. بـۆ ئـەوەی ببـێ بـە یـەکێک لە ئەهلی ڕاگەیاندن، پێویستی بە دەوڵەمەندی فیکـر، هوشـیاری سیاسـی و سـەرەتایی ترین شارەزایی ژیانی جفاکی و کۆمەڵایەتی هەیە." لـە ڕۆژنامـەی "پەیکی ئەوروپا"دا ئەمـە دەخوێنینـەوە: "ئـەم قسـە بـۆش و بـەتاڵ و بێماناکانـە چیە کـە لـەو وتـارەدا هـاتووە؟" هـەروەها: "خۆزگـە جـەنابی دوسـتویفکی، لـە ورینـە گۆییـەکانی ئایندەیـدا، حەقیقەتـە سـادە و سـەرەتاییە مێژووییـەکان و پرەنسیپەکانی هەستی ساغڵەمی فەرامۆش نەدەکرد."

دۆستویفسکی بەهۆی ئەم بادانەوە لەناکاوەی خەڵکی و ئەو نووسینە پڕ تانەو تەشـەرانەی لە ڕۆژنامەوانیدا دژی بڵاو دەکرێنەوە، بەڕادەیەک پەسـت و نیگەران دەبێ، کە دوو جاری پەیاپەی تووشـی نۆرە فێ دەبێت و دوو دانە هەفتە، بە بێئەوەی هیچ کارێک بکات، لەجیگادا دەکەوێ.

لە ١٨٨٠/٨/٢٦دا نامەیەک بۆ "و. ف. میللەر" دەنووسێت: "سـەبارەت بەو گوتارەی لە مۆسکۆ خوێندمەوە، دەبینی چۆن زۆربەی هەرە زۆری ڕۆژنامەکان دژایەتیم دەکەن. لە تۆ وایە دزیم کردووە یا فێڵم کردووە، یا قەواڵە و سەنەدم تەزویر کردووەو پێشکەش بە بانکێکم کردووە."

ئیدی لێدەپرێت، وەڵامی پروفیسۆر گرادووسکی، کە لەنـەیارە گـەورەکانی ئـەو بـوو، بداتـەوە. پروفیسـۆر وتـارێکی بەناونیشـانی "خـەون و حەقیقـەت" لـە ڕۆژنامەی "دەنگ"دا دژ بەو بڵاوکردبووەوە. بەڵام وەڵامەکـەی دۆسـتویفسـکی و

ئەو گوتارەی کە لە ئاهەنگی ڕێزلێنانەکەی پوشکیندا، خوێندبوویەوە، لەو تاقە ژمارەیەی بڵاوکراوەی "ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک"دا کە لەساڵی ١٨٨٠دا دەرچوو، بڵاوبوونەوەو لە هیچ شوێنێکی دیکەدا بڵاو نەکرانەوە. ئەم تاقە ژمارەیە بازاڕ و فرۆشێکی گەرم و فرەی پەیدا کرد، جەماوەری خوێنەران پیشوازییەکی بێ وێنەیان لێکرد. شەش هەزار نوسخەی بەڕۆژێک لێفرۆشرا. هەمان ژمارە، لەپایزی هەمان ساڵدا چاپی دووەم کرایەوە و تاقە نوسخەیەکی لە بازاڕ نەمایەوە.
ئەم پێشوازیە گەرمەی خوێنەران لە نووسینەکانی دوستویفسکی، سووکە ئاسودەییەکی پێدەبەخشێت. ئیدی لێدەبڕێت، برایانی کارامازوف، کە هێشتا بەرگی چوارەمی نەنووسی بوو، تەواو بکات. لەو بارەیەوە دەڵێت: "لە پازدەی حوزەیرانەوە تا یەکی ئۆکتۆبەر بیست لاپەڕەی چاپکراوم لە ڕۆمانەکەم نووسیوە و سێ پەڕەی ئەم دیوو ئەودیووی"ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک"م هەڵەچن و ئامادە کردووە."
لە مانگی تشرینی دووەمدا، دوابەشی ڕۆمانی برایانی کارامازوف دەنێرێ بۆ ئیدارەی بڵاوکراوەی پەیکی ڕووس. هەڵبەتە بەنامەیەکی کورتەوە بەم نێوەڕۆکە: "فەرموون ئەمە دوابەشی ڕۆمانەکەمە، سێ دانە ساڵ کارم تیا کردووە، و بە دووساڵ بڵاو بووەتەوە، ئەم ساتە بۆ من ساتێکی گرینگ و پڕ شکۆیە."
لە سەرەتای وەرزی زستانەوە، لەسان پتروسبۆرگدا ئاکنجی دەبێت. کۆنە دۆستەکانی بەسەر دەکاتەوە، لەچەند کۆڕێکی ئەدەبی و خوێندنەوەی دەقێن ئەدەبیدا بەشداری دەکات. شتاکن شنایدر، دەڵێت: "ئەمڕۆ گەنجینەی ئەدەبی، لە هۆڵێکی نیمچە تاریکدا، کە بەزەحمەت بابەتی تیا دێتە خوێندنەوە و گوێدێران بە ئەستەم دەتوانن ببیستن، کۆڕێکی دەق خوێندنەوەی سازکرد. دوستویفسکیش لەم کۆڕەدا بەشدار بوو، وێڕای ئەوەی کە نەخۆش بوو، بەئەستەم دەنگی دەردەهات و، گەرووی ماندوو بوو، سییەکانی ئاوسا بوون، دەنگی لەوانی دی ڕەساتر و ڕوونتر بوو. چەند سەیرە! دەتگوت ڕوح لە بەدەنیا نییە. زۆر لاواز بوو، سینگی چوو بوو بەناوا، دەنگی بەئاستەم دەردەهات، بەڵام کە دەست بەقسان دەکات، لەتۆ وایە تین و تاوی وەبەر دەکەوێتەوە، و چاوەکانی دەکرێنەوە، ئەم گوڕوتینەی لەکویوە بۆ دێت؟..."
ئەوەی ڕاستبێ، لوتف و میهرەبانی خەڵک بۆ دوستویفسکی باشترین دکتۆرو دەرمانە. واز لە دکتۆر و دەرمانی شاری ئیمس دێنێ تا خۆی بۆ کار تەرخان بکات. کۆمەڵێک پرۆژەی کار سەرقاڵی دەکەن. بیر لەوە دەکاتەوە لە ماوەی دوو ساڵدا، وەرزنامەکەی (ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک" بڵاو بکاتەوەو پاشان دەست بە نووسینی بەشی دووەمی ڕۆمانی "برایانی کارامازوف" بکات.
نامەیەک بۆ سکرتێری ئیداری ڕۆژنامەی "پەیکی ڕووس" دەنووسێت: "ڕێگەم بدە، باخواحافیزیت لێنەکەم. بەخۆت دەزانی من حەزدەکەم بژیم و بیست دانە ساڵی دیکە لە نووسین بەردەوام بم."

لە هەوەڵی ساڵی ١٨٨١دا دوستویفسکی بڕیار دەدات کە ژمارەی یەکەمی بڵاوکراوەی "ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک" لەو ساڵەدا چاپ وبڵاوبکاتەوە. لەوە دەچوو تەندروستی باش بێت. تێکەڵاوی دۆست و بناژۆکانی دەکات، هاتوچۆیان دەکات. تەنانەت بەڵێن بە کۆمەڵەیەکی هونەری دەدات کە لەشانۆنامەی مەرگی ئیڤانی ساماناکدا، نووسینی تولستوی، کە قەرار بوو لە مانگی شوباتدا پێشکەش بکرێت، دەوری پارسای خواناس بدینێ. هەروەها قاییل دەبێت بە بۆنەی ساڵوەگەڕی مردنی پوشکینەوە، لە ٢٩/ک٢/١٨٨١دا شیعرێک بخوێنێتەوە. بەهەرحاڵ چوار ڕۆژ پێش ئەم کۆرە. ڕووداوێکی بچکۆلە مجێزی دەشێوێنێ و ترسی لێدەنیشێت. شەوی "٢٥ یا ٢٦"ی کانوونی دوەم، لەکاتێکا لە ژووری کارەکەیدا، خەریکی نووسین دەبێت، قەڵەمەکەی لە دەستی بەردەبێتەوە، غل دەبێتەوە و دەچێتە ژێر مۆبیلەیەکەوە. دوستویفسکی هەڵدەستێت، هەوڵدەدا مۆبیلەکە لابدات و قەڵەمەکەی بدۆزێتەوەو دەریبێنێ. بەڵام هەرکە دادەنەوێتەوە، هەست دەکات ناو دەمی گەرم دادێت و دەمی پڕ دەبێت لەخوێن، لێوەکانی دەسڕێت، سەیر دەکات خوێنە، خوێنەکە کەم دەبێت، فەرامۆشی دەکات و گوێی ناداتێ. تەنانەت بیر لەوە ناکاتەوە کە هاوسەرەکەشی هەستێنێ.
بۆ سبەینێ، هەست دەکات تەندروستی زۆر باشە و عەیبی نییە. چاوەڕوانی، ڤێرای خوشکی، کە چەند ڕۆژێک بوو، بۆ سان پترسبوورگ هاتبوو، دەکات کە ئێوارێ پێکەوە شێو بخۆن. لە دڵی خۆیدا لێدەپڕێت، کە ئێوارێ لەسەر خوان و بەدەم شێو خواردنەوە، دەگەڵ خوشکەکەیدا، یادی ڕۆژانی منداڵی خۆیان و ژیانی مۆسکۆ و داروڤی بکاتەوە. بەخۆشی و شادییەوە دەست بەشێو خواردن دەکەن. دۆستویفسکی دەست بە باسی ئەسپابوازییەکانی سەردەمی منداڵی خۆیان لە نەخۆشخانەی ماردیدا دەکات. پاسی ئەوە دەکات کە بەچ جۆش و خرۆشێکەوە خۆیان ئامادە دەکرد کە پڕۆن بۆ بەسەربردنی پشووی هاوینە. باسی ئە گەنگەشە و مشت ومڕە ئەدەبیانە دەکات کە دەگەڵ میشێلی برایدا دەیانکرد. زۆر دڵی خۆشبوو، بەو گەمە و نوکتانەی خۆی پێدەکەنی کە بە منداڵی دەیکردن.
بەڵام پورە ڤێرا، لەوە نەدەچوو، حەز بەو قسەو باسانە بکات. تومەز خوشکەکانی ناردبوویان بۆ مۆسکۆ، تا دەربارەی مەسەلەی بەشەمیرات، قسە دەگەڵ برایەکانیدا بکات. مەسەلەکە پەیوەندی بەو میرات و کەلەپوورەوە بوو کە لەپاش "کومانین" بەجێ مابوو و لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنەکەی ناکۆکی کەوتبووە نێوان ئەندامانی خانەوادەکەیانەوە. ڤێرا، خواخوای بوو زووتر ئەو مەسەلەیە بخاتە ڕوو و موناقەشەی بکەن. ئیدی قسە عاتیفی و ئەدەبیەکانی دەبڕێت. ئیدی بە گەرمی دەکەوێتە قسان و بەرە بەرە گەرم و گەرمتر دەبێت. گلەیی لە دوستویفسکی دەکات کە گوایە نەهەقی لە خوشکەکانی کردووە. ئەوجا بە کوڵ دەست بە گریان دەکات و لە هۆڕژنی گریان دەدا.

دوستویفسکی که زۆر پەست دەبێت و لە تەحەمولیدا نامێنی، هەڵدەستێت، ژووری نانخواردنەکە بەجێدێڵێ و دەڕوات بۆ ژووری کارکردنەکەی خۆی. لەم ماوەیەدا ئانا گریگوریڤنا، ڤێرا بەڕێ دەکات و تا بەر دەرگای حەوشە لەگەڵیدا دەڕوات. دوستویفسکی لەپشت مێزی کارەکەیەوە ڕۆدەنیشێت، سەری دەخاتە نێو هەردوو دەستی. هێشتا دەنگی چپە دووی جووتە ژن لە داڵانەکەوە دەهات. بێزاری و بێتاقەتیەکی زۆر دایدەگرێت. ئەو شەوەی بە تەواوەتی لێ تاڵ بوو، بەهۆی هەندێ گلەیی و گازاندەو عەزابی ویژدان و گریانەوە لەسەر هەندێ پارە!..
لەناکاوا، هەست دەکات شتێکی گەرم بەسەر دەستەکانیدا دەڕژێ. تەمەشایان دەکات، دەبینێ یەکپارچە خوێنن. دەست بە سمێڵەکانیا دێنێ، هەست دەکات تەڕن، هاوارێک دەکات. ئانا بە غار دەگەڕێتەوە بۆلای، دەبینێ، مێردەکەی ڕاوەستاوە و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و دەم و سمێڵ و ڕدێنی لەخوێنا هەڵکشاوە، دەڵێت: "خێرا دکتۆرێکم فریا بخەن."
بەڵام خوێنڕێژییەکەی پێش گەیشتنی دکتۆرەکە دەوەستێتەوە. دوستویفسکی دەست و دەموچاوی دەشوات. منداڵەکانی گاز دەکات تا وێنەکانی نێو ڕۆژنامەیەکی کۆمیکیان نیشان بدات. کاتێ کە دکتۆرەکە دەگاتە جێ، ڕووبەڕووی پیاوێکی هێمنی ڕوو خۆشی دەم بەخەندە دەبێتەوە. تکای لێدەکات کە معایەنەیەکی گشتی وردی بکات. بەڵام لەکاتی معایەنەکەدا، خوێنڕێژیەکە دەست پێدەکاتەوە، ئەمجارەیان دوستویفسکی لەهۆش دەچێ. دوای چەند ساتێک کە وەخۆدێتەوە، لەبن لێوانەوە دەڵێت: "ئانا، تکایە قەشەیەکم بۆ بانگ بکە. دەمەوێ ئیعتراف بکەم. دوعا و نزا بکەم." ئانا، قەشەی بۆ دێنێ. دوای ئیعتراف و دوعا ونزاکە کەمێک حاڵی باشتر دەبێت و بە هێمنی لەسەر قەنەفە چەرمەکەی ژووری کارەکەی خۆیدا خەوی لێدەکەوێت و هاوسەرەکەی و دکتۆر ڤون برتزل بەدیاریەوە وەستا بوون. لەو ماوەیەدا ناردیان بەدووی پروفیسور کوشلاکوڤ و دکتۆر پفیفر، ئەو خوێنەی کە لەبەر دوستویفسکی ڕۆیی بوو زۆر نەبوو و مایەی ترس و نیگەرانی نەبوو. دەرمان و مالیجەی دەکەن. بۆ سبەینێ کەمێک وەخۆ دیتەوەو حاڵی باشتر دەبێت. بەکاوە خۆ لەخەو ڕادەبێت. داوای پرۆڤەکانی ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک دەکات و دەربارەی پاکنووس و لاپەڕە بەندیەکانی، دەگەڵ هاوسەرەکەیدا موناقەشە دەکات. کە هەواڵی نەخۆشیەکەی دوستویفسکی بڵاو دەبێتەوە، دۆستەکانی لە شارەوە دێنە دیدەنی. بە دەنگی زەنگی دەرگا بێزار دەبوو، ئیدی بەناچاری زەنگەکە یان قەتکرد.
ئانا گریگوریفنا، داوای لە کرێچییەکانی قاتی سەرەوە دەکات کە بە پێڵاوەوە، لە ماڵەکانی خۆیاندا هاتوچۆ نەکەن.
دوستویفسکی تۆزێک خاویار دەخوات و کوپێک شیر دەخواتەوە و لەبن لێوانەوە دەڵێت: "خەمی منداڵەکانمە، بیر لە ئایندەیان دەکەمەوە، کاتێ کە گەورە دەبن."

لەشەوی ٢٨/٢٧دا هاوسەرەکەی لەخەو بێداردەکاتەوە، تەنیا چرایەکی چکۆلە بەدیار تەختە خەوەکەیەوە دەسووتا. ژنەکەی دەپرسێت: "گیانەکەم، چۆنی، هەست بەچی دەکەیت؟" بە دەنگێکی نزم وەڵام دەداتەوە: "دەزانی ئانێت، سێ دانە سەعاتە بە خەبەرم، خەوم لێناکەوێت، بەردەوام بیر دەکەمەوە. ئیدی دڵنیام کە ئەمڕۆ دەمرم."
-نە گیانەکەم، بۆچی وابیردەکەیتەوە؟ خۆ ئێستا حاڵت باشترە. ئیدی خوێنڕێژیەکەت وەستاوەتەوە. وەکو دکتۆر کوشلاکوف دەیگوت، خوێنەکەت مەیبوەتەوە وشوکر ئەو حاڵەت نەماوە، بیکە بەخاتری خوا، بەخەیاڵی پوچ خۆت ئەزیەت مەدە، من دڵنیام چاک دەبیتەوە و دەژیت.
-نەخێر، من خۆم دەزانم چیمە، دەردم گرانە، ئەمڕۆ دەمرم. ئانێت مۆمێک داگیرسێنە و ئەو ئینجیلەم بۆ بێنە.
دۆستویفسکی زۆربەی کات، کاتێ کە نەیدەتوانی دەربارەی بابەتێک بڕیاری بنجبڕ بدات، تەوراتە کۆنەکەی خۆی کە لە تاراوگەوە دەگەڵ خۆیدا هێنابووی، دەکردەوە و بەڕێکەوت لاپەڕەیەکی دەکردەوە و دەستی بە خوێندنەوەی دێرەکانی هەوەڵی دەکرد. ئەمجارەش ئەو کتێبە ئەستوورەی، کە بەرگێکی چەرمی ڕەشی هەبوو، بە دەستەوە گرت، کردییەوە و بۆ هاوسەرەکەی درێژی کردو گوتی:
-بیخوێنەوە.
ئانا دەڵێت:
-ئەمە ئینجیلی سن ماتیو (مەتی)یە، فەسڵی سێیەم، ئایەتی چواردە.
دەست بەخوێندنەوە دەکات: "ئەمە منم کە دەبێ لەلایەن تۆوە بشۆردرێم و تۆ بۆ لای من دێی. و مەسیح وەڵامی دەداتەوە: "لەم سەعاتەوە ئیدی ڕێ لەکاری من مەگرە، چونکە دەبێ بەمجۆرە،عەدالەت بەتەواوەتی و لەهەموو ڕوویەکەوە ئەنجام بدەین."
دوستویفسکی بزەیەکی بۆ دەکات و دەڵێت: "گوێت لێیە، دەڵێ ڕێ لە کاری من مەگرە، ماناى وایە دەمرم."
ئانا، دەست بەگریان دەکات، ڕوندک بەچاوانیدا دێنە خوارێ. هەوڵدەدات دڵ خۆشی بداتەوە و هێوری بکاتەوە. پاشان دەستی هاوسەرەکەی لەنێو دەستەکانی خۆی دەنێت و خەو دەیباتەوە.
دەوروبەری سەعات یازدەی بەیانی لەخەو ڕادەبێت، کاتێ سەرهەڵدەبڕێت و شان دەداتە سەر سەرینەکەی، خوێنێکی کەم هەڵدەێنێتەوە. بە هاوسەرەکەی دەڵێت: "گیانەکەم، ئازیزە داماوەکەم، چ خەمێکت لەدوای خۆ بۆ بەجێدێڵم. چەند ژیانت لەم دنیایەدا ناخۆش و دژوار دەبێت." ئیدی منداڵەکانی گاز دەکات تا دوا ئامۆژگاریان بکات و دوا وەسێتیان بۆ بکات: "باوەڕی ڕەهاتان بە یەزدان هەبێت و هەرگیز لە ڕەحمەت و بەخششی ئەو نائومێد مەبن. من زۆرم خۆش دەوێن، بەڵام ئەم خۆشەویستیەی من، لەچاو ئەو خۆشەویستیە بێ پایانەی خودادا بۆ بەشەرانی خەڵقەندەی خۆی، ناکاتە هیچ."

منداڵەکان لە هەمێز دەگرێت، ماچیان دەکات، دوعای خێریان بۆ دەکات و تەوراتەکە دەداتە دەست فیدیای کوڕی. ئیدی بەرە بەرە هێزی کەم دەبێتەوە. ئێوارێ. لەسەر تەختە خەوەکەی هەڵدەستێ، قوڵپێ خوێن لەدەمیەوە دەڕژێتە سەر چەرچەفەکە. ئانا، پارچە سەهۆڵێکی دەداتێ کە بیخوات، بەڵام خوێنەکە ناوەستێتەوە. دەنێرێت بەدووی دکتۆردا. دۆستویفسکی هەندێ قسەی پچڕ پچڕ و ئەستەم فام دەڵێت و هاوسەرەکەی لەسەر پارچە کاغەزێک تۆماریان دەکات: "من بەم نەخۆشیە، ئێوەشم گیرۆدە کردووە، بە هیلاکم داون. ئەوەی بەلاتەوە بێسوودە ڕەشی بکەوە. چی دەربارەی من دەڵێن. تەواو دەڕۆم، تۆزێکی دی غەرق دەبم، دەنێژریم..."

ئیدی، بەبێ هۆشی دەکەوێتە سەر سەرینەکەی. هاوسەرەکەی و منداڵەکانی، بەدەوریا چۆک دادەدەن و دەگرین، هەندێ لە دۆستان و خزمان، لە هۆڵەکەدا چاوەڕوانی دوا هەواڵی نەخۆشەکە دەکەن. لە هەموو لایەکەوە بروسکەی هاوسۆزی و هاوخەمیان بۆ دێت.

سەعات حەوتی ئێوارێ، ڕێگەی میوانەکان دەدرێت، بچنە ژووری نەخۆشەکە. ژوورەکە تاریکە. فانۆسێکی کز، بەئاستەم لایەکی ئەم ئەشکەوتە کپ و بێدەنگ و تاریکەی ڕوناک دەکردەوە. دوستویفسکی لەسەر قەنەفە چەرمیەکە ڕاکشا بوو، جلی تەواوی لەبەر کرد بوو، سەری نابوو، بەسەرینەکانی پشتیەوە. جگە لە ڕوخساری زەردو وشکی، کە لە دەمامکێکی زەردی کاغەزین دەچوو، هیچ شتێکی دی نەدەبینرا، پەڵەیەکی سوور بەسەر ڕدێنیەوە بوو. برژانگەکانی هاتبوونەوە یەک و چاویان داپۆشی بوو. هەناسەی دەوەستاو دووبارە بە قرخە قرخ و بە دژواری دەهاتەوە. هەوڵیدەدا قسە بکات، بەڵام کەس لە قسەکانی حاڵی نەدەبوو. سەعات هەشتی شەو دکتۆر دەگاتە جێ، تەنیا ئەوەندەی لەدەست دێ دوا لێدانی دڵی دوستویفسکی بژنەوێ. ئیدی دوستویفسکی لە سەعات هەشت و سی و شەش دەقیقەدا دوا هەناسە دەدات و کۆچی دوایی دەکات.

دوای ئەوەی جەنازەکە دەشۆن، جلی خاوێن و تازەی لەبەر دەکەن، بەدەم چاوەڕوانی هانینی تابووتەوە، لەسەر مێزێک ڕایدەکێشن. پارچەیەک ماهووتی زەردباو، لە کلێساکەی تەنیشتیانەوە دێنن و تا ناو قەد بەسەر جەنازەکەیدا دەدەن. دەستەکانی، وەکو خاچ لەسەر سینگی دانراون و ئەیکۆنەیەکی بە باوەشەوەیە. چرایەکی چکۆلە لەسووچێکی ژوورەکەدا دەسووتێ. بۆنی بخوردو مۆم و کۆڵۆنیا ژوورەکەی پرکردووە. نیگارکێشێک بەدیار جەنازەکەوە دانیشتووە و وێنەی دەکێشێت.

لەم کاتەدا، گرووپێن خزمەتگوزاری ئاینی، یەک لەدوای یەک دێن. نوینەرێن هەر گرووپێکی ئاینی کەشیش و تیپی سروودخوانی ئاینی خۆی لەگەڵدایە، هەر گروپە و داوا دەکات، ڕێورەسمی ئاینی، مەرگی دوستویفسکی بەو بسپێردرێ. نوێنەری خوێنکاران و نوێنەری خوێندکارانی هێزی دەریایش لەنێو ئەو شاندانەدا بەدی دەکران. کەشیش دوعاو نزا دەکات و ئامادەبووان هەموو بەیەک دەنگ و بەکۆمەڵ بۆی دەسەننەوە.

دنیـا گەرمــە، هەواکــەی هێنــدە قورســە، کــە هەنــدێجار چــرا چکۆلەکــە دەکوژێتەوە. چەپکە گوڵ و تاجە گوڵی تازەیەباری لە ژوورەکەدا، لەسـەریەکدی کەڵەکە بووە. هەندیک لە هەوادارانی دوستویفسکی، دەستی جەنازەکە مـاچ دەکەن و داوا لە منداڵەکانی دوستویفسـکی، دەکـەن کـە بـەیادی باوکیانـەوەو بەیادگاری چڵە گوڵێکیان پێبدەن.
ئانـا گریگوریفنـا، وەکـو شـێت لـە ژوورێکـەوە بـۆ ژورێکـی دی دێـت و دەڕوات. پەست و بێزار، لەو حەشاماتە نەناسـەی کۆمـەڵ کۆمـەڵ بەسـەر ماڵەکەیانـدا دادەڕژان و بــە بــەردەم جــەنازەی مێردەکەیــدا ڕەت دەبــوون. ئــەم خەڵکــە هەنـدێکیان لـە قاڵدرمـە سـەرەکیەکانەوە دەهاتنـە ژوورەوە و هەنـدێکیان لـە ڕێگای قاڵدرمە تایبەتیەکەی ماڵەوە. حەشاماتەکە وەکو شـەپۆل پێکیانـدا دەدا، لەبەرانبەر تابووتە ڕازاوەکەدا، پڕ پڕ جیا دەبوونەوە. ئەم هـەموو خەڵکـە نەناسـە کێ بوون؟ بۆچی وەدەریان نانەن؟ ئانا وای تەسـەور دەکـرد، کـە ئـەم خەڵکـە، پێشوەختە، قەراری دیداریان لە بەیندا بووە. ئیدی ئەو پیـاوە هەسـتیار و تـورە و کۆمیدیەی کە ئەوەندە لە دڵی ئانادا ئازیز بوو، تـەواو، پەیوەنـدی بەمـەوە نـەما، ئەوانە لە ئانایان داگیرکردووە و ئێستا هی ئەمانە نەک ئانا.
ئێستا، نوێنەری وەزارەتی ناوخۆ، گراندۆک دیمتیری کونستاتینۆفیچ، و کۆمەڵێک زانا، خوێندکاری کۆلیجەکان و خانمی بەڕێز و چاو بەگریان، لە ماڵە چکۆلەکەی دوستویفسکیدا کۆبوو بوونەوە.
"ن. س. ئەبازا" سکرتێری کاروباری دارایی دیوانی دەربار. نامەیـەکی وەزیـری دارایــی دەدات بــە ئاناگریگوریفنــا کــە تیایــدا نووســرا بــوو، خاوەنشــکۆ تــزار، مانگانەیـەکی بـە بـڕی دوو هـەزار ڕۆبڵـی بـۆ بێـوەژن و منداڵـەکانی نووسـەری مەزن بڕیوەتەوە. ئەم هەواڵە بە جۆرێ ئانا خۆشحاڵ دەکات کـە بـە هەڵـەداوان بــۆ ژووری کــاری مێردەکــەی دەڕوات تــاکو مــژدەی بــداتێ. لــەو بارەیــەوە دەنووسێت: "کاتێ کە چاوم بە جەنازەکەی کـەوت کـە لەژوورەکـەدا ڕاکشـاوە، ئەوسا زانیم مردووە، لە دنیادا نەماوە. ئیدی گریام، ئەمما گریان، کوڵی گریـانم لە جۆش نەدەکەوت."
لەو ماوەیەدا، کەشیشانی دێری سانت "لوردا ئەلکساندرنویسکی" پێشنیازی ئەوە بۆ ئانا دەکەن کە ڕێگەیان بدات جەنازەکەی دوستویفسکی لە گۆرستانی تایبەتی خۆیاندا بنێژن. هەروەها پێشنیازی ئەوەش دەکەن ئەوان مەسرەف و خەرجی ڕێوڕەسمی پرسـەکەی ئەم "نیگابانە مەردەی مەزەبی ئەرتەدوکسی ڕاستەقینە" بکێشن.
ئانا، بیرەوەرییەکی کـۆنی وەیـاد دێتـەوە، کـە ڕۆژێـک بـە سـوعبەتەوە باسـی ناشــتنی مێردەکــەی کردبــوو و گوتبــووی: "مــن وام پــێ باشــە کــە لــەدێری ئەلکساندرنویســکیدا بنێژرێــی." دوستویفســکی بــە پێکەنینــەوە بەرســقی دابووەوە: "وابـزانم تـەنیا جەنـەڕاڵانی پیـادە و سـوارە لەوێنـدەر دەنێـژرێن!" ئانـا گوتبووی: "باشتر، چما تۆش جەنەڕاڵ و سەرکردەیەکی ئەدەبیات نیت؟"
ڕۆژی شــەممەی ٣١/کـانوونی دووەم/١٨٨١ جەنازەکـە بـەڕێکرا، لـە بـەیانی زووەوە، ئاپۆرایەکی گەورە لەبەر ماڵەکەیاندا گردبووەوە، جادەکـە یـەک کەسـی

دیکەی نەدەگرت. گالیسکەیەک بۆ هەڵگرتنی جەنازەکە ئامادە کرا بوو، بەڵام دۆستدارانی دوستویفسکی، نەیانهێشت جەنازەکە لە گالیسکەکە باربکرێت، خستیانە سەر شانیان و بەشان تا دێرەکەیان برد. سی هەزار کەس دووی جەنازەکە کەوتبوون: هەفتاو دوو شاند و نوێنەری کۆمەڵە و سەندیکای جۆراو جۆر بە چەپکە گوڵەوە بەگەڵ جەنازەکە کەوتبوون. پازدە تیپی سروودخوان، بەدەم گوتنی سروودی ئاینییەوە بەدووی جەنازەکەوە بوون. ڕیزێک گوڵ بەدەست، بە درێژایی شەست مەتر، کاروانەکەی لە باقی بەڕێکەرانی جەنازەکە جیادەکردەوە.

دوای دوو سەعات ڕێگا، سەری کاروانەکە گەییە درێرو پەرستگەی نویسکی. تابووتەکەیان لەناوەندی میحرابی ڕوحی قودس (سانت سپری)دانا.

بۆ سبەینێ، ١٨٨١/٢/١، جەماوەرێکی یەجگار زۆر لە دۆستان و خەڵکانی فزوڵ، بەسەر دێری ئەلکساندرنویسکیدا دادەڕژێن، ئاپۆراکە هێندە زۆر دەبن کە پۆلیس ناچار دەبن دەرگاکان دابخەن. تەنانەت ئاناش بە زەحمەتێکی فرە ئەوسا دەتوانێ بچێتە ناو کڵێساکەوە. پاشان لەو بارەیە دەنووسێت: "پێمگوتن من بێوەژنی ڕەحمەتیم و ئەمەش کچمە. پاسەوانەکان گوتیان، چی بێ لەتۆ نهێنی، تا ئێستا چەندین ژن بەناوی ئەوەی کە بێوەژنی دوستویفسکین، چوونەتە ژوورەوە. هەندێکیان هەر بە تەنیا بوون و هەندێکیان منداڵیان پێ بوو."

ئەنجام ئانا گەییە شوێنی دیاریکراوی خۆی و ئیدی ڕێورەسمی ئاینی دەست پێدەکات. تابووتەکە لە داڵانی کەنیسەکەدا، لەژێر تاجە گوڵیناندا ون دەبێت. قەشەباشییەک سەرپەرشتی ڕێورەسمی نوێژ و نزا و سرووتی ئاینی دەکات. سەرۆکی ئەکادیمیای کڵێسایی و نوێنەری ئەرشمندرێت، سیمیون، لە ڕێورەسمی دوعا و نزای کۆتاییدا ئامادە دەبن. پێش نوێژی مردوو و ناشتنی جەنازەکە، قەشەباشی پانیچوف، وتارێک دەخوێنێتەوە کە ستایشی هەڵوێست و ڕەفتاری مەسیحیانەی دوستویفسکی دەکات.

دوای تەواوبوونی ڕێورەسمی تازیەباری، تابووتەکەی دوستویفسکی لەلایەن دۆستدارەکانیەوە هەڵدەگیرێت و لە کڵێساکە دەبرێتە دەرەوە.

گۆڕستانەکە لەژێر بەفردا دیار نەبوو. لقی درەختان لەژێر بەفرا چەمی بوونەوە. دەنگەکان، لەتۆ وایە لە سەرما ساف بوو بوون. هەندێ خەڵکی فزوڵ ولاپرەسەن، لەسەر قەبرەکان وەستابوون و هەرکە کاروانی تازیەباران لێیان نزیک دەبوونەوە، کڵاوەکانیان دادەگرت. گۆڕەکەی دوستویفسکی، لەلای گۆڕەکەی جوکوفسکیەوە، ئامادە کرابوو. نووسەران: پالم، میللەر، گایدوبوروف، سولوڤیفە، سەرو وتەیەکی ماتەمینی بەدیار گۆڕە کراوەکەی دوستویفسکییەوە پێشکەش دەکەن.

سولوڤیف، لە بەشێکی وتەکەیدا دەڵێت: "ئەو باوەڕی تەواوی بە بوونی هێزێکی خوایی و بێکۆتایی لە ڕوحی ئینساندا هەبوو و لەو ڕێگایەوە بەسەر هەر توندوتیژیەکی دەرەکی و هەر سستی و لاوازییەکی دەروونیدا

سەردەکەوت.. ئێمە لێرەدا لەبەر خاتری خۆشەویستی ئەو کۆبووینەتەوە، خۆشەویستی ئەو کۆی کردوینەتەوە. جا با هەوڵبدەین، بەهەمان ئەشق و خۆشەویستییەوە لێکدی نزیک ببینەوە. چونکە تەنیا بەو کارە، وەفاداری خۆمان بەرانبەر بە ڕێنوێنیەکانی ڕۆحانی ڕووسیا و، کارە مەزنەکانی و، کول و کۆڤانەکانی، ژان و ئازارەکانی دەنوێنین و ویژدانی خۆ ئاسوودە دەکەین."

ئیدی ئاپۆرا نەناسەکە، چەپکە گوڵەکانیان دەنەنە سەر تابووتەکە. گۆڕەکە لەوە تەنگتر بوو، ئەو هەموو گوڵ و چڵ و گەڵایانە بگرێت. یەکێک لە دۆستدارەکانی، ژێراو ژێر، بە دزییەوە کۆمەڵێک چڵ و گوڵ هەڵدەگرێت، دەی شکێنێتەوە و دەیخاتە ژێر پاڵتۆکەیەوە. هەواکەی ساردە، کات دەڕوات، ئێوارە نزیک دەبێتەوە. سەعات چواری دوا نیوەڕۆ، ئانا، شەکەت و ماندوو، غەمبار و برسی لە گۆڕستانەکە وەدەردەکەویت. بەڵام لەنێو خاچەکانی گۆڕستانەکەوە، هێشتا تارمایی و تاپۆی تاریک، بە یەخەی هەڵدراوەوە، بەڕوخساری لە سەرما چرچ هەڵگەڕاوەوە، رێک وەکو ئەو کاراکتەرە تارمایی ئاسایانەی کە دوستویفسکی لە ڕۆمانەکانیا خوڵقاندبوونی، بەدی دەکران. ئەوانیش لە ڕۆیشتنا بوون، ئیدی دەرگا و دەروازەکانی گۆڕستانەکە بەرە بەرە دادەخران. ئیدی لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدا، شووشەی پەنجەرەی ژووری پاسەوانەکە ڕوناک دەبووەوە. ئەوسا ژیانی ڕاستەقینەی فیدور دوستویفسکی، لە دەرێی کات و شوێندا، لە دڵی ئەوانەدا کە خۆشیان دەویست، لەدڵی دۆستدانیدا، دەست پێدەکات.

## دوای مردن.

ئانا گریگوریفنا، دوای مردنی دوستویفسکی، هەموو ڕۆژێ لەگەڵ منداڵەکانیدا، دەچوو بۆ سەر قەبران. دوای گریانێکی زۆر، شەکەت و ماندوو، بە کزەی سەرما، بۆ ماڵ دەگەڕایەوە. ئیدی هۆڵەکەیان پڕ دەبوو لە میوانی ناوەخت و نەناس، نەیدەزانی چۆن خۆی لێیان ڕزگاربکات. یەکێک لەو مێملانە قەشەیەکی گەنجی چەنەبازی چەقاوەسوو بوو کە بە زمانێکی تەڕ و پاراو ستایشی بەها مەسیحیەکانی دوستویفسکی دەکردو تا سکەیەکی زێڕیان لە دەستی نەنایایە لە ماڵەکە نەدەچووە دەرێ. یەکێکی دی پیرەژنێکی شێت بوو، کە دەیگوت ئامادەیە یەک ملیۆن ڕۆبڵ، بە منداڵەکانی نووسەری نێودار ببەخشێت، ئەگەر ئانا ڕازی بێت و لە چارەسەری کێشەیەکی میراتگریدا

یارمەتی بدات. پیاوێکی دیکە هەبوو، سیمایەکی میهرەبانی هەبوو، پیاوێکی دەم و لەبز شیرین و قسە خۆش بوو، ئەمە لە بێوەژنە گەنجەکەی دوستویفسکی هەڵپێچابوو و هانی دەدا کە شوو بکاتەوە. دەیگوت: "تۆ کارت کردووەتە سەر گەنجێکی ڕێک و پێک و بە ڕەوشت." هەندێک وەشانکاران هاتوچۆیان دەکرد، هەوڵیاندەدا، ئیمتیازی بڵاوکردنەوەی تێکڕای بەرهەمەکانی دوستویفسکی لێوەربگرن. پرۆفیسۆر ڤاگنەریش، کە مامۆستای زانکۆی سان پترسبورگ بوو و زانایەکی بەنێو بانگی بواری شیکاری دەروونی بوو، دێت و داوا لە ئانا دەکات کە ڕێگای بدات ڕوحی مێردەکەی ئامادە بکات. بەڵام ئانا ڕێگەی نادات کاری وا بکات و بە ئاشکرا جوابی دەکات. بەڵام هەر ئەو شەوە فیدور دێتە خەوی. ئانا بەدەم خەوەکەوە ڕادەپەڕێت. هاوار دەکات: "خودایا! چی بوو، ئێستا دیتم، خۆی بوو." لەهەمان کاتدا کچکەشی کە لەنزیکی دایکیەوە نوستبوو، لە خەو ڕادەپەڕێت و لەبن لێوانەوە دەڵێت: "دایکە، ئێستا، تۆزی لەمەپێش، باوکم هاتە خەوم. لەوە دەچوو بیەوێ لە جیگاکەی خۆی هەستێ. ڕەنگ و ڕووی لەبەرچاوم زۆر زەردو چرچەڵە بوو..."

دیداری میوانی ناوەخت و مێملان، گفتوگۆ و گەنگەشە دەربارەی کاروباری ژیان، نوێژ و نزای ڕۆژانە، هەموو ئەمانە ئانایان تەواو بێزار و بێتاقەت کردبوو. هەندێجار هەستی دەکرد خەریکە شێت دەبێت. هەستی دەکرد مێردەکەی نەمردووە، خەڵکانێک بە تۆبزی هەر ڕۆژەی بۆ سەر گۆری کەسێکی دیکەی دەبەن. تەنیا دەیانەوێ ئەو بگێڕن. فیدور لە ژوورەکەی خۆیدایە، گوێی لە دەنگیەتی کە کاغەزەکانی ئەم دیو و ئەو دیو دەکات و بە هەنگاوی هەڕاو و قورسەوە هەنگاو دەنێت، لەسەر مێزەکە هەڵدەستێت و دەچێت بەلای دۆڵابی کتێبەکانیەوە. ئانا، وای هەست دەکرد ئەوانەی دڵنەوایی دەکەن، هەندێ دکتۆری ئەقڵ نەخۆش بوون و دەیانویست بۆ ماوەیەک مژوولی بکەن.

لە ڕۆژی ٣/١دا کە لە گۆڕستانەوە بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، جەنەڕاڵێکی پیر، لە کۆنە ئاشنایانی دوستویفسکی لە ماڵەوە دەبینێ. هێشتا یارۆی جەنەڕاڵ، بەتەواوەتی نەکەوتبووە قسان، کە کارەکەرەکە بە هەشتاو خۆی بە ژوورا کرد و هاواری کرد: "تزاریان کوشت." ئانا تەواو پەشۆکاو دەسەپاچە بوو، یارۆی جەنەڕاڵی پیر ،بەسەر کورسیەکەوە لەخۆی چوو. ئانا، پاشان لەو بارەیەوە دەنووسێت: "دەشیا. مێردەکەم چاک بوایەتەوە، بەڵام بێگومان زۆر نەدەژیا، چونکە کوشتنەکەی تزار، زۆر کاری تێدەکرد، چونکە تزاری زۆر خۆشدەویست بە فریاڕەس و ڕزگارکەری جوتیارانی کۆیلەی دەزانی و دەیپەرست."

مردنی دوستویفسکی، بۆ ماوەیەکی زۆر کردیە کارێک کە جەماوەری خوینەران ڕووبکەنە پەیگیری بەرهەمەکانی نووسەری "برایانی کارامازوف" لە

ماوەی چەند ڕۆژێکدا بەرهەمەکانی لە بازاڕدا نەمان. وەشانکارانی سان پتروسبورگ و شارەکانی دی داوایان لە ئانا دەکرد کە ڕێگەیان بدات یادگارییەکانی خانەی مردووان و ڕۆژانە یاداشتەکانی نووسەرێک چاپ بکەنەوە. ئانا، قاییل نایێت، ئیدی لە سەر قسەی سەرەو گردی (وەسی) منداڵەکانی، جێگری قازی (سان –سینود)، "پوبیدو نوست زیڤ" بڕیار دەدات، بەخۆی کۆ بەرهەمی مێردەکەی چاپ و بڵاوبکاتەوە. جا چونکە پێویستی دەکرد پێشەکیەک بۆ ئەم کۆ بەرهەمە بێتە نووسین و ژیان و بیرەوەرییەکانی دوستویفسکی لەخۆ بگرێت، ئەرکی نووسینی ئەم پێشەکییەیان بە هەردوو نووسەر میللەر و ستراخۆف سپارد. ئەم هەنگاوە سەرکەوتنێکی زۆر باشی بەدەست هێناو هەفتاو پێنج هەزار ڕۆبڵ قازانجی کرد.

چاپی دووەم (لە شەش بەرگ)دا بە نرخی هەرزان، لە ساڵی ١٨٨٦دا بڵاو بووەوە. ئەنجام لە ساڵی ١٨٩٣دا بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی نیڤا، ئیمتیازی ڕۆمانەکانی دوستویفسکی بە پڕی هەفتاو پێنج هەزار ڕۆبڵ کڕی کە بەخۆڕایی وەکو پاشکۆی ڕۆژنامەکەی و لەگەڵ ڕۆژنامەکەیدا دابەشی بکات. ئیدی ژمارەی بەشدارانی ڕۆژنامەی نیڤا لە ماوەیەکی کەمدا زۆر زیادی کرد و لە هەفتا هەزارەوە گەییە سەدو نەوەد هەزار بەشدار. بەڵام لەوە بە دواو بۆ ماوەی چەندین ساڵ، مەحاڵ بوو، بەرهەمەکانی دوستویفسکی، چاپی تازە بکرێنەوە. لە ساڵی ١٨٨٣دا، دۆستدارانی دۆستویفسکی، بە مەبەستی دروستکردنی پەیکەرێک بۆ ئەم پیاوە مەزنە، کەوتنە کۆکردنەوەی باربوو و پیتاکان. دروستکردنی پەیکەرەکە خرایە پێشبڕکێوە، بڕیاری لیژنەی سەرپەرشتکاری ئەم کارە ئەوە بوو کە نیو کۆتەڵێکی بۆ ساز بکەن، هەرچەندە بەدڵی هاوسەرەکەی نەبوو و بەلایەوە زیاد لە پێویست گەورە بوو، بەڵام لیژنەکە قاییل بوو و بڕیاری لە سەر دا. دوای تەواو بوونی پەیکەرەکە دوو هەزار ڕۆبڵ، لەو پارەیەی کە کۆکرابووەوە، مایەوە کە ئەوەشیان بۆ دروستکردنی قوتابخانەیەک بەناوی دوستیوفسکییەوە تەرخانکرد. ئەم قوتابخانەیە لە ستارایاروسیا دروستکرا. ئیدی باباجان ڕومیانتزیف کە دوستێکی گیانی بەگیانی دوستویفسکی بوو، بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکەی گرتە ئەستۆ. ئەنجام لە ساڵی ١٨٨٧دا دۆقی گەورە فلادیمیر ئەلکساندروفیچ، خەمی قوتابخانەی نێوبرای گرتە ئەستۆی خۆی.

ئانا، ئەوکاتە کەمەی، کە دوای کاری چاپ وبڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی هاوسەرەکەی و کاروباری قوتابخانەکە و کۆڕ و کۆبوونەوە ئەدەبییەکان، بۆی دەمایەوە، دەقۆزێتەوە بۆ ڕێکخستن و کۆکردنەوەی ئەو قەواڵەو بەڵگەنامە و دیکۆمێنتانەی کە پەیوەندیان بە ژیانی هاوسەرەکەیەوە هەبوو. ئیدی نامەی دۆستان و نموونەی پرۆڤەی چاپ و ئەو پرسەنامانەی کە بەبۆنەی کۆچی دوایی هاوسەرەکەیەوە بۆیان هاتبوو، ئەو پروانامەی ڕێزلێنانەی کە پێشکەشی مێردەکەی کرابوون، هەر هەمووی کۆکردەوە و ئامادەی کردن.

شـــەوێک لە مـــاڵی ژنێکـــی کۆنەدۆســـتی خـــۆی، کە هـــاوڕێی ســـەردەمی قوتابیەتی بوون، تووشـی پیاوێـک بـوو بەنێـوی سـیزون، ئەم پیـاوە بەڕێـوەبەری مۆزەخـانەی مێژوویـی مۆسـکۆ دەبێـت، ئانـا داوای لێـدەکات کە سـووچێکی لە مۆزەخانەی ناوبراودا بـدەنێ، تـا یادگارییەکـانی هاوسـەرەکەی لە دیکومێنـت و وێنە و کتێب و ئەو شتانەی پەیوەندی بەژیانی هاوسـەرەکەیەوە هەیە، لەوێـدا دابنرێ و نەفەوتێن. بێـوەژنی گەنـج، دوای هەفـتەیەک وەڵامـی وەرگـرتەوە کە دەتوانێ لە مۆزەخانەی ناوبراودا، ژوورێک بـۆ ئەو مەبەسـتە، بەکـاربێنێ. ئیـدی ئانا، لە سان پتروسبۆرگ، دۆڵابێکـی گەورەی لە داربەڕووی قـاوەیی بەکـرد داو بەهەزار و سێ سەد ڕۆبڵ بۆیـان گواسـتەوە بـۆ مۆسـکۆ. ئیـدی سـاڵی ١٨٨٦ هەرچی سـەندوقە کتێـب، وێـنە و دەستنووسـی هاوسـەرەکەی هەبـوو، هەر هەمووی بۆ مۆزەخانەی ناڤبری ڤڕێکرد.

لەوە بە دواوە، ئانا هەموو کاتی خۆی بۆ ئەوە تەرخانکرد، کە پاشماوە و کەلەپووری مێردەکەی کۆبکاتەوە و ڕێکیان بخات. لە ساڵی ١٩١٦دا، لای گروسمان بە ئاشکراو بەڕاشکاوی دەڵێت: "من لە سەدەی بیستەمدا ناژیم، بەڵکو لە ساڵانی هەفتایەکانی سەدەی نۆزدەدا دەژیم. برادەرانی من هەمان برادەرەکانی مێردەکەمن. دنیا و ژینگەی من، هەمان دنیاو ژینگەی سەردەمی دوستویفسکییە، ئێستا کە ئەو نەماوە، من لەگەڵ ئەواندا دەژیم." گروسمان دەڵێت: "ئەم ژنە، کە داوی سپی کەوتبوونە سەری، کڵاوێکی تەنکی لەسەر دەکرد. ڕوخسار و سیمای ماندوو، بەڵام جوان و دڵگیر، چاوەکانی گەش و درەخشان، زیرەکی و هۆشنیان پێوە دیاربوو. بەڕووی خۆشەوە، هەندێ دەستنووسی بیرەوەرییەکانی خۆی دەربارەی مێردەکەی، بە من نیشان دەدا. ئەو نامە بەنرخانەی کە لە ئەرشیفی خۆیدا هەڵیگرتبوون، ئەو نامانەی کە مێردەکەی بۆی نارد بوو، بە من و بەهەر دۆستدارێکی دیکەی دوستویفسکی، نیشان دەدا." بەڵێ، ئانا، بە کەماڵی ئارەزوو، خۆی تەرخانکرد بۆ خزمەتی ناوبانگ و ڕێبازی مێردەکەی، دەیویست وەکو چۆن لەم ساڵانەی دوایی ژیاندا خۆی بۆ خزمەتی ئەو تەرخانکرد بوو لە دوای مردنیشی، پارێزەر و خزمەتگوزاری ئەو بێت. دەیویست لە پێناوی ئەودا بخەبتێ و نەمرییەکی ڕەهاو بێغەل و غەشی بۆ دابینبکات. وەکو چۆن جاران ڕووبەڕووی خاوەن قەرزان و نەیارانی مێردەکەی بوو بووەوە و بەرگری لێکرد بوو، ئێستاش بە هەمان نەفەسەوە ڕوو بەڕووی ئەو کەسانە دەبووەوە کە ژیاننامەو بێوگرافی مێردەکەیان بە نیوەچڵی دەنووسییەوە.

لە سـاڵی ١٨٩٨دا، خـانمێکی نەمسـاوی بەنێـوی مەدام هوفمـان، کە چەنـد لیکۆڵینەوەیەکی دەربارەی دوستویفسکی بە ئەڵمانی نووسی بوو. لە ڕێـگەی ســـەفارەتخانەی نەمســـاویەوە، مـــۆڵەت وەردەگرێـــت، کە دۆســـیەی، دۆزی پیترافیشـــکی کە لە دیـوانی هـۆبەی سـێیەمی دادگـادا دەبێـت، ببینـێ و بیخـوێنێتەوە. بەڵام بەبـێ مـۆڵەت و ئامـادەبوونی ئانـا گریگوریفنـا، ڕێـگەی ئەو کارەی نادەنێ. بەو مەرجە ڕێی دەدەن کە ئانای لەگەڵدا بێ، چـونکە ئانـا تـاقە کەسێک بوو کە بۆی هەبوو، کۆپی لەبەر ئەو دیکۆمێنتـانە بگـرێتەوە. ئیـدی ئانـا

دەبوایە پێنج کەرەت بچێتە دایەرەی نێو براو تا دەقی تەواوی ئیعترافەکانی دوستویفسکی کۆپی بکات. لە دوایەمین ڕۆژدا، کە مەدام هوفمانیشی لەگەڵدا دەبێت، کە لەدایەرەی نێوبراو دێنە دەرێ، ئانا، دەستنووسەکان دەداتە دەست مەدام هوفمان، تا پاڵتۆکەی لەبەر بکات، کە داوای دەستنووسەکان دەکاتەوە، مەدام هوفمان قایل نابێت بیداتەوە و دەڵێت شەوێ هەموو ئەو دیکومێنتانە بۆ ڤێنا دەنێرێت بۆ وەشانکاری بەرهەمەکانی. ئانا دەڵێت، ناکرێت ئەم بەڵگەنامانە، پێش ئەوەی لە ڕووسیادا و بە زمانی ڕووسی بڵاوبێتەوە، لە هەندەران و بە زمانێکی بێگانە بڵاو بکرێنەوە. بەڵام خانمی نەمساوی، توند ئەم دەسکەوتە بە سینگ و بەرۆکیەوە دەگوشێت و نایەوێت بیداتەوە و دەیکات بە مشت و مڕ. ئیدی ئەم دەم بۆڵەو قەرقەشەیە وەختێ کۆتایی دێت کە ئانا هەڕەشەی لێدەکات کە خەبەری پۆلیسی لێدەدات کە ئەو بەڵگەنامانەی لێدزیوە. ئیدی مەدام هوفمان دەترسێت و بەناچاری دیکومێنتەکانی وێدەداتەوە. ئانا ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ هەر خەریکی کۆپی کردنی بەڵگەنامەکان دەبێت و هەر ئەو شەوە نوسخە کۆپی کراوەکان بۆ هەڤڕکەکەی دەنێرێت.

وێڕای ئەمەش، بەهۆی شۆرەت و ناوبانگی مەدام هوفمانەوە، پاچڤەی ئەڵمانی ئەم بەڵگەنامانە، لەپێش بڵاوبوونەوەی دەقی ئەسڵیان لە ڕۆژنامەکانی ڕووسیادا، لە هەندەران بڵاوبوونەوە.

مەدام دوستویفسکی، حەزی لە چارەی بیوگرافی نووسان و ئەو یادگاری نووسانە نەدەکرد کە بە ئارەزووی دڵی خۆیان و چۆنیان بویستایە، دەیان ڕازاندەوە و دەسکاریان دەکرد. ئەو هەموو نووسینانەی کە بەناوی (بیرەوەری) دەربارەی دوستویفسکی، لەلایەن خەڵکانێکەوە بڵاودەکرانەوە کە کەم دایێژێک دەیان ناسی، ئانای نیگەران و تووڕە دەکرد. چونکە پێی وابوو تەنیا ئەو باشی دەناسێت.

چاپخانەداران، برادەرانی هاوپۆل، دۆست و برادەرانی نووسەر و ئەدیب، هاوڕێیانی زیندان و تاراوگەی سیبیریا، هەرچیەکیان بەقەڵەمدا هاتبا، دەربارەی دوستویفسکی دەیاننووسی، بەڵام کەسیان نەیاندەتوانی، کەسایەتی ڕاستەقینەی ئەو بەرجەستە بکەن.

ئانا لەمبارەیەوە دەنووسێت: "هەرجارێ کە لە رۆژنامەیەکدا دەمخوێندەوە کە فڵان کەس لە بیرەوەرییەکانیدا باسی مێردەکەی منی کردووە، دڵم دەگوشرا. لە دڵی خۆدا دەمگوت: بێگومان بریتیە لە کۆمەڵێک زێدەڕۆیی و قسەی هەڵبەستراو، یا کۆمەڵێک قسەی بێسەروبەرو نادروستە... بە دەگمەن لەو بۆچوونانەمدا سەرچیخ دەچووم. سەرم لە شێواز و تۆنی نووسینی، بیرەوەی نووسان، دەربارەی دوستویفسکی سوڕدەما. دەتگوت هەر هەموویان لە بەینی خۆدا ڕێکەوتوون کە بە پیاوێکی خەمین، شپرزە و گۆشەگیر، لەگەڵ خەڵکیدا نەکڵۆک و نەساز، لە خۆبایی و لووت بەرز و شەیدای شۆرەت و نێوبانگی وەسف بکەن و لە قەڵەم بدەن (دوور نیە ئەمە دەرهاویشتەی خوێندنەوە و قەزاوەتیان بووبێ بۆ بەرهەکانی)."

ئانا، بۆ ئەوەی وێنەیەکی ڕاستەقینەی مێردەکەی، پێشکەش بە نەوەکانی ئایندە بکات، دەکەوێتە بەر پەرجدانەوەی ئەو قسە هەلەق و مەلەق و نادروستانەی لەم لاو لەولا دەربارەی مێردەکەی دەکران و دەنووسران. لەو بارەیەوە دەنووسێ: "ئەگەر لەنێو خەڵکیدا کەم دوو بوو، لەبەر ئەوە بوو کە بە قاڵدرماندا سەردەکەوت، هەناسەی تەنگ دەبوو و نەیدەتوانی یەکسەر قسان بکات، ئەگەر هەندێ مەندو خامۆش دەهاتە بەرچاو، لەبەرئەوە بوو کە نەخۆش بوو."

بەڵام ئەم سووکە سەرنجانەی ئانا، لەچاو ئەو هەموو بوختانە ترسناکانەوە کە ستراخوف، یەکەمین بیوگرافی نووسی دوستویفسکی، بۆی هەڵبەستبوو، نەیدەکردە هیچ.

لەساڵی ١٨٨٣دا، ستراخۆف، قایل دەبێت، بە پارەیەکی زۆر باش، بیرەوەرییەکانی خۆی دەربارەی دوستویفسکی بنووسێت. لە ٢٦/ نۆڤەمبەری هەمان ساڵدا، نامەیەکی پڕ لە بوغزو کینە دەربارەی دوستویفسکی، بۆ تولستوی دەنووسێت، ئەم نامەیە، هەمان ئەو نامەیەیە کە لە ساڵی ١٩١٣دا لە ژمارەی ئۆکتوبەری ڕۆژنامەی "دنیای هاوچەرخ" بڵاودەبێتەوە. بەڵام ئانا دوای یەک ساڵ، لەکاتێکا خجڵی کۆکردنەوەی هەندێ شپرە ڕۆژنامان دەبێت، ئەوسا پێی دەزانێت و لەحەژمەتاندا، ڕۆژنامەکە پارچە پارچە دەکات وەدەیجوێت. ئەمە دەقی نامەکەیە:

"جەنابی لیف نیکولایوفیچی، پایەبەرز و قەدرگران، نامەیەکی بچووکت بۆ دەنووسم، هەرچەندە بچووکە، بەڵام لەڕووی بابەت و ناوەڕۆکەوە زۆر گرینگە... بێگومان بیوگرافیەکەی دوستویفسکیت پێگەیشتووە (ڕاو بۆچوونی ئێوەم دەربارەی زۆر مەبەستە) تکایە ڕای خۆتم لەبارەیەوە پێ بڵێ. جا بەم بۆنەیەوە حەزدەکەم ئەو ئیعترافەت بۆ بکەم کە بەدرێژایی ئەو ماوەیە کە خەریکی نووسینی ئەو ژیاننامەیە بووم، وام هەست دەکرد بێگارم پێدەکەن، بە خورتی ئەو هەستەم لەناخی خۆدا سەرکوت دەکرد. تکایە ڕێگەیەکم پێ نیشان بدە کە لەو حاڵەتە ڕزگار بم. من ناتوانم دوستویفسکی بە پیاوێکی باش بزانم، بە پیاوێکی بەختەوەری بزانم (لە ڕاستیدا ئەم دوو حاڵەتە تێکەڵ بەیەکدی دەبن) دوستویفسکی پیاوێکی خراپ، دڕ، بەغیل بوو. هەموو ژیانی بە جینگیزی و تووڕەیی و هەڵچوونێکی ئەوتۆوە بەسەربرد کە پیاو بەزەیی پێیدا دەهاتەوە و هەندێجار دەبووە مایەی مەخسەرە و پێکەنین. کاشکێ نە ئەوەندە زیرەک و نە ئەوەندە شەڕەنگێز دەبوو... هەندێجار کاری زۆر نەنگینی دەکرد و شانازی پێوە دەکرد. ڕۆژێک ڤیسکوڤاتوف بۆی گێڕامەوە کە بە خۆی گوێی لە دۆستۆیفسکی بووە، گێڕاویەتیەوە کە چۆن خانمێکی بەڕێوەبەری قوتابخانە کچۆڵەیەکی مەکتەبلی منداڵی بۆ هیناوەو بردوویەتیە گەرماوەوە.. بە شانازیەوە گێڕاویەتیەوە. ئەو قارەمانانەی کە زیاتر لە خۆی دەچن، یەکێکیان قارەمانی چیرۆکی یاداشتە ژێر زەمینییەکانە. دووەمیان، سفیدرگایلوفی قارەمانی ڕۆمانی تاوان و سزایە، سێیەمیان ستافروگینی قارەمانی ڕۆمانی شەیتانەکانە... من دەمتوانی ئەم لایەنانەی تەبع و تەبیعەتی دوستویفسکی

له بیوگرافیەکەیدا تۆماربکەم و ڕوونی بکەمەوە، بەڵام شتی زۆر خراپتر لەمەی بۆم گێڕایەوە، هەبوو.. بەهەرحاڵ ئەم شتانە با بچنە گۆڕەوە." تولستوی ئەم وەڵامەی دەداتەوە: "تۆ دەڵێیت کە لەگەڵ تورگینیفدا ئاشت بوویتەوە. من ئێستا خۆشم دەوێ. ئەمە شتێکی سەیرە. ئەمە لەبەر ئەوەیە کە ئەو خەتاکار نەبووە و بەڕێی ڕاست و دروستیا بردوویت. وەکو هەندێ لەو فێڵبازانە نییە ئەگەر نەتخەنە قۆرتێکەوە، ناشت گەیەننە هیچ شوێنێک. تورگینیف لە دوستویفسکی زیاتر دەژی نەک بەهۆی هونەرەکەیەوە، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە کە لەژیانا خەتاکار نەبووە."

ستراخوف، لە ١٢/١ک/١٨٨٣دا، وەڵامی تولستوی دەداتەوە: "تەسەور و بۆچوونی تۆ دەربارەی دوستویفسکی، حەقیقەتی کەسایەتی ئەوی بۆ ڕوون کردمەوە، بەڵام من وا هەست دەکەم زیاد لە پێویست خاترت گرتووە و مدارات کردووە کەسێک هیچ شتێک پەی بە ناخی نەبات، چۆن دێتە ناسین و هەڵسەنگاندن، من ئەوم وا هی ناسیوە."

ساڵێک لەپێش ئەو بەروارەی سەرەوە (واتە ١٨٨٢/١٠/٦) تورگینیف، لە نامەیەکدا بۆ سالتیکوف، دەربارەی دوستویفسکی دەڵێت: "دوستویفسکی زۆر بە وردی ڕێڕەوی کارەکانی ڕەچاو کردووە و بە بەرنامە کاری لەسەر کردووە و پابەندی بووە. هەڵبەتە ئەوەی زانیوە کە لە ئەدەبی فەرەنسیدا کەسێک هەبووە زۆر لەو چووە، ئەو کەسەش مارکیز دی سادی زۆر بەنێوبانگ بووە. (مارکیوز دی ساد (١٧٤٠ -١٨١٤) ئەمە لە شەڕێن حەوت ساڵەدا. وەکو ئەفسەری سوارە بەشداری کردووە و پاشان کەوتووەتە کاری نووسین. سەرانسەری ژیانی کوشتن و تاوان و زیندان بووە و لەئەنجامدا لە شێتخانە دەمرێت. نووسینەکانی چونکە دەگەڵ داب و نەریت و ئەخلاقیاتی باودا تێکناکەنەوە. لە لایەن سانسۆری وڵاتانەوە، ڕێگەی بڵاوبوونەوەیان نادرێت. لە سەدەی بیستەمدا ئەوسا بەرهەمەکانی چاپ دەکرێن. وێرای ئەمەش سانت بوفی ڕەخنەگری گەورە، دەربارەی ئەو دەڵێت: "ساد و بایرون گەورەترین ئیلهامبەخشانی مودێرنیستەکان بوون." ڕەخنەی سەدەی بیستەم، بەرهەمەکانی ساد، لە ڕووی شیکردنەوەی دەروونی تاکەوە دژ بە کۆمەڵگە و خوا، بەرز دەنرخێنێ. سادیسم کەچڕەوی ئارەزووی سێکسیە کە لەزەتی سێکسی لە ئازاردانی بەرامبەرەکەی دەبینێ. تورگینیف لێرەدا، دۆستویفسکی بەو کەسە کەچڕەوە ئەنتی بەشەریە بەراورد دەکات."

جا کە دەبینی هەموو کەشیشانی ڕووس، ڕێورەسمی نویژ و دوعایان بۆ "دوساد"ی ڕووس کردووە و وتاری پڕ پەند و ئامۆژگاریان دەربارەی ڤیانی جیهانی ئەو خوێندەوە، هەنگێ دەبێ بپرسین، ئەم کارە چەندی بەچەندە؟

ئەم ژاوە ژاو و هێرشانە بۆ سەر دوستویفسکی، کە زۆربەی هەرە زۆری دەرهاویشتەی بەغیلی و حەسوودی بوو، زۆر بوو بوو و، ئانا گریگوریفناش زۆری پێناخۆش بوو. بەتایبەتی نامەکەی ستراخوف زۆری پەست و توورەی کردبوو. ئیدی لای گروسمان گوتبووی: "باوەڕ بکە لە حەژمەتاندا چاوم نەیدەبینی، ئاخر ئەو هەموو بوختانە بێمانایە لەپای چی. ئەگەر ستراخۆف

زندوو بوایە. لە ژیاندا بوایە، بەم پیریە، لە هەر شوێنیک بوایە دەچوومە سەری و لەسەر ئەم ڕەفتارە دزێوەی یەک زللەم لێدەدا."
"باشە ستراخوف بەدرێژایی دە دانەساڵ هاوکار و برادەر و هاورێی دوستویفسکی نەبوو، دوستویفسکی داڵدەی نەدەدا. باشە کە ئەمە ڕەئی بوو، بۆچی ڕەفزی نەکرد ژیاننامەکەی بنووسێت، مادامێکی لەکاتی نووسینیدا دڵی تێکهەڵدەهات و قێزی دەکردەوە؟ باشە چۆن توانیویەتی دوستویفسکی بەچرووکی و خۆپەرستی تاوانبار بکات، لە کاتێکا دوستویفسکی بەدرێژایی ژیانی، لەخۆی گرتووەتەوە، بۆ ئەوەی یارمەتی خانەوادەکەی میشێلی برای بدات. ئاخر چۆن توانیویەتی باسی شەڕەنگێزی و بەدڕایی نووسەرێک بکات کە هەر کەسێک نامەی بۆ نووسی بێت بەهانایەوە چووە و لە کەسانی گەورە و دەستڕۆی وەکو " پوبیدونو ستریف" یان "فیشنیگراداسکی" داوای یارمەتی بۆ کردوون، بەڵام سەبارەت بە بویەری حەمامەکە، ئەمە تەنیا هەواڵێک بووە کە کەسێکی دیکە بۆ ئەمی گێڕاوەتەوە و ئەمیش ویستویەتی لە ڕۆمانی شەیتانەکاندا، بەکاری بەرێت و مامەڵەیەکی هونەریی لەگەڵدا بکات. بەڵام دۆست و هاورێکانی ئامۆژگاری دەکەن کە کاری وابکات، چونکە لە کەسێکی وەکو دوستویفسکی (لایەنگری مافی ژنان) ناوەشێتەوە، خانمێکی بەڕێوەبەری قوتابخانەیەک وەکو قەوێدەیەک نیشانبدات. لە ڕاستیدا، ستراخوف، نووسەرێکی دەرەجە دووی حەسوود، دەنی، نەفس نزم، فێڵباز و مشە خۆر، لەبنەوەپڕ و پیلانگێڕ بوو. فیدور میخائیلوفیچ، زۆر باشی ناسی بوو و لەساڵی ١٨٧٥دا، بەمجۆرە وەسفی کرد بوو: "بەڵێ ئانیت، ئەمە دەرچووی خوێندنگەیەکی ئیکلیریکی زۆر خراپە، جگە لەمە هیچی دیکە نییە.. دوای فەشەل و ناکامی ڕۆژنامەی (سەردەم) بەجێی هێشتم و ئیدی لێی نەپرسیمەوە و نەهاتەوە بەلامەوە، کە ڕۆمانی تاوان و سزا سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا ئەوسا هاتەوە بۆ لام." بەڕاستی زۆر چاکی ناسی بوو."
بەهەرحاڵ، ئانا، لە ڕادەبەدەر بەرگری لە مێردەکەی کرد، هەموو لایەنەکانی ژیانی دوستویفسکی بە تەواوەتی ڕوون کردەوە. ئەوەی کە پێویست بوو دەربارەی ئەخلاقیاتی دوستویفسکی بیزانین، هەموویمان زانی. دوستویفسکی پیاوێک بوو شایستە و بەهرەمەند و ئامادە بۆ کارێن باش و گەورە و، لە هەمان کاتدا وردەکارێن شەڕانی و خراپی بچووکیشی لێدەوەشایەوە. گیانی فیداکاری گەورەو وردە خۆپەرستی تیا بوو. پیاوێک بوو سەرریژ لە عاتیفەی مرۆڤانی و لەهەمان کاتدا لە وردە عەیبانیش بەدەر نەبوو. بەڵام بەسەر عەیب و کێماسیەکانی خۆیدا زاڵ بوو. تاوانی قارەمانەکانی، کە جۆرە سادیەتێکیان تێدایە، تاوانێک نەبوون کە خۆی کردبنی و جەڕباندبنی، بەڵام بە خەیاڵ وێنای کردوون و وێنەی گرتوون. ئەو جۆرە وەسوەسە و خولیایەی هەبووە. باری دڵ و دەروونیان قورس کردووە، ئیدی لەبەرهەمەکانیدا هەڵیڕشتوون و خستونیەتە بەردەستی خوێنەران و خۆی لێ ڕزگار کردوون. گەورەیی ئەو پیاوە لەمەدا بووە کە هەموو خاڵە ئەرێنی و

نەرێنییەکانی ئینسانێکی لە خۆدا کۆکردبووەوە و پەنا دابوو. دوستویفسکی هەر بە فام و زیرەکی و ئەقڵ پیاوێکی جیهانی نەبوو، بەڵکو بەدڵ و سۆز و سۆزداریش هەر پیاوێکی جیهانی بوو. ئەو نەتوانیویەتی بچێتە کلێشەی ستاڤروگینەوە و لە شێوەی شەیتاندا خۆی بنوێنێ و نە توانیویەتی بچێتە پێستی میشکینەوە و لەشێوەو قالبی فریشتەی ئاسماندا خۆی بنوێنێ. چونکە لەهەمان کاتدا ئەو دووانە، هەردووکیان بووە، واتە بە هۆشمەندییەکی یەکسانەوە هەردوکیان بووە. ئەم دوالیزمیە لە هەموو بەرهەمەکانیدا بەر چاودەکەوێت. یانی لە نێوان دنیای فسق و فجوری جەستەیی و لەزەتخوازی و دنیای خەڵوەتنشینی و ڕۆحانی ڕەهادا، لە هاتوچۆدایە. لەنێوان سیستەمی باو و جێگیر و، سیستەمی تازەی نادیاری ئایندەدا، دەهات و دەچوو. ناتوانێ هیچ یەکێک لەم دوانە هەڵبژێرێت. جا بەم پێودانگە هیچ سەیر نییە کە ئەم پیاوە مەسیحییە ئیماندار و ئاشتیخوازە، پشتیوانی لە شەڕی ڕۆژهەڵات (مەبەست لە جەنگە لەگەڵ عوسمانیەکاندا) بکات. یا ئەم پیاوە خەیاڵپەروەرە ئایدیالیستیە فێدارە، ڕۆمانەکانی پڕ بکات لە بۆچوونی مەتریالیستی و ڕیالیستی. دوستویفسکی وەکو قارەمانەکانی کەسایەتیەکی دوالیستی هەیە. بۆیە کە کاتێ چارەسەرێک بۆ (کێشەیەکی ژیان) دادەنێت، دەشێت بەدڵنیاییەوە بڵێین کە ئەمە چارەسەرێک نییە کە باوەڕی پێی هەبیت. لەڕاستیدا بەرهەمەکانی دوستویفسکی وەڵامی پرس و کێشەکانی ژیان نین، بەڵکو زیاتر پرسیارن. تەنیا پرسەکە دەخەنە ڕوو. کە کتێبێکی دوستویفسکی دەخوێنینەوە ئیدی، هەمان کەسەکەی پێش خوێندنەوەکە نین. پێشتر وامان هەست دەکرد کە لە دنیایەکی پیری کۆنی چەندین هەزار ساڵە، بەیاسای زانستی جێگیر، پرەنسیپی ئەخلاقی و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی پیرۆز و پایەدار، مکوم و نەگۆڕ گەورە بووین و دەژین، کەچی لەناکاوا ئەم دنیایە دەلەقێ، زەویەکەی ژێر پێمان دەلەرزێ. زەویەکە لەژێر پیماندا دەخزێت، لەجیاتی قۆرتێ، دەیان قۆرت دەورمان دەدات. دوستویفسکی لە فەزایەکی بۆش و ترسناکدا، لە خەوی ئاراممان بێدار دەکاتەوە. درۆ باو و ئاساییەکانمان کێوە چوون، ئەو چەکە کۆن و باوەڕپێکراوانەی ئێمە کێوە چوون؟ ئیمە خۆمان لە کوێین؟ ئێمە خۆمان چین؟ دۆستویفسکی ئێمەی لە هەموو ئەو قەناعەتانە ڕووت کردەوە، کە فەلسەفە و حیکمەت لە هەوەڵ ڕۆژی دروستبوونی بەشەرەوە پێی بەخشی بووین. ئەدی چی لە جیاتی ئەوە پێبەخشین؟ هەندێک دەڵێن هیچ، تەقریبەن هیچ. بەڵام هەندێکی دی دەڵێن هەموو شتێکی داوە. دوستویفسکی لە میتافیزیای ڕۆمانەوانیدا، چەمکی "لە چارەسەر نەهاتگ"مان دەداتێ. لە جیاتی یەقینیەت، نیگەرانی و پەشێوی بێکۆتاییمان دەخاتە بەردەم. هیچ جۆرە باوەڕ و نیهادێکی تازەی کۆمەڵایەتیمان بەسەردا ناسەپێنێ. ئەرکی ئەوەیە بە دیدێکی فراوانتر و حەوسەڵەیەکی ئەخلاقی زیاترەوە، مامەڵە دەگەڵ دیاردە و ڕووداوەکاندا بکەین. هیچ بەڵێنێکی نەداوینەتێ کە چاوەڕوانی هاتنە دی

بکەین، بەڵام هونەری چاوەڕوانی کردنمان فێر دەکات. "باوەڕ بکە خوا بە ڕادەیەک خۆشی دەوێی، کە تۆ هەرگیز ناتوانی بەخەیاڵیش وێنای بکەیت."

جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم حەقیقەتەدا، دەبینین ئاپۆرایەکی فرە، لە خەڵکانی عەجیب و غەریب، بەسیمای پرشنگدار و جل و بەرگی تەماویەوە، ڕادەبن و بەرەو ڕوومان دێن: ڕاسکولنیکوف، ڕوگوژین، ستاڤروگین، میشکین، فیرسیلوڤ و برایانی کارامازوف، هەموو ئەم تاوانبارانە، ئەم بێتاوانانە، ئەم هەرزە و داوێن تەڕو داوێن پیسانە، وشیار و بەویقار لە لامانەوە دەوەستن و، ئێمە ماهیەتی دەروونی خۆمان لە سیماو ڕەفتاری ئەواندا دەبینین و خۆمان دەناسین. سوور دەزانین کە ئەمانە لەمەو دوا بەدرێژایی ژیان لەگەڵماندا دێن. کاتێ کە شەکەت و ماندوو، تینوو برسی، وا وێنا دەکەین، کە گەییوینەتە ئامانج و مەبەست، ئا ئەم کاراکتەرانەی هونەرمەند، شانمان توند دەگرن و ڕایدەوەشێنن. گوایە دەڵێت: "نەگەیشتنە ئامانج، گەورەیی تۆی لێ دەکەوێتەوە."

دوستویفسکی گەورەیە، چونکە نەگەییە ئامانج و ئاواتەکەی نەهاتەدی.

تێبینی: لە ٢٠١٦/٦/٢٥ لە پاچڤەی ئەم بەرهەمە بوومەوە. کە لەم سەرچاوانەی خوارەوە، بەشێوەیەکی بەراوردکاریانە پاچڤەم کردووە. جا ئەگەر ئەمە بوویێتە هۆی ئەوەی هەندێ دەستەواژەو ڕستە و پەرەگرافی دەقە کوردییەکە، لە ڕواڵەت و شێوەدا تەواو دەگەڵ سەرچاوەی یەکەمدا تێکنەکاتەوە، ئەوا لەگەڵ سەرچاوەی دووەمدا تێکدەکاتەوەو پێچەوانەش پێچەوانەیە... بۆیە بەدڵنیاییەوە دەیڵێم پاچڤە کوردیەکە هیچی لە دوو پاچڤەکەی دی، کە یەکەمیان فارسی و دووەمیان عەرەبیە، ئەگەر زیاتر نەبێت، کەمتر نییە.

١-هنری ترویا/ داستایفسکی (زندگی و نقد آثار) ترجمە حسین علی هروی/ چاپ دوم: ١٣٨٨/آنتشارات نیلوفر (تهران)
٢-دوستویفسکی حیاتە - اعمالە/ تآلیف هنری ترویا/ ترجمە: علی باشا/ البعة الاولی/٢٠٠٦/ دار علاءالدین للنشر والتوزیع والترجمة.

## هنری ترویا (١٩١١ -٢٠٠٧)

هنری ترویا، نووسەری ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩١١دا، خانەوادەکەیان کە لەسەردەمی تزاریدا، پێگە و پایەیەکی جڤاکی و کۆمەڵایەتی باشیان هەبووە، لە شۆڕشی ئوکتوبەر (١٩١٧) بەدواوە، باروبنەیان پێچایەوە، ئیدی داک و باب و کوڕ کە ئەوکاتە تەمەنی شەش ساڵان دەبێت. لەڕێگای قەفقازەوە بۆ قرم دەڕۆن و لەڕێگای دەریای میدیترانەو بەندەری ڤینیسیاوە، سەرەنجام لە ساڵی ١٩٢٠خۆ دەگەیەننە پاریس. چونکە ئومێدی گەڕانەوەیان بۆ ڕووسیا نابێت. ئیدی تەبەعەی فەرەنسی وەردەگرن، ناوی خانەوادەگی خۆیان لە تاراسوفەوە دەگۆڕن بۆ ترواپا. ئەوە بوو ناوی "لیف تاراسۆڤ"ی هەشت ساڵە گۆڕا و بوو بە "هنری ترویا – Henri Troyat"هنری لە قوتابخانەکانی فەرەنسا دەخوێنێ و ئەنجام بەکالوریوس لەبەشی ماف وەردەگرێت. بەڵام زەوقی ئەدەبی وای لێدەکات بە بەردەوامی بەرهەمی کەڵە نووسەرانی فەرەنسا و ڕووس بخوێنێتەوە. لە گەنجیەوە دەست بەکاری نووسینی ڕۆمان و نوڤڵ دەکات. یەکەمین ڕۆمانی بەناوی (کازیوە) لەساڵی ١٩٣٥دا بڵاو بووەوە و خەڵاتی ئەدەبی پوولیستی لەسەر وەرگرت. نووسەر ئەم ڕۆمانەی بەدەم خزمەتی سەربازییەوە لەشاری میتز، نووسی بوو.

دوای خزمەتی عەسکەری، لەبەشی دارایی شارەوانی پاریس دامەزرا و ئیدی هەموو کاتی دەستبەتاڵی خۆی بەخوێندنەوەو نوسینی چیرۆک و ڕۆمانی کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە بەسەر دەبرد و کتێب لە دوو کتێبی چاپ و بڵاو دەبوونەوە. لەوانە (حەوزی بەخێوکردنی ماسی، شکۆی سروشتی، جاڵجاڵۆکە، لەساڵی ١٩٣٨دا خەڵاتی ئەدەبی گنکوری لەسەر ڕۆمانی جاڵجاڵۆکە درایە.

هنری ترویا. هەرگیز نەژادی ڕووسی خۆی فەرامۆش ناکات، وەکو خۆی دەڵێت لەماڵەوە بەڕووسی قسە دەکات و بەرهەمی کەڵە نووسەرانی ڕووس، بە زمانی ڕووسی دەخوێنێتەوە، حەز دەکات کاریگەری هەردوو فەرهەنگی فەرەنسی و رووسی، لە سەریەکدی، لە بەرهەمەکانی خۆیدا نیشان بدات و پێشەنگانی ئەدەب و فەرهەنگی ڕووس بە فەرەنسیەکان بناسێنێ. زۆر بەرهەمی چاک و جوانی لەم دوو زەمینەیەدا بەرهەم هێناوە. لەواری کاریگەری فەرهەنگی فەرەنسیدا بەسەر فەرهەنگی ڕووسدا کۆمەڵێک کاری گەورەی کردووە، لەوانە: "تازەوی پایەدارە - سی بەرگە، چاندن و درەو – پینج بەرگە، نورپاکان پێنج بەرگە. نووسەر هەوڵیداوە لەم بەرهەمانەیدا، ژیانی میللەتی ڕووس لە سەردەمی تزارەکاندا نیشانبدات و کاریگەری و باندۆری فەرهەنگی ئەوروپایی بەگشتی و فەرهەنگی فەرەنسی بەتایبەتی، لە واری گۆرانکاری ڕۆشنبیری ڕووسیادا دەرببڕێت.

لایەنێکی دیکەی کارە ئەدەبیەکانی جەنابی هنری ترویا، تایبەتە بە ناساندن و نیشاندانی هونەریانەی ژیانی میللەتی ڕووسیای پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر، کارێکی زۆری لەو مەیدانەشدا کردووە، لەوانە: (مۆسکۆیی –سی بەرگە، ژیانی ڕۆژانە لە ڕووسیای سەردەمی دواتزاردا، ڕووسیای پیرۆز). بەڵام خزمەتی گەورەی هنری ترویا بەهەردوو کەلتووری فەرەنسا و ڕووسیا، ناساندنی پێشەنگانی کەلتووری ڕووسە بە فەرەنساو لەڕێگای فەرەنساوە بەهەموو دنیای هاوچەرخ. باوەڕ ناکرێت کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، کەسێک هەبێت لەبواری ناساندنی کەلتووری ڕووسیدا، شان لە شانی هنری ترویا بدات. چونکە ترویا، جگە لەوەی بەخۆی لە نووسەرانی دەرەجە یەکی فەرەنسایە، بەرهەمی نووسەرانی ڕووسیش بە زمانی ڕووسی، زمانی دایک دەخوێنێتەوە. چەندین سەفەری وڵاتی سۆڤیەتی کردووەو دەربارەی کەڵە نووسەرانی ڕووس دەگەڵ خەڵکە بەتەمەنەکانی ئەوێندەردا قسەی کردووە زۆر شتیان بۆ گێڕاوەتەوە. ئەمە جگە لەوەی ڕێچکەو ڕێبازی ئەو لەواری بیوگرافی نووسیندا، ڕێبازێکی شیکاری و ڕەخنەیی تەواوە. واتە تەنیا بە شەرح و شرۆڤەی ژیان و تۆمار کردنی ڕووداوەکانی ژیانی نووسەری پەیوەندار واز ناهێنێ، بەڵکو بە زۆری پوختەیەکی بەرهەمە سەرەکیەکانی باس دەکات، بەرهەمەکانی لەمەحەکی ڕەخنە دەدات، ڕاو بۆچوونی خۆی دەربارەی بایەخ و کاریگەریی کۆمەڵایەتی هەر یەکێک لەبەرهەمەکانی دەردەبڕێت. کاریگەری و باندۆری فاکتەرەکانی ژینگەی ژیانی نووسەر، لەسەر بەرهەمەکانی، دەست نیشان دەکات، بگرە زۆرجاریش، ئەوەمان نیشان دەدات کە قارەمان و کاراکتەرانی ڕۆمانەکانی نووسەر، لە ژیانی ئاسایی نووسەردا چ کەسانێک بوون. بۆیە کە بەرهەمە بیوگرافیەکانی هنری ترویا دەربارەی هەر نووسەرێک دەخوێنینەوە، وەکو ئەوەیە هەموو بەرهەمەکانی ئەو نووسەرەمان خوێندبێتەوە کە ترویا ژینامەکەی نووسیوە. بۆیە ئەو بیوگرافیانەی کە جەنابی هنری ترویا دەربارەی کەڵە نووسەرانی ڕووس، نووسیونی، چونکە تەماسی ڕاستەوخۆی دەگەڵ بەرهەم و ژینگەی ڕووسی ئەواندا هەبووە، بە بەڵگەنامە

و سەرچاوەی نمرە یەک دێنە ژماردن و لە ڕووی دیقەت و زانیاری فراوانەوە کەم وێنەن، زۆر کاری لەم بوارەدا کردووە، لەوانە: "پوشکین، لیرمانتوف، چیخوف، تولستوی، گوگول و دوستویفسکی... هتد."
ئەوەشمان لەبیرنەچێت کە کتێبی (بەردی بناغەی گومەز)ی جەنابی ترویا، خەڵاتی ئەکادیمیای فەرەنسای وەرگرتووە و نووسەر لەساڵی ١٩٥٩دا بۆ ئەندامیەتی ئەکادیمیای فەرەنسا هەڵبژێردراوە... بەمجۆرە دەکریت هنری ترویا، بە پردێکی ئەمینی نێوان هەردوو کەلتووری دەوڵەمەندی ڕووسی و فەرەنسی بزانرێت...
سەبارەت بەم پاچڤەیەش، لە خوینەرانی کوردی زمان، تکاکارم کە هەر سەرنج و تێبینییەکیان هەبوو، لەهەر ڕوویەکەوە کەم و کورتی و کێمیاسیەکیان بەدی کرد، ئاگادارمان بکەنەوە، تا ئەگەر دەرفەتی چاپی دیکە هەڵکەوت، ئەو کەم و کووریانە ببوێرین.

پێرست

**بەشی یەکەم**



**بەشی دووەم**

**بەشی سێیەم**



**بەشی چوارەم**